سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٥

# پاشبەندەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

داینا وە

فارووق رەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

Nawrasi, Said
نورسی، سعید، ۱۸۷۳ - ۱۹۶۰م.
پاشبەندەکان / بدیع الزمان سەعیدی نوورسی؛ وەرگیر فاروق رسول یحیی.-- تهران: احسان، ۱۳۸۷.
[۱۰۱۰] ص.
ISBN: 978-964-356-660-9
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کتابنامه؛ به صورت زیرنویس.
۱. اسلام -- تجدید حیات فکری. الف. یحیی، فاروق رسول، ۱۹۵۰ - م. مترجم.
ب. عنوان.
۲و۹ن/۷/BP۲۳۳ ۲۹۷/۴۸
۱۳۸۷
کتابخانه ملی ایران
۸۳-۱۵۱۷۷م

## پاشبەندەکان

✦ مؤلف: بدیع‌الزمان سعید نورسی
✦ مترجم: فاروق رسول یحیی
✦ ناشر: نشر احسان
✦ تیراژ: ۲۰۰۰ نسخه
✦ نوبت چاپ: اول - ۱۳۸۷
✦ چاپ: چاپخانه مهارت

ISBN: 978-964-356-660-9
شابک: ۹۷۸-۹۶۴-۳۵۶-۶۶۰-۹



تهران. خ انقلاب. خ صفی علیشاه. کوچه تهرانی. پلاک ۲۶. تلفن ۷۷۵۳۷۶۵۵
تهران. خ انقلاب. خ روبروی دانشگاه تهران. مجتمع فروزنده. واحد ۴۰۶. تلفن ۶۶۹۵۳۲۰۲

به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

# پاشبەندەکان چین؟

به پێنووسی:
ماموستا ئیحسان قاسم صالحی
وەرگێڕی سەرجەمی پەیامەکانی نوور
بۆ زمانی عەرەبی

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله ومن والاه. وبعد:

لای خوێنەری بەڕێز ئاشکرایە کە مەبەست لە (پاشبەند) ئەو کورتە باس و نامیلکانەیە کە دوای تەواوبوونی دانانی کتێبێك دەکرێن بە پاشکۆی ئەو کتێبە. بەڵام نووسینی ئەم پاشبەندانەی بەردەستمان بەو جۆرە نی‌یە، بەڵکو هاوکات بووە لەگەڵ دانانی (پەیامەکانی نوور)دا، هەر لەسەرەتای دەستکردنی ماموستا نوورسی بە نووسینیان لە "بارلا" ساڵی ١٩٢٧ز هەتا کۆچی ماڵئاوایی لەم دنیایە و ڕۆشتنی بەرەو ئامێزی سۆزی خوای میهرەبان لە ساڵی (١٩٦٠ز)دا.

ئەم پاشبەندانە کۆمەڵە نامەیەکن لە نێوان ماموستا نوورسی و یەکەم دەستەی قوتابیانیدا، کە بە شێوەیەکی گشتی مۆرکی ڕێنمایی و ئامۆژگاری‌یان پێوەیە و، گرنگیی "پەیامەکانی نوور" و ڕێبازیان لەمەڕ بانگەوازی خەڵکی ئەم چەرخە بۆ لای خوای گەورە ڕوون دەکەنەوە. هەروەك چەندین نامەی دۆستانەشیان ئاوێتە

بووە کە قوتابیانی مامۆستا نوورسی لە لایەن خۆیانەوە ڕادەی دەستکەوتی "گیانی" و سوودی "ژیری"یان لە پەیامەکانی نوور دەردەبڕن و، لەوە دەدوێن کە چۆن ئەم پەیامانە ڕەوتی ژیانی ئەوانی گۆڕیوە و چەندین ئاسۆی زانینی فراوانی لە بەردەمدا واڵا کردوون..

جگە لەمانە، چەند بیر و ئەندێشەیەکی لەخۆ گرتووە کە هاتوونەتە دڵی مامۆستا نوورسی‌یەوە، ئەویش بەوپەڕی ڕاستی و دڵسۆزی بۆ قوتابیانی دەربڕیوە. سەرباری کۆمەڵێك ڕێنمایی و ئامۆژگاری بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵسوکەوت و، چۆنێتیی ڕەفتار لەگەڵ کەسانی تردا و، هاندانیان بۆ بەدەستهێنانی ئیمانی قووڵ و کاری بەردەوام و پەیوەندیی توندوتۆڵ و پابەند بوون بە قورئان و سوننەتەوە. هاوکات لەگەڵ جەختی تەواو لەسەر خواپەرستی و، بارگاوی کردنی دڵ و دەروون بە دوعا و یادی خوای گەورە و، تێفکرینی ئیمانی و، داوای لێبوردنی بەردەوام لە حوزووری خوای گەورەدا و، دەرخستنی کۆڵەواری و دەستەوسانی لە بەردەمیدا و.. واتاکانی تری هاوێنەی ئەمانە، کە جێی بایەخ پێدانی هەموو بانگەوازکارێکە بۆ لای خوای گەورە، تەنانەت توێشووی هەموو موسڵمانێکیشە.

(پاشبەندەکان) سێ کتێبی جیا جیا و سەربەخۆن، کە بریتین لە:

پاشبەندی بارلا.. پاشبەندی قەستەمۆنی.. پاشبەندی ئەمیرداغ.

لە ڕاستیدا ئەم پاشبەندانە هەنگاو بە هەنگاو پێکهاتوون و، دواتر نامە و وەڵامەکان پێکەوە خڕ کراونەتەوە، پاشان خراونەتەوە بەردەستی مامۆستا نوورسی. ئەویش ئەوانەی لێ هەڵبژاردوون کە بۆ بڵاو کردنەوە دەست بدەن.

ئنجا هەریەك لەم سێ پاشبەندە قۆناغێکی ژیانی مامۆستا نوورسی ڕوون دەکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا دەورانێکی جیا و سەربەخۆی مێژووی بانگەوازی پەیامەکانی نوور لە تورکیا، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە، دەردەخات. دەبێ ئەوەش بزانین کە هەر یەك لەو دەوران و قۆناغانە بە ئەزموونێکی دژوار و پاڵفتە کردنێکی ئیمانیی ورد بۆ کارگوزارانی بواری ئیمان و بانگەوازی قورئان دەست

پێ دەکات، لە گرتن و بە ئاوارە کردن و نەفی و ئەشکەنجە و ئازاردان.. ئنجا قۆناغێکی تر و، پاشان قۆناغێکی تر..

بۆ نموونە:

(پاشبەندی بارلا): ئەو نامانەی لەخۆ گرتووە کە لە سەرەتای ڕەهەندە بوونی مامۆستا نوورسی بۆ "بارلا" لە ساڵی ١٩٢٧ز و نیشتەجێ کردنی زۆرەملێی لەوێ، نووسران.. تا ئەو دەمەی کە ساڵی ١٩٣٥ز لەگەڵ قوتابیانیدا بران بۆ دادگای گەورەی جەزا لە شاری "ئەسکی شەهر" و بە بەندیخانەی ئەوێ سپێرران.

(پاشبەندی قەستەمۆنی)ش: ئەو نامانەی نێوان مامۆستا نوورسی و قوتابیانی ئەوی لەخۆ گرتووە کە دوای بەسەربردنی ماوەی حوکمەکەی لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" و نەفی کردنی بۆ "قەستەمۆنی" لە ساڵی ١٩٣٦ز و نیشتەجێ کردنی زۆرەملێی لەوێ، دەگرێتەوە.. هەتا بردنی خۆی و قوتابیانی نوور بۆ دادگای "دەنیزلی" لە ساڵی ١٩٤٤زدا.

(پاشبەندی ئەمیرداغ)یش دوو بەشە:

بەشی یەکەمیان: ئەو نامانەی مامۆستا نوورسین کە دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانی لە دادگای "دەنیزلی" ساڵی ١٩٤٤ز و نیشتەجێ کردنی زۆرەملێی لە شاری "ئەمیرداغ" نووسیونی. ئەم بەشە بە تەواوبوونی ساڵی ١٩٤٧ز کۆتایی پێ دێت، کە لەو بەروارەدا بران بۆ بەندیخانە ترسناکەکەی "ئافیوون".

بەشی دووهەمیشی: لە ساڵی (١٩٤٨ز)یەوە دەست پێ دەکات، واتە دوای ئازاد بوونی مامۆستا نوورسی و قوتابیانی لە بەندیخانەی "ئافیوون" و گەڕانەوەی بۆ ئەمیرداغ و نیشتەجێ کردنی زۆرەملێی لەوێ هەتا کۆچی دوایی.

ئەم بەشەیان نامەکانی تری مامۆستا نوورسیی تێدایە کە لە ماوەی بیست مانگی بەند بوونی لە بەندیخانەی "ئافیوون" بۆ قوتابیانی نووسیوە و، ئەوانەش کە ماوەی مانەوەی دوو مانگی لە "ئەسکی شەهر" و، سێ مانگی مانەوەی لە ئەستەمبووڵ (بۆ

دوو جار: ١٩٥٢-١٩٥٣ز) نووسیونی کاتێ کە ڕۆشت بۆ ئەستەمبووڵ لەبەر ئەو داوایەی لەسەر پەیامی (ڕابەری لاوان) لەوێ لەسەری تۆمار کرابوو.

بەڵام ئەو نامە بەنرخانەی تر کە مامۆستا نوورسی لە بەندیخانەکانی (ئەسکی شەهر و دەنیزلی و ئافیوون)دا نووسیونی، ئەوا لەسەر حەز و خواستی خۆی خراونەتە ناوەندی کۆمەڵە پەیامی (تیشکەکان)ەوە.

شایانی باسە ئەم پاشبەندانە مۆرکێکی تایبەتیی بانگەوازیان لەخۆ گرتووە لەمەڕ ئاراستە کردنی گوفتار بۆ خۆشەویستان و پشتگیرانی ئایین، تەنانەت نەیارانیشی و، هاندانی هەموویان بۆ بەرگری کردن لە ئیسلام و باوەڕ و مێژووەکەی، لە بەرامبەر ئەو بارودۆخە نامۆ و دژوارەی کە خەڵکانی کۆمەڵگای تورکیا ڕووبەڕووی بووبوونەوە و، لە ئاسایی‌ترین چەمکی تێگەیشتن لە ئایینی ئیسلام بێ بەش کرابوون، لە قۆناغێکدا کە هیچ کارێکی توندوتۆڵ و ڕێکوپێك بۆ خزمەتی ئیسلام لە گۆڕێدا نەبوو کە ئەرکی هەڵگرتنی ئەمانەت و ڕێنمایی ڕۆڵەکانی نەتەوە بگرێتە ئەستۆ.

جا بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز لە بەروبوومە شیرینەکانی ئەم پاشبەندانە بەهرەمەند بێت، ئەوا لە خوارەوەدا هێڵە سەرەکی‌یەکانی بارودۆخی ئەو سەردەمە و ڕەنگ و ڕوخساری بەرجەستەی هەریەك لەو قۆناغانە دەخەینە بەر دەستی، بۆ ئەوەی بە تەواوی شێوەی ئەو سەردەمانەی لە لا ڕوون ببێتەوە و، هەر بۆ خۆی لە گرنگیی ئەو شتانە تێبگات کە مامۆستا نوورسی لە "پاشبەندەکان"دا لێیان دواوە.

وڵاتی تورکیا لەو ماوەیەدا (١٩٢٥-١٩٥٠ز) لە تاریکاییەکی ڕەشی ستەم و زۆرداری و دوژمنایەتیی ئاشکرای ئاییندا دەژیا؛ دەستەڵاتدارانی ئەو دەمە دەیانویست گەل و نەتەوە لە بیرو باوەڕەکەی دابڕن..

ئەوەبوو بڵاوبوونەوەی قورئانیان قەدەغە کرد و، خوێندنگا ئایینی‌یەکانیان داخست و، بە چەند بروبیانوویەکی جۆراوجۆر ڕێی ئەنجامدانی فەرزی حەجیان لە موسڵمانان گرت و، بانگ و نوێژ و قامەت و وتاری هەینی‌یان لەسەر شێوە

شـــەرعی‌یەکەی خـۆی نەهێشـت و گۆڕی‌یـان بـە زمـانی تورکـی و، پۆشـاکی ئەوروپایی و سفووری ئافرەتیان بە زۆرەملـێ بەسەر خەڵکیدا سـەپاند و، پیتـی ئیسلامیی نووسینیان گۆڕی بە لاتینـی و، لـە بریـی ڕۆژانـی هـەینی ڕۆژی یـەك شەممەیان بە پشووی حەفتە بەسەر جەماوەردا سەپاند و، یاساکانی ئەوروپایان خستە جێی ئەحکامەکانی شەرعی ئیسلام و، لە سەرانسەری وڵاتدا چەندین دادگایان بۆ پیادە کردنی ئەو یاسایانە دامەزراند کـە تۆقـاندن و تـرس و لـەرزیان خستبووە دڵی جەماوەرەوە و، سێدارەکانیان لە هەموو شوێنێکدا بۆ زانایان و هەموو ئـەو کەسانە دانا کە ڕەخنەیان بەرامبەر دەسـتەڵاتداران لـە زار دەربچوایە! لـە لایـەکی تریشـەوە بانگەشە بۆ "نەتەوایـەتیی تـورك" دەکرا و لافی باشـی و جیـاوازیی نەتـەوەی تـورك لەچاو نەتەوەکانی تر لـێ دەدرا و، سەرکردەکانیان تـا ڕادەی "خوایـەتی" پـەنا بـە خوا تەقدیس دەکران و، فەلسەفەی ماددی و، ئینکاریی بوونی بەدیهێنەر و ڕۆژی دوایـی لـە قوتابخانەکاندا بـە دەرس دەوترایـەوە و، گیـانی سەرسـووڕمان بەرامبـەر شارستانێتیی ئەوروپا تا ڕادەی توانەوە لەناو خەڵکیدا برەوی پێ دەدرا.

لەبەر ئەو بارودۆخانە بووە کە هەردوو قۆناغی "بارلا" و "قەستەمۆنی" بە تایبەتی (١٩٢٧-١٩٤٤ز) هەروەها "ئەمیرداغ"یش، لە مێـژووی بانگـەوازی پەیامـەکانی نـووردا، پتر بـەوە لـە قۆنـاغەکانی تـر جیـا دەبنـەوە کـە کـاری تـەواو پەنهـان و دامەزراندنی هێمنانەی بێ دەنگی لەخۆ گرتووە. هاودەم لەگـەڵ جـەخت کردنـەوە لەسەر توندوتـۆڵ دارِشتنی بناغـە و پـەروەردەی چـەندین قوتـابی لەسـەر ئیخلاسـی تـەواوەتی و، توانـەوە لـە کـار و خزمـەت و، وەفـای بێگـەرد و، شـەیدا بوونیـان بـۆ بانگەوازەکەیان و، پەیوەندیی تۆکمە و نەپچڕاویان پێیەوە و، هیممـەت بـەرزی‌یان لـە پێنـاوی بڵاوکردنـەوەی پەیامەکانی نـووردا کـە تەفسـیری قورئـانی پـیرۆزن و، هـەوڵی بـێ وچانیـان لـە دامـەزراندنی ڕاسـتی‌یەکانی ئیمـان لـە دڵ و دەروونـی خەڵکیدا و، دوورخستنەوەی گومانەکان لێیان..

ڕوودانی هەموو ئەمانە لەو ماوەیەدا بوو کە بە دژوارترین قۆناغی مێژووی تورکیا دادەنرێت، چونکە جەنگێکی بێ ئامانی دڕندانە لە دژی ئیسلام لە ناوخۆدا سازکرابوو کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەی دەسەند، سەرباری گێرو گرفتەکانی "دووهەم جەنگی جیهانی" کە هاوکات بوو لەگەڵ قۆناغی قەستەمۆنیدا و، برسێتی و هەژاری و ترس و لەرزی دەرخواردی خەڵکی دا، هەرچەندەش تورکیا لەو جەنگەدا بە بێ لایەنی مابووەوە.

ئەم وشکەساڵی و کەشە تاریکانە هەر مایەوە هەتا خوای گەورە چەند قوتابییەکی چاپوك و لێهاتووی لە دەستەی یەکەمی قوتابیانی نوور هێنایە مەیدان کە قۆڵی لێبڕانیان بۆ کاری سەروم‌ڕ و مەردانە لێ هەڵماڵی، لەو قوتابیانەی کە دڵانیان بە ئیمان هاتبووە جۆش و، گیانیان تەڕ و پاراو بوو بە خۆشەویستیی خوای گەورە و پێغەمبەری ئازیز ﷺ و، سنگ و دەروونیشیان لە خۆشویستنی بانگەوازی ئیمان و قورئاندا بە ڕادەیەك قوڵپی دەدا کە هی وایان تێدا بوو بە درێژایی شەو هەتا ڕۆژ دەبووەوە - دوور لە چاودێران - بەناو چۆڵایی هەرد و چیاکاندا دەڕۆشت تاکو بگاتە گوندێکی تر و لەوێ پەیامێك بگەیەنێتە دەستی ئەو کەسەی کە بە دەست دەینووسێتەوە و لە بەری دەگرێتەوە!

بە درێژایی هەموو ئەو ساڵانە مامۆستا نوورسی بە نهێنی لە نامە گۆڕینەوەی بەردەوامدا بووە لەگەڵ قوتابیانی، هەرچەندە لێیانەوە دوور بووە و گەلێ چاودێریی ورد و بەردەوامیشی لەسەر دانراوە. دەبینیت لەو نامانەدا ئامۆژگاریی یەك لە دوای یەکیان دەکات بۆ کار و کۆشش لە پێناوی قورئاندا، هاودەم لەگەڵ حەزەر و وریایی زۆر و، پابەند بوون بە تەقوا و زوهد و قەناعەت و غیرەت لەسەر ئیمان، هەموو ئەمانەش لە ناوەندی تەوازوع و خۆنەویستیی تەواوەتی و، لێبڕانی یەکجاریدا بۆ بانگەوازی ئیمان و قورئان.

یەکێك لەو شتانەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە مامۆستا نوورسی لە ناوەندی نامەکانی خۆی لەم پاشبەندانەدا هەندێ نامەی قوتابیانیشی داناوە، کە لە

بارەی جۆش و کوڵی "دڵ و دەروون" و ڕیژنەی "گیان" و توێشووەکانی لەمەڕ "ژیری"یەوە دەدوێن کە لە دەمی خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور لە خۆیاندا هەستیان پێ کردووە و، هەتا زیاتر خوێندبێتیانەوە پتر هزر و دەروونی ئەوانی لە خلتە و گومانەکان پالاوتووە و، بەرەو دەستگرتنی زیاتر بە قورئان و سوننەتەوە بردوونی و، هانی داون کە بە حەز و تاسە و خۆشەویستی‌یەوە بۆ بەرز ڕاگرتنی ئایینی ئیسلام تێبکۆشن. جا نامەکانی ئەو بەڕێزانە پێزانین و وەفاداری‌یان دەردەخات بەرامبەر بەو چاکەیەی کە پەیامەکانی نوور پێشکەشی کردوون.

بەڵام لە (پاشبەندی ئەمیرداغ)دا هەست بە هەندێ ئاڵوگۆڕ و جیاوازی دەکەین، چونکە لە دوای سالی (١٩٥٠ز)یەوە ئازادی‌یەکی ڕێژەیی بۆ موسڵمانان ڕەخسا. بۆیە لەم پاشبەندەدا هەندێ پێوەر و تەرازووی سیاسی و دەستووری کۆمەڵایەتی دەبینین، بە تایبەت لە بەشی دووهەمیدا. هەروەك چەندین نامەی لەخۆ گرتووە کە ئاراستەی کاربەدەستانی وڵات کراون، هەر لە بەڕێوەبەری ئاسایشی پارێزگاوە بۆ بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی و دادگای تەمیز و دادگاکانی تر و سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆماریش، تەنانەت بۆ دەرەوەی وڵات تا دەگاتە وەڵامنامەی پاپای ڤاتیکان. هاودەم لەگەڵ بەرپەرچدانەوەی ڕۆژنامە بەکرێ گیراوەکاندا لەوانەی کە هانی کاربەدەستانیان لە دژی موسڵمانان دەدا و ئاشوو بیان دەنایەوە و پڕوپاگەندەیان دەخستە ناوەندەکانەوە..

ئنجا لەبەر ئەوەی مامۆستا نوورسی لەو نامە یەکجار زۆرانەی نێوان خۆی و قوتابیانیدا تەنها ئەوانەی بۆ ئەم پاشبەندانە هەڵبژاردووە کە بۆ بڵاوکردنەوە دەست بدەن، ئێمەش لە دەمی وەرگێڕانی ئەم پاشبەندە هەڵبژاردانەی مامۆستا نوورسیدا ئەوانەمان بۆ وەرگێڕان هەڵبژارد کە لە بواری ڕێنمایی و بەرچاو ڕۆشنیدا کاریگەری‌یان هەیە و، شێوازەکانی بانگەواز لە قۆناغە جیاجیاکاندا دەردەخەن، یان شێوازی کار و مامەڵە لەگەڵ هەموو بەش و چینێکی دۆستان و نەیاراندا ڕوون دەکەنەوە، یاخود چەندین پەند و ئامۆژگاری و دانایی و دەستوور و پێوەر و

ئەرازووی ڕاست و دروستیان لەخۆ گرتووە و، هەموو خاوەن بانگەوازێك پێویستی پێیان دەبێت. چونکە کاروبارەکانی بانگەواز، بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکیەوە، لە هەموو کات و شوێنێکدا دووپات دەبنەوە. بۆیە ئەم نامانە بە چەند نموونەیەکی سەرکەوتووانە و زیندوو دادەنرێن لە بواری بانگەوازی ئیمان و قورئاندا و، ناکرێ پشتگوێ بخرێن و سوودیان لێ وەرنەگیرێت.

هەر لەبەر گرنگیی ئەم پاشبەندانەیە کە مامۆستا نوورسی لە ناوەندی "پەیامەکانی نوور"دا جێی بۆ داناون و، ناوی: "مەکتووبی بیست و حەوتەم"ی کۆمەڵە پەیامی (مەکتووبات)ی لێ ناون.

ئەوەی لێرەدا جێی تێبینییە ئەوەیە کە:

هەر کەسێك "بابەتە ئیمانییەکان"ی پەیامەکانی نوور بە وردی و سەرنجدانەوە دەخوێنێتەوە، زەینی خاوێن دەبێتەوە و گیانی دەگەشێتەوە و ئیمانەکەشی پوخت و پاڵفتە دەبێت و بە پلەکانی ئیماندا سەردەکەوێت.. ئەو کەسەش کە بەردەوام "بەرگری"یەکان دەخوێنێتەوە، کە هەر لەناوەندی پەیامەکاندان، هێندە پڕچەك دەبێت کە بتوانێت لە بەرامبەر شەیتانەکانی جینی و ئینسدا بەرگری لە بانگەوازەکەی بکات.. هەر کەسێکیش بە وردی لە "پاشبەندەکان" بکۆڵێتەوە، سەرجەم هەڵسوکەوت و بارودۆخ و تێڕوانینەکانی بۆ ڕووداوەکان یەکاویەك دەبن لەگەڵ دیدی قورئانییانەی پەیامەکانی نووردا!

ئیتر لەم ڕێیەوە هەست و نەستەکانی ژیریی فراوان دەبن و تێگەیشتنەکانیشی ڕووناك دەبنەوە و، دڵ و هەست و سۆزەکانیشی دێنە جۆش و لە ئیمان پڕ دەبن و بینینەکانی هەتا دوور بڕ دەکەن.. ئنجا - بە پشتیوانیی خوای گەورە - هەوا و ئارەزووەکان لە ڕێ نایترازێنن.

پێمان باشە لێرەدا دەقی ئەو نامەیەی مامۆستا نوورسی بۆ یەکێك لە قوتابیانی پێشینی بهێنین کە تیایدا گرنگیی ئەم پاشبەندانە دەخاتە ڕوو، تاکو بیکەین بە دوا قومی بۆ میسکی ئەم پێشەکییە.

ئەوەتا مامۆستا نوورسی لەو نامەیەدا کە بۆ "خەسرەو"ی نووسیوە، دەفەرموێ:

ئەم پەیامە (واتە مەکتووبی بیست و حەوتەم - پاشبەندەکان) ئەنجومەنێکی نوورانیی گەورەیە و قوتابیانی بەڕێزی قورئانی پیرۆز وانەکانی تێدا دەخوێنن و، لە نێوان خۆیاندا ئەو بیر و ڕایانە ئاڵوگۆڕ پێ دەکەن کە تایبەتن بە ئیمانەوە و، لە واتاکانیان دەکۆڵنەوە..

کەواتە ئەم پەیامە هەیوان و حوجرەی قوتابخانەیەکی مەزن و بەرزی ئەوتۆیە کە هەڵگرانی قورئانی پیرۆز بیروڕا و بۆچوونەکانی خۆیانی تێدا دەگۆڕنەوە و، هەریەکەیان لەو وانەیە دەدوێ کە لە قورئانی پیرۆزەوە بەهرەمەندی بووە.

هەروەها - ئەم پەیامە - وەکو خانوویەکی مەزن و بە وێنەی پیشانگایەکی فراوان وایە بۆ فرۆشتنی پەیامەکان، کە سندووقی گەوهەرەکانی گەنجینەی خاوێنی قورئانن و، هەر قوتابی‌یەك ئەو گەوهەرانە دەخاتە پێش چاوی کڕیاران کە لەو گەنجینە بەنرخەوە بەدەستی هێناون.

دەسا ئافەرین و "بارك الله" بۆ ئێوە ئەی خەسرەوی برام - کە ئەو مەنزڵ و پیشانگایەتان بە جوانترین ئارایشت ڕازاندووەتەوە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە ئەوەش دەڵێین کە بە مەبەستی ئاسانکاری بۆ خوێنەری بەڕێز لە سەرەتای هەموو یەکێك لە نامەکاندا ناونیشانێکمان لە نێوان دوو کەوانەدا داناوە کە لە دەقە تورکی‌یەکەدا نەبوو.

لە خوای گەورە داواکارین کە نیازی جوان و تێگەیشتنی ڕاست و ڕاستیمان لە گوفتار و کرداردا پێ ببەخشێت.

وصل اللهم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

ئیحسان قاسم صاڵحی

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

# پێشەکی

پێنج هۆکار هەن کە بۆچوونەکانی "خلووصی"[(١)] و "صەبری"[(٢)] سەبارەت پەیامەکانی نوور - کە لە نامەکانیاندا نووسیویانن - لە نێوان پەیامەکانی نووردا بڵاو بکرێنەوە:

یەکەمیان: غیرەت و لێبڕانی "خلووصی" گرنگترین هۆکاری نووسینی دوا پەیامەکانی کتێبی "وتەکان" و زۆربەی "مەکتووبات" بوون. ئنجا تاسەمەندیی گەرموگوڕی هەڵقوڵاوی ناخی دڵی "صەبری"ش بوو بەهۆی نووسینی مەکتووبی "نۆزدەهەم" کە سێیەکی "مەکتووبات" پێکدەهێنێت.

هۆکاری دووهەم: ئەم دوو برا بەڕێزە نەیاندەزانی ئەم بڕگانەی نامەکانیان بڵاودەکرێنەوە. ئەم نەزانینەشیان هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی کە سەنعەتسازی و مەرایی توخنی نووسینەکانیان نەکەوێت و لەوپەڕی "ئیخلاص"دا بێت و پلەکانی

---

(١) "خلووصی یەحیا گیل" یەکێکە لە قوتابیانی دێرینی مامۆستا نوورسی لە "بارلا" کە لەو دەمە ئەفسەر بووە لە پلەی نەقیبدا. هەر پرسیارێکی بیوایە سەبارەت بابەتە ئیمانییەکان دەینارد بۆ مامۆستا نوورسی، ئەویش وەڵامی بۆ دەنووسییەوە. پاشان بە ڕێنمایی مامۆستا خۆی ئەم وەڵامانە کۆکرانەوە و ناونران: "مەکتووبات". ناوبراو لە ساڵی (١٩٨٦ز) و لە تەمەنی نەوەدویەك ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٢) (١٨٩٣-١٩٥٤ز) زانایەکی بەرز و بەڕێز و، پێش نوێژی مزگەوتی گوندی "بەدرە"ی نزیکی بارلا بووە. هەر پەیامێکی نووری لە لایەن مامۆستاوە بەدەست دەگەیشت یەکسەر لەبەری دەنووسییەوە و بە پەنامەکی و لە ڕێگای چەند قوتابییەکی گورجوگۆڵی نوورەوە دەینارد بۆ "حافظ عەلی" و برایانی لە قوتابیانی نوور ئەوانیش دەیان نووسییەوە و بە نهێنی بەسەر تاسەمەندانی پەیامەکاندا دابەشیان دەکردن. (وەرگێڕ)

چێژ وەرگرتنی هەست و گیانیان بەرامبەر پەیامەکان دەربڕێت و، لە هەمان کاتدا شەوق و تاسەیان بۆ ڕاستی‌یەکانی ئیمان بخاتە ڕوو. لەبەر ئەوە، ڕێزلێنان و دەربڕینی سەرسووڕمانیان بەرامبەر بە پەیامەکان وەك ئەو پیاهەڵگوتن(تقريظ)ە ئاساییانە نین کە بۆ کتێبی تر دەنووسرێن، بەڵکو هەست دەربڕینێکی خاوێنە و، ئەو ڕاستی‌یانە دەردەخەن کە لە پەیامەکاندا دیویانە و چەشتوویانە.

هۆکاری سێ‌هەم: ئەم دوانە لە قوتابی‌یە ڕاستەقینە و هاوەڵە ڕاست و جددی‌یەکانمانن و، سێ تایبەتکاریی قوتابیی نوور و کارگوزاریان لە پێناوی قورئاندا تێدایە، کە تایبەتکاریی "قوتابی" و "برا" و "هاوەڵ"ن. تەنانەت لەم سێ سیفەتەدا پێش هەموو کەسێکیان داوەتەوە. ئەو سێ سیفەتەش ئەمانەی خوارەوەن:

تایبەتکاری یەکەم: هەردوو کیان هەموو ئەو پەیامانەی نوور دەگرنە خۆیان کە بە هی من دادەنرێن، وەك بڵێی ئەوان خاوەنی ڕاستەقینەیان بن. چونکە هەر وتەیەك لە "وتەکان" کە دەنووسرێت، ئەوان بە چەشنێکی بێگەرد تامی دەچێژن، دەڵێی خۆیان نووسیویانە و دایان ناوە، بۆیە شوکرانەی خوای لەسەر پێشکەش دەکەن. ئەم دوانە وەکو یەك گیان وان لە دوو جەستەدا و، میراتگری ڕاستەقینەی مەعنەویی منن.

تایبەتکاریی دووهەم: هەردوو کیان لەو باوەڕەدان کە مەزنترین و بەنرخترین ئامانجی ژیانیان خزمەت کردنی قورئانی پیرۆزە لە ڕێی ئەو وتانەی پەیامەکانی نوورەوە و، هەست دەکەن کە خزمەتگوزاریی ئیمان گرنگترین حەقیقەتی ژیانی دنیان و مەزنترین ئەرکی ئەستۆی سروشتیانە لەم دنیایەدا.

تایبەتکاری سێ‌هەم: هەردوو کیان - وەك من - پەی بە زامەکانیان دەبەن و وەك منیش بەو دەرمانانە سارێژیان دەکەن کە لە دەرمانخانەی قورئانی پیرۆزەوە هێناومن و، لە پێشدا لەسەر خۆم تاقیم کردوونەتەوە. ئنجا لە هەمان کاتدا هەردوو کیان خاوەنی غیرەتێکی گەلێ بەرزن بۆ پاراستنی ئیمانی ئیمانداران. لەبەر ئەوە، شەفەقەتێکی زیادیان تێدایە بۆ سارێژ کردنی ئەو زامانەی ئیمانداران کە بەهۆی گومان و دوودڵی‌یەکانەوە لە دڵ و دەروونیاندا دروست بوون.

هۆکاری چـوارەم: "خلووصـی" وەکـو تاقانـە کـوڕی مەعنـەویی مـن و چەشـنی "عـەبدوڕڕەحمان"ی بـرازام وایـە(١) کـە مایـەی دڵنـەوایی و شـادمانیم و مـیراتگری ڕاستەقینەم بوو، هەروەك چاوەڕوانی ئەوەی لـێ دەکـرا کـە زیرەکـی و وریاییـەکی نوورانیی بێ. بـەڵام کـە کۆچی دوایی کـرد "خلووصـی" شـوێنی ئـەوی گرتـەوە، چونکە بە ڕاستی و دروستی ئەو خزمەتگوزارییانە ئەنجام دەدات کـە مـن لـەو خـوا لێخۆشبووە چاوەڕوانم دەکرد.

کـە ماوەیـەکی زۆر لـە پێـش دیتنـی "خلووصـی" خـەریکی نووسـینی "وتـەکان" بووم، وام هەست دەکرد کەسێکی مەعنەوی خاوەن کارمەندییەکی سـەربازی لـە بەرامبەرمەوەیە و قسـە و گوفتارەکـانمی ئاراسـتە دەکـەم، بۆیـە زۆربـەی نموونـەکانم بـەپێی ئـەرکی سەرشـان و ڕێبـاز و فەرمانبـەریی ئـەو هێـنراون و بـاس کـراون. بـەو واتایەی کە خوای گەورە ئەو کەسەی کردبوو بە قوتابی و یارمەتیدەرم لە خزمـەتی قورئان و ئیماندا. منیش - بێ هیـچ هەسـت و شـعوور و مەبەسـتێك - ئـەو کەسـەم وەك قسەبۆکراو(مخاطب)ی خۆم دانـا و پێـش ئـەوەی ببینـم و دەرسـی پێ بڵێـم لـە "وتەکان"دا ڕووی گوفتارەکانم ئاراستە کرد!

سەبارەت بە "صەبری"شەوە، ئەوا نیشانەیەکی جوداکـەرەوەی سروشتیی هەیـە کـە لـە منیشـدا هەیـە و تایبەتـە بـە منـەوە و جگـە لـەو لـە هیـچ کەسـێکی تـری ئـەو شوێنانەدا نەم دیوە کە تیایاندا گەڕاوم(٢). ئنجا ئەویش پتر لە سیلەی ڕەحم، هەست بە پەیوەندیی خزمایەتی دەکات لەگەڵ مندا و، لەبەر ئەوەی تـازەکی لـە خـەوی بێ ئاگایی بێدار بووەتەوە، چاوەڕوانیی خزمەتێکی کەمم لـێ دەکرد بتوانێـت ئـەنجامی بدات، کەچی پێش هەموان کەوتەوە! ئەمەش ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەوەی کـە "صـەبری"

---

(١) ناوی "عەبدوڕڕەحـمانی کوڕی عەبدوڵڵا"یە و برازای مامۆستا نوورسییە. لە سـاڵی ١٩٠٣ز لـە گوندی "نوورس" لە دایك بووە و، لە سـاڵی ١٩٢٨زیشـدا لـە گونـدی "زولفـەزل"ی نزیکی ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. ژیاننامەیەکی مامۆستا نوورسـی نووسـیوە کـە هـەر لـە سەرەتای ژیان و لـەدایکبوونی مامۆستاوە تـا سـاڵی ١٩١٨ز باسی ژیـانی ئـەوی تێـدا کـردووە و، لـە کتێبێکدا کە لە ئەستەمبووڵ چاپی کردبوو، بڵاوی کردەوە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەو نیشانەیە بریتییە لە پێوەلکانی پەنجە گەورەی پێی بەوەی تەنیشتیەوە. (وەرگێڕ)

خولووصیی دووهەم و دەستنیشانکراوی ئەم خزمەتەیە و خواوەندی گەورەی بەتوانا ئەم ئەرکە گرنگەی خستووەتە ئەستۆی و کردوویەتی بە قوتابی و هاورێمان لە خزمەتی قورئاندا.

هۆکاری پێنجەم: هەرگیز سەبارەت بە خۆم بە مەدح و ستایش و دەربڕینی سەرسووڕمان و ڕێزلێنان، ڕازی نیم. چونکە زیانی زۆرم لێ دیوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە زۆر بە توندی نەفرەتی لێ دەکەم و لە دەستی هەڵدێم، تەنانەت خۆمی لێ دەپارێزم، نەبادا ئەم ڕێزنان و سەرسووڕمانە ببنە مایەی شانازی و لەخۆ بایی‌بوون..

بەڵام لەو ڕووەوە کە من "بانگەوازکار" و "خزمەتگوزاری قورئانی پیرۆز"م، ئەوا ئەو چەشنە ڕێزلێنانە بۆ من ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ "وتە" نوورانی‌یەکان، تەنانەت بۆ ڕاستی‌یەکانی ئیمان و نهێنی‌یەکانی قورئان دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوە و، لە گۆشەی "شوکرانەبژێری"یەوە بۆ خوای گەورە - نەك شانازی و لەخۆ بایی بوون - بەم جۆرە ڕێزلێنانە ڕازی دەبم.

جا لەبەر ئەوەی کە ئەم دوو کەسە زیاتر لە چاو کەسانی تر لەم ڕاستی‌یە تێگەیشتوون، ئەوا نووسینی ڕێزلێنان و سەرسووڕمانیان لە پەیامەکانی نوور - بە هاندانی ویژدان و بێ ئەوەی هەست بکەن کە نووسینەکانیان بڵاو دەکرێنەوە - ئاوێتەی پەیامەکان بوون و لە نێوانیاندا بڵاو کرانەوە.

لە خوای گەورە داواکارین کە هاوونەیان زۆر بکات و، بۆ کاری خێر و چاکەکاری سەریان بخات و، لەسەر ڕاستە شەقامی ئیمان نەیانترازێنێت.. ئامین.

اللّهم وفّقنا وإياهما وأمثالهما من إخواننا لخدمة القرآن والإيمان كما تحب وترضـى، بحق من أنزلت عليه القرآن، عليه أفضل الصلاة وأتم التسليمات ما اختلف الملوان ومـا دار القمران.

سەعیدی نوورسی

# مەکتووبی بیست و حەوتەم

# و

# پاشکۆکانی

ئەم مەکتووبە بریتی‌یە لەو برگەی ڕێز و ستایشانەی نامە تایبەتی‌یەکانی "خلووصی"، کە یەکەم کەسە "وتەکان"ی نووری ئاراستە کراوە.

بەشی دووهەمی ئەم مەکتووبی بیست و حەوتەمەش، واتە پاشکۆکەی، چەند برگەیەکی نامەکانی "صەبری"ن کە "خلووصی"ی دووهەمە و، لەو برگانەدا ڕێز و سەرسووڕمانی خۆی سەبارەت بە "پەیامەکانی نوور" دەربڕیوە[1].

---

(١) پاشبەندی بارلا و پاشکۆکانی بەشێکی مەکتووبی بیست و حەوتەمن. ئەم مەکتووبە - لە دواییدا - بە تەواوی ئامادە کرا بەوەی کە هەر سێ پاشبەندەکەی خرانە سەر: پاشبەندی بارلا و، پاشبەندی قەستەمۆنی و، پاشبەندی ئەمیرداغ. (دانەر)

(ئەرکی سەرشانی بانگەوازکار کۆتایی پێ نایەت)

"بڕگەی یەکەم بە پێنووسی خلووصی"

بسم الله الرحمن الرحيم

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بعدد ذرات الكائنات أبداً دائماً

ئەی مامۆستای بەڕێزم!

من لەو مرۆڤە کاملانە نیم کە لەو دەمەی هەژاری و بێ نرخیی خۆیان لە بەردەم خوای گەورەدا دەبینن هەست بە شادمانی و خۆشی دەکەن. نەخێر.. بەڵکو من لەو جۆرە کەسانەم کە دەیانەوێت خۆیان لە ڕاستیدا چۆنن هەر وەهایش لە پێش چاودا دەربکەون.

من پڕ بە دڵ بەختەوەری ئاوڕ لێدانەوەی پڕ لوتف و مەرحەمەتی جەنابتم کە بە: "قوتابیم.. برام.. برازام" لەگەڵم دەدوێیت و ڕووی گوفتارم ئاراستە دەکەیت.

بە ڕاستی - ئەی مامۆستای ئازیزم! - من لە ڕووی مەعنەوییەوە لە دۆخێکی یەکجار نزمدام و گەلێ پێویستم بە دوعا و نزای بەڕێزتانە.

ویستی خوای گەورە وا بووە کە هەندێ بریسکانەوەی نووری قورئانی پیرۆز - کە نووری ڕاستەقینەیە - بۆ گرۆی مرۆڤی ئەم سەردەمە بە چەشنێکی هێندە ڕوون و ئاشکرا بخرێنە پێش چاو کە تەنانەت بڕواتە ناو چاوە کوێرەکانی گومڕایانیشەوە. ئنجا مامۆستای بەڕێزیشمان بوو بە هۆکاری ئەنجامدان و ڕاگەیاندنی ئەم ئەرکە گرنگە..

ئا لەم ڕێگایەوە و بەهۆی لوتف و چاکە و چاودێریی خوای گەورەوە، ئەم قوتابییە هیچ و بە "نەبوو" حساب بووەی خۆتان ئەرکێکی جوزئیی خراوەتە ئەستۆ لە خزمەتی مامۆستاکەیدا، کە بە ڕاستی و دروستی ئەرکی خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆز ئەنجام دەدات.

لەبەر ئەوە، هەرچەندە لە شوکرانەی خوای گەورەدا بەردەوام بم، هێشتا لە ئاستی ئەو نیعمەتە مەزنەی کە پێی بەخشیوم ئەو شوکرانەیەم بە کەم دادەنرێت.

کەواتە من بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش مافی شانازی دەربرینم لەم خزمەتەدا نی‌یە، بەڵکو داوای لێبوردن دەکەم لەسەر ئەو هەڵە و گوناهانەم کە لەوانەیە لە دەمی بەجێهێنانی خزمەتگوزاری‌یەکانمدا دووچاریان بووبێتم.

مامۆستای بەڕێزم! لە دواهەمین دوو نامەتاندا گەلێ سوورن لەسەر وەڵامدانەوەی پرسیارێك کە پێشتر فەرمووبووتان..

دەڵێم: بەسەرچاو. بەڵام بەرامبەر بەم پرسیارە سەختە، جگە لە هانا بردن بۆ چاودێریی خوای گەورە و.. دەستگیرکردن لە سۆز و کەرەمی خواوەند و.. یارمەتی وەرگرتن نەبێت لە ڕۆحانییەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هیچی تر شك نابەم. چونکە من لەوپەڕی دەستەوسانی و هەژاریدام.

جا بۆ ئەوەی وەڵامەکەم لەگەڵ حەق و ڕاستیدا یەکاویەك دەربچێت، دەڵێم:

بێ گومان "وتە" پیرۆزەکان، کە بریسکانەوەی نووری قورئانی پیرۆزن، هەرچەند بەهۆی شێوازە بەرز و بڵندەکەیانەوە لە هەندێ شوێندا پێویستیان بە ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە هەیە، بەڵام - بە گشتی - هیچ کەموکوڕی‌یەکیان تێدا نی‌یە و، گشت توێژ و چینێکی خەڵکی دەتوانن بەشی خۆیان لێی بەهرەوەر بن و سوودی لێ وەربگرن. بەڵگەش لەسەر ڕاستیی ئەم بۆچوون و قەناعەتەمان ئەوەیە کە تا ئێستا هیچ کەسێك ڕەخنەی لێ نەگرتوون، بەڵکو گشت مەشرەب و ڕێبازەکان ڕەزامەندی‌یان لە ئاستدا دەربڕیوە و، مولحیدانیش لە بەرامبەریانەوە کەڕ و لاڵ ماونەتەوە.

وا لە خوارەوەدا بەپێی بیر و بۆچوونی خۆم ئەو بەڵگانە دەنووسم کە دەیسەلمێنن ئەرکی سەرشانی بەڕێزتان تەواو نەبووە:

یەکەم:

ئەو کارەی خراوەتە ئەستۆی زانایانەوە بریتی‌یە لە ئاشکرا کردنی "حەق" و بێ دەنگ نەبوون لە ناحەقی لە دەمی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی بیدعەتەکاندا، هەروەك لە فەرموودەی پیرۆزدا هەڕەشەی سزای خوای گەورە کراوە لەو کەسەی کە لە ئاستی ئاشکرا کردنی "حەق"دا بێ دەنگ دەبێت.

دووهەم:

ئێمە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرمان ﷺ خراوەتە ئەستۆ. جا ئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرنگە پێویستی‌یەکە هەتا کۆتایی تەمەن بەردەوامە.

سێ‌هەم:

ڕاپەڕاندنی ئەم خزمەتە بە ڕا و بۆچوونی جەنابتانەوە نەبەستراوە، بەڵکو ئەم خزمەتە ئەرکێکە ئێوەی تێدا خراونەتە کار و هەرگیز دەستی ئێوەی تێدا نی‌یە. بۆیە من لە قەناعەتێکی وەها تەواودام کە ئەگەر ئەرکی سەرشانی مامۆستای بەڕێزم تەواو ببێت خوای گەورە ئیلهامی دڵی دەکات کە تەواو بووە، هەروەك ڕاگەیەنەری قورئانی پیرۆز: خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانیان محەممەدی پێغەمبەر و سەروەرمان ﷺ بە ئایەتی: ﴿أَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ (المائدة:٣) هەواڵی تەواوبوونی ئەرکی پێغەمبەرێتیی پێ ڕاگەیەنرا.

چوارەم:

ئاراستە نەکردنی ڕەخنە تا ئێستا لە "وتەکان" ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم بارە تا دوایی هەر وا دەمێنێتەوە. نەخێر.. ئێوە - ئەی مامۆستای بەڕێزم! - هەتا لە ژیاندا مابن ئەرکی وەڵامدانەوەی ئەو هێرشانەتان لە ئەستۆدایە کە لەوانەیە بکرێنە سەر "وتەکان".

پێنجەم:

پێم وایە ئێوە وەڵامی ئەو پرسیارانە پشتگوێ ناخەن کە سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی "وتەکان" لە لایەن ئەو کەسانەی پەیوەندی‌یان پێیانەوە هەیە، ئاراستەت دەکرێن. خۆ ئەگەر هیچ هۆکارێکی تری جگە لەمە لە گۆڕێدا نەبێ، ئەوا هەر ئەم هۆکارە سەرزیادە بۆ ئەوەی کە نەتوانن دنیا فەرامۆش بکەن، هەرچەندەش خۆتان واتان پێ باش بێت.

شەشەم:

ئەو کەسانەی لەبەر خوای گەورە تۆیان خۆش دەوێت، گەلێ پرسیارت لە بارەی هەندێ لایەنی نووسینە بەنرخەکانت و ڕوونکردنەوە بەرزەکانی کۆرە

زانستی‌یەکانت ئاراستە دەکەن، خۆ هەموو ئەو ڕوونکردنەوانەش لە "وتەکان"دا بڵاو نەکراونەتەوە. ئەمەش بەڵگەیەکی بێ گومانە دەری دەخات کە ئەرکی سەرشانتان هێشتا تەواو نەبووە و خزمەتگوزاریی ئیمانیش کۆتایی پێ نەهاتووە.

وا چەند شتێك بۆ بەڕێزتان دەخەمە ڕوو:

لەو کاتانەدا کە خوای گەورە دەرفەتم بۆ دەڕەخسێنێت "وتەکان"ی نوور بۆ برایانم بخوێنمەوە، هەست و نەستەکانم جۆش دەخۆن. جا هیوادارم بوارم بدەن کە بیانخەمە پێش چاوی بەڕێزتان:

یەکەم: هەر کە پێنووس بە دەستەوە دەگرم تاکو ئەو هەستە جۆش خواردووانەم بۆ ئێوەی مامۆستای بەڕێزم بنووسم، هەست بە فراوان بوونێك دەکەم لە "گیان"ی خۆمدا، بە ڕادەیەك کە لەو دەمانەدا – بە بێ ویست و ئیختیاری خۆم – پێنووسەکەم ئەو هەست و نەستانە دەردەبڕێت!

دووهەم: بیرم کردەوە لەوەی کە ئەگەر هەموو کەسێك بیەوێت دوورەپەرێزی بگرێت و لە سووچێکی تاریکدا گۆشەگیر بێت، تاکو لە دەستی فروفێڵی دەروونی بەدخوازی – دوژمنی هەرە مەزنی خۆی – قوتار بێت و، لە فێڵی شەیتانەکانی جینني و ئینس خۆی ڕزگار بکات و بڕواتە ناو گۆشەی فەرامۆشی‌یەوە و، بەو جۆرە گشت ئەو بارودۆخە ناهەموار و سەختانە پشتگوێ بخات کە بەسەر جیهانی ئیسلامدا هاتوون بە ڕادەیەك کە هیچ کەسێك سوودی بۆ کەسی تر نەماوە..

گەر هەموو کەسێك بەم جۆرە خۆی بکێشێتە دواوە، ئەوا بڕیار بێت لە کاتێکی ئاوادا، من هەر بمێنمەوە و ئەم ڕاستی‌یانە بە برایانی ئایینم ڕابگەیەنم، تاکو خوای گەورە بە فەزڵ و بەخشش و شکۆمەندیی خۆی ڕەفتار و مامەڵەم لەگەڵدا بکات.

جا من وام پێ باش و بەسوودە کە لەو چەشنە کاتانەدا ئاوڕ لە خودی خۆم نەدەمەوە و هەر بیری لێ نەکەمەوە. ئایا حیکمەت لەمەدا چی‌یە؟

سێهەم: بۆچی هەردوو ناوی: "الرحمن و الرحيم" ڕۆشتوونەتە ناو "بەسمەلە"وە؟ ئایا ئەم دوو ناوە لە مەزنترین پلەی ناوە جوانەکاندان؟ یا خود هۆکار و حیکمەتێکی تر لە ئارادا هەیە؟

ئەم پرسیارەم لە دەمی نووسینی ئەم نامەیە بە زەیندا هات[١].

مامۆستای ئازیز و بەڕێزم!

نەك تەنها ئێمە، بەڵکو سەرجەمی جیهانی ئیسلامی پێویستی بە بوونی ئێوەیە. چونکە بە فەزڵ و بەخششی خوای گەورە ئێوە بوون بە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو "وتە" بەرزانەی کە لە نووری قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاون و بریسکاونەتەوە و.. هێز و پێز بە ئیمانی ئیمانداران دەدەن و.. بێ ئاگایان بە خەبەر دەهێنن و.. بۆ مەبەستی ڕێنمایی گومڕایان ڕێی ڕاست پیشان دەدەن و.. فەیلەسووفەکانیش دەمکوت و گرفتاری سەرسامی و حەپەسان دەکەن.

لە خوای پەروەردگاری میهرەبان دەپاڕێمەوە کە درێژە بە لەشساغی و تەندروستیی مامۆستای بەڕێزمان بدات و، بۆ نەتەوەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بیهێڵێت.

آمين بحرمة سيد المرسلين

خلووصی

* * *

(خوای گەورە ویستی لەسەر هەر شتێك بوو، ئەنجامی دەدات)

پشت بە خوای گەورە، هەر لە یەکەم شەوی گەیشتنم بە ئێرە دەستم داوەتە خوێندنەوەی "پەیامەکانی نوور" بۆ میوانەکانم لە نێوان نوێژی شێوان و خەوتناندا، لەو ژوورەی کە باوکم بۆ میوان تەرخانی کردووە.

مامۆستای خۆشەویستم!

هەروەك زووتر عەرزم کردن، لەو باوەڕەدام کە من بۆ یەك ئامانج دەژیم، ئەویش یارمەتیدانێکی جوزئی‌یە بۆ بەجێهێنانی ئەرکی گرنگی سەرشانی مامۆستای بەڕێزم کە بانگهێشتی خەڵکی‌یە بۆ لای قورئانی پیرۆز. واتە من تەنها بۆ خزمەتێکی جوزئی دەژیم لە پێناوی قورئانی پیرۆزدا..

(١) لە مەکتووبی هەشتەمدا وەڵامی ئەم پرسیارانە دراوەتەوە. (وەرگێڕ)

لەبەر ئەوە، تکای تایبەتیم لە بەڕێزتان ئەوەیە کە هەتا لەوێ ماون لەو ڕێژنە و پیت و بەرەکەتانەی قورئان بێ بەش نەبم کە لە پێناوی بڵاوکردنەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیمان و ئیسلامدا لە قورئانی پیرۆز دەری دەهێنن و لێی بەهرەمەند دەبن. پشت بە خوا و بە دوعای بەڕێزتان لەمەولا خوای گەورە دەمگەیەنێتە ئەو ئاکامەی کە ئاواتمە و ئومێدەوارم پێی بگەم لە هەوڵ و تەقالامدا بۆ پەیامەکانی نوور، تاکو منیش وەکو "عەبدورڕەحمان"ی خوا لێخۆشبووم لێ بێت و، تا دوا هەناسەی ژیانم ئیمان و پشتگیریی خواوەندم دەستگیر بێت و، شوێن پێی پێغەمبەری مایەی شانازیی هەموو جیهان حەزرەتی "محمد المصطفى" ﷺ هەڵبگرم و، بە بەختەوەریی هەمیشەیی شاد ببم و، جێگەدار و هاوسێی مامۆستای بەڕێزم بم!

سەرداری بوونەوەران پێغەمبەری ئازیزمان حەزرەتی محەممەد ﷺ هۆی ڕاگەیاندنی قورئانی پیرۆز بوو بە سەرجەمی ئادەمیزاد. ئێوەش - ئەی مامۆستای بەڕێزم! - لەم سەردەمەدا و بە ناوی خوای گەورەوە، لە ڕێژنەی ئەو قورئانە پیرۆزەوە و لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە - هەرچەندەش دانراوی خۆتانن - ڕووی گوفتار ئاراستەی مرۆڤی بێ ئاگای ئەم سەردەم و ڕۆژگارە دەکەن.

لەبەر ئەوە، من لەو باوەڕەدام ئەو پەروەردگارە دانا و میهرەبانەی کە ئێوەی لەم بوارەدا خستووەتە کار، هەرگیز نایەڵێت ئەو نوورانە فەرامۆش و پێ شێل بکرێن، بەڵکو لە نێوان کەسانی وا فانیدا کە هەر هیچ حسابێکیان بۆ ناکرێت، چەندین کەس بە چەندەها پلەی جیاجیا دەنێرێت کە ئەو نوورانە بگرنە ئەستۆیان و بیانپارێزن و ڕایان بگەیەنن و بڵاویان بکەنەوە.

خلووصی

* * *

(داخوازی‌یەکانی ڕزگارکردنی ئیمان)

بەڵێ، سوپاس بۆ خوا، من ڕێگایەکی ڕاست و بەرزم گرتووەتەبەر کە ئایینی ئیسلامە و.. سەرچاوەیەکم هەیە لێی هەڵدەگۆزم کە مەشرەبی "کۆڵەواری" و

"هەژاری"یە لە بەردەم میهرەبانیی خوای گەورەدا و.. دوای پێشەوایەکی مەزن کەوتووم کە پێغەمبەری ئازیزمان سەرداری پێغەمبەرانە ﷺ و.. ڕێنمایی لە ڕابەرێکی گەورە وەردەگرم کە قورئانی پیرۆزە و.. ڕێبازێکی وەها بەنرخم گرتووەتە بەر کە چەشنی سەربازی ئێشکگری سنووری ئیسلام(مُرابــط)، لە یەك خوولەکدا دەمگەیەنێتە پلـەی "ویلایەت". چونکە مامۆستاکەم من و هەموو مرۆڤێکی ژیری تێگەیاندووە کە ئەم سەردەمە سەردەمی دەربازکردنی ئیمانە نەك هی گرتنەبەری ڕێی تەسەووف. ئەوەتا دەڵێت:

(مافی تەواو بە پێنج فەرزەکانی نوێژی ڕۆژانەت بدە و، زیکرەکانی دوایان بخوێنە و، شوێن سوننەتی پیرۆز بکەوە و، لە حەوت گوناهە گەورەکان دوورە پەرێز بە).

منیش بە سەرجەمی "گیان" و "دڵ"ی خۆم بە گوێم کرد و، بەدەم ئامۆژگارییەکەیەوە ڕۆشتم و، وتم:

"بەڵێ ئەی مامۆستای بەڕێزم"!

ئەم "بەڵێ"یەشم چ بۆ ئەم وانەیە و چ بۆ وانەکانی تر وت کە لە پەیامەکانی نوورەوە وەرمگرتوون.. "بەڵێ"م بۆ ئەو ڕاستییانە وت کە مامۆستا لە نووری قورئانی پیرۆزەوە هەڵی گۆزیون و منیش پڕ بە دڵ تەسدیقم کردوون.

جا ئیتر وشەی "مامۆستا"م لە گفتوگۆدا بۆ ئەو کەسە بەکارهێنا کە ئەم وانەی حەقیقەتەی دادام، ئەو وشەیەی کە لە سەرانسەری ژیانمدا جگە لەو بۆ کەسی ترم بەکار نەهێناوە. لەمەشدا پێکاومە و بەهەڵەدا نەچووم!

خلووصی

* * *

(دەبێ گوێ بیست بۆ وانەی پەیامەکان بدۆزمەوە)

بە فەزڵی خوای گەورە دیاریی مانگی ڕەمەزان، واتە: "هەڵوێستی یەکەمی وتەی سی و دووهەم"م بە تەواوی نووسییەوە. خۆ ئەگەر خوای گەورە پشتگیرم بێت ئەوا لەو ماوەیەی دەستنیشانتان کردووە پەیامەکانی تریش دەنووسمەوە.

ئەم وتە بەرز و بەنرخ و نوورانی‌یانە شایانی ئەوەن بە جوانترین خەت، تەنانەت بە ئاوی زێڕ بنووسرێنەوە. کەچی ئەم کۆڵـەوارە دەیاننووسێتەوە کە دەستخەت و نووسینی مەگەر هێندەی بخوێنرێتەوە دەنا جوانی‌یان تێدا نی‌یە، تەنانەت هەڵـەش لـە نووسینەکانیدا دەکات. جا نووسینەوەی ئەم پەیامە بەنرخانە لـە لایەن کەسێکی کۆڵەواری وەك منەوە، هانم دەدات پتر سوپاس و شوکرانەم بۆ خـوای گەورە زیاد بکەم.

لەبەر ئەوەی کە لەمەولا بە جەستە دوور دەبم لـە ئاوڕلێدانەوەی پـڕ سـۆز و میهرەبانیتان و، لەو سلاوە گەرموگوڕانەی کە بە هەموو ڕێگایەك دەیـاننێرن و، لـە فەرمانەکانتان کە وەك ڕوونکردنـەوە و لێکدانـەوە و پاشـکۆ و پـەراوێز وان بـۆ پەیامەکانی نوور.. ئەوا گەلـێ ئازار دەچێژم..

بەلام نابێت بەم جۆرە بـیر بکەمەوە، بەڵکو دەڵێـم: لـە هـەر شـوێنێکدا بم هـەوڵ دەدەم کەسانێك بدۆزمەوە گوێ بۆ ئەو دەرسـانە ڕابگـرن کە بەڕێزتان لــە ژێـر چاودێریی خوای گەورەدا دەیانڵێنەوە، بێ ئەوەی لە ڕێی بلاوکردنەوەی حەقیقەتدا ئـاوڕ لـە کـۆڵەواری و هـەژاریی خۆم بدەمەوە. بەڵێ، دەبێـت، بە فـەزلی خـوای گەورە و پاشان بە بەرەکەتی دوعـا و نزای ئێـوە، لـە دەرگانـەی هـەموو هۆکـارێك بدەم. هەر تەنها بەمە دڵدانەوە و دڵنەوایی خۆم دەکەم.

لەگەڵ ئەمەشدا، من لـە ڕوویـەکی تـرەوە خەفـەتبارم، چونکـە کارمـەندی و فەرمانبەری‌یەکانی دنیـام تـا ڕادەیەك ڕێـی سـەرقاڵ بـوونم بـە "وتـەکان"ەوە لــێ دەگرێت، ئـەو وتـە نوورانی‌یانـەی کـە فێـرەتم پێیـان دەحەوێتـەوە و کەمەندکێشــی ڕاستی‌یەکانیان دەبم. بەلام چار نی‌یە، هەر ڕۆژێك لە تەمەن دەڕوات بـە شێوەیەکی ئاشکراتر ڕووی بێ کـەڵك و فـانیی دنیـام لــێ دەردەکـەوێت و خەفـەت بـۆ ئـەو کاتانەی پێشووی ژیانم دەخۆم کە لە پێناوی ژیانی هەمیشەییدا بەکارم نەهێناون.

لەبەر ئەوە، خەمی زۆر بۆ لێکدابڕانی ڕواڵەتیمان نـاخۆم، بە تایبـەت دوای ئـەو مژدەیەی کـە مامۆستای خۆشەویستم لە دوا وانەیدا بۆم - بە دڵنیاییەکی تـەواو -

سەبارەت بە تام و چێژی هەمیشەیی ئەودنیا ڕایگەیاند کە: بە چەندین پلەی لەژمارەبەدەر لە سەرووی تام و لەزەتەکانی ئەم ژیانە فانی‌یەی ئێرەوەیە.
خلووصی

* * *

(لەنگەرگرتن لە کەناری ئارامی و ئاسایشدا)

ئەو کتێبە - وەك هاوونەکانی - نووسراوێکی ڕووناك و پڕ لە دانستە و، پشت بەخوا دەبێت بە دەرمان و مەڵهەمێکی سارێژکاری شیفابەخش بۆ دەردێکی کۆمەڵایەتی کە نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ پێوەی دەتلێنەوە.

هەروەك خۆتان فەرمووتان: کتێبی "وتەکان"م - کە ڕاستەوخۆ لە نووری قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون - پیشانی (فلان کەس) دا و چەند وتەیەکم بۆ خوێندەوە، ئەویش تەسدیقی کردن. لەمەولاش هەر کاتێ دەرفەتم بۆ بڕەخسێت هەر بۆی دەخوێنمەوە.

من لە شوکرانەی ئەو نیعمەتە زۆرە لە ژمارە بەدەرانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوم کۆڵەوار و دەستەوسانم، چونکە لە کاتێکدا کە من گیرۆدەی گوناهـ و تاوان بووبووم، ئێوە - ئەی مامۆستای بەڕێزم! - بە ئیزنی خوای گەورە و بەهۆی "وتەکان"ەوە لە تاریکی‌یەوە بەرە و ڕووناکی دەرتان هێنام.

لە کاتێکدا کە تەمەنی پێشووم لە سۆراخی دۆزینەوەی ڕاستیدا بەسەر دەبرد، پێنج ساڵ لەمەوبەر قەدەری خوای گەورە منی لاواز و گوناهباری بەرەو تەریقەتی نەقشبەندی دایەبەر، ئەو تەریقەتەی کە ڕووی لە "شێخ محەممەدی کوفرەوی"یە[1] و، ئەویش لە شاهی نەقشبەندی وەرگرتووە[2]. بەڵام پاش ماوەیەك و دوای

(١) زانایەکی مەزن و پیاوچاکێکی ناوداری کوردستانی باکوورە. خەڵکی گوندی "کوفرە"ی سەر بە پارێزگای "سیعرد"ە. دواتر لە "بەتلیس" نیشتەجێ بووە تا کۆچی دوایی لە ساڵی (١٨٧٩ز-١٣١٣ك).
(وەرگێڕ)

(٢) شاهی نەقشبەند ناوی (محەممەدی کوڕی محەممەد)ە و ناسراوە بە (خواجە محەممەد بەهائەددین) و

سەرهەڵدانی تاریکی‌یەکی کتوپڕی بەسەر دڵدا، ڕێم لێ گیرا و، لە ناوەندی ڕێگایەکی تاریك و هەڵەت و دڕکاویدا ئەم بێ دەستەڵاتە دەتلایەوە. تا لەم کاتەدا، بەهۆی نووری "وتەکان"ەوە کە لە لایەن جەنابتانەوە دانراوە، لەو تاریکی و گێژاوە خنکێنەرانە ڕزگار بووم و، بەرەو ڕووناکی و بەختەوەری.. بەرەو کەناری بێ وەیی، پەڕیمەوە و لەنگەرم گرت.

کەواتە:

الحمد لله.. هذا من فضل ربي!

ئێوە فەرمووتان: ئەم کات و سەردەمە سەردەمی ڕزگار کردنی ئیمانە..

بەڵێ مامۆستای بەڕێزم! فەرمایشتەکەتان لەسەر چاو و سەرمانە.

خلووصی

* * *

(گرنگیی خوێندنەوەی پەیامی: موعجیزاتی ئەحمەدی)

ئەم پەیامە(مەکتووبی نۆزدەهەم) موعجیزە مەزنەکانی پێغەمبەری ئازیز و خۆشەویستی ﷺ گرتووەتە خۆ. ناردنیشی - بە تایبەتی - بۆ من، ژیانێکی نوێی تێدا بووژاندمەوە. جگە لەوەی کە خوێندنەوەشی سەرجەمی هەست و سۆزەکانم دەورووژێنێت و، بەخوڕ فرمێسکی گەرموگوڕم پێ هەڵدەڕێژێت.

خلووصی

* * *

---

دامەزرێنەری (تەریقەتی نەقشبەندی)یە. لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ٧١٧ك لە گوندی (قەصری عاریفان)ی نزیکی (بوخارا) کە پێشی دەوترێت: (قەصری هیندوان) لە دایك بووە و لە (سەمەرقەند) خوێندوویەتی و چەندین شوێنی تر گەڕاوە و بەهرەمەندی دەرس و پەروەردەی گەلێ زانا و پیاوباشی سەردەمی خۆی بووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بوخارا و لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ژنی هێناوە. دوو جاریش حەجی کردووە و تا کۆتایی ژیانی لە بوخارادا ماوەتەوە و، هەر لەوێش (تەریقەتی نەقشبەندی)ی دامەزراندووە. لە بەرواری (شەوی دووشەممە ٣/ڕەبیعی یەکەم/٧٩١ك) و لە سەرەتای تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گوندەکەی خۆی (قەصری عاریفان) ئەسپاردەی خاك کراوە. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، وەك: (رسالة الواردات)، (الأوراد البهائية)، (حیاتنامە)، (دلیل العاشقین). (وەرگێڕ)

(چەند ڕابەرێکی مەعنەوی)

"بڕگەیەك لە نامەیەکی عەبدولمەجیدی برام"[(١)]

دەستەکانتان ماچ دەکەم و ئومێدەواری دوعا و نزاتانم. نووسراوە تازەکەتانم بە دەست گەیشت کە لەمەولا دەبێت بە مامۆستا و ڕابەرێکی بەرز و بە توانا بۆ عەبدولمەجیدی کۆڵەوار و دەستەوسان کە وازی لە دنیا هێناوە.

بەمەش مژدە بە خۆم دەدەم و دڵنەوایی خۆم دەکەم و دەڵێم: گەر مامۆستایەکم لەدەست چوو بێت ڕووبەڕوو قسەم لەگەڵ بکات، ئەوا چەندین ڕابەر و مامۆستای مەعنەویی زۆر و زەبەندەم دەست کەوتووە.

بە ڕاستی ئەم پەیامانە چەند نووسراوێکی نوورانیی وەهان کە مرۆڤ بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی دەکەن. دەك خواتان لێ ڕازی بێت.

عەبدولمەجید

* * *

(پلەکانی خۆشویستن لە پێناوی خوای گەورەدا)

بەڵێ، دوو لایەن هەن کە دڵنەوایی خۆمیان پێ دەکەم:

یەکەم: هاودەمیمان پێکەوە بە چەشنێکی مەعنەوی و لە ڕێی "وتە" پیرۆزەکانەوە کە لەبەر دەستماندان.

دووهەم: باوەڕمان بەوەی کە خۆشەویستیی نێوانمان - بە فەزڵی خوای گەورە - لە پلەی: "الحب في الله"دایە!

لەسەر بناغەی ئەمە، مەزنترین دیاری کە چ ئەمڕۆ چ سبەینێ پێشکەشی بەڕێزتانی بکەم بریتی‌یە لەوەی کە ئەو وانە ئیمانی‌یانەی ئێوە فێرتان کردین لە بریی

(١) بچووکترینی براکانی مامۆستا نوورسی‌یە. بەشێکی لە پەیامەکانی نوور کردووە بە عەرەبی، هەروەك "إشارات الإعجاز" و "المثنوي العربي النوري"یشی کردووە بە تورکی. لە پێشدا مامۆستای زمانی عەرەبی و، پاشان موفتی و، ئنجا مامۆستای زانستە ئیسلامی‌یەکان بووە لە پەیمانگای بالای شاری "قونیا". لە سالی ١٩٦٧ از لە تەمەنی هەشتا و سێ سالیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

خۆتان و بە گوێرەی توانا، بە ئیماندارانی ڕابگەیەنم و، ئەم خۆشەویستی‌یە ڕاستەقینەیەش کە خوای گەورە پێی بەخشیوین، تا ئەبەد و هەتا هەتایە هەڵی بگرم و پارێزگاریی لێ بکەم.

جا بەرامبەر بەمە، لە دەرگانەی پەروەردگاری بەخشندەی میهرەبان کە "أحسن الخالقين وأكرم الأكرمين وأرحـــم الراحمـــين"ە دەپاڕێمەوە کە بە ئەنجامەکانی ئەم خۆشەویستی‌یە شاد و بەهرەمەندمان بکات، ئەوانەی کە لە "هەڵوێستی سێ‌هەمی وتەی سی و دووهەم"دا ڕوون کراونەتەوە.

من و "سەیید حەققی" کە لە ڕێی "ئیمانی تەحقیقی"دا بە یەك گەیشتووین، بڕیارمان داوە ڕێبازی حەق و ڕاستگۆیی و ئیخلاس بگرینەبەر.

خلووصی

* * *

(نوورەکان فەرامۆش ناکرێن)

ئەو وتانەی کە وەك ئەمانەتێك بە من سپێرراون، پڕ بە دڵ ئومێدەوارم کە بە ئیزنی خوای گەورە و بەرەکەتی دوعای بەڕێزتان بە گوێی کەسانی قەدرزان و نرخ شناسیاندا بدەم و ڕایان بگەیەنم.

ئەی مامۆستای بەڕێزم! دڵنیا بن کە ئەم نوورانە هەرگیز پشتگوێ ناخرێن و فەرامۆش ناکرێن، چونکە ئەو بەدیهێنەرە بەخشندە و میهرەبانەی کە لە ڕێگای خزمەتگوزارەکەی قورئانەوە خستنیە بەرچاوی جیهان، هەر ئەویش دەیانپارێزێت، تەنانەت بە کەسانێکی دەستەوسان و کۆڵەواری وەك ئێمە و ئەوانەش کە هەر بە خەیاڵدا نایەن.

من لەو قەناعەتەدام کە هەرکات خزمەتگوزارانی قورئان بڵێن: بەهۆی هەوڵ و کۆششی خۆمانەوە ئەم بەهرەیەمان بەدەست هێناوە، هەر لەو دەمەدا خوای گەورە ئەو خزمەتە لەوان دەسێنێتەوە و بە کەسانێکی تری دەسپێرێت کە شایانی بن، با لە ڕواڵەتیشدا لاواز دیار بن و بە شایستەی ئەو خزمەتە مەزنە دەرنەکەون.

لەبەر ئەوە، تکا لە برایانی ئەوێم دەکەم:

بە پەیوەندییەکی پتەو پەیوەستی پەیامەکانی نوور بن و خۆیانی پێوە گرێ بدەن.

خلووصی

* * *

(کاتە پیرۆزەکان)

لەو کاتانەدا کە بە چاودێری و توانا و لوتفی خوای پەروەردگار دەتوانم خەریکی خوێندنەوەی پەیام و نووسراوەکانی نوور بیم و، بیانووسمەوە و، بڵاویان بکەمەوە و بەپێی توانا بە خەڵکیان ڕابگەیەنم و، ئەم چەشنە کارە پڕ لە خێر و چاکانە ئەنجام بدەم، ئا لەو دەرفەتانەدا کە بۆ سوودی خەڵکی دەیانقۆزمەوە، هەست دەکەم منی هەژار یەکەم کەسم کە سوودیان لێ وەردەگرم و لێیان بەهرەمەند دەبم.

لەبەر ئەوە، پێم وایە ئەو کاتانەم گەلێ پیرۆزن و، کە تەواو دەبن و بەسەر دەچن گەلێ خەمیان بۆ دەخۆم و ئازاری جودابیان دەچێژم و، لە ناخی دڵمەوە ئاواتەخوازم کە هەمیشە لە سایەی ئەو ساتانەدا بمێنمەوە و هەرگیز کۆتاییان پێ نەیەت.

بەڵام چار چییە؟ تەنها ئەوەندەم لە توانادایە کە لەو کاتە سوودمەندانەی ئاوا بە خێرایی تێپەڕ دەبن زەینی خۆم خاوێن بکەمەوە و ڕووەو نوورەکان خۆم ڕابگرم. چونکە لەو دەمانەدا خۆم لە بەرامبەر چەند پەیامێکی وەها دەبینمەوە کە لە موعجیزاتی قورئانی پیرۆز دەدوێن و، هەست دەکەم لە قوتابخانەی مامۆستای ئازیزم و لە باخچە(روضة)ی خاوێنی سەرداری گەردوون پێغەمبەری ئازیزماندا ﷺ ئامادەم و، لە کۆتاییدا هەست دەکەم کە بۆ حوزووری خواوەندی خاوێن لە جێ و شوێن بەرز دەبمەوە!

لەبەر ئەم هۆیە، ئومێدەوارم کە ئەو دەم و ساتانەی تیایاندا خەریکی پەیامەکانی نوور نابم، لەسەر ژیانم حساب نەکرێن!

خلووصی

* * *

(پەنجەرەکانی نوور)

حەفتەی پێشوو "پاشکۆی یەکەم و دووهەمی مەکتووبی بیست و چوارەم"م بەسەر دوو کۆمەڵدا - بە جیا جیا - خوێندەوە و، گوێ بیستان لە سەرسوورِماندا وەك مەستیان لێ هات و، منی هەژاریش بەر تیشکی نووری ئیعجازی قورئان کەوتم و، لە دەمی خوێندنەوەدا ڕووناکترینی ئەو پەیامانە موتالا دەکەم کە لە "وتەکان" و "مەکتووبات"ی نووردا درەخشانترین پەیامن.

ئەمڕۆی هەینی وتەی یازدەهەم و سیازدەهەمم بۆ "کاك فەتحی"ی هاوسێمان خوێندەوە.

لەو کاتانەدا کە دەرفەتم بۆ دەڕەخسێت خۆم لە کار و سەرقاڵیی دنیا بکێشمەوە، خێرا دەڕۆمە بەر پەنجەرە کراوەکانی نوور(وتەکان) و، خۆراکی مەعنەویی گیانی خۆمیان لێ وەردەگرم و، هەوڵ دەدەم کەسێك بدۆزمەوە تاکو بەویشی ڕابگەیەنم.

خلووصی

* * *

(پەیامەکان پێویستییەکانی سەردەم جێبەجێ دەکەن)

بە دڵێکی شادمانەوە مەکتووبی بیست و شەشەمم بەدەست گەیشت و، زۆر بە وردی و لەسەرخۆیی و بەوپەڕی تاسەمەندی و لەزەت و خۆشەویستی و شەوقەوە چەندەها جار خوێندمەوە. لە کۆتاییدا لە دەرگانەی ئەو پەروەردگارە بەدیهێنەر و

میهرەبانەدا لالأمەوە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي لَوْلا دُعَاؤُكُم﴾ (الفرقان:٧٧) و، لە دەمی کۆڵەواری و هەژاری‌یەکی تەواودا و بە تاسە و شەوقێکی گەرموگوڕ و ئیخلاس و نیازی خاوێن و بە زمانی پەیوەندیی بەندایەتیم بەو خواوەندەوە، لێی پاڕامەوە کە لە سەرجەمی خزمەتە ماددی و مەعنەوی و ئاشکرا و پەنهان و دنیا و قیامەتی‌یە پڕ ئیخلاس و بێگەردەکانتاندا سەرتان بخات و، بە ڕوونی و ئاشکرایی ئەو نوورانە بەناو ئەهلی ئیمان و قورئاندا بڵاو بکاتەوە و، بە لوتف و کەرەمی فراوانی، لای خۆی تۆماریان بکات و، لە هەردوو دنیادا عیززەت و سەربەرزی بە مامۆستای بەڕێزیشمان ببەخشێت.

ئومێدەوارم ئەم نزایەم بکەوێتە بەر نووری ئایەتی:

﴿أُدْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر:٦٠).

مامۆستای بەڕێزم!

ئایا ئەو شتەی لە ئێمەوە چاوەڕوانی دەکەیت هەر دوعا و پاڕانەوە نی‌یە؟!

ئەم هەژارە بە تاقیکردنەوەی خۆی دڵنیاییەکی تەواوی بۆ دروست بووە کە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ﴾ (الإسراء:٨١) دارای گەلێ موعجیزەی نەمر و هەمیشەییە. ئەوەبوو خوای گەورە بۆی ڕەخساندم کە ئەو پەیامانەی ئەم جارە بۆت ناردم، بۆ چەندەها تاقم و کۆمەڵی جیاجیا و جۆراوجۆریان بخوێنمەوە کە هەندێکیان زانایانیشیان لە نێواندا بوون. هەرهەموویان ڕێز و سەرسووڕمانی مەزنی خۆیان لە ئاستیاندا نواند!

من پێم وایە کە هەرچی‌یەك لە کۆمەڵە پەیامەکانی "وتەکان" و "مەکتووبات"ی نووردا هەن، بۆ پێویستی‌یەکانی ئەم سەردەمەن و، دەتوانن قەناعەت بە سەرجەم دەستە و چینەکانی ئایینداران ببەخشن، بەڵکو مولحیدانیش دەمکوت بکەن، بە مەرجێ لە عیناد و سەرسەختیدا بە تەواوی ڕۆ نەچوو بن. لەگەڵ ئەمەشدا، بە دووری نازانم کەسانی دووچاربووی خۆشەویستیی ئەو دنیایەی کە خەڵکی بۆ

سوود و بەرژەوەندی و هەڵپە کردن بۆ ژیان هان دەدات و، گرفتاربووانی کوفر و سەرسەختی و بێ ئاگایی و تەمبەڵی و شیرك و گومرایی و ئەم چەشنە گوناهانە.. بە دووری نازانم کە چاویان لە ئاستی ئەو نوورانەدا بنووقێنن و ئینکاری و نەفامی و شێتی بەرامبەر بەو حەق و ڕاستی‌یانە بنوێنن کە بە چاو دەیانبینن.

بەو واتایەی کە ئەم میوانخانەیەی خوای گەورە لەو جۆرە ئاژەڵانە خاڵی نی‌یە کە لە ڕوخساری ئادەمیزاددان!

بێ گومان گەر خوای گەورە کەسانێکی وای بناردایە کە ئەم نوورانەیان بڵاو بکردایەتەوە، ئەوا ئەو وڕێنە و گەلحۆییانە پتر دەکەوتنە ڕوو.

خلووصی

* * *

(پلەکانی سەرسوورمان و ڕێزنان لە پەیامەکان)

"ئەمەش بڕگەیەکە لە نووسینی عەبدولمەجیدی برام"

ئەم پەیامانە لە لایەن بازرگان و کاسبکاران و سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵەوە ڕێز و سەرسوورمانیان بەدەست هێناوە و، هەر کەسێك دەیانبینێت سەری لێیان سوور دەمێنێت، چونکە بواری ڕەخنەیان بۆ کەس نەهێشتووەتەوە. بەڵام پلەکانی سەرسوورمان و ڕێز دەربڕین بەپێی پەی بردن و تێگەیشتن دەگۆڕێت و جیاواز دەردەچێت.

هەموو کەسێك دەتوانێت بە ئەندازەی پلەی تێگەیشتنی لێیان، نرخیان بزانێت و ڕێزیان لێ بنێت.

عەبدولمەجید

* * *

(دوا نامە بۆ مامی بەڕێز)

نامەكـەی "عـەبدورڕەحمان"ی بـرازام كـە لـە پێـش "خلووصی"دا قوتابیم بوو، لە تەمـەنی بیست و شـەش سـاڵیدا وەفاتی كرد و، دوو مانگ پێش كۆچی دوایی نووسیویەتی:

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

دەستە پیرۆزەكانت ماچ دەكەم و تكاكاری نزا خاوێنەكانتانم.

لە ڕێی بەڕێز كاك "تەحسین"ەوە هەواڵی سەلامەتیتانم لەگەڵ پەیامی "وتەی دەهەم"دا بەدەست گەیشت، ئەو وتەیەی كە مرۆڤ بۆ لای خێر و ڕێی ڕاست ڕێنمایی دەكات. پێزانین و سوپاسی زۆری خۆمتان پێشكەش دەكەم.

هەرچەند پەشیمانم لەوەی كە بێ فەرمانیم كردن و لێتان جیا بوومەوە و لەم ڕووەوە شایانی هەموو گلەییەكم، بەڵام دەبێ بزانین كە ئەم لێكدابڕانە بە ویست و تەقدیری خوای گەورە ڕووی داوە و خێری هەردوولامانی تێدا بووە.

جا بەم لێك جیابوونەوەیەی كە بە نەزانیی من ڕووی دا، سووچ و گوناهێكم هاتە ئەستۆ و لە ئەنجامی ئەوەشدا سزا درام. بەڵام پشت بە خوا لەمەولا كارێ ناكەم لەسەری سزا بدرێم. بۆیە داوای لێبووردنتان لێ دەكەم و ئومێدەواری دوعاتانم.

مامی ئازیزم!

وا ئەمەی خوارەوەشتان بۆ ڕوون دەكەمەوە:

بە فەزڵی خوای گەورە و بە چاودێری و هیممەت و غیرەتی ئێوە، خۆمم لە هەموو كردار و ڕەفتارێك پاراستووە كە زیان بە دواڕۆژم بگەیەنێت. پشت بە خوا هەر وەهاش دەمێنمەوە. هەرچەند من گەلێ دەردیسەریی بێ نرخیی دنیا و تاڵی و

شیرینی و خۆشی و ناخۆشیی زۆرم چەشت و هەموویانم بەسەربردن. لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ کاتێك ئەوەم لە یاد نەچووە کە هەموو ئەوانە تەواو دەبن و تیا دەچن و بێ ئەنجامن و تەپ و تۆزی دەم بان و، زانیومە کە ئەو خێر و لەزەت و خۆشی‌یانەی دنیا کە بۆ خوای گەورە و لە پێناوی ئەودا نین ئەنجامی ناهەمواریان هەیە، کە نابووتی و سزای سەختی خواوەندە. بەڵام ئەو ئەرك و ماندوویی و ئازارانەی کە لە پێناوی خوای گەورە و فەرمانە مەزنەکانیدا دێنە رێی مرۆڤ، ئەنجامەکانیان چەندین لەزەت و پاداشتی هەمیشەییە.

جا لەبەر ئەوەی من لەو باوەڕەدا بووم و بەو جۆرە بیرم دەکردەوە، ئەوا بە فەزڵی خوای گەورە خۆمم لە هەموو کردارێکی خراپ و ناڕەوا پاراستووە. ئەم هەست و پەروەردەیەش ئەنجامی ماندووبوونی ئێوەن لە پێگەیاندن و پەروەردەی مندا. لەبەر ئەوەی من ئەم ڕاستی‌یە ئاوا بە روونی دەبینم، ئەوا لە پێناوی خوای گەورەدا ئارام لەسەر گشت ئەو ئازار و پەژارانە دەگرم کە پێیانەوە دەتلێمەوە.

ئێستاش ئەی مامی ئازیز و مامۆستای بەتوانام!

موجاهەدەی دەروونیی بەدخوازم و ملنەدانم بۆ ئارەزووە بەدئەنجام و ئازاربەخشەکانی، ناچاری ژنهێنانیان کردم. ئێستا بە فەزڵی لوتف و میهر و کەرەمی خوای گەورە لە هەموو ڕوویەکەوە حەساومەتەوە، چونکە بۆ ئەوەی هیچ قسەیەکی نابەجێ نەبیستم و تووشی ڕەفتاری ناڕەوا نەبم تێکەڵاویی خەڵکی ناکەم و کاتەکانی دوای دەوامی ڕەسمیم لەماڵەوە بە شوکرانەبژێریی خوای گەورە بەسەر دەبەم.

لە کۆتاییدا - ئەی مامی ئازیزم! - مامۆستا و ڕابەری هەرە مەزنی من ئەو هەست و نەستەیە کە بەهۆی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە لە مندا دەهەژێت:

﴿ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾(یس:٦٥).

بەڵێ، هەر ئەم ئایەتە بوو کە لە خەوی بێ ئاگایی بێداری کردمەوە و، پاش ڕێنماییەکانی جەنابتان، ڕێی تاوان و کرداری چەپەڵ و خراپی لێ گرتم. لەو

باوەڕەدام کە ئەو ڕۆژە گەلێ نزیکە[1] و دوعای بەردەوامم ئەم نزایەیە کە: "اللـــهم لا تخرجنا من الدنيا إلاّ مع الشهادة والإيمـــان" و، ئەو ئیمانەش کە بڕوام لەسەری دامەزراوە بریتی‌یە لەوەی کە[2]: "آمنت بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخـــر وبالقدر خيره وشره من الله تعالى والبعث بعد الموت حـــق. أشـــهد أن لا إلـــه إلاّ الله وأشهد أنّ محمداً عبده ورسوله"[3].

برازاتان

**عەبدوڕڕەحـمان**

* * *

واتە "وتەی دەهەم" بـۆ ئەو وەك ڕابەرێکی ڕاستەقینەی لێهات کە ڕاستەوخۆ "عەبدوڕڕەحمان"ی بۆ پلەی "ویلایەت" بەرز کـردەوە و، زمـانی بەم سێ کەرامەتـە خستە گوفتـار.. هەشـت سـاڵ پێش ئێستا بەجێی هێشـتم.. بـەڵام توانیـی وتـەی دەهەمی دەست بکەوێت و، وەك خۆی لە سـەرەتای نامەکەیدا دەڵێـت، سـوودی زۆری پێ گەیـاند و خۆی لەو گوناهانە پێ پاك کردەوە کە لە ماوەی هەشت ساڵی ڕابوردوودا کەڵەکە بووبوون.

لە شوێنێکی تری نامەکەیدا - کە پێچرایەوە و نەهێنرا - لـە بـواری دەرخستنی شەوق و خۆشەویستیدا بۆ "وتەی دەهەم" دەڵێت:

"گشت ئەو وتانەم بۆ بنێرە کە داتناون، تاکو چ بـە دەسـتی خـۆم و چ بـە دەسـتی کەسانی تر یەکی سی دانەیان لەبەر بنووسینەوە، بۆ ئەوەی بڵاو بینەوە و نەفەوتێن".

بەم جۆرە، میراتگرێکی پاڵەوانی وەك ئەم قارەمانەم لەدەست دەرچوو..

دەسا "فاتیحە" بۆ ڕۆحیانەتی.

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) شایانی سەرنجدانە: هەواڵی مردنی خۆی ڕادەگەیەنێت! (دانەر)

(٢) ڕایدەگەیەنێت کە بە ئیمانەوە کۆچ دەکات. (دانەر)

(٣) باسکردنی ئەو وشە ئیمانی‌یانەی کە مرۆڤ لە سەرەمەرگدا دەیانڵێت لـە دوانامەکەیدا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە بە قارەمانی‌یەکی ناوازە و بێ وێنە ئیمانەکەی لەدەست ئەم دنیایە دەرباز کردووە و، هـەر ئاواش دنیا بەجێ دەهێڵێت. (دانەر)

پاشکۆی

# مەکتووبی بیست و حەوتەم

**(چێژی کۆڵەواری و هەژاری)**

**"بڕگەیەکە بە پێنووسی خلووصی"**

**هەموو ئیماندارێك، هەر کەسەو بەپێی پلەی چێژ و تێگەیشتنی خۆی، لە ڕێی بەسیرەتی ئیمانەکەیەوە پەی بەو شتانە دەبات کە لە ڕاستیدا "جوان"ن. بەڵام ئەو چێژ و لەزەتەی کە لە "کۆڵەواری" و "هەژاری"دان و، ئەو بەرزیەش کە "شەفەقەت" و "بیرکردنەوە" بەرهەمیان دەهێنن، هێندە بڵند و بەرزن کە لەگەڵ هیچ شتێکی تردا بەراورد ناکرێن.**

**لە پەروەردگاری میهرەبان و بەخشندە دەلالێمەوە کە ئەم ئەنجامە بەرز و بڵندەمان پیشان بدات. واتە بینینی ئەو پارچە ئەڵماسانەی کە ئێوە لە گەنجینەی تایبەتیی قورئانی پیرۆزەوە دەریان دەهێنن و پاشان بە دەستەواژە و داڕشتنی بەرزی خۆتان دەریان دەبڕن، بۆ زۆر کەسی خاوەن بەسیرەت ئاسان بکات و.. مەست و بێ ئاگایانیش بێدار بکاتەوە و.. سەرسام و سەرگەردانانیش ڕزگار بکات و.. خۆشی بخاتە ناو دڵی ئیماندارانەوە و.. مولحیدان و کافران و موشریکانیش بهێنێتە ناو بازنەی حەق و ڕاستی و ژیری و ویژدانەوە.**

**ئەی مامۆستای بەڕێزم!**

**جەنابتان تا چەندە شوکرانەبژێریی زیاتر پێشکەشی خوای گەورەی بەتوانا بکەن، هەر لەجێی خۆیدایە!**

**چونکە خوای گەورە یاریدەدەر و پشتیوانتان بووە کە لە ڕێی "دەستەوسانی" و "هەژاری"یەوە لە دەرگای کۆشك و تەلاری قورئانی پیرۆز ڕابووەستن و، لە گەنجینە تایبەتی‌یەکەیدا یەك لە دوای یەکی ئەو گەوهەر و مرواری‌یانە دەربهێنن کە نە بە چاو بینراون و نە گوێی هیچ کەسێکیش بیستوونی، بەڵام ئێوە دەیانبینن و**

مۆڵەت دەدرێن کە دەریان بهێنن و، لە پێشدا خۆتان تاوتوێیان دەکەن و تیایاندا رادەمێنن، ئنجا دەڵێن:

(خەڵکینە بروانن کە چۆن خوای گەورەی بەخشندە دەرگاکانی میوانخانەکەی خۆی بۆ خستوونەتە سەرپشت و، بە میهرەبانی‌یە گشتی‌یەکەشی جیهانەکانی دروست کردووە و، بە دانستی خۆشی ئێوەی بەدیهێناوە و بۆ ئەم جیهانەی ناردوون..

جا پەروەردگاری هەموو جیهانەکان: هەزار و سێ‌سەد ساڵ پێش ئێستا لە رێی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیەوە ﷺ حیکمەتی بەدیهێنان و، ئامانجی هاتنتان بۆ ئێرە و، ئەو ئەرکەش کە خراوەتە ئەستۆتان و، سەرجەمی کارمەندی و خزمەتگوزاری‌یەکانی بەندایەتی و، شتانی هاوچەشنی ئەمانەی بۆ روون کردوونەتەوە.. وا منیش لە لایەنی خۆمەوە ئەو فەرمانە بەرز و بریارە پیرۆزەتان بە زمانی خۆتان و بە چەشنێ کە بتوانن لێیان تێبگەن، پێ رادەگەیەنم.. دە فەرموون گوێیان لێ رابگرن. ئەگەر ئێوە ژیر و هۆشمەند و خاوەن دڵ و بەسیرەت و دارای هەست و شعوور و رەوشت و رەفتاری مرۆڤانە بن، ئەوا لە "راستی" تێدەگەن و دەگەڕێنەوە بۆ ناو بازنەی ئیمان).

بەڵێ مامۆستای بەرێزم!

ئێوە تەنها ئەم فەرمانانە رادەگەیەنن و، ئێمەش سوپاس بۆ خوا بەپێی توانا و لە نزیکەوە گوێ بیستی ئەو فەرمانانە بووین و کەسانی تریشمان بۆ بینین و پیشاندانیان هان داوە. چونکە ئێوە ئەو پارچە ئەڵماسانەتان پێش‌چاو خستین و لە بێ ئاگایی بێدارتان کردینەوە و، راستیتان تێگەیاندین و، بوون بە هۆکارێکی خێر تاکو ئێمەش رێی راستی و دروستی بدۆزینەوە و پێی ئاشنا بین. دەسا خوای گەورە - هەتا هەتایە - لێت رازی بێت.

ئێمە هەرچەندە هێشتا لە شەڕ و زیانی دەروونی بەدخواز و فروفێڵ و داوەکانی شەیتانەکانی جینی و ئینس رزگارمان نەبووە، بەڵام کاتێ لێدەبڕێین بۆ کار و کۆشش لە بواری ئەم خزمەتە قورئانی‌یە خاوێنەدا، هەست بە چێژ و لەزەت

دەکەین. خۆ ئەگەر لەم کارەدا قسوور و ناتەواویمان هەبێت و نەمانتوانیبێت لە ئاستی شایستەیی ئەم خزمەتە مەزنەدا کار بکەین، ئەوا هێندەمان بەسە کە – سوپاس بۆ خوا – کاری تێدا دەکەین. دیارە پاداشتی کردارەکانیش بەپێی نیازەکانە.

خلووصی

* * *

(لە بارەی وتەی بیست و یەکەمەوە)

برگەیەکە لە نامەکەی "صەبری" کە لە دەمی نووسینەوەی وتەی یەکەم و، بیست و یەکەم و، بیست و دووهەمدا نووسیویەتی.

گشت پەیامەکانی نوور، بەڵکو هەموو یەکێکیان، تەنانەت هەر یەك لە باس و بابەتەکانیان، گەلێ کێشە و گیروگرفتی زۆر و زەبەندە چارەسەر دەکەن و، لەو باوەڕەشدام کە ئەم دیاردەیە شتێکی بینراو و سەلمێنراوە. لەبەر ئەوە، هەر کەسێك بیەوێت لە دەریای ئەم ڕووناکی‌یانە نزیك بێتەوە، ئەوا وتەی "یەکەم و بیست و یەکەم و بیست و دووهەم" سەروزیادن بۆ لابردنی نەخۆشی‌یەکانی "دڵ"ی و ڕووناك کردنەوەی "گیان"ی و شادمانی و دڵخۆشی پێ بەخشینی، هەرچەندەش هێشتا دەستی بە پەیامەکانی تری – جگە لەمانە – نەگەیشتبێت.

چونکە وەك زانراوە:

"وتەی یەکەم": کلیلی تەوحیدە و..

کەرتی یەکەمی وتەی بیست و یەکەمیش: پلیکانەیەکە بەرەو بەهەشت و..

کەرتی دووهەمیشی: دەرمانخانەیەکی بێ وێنەیە لە ڕووی سارێژکردنی زامەکانی دڵی مرۆڤەوە، بە چەشنێك کە لە ڕێی ئیکسیری دەرمان و چارەسەرەکانیەوە سەرجەمی ئەو وەسوەسانە سەرکوت دەکات کە بە دەگمەن مرۆڤ ڕزگاری دەبێت لێیان. کەواتە ئەم کەرتەی دووهەمی وتەکە ڕێگایەکی ڕزگار بوونی ئەوتۆیە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە لێوار و کەناری ڕزگاری و سەلامەتیی هەمیشەیی،

بەهۆی ئەو ڕێژنە بەردەوام و ڕووناکی‌یە نەکوژاوە و هەتاهەتاییانەی قورئانی پیرۆزەوە کە ئاراستەی دڵ و ڕۆحی مرۆڤی دەکات..

بەڵام "وتەی بیست و دووهەم" بیروباوەڕ لە دڵدا دادەمەزرێنێت و، لە ڕێی بەڵگە و بریسکانەوە بێ وێنەکانیەوە توندوتۆڵی و هێز و پێز بە "ئیمان" دەدات.

صەبری

* * *

(پەیامەکان چۆن دەخوێنرێنەوە)؟

ئەمە بڕگەیەکی نامەکەی کاك "ڕەئفەت"ە[1].

"وتەکان"تان گەلێ بەرز و بڵندن و، ڕێگای ڕاست پیشانی سەرگەردان و سەرساماان دەدەن و، دەبێ زۆر بە وردی و سەرنجدان و هاودەم لەگەڵ شیکردنەوەی فیکری و بەگەڕخستنی ژیری، بخوێنرێنەوە. چونکە ئەو بەڵگە عەقلی و تەرازووە مەنتیقی‌یانەی کە ئێوە لەو وتانەدا دەیانخەنە ڕوو هەروەك چێژێکی بەتام و لەزەتیان تێدایە، سەرسووڕمانی مرۆڤیش بە ڕادەیەك دەورووژێنن کە هەتا زیاتر بیانخوێنێتەوە تاسەی بۆ خوێندنەوەیەکی تر زیاد دەبێت و، هەست بە تام و لەزەتێکی مەعنەویی نەبڕاوە دەکات و، هێندە هۆگریان دەبێت کە ناتوانێت دەستیان لێ هەڵبگرێت.

بۆیە تەنها یەك خوێندنەوە بەش ناکات، بەڵکو دەبێ بە بەردەوامی بخوێندرێنەوە.

ڕەئفەت

---

(١) ڕەئفەت بارووتچی (١٨٨٦-١٩٧٥ز) عەمیدێکی خانەنشینە و لە بارلادا پەیوەندیی بە مامۆستا نوورسی‌یەوە هەبووە و، لە بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر سالی ١٩٣٥" و "دەنیزلی ١٩٤٣" و "ئافیون ١٩٤٨" لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەند کراوە. لە وانەوتنەوە و فێرکاریی قورئانی پیرۆزدا گەلێ شارەزا بووە. پاشان لە مزگەوتێکی ئەستەمبوڵدا و تا کاتی لە دنیا دەرچوونی پێشنوێژ بووە. خوای گەورە لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

## پاشکۆی دووهەم

ئەمەی خوارەوە هەست و نەستی "بەکر ئاغا"ی برای قیامەتیمە، کە لە دەمی خوێندنەوەی وتەکاندا ئەو هەست و نەستانەی هاتوونەتە جۆش. هەر ئەم برایەش بوو بەهۆی بێدارکردنەوەی خەڵکی "ئیسپارتە" و ڕاکێشانی سەرنجیان بۆ لای نهێنییەکانی قورئان و، بەم خزمەتەشی ئەرکی چەند زانایەکی مەزنی ڕاپەڕاند، هەرچەندەش بۆ خۆی نەخوێندەوارە!

(کلیلی ڕووناکییەکان)

بۆ جەنابی مامۆستای بەڕێزم!

گەورەم! پێش هەموو شتێك بەوپەڕی ڕێز و پێزانینەوە دەستە پیرۆزەکانت ماچ دەکەم و، لە هەموو کاتێکدا ئەو دوعا خاوێن و بێگەردانەت بۆ دەکەم کە بەسەر زمانمدا دێن، هەروەك تکام وایە ئێوەش دوعامان بۆ بفەرموون.

گەورەم! لە جەنابتان شاراوە نییە کە ئەم قوتابی و برایەتان کەسێکی نەزان و نەخوێندەوارە، بەڵام بە سایەی خواوە گوێی بۆ خوێندنەوەی هەموو پەیامە بێ وێنە و نایابەکانتان گرتووە.

جا هەروەك ناگونجێ ڕووناکیی خۆر بە هیچ شتێك داپۆشرێت، ناتوانرێت ئەم پەیامە نوورانییانەی ئێوەش لە پێش چاوی خەڵکیدا داپۆشرێن و هەڵبگیرێن.. هیچ گرێمانێك بۆ ئەمە لە کایەدا نییە.

لە دەمی گوێ ڕاگرتنمدا لە پەیامەکان، چاودێریی "دڵ"ی خۆمم کرد و حاڵەتەکانی "گیان"ی خۆمم پشکنی.. بینیم: کەفوکوڵێکی گەورە لە "گیان"مەوە و، جۆش و خرۆشێکی مەزنیش لە "دڵ"مەوە هەڵدەقوڵێن و، تەنانەت هانیشم دەدەن کە - بێ ئەوەی خۆم هەست بکەم - کارێك بۆ خزمەتی ئیمان ئەنجام بدەم، وەك بڵێی بانگم دەکات و پێم دەڵێت: هەڵسە.. خێرا کە!

جا لەو کاتەدا کە چاودێری ئەم حاڵەتە سەرهەڵداوەی ناو ڕۆحی خۆمم دەکرد، ئەو کلیلانەم بینی کە ئەم پەیامە نوورانی‌یانە پێش چاویان خستم. وەك بڵێی پێم ڕاگەیەنرابێت بەم کلیلانە ئەو دەرگایانە بکەمەوە کە پێویستن بکرێنەوە. وەك ئەوەی فەرمانم پێ درابێت بە دوای برایانی نوورمدا بگەڕێم و ڕێژنەی ئەو ڕووناکی‌یانە بە کەسانی شایانی خۆیان بگەیەنم. تەنانەت ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئەو ڕووناکی‌یانم - کە لەو پەیامانەوە تیشك دەدەن - بە کاری سەرشانی خۆم دانا.

ئنجا دوای وەرگرتنی کلیلەکان لەو نوور و ڕووناکی‌یانە و، بۆ مەبەستی لەکارخستنی دەستی مولحیدە خیانەتکارەکان، بە دوای ئەو برایانەمدا گەڕام و، سوپاس بۆ خوا دۆزیمنەوە و، ئەو ڕووناکی و نوورانەم پێ سپاردن کە ڕاسپاردە و ئەمانەتی خوای گەورە و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ئەون ﷺ. دەسا لە سەرەتا و کۆتاییدا حەمد و سەنا و سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر ئەم سەرکەوتنەی کە لەم کارەدا پێی بەخشیین.

بێ هیچ گومانێك هەر کەسێك - بە مەرجێ مرۆڤی ڕاستەقینە بێت، تەنانەت پەیوەندی‌یەکی کەمیشی بە مرۆڤایەتی‌یەوە بێت - گەر نووسراوە بەنرخەکانتان بخوێنێتەوە، دەڕواتە ناو بازنەی ئیمانەوە. دەنا دەبێ واز لە مرۆڤێتیی خۆی بهێنێت و بڵێت: من مرۆڤ نیم!

هەریەك لەم نووسراوانە لە خۆیاندا وەك "فاتیح"ێك وان و - پشت بە خوا - لە سەرانسەری زەویدا دەرگای دڵەکان دەکەنەوە. لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە لە دواڕۆژدا پاداشتی ئەم کارە بدرێنەوە. ئامین.

جارێکی تر - گەورەم! - دەستە پیرۆزەکانتان ماچ دەکەمەوە و تکای دوعای خێرتان لێ دەکەم.

بەکر ئەمروڵڵا ئۆغلو
لە شاری "عادل جەواز" و
لە نەوەی عەبدولجەلیل

(هیوا و ئاواتێك بۆ تێگەیشتن لە پەیامەکان)

بڕگەیەکی خەسرەوە[1]

تا ئێستا هیچ دانراوێکی وەك ئەو "وتە" جوان و بەرزانـەم نـەدیوە. هیـوادارم کـە خوای گەورە - پاش دوعا و نزای بەڕێزتان - یارمەتیم بدات کە بگەمە ئەو ڕۆژەی بتوانم لە هەموویان تێ بگەم، چونکە هەموو کەسێك بۆی نارەخسێت کە لە گشت واتاکانیان تێ بگات.

حەمد و سوپاسی نەبڕاوەم پێشکەش بە خوای گەورە لەسەر ئەوەی کە جەنابتان بوارتان دام ئەو وتانە بنووسمەوە.

خەسرەو

* * *

(لە بارەی پەیامی موعجیزاتی ئەحـمەدی‌یەوە)

ئەمەی خوارەوە بڕگەیەکی "حافظ زوهدیی بچکۆلە"یە.

بە فەزڵی خوای گەورە توانیم دوو بەروبوومیش لە بـەرە نوورانی‌یـەکانی بـاخ و بێستانی نوور بکەمەوە، بەڵام لە دەربڕینی تام و لەزەتی بێ وێنەی ئەو بەروبوومانەدا دەستەوسانم.

من هەرگیز لە تامی خوێندنەوەی "مەکتووبی نۆزدەهەم" تێر نابم کە دەمگەیەنێتـە

---

(١) خەسرەو سالی ١٨٩٩ لە ئیسپارتە لەدایك بووە و سالی ١٩٧٧یش لە ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کردووە. لە پێشەنگی ئەو کەسانەوە بووە کە لە ناخۆشترین و سەختترین بارودۆخدا سەدان پەیامیان نووسیوەتەوە و بڵاویان کردووەتـەوە. زۆربەی ژیانی خۆی لەگەڵ مامۆستاکەیدا لـە بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" و "ئافیوون"دا بەسەر بردووە و، بە فەرمان و ڕێنمایی مامۆستا نوورسیش موصحەفێکی بۆ دەرخستنی ئیعجازی لەمـەڕ تەوافوقی جوانـی "لـەفظی جەلالـە"ی نـاو یەك بە یەکی لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆز، نووسیوەتەوە. خوای گەورە لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

ئاستی چەشتنی شەرەفی ئامادەبوون لە کۆڕی نەبەویی پیرۆزی پێغەمبەری ئاخر زەمان ﷺ و دانیشتن لە مەجلیسی پڕ بەختەوەریی ئەودا.

پێنووسەکەم گەلێ کورت و دەستەوسان و ناتەواوە لە دەربڕینی ڕێز و سەرسوورمانم بەرامبەر بە "پەیامەکانی نوور" بە گشتی. لە خوای گەورەی بەخشندە دەپاڕێمەوە کە لە چەشتنی هەموو بەروبوومە پێگەیشتووەکانی باخ و بێستانی نووردا یارمەتیم بدات، وەك ئەوەی کە برا خۆشەویستەکانم دەیچێژن.

حافظ زوهدیی بچووك

* * *

(نووری میعراج)

> بڕگەیەکی ئەو "زەکائی"یە زیرەکەیە کە پشت بە خوا دەبێت بە خەسرەوی دووهەم و صەبریی بچکۆلە.

ئەمڕۆ خوای گەورە بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبە مەزنە یارمەتیی دام، بەڵام پێنووسەکەم یەکجار دەستەوسانە لە دەربڕینی مەودای ئەو خۆشحاڵی و بەختەوەرییەی کە دوای خوێندنەوەی تەواوی "پەیامی میعراج" هەستم پێ کرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ دەدەم لە ڕستەیەکی پوخت و کورتدا ئەو هەست و نەستانەم پێش‌چاو بخەم کە لە خوێندنەوەی ئەم پەیامەوە سەریان هەڵدا.

کاتێ پەیامی میعراجم دەخوێندەوە، ڕووناکییەکم بینی کە دڵی مرۆڤی پڕ لە نوور دەکرد و، لە ناوەندی ڕێبازە سەر لێ شێوێنەکانی دەریای ژیاندا ڕێگای سەلامەتی و بێ وەیی ڕۆشن دەکردەوە و، مرۆڤی دەگەیاندە ئەو دەریا مەعنەوییەی کە بەرەو بەختەوەریی هەمیشەیی دەڕوات و خوڕ دەبێتەوە.

بەڵێ، ئەو ڕاستییە زۆر و زەبەندانەی کە بە بەڵگە گومانبڕەکان چەسپاون و لە یەك بە یەکی نموونەکانی ئەو کتێبەدا هێنراون، لە بەرچاوماندا ژیان دەکەنەوە بەبەر سەردەمی بەختەوەریی باشترین سەدە و زەمەنی ڕوودانی موعجیزەکاندا، کە ژیانێکە هەر تەنها یادکردنەوەی - بە ئەندێشە - گیانەکانمان لە نوور و ڕووناکی پڕ

دەکات و بـە شـادمانی و دڵخۆشی دەیخەملێنێت، بە تایبەت لەو کاتانەدا کە لـە بیرێکـەوە بـۆ بـیرێکی تـر دەیگوێزێتـەوە. کتێبـی "میعـراج" گرفتـاری حاڵـەتی سەرسوورمان و حەپەسانی کردم. پێم وایە لە هـەموو کـاتێکدا سـەروزیادی ئەوەیـە کە بۆچوون و قسە و گوفتارەکانی شەیدایانی فەلسەفە پووچەڵ بکاتەوە، تەنانەت بەڵگەکان و شێوازەکانی چەسپاندن لـەو پەیامەدا هێنـدە بەهێزن کـە هـانی ئەوانـە بدات ئیفلاس و نابووتیی خۆیان ڕابگەیەنن!

کتێبی "میعـراج" پـەڕاوێکی مێژوویی بەنرخـە و، ئـەو ڕاسـتییانەی ئوسـووڵی عـەقیدە و بـاوەڕ دەچەسـپێنێت کـە تەنانـەت لـە لای ئـەهلی ئیمـانیش پەنـهان و شـارراوەن و، بـە شـێوازێکی ژیرەکـی و مـەنتیقێکی هێنـدە سـاغ و تـەواو دەیانچەسپێنێت کە مرۆڤی بەویژدانی بێ لایەن دەتوانێت بیـانبینێت و پەیان پێ ببات.

ئەو فەیلەسـووفەی کـە نوقمـی بـێ ئاگاییـە و، تەسـلیمی گومڕایـی بـووە و، دەشیەوێت لـە شـوێنێکی بەرز و لـە بـەرچاوی خـەڵکیدا بـە ژێـر و خـاوەن فـام دەربکەوێت، لە بەرامبەر ئەو کتێبە ڕەنگینـەوە بە وێنەی ئەو پادشا لەسـەر تـەخت لابراوە دەردەکەوێت کە هـەموو ڕوتبە و نیشـانەکانی لـێ دامـاڵرابێت و، ئـەمیش وەك ئەو بۆ هەتاهەتایی نائومێدیی بەسەردا زاڵ دەبێت! بەڵام ئەو فەیلەسـووفەی کـە خـاوەن ئیـدراك و پەی پێ بردنە، بە خوێندنەوەی ئەم کتێبـە و لـە بەرامبـەر ئـەو ڕاستییانەوە، هەموو کۆت و زنجیرەکـانی فەلسـەفـە بەلایـەوە وردوخاش دەبن و، یەك لە دوای یەکی کۆت و زنجیری ئەو ڕەخنە و ئیعتیرازانەشی دەشـکێن کە بیری ئـەویان کەلەپچە کردبوو. ئـەو کاتـەش پـەی بـەوە دەبـات کـە لاف و دەعواکـانی بەتاڵن و، یەکسەر لە بەردەم مـەزنێتیی بەدیهێنـەری بـەتوانادا سـەر دەباتـە سـوژدەی ڕێزلێنان و شکۆمەندی و، داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکات.

زەکائی

* * *

(ڕێگایەکی هاوڕاز)

بڕگەیەکی "دکتۆر"ە

من نووسراوە بەنرخەکانتان دەخوێنمەوە و دەرفەت و هەل بۆ ئەم مەبەستەش دەقۆزمەوە، هەرچەندەش ناتوانم پەی بە هەموو واتاکانیان بەم. چونکە نووسراوەکانتان چەند سەوانیحێکی ڕەنگین و ڕێنمایی بەرزن.

ئەم نووسینانە - بە ڕاستی - بەسەر هەموو هەست و نەستەکانمدا زاڵ بوون و چێژەکانیشیان منیان پابەندی خۆیان کردووە. پشت بە خوا بە درێژایی ژیان و تا ناو گۆڕیش ئەو چێژانە هەر دەمێنن.

مامۆستای بەڕێزم!

"وتەکان"تان ئاڵوگۆڕی ڕاستەقینەیان لە بیری ئایینی مندا ئەنجام داوە و، بەرەو ڕێگایەکی خۆشەویست و دڵخۆشکەریان داومەتە بەر. ئێستا من بە وێنەی ڕوانینی پزیشکەکانی تر ناڕوانمە ژیان!

دکتۆر یووسف کەمال[1]

* * *

(سێ کەسایەتی)

ئەم بڕگە درێژانەش هی کاك "خلووصی"ن

باسمە سبحانە

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە بعدد الْمَلَك والإنس والجان

مامۆستای ئازیزم!

(١) دکتۆر یووسف کەمال ساڵی (١٩٠٠ز) لە "ئولو بورلو"ی سەر بە پارێزگای ئیسپارتە لەدایك بووە و، سەرۆکی پزیشکەکانی نەخۆشخانەی ئیسپارتە بووە و، جار بە جاریش لە "بارلا" ئامادەی وانەکانی مامۆستا نوورسی دەبوو. لە ساڵی (١٩٦٩ز)دا کۆچی دوایی کردووە. خوای گەورە لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

بەهۆی هاتنی مەسەلەی چوارەمـی مـەکتووبی بیسـت و هەشتەم کـە چـوار ڕۆژ پێش ئێستا پێم گەیشـت و، مەسـەلەی دووهـەم و سێهەمیشـی کـە دوێنـێ گەیشتنە دەستم، خۆم بە بەختەوەر دەزانم.

یـەکەم: تکـام وایـە ڕێـم پێ بـدەن شـتێك لـە بارەی ئـاوڕ لێدانـەوەی پـڕ لـە مەرحەمـەت و ئـەو ڕێزلێنانـە مەزنـەوە بنووسـم کـە بـرای بـەڕێزم کـاك "صـەبری" سـەبارەت بـە کەسـی کۆڵـەواری مـن دەری بڕیـوە و، لـە تـەوازوع و خۆنەویسـتیی لەڕادەبەدەری خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەم بـرا پـڕ قسـوورەتان دڵۆپێکـی لـە دەریـای سیفەتەکانی مامۆسـتا ئازیزەکـەی خۆی تێدایە. وا لە ڕوانگەی ئەم ڕستەیەوە حاڵەتی خۆمتان پێش چاو دەخەم.

یەکەمیان:

بـەهۆی لوتفـی بەدیهێنـەری میهرەبانـەوە، هـەر لـە مناڵیمـەوە مـن بـە دوای "ڕاستی"دا گەڕاوم و تاسەمەندی "ڕاستیی قورئانی مەزن" بووم. سوپاس بۆ خوا کە لـە قـەزای "ئـەگریدر" و لـەو کتێبـەدا کـە نـاوی "وتـەکان"ە و مامۆسـتای بـەڕێزم دایناوە، ئەو شتەم دۆزییەوە کە بە شوێنیدا دەگەڕام و بۆی عـەوداڵ بـووم! چونکـە ئەم کتێبە منی لە گیروگرفت و گێژاوەکانی ژیان ڕزگار کرد و گەیاندمیـە کـەنار و لێـواری سـەلامەتی و، لـە هـەڵدێر و تاریکاییـەکان دەربـازی کـردم و منـی گـەیاندە بەختەوەری و ڕووناکییەکان. لە ئـەنجامی ئەمەشـەوە خۆشەویستییەکی گـەورە و نەگۆڕی لە ڕۆح و هەست و هەناومدا بەرامبەر بڵاوکـەرەوەی ئـەم ڕووناکییانـەی قورئان دامەزراند کە منیان - بە ئیزنی خوا - لە بێ ئاگایی ڕزگار کرد و، خۆیشی بە کەسانی تری ڕاگەیاندوون و ڕێنمایی خەڵکیی بۆ لا کردوون. هـەر لـەو سـاتەوە هەستم بە پەیوەندییەکی بەهێز و توندوتۆڵ کردووە لە ئاستیدا. کەواتە سەد هەزار هەزار جار سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

من هەرکات بەو ڕووناکییانەوە سەرقاڵ دەبم، هەست بە شەوقێکی بـەخوڕەم و چێژێکی ناسکی ئەوتۆ دەکەم کە بە چەندین پلەی زۆر لە سـەرووی هـەموو چێـژ و لەزەتەکانی دنیاوەن.

دووهەمیان:

ئەوەی کە "بەندایەتی" داخوازیەتی و ئەو دەرسانەش کە ئەم ڕووناکی‌یانە دەیانڵێنەوە، تێم دەگەیەنن کە: بزانم هەرچی قسوور و هەڵە و گوناهباریم هەن هەموویان هی دەروونی بەدخوازی خۆمن، بەڵام هەست دەکەم کە هەرچی چاکە و ڕەوشت و ڕەفتاری بەرز هەن هەموویان هی فەزڵ و چاکەکاریی خوای گەورەن.

لەبەر ئەوە، لە پێناوی خواوەنددا و بۆ دەربڕینی شوکرانەم لە بەردەم خوای گەورەدا لەسەر ئەم حاڵ و بارەی کە تیایدام: پڕ بە دڵ حەز دەکەم ڕاپەڕێمە ناو مەیدانی کاری خزمەتگوزاریی نوور و قورئانی پیرۆز. بەڵام لەبەر ئەوەی لە بڵاوکردنەوەیاندا سەرکەوتن بەدەست ناهێنم ئەوا خەم و ئازارم بەسەردا زاڵ دەبێت، چونکە ناگەنە ناو دەستی سەرانسەری ئیمانداران.

حاڵەتی سێ‌هەم و کەسایەتیی ڕاستەقینەم:

من لە پێناساندنی ئەم کەسایەتی‌یەمدا شەرمەزاری دەمگرێت. بۆیە لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە خۆم و برایانم لە شەڕ و خراپەی دەروونی بەدخواز و فڕوفێڵی شەیتانەکانی جینني و ئینس بپارێزێت و، نائومێد و گومڕامان نەکات.

برا بەڕێزەکانم! بێ هیچ گومانێك ئەو مرۆڤە بەرز و بەڕێزانەی کە برا و قوتابیی مامۆستاکەمن، حاڵەتی یەکەم و دووهەم لە ڕۆحی خۆیاندا هەست پێ دەکەن. کەواتە ئەو کەسانەی کە تەنها بۆ یەك جاریش هاتبنە ناو ئەم ڕێگایەوە – پشت بە خوا – وەك ئەم کۆڵەوارە لە بەردەم دەروونی بەدخوازیان و شەیتانەکانیاندا شکست ناهێنن و، بە ڕێژەی سەرکەوتنیان بەسەر دەروون و شەیتانەکانیاندا، بە تەوفیق و یارمەتیی خوا، هەست و نەست و لەتائیفەکانیشیان دەکرێنەوە و دەپشکوێن، چونکە لەتائیفی مرۆڤ بە تایبەت لە ئیمانداراندا سنووریکیان نی‌یە.

ڕووتێکردنی پڕ سۆز و میهری مامۆستای بەڕێزم لەم قوتابی‌یە تەقسیربارەی خۆی، نموونە و بەڵگەی پلەی شەفەقەتە فراوانەکەیەتی سەبارەت بە خەڵکی، بە تایبەت ئیمانداران، بە تایبەتتر کەسێکی وەك من کە لەوپەڕی پێویستیدایە بەو شەفەقەتە.

به پوختی:

بەرامبەر بەو ئاوڕلێدانەوە و خۆش باوەڕی‌یە زیاد لە پێویستەی کە برای بەڕێز و موتەوازیع "کاك صەبری" سەبارەت بە من دەری بڕیبوو، دەڵێم: من بەندەیەکی گوناهکاری تەقسیرباری کۆڵەوار و هەژارێکی دەست بەتاڵی نابووتم و، یەکێکم لە نەتەوەکەی حەزرەتی محەممەد ﷺ و، گەلێ پێویستیم بە دوعا و نزای ئێوەیە.

گەورەترین ئاوات و بەرزترینی ئەو نیازانەی لە خوای گەورەیان داوا دەکەم بریتی‌یە لەوەی کە منی کۆڵەواری هەژار ببم بە یارمەتیدەری خزمەتگوزار و بانگەوازکارەکەی قورئان لە خزمەتە خاوێنەکەیدا، کە بریتی‌یە لە خزمەتگوزاریی قورئان و ئیمان و، لە دەرهێنانی مرواریی ڕاستی‌یەکانی ئەو قورئانە و، ڕاگەیاندنیان.

جا لەبەر ئەم نیازە بەرزە و، لەو خولەکانەدا کە بەم ڕووناکی‌یانەوە سەرقاڵ دەبم و هەست بە بەختەوەری دەکەم، چەند وشەیەك دێنە ناو دڵم و سەر نووکی قەڵەمەکەمەوە، بێ ئەوەی خۆم بیرم لێ کردبێتەوە، یان لە حسابمدا بووبێتن. جا ئەم زانین و ناسینە هی من نین، بەڵکو تایبەتن بەو ڕووناکی‌یانەی کە لە نوورەکانی قورئانی پیرۆزەوە دەبریسکێنەوە.

لەبەر ئەوە، مامۆستای ڕاستەقینە تەنها هەر قورئانی پیرۆزە.

مامۆستای بەڕێزیشمان شایانترین کەسە کە ئەو قورئانە پیرۆزە بناسێنێت و ڕابگەیەنێت و بە دەرس بیڵێتەوە.

کەواتە – برا بەڕێزەکانم! – دەبێ ئێمە ئەم دەرفەتە بقۆزینەوە و، ئەو گەوهەرە گرانبەها و بەنرخانە بکڕین و، لە دڵ و مێشکی خۆماندا بیان نەخشێنین، چونکە ئەم ڕووناکی‌یانە دەبن بە مایەی دڵنەوایی و دڵدانەوەمان لە هەردوو دنیادا.. هەروەها دەبێ بەپێی توانامان بۆ بڵاوکردنەوەیان تێبکۆشین و، لە هەر کاریگەرێکی دەرەکی، کە بێنە ڕێیان، بیانپارێزین.

ومن الله التوفيق.

خلووصی

(پەیامەکان دەبن بە سروودی سەرزارەکان)

"بڕگەیەکی ئەو کاك سولەیمانەیە[1] کە بە وەفادارییەکی بێگەرد ماوەی شەش ساڵی ڕەبەق لە کاروبارەکانمدا یارمەتیی دام و، تووڕەیی منی نەورووژاند کە مرۆڤێکی بە سروشت تووڕەم و، بە بەردەوامی ئەرکی نووسینەوەی ڕەشنووسەکانی ڕاپەڕاند".

بەڕێز.. گەورەم!

پێشەکی دەستەکانتان ماچ دەکەم و ئومێدەواری دوعاتانم.

من کە "سولەیمان"ی قوتابی و برا و یارمەتیدەرتانم لە کارەکانتاندا، پەیام لە دوای پەیامی ئەو ڕووناکی و نوورانەم خوێندووەتەوە کە جەنابتان تا ئێستا داتانناون و، لە هەموو یەکێکیاندا هێندە ڕووناکیی درەخشانم بینیوە کە وەکو خۆری ڕووناك وان و سوودێکی یەکجار زۆرم لێ بەدەست هێناون. چونکە ئەو نوورانە ڕێی دواڕۆژیان پیشان دام و بۆیان ڕووناك کردمەوە و، گەلێ شتی لەمەڕ ئەم ڕێگایەیان تێگەیاندم کە پێشتر نەمدەزانین.

دەسا خوای گەورە لێتان ڕازی بێت و، داوای لێبوردنیش لە ئێوەی بەڕێز دەکەم کە من لە سوپاسی ئێوەدا دەستەوسانم.

لەبەر ئەوەی من ناتوانم لە "دەروون"ی خۆمدا نموونە بەو ڕووناکییانە بهێنمەوە، ئەوا دەستم لە داوێنی "گیان"م گیر کرد و ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە هەست و نەستەکانی "دڵ"ی منی دەربڕی کە پێشکەشتانی دەکەم. تکام وایە لە بەڕێزتان کە لە ناتەواوی و هەڵەکانم ببورن:

بەڕێز و گەورەم!

---

(١) ئەم سولەیمانە بە: سولەیمان کاروانچی بەناوبانگە و، لە پێشەنگی خزمەتگوزارانی ئیمان و نموونەی بەرجەستەی ڕاستی و وەفا و ئیخلاس بووە. ساڵی ١٩٦٥ز کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

ئەو تام چێژ و بەختەوەرییانەی کە لە دەرگای پەیامەکانی نووردا بینیومن لە درێژایی ژیانمدا هەرگیز هاووێنەیانم نەدیوە. چونکە دوای داوەرییە ویژدانییەکانی خۆم بە دڵنیاییەوە تێگەیشتم لەوەی کە:

هەموو یەکێك لەو پەیامانە تەفسیرێکی قورئانی پیرۆزە و، خوێندنەوەشیان معتهەمێکی خاوەن کاریگەریی خێرا و دەرمانێکی سوود بەخشی زامە معنەوییەکانی هەموو ئەو کەسانەیە کە لەسەر شێوە و ڕوخساری مرۆڤدان و لە مرۆڤایەتی بێ بەشن. من بە سەلیقەی بچووك و لاوازی خۆم هەستم بەمە کردووە و، لەو باوەڕەشدام کە ڕۆژگار نرخی ئەم پەیامانە پتر دەردەخات و، دەبن بە سروودێك لەسەر زارەکاندا و، بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڵاو دەبنەوە و، پشت بە خوا بۆ ئەوروپاشی ڕوون دەکەنەوە کە چۆن ئایینی ئیسلام نوورێکی درەخشانی خواییە.

جارێکی تر دەستەکانتان ماچ دەکەمەوە و، ئومێدەواری دوعا خاوێنەکانی ئێوەی گەورە و بەڕێزم.

قوتابیی خۆتان

سولەیمان

* * *

(ماهییەتی پاشکۆکان)

بۆ برای بەختەوەرم کاك خەسرەو!

ئەم پەیامە (واتە مەکتووبی بیست و حەوتەم - پاشبەندەکان) ئەنجومەنێکی نوورانیی گەورەیە و قوتابیانی بەڕێزی قورئانی پیرۆز وانەکانی تێدا دەخوێنن و، لە نێوان خۆیاندا ئەو بیر و ڕایانە ئاڵوگۆڕ پێ دەکەن کە تایبەتن بە ئیمانەوە و، لە واتاکانیان دەکۆڵنەوە.. کەواتە ئەم پەیامە هەیوان و حوجرەی قوتابخانەیەکی مەزن و بەرزی ئەوتۆیە کە هەڵگرانی قورئانی پیرۆز بیروڕا و بۆچوونەکانی خۆیانی

تێدا دەگۆڕنـەوە و، هەریەکـەیان لـەو وانەیـە دەدوێ کـە لـە قورئـانی پـیرۆزەوە بەهرەمەندی بووە.

هـەروەها - ئـەم پەیامـە - وەکـو خانوویـەکی مـەزن و بـە وێنـەی پیشـانگایەکی فراوان وایە بۆ فرۆشتنی پەیامەکان، کە سندووقی گەوهەرەکانی گەنجینەی خاوێنی قورئانن و، هەر قوتاییـەك ئـەو گەوهەرانـە دەخاتـە پێش چـاوی کڕیـاران کـە لـەو گەنجینە بەنرخەوە بەدەستی هێناون.

دەسا ئافەرین و "بارك الله" بۆ ئێـوە - ئـەی خەسـرەوی بـرام - کـە ئـەو مـەنزڵ و پیشانگایەتان بە جوانترین ئارایشت ڕازاندووەتەوە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(من بە دوای نوورێکدا دەگەڕام)

ئەم بڕگەیە هی عەقیدی خوالێخۆشبوو کاك "عاصم"ە[1].

هیچ نرخێك نییە شایانی بەهای ئـەم پەیامـە پیرۆزانـە بێـت کـە پێـیان دەوترێـت: "وتـەکان" چونکـە لـە بەڵگـە و تـەرازووەکانی قورئـانی پـیرۆزەوە سـەرچاوەیان گرتـووە. زۆر لـە مێژە بـە دوای ڕووناکییـەکی وەك ئەمـەدا دەگـەڕام. سـوپاس و

---

(١) "عەقید عاصم" لە سالی (١٨٧٧ز) لە شاری "ئیزمیت" لەدایك بووە و، بە ڕوتبەی سـەربازییەوە لە تەرابلوسی لیبیا و لە شام و چەند شارێکی تورکیادا کاری کردووە. سـالی (١٩٣٥ز) لـەو کاتـەدا کە لە دادگا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرا گیانی سپاردووە.

مامۆستا نوورسی لە بارەیەوە دەڵێت: کاتێ لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بـەڕێز "عـەقید عـاصم"دا کـرد بیری کردەوە لەوەی کە ئەگەر بێت و ڕاستی بڵێت زیان بە مامۆستاکەی دەگات. ئەگەر درۆیـش لـە زاری دەربچێـت ئـەوا پەڵـە بـەر ڕاستگۆیی و ڕاستڕەوییەکەی دەکەوێت کـە نزیکـەی چـل سـالی ڕەبـەقی خزمەتی سەربازی بە سەربەرزی و کەرامەتەوە پاراستوویەتی. بۆیە وتی: "خوایە گیان! گیانم بکێشە". ئەمەی وت و، دوای دە خولەك گیانی سپارد و، بوو بە شەهیدی ئیستیقامەت و ڕاستگۆیی!

(وەرگێڕ)

پێزانین بۆ خوای گەورە کە بە نیعمەت و کەرەمی خۆی ئەم وتانەی پێ بەخشیم.
زمان و پێنووسەکەم دەستەوسانن لە دەربڕینی ئەو هەست و سۆزانەی لە دڵمدا هەن بەرامبەریان.

عاصم

* * *

(سیفەتی دەڵاڵ)

بڕگەیەکە بە پێنووسی "صەبری"

بەڵێ، دەبێ دان بەم ڕاستی‌یەدا بنرێت:
گەنجینەی گەوهەر و مرواری‌یەکان چەندەش پڕ و بەنرخ بێت، هێشتا هەر دەبێ دەڵاڵ و فرۆشیارەکەیان شارەزای ئوسووڵی کڕین و فرۆشتن بێت! دەنا گەر لەو توانا و شارەزاییە بێ بەش بێت، ئەوا هەموو گەنجینە بەنرخەکانی و کەرەسە بەهادارەکانی ناویان لە پێش چاوی خەڵکیدا دەشارڕێنەوە. واتە ڕێزی شایانی لێ نەناون!
لەسەر ئەم بناغەیە دەڵێم:
ئەو کەسەی کە بە شێوەیەکی خاوێن و بێگەرد و تەنها لەبەر ڕەزامەندیی خوای گەورە ڕاستی‌یەکانی قورئان پێش چاوی هەموو خەڵکی دەخات و، نەك شەش ساڵ بەڵکو چل ساڵە لە ناوەندی ئەم بارودۆخە شڵەژاوە پڕ لە ئاڵوگۆڕەدا خەڵکی‌یان بۆ لا بانگ دەکات و، لەو کاتەوە ئەم فەرمانە پەروەردگاری‌یە مەزن و بانگە بڵندە بە گوێی ئەهلی ئیسلامدا دەدات کە دەفەرموێ:
﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾(الصف: ١٠)..
ئەو کەسە، نەتەوەی حەزرەتی محەممەدی ﷺ خستووەتە باری شوکرانەیەکی گەورەوە بۆ خواوەند، لەسەر ئەو ڕووناکی‌یانەی ئیمان کە پێشکەشی موحتاجانیانی کردووە!

صەبری

# پاشكۆی سێهەمی

# مەكتووبی بیست و حەوتەم

برگەیەكی سەعید

بسم الله الرحمن الرحیم

(ئەمەی خوارەوە دەقی نامەیەكە بۆ پزیشكێك كە گەلێ تاسەمەندی پەیامەكانی نوور بووە، دوای ئەوەی كە لە ئەنجامی خوێندنەوەی زۆری ئەو پەیامانەوە بێداربوونەوەیەكی ڕۆحیی تێدا دروست بووە.. هەرچەندەش پەیوەندیی ئەم نامەیە بەم پاشكۆیەوە پەیوەندییەكی لاوازە، بەڵام با ببێت بە برگەیەكی نێوان برگەكانی برایانم).

سڵاو ئەی هاوڕێی دڵسۆز و ئەی پزیشكی بەختەوەری ئازیز كە پەیی بە دەستنیشان كردنی نەخۆشیی خۆی بردووە!

ئەو بێداربوونەوە ڕۆحییەی كە نامەكەتان دەری دەخات، شایانی پیرۆزبایی لێكردنە.

برام! بزانە كە: "ژیان" بەنرخترین شتی ناو جیهانی بوونەوەرانە. هەرشتێكیش خزمەتی "ژیان" بكات بەرزترین ئەركی سەرشانە و هەوڵدانیش بۆ بەكارهێنانی ژیانی لەناوچووی فانی لە پێناوی ژیانێكی هەمیشەییدا بەنرخترین فەرمانبەرداریی ژیانە.

بیشزانە كە پوختە و گرنگیی تەواوی "ژیان" لەوەدایە كە "تۆو" و بنەما و سەرەتای گەشە كردنی ژیانێكی نەمری هەمیشەیی بێت. بە ڕادەیەك كە بۆچوونی

پێچەوانەی ئەمە، واتە تەرخان کردنی هەموو خەم و بیر و زانینێك بۆ ئەم ژیانە لەناوچووەی دنیا، تێکدانێکی تەواوەتیی ژیانی هەمیشەییە و، شێتی و نەفامی‌یەکی وەك ئەوە وایە کە: یەکێك "خۆر"ێکی هەمیشەیی بە بریسکانەوەیەکی کتوپڕی بگۆڕێتەوە.

پزیشکانی بێ ئاگا لە دواڕۆژ و نوقم بووانی ناو لیتاوی ماددەگەری، لە ڕوانگەی ڕاستی‌یەوە، لە هەرچی کەسە نەخۆشترن! بەڵام ئەگەر ئەوانە بتوانن چارەسەری ئیمانی و دەرمانە دژ بە ژەهرەکان لە دەرمانخانەی قورئانی پیرۆز وەربگرن و بە چەند ژەمێك بەکاری بهێنن، ئەوا جگە لەوەی کە زامە مرۆڤانە و نەخۆشی‌یە تایبەتی‌یەکانی خۆیانی پێ چارەسەر دەکەن، دەشبن بە هۆی سارێژ کردنی تێکڕای زامەکانی مرۆڤایەتی بەگشتی.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئەم بێداربوونەوە رۆحی‌یەتان بکات بە مەلهەمێکی شیفابەخشی زامەکانی خۆت و، نموونەیەکی زیندوو و خاوێن و ڕچەشکێن لە بەردەم پزیشکانی تردا و بیکات بە دەرمانی دەردی ئەوانیش.

لاتان ئاشکرایە کە دڵدانەوە و دڵنەوایی نەخۆشێکی نائومێد لە هەموو تروسکاییەکی هیوای ژیان چەندە کارێکی گرنگە، کاتی وا دەبێ ئەم دڵدانەوەیە بۆ ئەو جۆرە نەخۆشانە لە هەزار دەرمان و چارەسەر سوود بەخشتر دەبێت. بەڵام پزیشکی نوقم بووی ناو سروشتی دڵ ڕەق و لیتاوی ماددەگەری، نائومێدی‌یە دڵتەزێنەکەی ئەو هەژارانە پتر دەکەن، بە ڕادەیەك کە ژیان لە بەرچاوی ئەواندا بە تاریکستانێکی ڕەش پیشان دەدەن. بەڵام پشت بە خوا ئەم ڕاپەڕین و بێداربوونەوە رۆحی‌یەی تۆ دەبێ بە مایەی دڵنەوایی و دڵدانەوەی ئەو هەژارانە و کەسانی تری هاوچەشنیان و، دەتکات بە پزیشکێکی ڕاستەقینەی ئەوتۆ کە ڕووناکی ئاراستەی دڵان بکەیت و شادمانیش بە دەروونی خەڵکی ببەخشیت!

وەك ئاشکرایە تەمەن یەکجار کورتە و ئەرکە پێویستەکانی سەرشانیش گەلێ زۆرن. کەواتە ئەرکەکانمان لە چاو کاتەکانماندا گەلێ زۆر و زیاترن. جا ئەگەر تۆش - وەك من - زانیاری‌یەکانی ناو مێشکت بپشکنیت و لێیان ورد ببیتەوە،

دەبينيت هەندێ لەو زانيارىيانە بێ كەڵك و بێ سوودن و وەكو خۆڵەمێش وان. من بەش بە حاڵى خۆم ئەم چەشنە پشكنين و لێكدانەوە و تەتەڵە كردنەم ئەنجام داوە و، گەلێ زانياريى بێ سوود و بێ بايەخم بۆ دەركەوتووە.

بەڵێ، پێويست دەكات مرۆڤ بە دواى چارەسەر و هۆكارێكدا بگەڕێت تاكو بتوانێت ئەو زانيارىيە زانستى و فەلسەفىيانە بكات بە چەند زانيارىيەكى سوودبەخش و ڕووناك و ڕووناكيدەر و زيندوو و تەڕ و پاراو و بەرهەم بەخش.

برام! تۆش وەكو من بلاڵيرەوە و لە خواى داناى شكۆمەند بپاڕێرەوە كە بيركردنەوەكانت بۆ خۆى و لە پێناوى خۆيدا پاڵفتە و خاوێن بكات و، ئاگر بەربداتە ئەو ليژنە دارە، تاكو ئەو زانينە زانستىيە بێ سوودانە بەم ئاگرە ڕووناك ببنەوە و بگۆڕرێن بە چەند زانستێكى بەنرخى خواناسى.

هاوڕێى زيرەكم!

لە دڵەوە گەلێ ئارەزوومەندم كەسانى هاوێنەى "خلووصى" لە زانايانى تاسەمەند و تامەزرۆى نوورەكانى ئيمان و نهێنىيەكانى قورئان، دەربپەڕنە مەيدان.

جا لەبەر ئەوەى كتێبى "وتەكان" دەتوانێت لەگەڵ ويژدان و دڵ و دەروونتدا بدوێت، ئەوا نەك هەر تەنها بە نامەيەكى تايبەتى لە منەوە بۆ تۆ، بەڵكو هەموو وتەيەك لە وتەكانى ئەو كتێبە بە نامەيەكى ئاراستەكراو دابنێ لە كەسێكى بانگەوازكارى قورئان و ڕێنمايى كەرى خەڵكىيەوە بۆ لاى ئەو قورئانە پيرۆزە. هەروەها بە ڕەچەتەيەكى دەرمانخانەكەى قورئانى حەكيمى وەربگرە. ئەو كاتە بەم كارەت و دووراودوور كۆڕێكى فراوانى خاوێن و دانيشتنێكى پيرۆزى ڕووبەڕوو ساز دەكەيت!

تۆ لە نامەنووسيندا بۆ من هەركات بتەوێت سەربەستيت، بەڵام تكام وايە لە وەڵام نەدانەوەى دڵگران نەبيت! چونكە من لە مێژە لەسەر نەنووسينى نامە - مەگەر بە دەگمەن - ڕاهاتووم، تەنانەت وا سێ ساڵە لە يەك وەڵام زياترم بۆ براكەم نەنووسيوە، هەرچەندەش ئەو نامەى زۆرم بۆ دەنێرێت.

سەعيدى نوورسى

(پەیامەکان نوقمی دەریای نووریان کردین)

برگەیەکی خەسرەو

مامۆستای بەڕێز و خۆشەویستم!

پەیامەکەتان ڕووناکیی ماددی و مەعنەوی‌یان پێ بەخشیین و، بۆ لای چەند ڕێژنە و بەرەکەتێکی بلندی لەوتۆیان بردین کە دەستی کەسیان پێ ناگات و، نوقمی دەریای نووریان کردین. سوپاسێکی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە کە لە ڕێی جەنابتانەوە ئەم شەرەفمەندی‌یە مەزنەمان بەدەست هێنا و لەسەر مژدەدانی بەڕێزیشتان بەو پشتگیری و سەرکەوتنەی کە لە ئەنجامی خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆزەوە لە ڕۆژانی ئاییندەدا دێنە دی.

ئەی مامۆستای ئازیزم! من هەمیشە دوعای ئەوەتان بۆ دەکەم کە خوای گەورە نیعمەت و پاداشتێکتان پێ ببەخشێت کە هیچ چاوێك نەیدیبێت و بە هیچ گوێیەك نەبیسترابێت و بە ئەندێشە و بیری کەسیشدا نەهاتبێت!

مامۆستای بەڕێزم!

زۆر زۆر یادتان دەکەم، بەڵام خیانەتکارە لە ڕێ ترازاوەکان لە هەموو لایەکەوە ڕێمان لێ دەگرن و ناهێڵن بە خزمەتتان شاد ببین، ئەمەش گەلێ ئازارم دەرخوارد دەدات. بارودۆخی کاتی ئێستامان دڵمان لە خەم و پەژارە پڕ دەکات، بەڵام هیچ چارە و دەستەڵاتێکمان نی‌یە.

هەر مرۆڤێك ئەو پەیامانەی نووری بە دەست بگات کە ڕێژنەی ڕووناکی‌یەکانن، پەیوەندی‌یەکی پتەویان لەگەڵدا دەبەستێت. کەواتە ئەم پەیامانە لەناو کەسانی موشتاق و شایانی خۆیاندا دەستاودەستیان پێ دەکرێت.

الحمدلله.. هذا من فضل ربّي.

خەسرەو

* * *

(پەیامەکان بێئاگاییان ڕەواندووەتەوە)

مامۆستای بەڕێزم!

پەیامەکەتان، کە بە ڕووناکی و ڕێژنەی قورئانی پیرۆز دانراوە و دەڵێی ئاوێنەی نوورەکانی ئەو قورئانەیە، بەڵگەیەکی سەروزیادە لەسەر بەرزیی پلەی مامۆستایەتیتان. چونکە - ئەی مامۆستای ئازیز! - ئەم پەیامانە سەرانسەری ئەو تاریکاییانەیان ڕەواندەوە کە بەسەر موسڵمانانەوە پەلە هەورێکی ڕەشیان پێکهێنابوو، هەروەها پەردەکانی لە خوا بێ ئاگاییان دڕاند کە بەسەر خەڵکیدا دادرابوونەوە و، بە فەزڵی خوای گەورە چەندین ڕاستیی درەخشان و بریسکاوەیان لە ژێر ئەو پەردە چڵکن و چەپەڵانەوە بۆ خەڵکی دەرخست.

پشت بە خوا هیممەت و عەزمی مەحکەم و، توندوتۆڵی و، هەوڵ و کۆششی بەردەوامتان بێ سوود و بێ بەرهەم نابێت. چونکە جەنابتان - ئەی مامۆستای بەڕێزم! - سەرچاوەیەکی بەخوڕی ئاوی ژیانتان لە ناوجەرگەی ئەنادۆڵدا تەقاندووەتەوە[1].

جا سەرچاوە و کانگای بەردەوامی ئەو پەیامانە تەنها دەریای قورئانی پیرۆزە. پشت بە خوا کاتێ کە لەم خانەی تاقیکردنەوەیەوە بەرەو خانەی بەختەوەری کۆچ دەکەن، ئەو کتێبە بەنرخانە بەردەوامی بە ژیانتان دەبەخشن و ناوتان بە نەمری دەهێڵنەوە. دەسا خۆشبەختی بۆ قوتابییە بەختەوەرەکانت کە تۆ خۆشت دەوێن و ئەوانیش ڕێزی شایان لەو کانیاوە بەخوڕەمە دەگرن کە جەنابتان تەقاندووتانەتەوە و، بە ڕاگەیاندن و پێناساندنی ئەو سەرچاوەیە بەرگری و پارێزگاریی لێ دەکەن و، گەر پێویستیش بکات بە هەزاران گیانی خۆیان بڕیارەکانی ئەو چاوگەیە بە گوێی خەڵکیدا دەدەن.

---

(١) گەر من تەنها یەك لە هەزاری ئەو پاداشت و شەرەفمەندییەم بێت کە ئێوە لە کار و کۆششی نێوان ئەم خزمەتە بەرزەدا تەسەووری دەکەن، ئەوا شوکرانەی زۆرم پێشکەش بە خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەم یەك بەشە. بەڵام خاوەنی فەزڵ و جوامێری، کەسانی وەك ئێوەن کە لەم خزمەتەدا یارمەتیم دەدەن و بە قەڵەمە ئەڵماسییەکانیان لەم پێناوەدا تێدەکۆشن. (دانەر)

دەسا ئەی مامۆستای ئازیزم! چاوەکانت ڕوون! دڵنیابە ئەو مەردە جوامێرانە هەرگیز کارێکی ئەوتۆیان لێ ناوەشێتەوە کە لە دواڕۆژدا دڵگرانت بکەن.

قوتابی‌یەکانت بە هەموو ڕۆح و هەناوی خۆیانەوە منەتبار و سوپاسگوزاری فەزڵ و چاکەی بەڕێزتانن، لەوەدا کە بەڕێزتان گەلێ کلیلی نهێنی‌یەکانی قورئانتان داوەتە دەستیان.

بەڵێ، ئەو ڕێژنە و ڕووناکی‌یانەی کە جەنابتان لەمڕۆدا بڵاویان دەکەنەوە، دڵخۆشی‌یەکی لەڕادەبەدەر بە مرۆڤە ڕاستەقینەکان دەبەخشن، چونکە هەنگاوەکانی کار کردنیان فێر دەکات سەبارەت بە ئەرکە سەرەکی‌یەکانی ژیانیان لەم سەر زەوی‌یەدا.

پشت بە خوا هەوڵ و کۆشش و خزمەتگوزاری‌یەکانتان لای خوای گەورە گیرا دەبێت و، فیداکاری‌یەکانیشتان تابڵێی گەورە و مەزنن.

مامۆستای بەڕێزم!

دەبا بەرهەمە مەزنەکانتان هەر بڵاو ببنەوە و بگەنە ئاسۆی ئاسمانەکان و زەمانەکانیشیان پێ بکەوێتە گۆ[1].

ئەو کارە دنیاییانەی کە هیچ بەشێکی ئاینیان پێوە نی‌یە و لەناو خەڵکیدا بەگشتی دەستیان بە بڵاوبوونەوە کردووە و تاریکیی "بێ ئاگایی" غافڵان و "مەستی"یان پتر زیاد دەکات، تەنانەت خۆیان لە خۆیاندا بریتین لە "مەستی"،

---

(١) من بەشداریی ئەم برایەم ناکەم لەم هەست و نەستانەیدا، ئێمە ڕەزامەندیی خوامان سەروزیادە. چونکە ئەگەر ڕەزامەندیی خوامان لەگەڵدا بێت ئەوا هەموو شتێکمان لەگەڵدایە، دەنا هەموو دنیا هیچ سوودێکی تێدا نی‌یە. قەدرزانی و ڕێزلێنانی خەڵکی سەبارەت بەم چەشنە کارە و هەر کارێکی تری سەر بە قیامەت، گەر بێن بە هۆ و عیللەتی ئەو کارانە ئەوا پاداشتەکانیان بەتاڵ دەکەنەوە و، گەر تەرجیحدەر بن ئەوا ئیخلاسی کارەکە دەشێوێنن و، گەر هاندەریش بن ئەوا خاوێنیی کارەکە ناهێڵن! بەڵام گەر خوای گەورە، وەك نیشانەیەك لەسەر قبووڵ بوونی ئەو کارە و بە بێ داواکاریی مرۆڤ، هەر شتێکی لەم ڕووەوە بە بەندەکەی بەخشی، ئەوا شتێکی باشە، بە مەرجێ لە پێناوی ڕوونکردنەوەی کاریگەریی ئەو کردەوەیە یان ئەو زانستە لە خەڵکیدا، بەکار بهێنرێت. وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الآخِرِينَ﴾ (الشعراء: ٨٤). (دانەر)

مەگەر بە کتێبە بەنرخەکانی ئێوە و ڕێنماییە ڕاست و دروستەکانتان، دەنا ناتوانرێت بە هیچ شتێك لا ببرێن و بڕەوێنەوە.

ئەوەتا بە چەندین بەڵگەی ژیری و مەنتیقی چەسپاوە کە دەوڵەتە موڵحیدەکان ناگەنە ئاستی مرۆڤایەتی و لە توانایاندا نی‌یە بگەن هەتا لەسەر ئەو حاڵەیان بن و، لە ئەنجامدا گرفتاری ڕووخان و دارمان دەبن.

کتێبە بەنرخەکانتان گشتی و بەرز و بڵندن و، سیفەتەکانی "گیان"ە بەرزەکەت دەردەخەن.

مامۆستای خۆشەویستم!

بە تەواوی دڵنیا بن لەوەی کە هەوڵ و کۆششەکانتان جێگای خۆیان دەگرن و، هەرگیز بێ ئەنجام دەرناچن و، دەستە زۆر و زەبەندەکان دەیانگرنەوە و، تا ئەبەد دەیانپارێزن و، موڵحیدانی ئەمڕۆش لە سنووری خۆیاندا ڕادەگرن و، لەوانەشە نووری ئیمانیان پێ ببەخشن. ئایا ئەمە هیوا و ئاواتی ئێوە نی‌یە؟ ئایا کار و ئامانجتان بریتی نی‌یە لە بێدارکردنەوەی خەڵکی و ڕێنماییان بۆ لای ئیمان؟

ئەو ئەدیبانەی کە بە پاشماوەی سەرخوانی فەیلەسووفەکان پەروەردە بوون و لە ئەدەب بێ بەشن، بە حەتمی ئەدەبی ڕاستەقینە لە پەیامەکانی ئێوەدا دەدۆزنەوە و ئەم کارە لە ڕاستیدا دێتەدی. ئێوەش لە لایەنی خۆتانەوە و بە ئەنجامدانی ئەم ئەرکەتان خزمەتی مەزن و شایستەی "ئیمان" بە تەواوی جێبەجێ دەکەن. ئەم نەتەوە و نیشتمانە هەتا هەتایە هەر قەرزار و منەتباری ئێوەیە و هەرگیز ناتوانێت مافی شایانی خۆتان پێ ببەخشن، چونکە ئەم نەتەوەیە لە توانایدا نی‌یە پاداشتی خزمەتە بەرز و بڵندەکانتان بداتەوە، بەڵکو هەر تەنها خوای گەورە پاداشتی شایانی ئەو خزمەتگوزاری‌یانەت دەداتەوە. دەسا خوای گەورە لە دنیا و قیامەتدا لە ئێوەش و لە خزمەتگوزارە گوناهبارەکانی وەك ئێمەش ڕازی بێت.

زەکی

هاوڕێی قوتابی‌یە دێرینەکەی پەیامەکانی نوور:

لوتفیی خوا لێخۆشبوو

(پەیامەکان خوێنەرانیان لە هەست و نەستە نزمەکان دوور دەخەنەوە)

بڕگەیەکی "کاك عاصم"

باسمه سبحانه

لە هەموو خولەکێکی تەمەنمدا حەمد و سوپاسی نەبڕاوە و بێ کۆتایی پێشکەش بە خاوەن توانستی ڕەها و پادشای ئەزەل و ئەبەد و خواوەندی حەیی و قەییووم دەکەم لەسەر ئەوەی کە لە دەریای کەرەمی فراوانی خۆیەوە نیعمەتی: "مامۆستای بەڕێز"ی بەم هەژارە بەخشی. خۆ هەتا حەمد و سوپاسی زیاتر پێشکەش بە خوای گەورە بکەم هێشتا هەر ناتوانم مافی ئەم قەرزەی بەسەرمەوەیە بیدەمەوە. کەواتە: "لە الحمد والمنّة.. هذا من فضل ربّي".

منی هەژاری نوقمی گوناهباری، بەپێی خواستی سروشتی بەشەریم و بە درێژایی ژیانی سی و چوار ساڵەی سەربازیم، زریانی گوناه لە هەموو لایەکەوە بەسەرمدا هەڵی کرد و، شەپۆلەکانی گوناهباریش منیان بەم لا و ئەولادا هاویشت و، لەم ڕووەوە ژیانی ئایینی و قیامەتیم یەکجار هەژار مایەوە و، ژیانم بەم چەشنە بردە سەر کە پەردەی بێ ئاگایی بەرچاوی داپۆشیبووم. وا ئێستا دەزانم چیم لەدەست دەرچووە و ئاخی پەشیمانی‌یان بۆ هەڵدەکێشم، تەنانەت بۆ ئەو شتانەی ژیانی ڕابوردووشم دەگریم کە لەوەوپێش منیان دەخستە پێکەنین! ئەم ئەنجامەش هی چاوپێکەوتنی بەڕێزتان و پەیامە بەنرخەکانتان بوو. دەسا هەزار حەمد و سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر ئەم چاکە و بەخششە مەزن و گشتی‌یەی.

چوار ساڵ پێش ئێستا و لە دەمی هاتنمدا بۆ بوردوور و لە ڕێی برای بەڕێزمان شێخ محەممەد ئەفەندی‌یەوە بە فەزڵی خوای گەورە نامە گۆڕینەوەم لەگەڵ بەڕێزتاندا دەستی پێ کرد. ئەم پەیامانە چەند کلیلێکی ئەوتۆیان دایە دەستی ئەم هەژارە کە ڕووناکی‌یەکان دادەگیرسێنن و، سەرتاپا دانایین و، گیروگرفتەکان چارەسەر دەکەن و، مەتەڵ و گرێ کوێرەی بوونەوەرانیش شی دەکەنەوە.

بەڵێ، ناتوانرێت بەهای ئەم کلیلانە بە هیچ نرخێك دەستنیشان بکرێت. چونکە لە گەوهەر و ئەڵماس گەلێ بەنرخترن، تەنانەت قەڵەم و زمانم دەستەوسانن لە

پێناساندن و دەربڕینی هەست و نەستی دڵ و دەروونم بەرامبەر بەو پەیامانە، بۆیە پێم باشترە کە بە کۆڵەواری و دەستەوسانی خۆمەوە بسرەوێم.

وەسفی مـن لـە کـوێ و ئەم پەیامانـەش لـە کـوێ کە گـەنجینەکانی شـەریعەتی خاوێن و، حەقیقەتی ڕاست و، ناسینی خـوای گـەورەیان لـەخۆ گرتـووە؟ تەنانـەت هەریـەك لـەو پەیامانـە لـەوانی تـر ڕووناکـتر و درەخشـانترە! بـە تایبـەت پـەیامی "ئیعجازی قورئان" کە تیشـکی نوورەکـانی لـێ پـەخش دەبێتـەوە. لـە ڕاستیدا ئەم پەیـامانە بـاخێکی ڕەنگینـی ئـەوتۆن کـە خۆشـی و شـادمـانی بـە دەوروبـەریان دەبەخشن و، چەندین گوڵی ناسك و ناوازەی وەهایان لە ئامێز گرتووە کـە مـرۆڤ سەرسامە بۆنی کامیان بکات و کامیان لێ بکاتەوە تاکو سەرسامیی نەمێنێت و بە کامی دڵ تینوێتیی دڵی خۆی بشـکێنێت، بۆیـە چارەیـەکی تـری لـە بـەردەمدا نی‌یـە جگە لەوەی کە لە هەر هەموویان پێکەوە چەپکە گوڵێکی نوورانی پێکبهێنێت.

ئەم پەیامە پیرۆزانە خوێنەران و نووسەران و گوێ بیستانیان لە باخ و گوڵـزاری نووردا نوقمی دەریـای نـوور دەکـەن و، هـاودەم لەگـەڵ مەستیی سەرسـووڕمان و ڕێزلێناندا، بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان هانیان دەدەن و، مرۆڤ بۆ چەند مەنزڵگایـەکی هێنـدە بلنـد دەبـەن کـە گەلـێ دوور و بـەرزن لـە ئاستی سـەرجەمی ڕەوشـتە نـزم و چەپەڵەکانەوە و، دەروونی بەدخوازی مرۆڤ لەناو دەبەن.

بەڵێ، دەتوانم بڵێم: ئەم پەیامە نوورانی‌یانە باخچەیەکی بەهەشتن، بەڵام هەزاران داخ بۆ ئەو بەدبەختانەی کە ناتوانن بەرچنی بەشـی خۆیـان لـەم باخچـە بـۆن خۆشـە بکەن. گەلێ هیوادارم کە ئەم ئیلهامە پەروەردگاری‌یە بگاتە دەستی ئەوانیش تاکو بتوانن خـەوی بـێ ئاگاییـان بگـۆڕن بـە بێـداری و وریـایی، وەك ئـەوەی لـە کۆتـایی "وتەی بیست و سێ‌هەم"دایە.

لـە خـوای گـەورە و بـەتوانا و "واجب الوجود" دەلالێمـەوە کـە ئیمـاندارانی یەکتاپەرسـت بخاتـە سـەر ڕاسـتی و دروسـتی و، بـە کـردەوەش لێـی دەپاڕێمـەوە کـە هـەموو ئـەو پەیامانـەی لـە بەردەسـتمدان لـە ڕۆژانـی هـەینیدا بیاننووسمـەوە و لـە خوێندنەوەشیاندا دەستاودەستیان پێ بکەم کە هەندێ جار خوێندنـەوەیان تـا ئێـوارە

بەردەوام دەبێت، بەشکو بە فەزڵی خوای گەورە مـافی بەندایەتیمان بۆ ئـەو خوایـە ئـەنجام بدەین. لـە خـوای گـەورەش دەپاڕێینـەوە کـە هـەتا زەوی دەمێنێتـەوە تەمـەنی مامۆستاشمان بـەردەوام بکـات و هـەر ڕابـەری پەیامـەکانی نـوور بێـت و ڕێنمـایی خـەڵکی یان بۆ لا بکـات و کاروبـاری بانگـەوازی نـوور لـە ئەسـتۆ بگرێـت. ئـەم دوعایەش قەرزێکە لە ئەستۆی هەمووماندا بەرامبەر بە مامۆستا.

ئێمە هەمووومان - خۆم و خێزانەکەم - لە دوای هەموو نوێژێکەوە بەم دوعایە لە دەرگانەی خوای گەورەدا دەلالێینەوە.

عاصم

* * *

(ئەو دەرگایەم دۆزییەوە کە بۆی دەگەڕام)

بڕگەیەکی "بابا جان محەممەد عەلی"یە

ئەی مامۆستای بەڕێز و ئەی ئـەو کەسـەی کـە لـە گیـانی خـۆم بەلامەوە ئـازیز و بەنرختریت!

من بە تەواوی دەستەوسانم لەوەدا کە مافی ڕەوا و شـایان بـە ئـەرکی "قوتـابێتی" بدەم و، ناتوانم خزمەتێکی ڕاستەقینە پێشکەش بە "پەیامەکانی نوور" بکـەم. چونکـە هەر کاتێك بیر لەو هێز و توانا و نهێنی و ڕووناکی یانە دەکەمەوە کە لە پەیامـەکانی نوورەوە دەردەکەون، لە هۆشی خۆم دەچم!

کەواتە من ناتوانم بۆ ئەم چەشنە لوتکە بەرزانە سەر بکەوم، بەڵام پشت بە خوا و بـەپێی توانـا هـەوڵ دەدەم سـوود لـەم پەیامانـە وەربگـرم کـە نهێنییـەکانی قورئـان دەردەخەن و بەلامەوە هەزاران جار لە گەوهەرە بەنرخەکان بەهادارتر و بەنرخترن. ئەمەش فەزڵ و چاکەیەکی خوای گەورەیە بەسەر بەندە ئیماندارەکانیـەوە. لەمـەولا بەشێکی شەوەکانم بە نوورەکانی ئەو پەیامانە ڕووناك دەکەمـەوە، چونکـە بـە ڕۆژدا لەبەر سـەرقاڵیم بـە داخوازییـەکانی ژیـان و گوزەرانـەوە بوارێکـی ئـەوتۆم لەبـەر دەستدا نی یە.

هەرکاتێك ئەو ڕووناکی‌یانە دەنووسمەوە، لە دڵی خۆمدا هەست بە شادمانی و خۆشحاڵی‌یەکی لەوپەڕی شیرینی و تام و چێژدا دەکەم.

بەڵێ، من لە پێشکەش کردنی شوکرانەبژێریمدا بۆ خوای گەورە و بەتوانا کە ئەم هەموو نیعمەتە زۆرانەی پێ بەخشیوین، دەستەوسانم.

کاتی وا هەیە لە بەرامبەر ئەم ڕووناکی‌یە مەزنانەوە "ویست"ی خۆم لەدەست دەدەم. چونکە هەرکاتێ بیر لەو ڕۆژگارانەی ژیانم دەکەمەوە کە بە غەفلەت بەسەر چوون، خەم و خەفەت دام دەگرێتەوە. بەڵام لەو کاتەوە کە ئەم نوورانەم دەست کەوتووە، بۆ دوارۆژ دەڕوانم و بە دڵێکی گەشەوە پێدەکەنم و دڵخۆشی ڕووم تێدەکات. پازدە ساڵ بوو من چاوەڕێی ئەم خزمەتە مەزنەی قورئانم دەکرد، چونکە هەموو جۆرە خۆشی و لەزەتێکی ژیانی دنیام چەشت، بەڵام هیچ کامیان ئەو ئارەزووە قووڵە بۆ ئەبەد موشتاقەی منیان تێر نەدەکرد. وا ئێستا خۆراکی تەواوی ئەو ئارەزووەم و دڵنیایی تەواوم بەدەست هێنا.. فالحمد لله أولاً وآخراً.

بەڵێ، "دەروون"م تا ئێستا بە چەند چێژێکی ڕواڵەتیی دنیا خەڵەتا و لە خشتە چوو، تا ئەو چێژانە منیان گەیاندە دەرگاکانی بەندیخانەی سامناکی دوارۆژ. "دەروون"م تا ئێستا هەر سواری ملم بووە و هەوا و ئارەزووەکانی خۆی لەسەر ئەستۆم داناوە. بەڵام وا ئێستا - شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە - خواوەند بە نهێنی‌یەکانی قورئانی پیرۆز و لە ڕێی مامۆستا سەعیدەوە فریام کەوت و بە هانامەوە هات و، بە فەزڵی خوای گەورە لە چڵك و چەپەڵی‌یەکانی ئەو "نەفسە ئەمارە"یە ڕزگارم بوو.

بەڵێ، بە درێژایی ئەو پازدە ساڵە لە گەڵێ دەرگای زۆرم دا و، بە دوای ئەو ڕێگایەدا دەگەڕام کە مرۆڤ دەگەیەنێتە "ڕاستی". بەڵام دەستم لە زۆربەیان داشۆرد، چونکە ئارایشتی ژیانی دنیام تێدا دەبینین! بەڵام ئێستا - سوپاس بۆ خوا - ئەو دەرگایەم دۆزی‌یەوە کە بە ڕاستی دەمویست و بە شوێنیدا دەگەڕام.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە بمخاتە ڕیزی خزمەتگوزارانی ئەو دەرگایە و، بەردەوام بوونیشم لەسەر ئەم خزمەتە بەرزە پێ ببەخشێت.

مەگەر تەنها بە "نەزانی" دەنا هەرگیز ناتوانرێت ئینكاریی مەودای ئەو سوودە مەزنانە بكرێت و چاویان لە ئاستدا بنووقێنرێت كە "پەیامەكانی نوور" پێشكەشیان دەكەن، لە ڕووی بڵاوكردنەوەی ڕاستییەكانی ئیمان و، ڕەواندنەوەی تاریكاییەكانی ئەم چەرخە تاریك و نووتەكەوە.

اللهم ارفع الغشاوة عن أبصارنا وأرنا الحق حقا وارزقنا اتباعه.

باباجان محەممەد عەلی

* * *

(ئایا شتێكت لە دڵدا هەڵگرتووە)؟

ئەم نامەیە بە بۆنەی پرسیارێكەوە نووسرا كە لە مەسەلەیەكی بچووكدا بەم جۆرە هاتبوو:

"ئایا شتێكت لە دڵی خۆتدا هەڵگرتووە"؟

ئەی مامۆستای بەڕێز و بەتوانام!

تۆ لە هەموو ژیانم بەنرختریت و، هەموو كات و ساتێك ئامادەم بۆ جێبەجێ كردنی هەر فەرمانێك لە فەرمانەكانت ژیانی خۆم بەخت بكەم!

بەڵێ، هەرگیز دوودڵ نیم لە بەخشینی ئەم دیارییە مەزنەی "ژیان" لە پێناوی پەروەردگاری مەزندا كە هەر خۆی ئەو نیعمەتەی بەخشیوە.

ئەی مامۆستای بەڕێزم!

ئێمە لە هەموو كاتێكدا ئامادەین كە نیعمەتی ژیان - كە ئەمانەتێكە و نازانین چ كاتێك لێمان دەسێنرێتەوە - بە نیعمەت بەخشە ڕاستەقینەكەی پێشكەش بكەین. من لە هەموو كاتێكدا و بێ هیچ دوودڵییەك و بۆ مەبەستی جێبەجێ كردنی ئەم فەرمانەی خوای گەورە، ئامادەم. جەنابیشتان لەبەر ئەوەی فەرمانەكانی ئەو پەروەردگارە مەزنە ڕادەگەیەنن، ئەوا گوفتارە شیرینەكانتان هەروەك حەق و ڕەوایە، سۆز و میهرەبانییشە لە هەمان كاتدا.

پاشـان گـەورەم! پەلـە نزمـەکانی درەخـت دەقرتێنرێن و دەبڕرێـن تـاکو قـەدی درەختەکە بەرز بێتەوە و لە زیندەوەرە زیانبەخشەکان بپارێزرێت. ئیتر ئەو پەلانە بـە هیچ جۆرێك مافی ڕەخنە گرتنیان لەو کارە نی‌یە. چونکە ئەگـەر هـەروا بمانایەتـەوە لەوانەیـە زیندەوەرێکـی زیانبـەخش بیبڕیایـە و ڕەگـەکانی بڕزینایـە و بـە تـەواوی لەناوبچوونایە.

مامۆستای بەتوانام!

بێ هیچ زیادەڕەوی‌یەك دەڵێم:

بـاوەڕم وایـە کـە هیـچ کەسێك نی‌یـە وەکـو مـن نوقمـی گوناهــو تاوانبـاری بوو بێت. تەنانەت هەندێ جار "دەروون"یشم قەناعەتی بەمە کردووە. ئنجا نەك هەر تا ئەژنۆ و پشت و لامل و سەرشانم، بەڵکو هەر لە پاژنەی پێمـەوە تـا دەگاتـە تـەوقی سەرم، تەنانەت تا دەگاتە قووڵایی ناخی وجوودم، هەر هـەمووی نوقمی چڵکـاوی ئەو تاوان و گوناهانەیە.

جا لـەو کاتـەدا کـە ڕزیـن و گـەنیوی لـە هـەموو وجوودمـدا دەسـتی پـێ کرد، جەنـابتـان - بە ئیزنی خـوا و بە وێنەی خضر و لوقمانی حەکیم، درووديان لەسـەر بێـت - دەسـتتان دایـە چارەسـەر کردنم و، مەڵهـەمی شیفابەخشـی دەرمانخانەکـەی قورئانی پیرۆزتان لەسـەر برین و زامـە بۆن کردووەکـانم دانـا. واتـە: ئێـوە هۆکـاری بەخشینی ئەو ژیانەن کە شایانی ئەوەیە پێی بوترێت: "ژیان"!

کەواتە هەرگیز کارێکی ژیرانە نی‌یە کە لە پێناوی بەخشـەری ئـەو ژیانـەدا و بۆ ئەو کەسەش کە هۆکاری ئەو پێ بەخشینە مەزنە بووە، "ژیان" بەخت نەکرێت.

بەڵێ، دەبـێ نـەخۆش بزانێـت کـە پێویسـتی بـە نەشتەرگەری هەیـە و، قـەرزاری شوکر و سوپاسـی ئـەو کەسـەیە کـە بـە شـەو و بـە ڕۆژ چـاودێریی چارەسـەرکردنی دەکات. تەنانەت قەرزاری شوکرانەبژێری و حەمد و سـەنایەکی بێ سنووری ئـەو دانـا و زانـا بـێ وێنەیـە کـە ئـەو دەرمانـەی لـە دەرمانخانـەی قورئانـە پیرۆزەکەیـەوە بەخشیوە.

بەڵام ئەی مامۆستای بەڕێزم!

من گەلێ دڵگرانی ئەوەم کە ئەم قەرزەی ئەستۆم نەداوەتەوە. دەسا هەتاهەتایە خوای گەورە لێت ڕازی بێت، ئەی مامۆستا بەڕێزەکەم!

حافظ عەلی[1]

* * *

(پایەکانی ئیمان لە پەیامەکاندا)

ئەم ئاسەوارە نوورانییانە لە لایەکەوە شێوازی "تەرغیب" و لە لایەکی ترەوە شێوازی "تەرهیب" بەکار دەهێنن. واتە "تەرغیب" و "تەرهیب"یان پێکەوە تێدایە. گومانیش لەوەدا نییە کە هەر یەکێك لەم دوو هۆکارە کاریگەرییی گرنگ لە مرۆڤدا بەجێ دەهێڵێت. جا پەیامەکان لە ڕووناکیی ئەم ڕاستییەدا ئەهلی قورئان و قوتابیانی بەخەبەر دەهێنن و، شەش بناغەیان دەخەنە پێش چاو تاکو لە خشتە نەبرێن و نەخەڵەتێن:

١ - لە بریی "خۆشویستنی پلە و پایە"، هەوڵدان لە پێناوی "ڕەزامەندیی خوا" نە دڵی مرۆڤدا دادەنێن، کە ئەمەش لە "باوەڕبوونەوە بە خوای گەورە" سەرچاوە دەگرێت.

٢ - لە بریی "ترس" و دووچار بوونی مرۆڤ بە وەهم و گومانەکان، "باوەڕ بە قەدەر" لە دڵیدا دادەنێن.

٣ - لە بریی هەڵپە و تەماع، ئەو ئیمانە لە دڵی مرۆڤدا دادەمەزرێنن کە: هەر تەنها خوای گەورە ڕۆزیدەر و بەهێز و بەتوانایە.

٤ - لە بریی هەست و نەستەکانی دەمارگیری، باوەڕ بە پێغەمبەرە بەڕێزەکان - دروودی خوایان لەسەر بێت - لە پێشەنگیانەوە پێغەمبەری سەردارمان ﷺ لە

---

(١) "حافظ عەلی" لە پێشەنگی قوتابییە دێرینەکانی مامۆستا نوورسییە و، بەهۆی ئەو خەت خۆشی و هیممەت بەرزییەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو لە نووسینەوەی پەیامەکاندا گەلێ چوست و چالاك بووە. ساڵی ١٩٤٤ لە بەندیخانەی دەنیزلی لە تەمەنی ٤٦ ساڵیدا ژەهری دەرخوارد دراوە و شەهید کراوە. خوای گەورە نوقمی میهرەبانیی فراوانی خۆی بکات. ئامین. (وەرگێڕ)

دڵی مرۆڤدا دادەنێن کە بۆ هەموو گرۆی جینی و ئادەمیزاد ڕەوانە کراوە. ئەمەش جێبەجێ کردنی فەرمانی ئەم ئایەتە پیرۆزانەمان بۆ دەهێنێتە دی:

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات:١٠)..

﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً وَلَا تَفَرَّقُوا﴾ (آل عمران:١٠٣).

٥ – لە بریی خۆویستی و خۆشویستنی زات، فێرمان دەکەن کە دان بە دەستەوسانی و ناتەواویی خۆماندا بنێین، هاودەم لەگەڵ پەی بردنێکی تەواوەتی بەوەی کە ئێمە ئەنجامدانی ئەرکی خزمەت و کارکردنمان بۆ قورئانی پیرۆز خراوەتە ئەستۆ لە ڕێی بڵاوکردنەوە و پاراستنی ئەو پەیامانەی کە لە قورئانەوە پاڵێوراون، بە بێ چاوەڕوان کردنی هاتنەدیی ئەنجامەکانی ئەو کار و خزمەتە. واتە دەستبەرداربوون – تا ڕادەیەك – لە هاندەرە مرۆییەکان و چاو کردن لەو مەلائیکەتانەی کە لە ڕێیانەوە کتێب و صوحوفە ئاسمانی‌یەکان ڕەوانە کراون. ئیتر بەم شێوەیە پایەی "ئیمان بە مەلائیکەت" دەهێنینە دی.

٦ – لە بریی تەمبەڵی و پاڵدانەوە و حەوانەوە، خێرایی و چوست و چالاکی لە مرۆڤدا دادەنێن بۆ کاری خزمەت بەو قورئانەی کە هەموو سەعاتێکی هاوتای ڕۆژێك خواپەرستی‌یە.

هەروەها ئەم پەیامانە بە جۆرێك چاومان دەکەنەوە کە ڕێزی شایان لە "کات" بگرین و بە توندی هۆگری کاری "خزمەت بە قورئان" بین، پێش ئەوەی ئەم کارە خاوێنەمان لەدەست دەربچێت. هاودەم لەگەڵ چاوکردنەوە و بێداری بۆ تێگەیشتن لە کاروبار و ڕووداوەکان. واتە: زانینی نرخی "ژیان" پێش ئەوەی "مردن" لە پڕ یەخەمان پێ بگرێت.

ئیتر بەم جۆرە، ئەی مامۆستای بەتوانام! ئێوە بە: دەلالەت و، هێما و، ئاماژە و، ڕاشکاوی، خەڵکی بۆ لای "باوەڕ بە دواڕۆژ" ڕێنمایی دەکەن.

خوای گەورە لێتان ڕازی بێت و، نەتەوەی پێغەمبەریش ﷺ لە گومڕایی دەرباز بکات و، لە هەوڵ و جیهادە بێگەردەکەتاندا، کە بۆ بانگهێشتی خەڵکی بۆ لای قورئان ئەنجامی دەدەن، سەرتان بخات.

آمین.. آمین.. بحرمة سيّد المرسلين وبحرمة القرآن المبين.

بەشی حەوتەمی مەکتووبی بیست و نۆهەمم بۆ بەڕێز عەبدولمەجیدی براتان نارد. لە وەڵامیدا وتی:

(جگە لە خلووصی و عەبدولمەجید بۆ کەسی تر دروست نی‌یە سەیری ئەو کیژۆلە جوانەی زادەی بیری کاکەم بکات! تەنانەت مەحرەمەکانیش لەمەدا وەك بیانی وان. پێم باشە نامەیەك بۆ کاکم بنووسیت کە: چوونە دەرەوەی ئەم کیژۆلە جوانە هیچ سوودێکی تێدا نی‌یە، بەڵکو لەوانەیە گەلێ زیانی گەورەشی لێ بیتەوە. تووڕەیی و زوو هەڵچوونی "سەعیدی کۆن" لە "سەعیدی نوێ"شدا هەر ماوە. بەپێی خواستی ڕێباز و مەشرەبەکەی دەبێ سەعیدی نوێ کاتی لەگەڵ خەڵکیدا بە زایە نەدات. بەهەرحاڵ، پارێزگار هەر خوای گەورەیە).

منیش لە لایەنی خۆمەوە بەمەی خوارەوە وەڵامم دایەوە:

بەڵێ، ئەم ڕایەت سەبارەت بە ئێمەوە ڕاستە، بەڵام پێم وا نی‌یە سەبارەت بە مامۆستای بەڕێزیشمانەوە، کە پشتی لە دنیا هەڵکردووە و بە ڕاستی و دروستی ئەرکەکەی سەرشانی ڕاپەڕاندووە، ڕاست بێت! چونکە ئەو کەسەی کە لەم کارە مەزنەدا خستوویەتیە کار، بێ هیچ گومانێکیش دەیپارێزێت.

قەناعەتێکی تەواوم بەوە هەیە کە مامۆستا پشت لە ئێمەش هەڵدەکات گەر پەیوەندی‌یەکانمان بە پەیامەکانی نوورەوە بپچڕێن.

بەڵێ، نیگەرانی و دڵەتەپێی برای ئازیزمان ڕاستە و لەجێی خۆیدایە ئەگەر ڕواڵەتی شتان ڕەچاو بکرێن. بەڵام بێ بەش کردنی ئەو کەسە کەمانەی کە پەیوەندی‌یان بە پەیامەکانی نوورەوە هەیە لەم ڕاستی‌یانە و شاردنەوەی ئەم ئاسەوارە بەرزانە لێیان، بە کارێکی دروست نازانم، بەڵکو پێچەوانەی بناغەی پەیامەکانی نوورە. خۆ هەر تەنها خوای گەورە باشترین پارێزەرە و لە هەموو خاوەن بەزەییەك بەسۆزترە و هەر ئەویش پشتگیر و یارمەتیدەرمانە. ئەرکی سەرشانی ئێمە تەنها: ڕەواندنەوەی گومانەکان و پووچەڵ کردنەوەی فڕوفێڵەکان و پابەند بوونە بە نیازی خاوێن و هەست و شعووری بێگەرد و شەوقی گەرم و گوڕەوە لە هەوڵ و

تێکۆشانەکانماندا بۆ مەبەستی پشتگیریی ئەو کارەی کە مامۆستای بەڕێزمان ئالاکەی هەڵکردووە.

سڵاو لە هەموو برایانمان دەکەین، هاودەم لەگەڵ دوعای سەرکەوتن و ڕاستی و دروستی لە هەڵوێستەکانیاندا. هەروەك تکام وایە لە بەڕێزتان کە دوعام بۆ بفەرموون و چاو لە هەڵەکانم بپۆشن و قوتابیی‌یە ڕاستەکەتان لە دوعاکانتاندا بێ بەش نەکەن.

الباقي الحب في الله

خلووصی

* * *

(هۆی ناردنەوەی دیارییەك)

"نامەیەکە لە بارەی ناردنەوەی دیاریی برایەکەوە نووسرا کە وەك "خلووصی" بەلامەوە ئازیزە و، لەسەر ڕای برایانم خرایە ناو برگەکانی خۆیانەوە".

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ هەردوو برای قیامەتی و ئازیز و بەوەفام: کاك حاجی نووح و مەلا حەمید!

گەلێ هۆکاری زۆر هەن کە ڕێی دیاری وەرگرتنم پێ نادەن، گرنگەکەیانتان بۆ باس دەکەم کە بریتیی‌یە لەوەی: "وەرگرتنی دیاری" پەیوەندیی یێگەرد و گەرموگوڕی نێوان من و قوتابیانی نوور دەشێوێنێت. سەرەڕای ئەوەی کە من، بەهۆی قەناعەت و بەرەکەت و لانەدانم لە دەست پێوەگرتن، تا ئەو ڕادەیە دەستکورت و موحتاج نیم کە وەری بگرم. بەڵکو هەر ناتوانم دەستەکانم بۆ ماڵی دنیا درێژ بکەم و کارێکە لە توانا و ویستی خۆم بەدەرە.

وا لە نێوان هۆکارە زۆرەکانی ئەمەدا یەك هۆکاری ورد باس دەکەم:

هاوڕێیەکی دڵسۆز کە بازرگان و کاسبکارە، ئەندازەیەك "چا"ی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنابووم کە بایی سی قورش دەبوو، بەڵام من لێم وەرنەگرت.

وتی:

مامۆستای بەڕێزم! نائومێدم مەکە و دەست بە ڕوومەوە مەنێ، چونکە لە ئەستەمبووڵەوە بۆم هێناویت!

منیش لێم وەرگرت، بەڵام بە دوو قات نرخەکەیم پێ دا!

وتی:

مامۆستا! بۆچی ئەم جۆرە مامەڵەیە دەکەیت و چ حیکمەتێکی تێدایە؟

وتم:

تاکو نرخی ئەو دەرسەی کە تۆ لە منی وەردەگریت و هێندەی ئەڵماس بەنرخ و بەهادارە دانەبەزێنمە ئاستی وردە شووشە بێنرخەکان. واتە: من لەبەر سوودی تۆ واز لە سوودی تایبەتیی خۆم دەهێنم!

بەڵێ، ئەو دەرسی "ڕاستی"یەی کە لە مامۆستایەك وەری بگریت بۆ بەدەستهێنانی خاشاکی دنیا دانەبەزێت و، پێی بۆ تەماع و زەلیلی نەترازێت و، لە بەرامبەر خزمەتگوزارییەکانی لە پێناوی حەق و ڕاستیدا داوای هیچ شتێك نەکات و، ناچاری مەرایی کەس نەبێت، بێ گومان ئەو دەرسە، بە وێنەی "ئەڵماس" بەهادار و بەنرخ دەبێت.

بەڵام ئەو دەرسەی کە لە مامۆستایەك وەرگیرابێت ناچاری وەرگرتنی خێر و صەدەقە و مەرایی بووبێت بۆ دەوڵەمەندان و، عیززەتی زانستیی خۆی لە پێناوی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیدا دانابێت و، لە بەردەم ئەوانەدا ڕیا و مەرایی بنوێنێت کە خێری پێ دەبەخشن و، بەم کارەشی بواری بە خۆی دابێت بەروبوومەکانی ئەودنیای لەم دنیا وەربگرێت.. نرخی ئەو دەرسە، تا ئاستی وردە شووشە دادەبەزێتە خوارەوە.

* * *

(هەستی بێگەرد و خاوێنی برایانە)

بۆ برای ئازیز و بەوەفا و ڕاستگۆ و چالاکم و، هاوڕێم لە خزمەتگوزاریی قورئاندا: بەڕێز کاك "ڕەئفەت"!

ئەو کارەی کە لە بواری خزمەتی قورئاندا ئەنجامی دەدەیت، کارێکی سەرتاپا پیرۆزە. خوای گەورە لەو هەوڵ و تەقالایەدا پشتیوانتان بێت و شەوقی زیاترتان بۆ کار و خزمەت پێ ببەخشێت، بێ ئەوەی دووچاری سستی و بێزاری بن.

ئەم ئەرکەی ئێستاتان لە "نووسینەوەی دەستیی پەیامەکان" گەلێ گرنگترە، بەڵام واز لەویش مەهێنن.

وا دەستوورێکتان لە بارەی "برایەتی"یەوە بۆ ڕوون دەکەمەوە، کە دەبێ بە گەرمی و لێبڕانەوە ڕەفتاری پێ بکەن..

ژیان ئەنجامی "یەکبوون" و "یەکێتی"یە. جا ئەگەر ئەو یەکێتی‌یەی کە لە ئاستی تێکەڵی و ئاوێتەبووندایە لەدەست بچێت، ئەوا ژیانی مەعنەوییش دەڕوات و نامێنێت.

ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُم﴾ (الأنفال:٤٦) ئاماژە بەوە دەدات کە: هەرکات پشتگیری و هاوپەیوەندیی نێوان برایان تێکچوو، ئەوا "کۆمەڵ"یش چێژی خۆی لەدەست دەدات.

ئێوە دەزانن کە هەرکات سێ دانە ئەلف بە جیا جیا بنووسرێن نرخیان هەر سێ دانە دەبێت، بەڵام گەر بە پشتگیریی ژمارەیی کۆ بینەوە ئەوا نرخیان دەگاتە سەد و یازدە. بە هەمان جۆر گەر چەند کەسێکی وەك ئێوە لە خزمەتگوزارانی حەقدا هەریەکەیان بە جیا جیا کارەکانی ئەنجام بدات و بایەخ بە دابەشکردنی کار لە نێوان خۆیاندا نەدەن، ئەوا هێز و توانایان هەر تەنها هی سێ چوار کەس دەبێت، بەڵام گەر بە برایەتیی ڕاستەقینە و پشتگیریی یەکتری تێبکۆشن و هەریەکەیان شانازی بە فەزڵی ئەوانی ترەوە بکات تا بەهۆی نهێنیی "توانەوە لە برایەتیدا"(الفناء في الأخوة) وایان لێ بێت کە هەر یەکەیان بریتی بێت لەوی تریان.. ئەوا نرخی ئەو چوار کەسە وەك هی چوار سەد کەسی لێ دێت!

برام! ئێوە وەك دینەمۆکانی کارەبایەك وان کە ڕووناکی نەك تەنها بە "ئیسپارتە" بەڵکو بە وڵاتێکی گەورە بدات. خۆ چەرخەکانی مەکینەش ناچارن هاوکار و تەواوکەری یەکتر بن. چونکە هەریەك لەو چەرخانە نەك هەر دژایەتی و بێزاریـان بەرامبەر بەوانی تر تێدا نییە، بەڵکو حەوانەوەشیان لەو هـێزە گەورەیەوە بەدەست دەهێنن کە هی چەرخەکانی ترن، چونکە ئەرکی سەرشانی لەسەر سووك دەکەن.

ئـەو کەسـانەی ئـەرکی خزمـەتگوزاریی ئیمـان و قورئـان لەسـەر شـانیان هەڵدەگرن، کە وەکو گەنجینەیەکی گەورە و بەرزی حەق و ڕاستی وایە، هـەرکات چەند شان و بازوویـەکی بەهێز و هاوکار بچێتـە ڕیزیانـەوە و گەنجینـە مەزنەکەیان لەگـەڵدا هـەڵبگرێت، دەبێـت بـە مایـەی شـانازییان، هـەروەك سوپاسـی پەروەردگاریشی لەسەر دەکەن.

کەواتە وریابن! هەرگیز دەرگای ڕەخنـە لـە نێوانتـاندا نەخەنـە سـەر پشـت. ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی ڕیزەکەتاندا شـایانی ڕەخنـەن، گەلـێ زۆرن. جـا هـەروەك من شـانازی بـە تایبەتکارییـەکانی ئێـوەوە دەکـەم و، حەوانـەوە و دڵنـەواییم لـەو تایبەتکارییانەی ئێوەدا بەدەست دەهێنم کە خۆم لێیان بێ بەشم و بـە هـی خۆمیـان دادەنێم، دەبـێ ئێـوەش بـە هـەمان جـۆر بڕواننـە تایبەتکارییـەکانی برایانتـان و هەریەکەتان فەزڵ و چاکەی ئەوانی تر بڵاو بکاتەوە.

بە شایانی دەزانم کە ئێوەش لەو هەستە برایانە بێگەردەی برای بـەڕێزمان "حـافظ عەلی" ئاگادار بکەمەوە کە بەرامبەر برایەکمان دەری بڕی لە نووسینەوەی دەسـتیی پەیامەکاندا دەبووە ڕکەبەری..

وا لە خوارەوە دەیگێڕمەوە بۆتان:

"حافظ عەلی" هات بۆ لام و، پێم وت:

خەتی "فلانە برا" لە خەتی تۆ خۆشترە و کار و چالاکیشی لە هی تۆ زیاترە!

بینیم "حافظ عـەلی" لـە نـاخی دڵـەوە – بە ئیخـلاس و بێگـەردی – شـــانازی بە سـەرکەوتنی ئـەو برایـەوە دەکـات بەسـەریدا، تەنانـەت لەزەتیشـی لـەم هەواڵـە

چەشت و دڵی پێی کرایەوە، چونکە ئەو برایە توانیویەتی خۆشەویستی و مەدح و سەنای مامۆستاکەی بەدەست بهێنێت!

کە بە وردی سەرنجی دڵی "حافظ عەلی"م دا و بۆم ڕوانی، زانیم ئەم گوفتارەی هەرگیز دەستکرد و مەرایی نی‌یە، بەڵکو تێگەیشتم کە هەستێکی بێگەرد و خاوێنە!

منیش پڕ بە دڵ گەلێ شوکرانەی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەوەی کە لەناو برایانماندا کەسێکی وا هەیە ئەم هەست و سۆزە بەرزەی تێدا بێت. پشت بە خوا ئەم هەستە گەلێ خزمەت ئەنجام دەدات. سوپاس بۆ خوای گەورە وردە وردە ئەم هەست و سۆزە برایانەیە لەناو ڕیزی برایانی ئەم ناوچەیەماندا بڵاو بووەتەوە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(لە خوێندنەوەی پەیامەکان تێر نابم)

مامۆستای بەڕێزم!

ئەم "هێما"یانە[1] چەند ئاسەوارێکی ناوازە و نائاساییں و، سەرسووڕمانی مرۆڤ دەورووژێنن. چونکە چەندین چێژی نەبڕاوە و هەست و نەستی بەرز و ناسك بە خوێنەرانیان، لە شەیدایانی زانست، دەبەخشن. من بەش بە حاڵی خۆم سەرلەنوێ ژیانم بەم هەست و نەستە بەرزانە تازە بووەوە - گەر خوای گەورە لەسەر ئەم ژیانە نوێیە بە دامەزراوی بمانهێڵێتەوە - بە ڕادەیەك کە هیوای تەمەن درێژی لە خوای گەورە دەخوازم! ئەمەشت بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە لە خوێندنەوەیان هەرگیز تێر نابم و، تا بیانخوێنمەوە وەك ئەوە وایە پێشتر نەم خوێندبێتنەوە و، وەکو کەسێك وام کتێبێکی تازە بخوێنێتەوە. بۆیە بە چێژێکی مەعنەویی بێ سنوور و حەزێکی ڕۆحیی بێ کۆتایی دەیانخوێنمەوە.

---

(١) هەشت هێماکان: پەیامێکە تەوافوقە ناسکەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا و، نهێنیی پیت و وشەکانی باس دەکات. (وەرگێڕ)

ئەم دیاردەیەش چ لە "وتەکان"دا و چ لە "مەکتووبات"دا و چ لە "هێماکان"دا وەکو یەك وایە و لە هەموویاندا یەکسانە. پێم وایە وەسفی دەراسایی ئەم پەیامانە ـەم خاڵە وردەدا کۆ دەبێتەوە. لە کاتێکدا کە مرۆڤ گەر تەنها یەك جار کتێبی تر بخوێنێتەوە ئیتر حەزی خوێندنەوەیەکی تری تێدا ناورووژێت.

بەڵێ، هەتا زیاتر ئەم نوورە قورئانی‌یانە بخوێنمەوە، ناتوانم دەست بە رووی حەز و تامەزرۆیی خوێندنەوەیەکی تریانەوە بنێم، بە تایبەت "هێماکان" چونکە منیان نوقمی سەرسوورمان و کەمەندکێشی خۆیان کردووە. لەبەر ئەوە، یەکسەر نە دوای خوێندنەوەی پەیامەکە دەستم بە نووسینەوەی کرد!

ڕەنفەت

* * *

(تاقانە دڵنەوایی من)

مامۆستای ئازیز و میهرەبانم!

جەنابتان دەتانەوێت ئەم قوتابی‌یە کۆڵەوارەی خۆتان - کە لە پێناوی خوادا ئێوەی خۆش دەوێت - بێدار بکەنەوە و، بە هەموو شێوەیەك و لە ڕێی هۆکاری جۆراوجۆرەوە بۆ ڕێنمایی کردنی تێدەکۆشن و، چەندین وانەی مەعنەویی یەکجار بەرزی پێ دەڵێنەوە. بەڵام من ناتوانم لە ڕێزنەی ئەم دەرسانە بەهرەمەند بیم وەك ئەوەی کە ئەو برا ئازیز و بەڕێزانەم لێیان سوودمەند دەبن کە لەخزمەتتاندا دادەنیشن و شەرەفمەندی هاوەڵێتی و نزیك بوونی ماددی و مەعنەوین لێتانەوە ئەوانەی کە بە پشتیوانی بەدیهێنەری گەورە و مەزن هەنگاوی ڕاستیان لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا ناوە.

من هۆکاری ئەمە دەگێڕمەوە بۆ گوناهباریم و، زیادبوونی هەڵە و گوناهەکانم و، کاریگەریی دەوروبەر و ڕووداوەکان لە سەرم، کە دەبن بە تەگەرە لە ڕێی کاری نوورانیدا.. هەروەك گەلێ جار دەیگێڕمەوە بۆ هێرشەکانی دەروونی بەدخوازم و شەیتانەکانی جینی و ئینس. ئا لێرەوە هەست بە بەدبەختیی خۆم دەکەم.

بەڵێ، من سەرەڕای ئەمە، هەست بەو نیعمەتە لە ژمارە نەهاتووانەش دەکەم کە بەدەستم هێناون و نەمتوانیوە - بە داخەوە - شوکرانەیان لەسەر پێشکەش بکەم. لە کاتێکدا کە هەموو ڕۆژێك و هەموو کاتژمێرێك تەنانەت هەموو خولەك و چرکەیەك کە بەسەر دەچێت بێدارم دەکاتەوە و کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە فانییەم و کۆچی دواییم لەم دنیا تەمەن کورتە یاد دەخاتەوە. کەچی سەرباری ئەمەش ناتوانم دەست لە داوێنی دنیا بەربدەم! تاقانە دڵنەوایی من تەنها پەیوەندیی توند و تۆڵمە بە قورئانی پیرۆزەوە و، ئیمانی دامەزراومە بە ئایینی ڕوونـاك و پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و ئەو شەریعەتە خاوێنەی کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی و، پەیوەندیی بەهێزیشمە بە مامۆستا خۆشەویستەکەمەوە. هیوادارم ئەم نوقم بووەی ناو تاوان و گوناهباری لە دوعا خاوێنەکانتان بێ بەش نەکەن.

خلووصی

* * *

(لە بارەی پەیوەندییەکانی نێوان مامۆستا و قوتابیانی)

بۆ برایانم: خەسرەو، لوتفی، ڕوشدی!

وا لە خوارەوەدا و بە جۆرێك کە سوودی بۆ ئێوە تێدا بێت، ڕا و بۆچوونی خۆمتان سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوان "مامۆستا" و "قوتابیان" و "هاوڕێیانی دەرس" بۆ باس دەکەم:

برایانم! ئێوە لە ڕوویەکەوە و بە ڕادەیەك کە لە سەرووی سنوور و توانای خۆمەوە بێت: قوتابیی منن و.. لە لایەکی تریشەوە هاوڕێمن لە دەرسدا.. هەروەك لە لایەکی ترەوە یاریدەدەر و هاوڕێیانی شوورا و پرس و ڕای منن.

برا ئازیزەکانم! مامۆستاکەتان لە هەڵە پارێزراو(معصوم) نییە. بەڵکو هەڵە لەوەدایە کە لەو باوەڕەدا بن تووشی هەڵە نابێت..

بەڵام هەرگیز سێوێکی گەنیو زیان لە باخەکەی نادات و، دراوێکی ساختە و قەڵبیش لەناو گەنجینەیەکدا نرخی گەنجینەکە ناشکێنێت.

جا لەبەر ئەوەی "خراپە" بە یەك دانە و، "چاكە"ش بە دە هێندەی خۆی دادەنرێت، ئەوا ویژدان داخوازی ئەوەیە كە:

ساف و خاوێنیی دڵەكان هەرگیز بەرامبەر كردەوە چاكەكان لێڵ نەكرێت و رەخنەیان لێ نەگیرێت، گەر گوناهێك یان هەڵەیەك لە خاوەنی ئەو كردەوە چاكانەوە بینرا.

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلانەی كە تایبەتن بە "ڕاستییەكانەوە" هەروەها "مەسەلە گشتییەكان" و "درێژە پێدانیان" بە شێوەیەكی گشتی، لە بابەتی "سانیحاتی ئیلهامی"ن، ئەوا بە چەند مەسەلەیەكی یەقینی دادەنرێن و هیچ رەخنەیەكیان ئاراستە ناكرێت.

سەبارەت بە را وەرگرتن و پرس و راشم پێتان لە بارەی ئەو مەسەلانە، ئەوا لە رووی جۆری وەرگرتنی ئەو مەسەلانەیە لە لایەنتانەوە، نەك لەو رووەوە كە ئایا حەق و حەقیقەتن یان نا؟ چونكە هەرگیز من دوودڵ نیم لەوەدا كە "حەقیقەت"ن!

جا ئەو ئاماژانەی كە تایبەتن بە پەیوەندیی نێوان تەوافوقەكان - لەبەر ئەوەی چەند سانیحاتێكی ئیلهامین - ئەوا بە شێوەیەكی رەها و پوخت و هەمەكی دێنە ناو دڵەوە. كەچی هەندێ جار زەینی كەم و كۆتام دەشێوێت و بە هەڵەدا دەچێت، لەمەشەوە درێژەپێدان و لق لێ بوونەوەكانی ئەم شێوە رەها و پوخت و هەمەكییە، بە ناتەواوی دەمێننەوە. جا دووچار بوونم بە هەڵە لەم چەشنە درێژە پێدانە هەرگیز زیان بە بابەتە بناغەییەكە و ئەوەش كە لە حوكمی موتڵەقدایە، ناگەیەنێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی خۆم بە باشی ناتوانم بنووسم و، نووسەرەوەشم بە هەمیشە و بەردەوامی لە لای خۆم بۆ نارەخسێت، ئەوا گوزارشت و دەربڕینەكان بە پوختی و لە شێوەی تێبینیدا دەمێننەوە و لێ تێگەیشتنیان قورس دەبێت.

ئەی برایان و هاوڕێیانی دەرسم!

ئەوە بزانن كە من گەلێ دڵخۆش دەبم گەر هەر هەڵەیەكتان لێ بینیم بە راشكاوی ئاگادارم بكەنەوە. تەنانەت گەر بە توند و تیژییەوە ئەو هەڵەیەشم پێ بڵێن، دەڵێم: خواتان لێ رازی بێت. چونكە نابێ لە ئاستی "حەق"دا بایەخ بە هیچ

شتێکی تر بدرێت. من بۆ قبوولّ کردنی هەر ڕاستی‌یەك ئامادەم کە "حەق" بە پێویستی دابنێت. خۆ ئەگەر ئەو ڕاستی‌یە نەزانم و شارەزای نەبم هەر کە پێم وترا - با پێچەوانەی دەروونی بەدخوازیشم بێت - بە بێ موناقەشە، لەسەر چاو و سەرمی دادەنێم.

باش بزانن کارکردن بۆ "ئیمان"، بە تایبەت لەم کاتەدا، گەلێ مەزن و گرنگە. بۆیە نابێت ئێوە ئەم کۆلّە قورسە بخەنە ئەستۆی کەسێکی لاوازی وەك من کە بیری دووچاری شپرزی و پەرتەوازەیی بووە. بەلّکو دەبێت بەپێی توانا ئێوەش یارمەتیی بدەن.

بەلّێ ڕاستە، کاتێ حەقیقەتە پوخت و ڕەهاکان دێن و دەردەکەون ئێمە دەبین بە هۆکاری ڕوالّەتی‌یان، بەلاّم ڕێکخستن و وێنە کێشانیان ئەرکی سەرشانی برا بەتواناکانمن. هەندێ جاریش من لە بریی ئەوان خۆم لەو درێژە پێدان و ڕێکخستنانەدا هەلّدەقورتێنم و لە ئەنجامی ئەمەشدا ناتەواو دەردەچن.

دەزانن کە "بێ ئاگایی" زیاتر لە وەرزی هاویندا زالّ دەبێت و خۆی دەسەپێنێت، چونکە زۆر کەسی هاوڕێمان لە وانەکان سارد دەبنەوە و ناچار دەبن کارەکانیان ڕابووەستێنن و، ناتوانن بە لێبڕان و گەرموگوڕی‌یەوە خۆیان بە ڕاستی‌یەکانەوە سەرقالّ بکەن.

برایانم! ئێمە لەم کاتەدا و لە بەردەم "گومڕایی" و "بێ ئاگایی"دا گەلێ پێویستمان بە "هێزی مەعنەوی" هەیە. بە داخەوە من لە ڕووی کەسیی خۆمەوە لاواز و هەژارم و کەرامەتێکی دەراسام نی‌یە کە ئەم ڕاستی‌یانەیان پێ بچەسپێنم و، خاوەنی هیممەتێکی قودسیی ئەوتۆش نیم کە دلّەکانی پێ ڕابکێشم و، زیرەکی‌یەکی بلّندیش شك نابەم کە ژیری‌یەکانی پێ ملکەچ بکەم. بەلّکو وەك خزمەتکارێکی دەروازەگەڕ وام لە بەردەم دیوانی قورئانی پیرۆزدا.

براتان

سەعیدی نوورسی

(پرسیارێك لەبارەی ڕۆحەوە)

بۆ كاك خلووصی نووسراوە

باسمه سبحانه

پرسیار: بۆچی ئیمامی غەزالی فەرموویەتی:
"بەدیهێنانی یەكەم جار بە تەواوی جیاوازە لە بەدیهێنانی دووهەم"؟
وەڵام:
قسەكەی "حوججەتولئیسلام ئیمامی غەزالی" كە وتوویەتی: بەدیهێنانی یەكەم جار تەواو جیاوازە لە هی دووهەم، لە ڕووی شێوە و چۆنێتی‌یەوەیە، نەك لە ڕووی ماهییەت و ڕەگەزەوە. چونكە گەر وانەبێت ئەوا وتەكەی پێچەوانەی واتای ڕاشكاوی گەلێ ئایەتی پیرۆز دەردەچێت وەك:

﴿يُحْيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِها وَكَذلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ (الروم:١٩)..
﴿وَهُوَ الَّذي يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ (الروم:٢٧).

پاشان ئەم وتەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە شتانی سەر بە دواڕۆژ لە ڕووی پلەوپایەیانەوە گەلێ بەرز و بڵندن.. پاشان ئاماژەیەكە لە لایەن ئیمامی غەزالی‌یەوە بۆ ئەوەی كە حەشری جیسمانی لەگەڵ حەشری ڕۆحانیدا بە یەكەوە دەبێت، وەك چاولێكەری و موسایەرەكردنێك بۆ هەندێ لە "باتینی"یەكان.

پرسیار: سەعدی تەفتازانی[1] دوای ئەوەی كە "ڕۆح"ی كردووە بە دوو بەشەوە

(١) تەفتازانی: ناوی "مەسعوودی كوڕی عومەری كوڕی عەبدوڵڵا"یە. ساڵی ٧١٢ك (یان٧٢٢) لە تەفتازانی سەر بە خۆراسان لە دایك بووە و، لە سەمەرقەندیش ساڵی (٧٩٣ك) كۆچی دوایی كردووە. لە زانستەكانی زمانی عەرەبی و مەنتیق و كەلام و بەلاغەدا پێشەوای زانایانی ڕۆژگاری خۆی بووە. دوای ئاوابوونی خۆری زانستە ئیسلامی‌یەكان لە ئەنجامی هێرش و پەلامارەكانی مغۆلدا ئەم زانایە هەوڵی دا ئەو زانستانە زیندوو بكاتەوە و گەلێ كتێبی سەرچاوەیی گرنگیشی بۆ ئەم مەبەستە دانا. تەنانەت بە سنووری نێوان زانایانی پێشین و دواین دادەنرێت. ئەمەش ناوی هەندێكە لە كتێبەكانی: (تـهذيب المنطق، شرح المقاصد، شرح العقائد النسفية، المطول، مختصر المعاني، التلويح في كشف حقائق التنقيح). تا ئێستاش هەندێ لەم كتێبانە لە قوتابخانەكانی كوردستان و زانكۆكانی چەشنی زانكۆی ئەزهەریشدا بە دەرس دەخوێنرێن. (وەرگێڕ)

یەکێکیان: ڕۆحی ئادەمیزادانە و ئەوی تریان ڕۆحی ئاژەڵانە، وتوویەتی: (تەنها ڕۆحە ئاژەڵانەکەیە کە دووچاری مردن دەبێت. بەڵام ڕۆحە ئادەمیزادانەکە "بەدیهاتوو" نی‌یە و هیچ پەیوەندی و هۆکارێك لە نێوان خوا و ئەودا نی‌یە، چونکە لە خۆیدا سەربەخۆیە و بە جەستەوە بەند نی‌یە).

بۆچی وای وتووە و ڕوونکردنەوەی ئەم قسەیە چی‌یە؟

وەڵام:

سەعدی تەفتازانی کە دەڵێت: (ڕۆحە ئادەمیزادانەکە بەدیهاتوو نی‌یە) مەبەستی ئەوەیە کە "ماهییەتی ڕۆح" بریتی‌یە لە یاسایەکی "ئەمری"ی زیندوو و، ئاوێنەیەکی خاوەن هەست و نەست بۆ ناوی جوانی "الحـــي"ی خوای گەورە و، جیلوەیەکی خاوەن جەوهەر لە درەوشانەوەکانی ژیانی سەرمەدی. کە ئەمەش ناوەرۆکی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێت: ﴿قُلْ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الإسراء:٨٥). لەبەر ئەوە، ڕۆح "مەجعوول"ە و، لەو ڕووەوە پێی ناوترێت: "مەخلووق".

سەعد لە "مەقاصید" و شەرحەکەیدا، وەکو هەموو زانا لێکۆڵەرەکانی تری ئیسلام ڕاستەوڕاست لەگەڵ دەقی ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکاندا وتوویەتی: "ئەو یاسای ئەمرە بوونێکی دەرەکیی لەبەر کراوە، کەواتە وەك هەموو بەدیهاتوویەکی تر بەدیهاتووە و تازە پەیدابووە". هەروەها هەموو ئاسەوارەکانی تری شایەتن لەسەر ئەوەی کە باوەڕی بە "ئەزەلییەتی ڕۆح" نەبووە.

سەبارەت بەوەش کە وتوویەتی: "ڕۆح هیچ پەیوەندی‌یەکی لە نێوان خۆی و خوادا نی‌یە" ئەوا ئاماژەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕێڕەوێکی هەڵە و ناڕەوای وەك "حلوول". چونکە ڕۆحی ئاژەڵەکانیش بە هەمان جۆر باقی‌یە و لە ڕۆژی قیامەتدا تەنها جەستەکانیان فانی دەبێت و لەناو دەچێت. لە کاتێکدا کە "مردن" فەنا و نەمان نی‌یە، بەڵکو پچڕانی پەیوەندی‌یە.

ئەوەش کە وتوویەتی: "هیچ هۆکارێك لە نێوان خۆی و خوادا نی‌یە" ئاماژەیە بۆ بەدیهێنانی ڕاستەوخۆی "ڕۆح" لە لایەن خواوەندەوە، بێ ئەوەی ناوەندە هۆکارەکان لە کایەدا بووبن، وەك لە موناجاتەکەی حەزرەتی عیزرائیلدا

- درورودی لەسەر بێت - دەردەکەوێت کە لە بارەی گیان کێشانەوە لەگەڵ خوای گەورەدا کردوویەتی.

سەبارەت بەوەش کە وتوویەتی: "ڕۆح لە خۆیدا سەربەخۆیە" ئەوا مەبەستەکەی لەوەدایە کە "جەستە" پاڵی بە "ڕۆح"ەوە داوە و بە ڕۆحەوە ڕاگیر بووە، کەچی ڕۆح پاڵی بە جەستەوە نەداوە و سەربەخۆیە، وەك لە "چەسپاندنی مانەوەی ڕۆح"دا باس کراوە. جا هەرکات کە "جەستە" تێکدەچێت "ڕۆح" پتر سەربەست دەبێت و وەك مەلائیکەت بە ئاسماندا دەفڕێت. ئەمەش ئاماژەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕێڕەوێکی هەڵە و ناڕەوا.

سەعیدی نوورسی

* * *

(ئەو پەیوەندی‌یەی کە کات و شوێن ناتوانن سنووری بۆ دابنێن)

گوفتارێکە ئاراستەی کاك خلووصی کراوە

بە ناوی ئەو کەسەی کە:

﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّموَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء: ٤٤).

وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته بعدد عاشرات دقائق عمركم، عمركم الله بالسلامة والعافية.

برای ئازیزم! نامەکەتان ئازاری دام. بەڵام بیرم لە ڕاستی‌یەك کردەوە و یەکسەر ئازارەکەم نەما. ڕاستی‌یەکەش ئەمەی خوارەوەیە:

پشت بە خوا ئەو پەیوەندی‌یەی کە بەیەکەوە دەمانبەستێتەوە و برایەتی‌یەکەی نێوانمان خاوێنە و لە پێناوی خوادایە. لەبەر ئەوە، کات و شوێن ناتوانن سنووریان بۆ دابنێن. کەواتە هەموو شارەکە و سەرانسەر وڵات و تەنانەت سەرتاسەری گۆی زەوی و بەڵکو هەموو دنیا و تەنانەت هەموو جیهانی وجوودیش سەبارەت بە دوو

برای ڕاستەقینەوە وەکو یەك کۆڕ و مەجلیس وایە و، لێکبڕان و جودایی لەم چەشنە هاوڕێیەتی و برایەتی‌یەدا نی‌یە، بەڵکو سەرتاپا ویصال و بە یەك شادبوونە. ئێمە کارمان بەسەر ئەو کەسانەوە نی‌یە کە هاوڕێیەتیی فانی و مەجازیی دنیا یەکی خستوون، با ئەوان خۆیان بیر لە جودایی خۆیان بکەنەوە، ئێمە جودایی لە ڕێبازماندا نی‌یە. *تۆ لە هەر جێگایەکدا بیت دەتوانیت لە ڕێی "وتەکان"ی* بەردەستەوە گفتوگۆ لەگەڵ ئەم برایەتدا بکەیت، منیش هەرکات بمەوێت دەتوانم لە تەنیشتی خۆمەوە ببینم کە پێکەوە دەستمان ڕووە و خوای گەورەی میهرەبان بەرز کردووەتەوە.

ئەگەر "قەدەر"ی خوای گەورە بۆ جێگایەکی تری ناردیت، ئەوا بە کەماڵی ڕەزامەندی‌یەوە جڵەوی کاری خۆتی پێ بسپێرە، چونکە خێر لەوەدایە کە خوا هەڵی بژێرێت! لەوانەیە جێگاکانی تر پێویستیان بە خاوەن دڵێکی ساغ و خاوەن ژیری‌یەکی ڕێك و ڕەوانی وەك ئێوە بێت کە وانەی ئیمانی تەحقیقی بە خەڵکی بڵێتەوە. سوپاس بۆ خوا لە "ئەگریدیر"دا خزمەتێکی گەورەت بۆ ئیمان پێشکەش کرد.

برای ئازیزم!

بێ گومان سەرقاڵی‌یەکانی بەهار و هاوین و کورتیی شەوگار و بەسەرچوونی سێ مانگەکە، جگە لەوەش کە زۆرینەی برایانم بەشی کارەکانی خۆیان وەرگرتووە و، چەندین هۆکاری تر، هەندێ سستی دەخەنە دەرسەکانی زستانەوە. بەڵام ئەو سستی و کەمتەرخەمی‌یەی کە لەو هۆکارانەوە پەیدا دەبن نابێت ئێوەش بگرێتەوە، چونکە ئەو دەرسانە چەند زانستێکی ئیمانین و هێندە بەس نی‌یە کە مرۆڤ تەنها خۆی گوێی لێیان بێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئێوە هەمیشە یەك دوو برای ڕاستەقینە بۆ خۆتان دەدۆزنەوە. پاشان بیشزانن کە ئەوانەی گوێ بیستی ئەو دەرسانە دەبن تەنها مرۆڤ نین، بەڵکو خوای گەورە گەلێ بەدیهاتووی خاوەن هەست و شعووری هەیە کە لەزەتێکی زۆر لە بیستنی ڕاستی‌یەکانی ئیمان دەچێژن. کەواتە ئێوە گەلێ هاوڕێ و گوێ بیستی زۆرتان لەم جۆرە هەیە.

هەروەها کۆڕ و هاومەجلیسیی ئیمانیی وەك ئەمانە - کە بیر کردنەوەی تێدایە - ئارایشت و گەشی و مایەی شانازی‌یە بۆ گۆی زەوی، ئەوەتا یەکێك ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە و وتوویەتی:

آســـمان رشـــك بـــرد بـــهر زمين كـــه دارد
يك دو كس يك دو نفس بـــهر خدا برنشـــينند

بەو واتایەی:

ئاسمانەکان خۆزگە بە زەوی دەخوازن، لەبەر ئەوەی یەك دوو کەسی ئەوتۆی تێدایە کە بە خاوێنی و بێگەردی لەبەر خوای گەورە یەك دوو خولەك بە زیکر و تێفکرینەوە پێکەوە دادەنیشن و، هەر یەکەیان ئاسەوارە جوانەکانی میهرەبانیی پەروەردگارە مەزنەکەی و سنعەتە ڕازاوە پڕ لە دانستەکەی بۆ ئەوی تر ڕوون دەکاتەوە و، بەم جۆرە پەروەردگاری خۆی خۆش دەوێت و، لای هاوڕێکەشی خۆشەویستی دەکات. هەروەها بیر لە ئاسەوارەکانی دەکاتەوە و هاوڕێکەشی دەخاتە ئەو بیر کردنەوەیە.

پاشان زانست دوو بەشە:

جۆرێکیان: یەك دوو جار سەروزیادە کە بیزانیت و لێی تێ بفکریت..

ئەوی تریان: وەك نان و ئاو وایە، مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا پێویستی پێی دەبێت و بیری لێ دەکاتەوە. کەواتە ناتوانێت بڵێت: لێی تێگەیشتم و سەروزیادمە. جا "زانستەکانی ئیمان" لەم بەشەن و، زۆربەی "وتەکان"ی بەردەستیشت - پشت بە خوا - بەر ئەم بەشە دەکەون.

سەعیدی نوورسی

* * *

## چەند مەسەلە و بابەتێکی هەمەڕەنگ

❑ مەسەلەی یەکەم:

پرسیار:

حیکمەتی زۆریی "سـڵاواتدان" لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ چییـە و، چ نهێنییـەك لەوەشدا هەیە کە هاودەم لەگەڵ سڵاواتدا "سەلام"یشی ئاراستە دەکرێت؟

وەڵام:

سـڵاواتدانی تەنها - بە بێ سـەلام - لەسـەر پێغەمبەر ﷺ ڕێگـای گەیشـتنە بـە "حەقیقەت".

خۆ هەرچەندە پێغەمبـەر ﷺ بەهرەمەندی ئەوپەڕی میهرەبانیی خواوەنـد بـووە، لەگەڵ ئەوەشـدا پێویستیی خـۆی بـۆ ئەوپـەڕی سـڵاوات لەسـەردانی لـە لایـەن نەتەوەکەیـەوە، دەربڕیـوە. چونکـە پێغەمبـەری خۆشەویسـت ﷺ پـەیوەندیی بـە ئازارەکانی سەرجەمی نەتەوەکەی و بەشێکیشـی لـە بەختەوەرییـەکانی ئـەواندا هەیە. جا لەبەر ئەوەی پەیوەندیی بە بەختەوەریی هەموو کەسانی نەتەوەکەیەوە هەیـە کە لە ئایندەیەکی بێ سنووری تا ئەبەد خایەندا گرفتاری چەندین بارودۆخی یەك لە دوای یـەك و نـەبڕاوە دەبن، ئـەوا پێویسـتیی خـۆی بەوپـەڕی سـڵاواتدانی ئـەوان دەرخستووە.

پاشان پێغەمبەری ئازیز ﷺ هەروەك "بەندە"یە، لە هەمان کـاتدا "پێغەمبـەر"یشـە. بۆیـە لـە ڕووی "بەندایـەتی"یەکەیـەوە پێویسـتی بـە سـڵاوات دەبێـت، لـە ڕووی "پێغەمبەرایـەتی"یەکەشـیەوە پێویسـتی بـە سـەلام لـێ کـردن دەبێـت. چونکـە "بەندایـەتی" لـە مەخلووقـەوە ڕووی لـە خالیقـە، هـەتا پلـەی مەحبووبییـەت و

میهرەبانی بەدەست دەهێنێت، جا "سڵاواتدان" ئەم واتایە دەگەیەنێت. بەڵام "پێغەمبەرایەتی" ناردنی کەسێکە لە لایەن خالیقەوە بۆ لای مەخلووق، بۆیە داخوازی سەلامەتیی نێرراوەکەیە و ملکەچ بوونی خەڵکییە بۆی و قبووڵ کردنی کارەکەی ئەستۆیەتی و سەرکەوتنیەتی لە ڕایی کردنی ئەرکەکەی سەرشانیدا. وشەی "سەلام"یش هەموو ئەم واتایانە دەگەیەنێت.

پاشان ئێمە کە دەڵێین: "سیّدنا" مەبەستمان پێی ئەوەیە کە:

ئەی پەروەردگارا میهر و سۆز و بەزەییت بە سەرۆکەکەماندا بێتەوە کە پێغەمبەری تۆیە بۆ لای ئێمە و نێرراوی ئێمەشە بۆ دیوانی حوزووری شکۆمەندتان، تاکو ئەو میهرەبانییە ئێمەش بگرێتەوە.

اللهم صلّ وسلّم على سيّدنا محمد عبدك ورسولك وعلى آله وصحبه أجمعين.

* * *

❑ مەسەلەی دووهەم:

وەڵامێکی کورتە بۆ پرسیارێکی دوور و درێژی یەکێك لە برایانمان.

ئەگەر دەڵێیت:

ئەم "سروشت"ە چییە کە گومڕایان و بێ ئاگایانی بۆ خلیسکاوە و لە ڕێیەوە دووچاری کوفر و پێنەزانی بوون و بەرەو "أسفل سافلين" بەربوونەتەوە، دوای ئەوەی کە لەوەوپێش لە پلەی "أحسن تقويم"دا بوون؟

لە وەڵامدا دەڵێین:

ئەو شتەی ئەوان پێی دەڵێن: "سروشت" لە ڕاستیدا شەریعەتە فیطرییە گەورەکەی خواوەندە، کە بریتییە لە "کۆی یاساکانی عادەتی خوای گەورە" کە ڕێسا و ڕێکوپێکیی کارە خواییەکان دەردەخەن.

ئاشکرایە کە "یاساکان" چەند شتێکی "ئیعتیباری"ن و تەنها خاوەنی "بوونی زانستی"ن، نەك "بوونی دەرەکی".

بەڵام "بێ ئاگایی" و "گومڕایی" ئەوانی گەیاندووەتە ئەوەی کە هیچ شتێك لە بارەی نووسەر و نەخشەکێشە ئەزەلی‌یەکەی ئەو یاسا فیطری‌یانەوە نەزانن! بۆیە پێیان وایە کە ئەو کتێبە و نووسینەکەی ئەو کتێبەش خودی نووسەرەکەیە و.. نەخشەکەش خودی نەخش ڕێژەکەیە و.. یاساکەش توانستە و.. ڕاستەکەش سەرچاوەیە و.. ڕێساکەش ڕێکخەری ڕێسایە و.. سنعەتەکەش سنعەتکارە!

هەروەها ئەگەر مرۆڤێکی نەزان، کە لەوەوپێش ژیانی کۆمەڵایەتیی نەدیبێت، بڕواتە ناو سەربازگەیەکی مەزن و جموجووڵە ڕێك و بەردەوامەکانی سوپا ببینێت، کە بەپێی چەند ڕێسایەکی مەعنەوی ئەنجامی دەدەن، پێی وا دەبێت ئەو سەربازانە بە چەند پەتێکی ماددی‌یەوە بەسراونەتەوە.. یان گەر ئەو کەسە بڕواتە ناو مزگەوتێکی گەورە و هەڵسوکەوتە جوان و ڕێکەکانی موسڵمانان لە نوێژی "جەماعەت" یان "جەژن"دا ببینێت، لە ئەندێشەی خۆیدا پێی وا دەبێت کە نوێژخوێنانی مزگەوت بە چەند پەتێکی ماددی‌یەوە پەیوەستن..

بە هەمان جۆر گومڕایانیش - کە لەم نەزانە گەلێ نەزانترن - کاتێ دێنە ناو ئەم گەردوونەی کە سەربازگەیەکی مەزنی ئەو پادشایەی ئەزەل و ئەبەدە کە خاوەنی سەربازەکانی ئاسمانەکان و زەوی‌یە.. یان کاتێ دێنە ناو ئەم جیهانەوە کە خۆی لە خۆیدا مزگەوتێکی گەورەی پەرستراوی ئەزەلی‌یە.. دەچن یاسا و ڕێساکانی ئەو پادشایە بە "سروشت" ناو دەبەن و، لەو ئەندێشەیەدان کە شەریعەتە مەزنە پڕ لە حیکمەتە نەبڕاوەکانی ئەو پادشایە وەك "هێز" یان "ماددە"یەکی کەڕ و کاس و، کوێر و، تێکەڵ و پێکەڵ وابێت!

بێ گومان هەرگیز بەم جۆرە کەسە ناوترێت: "مرۆڤ" تەنانەت پێشی ناوترێت: "ئاژەڵێکی وەحشی"! چونکە ئەو شتەی لە ئەندێشەی خۆیدا بە "سروشت"ی داناوە، ناچاری دەکات کە "زانستێکی گشتگیر" و "توانا" و "هێز"ێکی ئەوتۆ بە هەموو "هۆکار" و "گەردیلە"یەك ببەخشێت کە هەموو یەکێکیان بتوانن سەرجەمی بوونەوەران بەدی‌بهێنن، تەنانەت دەبێت هەموو

سیفەتەکانی خواوەندی "واجب الوجود" بە هەموو "گەردیلە" و "هۆکار"ێك بیەخشێت و پێی ڕەوا ببینێت!

خۆ ئەمەش مەحاڵێکی لەوپەڕی گومڕاییدایە، بەڵکو ورێنەیەکە لە گەلحۆیی و گومڕاییەوە سەری هەڵداوە.

"وتەکان" و چەند پەیامێکی تر لە سەد و یەك شوێندا چەمکی سروشتیان بە تەواوەتی کوشتووە و لەناویان داوە. هەروەها وتەی بیست و دووهەمیش ئەم مەسەلەیەی بە چەشنێکی بێ گومان چەسپاندووە.

بە پوختی:

"وتەکان" بە جۆرێکی گومانبڕ چەسپاندوویانە کە ئەو کەسەی "سروشت" بە "خوا" دادەنێت، دەبێ بە ناچاری و لە ئەنجامی ئینکاریی بوونی خوای تاك و تەنیا باوەڕ بە چەندین خوای دەست هەڵبەستی ئەندێشەیی و لەژمارەبەدەر بهێنێت! ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەبێ بۆ مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری گەردوون هەریەك لەو خوایانە توانای بەسەر هەموو شتێکدا بشکێت و، دژی هەموو خواکانی تر بێت و لە هەمان کاتدا لەوانیش بچێت! لە کاتێکدا کە تەنانەت بە ئەندازەی باڵە مێشێکیش جێی "هاوبەش" لە هیچ شتێکی ئەم گەردوونەدا نابێتەوە، هەر لە باڵە مێشێکەوە تا دەگاتە کۆمەڵەی خۆر، چ جای ئەوەی بتوانێت خۆی لە کاروباری خوای گەورەدا هەڵبقورتێنێت!

بەڵێ، ئایەتی پیرۆزی: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ (الأنبياء: ٢٢) بە چەندەها بەڵگەی بەهێز و گومانبڕ، بناغەی شیرك و هاوبەشایەتی هەڵدەتەکێنێت.

* * *

❑ مەسەلەی سێهەم:

"کوفر" تۆوی دۆزەخێکی مەعنەوی‌یە و، بەرەکەشی - وەك لە وتەی دووهەم و هەشتەم و وتەکانی تردا چەسپاوە - دۆزەخێکی ماددی‌یە.

جا هەروەك كوفر هۆی چوونە دۆزەخی كافرانە، هۆی بوونی دۆزەخیشە.

چونكە هەروەك ئەگەر فەرمانڕەوایەكی بچووك كە خاوەنی عیززەتێكی كەم و غیرەتێكی بچووك و شكۆیەكی ئاسایی بێت و، كەسێكی خراپكاریش سنگی لێ دەربپەڕێنێت و پێی بڵێت: تۆ هەرگیز ناتوانیت من سزا بدەیت. ئەوا بێ هیچ گومانێك ئەو فەرمانڕەوایە گەر پێشتر بەندیخانەشی نەبووبێت، هەر بە تایبەتكاری بەندیخانەیەك بۆ ئەو خراپكارە دروست دەكات و دەیهاوێتە ناوی!

بابای كافریش بە ئینكاری كردنی بوونی دۆزەخ، پادشایەك بە درۆ دەخاتەوە كە خاوەنی ئەوپەڕی عیززەت و غیرەت و شكۆمەندییە و، تۆمەتی "درۆزنی" و "كۆڵەواری" دەداتە پاڵ كەسێك كە توانای ڕەهای هەیە. كەواتە هەر بە كافربوونەكەی بە توندی خۆی لە قەرەی عیززەتی ئەو دەدات و، تانەش ئاراستەی شكۆمەندیی ئەو دەكات.

بێ گومان ئەگەر هیچ هۆكارێكی تر بۆ بوونی دۆزەخ لە كایەدا نەبێت - كە ئەمەش گریمانێكی مەحاڵە - ئەوا خوای گەورە دۆزەخ بۆ ئەو كافرە دروست دەكات و دەیهاوێتە ناوی، لەبەر ئەوەی كوفرەكەی تا ئەم ڕادەیە بەدرۆخستنەوەی خوای گەورەی تێدایە و، كۆڵەواری و بێ دەستەڵاتی دەداتە پاڵی.

* * *

❏ مەسەلەی چوارەم:

ئەگەر دەڵێیت:

بۆچی كافر و گومڕایان لەم دنیایەدا بەسەر ئەهلی هیدایەتدا سەردەكەون؟

لە وەڵامدا دەڵێین:

چونكە ئەو لایەنە ناسك(لطــائف) و توانا و لێهاتنانەی مرۆڤ كە بۆ كڕینی ئەڵماسی ئەبەدی پێی بەخشراون، گەلخۆیی كوفر و مەستیی گومڕایی و سەرسامیی

بێ ئاگایی دەیانگۆڕن بە چەند وردە شووشەیەکی بێ نرخ و چەند کولوویەکی بەفر کە خێرا لەناو دەچن. بێ گومان ئەو شووشە شکاوە بێ گیانانە، لەبەر ئەوەی بە نرخی ئەڵماس کڕراون، بەلای کڕیارەکەیانەوە وەك باشترین شووشە و جوانترین بێ گیانیان لێ دێت!

دەگێڕنەوە کە:

جارێکیان دەوڵەمەندێکی بازرگانی گەوهەر ژیریی خۆی لەدەست داوە. ئنجا کە ڕۆشتووە بۆ بازاڕ هەر پارچە شووشەیەکی بێ نرخی بەرچاو کەوتووە پێنج لیرەی زێڕی پێ داوە! کە خەڵکی ئەمەیان لێ بینی، هەرچی وردە شووشەیان لەلابوو پێیان فرۆشت و بەسەر ئەودا ساغیان کردەوە! تەنانەت منداڵەکانیش دەڕۆشتن کولووی بەفریان لە بەرامبەر لیرەی زێڕەوە پێ دەفرۆشت.

هەروەها جارێکیان پادشایەك لە حاڵی "مەستی"دا ڕۆشتبووە ناو کۆمەڵێکی منداڵانەوە و پێی وا بووبوو کە ئەو منداڵانە وەزیر و فەرماندەکانی ئەون، بۆیە فەرمانە پادشاییەکانی خۆی بۆ دەرکردن. منداڵەکانیش گەلێ بەمە دڵخۆش بوون و ئەویش بە گوێڕایەڵی‌یەکەی ئەوان خۆشحاڵیی بەدەست هێنا!

هەر بەم جۆرەش: "کوفر" گەلحۆییە و.. "گومڕایی" مەستی‌یە و.. "بێ ئاگایی"ش سەرسامی‌یە! بە ڕادەیەك ئەو کەسەی کە پێیانەوە گیرۆدە دەبێت، لە بریی شتانی "باقی" شمەکی "فانی" دەکڕێت. هەر ئەمەش نهێنیی هەست تیژیی گومڕایانە، ئەوەتا دەبینیت: سەرسەختی و هەڵپە و حەسوودی و هەست و نەستی لەم چەشنەیان تێدا بەهێز دەبێت، بە ڕادەیەك کە هی وایان تێدایە ساڵێکی ڕەبەق سەرسەختی لە شتێکدا دەنوێنێت کە شایانی بایەخ پێدانی یەك خولەکیش نی‌یە!

بەڵێ، بەهۆی گەلحۆیی کوفر و مەستیی گومڕایی و سەرسامیی بێ ئاگاییەوە: ئەو لایەنە ناسکەی مرۆڤ، کە بە سروشت بۆ ئەبەد و هەتاهەتایی بەدی هاتووە، لە ئاستی بەرزی خۆی بەردەبێتەوە و لە بریی شتانی "باقی" دەست بە شتی "فانی"یەوە دەگرێت و نرخێکی گران و زۆریشیان لە بەرامبەرەوە دەدات.

ئیمانداریش هەندێ جار دووچاری نەخۆشی‌یەکی دەمار یان نەخۆشی‌یەکی دڵ دەبێت و، ئەویش وەکو گومڕایان بایەخ بە شتانێك دەدات کە شایانی بایەخ پێدان نین. بەڵام زوو بە هەڵەی خۆی دەزانێت و لەسەری بەردەوام نابێت، بەڵکو دەگەڕێتەوە و داوای لێبوردن لە پەروەردگاری دەکات.

* * *

☐ مەسەلەی شەشەم (کە مەسەلەیەکی بچووکە):

"پەیامەکان" کە بریتین لە سی و سێ "وتە" و سی و سێ "مەکتووب" و سی و یەك "بریسکە" و سیازدە "تیشك"، لەبەر ئەوە ناونراون بە "پەیامەکانی نوور" چونکە وشەی "نوور" لە هەموو شوێنێکدا و بە درێژایی ژیانم ڕووبەڕووم بووەتەوە، کە ئەمانە هەندێکیانن:

گوندەکەم ناوی "نوورس"ە..

دایکی خوالێخۆشبووم ناوی "نووریە"یە..

مامۆستاکەم لە تەریقەتی نەقشبەندیدا ناوی "سەیید نوور محەممەد"ە..

یەکێك لە مامۆستاکانم لە تەریقەتی قادریدا ناوی "نورەددین"ە..

یەکێك لە مامۆستاکانم لە قورئاندا ناوی "نووری"یە..

زۆربەی ئەو قوتابیانەی لەگەڵمدا دەمێننەوە ناوی "نور"یان پێوەیە..

زۆربەی ئەو شتەی کتێبەکانم ڕوون و ڕووناك دەکاتەوە، نموونەهێنانەوە نوورانی‌یەکانن..

ئەو یەکەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە "ژیری" و "دڵ"م ڕووناك دەکاتەوە و "بیر"یشم بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات، بریتی‌یە لە ئایەتی:

﴿اللهُ نورُ السَّمَوات وَالأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَوةٍ﴾ (النور:٣٥)..

زۆربەی جار گیروگرفتەکانم لە بارەی حەقیقەتە خواییەکانەوە ناوی جوانی "النور"ی خوای گەورە بۆم شی دەکاتەوە..

ئنجا لەبەر ئەوەی زۆر موشتاقی قورئانم و خزمەتەکەشم تەنها بۆ قورئانە، ئەوا پێشەوای تایبەتیم حەزرەتی "عثمان ذوالنورين"ە، خوای لێ ڕازی بێت!

اللهم يا نور النور، ويا منور النور، ويا مصور النور، ويا مقدر النور، ويا مدبر النور، ويا خالق النور، ويا نوراً قبل كل نور، ويا نوراً بعد كل نور، ويا نوراً فوق كل نور، ويا نوراً ليس مثله نور. سبحانك لا إله إلاّ أنت الأمان الأمان أجِرْنا (وأجِرْ علياً) من النار.. وأدخِلْنا (وأدخِلْ علياً) الجنةَ مع الأبرار.. ونوِّرْ قلوبنا وقلبه، وقبورنا وقبره بأنوار الإيمان والقرآن. يا رحيم يا غفار! وصلّ على محمد المختار وآله الأطهار وصحبه الأخيار. آمين.. آمين.. آمين.

سەعیدی نورسی

* * *

(وەڵامی پرسیارێك لە بارەی بەرگ تێگرتنی ددانەوە)

وەڵامی پرسیارێکی " خلووصی بەگ"ە

بە پوختی یەك دوو مەسەلەی شەرعیت بۆ باس دەکەم:

ئاو لەدەم وەردان(المضمضة) لە دەستنوێژدا سوننەتە نەك فەرز، بەڵام لە غوسڵدا فەرزە و نابێت ناودەم – با کەمێکیشی بێت – نەشۆررێت. بۆیە زانایان پرکێشیی دەرکردنی فەتوایەکی ئەوتۆیان نەکردووە کە بەرگ تێگرتنی ددان(دانی ئاڵتوون) بە کارێکی دروست دابنێت.

ئیمامی ئەبوو حەنیفە و محەممەد – خوایان لێ ڕازی بێت – فەتوایان داوە کە دروستە دان لە ئاڵتوون و زیو دروست بکرێت بە مەرجێ بەرگ تێگرتنێکی بەردەوام نەبێت. بەڵام ئەم مەسەلەی بەرگ تێگرتنە هێندە بڵاوە کە شێوەی بەڵایەکی گشتی(البلوى العامة)ی گرتووەتە خۆ و ناتوانرێت لا ببرێت.

وا من ئەم خاڵەی خوارەوەم کتوپڕ بە دڵدا هات:

هەرگیز لە توانا و سنووری مندا نییە دەست لە کار و ئەرکی موجتەهیدەکان

وەر بدەم، بەڵام هەرچەندەش پێم خۆش نی‌یە "گشتی‌بوونی بەڵا" بە "زەروورەت" دابنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

گەر پزیشکێکی شارەزا و ئایینداری وەسیەت و ئامۆژگاریی نەخۆشێك بکات کە بەرگ لە دانەکانی بگرێت، ئەوا دان لەوە دەردەچێت کە بە "ڕواڵەتی" دەم دابنرێت و وەك "ناوەوە"ی دەمی لێ دێت. ئەو کاتەش نەشۆردنی دان غوسڵەکە بەتاڵ ناکاتەوە، چونکە بەرگەکەی دەشۆرێت کە جێگەی دانەکەی گرتووەتەوە. جا هەروەك بەپێی شەرع دەکرێت بەرگی سەر برین و زام لە بریی خودی زامەکە و لەبەر تووش نەبوونی ئەو زامە بە هیچ زیانێك، بشۆررێت.. بە هەمان جۆر شۆردنی ئەم بەرگە جێگیر و دامەزراوەش - لەسەر بناغەی پێویستی - جێی شۆردنی دانەکە دەگرێتەوە و غوسڵەکە بەتاڵ نابێتەوە. والعلم عند الله.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕوخسەت و بواردانە لەسەر بناغەی "پێویستی" دراوە، ئەوا بێ گومان کەسێك بۆ جوانی دانەکانی پڕ بکاتەوە یان بەرگیان تێ بگرێت سوود لەم ڕوخسەتە وەرناگرێت! چونکە گەر بێت و بە ئیختیاری هەڵەی خۆی ئەم کارەی کردبێت ئەوا لە حاڵەتی زەروورەتیشدا ئەم کارەی بۆ دروست نی‌یە، بەڵام گەر بەبێ زانینی خۆی ئەو ناچاری‌یەی بۆ پەیدا بووبێت، ئەوا لەبەر زەروورەت دروستە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(لە بارەی پەیامی حەشرەوە)

سەرنجی سێ‌هەمی مەسەلەی هەشتەمی مەکتووبی بیست و هەشتەم

بسم الله الرحمن الرحيم

السلام عليكم وعلى والديكم وعلى إخوانكم وعلى رفقائكم في درس القرآن

برای ئازیزم!

یەکەم: ڕاکەتانم زۆر پێ خۆش بوو کە بۆچوونەکەی "عەبدولمەجید"تان بەلاوە پەسەند نییە لەوەدا کە - لەسەر بناغەی حەزەرێکی نابەجێ - باسی سێهەمی مەکتووبی بیست و شەشەم بە پێویست نازانێت!

دەبێ بزانین کە ئێمە بەهرەمەندی نهێنیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿مِلَّةَ اِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً﴾ین کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئێمە شوێن پێی ئەو حەزرەتی ئیبراهیمەمان - دروودی لەسەر بێ - هەڵگرتووە کە سەنا و ستایشی قورئانی لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەدەست هێناوە:

﴿وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللهِ﴾ (الأنعام: ٨١).

دووهەم: "عەبدولمەجید" نووسیویەتی:

موفتیی شارێك - کە خەڵکی ئەو شارە بەگشتی دۆستایەتییان لەگەڵ مندا هەیە - بە ڕوانینێکی ساکار و ڕێبوارانە چەند ڕەخنەیەکی لاوازی ئاراستەی لق و بەشەکانی وتەی دەهەم کردووە.

وەڵامەکانی "عەبدولمەجید" بۆ ئەو موفتییە - لە دوو شوێندا نەبێ - سەروزیادن. چونکە ئەویش سەبارەت بەو پرسیارە ساکارەوە لە دوو شوێندا وەڵامێکی ساکار و سادەی داوەتەوە!

یەکەم: ئەو مرۆڤە بەڕێزە وتوویەتی: "ڕاستییەکانی وتەی دەهەم بۆ کەسانی سەرسەخت و ئینکار دەست نادات، چونکە لەسەر بناغەی سیفەتەکانی خواوەند و ناوە جوانەکانی دارێژراون". عەبدولمەجیدیش لە وەڵامدا وتوویەتی: (لە چوار ئاماژەکانی پێش ڕاستییەکاندا مونکیرەکانی هێناوەتە سەر دان نان بە ئیماندا، ئنجا ڕاستییەکانی هێناوە).

وەڵامی ڕاستەقینە ئەمەی خوارەوەیە:

هەموو یەکێك لەو ڕاستییانەی وتەی دەهەم لە یەك کاتدا سێ شت دەچەسپێنێت: بوونی خواوەندی "واجب الوجود" و.. ناوەکانی و.. سیفەتەکانی. ئنجا مەسەلەی حەشر لەسەر ئەو شتە بنەڕەتییانە بنیات دەنێت و دەیچەسپێنێت.

ئیتر هەموو کەسێك، هەر لە سەرسەختترین مونکیرەوە تا دامەزراوترین ئیمـاندار، دەتوانێت بەشی خۆی لە هەموو یەکێکی ئەو ڕاستییانە وەربگرێـت. چونکە ئەو ڕاستییانە سەرنجەکان بۆ لای بوونەوەران و ئاسەوارەکان ڕادەکێشن و دەڵێـن: چەند کارێکی ڕێکوپێك لەم بوونەوەرانەدا بـەدی دەکرێـت.. کـاری ڕێکوپێکیـش هەرگیز بێ بکەر نابێت، کەواتە بکەرێکیان هەیە. مادەم ئەم بکەرەش کارەکانی بە ڕێکوپێکی و ڕێسا ئـەنجام دەدات، ئەوا دەبێ "دانا" و "دادگـەر" بێـت. خۆ مـادەم دانایە ئەوا کاری بێهوودە و هەڕەمەکی ناکات. ئنجا مادەم کارەکانی بە دادگەری جێبەجێ دەکـات ئـەوا مافـەکان بـە زایـە نـادات.. کەواتـە دەبـێ مەحشـەر و دادگایەکی یەکجار گەورە بەرپا بێت.

ڕاستییەکانی وتـەی دەهـەم بەم چەشـنە دەڕۆن و پۆشـاکی ئەم شێوە زنجیرەییـە دەپۆشن و، هەرسێ دەعواکە بە یەکەوە دەچەسپێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی بە پوختـی هێنراون، ئەوا ڕوانینی سەرپێیی و سـاکارانە نـاتوانێت لـە یەکیان جیـا بکاتـەوە. دەبێ بیشزانین کە هەریەك لەو ڕاستییانە لـە چەند پەیامێکی تر و لـە وتەکاندا بە ڕوونکردنەوەیەکی تێر و تەسەل درێژەیان پێ دراوە.

*دووهەم وەڵامی ناتەواوی عەبدولمەجید:*

عەبدولمەجید بەهەڵەدا چووە کە موسایەرەی هەڵەکەی ئەو بەرێزەی کـردووە و سەلماندوویەتی. چونکە لە پەراوێزی وتەی دەهەمدا نەوتراوە: ئیسمی ئـەعزەم تەنها بریتییە لە پلەی هەرە مەزنی هەموو ناوێك. بەڵکو لە زۆر شوێندا وتوومانە: حەشر لــە "ئیســمی ئــەعزەم" و "پلــەی هەرەمــەزنی هــەموو یــەکێکی ناوەکــان"ەوە دەردەکەوێت. جا هەروەك پەیامەکە ئیسمی ئەعزەمی سەلماندووە دەریشی خستووە کە هەموو یەکێکی ناوە جوانەکانیش پلەیەکی هەرە مەزنیان هەیە بـە چەشنێك کـە پێغەمبەری سەردار و مەزنمان ﷺ بـە هـەموو ئەم پلانـە بەهرەمـەند بـووە و، حەشـری هەرە مەزنیش ڕووی لە هەموویانە.

بۆ نموونە:

ناوی "الخالق" گەلێ پلەی هەیە، هەر لەو پلەیەوە کە خالیق و بەدیهێنەری منە تا دەگاتە ئەو پلە تەواو مەزنەی کە خالیق و بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

ئەو بەرێزەی کە دووچاری گومان بووە، وتوویەتی:

"بوونی پلەیەکی هەرە مەزن بۆ هەموو ناوێك لە ناوە جوانەکان، لە قسەی فەیلەسووفە صۆفی‌یەکانە". مەبەستیشی لەم وتەیەدا بەرپەرچدانەوەی ئەو بۆچوونەیە..

کەچی "ئیسمی ئەعزەم" لە لای ئیمامی ئەبووحەنیفە و ئیمامی غەزالی و جەلالەددینی سیووتی و ئیمامی ڕەببانی و شێخی گەیلانی و لێکۆڵەرە صددیقەکانی هاوچەشنیان، دەگۆڕێت و ئەو ناوەی بەلای یەکێکیانەوە ئیسمی ئەعزەمە جیایە لەوەی کە بەلای ئەوانی ترەوە بە ئیسمی ئەعزەم دانراوە. ئەوەتا ئیمامی ئەعزەم - ئەبوو حەنیفە - فەرموویەتی: بریتی‌یە لە "العدل، الحکم". ئەوانی تریش بە هەمان جۆر، بۆچوونی جیای خۆیان هەیە.

بە هەرحاڵ، ئەم ئەندازەیە سەروزیادە بۆ ئەم مەسەلەیە.

ڕەخنەکانی ئەو بەرێزە لە سێ ڕووەوە منەتباریان کردم:

یەکەمیان: ئەو بەرێزە لەگەڵ ویست و نیازی ڕەخنەگرتندا کەچی تیایدا دەستەوسان ماوە. ئەمەش دەری دەخات کە ڕاستی‌یەکانی "وتەی دەهەم" خۆیان بۆ ڕەخنە نادەن بە دەستەوە، مەگەر ڕەخنەیەك کە ئاراستەی هەندێ دەستەواژەی بابەتە فەرعی‌یەکانی بکرێت.

دووهەمیان: لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە ئەو ڕەخنە دەربڕینانە هیممەتی عەبدولمەجیدی وریا و بەغیرەت بجووڵێنێت، تاکو ببێت بە هاوڕێی چالاك و وریای خلووصی و شایانی هاوڕێیەتیی ئەو.

سێ‌هەمیان: دیارە ئەو بەرێزە حەزی لە پەیامەکانە بۆیە ڕەخنە دەگرێت، چونکە گەر کەسێك حەز و ڕەغبەتی لە شتێك نەبێت بایەخی پێ نادات. لەبەر ئەوە، پشت بە خوا لە داهاتوودا سوودی تەواو لە پەیامەکان وەردەگرێت.

دەتوانن ئەم سەرنجە بە باشی کورت بکەنەوە و، هاودەم لەگەڵ سڵاو و مەمنوونیمدا، بۆ ئەو بەڕێزەی بنێرن.

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(خزمەتگوزاری کەسە چاوەڕوان کراوەکە)

بۆ برای قیامەتی و ئازا و بەغیرەتم و، هاوڕێم لە خزمەتگوزاریی قورئاندا: صەبریی یەکەم و خلووصی دووهەم!

پیرۆزباییتان لێ دەکەم لەسەر ئەوەی کە بە باشی و جوانی لە "مەکتووبی بیستەم" تێگەیشتوون و بە خەتێکی جوانیش نووسیوتانەتەوە.

لە نامەکەتاندا نووسیوتانە کە:

حەز دەکەن وانەی زانستی کەلامم لە لا بخوێنن.

برام! ئێوە ئێستا بە کردار ئەو دەرسەم لەلا دەخوێنن! چونکە ئەو وتانەی کە نووسیوتاننەتەوە، چەند وانەیەکی نوورانی و درەخشانی زانستی کەلامی ڕاستەقینەن.

چەند زانایەکی توێژەری وەك "ئیمامی ڕەببانی" فەرموویانە:

لە ئاخر زەماندا یەکێك دێت کە بە ڕوونکردنەوەیەکی ئاشکرا و بەرزتر لە هەموو نووسراوەکانی ئەهلی کەشف و تەریقەتە سۆفی‌یەکان، سەرجەمی مەسەلە ئیمانی‌یەکانی زانستی کەلامی لەمەڕ "ئەهلی حەق" ڕوون دەکاتەوە و، دەبێت بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەو نوورانە.

تەنانەت ئیمامی ڕەببانی پێی وابووە کە خۆی ئەو کەسەیە!

بەڵام ئەم برا کۆڵەوار و هەژارەت، کە بەهیچ شتێك ناونابرێت، ناتوانم لافی ئەوە لێ بدەم کە من ئەو کەسە چاوەڕوان کراوەم، کە ئەمە هەزار جار لە

سەرووی سنووری منەوەیە. چونکە لە هیچ ڕوویەکەوە شایانی ئەوە نیم ببم بەو کەسە..

بەڵام دەتوانم بڵێم:

پێم وایە من خزمەتگوزاری ئەو کەسە چاوەڕوان کراوەم و ڕێ و شوێنی هاتنی بۆ ئامادە دەکەم و، سەربازێکم لە پێشەنگی سوپاکەیدا. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەستتان بەو "بۆن"ە خۆشە سەرسووڕهێنە لەو شتە نووسراوانە کردبوو.

سەعیدی نوورسی

* * *

(لە بارەی تەوافوقەکانی قورئانی پیرۆزەوە)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بعدد حروف القرآن وأسرارها

ئەی ئەو کەسانەی کە لەم خانە فانی‌یەدا مایەی دڵنەواییمن و لەم لانەی نامۆییەشدا بوون بە هاودەمم و بە شەوق و حەز و تاسەمەندیی خۆتان هانم دەدەن کە لە نهێنی‌یەکانی قورئان بدوێم!

ئەی برایانی زیرەك و خاوەن فیراسەتم کە ڕووی گوفتاری خۆمتان ئاراستە دەکەم!

وا "پێرستی پیتەکانی قورئان"م بۆ ناردن کە بە خەتی خۆم نووسیومەتەوە و هەڵەکانیشم ڕاست نەکردووەتەوە، تاکو بۆ ماوەی چەند خولەکێك سەیری بکەن و تێبگەن کە ئەگەر من بەو خەتە ناخۆش و ناتەواوەی خۆم هەر کارێك بکەم چەندە شپرز و هەڵبزرکاو دەردەچێت و، بۆ ئەوەی هەستیش بکەن کە چەندە قەڵەمە بەنرخەکانی ئێوەم بەلاوە گرنگە!

بەڵام ئێوە نەك چەند خولەکێکی کەم، بەڵکو چەند سەعاتێکی دوور و درێژ سەرنجتان لەو پێرستە داوە و چەند ڕۆژێکیش سەرقاڵی نووسینەوەی بوون. لەمەوە

بۆم دەرکەوت کە ئێوە بایەخێکی زۆر بەو پێڕستە دەدەن. لەبەر ئەوە خودی لیستەکەتان - دوای پاکنووس کردنی - بۆ دەنێرم و دەتوانن لەبەری بنووسنەوە.

بەڵام بزانن کە ئەم پێڕستە بە شێوەیەکی "تەقریبی" نووسراوە، تاکو ببێت بە سەرچاوەیەکی "کاتی". چونکە من بەم خەتە ناخۆشەی خۆم و لە ماوەی نۆ سەعاتدا نووسیومە و لە نووسینی بەشێکیشیدا پشتم بەو زانیارییانە بەستووە کە زووتر لەبەرم کردوون و بەشەکەی تریشیم لەسەر بناغەی دوو پێوەر نووسیوە. پاش ئەمە زانیم کە تەفسیرێك لەم بارەیەوە هەیە[1]. ئیتر ئەو تەفسیرەمان هێنا و لەگەڵ لیستەکەی خۆماندا بەراوردمان کرد. بینیمان زۆرینەی هەردوو لایان وەکو یەك وان، مەگەر لە چەند کۆمەڵێکی کەم و لە نزیکەی پازدە شوێنی جوزئیدا جیاوازییان ببێت..

لە دوای لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەو جیاوازییانە یان ئەنجامی هەڵەکانی چاپی لەمەڕ ئەو تەفسیرەن، یان هەڵەی نووسەرانی دەست نووسەکانن. بۆیە لە دوو سێ شوێندا دەست نووسەکەی خۆمان ڕاست کردەوە، کەچی دوایی بۆمان دەرکەوت کە لەو ڕاستکردنەوەیەدا بە هەڵەدا چووین و، ئیتر قەڵەمی ئالوگۆڕمان نەبردە لیستەکەی لای خۆمان و، پێمان وابوو تەفسیرەکە لە ئەنجامی هەڵەکانی چاپەوە پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەیە. بەڵام پڕکێشیم نەکرد ڕاستی بکەمەوە، چونکە خاوەنەکەی وردەکارێکی مەزنە و، چاپخانەکەش لە مزگەوتی ئەزهەرەوە نزیکە و، چەند کەسێکیش لە زانایانی ئەزهەر سەرپەرشتیاری چاپەکەی بوون.

وا خودی تەفسیرەکەتان لەگەڵ پێڕستە پاکنووسەکەدا بۆ دەنێرم، تاکو سەیریان بکەن و بیانخوێننەوە. بەڵام هەوڵی ڕەخنە لێگرتنی مەدەن، چونکە لیستەکەی من "تەقریبی"یە نەك "تەحقیقی"، سەبارەت بە تەفسیرەکەش ئەوا زۆربەی جار پشت بە

(١) مەبەست پێی کتێبی: (المقباس في تفسير ابن عباس)ە کە دانراوی فەیرووزئابادیی خاوەنی (قاموس المحيط)ە. (وەرگێڕ)

ڕیوایەتەکان دەبەستێت. پاشان هەندێ سوورەتی مەککی چەند ئایەتێکی مەدەنی‌یان تێدایە و لەوانەیە نووسەر ئەو ئایەتانەی لەگەڵدا نەژماردبن.

بۆ نموونە وتوویەتی:

ژمارەی پیتەکانی سوورەی "العلق" سەد و ئەوەندە پیتە. مەبەستیشی نیوەی یەکەمی سوورەتەکەیە کە یەکەم جار نازڵ بووە و، لەمەشدا پێکاویەتی. بەڵام من پشتم بەو شتانە بەست کە پێشتر لەبەرم کردبوون و لەو شوێنەدا کە ئەو تەفسیرە ڕاستیی پێکاوە من بەهەڵەدا چووم، چونکە هەموو سوورەتەکەم بە تەواوی ڕەچاو کردبوو.

پاشان "نهێنیی تەوافوقەکان" بایەخ بە کۆمەڵە گشتی و هەمەکی‌یەکان دەدات، کەواتە پێڕستە تەقریبی‌یەکە سەروزیادی ئێمەیە. ئنجا ئەو تەوافوقانەی کە لە سێ سەرنجەکەی سەبارەت بە دوعای "کنزالعرش"[١] باس کراون، بە گۆڕانی کەرتەکان ئەوان ناگۆڕرێن، تەنانەت بە گۆڕانی کۆمەڵە گەورەکانیش ئەو تەوافوقانە تێك ناچن.

بۆ نموونە: سوورەی "الکهف" لەگەڵ سی و نۆ سوورەتی تردا لە ژمارەی "هەزار"دا یەك دەگرنەوە. جا ئەگەر یەك دوو سوورەتیان ئەو ژمارەی هەزارەی تێدا نەبێت، تەوافوقەکە تێك ناچێت.. هەروەها بەم جۆرە..

هەرچەندە کەرتەکان چەندین نهێنی‌یان تێدایە، بەڵام تا ئێستا بە ڕوونی دەرگای ئەو نهێنی‌یانەمان لێ نەکراوەتەوە. لە خوای گەورە داواکارین ئەو دەرگایەمان لێ بکاتەوە. ئەو کاتەش پێڕستەکە شێوەی تەحقیقیی خۆی وەردەگرێت.

سەعیدی نوورسی

* * *

(١) "کنــز العرش" دوعایەکی دوور و درێژە و لە پێشدا بەسمەلە و ئنجا سەرەتای یەك لە دوای یەکی سوورەتەکانی قورئان دەکات بە تکاکار و، پاشان یەك بە یەکی پیتەکانی قورئان، لەگەڵ ناوهێنانی ژمارەی ئەو پیتانە لە قورئانی پیرۆزدا. (وەرگێڕ)

(پەیامەکان لە زانستە ئیمانی‌یەکانن)

یەکەم:

ئەم پەیامە – وتەی دەهەم – هێشتا پلە و پایەی شایانی خۆی نەدراوەتێ. من هەر خۆم نزیکەی پەنجا جار خوێندوومەتەوە و، لە هەموو خوێندنەوەیەکدا تامێکی نوێم چەشتووە و، هەستم کردووە کە پێویستم بە خوێندنەوەیەکی نوێی تر هەیە! کەچی هەندێ کەس پەیی بەم گرنگی‌یە نەبردووە و بە چاوی پەیامە زانستی‌یەکانی تر دەڕوانێتە ئەم چەشنە پەیامانە و، تەنها یەك جار دەیخوێنێتەوە و جارێکی تر بەسەری ناکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەم پەیامە یەکێکە لەو زانستە ئیمانی‌یانەی کە پێویستی مرۆڤ پێیان وەك خواردنی نان وایە، پێویستی‌یەکی ڕۆژانەیە و هەمیشە نوێ و دووپات دەبێتەوە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(بەختەوەریی من بەندە بە دوعاکانی ئێوەوە)

بڕگەیەکی نامۆی "مەسعوود"ە

کاتێ لەبەر ڕووناکیی مانگەشەودا داسم دەوەشاند و دروێنەی جۆم دەکرد و، کەش و هەوا هێمنەکەش هەست و نەستی مرۆڤیان دەبووژاندەوە، بە نائومێدی‌یەوە بیرم لە حاڵی خۆم کردەوە کە وا نوقمی ئەم ڕووناکی‌یە بووم، کەچی دروێنە کۆتایی پێ نایەت و، لە نووسینەوەی "پەیامەکانی نوور" بێ بەش دەمێ! یەکسەر ئەوەم بەدڵدا هات – ناشزانم لە بێ‌ئاگاییەوەیە، یان لە جۆری ئەو شتانەن کە لە ئاسۆی دڵدا هەڵدێن – کە لەبەر خۆمەوە بڵێم:

ئەی خوای پەروەردگارم! من ناوم "مەسعوود"ە کەچی مەسعوود(واتە بەختەوەر) نیم، ئەوەتا لە کاردا زۆر ماندوو بووم و کەچی هەر بەختەوەریش نەبووم! ئەمەم وت و دەستم دایەوە دروێنە. پاش ماوەیەکی کەم خەوم لێ کەوت و یەکێك لە خەوندا پێی وتم:

"چمکی کەواکەی مامۆستا بەرمەدە، چونکە هەر ئەوە دەتکات بە بەختەوەر"!
کە بێدار بوومەوە، مانگ لە ئاوابووندا بوو. یەکسەر وتم: خوایە گیان! بمبوورە. من داوای بەختەوەریی دنیام نەکردووە.
جا ئەی مامۆستای بەڕێزم!
وا ئەوەم بە گوێدا درا کە بەختەوەریی دوارۆژم بە دوعای جەنابتان دێتە دی. بۆیە تکای دوعاتان لێ دەکەم و، هاودەم لەگەڵ دەربڕینی ڕێزمدا، دەست و قاچەکانیشت ماچ دەکەم، ئەی مامۆستای گەورەم!
مەسعوود

* * *

(پەیامەکان ڕابەرن)

نامەکەی "موزەینە"یە کە یەکێکە لە خوشکانی دوارۆژمان و قوتابییەکی پەیامەکانی نوورە

مامۆستای بەڕێزم!
چاوەکانم کە نوقمی ئازاری ئەم دنیا فانییەن، لە ناخی دڵ و ڕۆحەوە پەیوەستی "وتە" کاریگەر و "پەیام"ە شیفابەخشەکانتان بوون و، هەر جارێك دەیانخوێنمەوە تێدەگەم کە ئەو پەیامانە چ ڕابەرێکن! بە ڕادەیەك کە لە وەسفیاندا دەستەوسانم.
بەڵێ، "وتەکان"تان ئەو تاریکی و بێ ئاگایی و ستەمانە دەڕەوێننەوە و لەناویان دەبەن کە لەم زەمانەدا پەردە تاریکەکانی خۆیان بەسەر دنیادا داداوەتەوە.
ئایا چ ژیرییەك هەیە کە ڕاستی و درەخشانیی نوورەکان ببینێت، بەڵام دوای ئەوە خۆی بهاوێتە ناو تاریکاییەوە و چاو لەو ڕاستییە بنووقێنێت؟!
بە فەزڵی خوا، من لەو ڕۆژەوە کە ئەم "بەختەوەری"یەم بەدەست هێناوە، خۆم ناهاومە تاریکی و - پشت بە خوا - جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆ ناو "بەدبەختی".
مامۆستای بەڕێزم! من - وەکو هەموو خوشکانی ترم - لە خوێندنی ڕاستەوخۆی دەرس لە خزمەتی جەنابتاندا بێ بەشم. بەڵام کە هەموو هەفتەیەك یان

هەموو مانگێ جارێك - دوور لە ئامادەبوونی خۆتان - گوێ لەو وتە بەرزانەتان رادەگرم، وا هەست دەکەم کە ڕاستەوخۆ دەرستان لە خزمەتدا دەخوێنم.

لە پێشدا جەنابتان و ئنجا ئێمەش لە پشتی سەرتانەوە، هەمیشە لە دەرگانەی خواوەندی بەتوانادا بۆ سەلامەتیی موسڵمانان دەلاڵێینەوە و، داوای لێ دەکەین کە حاڵی من و حاڵی هەمووومان لە "تاریکی"یەوە بگۆڕێت بۆ "ڕووناکی" و، نیعمەتی فەزڵ و چاکەی خۆیمان پێ ببەخشێت.

مامۆستای بەڕێزم!

"زمان" و "کۆڵەواری" و "ناتەواوی"م بواری ئەوەم نادەن کە درێژە بە قسەکانم بدەم و لەسەریان بەردەوام بم. بۆیە دان بە کەموکووڕی و قسووری خۆمدا دەنێم.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە: بە کاریگەریی پەیامەکان و ڕێنمایی وتەکانتان ڕۆژێکمان بۆ بهێنێتە پێش کە تیایدا بتوانین لەو هەڵسوکەوت و بارودۆخانە ڕزگارمان بێت کە بەبێ ویست و ئیختیاری خۆمان دووچاریان بووین، وەك برای موستەقیم و خاوەن تەقوامان کاك "لوتفی" ڕزگاری بوو لێیان.

وتەی حەڤدەهەم و مەکتووبی هەژدەهەم و بیستەم و پەیامی بە نوور درەخشاوی "پەنجەرەکان"مان لە لایەن برای بەڕێزمان کاك "زەکائی"یەوە بەدەست گەیشت و، دەستمان دایە خوێندنەوەیان.

هەمیشە مامۆستا ڕاستەقینەکەمان - کە قورئانی پیرۆزە - بە دەستەوەیە و دەیخوێنینەوە.

موزەینە

* * *

(خوێندنەوەی پەیامەکان پەرستشێکی فیکرییە)

برای ئازیزم کاك ڕەئفەت!

بە سوپاس و خۆشحاڵییەوە نامەکەتانم لەگەڵ ئەو کتێبەدا کە ناردبووتان، بەدەست گەیشت. لە ڕێی ئەو نامەیەوە "گیان"ی یەکێ لە قوتابیانم کە "خلووصی"یە و لە ناخەوە خۆشم دەوێت، لە ئێوەشدا هەست پێ کرد. بۆیە بە

"قوتابی‌یەکی نوور" قبوڵم کردیت، نەك هەر قوتابی‌یەکی تازە، بەڵکو قوتابی‌یەکی دێرینی وەکو خلووصی!

تایبەتکاریی قوتابی بریتی‌یە لەوەی کە:

کاری خزمەت بەم پەیامە دانراوانە بە چەشنێك بخاتە ئەستۆی خۆی کە وەك خۆی خاوەنیان بێت و داینابێتن و نووسیبێتنی و، هەر بەو پێیەش هەوڵی گەرموگوڕ بدات بۆ بڵاوکردنەوەیان و گەیاندنیان بە کەسانی شایانی خۆیان.

خەتەکەتان جوانە و دەست خۆشیتان لێ دەکەم.

گەر بواری کاتتان لە بەردەمدایە ئەوا بەشێکی پەیامەکان بنووسەرەوە و، بەشێکی تریشیان چەند قوتابی‌یەکی تری جیددی و لێبڕاوی وەك خەسرەو دەیاننووسنەوە. ئێوە لەوانی وەردەگرن و دەینووسنەوە و هاوبەشی کارەکانیان دەبن.

چەند ساڵێکە چاوەڕوانی ئەوە بووم کە چەند قوتابی‌یەکی چوست و چالاك لە "ئیسپارتە"دا سەر هەڵبدەن.

سوپاس بۆ خوای گەورە کە لەگەڵ ئێوەدا چەند کەسێکی تر پەیدا بوون. یەك "قوتابی" لە سەد "هاوڕێ" باشترە.

ئەو نوورە قورئانی‌یانەی کە پێیان دەوترێت: "وتەکان" لە جۆری ئەو پەرستشە فیکری‌یەن کە بە گەورەترین پەرستش دادەنرێت.

ئەرکی گەورە و گرنگ لەم کاتەدا بریتی‌یە لە "خزمەتی ئیمان" چونکە ئەم خزمەتە کلیلی بەختەوەریی هەمیشەییە.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

(لە بارەی ئیسمی ئەعزەمەوە)

باسمە سبحانە

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفام: کاك ڕەئفەت!

وەك من ئومێدم دەکرد لێتان، ئێوە بە دوای پەیامەکاندا دەگەڕێن و دەیاننووسنەوە. دەسا خوا پێت و بەرەکەت بە کار و کۆششتان ببەخشێت! هەوڵێکی کەمی کەسانی وەك ئێوە بە زۆر دادەنرێت، چونکە لەبەر ئەوەی خەڵکی متمانەیان پێتانە، ئەوا دەبنە پێشەنگی کەسانێکی زۆر.

ئەم وڵاتی غەریبی‌یەم لە بەرچاودا وەکو نیشتمانی ئەسڵیی خۆم لێ هاتووە، چونکە چەند برایەکی چوست و چالاکی گەرموگوڕی وەك ئێوەم تێدا دۆزیوەتەوە. تەنانەت نیشتمانە ئەسڵی‌یەکەی خۆمی لە بیر بردوومەتەوە.

لە دوای قورئانی پیرۆز، کان و سەرچاوەی بەرزیی هەر کتێبێك لەوەدایە کە گوفتاری ئەو کتێبە ئاراستەی کەسانێك کرابێت بە تەواوەتی لێی تێ بگەن و، بە گەرموگوڕی و لێبڕانەوە موشتاق و تاسەمەندی بن. خۆ ئەگەر ئێوە لەسەر ئەوەی کە منتان دۆزیوەتەوە یەك جار سوپاسی خوا بکەن، من هەزار جار سوپاسی دەکەم لەسەر ئەوەی کە ئێوەم دۆزیوەتەوە!

لە نامەکانتاندا پرسیارتان لە بارەی ئیسمی ئەعزەمەوە کردبوو.

هەروەك "ئەجەل" لە تەمەندا و "شەوی قەدر" لە مانگی ڕەمەزاندا شارراوە و پەنهانن، "ئیسمی ئەعزەم"یش لە نێوان ناوە جوانەکاندا پەنهانە و، گەلێ حیکمەتیش لەم پەنهانی‌یەیدا هەیە.

من پێم وایە ئیسمی ئەعزەمی ڕاستەقینە پەنهانە و تەنها کەسانی "خەواص" ئاگادار دەکرێن لە بارەیەوە. بەڵام هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە پلەیەکی هەرە مەزنی هەیە کە وەك ئیسمی ئەعزەم وایە.

جیاوازیی ئەولیاکانیش لە دۆزینەوە و دەستنیشان کردنی ئیسمی ئەعزەمدا لەم نهێنیی‌یە وردەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەوەتا ئیسمی ئەعزەم بە لای ئیمامی عەلی‌یەوە - خوای لێ ڕازی بێت - شەش ناوە، وەك لەو پارچە شیعرە ڕەجەزەیدا هاتووە کە لە کتێبی "مجموعة الأحزاب"دا[1] بڵاو کراوەتەوە.

تایبەتکاری‌یەکانی ئەو ئیسمی ئەعزەمەی کە ئیمامی عەلی باسی کردووە و ئەو شەش ناوەش کە دەورەی ئیسمی ئەعزەمیان داوە، ئیمامی غەزالی لە کتێبی "جنّة الأسماء"دا لێکی داونەتەوە. ئەو شەش ناوەش بریتین لە:

"فرد، حيّ، قيّوم، حكم، عدل، قدّوس".

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(من زانستم لە ڕۆحی خۆمدا دەنووسی‌یەوە)

سێهەم:

داوای نامەیەکتان بە خەتی خۆم لێ کردبووم!

دەگێڕنەوە: جارێکیان بە کەسێکی بێ لچ و لێویان وت:

فوو لە چراکە بکە و بیکوژێنەرەوە!

وتی:

داوای شتێکی یەکجار قورستان لێ کردووم کە لە توانامدا نی‌یە!

بەڵێ، خوای گەورە خەت خۆشیی پێ نەبەخشیوم، بە ڕادەیەك کە لە نووسینی تەنها یەك دێڕیش بێزار دەبم و وەك کارێکی قورس وایە بەلامەوە.

(١) "مجموعة الأحزاب" کتێبێکە "شێخ ئەحمەد ضیائەددین گموشخانەیی" دوعا مەئسوورەکانی پێشەوایان و قوتبەکان و ئەولیا مەزنەکانی بە سێ بەرگ تێدا کۆکردووەتەوە و ساڵی ١٣١١ك بە خەتی دەست لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە و لە پەراوێزەکەشیدا هەندێ لەو دوعایانە لێك دراونەتەوە. (وەرگێڕ)

جاران لەبەر خۆمەوە بۆ بیر کردنەوە - نەك سکالآ - دەم وت:

ئەی خوای پەروەردگارم! هەرچەندە پێویستم بە خەت هەیە و حەزیشم لە شیعر و هۆنراوەیە، کەچی ئەم دوو نیعمەتەت پێ نەبەخشیوم!

پاشان لە دواییدا بە تەواوەتی بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە خەت و شیعری پێ نەبەخشیوم چاکەیەکی یەکجار گەورەیە. چونکە یارمەتی و هاوکاریی "پاڵەوانانی نووسین"ی وەك ئێوە پێویستیی من بە خەت و نووسین ناهێڵنەوە. خۆ ئەگەر بمتوانیایە بە جوانی بنووسم و خەتم خۆش بوایە، ئەو مەسەلانە لە دڵمدا جێگیر نەدەبوون. چونکە پێشتر من دەستم بە خوێندنی هەر زانستێك کردبێت، لەبەر ئەوەی لە خەتی خۆش بێ بەش بووم، لەپێشدا لەناو ڕۆحمدا دەمنووسییەوە، کەواتە ئەو توانا و قابیلییەتە سەبارەت بە من نیعمەتێکی گەورە بوو.

هەرچی شیعریشە ئەوا هەرچەند هۆیەکی گرنگی گوزارشت و دەربڕینە، بەڵام "ئەندێشە" حوکمی خۆی تێدا ڕایی دەکات و ئاوێتەی "ڕاستی" دەبێت تیایدا و شێوەکەی دەشێوێنێت و، هەندێ جاریش ڕاستییەکانی تێدا تێکەڵ و پێکەڵ دەبن.

جا قەدەری خوای گەورە، بە فەزڵ و چاودێریی خۆی، دەرگای شیعری لە بەردەم ئێمەدا نەکردەوە، چونکە ئەوەمان بۆ تەقدیر کرابوو لە داهاتوودا خزمەتی ئەو قورئانە پیرۆزە بکەین کە "حەق"ی بێگەرد و "حەقیقەت"ی پوخت و بێ گومانە. ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ﴾ (یس:٦٩) ڕووی لەم واتایەیە.

پشت بە خوا چەند دێڕێك لەبەر ئێوە دەنووسم.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

(هۆی دەسپێك)

ئەی برای ئازیز و وردەکار و قیامەتیم و، هاوڕێم لە خزمەتی قورئاندا!

یەکەم:

لە نامەکەتاندا پرسیوتانە:

بۆچی نامەکانم بە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَإِنْ مِـــنْ شَـــيْءٍ إِلاَّ يُسَـــبِّحُ بِحَمْـــدِهِ﴾ (الإسراء: ٤٤) دەست پێ دەکەم؟

وەڵام:

حیکمەتی ئەمە بریتی‌یە لەوەی کە:

یەکەم دەرگای گەنجینە خاوێنەکانی قورئانی پیرۆز کە لێم کرانەوە، هی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوو. واتە حەقیقەتی ئەم ئایەتە یەکەم دانەی حەقیقەتە بەرزەکانی قورئانی پیرۆز بوو کە لێم دەرکەوتن. هەر ئەم حەقیقەتەش زۆربەی پەیامەکانی گرتەوە.

حیکمەتێکی تر بریتی‌یە لەوەی:

ئەو مامۆستا بەرێزانەم کە جێی متمانە و بڕوامن، نامەکانیان بەو ئایەتە دەست پێ کردووە.

هەروەها لە نامەکەتاندا لە بارەی حەوت گوناهە گەورەکانەوە پرسیارتان کردبوو. دەڵێم:

گوناهە گەورەکان گەلێ زۆرن، بەڵام لە هەموویان گەورەتر ئەو گوناهـو تاوانانەن کە پێیان دەوترێت: "الموبقات السبع" کە ئەمانەن: قەتڵ، زینا، عەرەق خواردنەوە، سەرپێچی کردن لە دایك و باوك - واتە بڕینی سیلەی ڕەحم - قومار، شایەتیی درۆ، پشتگیری کردن لەو بیدعەتانەی کە زیان بە ئایین دەگەیەنن.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

(پەیامەکان قووت و خۆراکن)

١٤/شوال/١٣٥٢
کانوونی دووهەم/١٩٣٤[١]

باسمه سبحانه
﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾
السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ برای قیامەتی و ئازیز و وردەکارم کاك ڕەئفەت!
ئەی هاوڕێی بیریار و عەودالی حەقیقەتم!
یەکەم:

لە نامەکەتاندا دەڵێن: هەتا زیاتر پێوەر و تەرازووەکانی پەیامەکانی نوور بخوێنینەوە، پتر سوودیان لێ وەردەگرین.

بەڵێ برام! ئەو پەیامانە قووت و خۆراکن، چونکە لە قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون. جا هەروەك مرۆڤ ڕۆژانە هەست دەکات پێویستی بە خۆراکە، بە هەمان جۆر هەستیش بە پێویستیی ناخی خۆی دەکات بۆ ئەم خۆراکە ڕۆحانی‌یە. بۆیە کەسێکی وەك ئێوە کە گیانی لەسەر پەیامەکان والاّ بێت و دڵی پێیان گوشاد بووبێت، لە خوێندنەوەی ئەو پەیامانە بێزار نابێت. چونکە ئەم پەیامانە وەك نامیلکەی تر لە جۆری "میوە" نین تا مرۆڤ لێیان بێ تاقەت ببێت، بەڵکو قووت و خۆراکن و، هەمیشە پێویستن.

الباقي هو الباقي
براتان
سەعیدی نوورسی

* * *

(١) مێژووی گەیشتنی نامەکەیە بە دەستی کاك ڕەئفەت.

(لە بارەی تاقمی "زەیدی"یەوە)

٥/شوبات/١٩٣٤

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفا و وردەکار و موشتاقم کاك ڕەئفەت!

دووهەم: پرسیارەکەتان لە بارەی "ئیمام زەید"ەوە[1]، کە ئیمامی ئەهلی یەمەنە، گرنگی و یومنی تێدایە. بەڵام لە کاتێکی بێ یومن و بەرەکەتدا گەیشت! چونکە بارودۆخ بوار نادات و زەینم لە کار وەستاوە و... و... هتد. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

"ئیمام زەید" یەکێکە لە ساداتە مەزنەکان و پێشەوایانی ئالی بەیت و، هەر ئەویش بوو کە شیعە زۆر ڕۆچووەکان(غلاة)ی دەرکرد و پێی وتن:

بڕۆن ئێوە "ڕافزی"ن! هەروەك بە خۆ بەری کردن لە حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر - خوایان لێ ڕازی بێت - قایل نییە، بەڵکو دان بە خەلافەتەکەیاندا دەنێت و ڕێزیان لێ دەگرێت. ئنجا شوێنکەوتووانیشی ڕێکترینی تاقمەکانی شیعەن و نزیکترینیانن لە ئەهلی سوننەتەوە و، سیفەتی ئینصاف و زوو قبووڵ کردنی حەقیان تێدایە.

پشت بە خوا زەیدییەکان لە ئایندەدا خۆیان لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت جیا ناکەنەوە و دەڕۆنە ناویان و تێکەڵیان دەبن.

---

(١) ناوی: زەیدی کوڕی عەلیی کوڕی حەزرەتی حسەینی کوڕی حەزرەتی عەلییە و لە نێوان ساڵەکانی (٧٩-١٢٢ك)دا ژیاوە. پێی دەوترێت: "زەیدی شەهید". ئیمامی ئەبوو حەنیفە لە بارەیەوە فەرموویەتی: "لە زەمان و ڕۆژگاری ئەودا کەسم نەدیوە لە حازر وەڵامیدا لەو چاپوکتر بێت و گوفتاریشی لە هی ئەو ڕەوانتر بێت و لەویش شارەزاتر بێت لە فیقهدا". چل هەزار کەسی خەڵکی کووفە لەسەر بانگەوازی کیتاب و سوننەت بەیعەتیان پێ دا، پاشان پشتیان بەر دا و چەند جەنگێك ڕووبەڕووی هەڵگیرسا کە بە شەهید بوونی ئەم کۆتاییان پێ هات. بە پوختی لە "الأعلام"ەوە. هەروەها بڕوانە: "البداية والنهاية" لابن كثير ٩/٣٢٩. (وەرگێڕ)

ئەم زەمانەی دوایی گەلێ پشێوی بە خۆیەوە دەبینێت و، فیتنەی ئاخر زەمانیش سەرهەڵدانی چەندین شتی سەیر و سەرسوورهێنەر بە گوێی هەستی مرۆڤدا دەدات. سڵاو لە هەموو ئەوانە دەکەم کە پەیوەندییان بە پەیامەکانی نوورەوە هەیە.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(دەتوانن لە کۆڕی سەعیددا دابنیشن)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

دووهەم:...

پێشتر پێم وتن:

"کەس"ی من(سەعید) خاوەنی هیچ گرنگییەك نییە، تا پێتان خۆش بێت لەگەڵی دابنیشن و گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن.

بەڵام ئەو سەعیدەی کە "مامۆستا"تانە دەتوانن بە کردنەوەی هەرکام لە پەیامەکان، لەگەڵیدا دابنیشن و بەشداری گفتوگۆ بن لەگەڵیدا.

خۆ ئەو سەعیدەش کە "برای قیامەتی"تانە، بەیانی و ئێوارە لە دوعا و پاڕانەوەکانی لە دەرگانەی خوای گەورەدا لەگەڵتاندایە.

کاك "سزائی" هەر کاتێ بیەوێت دەتوانێت سەعیدی مامۆستا و برای خۆی ببینێت.

بەڵام "کەس"ی سەعید، هەر کەس ببینێت پەشیمان دەبێتەوە! بەپێی ئەو پەندە بەناوبانگەی کە دەڵێت:

"تسمع بالمعيدي خير من أن تراه"(1)!

چونکە لەبەر خۆیەوە دەڵێت: خۆزگا چاوم پێی نەکەوتایە و، وەکو تەپڵ وایە، هەر تەنها لە دوورەوە دەنگی خۆشە!

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(لە بارەی "ئالی عەباء"ەوە)

٤/نیسان/١٩٣٤ چوارشەممە

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفا و وردەکار و بایەخدەرم کاك ڕەئفەت!

پرسیارەکەی ئەم جارەتان دوو ڕووی تێدایە..

یەکەمیان:

ڕووی "ئالی عەبا"یە کە نهێنییەکە و، من شایانی ئەو نهێنییە نیم تا وەڵامی ئەو پرسیارەتان بدەمەوە. یان هەموو نهێنییەك ناکرێت بە نووسین دەربـبڕرێت. چونکە یەکێك لە درەوشانەوەکانی "حەقیقەتی محەممەدی" لە "ئالی عەباء"دا دەردەکەوێت.

(1) پەندێکی نوعمانی کوڕی مونزیرە کە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: مجمع الأمثال للميداني (٦٥٥) ١/١٧٨، جمهرة الأمثال للعسكري ١/٢٦٦، المستقصى للزمخشري ١/١٤٨، لسان العرب لابن منظور مادة (معد). (وەرگێڕ)

رووی دووهەمی ڕواڵەتی پرسیارەکە ئاشکرایە و لە کتێبەکانی فەرموودەدا وەك صەحیحی موسلیم[1] بە گێڕانەوەی حەزرەتی عائیشە - خوای لێ ڕازی بێت - بەم جۆرەی خوارەوە ڕیوایەت کراوە:

بەیانییەکیان پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە و عەبایەکی خوریی ڕەشی چنراوی دابوو بە شانیدا و، ئنجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر ﷺ خستیە ژێر عەباکەوە، ئنجا حوسەین هات و ئەویشی خستە ژێر عەباکەوە، ئنجا فاتیمە هات و هەر خستیە ژێر عەباکەوە، پاشان عەلی هات و ئەویشی خستە ژێر عەباکەوە، ئنجا فەرمووی:

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيراً﴾ (الأحزاب:٣٣).

چەند حەدیسێکی تری وەك ئەمە لە بارەی "ئالی عەباء"ەوە[2] بە چەند ڕیوایەتێکی جیاجیا لە شەش کتێبە صەحیحەکانی حەدیسدا ڕیوایەت کراون.

زاتێك بۆ مەبەستی چاکبوونەوە لە نەخۆشی و بەدەستهێنانی شەفاعەت فەرموویەتی:

لي خمسة أطفي بـها نار الوباء الحاطمة      المصطفى والمرتضى وابناهما والفاطمة

---

(١) صحيح مسلم (٢٤٢٤)، فضائل الصحابة ٦١. لە دەقی فەرموودەکەدا دەفەرموێت: "وعليه مرط مرحّل"، لە ڕیوایەتێکی تردا: "مرجّل". گەر "مرحّل" بێت واتە پۆشاکەکەی بەری وێنەی باری حوشتری لەسەر نەخشابوو. گەر "مرجّل"یش بێت، واتە وێنەی قازان و مەنجەڵی لەسەر نەخشێنرابوو، بڕوانە: "مسلم بشرح النووي" ١٩٤/٨. (وەرگێڕ)

(٢) وللحديث طرق كثيرة. انظر المسند ٤٨، ١٠٧، ٢٩٢/٦، ٢٩٦، ٢٩٨، ٣٠٤ والبخاري في التاريخ الكبير ٦٩/٢/١ والحاكم ١٤٧/٣ والترمذي وأحمد في فضائل الصحابة برقم ٩٨٧،١١٤٩، ١٤٠٤، ١١٧٠، ١٣٩٢ وذكر الهيثمي في المجمع ١٦٦/٩ والسيوطي في الدر المنثور ١٩٨/٥ له طرق كثيرة مع مخرجيها عن عدد من الصحابة رضي الله عنهم. أخرج الطبراني في الأوسط عن علي أنه دخل على النبي ﷺ وقد بسط شملةً فجلس عليها هو وعلي وفاطمة والحسن والحسين، ثم أخذ النبي بمجامعه فعقد عليهم ثم قال: "اللهم ارضَ عنهم كما أنا عنهم راضٍ". قال الهيثمي (١٦٩/٩): رجاله رجال الصحيح غير عبيد بن طفيل وهو ثقة، كنيته أبو سيدان ا هـ. عن حياة الصحابة ١٠٥/٤.

ئێستا هەر ئەم ئەندازەیەم لە وەڵامەکەت نووسی، دڵگران مەبە.

سەلام لە یەك بە یەکی ئەوانە دەکەم کە لە نامەکەتاندا ناوت هێنابوون و دوعای خێریان بۆ دەکەم.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(پیرۆزبایی بە بۆنەی لەدایك بوونی کیژۆڵەیەك)

چوارشەممە ٩/مایس/١٩٣٤

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفا و وردەکارم کاك ڕەئفەت!

یەکەم:

لەدایك بوونی منداڵەکەتان لێ پیرۆز بێت و خوا بیکات بە مایەی خێر. پشت بە خوا ڕێژنەیەکی نوورەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەدەست دەهێنێت کە دەفەرموێ:

﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنْثى﴾ (آل‌عمران:٣٦).

چونکە ئەو دوو کیژۆڵەیەی کە خوای گەورە بە ئێوە و کاك عاصمی بەخشی زیاتر دەتانکات بە شایانی پیرۆزبایی لێ کردن، لەبەر ئەوەی گرنگترین بناغەکانی مەشرەبی ئێمە بریتییە لە "شەفەقەت" خۆ کچانیش، کە دروستکراوێکی خۆشەویستن، پاڵەوانی سۆز و شەفەقەتن. من لەو باوەڕەدام کە لەم ڕۆژگارەدا مەترسی منداڵی نێرینە زیاترە لە هی مێینە.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە ئەم کیژۆڵەیە بکات بە مایەی هاودەمی و دڵنەواییتان و، وەك مەلائیکەتێکی بچووکی لێ بکات کە بە ناوماڵەکەتاندا بگەڕێت! پێم باشترە لە بریی: "ڕەنگی گوڵ" ناوی بنێن "زەینەب".

دووهەم:

ئەوەی کە تۆ و کاك شەریف لە بارەی پەیامی (حیکمەتی: أعوذ باللە) و (نهێنییەکانی: بسم اللە)وە نووسیوتانە، زۆر کورت و پوختە و، نازانرێت ئایا تەقدیر و ڕێزلێنانە یان ڕەخنەگرتنە! لە کاتێکدا من چەندین جار دووپاتم کردووەتەوە کە هەموو کەسێك پێویستی بە تێگەیشتنی هەموو مەسەلەیەکی هەموو پەیامێك نییە، بەڵکو چەندی لێ تێگەیشت سەروزیادیەتی.

سێهەم:

"جیهانی میسال" ناوەندێکە لە نێوان "جیهانی ڕۆح" و "جیهانی بینراو"دا و لە هەردووکیان دەچێت، هەر یەك لە ڕوویەکەوە. چونکە ڕوویەکی دەڕوانێتە ئەویان و ڕووەکەی تریشی دەڕوانێتە ئەمیان. بۆ نموونە: وێنە میسالیەکەت لەناو ئاوێنەدا لە جەستەت دەچێت و لە هەمان کاتیشدا وەك ڕۆحت نیان و ناسکە.

ئەو جیهانە - جیهانی میسال - بە وێنەی بێ گومانیی جیهانی بینراو و جیهانی گیانەکان[1] چەسپاوە و، شوێنی ناودەرکردنی شتانی نامۆ و سەیر و سەرسووڕهێنەر و جێگای گەشتوگوزاری ئەهلی ویلایەتە.

جا هەروەك هێزی "ئەندێشە" لەم مرۆڤەدا هەیە، کە جیهانێکی بچووکە، "جیهانی میسال"یش لەم جیهانەدا هەیە، کە مرۆڤێکی گەورەیە و، ئەرکەکەی ئەو ئەندێشەیە لەم مرۆڤە گەورەیەدا ڕادەپەڕێنێت و، جیهانێکە بە حەقیقەت وجوودی هەیە. چونکە هەروەك هێزی "بیرکردنەوە"ی مرۆڤ هەواڵی "لەوحی

(١) بوونی "جیهانی میسال" سەبارەت بە من شتێکی بینراوە و بە وێنەی بەڵگەنەویستی "جیهانی بینراو" بێ گومانە. تەنانەت: خەونی ڕاست و، کەشفی ڕاستی بێ گومان و، وێنە دەرکەوتنەکان لە شتە ڕوونەکاندا، سێ پەنجەرەن کە لەم جیهانەوە بەسەر ئەو جیهانەدا دەڕوانن، بە چەشنێك کە چەند لایەنێکی ئەو جیهانە پیشانی کەسانی عەوام و هەموو خەڵکی دەدەن. (دانەر)

مەحفووظ"ی جیهانی گەورە ڕادەگەیەنێت، بە هەمان جۆر هێزی "ئەندێشە"ش هەواڵی جیهانی میسال ڕادەگەیەنێت.

الباقي هو الباقي
براتان
**سەعیدی نوورسی**

* * *

(هەر دە لەتائیفەکە)

چوارشەممە ٢٠/حزیران/١٩٣٦

باسمه سبحانه
﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾
السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفا و بایەخدەرم کاك ڕەئفەت!

لە نامەکەتاندا لە بارەی دە دانە لەتائیفەکانەوە پرسیارتان کردووە. من ئێستا خەریکی وانە وتنەوەی تەریقەتی سۆفی نیم. زانایانی لێکۆڵەری تەریقەتی نەقشبەندی چەند کتێب و ئاسەوارێکیان لە بارەی ئەو دە دانە لەتائیفەوە هەیە.

ئەرکی ئێستای سەرشانمان دەرهێنانی نهێنییەکانی قورئانی پیرۆزە، نەك نەقڵ کردنی ئەو مەسەلە و بابەتانەی کە لەناو کتێبەکاندا هەن. دڵگران مەبن لەوەی کە ناتوانم بابەتەکەت بە درێژی بۆ باس بکەم. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

دە دانە لەتائیفەکان بەلای ئیمامی ڕەببانییەوە - خوای لێ ڕازی بێت - بریتین لە: "قەلب، ڕۆح، سیرڕ، خەفی و ئەخفا" هەروەك هەموو یەکێك لە چوار توخمەکەی ناو مرۆڤیش لەتیفەیەکیان هەیە کە لەگەڵ ئەو توخمەدا شیاوبن. هەروەك بە پوختی سەبارەت بەرزبوونەوەی یەك بە یەکی ئەو لەتیفانە و حاڵیان لە هەموو پلەکانی سەیر و سلووکدا، دواوە.

من پێم وایە ماهییەتی گشتیی مرۆڤ و، توانـا و لێهاتنەکانی لەمەڕ ژیان لـەودا گەلێ لایەنی ناسکیان تێدایە، بەڵام دە دانەیان ناوبانگی دەرکردووە.

دانایـان و زانایـانی ڕوالـەت بینیش ئەو دە لەتائیفـەیان - بـە شـێوەیەکی تـر - کردووە بە بناغەیەك بۆ دانستەکەیان، وەك پێنج هەستە ئاشـکرا و پێنـج هەسـتە پەنهانەکان، بە وێنەی چەند پەنجەرە و نموونەیەکی ئەو دە لە تائیفانە.

وەك لای عامـەی خـەڵکی باوە: دە لەتائیفـەکانی مـرۆڤ پـەیوەندییان بـەو دە دانەیەی لای ئەهلی تەسـەووفەوە هەیـە. بۆ نموونـە: گـەر ویجـدان و، دەمارەکـان و، هەست و، ژیری و، ئارەزوو و، هێزی شەهەوی و، هێزی تووڕەیی و، لەتائیفەکانی هاوچەشـنیان بخرێنـە سـەر: قـەلب و، ڕۆح و، سـیڕ، ئـەوا دە لەتائیفـەکان لـە شێوەیەکی تردا دەردەکەون.

جگە لەمانەی کە باس کران گەلـێ لەتائیفی تـر هـەن، وەك: سـائیقە و شـائیقە و هەستی پێش ڕوودان. خۆ گەر ڕاستیی ئـەم مەسـەلەیە بنووسم، درێژە دەکێشێت. بۆیە لەبەر کەمیی کاتەکەمان ناچار بووم لە کورتیدا بیبڕمەوە.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(واتای حەرفی و واتای ئیسمی)

بەڵام پرسیاری دووهەمتان:

گەر سـەیری ئاوێنـەت کـرد، یەکـەم جـار مـاددە شووشـەکەی دەبینیـت، پاشـان وێنەکـەی نـاوی لـە پلـەی دووهـەمدا دێـت بـەڵام ئەگـەر مەبەسـت لـە سـەیرکردنی ئاوێنەکە: بینینـی وێنەکـەی نـاوی بێـت، ئـەوا یەکسـەر ئـەو وێنەیـەت بـە ڕوونـی بـۆ دەردەکەوێت هەتا وات لـێ دەکات بڵێیت: "فتبارك الله احسن الخالقين" ئیـتر بینینـی شووشەی ئاوێنەکە دەکەوێتە پلەی دووهەم.

سەیرکردنی یەکەم بە واتای "ئیسمی"یە. واتە شووشەی ئاوێنەکە مەبەستە و، وێنەی ئەو کەسەش کە تیایدا دەردەکەوێت واتایەکی "حەرفی"یە و مەبەست نییە.

بەڵام سەیرکردنی دووهەم ڕاستەوخۆ بینینی کەسەکەی مەبەستە، کەواتە بینینی ئەو "واتای ئیسمی"یە و، هی شووشەکەیش "واتای حەرفی"یە.

بەم پێیە، لە کتێبەکانی "نەحوو"دا پێناسەی "ئیسم" بە: (واتای سەربەخۆ بۆ خۆی بەدەستەوە دەدات) و، هی "حەرف"یش بە: (واتای غەیری خۆی دەگەیەنێت) کراوە.

سەیرکردنی قورئان بۆ بوونەوەران وایە، کە هەموویان بە "حەرف" تەماشا دەکات کە واتای غەیری خۆیان دەگەیەنن، بەو واتایەی کە: درەوشانەوەی ناوە جوانەکان و سیفەتە مەزنەکانی بەدیهێنەری مەزن بەسەر بوونەوەرانەوە دەردەبڕن.

بەڵام زۆربەی ڕوانینەکانی فەلسەفەی مردووی ماددی بۆ بوونەوەران سەیر کردنی "ئیسمی"یە. ئیتر بەم بۆچوونە، پێی فەلسەفەی ماددی بۆ ناو زۆنگاوی سروشت دەخلیسکێت.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(موسڵمانی بێ ئیمان و ئیمانداری ناموسڵمان)

چوارشەممە ٢٧/حوزەیران/١٩٣٤

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ برای ئازیز و پرسیارکەر و ڕۆچوو لە باس و لێکۆڵینەوەدا: کاك ڕەئفەت!

زیرەكی‌یە لەڕادەبەدەرەكەت و تێبینی‌یە وردەكانت هانم دەدەن كە زۆربەی پرسیارەكانتان بە كورتی وەڵام بدەمەوە..

كەواتە دڵگران مەبن.

خۆ هەرچەندە حەز دەكەم لەگەڵتاندا بدوێم، بەڵام كەمی كات بوارمان نادات.

واتای: موسڵمانی بێ ئیمان و ئیمانداری ناموسڵمان ئەمەی خوارەوەیە:

لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا[١] چەند كەسێكی مولحیدم لە ناوەندی ئیتیحادی‌یەكاندا دەبینی كە دەیان وت:

ئایینی ئیسلام و شەریعەتی محەممەدی چەندین یاسا و دەستووری یەكجار بەنرخ و گشتی و سوودبەخشیان تێدایە كە شایانی جێبەجێ كردنن لە كۆمەڵگای ئادەمیزاد بە تایبەت لە سیاسەتی عوسمانیدا.

واتە: بە هەموو هێزێكیانەوە لایەنی شەریعەتی محەممەدی‌یان دەگرت.

جا ئەوان لەم حاڵەدا موسڵمانن. واتە: هەرچەند بێ ئیمانن، بەڵام لایەنی حەقیان گرتووە و جێبەجێی دەكەن. بەو واتایەی كە شایستەی ئەوەن پێیان بوترێت: موسڵمانی بێ ئیمان!

بەڵام ئێستا كەسی وا هەیە لە خۆیدا خۆی بە ئیماندار دەزانێت و باوەڕی بە خوا و پێغەمبەر ﷺ و ڕۆژی دوایی هەیە، كەچی بە ناوی "مەدەنییەت"ەوە دەچێت پشتگیری لەو تەوژمانە دەكات كە دژی شەریعەتن و لەگەڵ بیانی‌یەكاندا ڕێك و هاوبیروڕان! جا لەبەر ئەوەی یاساكانی شەریعەتی ئەحمەدی جێبەجێ ناكات - كە حەق و حەقیقەتن - و، بە چەشنێكی ڕاستەقینە لایەنی ئەو یاسایانە ناگرێت، ئەوا دەبێت بە ئیماندارێكی ناموسڵمان!

دەتوانرێ بوترێت:

---

(١) واتە: سەردەمی دووهەم جاری ڕاگەیاندنی دەستوور كە پێی دەوترێت "مەشرووتییەتی دووهەم" كە ساڵی ١٩٠٨ز لە لایەنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمەوە ڕاگەیەنرا. (وەرگێڕ)

هەروەك ئیسلامی بێ ئیمان نابێت بە مایەی ڕزگاربوون، بە هەمان جۆر ئیمانی بێ ئیسلامیش - کە لەسەر بناغەی زانین بێت - خۆی ڕاناگرێت و ڕزگاریش بۆ مرۆڤ بەدەست ناهێنێت.

پرسیاری دووهەمتان:

ئەجەلی موبرەم و موعەللەق، بە تەعبیرێکی تر بریتین لەو ئەجەلەی کە کاتی بۆ دیاری کراوە و ئەوەش کە کاتی بۆ دیاری نەکراوە، وەك خۆتان دەزانن و ئاگادارن.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(فیقهی ئەکبەر و مەسەلە فەرعی‌یەکان)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفا و وردەکارم کاك ڕەئفەت!

باشترین و ئاسانترین وەڵام کە ڕوخسەتی شەرعیی تێدا ڕەچاو کرابێت وەڵامەکەی ئێوەیە. چونکە "شەرحی مولتەقا"ی "داماد" و "مرقاة الفلاح" دەڵێن: یەك کەفارەت سەروزیادی دوو مانگی ڕەمەزانە. کەواتە کەفارەتێك بۆ چەند ڕووداوێکی جیاجیا بەسە، چونکە ڕووداوەکان تێهەڵکێشی یەکترین. ئەو دوو کتێبە وتوویانە: ئەم بۆچوونە صەحیحە.

لە گۆشەی ڕوانینی حەقیقەتیشەوە:

ئەم مەسەلەیە عەزیمەت و ڕوخسەتی تێدایە. عەزیمەتەکە بریتی‌یە لەوەی کە هەموو ڕەمەزانێك کەفارەتی سەربەخۆی ببێت، گەر ئەو کەسە لە توانایدا بێت. هەرچی ڕووی ڕوخسەتەکەشە ئەوا بەپێی خواستی "تێهەڵکێش بوونەکە": یەك کەفارەت فەرزە بۆ چەند مانگێکی ڕەمەزان و ئیتر کەفارەتە پەرش و بڵاوەکانی تر لە پلەی "موستەحەب"دان، هەروەها لەبەر ئەوەش کە هەردوو واتای "سزادان" و "بەندایەتی" لەم کەفارەتەدا ڕەچاو کراون. کەواتە جگە لە هۆکاری تێهەڵکێش بوون، لەبەر کۆبوونەوەی ئەم دوو واتایەش لە کەفارەتەکەدا بۆ هی ڕەمەزانەکانی تر زۆری لێ ناکرێت.

ئێمە سەرقاڵی بناغەکانی ئیمانین کە پێیان دەوترێت: "فیقهی ئەکبەر". بۆیە ئێستا زەینم بە شێوەیەکی جیددی ڕوو ناکاتە نەقڵ کردنی وردەکاریی مەسەلە فەرعی‌یەکان و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی موجتەهیدان. جگە لەوەی کە دەشزانن من کتێبە سەرچاوەییەکانم لە لا دەست ناکەوێت و کاتێکی ئەوتۆشم بۆ سەرلێدان و خوێندنەوەیان بە دەستەوە نی‌یە. سەرباری هەموو ئەمانەش زانایانی ئیسلام بە چەندین وردەکاریی ڕاست و دروست ئەم مەسەلە و بابەتانەیان خستووەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە هیچ پێویستی‌یەکیان بۆ وردکردنەوە و قووڵ بوونەوەی تر لە بابەتە فەرعی‌یەکاندا نەهێشتووەتەوە. خۆ ئەگەر لەم ڕووەوە هەستم بە پێویستیی ڕاستەقینە بکردایە، ئەوا بۆ ئەم چەشنە مەسەلە و بابەتانە سەردانی سەرچاوە بەنرخەکانی موجتەهیدانم دەکرد و بۆم ڕوون دەکردیتەوە. لەوانەیە هێشتا کاتی سەرقاڵ بوون بەم چەشنە ڕاستی‌یانە نەهاتبێت.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

(مەسەلەیەك كە تایبەتە بە "دەست پێوەگرتن"ەوە)

ئەی ئادەمیزاد و ئەی نەفسی خۆیشم!

بە دڵنیاییەوە بزانە كە:

جەستە و ئەندامەكانت و "بوون" و سەروەت و سامان و ئاژەڵەكانت كە نیعمەتن و خوای گەورە بە تۆی بەخشیون، هەرگیز بۆ ئەوە نەیبەخشیون كە بە موڵكی خۆتیان بزانیت، بەڵكو بۆ ئەوەیە كە ماڵێكی موباح بن لە بەردەستتدا. واتە بۆیە موڵكی خۆی خستووەتە ژێر دەستەڵاتی تۆوە و بۆی موباح كردوویت تاكو سوودیان لێ ببینیت، نەك بۆ ئەوەی بتكات بە موڵكدار و خاوەنیان.. چونكە كەسێكی وەك تۆ كە لە بەڕێوەبردنی "گەدە"یدا دەستەوسان بێت - كە ئاسانترین و ئاشكراترین كاری بەڕێوەبردنە و لە ناوەندی ئیختیار و هەست و شعووردایە - چۆن دەتوانێت ببێت بە خاوەنی "چاو" و "گوێ" و هەستیارەكانی هاوچەشنیان كە خوازیار و داواكاری بەڕێوەبردنێكن لە دەرەوەی بازنەی ئیختیار و هەست و شعووری مرۆڤدا!

جا مادەم ژیان و داخوازییەكانی بۆ "ئیباحە" بە مرۆڤ بەخشرابن نەك بۆ "موڵكداری" ئەوا تەنها دەبێ بەپێی دەستووری "ئیباحە" ڕەفتار بكەیت. واتە بە وێنەی خانەخوێ كە بواری سوود وەرگرتن بە میوانەكانی دەدات لەو شتانەی كە لە بەردەمیاندا دایناوە، بێ ئەوەی بیانكات بە موڵكیان. چونكە دەستووری "ئیباحە" و "میوانداری" ڕەفتار و هەڵسوكەوتە بەو كردارانەی كە لە چوارچێوەی ڕەزامەندیی خانەخوێدان.

كەواتە نابێت ئیسراف لەو شتانەدا بكات كە بە ئیباحە خراونەتە بەردەستی، یان لێیان ببەخشێت بە كەسێكی تر و، ڕەفتاری سەربەخۆ و گاڵتەجاڕییان تێدا بكات، یان بە زایەیان بدات! چونكە گەر بكرانایە بە موڵكی، ئەو كاتە دەیتوانی بەپێی حەز و ئارەزووەكانی خۆی هەڵسوكەوتی تێدا بكردنایە!

هەر بە هەمان جۆر، دروست نییە مرۆڤ خۆی بكوژێت و كۆتایی بەو ژیانەی بهێنێت كە خوای گەورە بە "ئیباحە" پێی بەخشیوە. هەروەك بواری ئەوەت

نەدراوەتێ کە "چاو"ی خۆت بە جۆرێکی مەعنەوی دەربهێنیت، واتە بە ڕوانین بۆ ئەو شتە حەرامانەی کە خاوەنی چاوەکە پێی ڕازی نییە، بە کاری بهێنیت. بە هەمان جۆر بوار نەدراوە "گوێ" و "زمان" و "لووت" و هەست و کۆئەندامەکانی هاوچەشنیان لە واتا و ناوەرۆکدا بکوژرێن. بەو واتایەی لە حەرامدا بخرێنەکار. کەواتە دەبێ بەپێی شەریعەتی خانەخوێ و میواندارى خاوەن کەرەم و بەخشندە هەڵسوکەوت و ڕەفتار لە هەموو نیعمەتەکانی دنیادا بکرێت.

سەعیدی نوورسی

* * *

(دوا ئاگادارکردنەوە(إنذار) بۆ موفتیی ئەگریدر)

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

لەبەر ئەوەی بەڕێزتان هاوڕێیەکی کۆن و هاوەڵمن لە زانستدا، وا گفتوگۆیەکتان لەگەڵدا دەکەم:

من هەواڵی گرفت و موسیبەتێکی ئایینیی گەورەت پێ ڕادەگەیەنم کە پەیوەندیی بە هەردووکمانەوە هەیە. دەسا با پێکەوە بۆ لابردن و نەهێشتنی تێبکۆشین، کە بریتییە لەمەی خوارەوە:

لەو کاتەدا کە دەبوو بەڕێزتان لە هەموو کەسێك زیاتر بایەخ و پشتگیریتان بۆ ئەو کاری "خزمەت بە قورئان و ئیمان"ەی ئێمە دەربڕیایە و، لە پێش هەموو کەسێکەوە بەرگریتان لێ بکردینایە، کەچی - بە داخەوە - دەبینین بە ڕوانینێکی هێندە ساردەوە بۆمان دەڕوانن کە گیانی موونافیسی لە خۆدا هەڵگرتووە، تەنانەت لەبەر چەند هۆیەکی نەزانراو هەڵوێستی نەیار و لایەنی بەرامبەرتان لێ گرتووین، بەڵکو هەوڵیشتان داوە کوڕەکەتان بە بەڕێوەبەری ئەم گوندە[1] دابمەزرێنن و پاشان

(١) مەبەست لە "کوڕەکەی موفتی": ئەو کەسەیە کە مامۆستا نوورسی لە مەکتووبی بیست و شەشەمدا (مەکتووبات لاپەڕە ٥٦٥) بە ناوی "کەسی دووهەم" ناوی دەبات. (وەرگێڕ)

پشتگیر و هاوڕێی بۆ بدۆزنەوە، هەتا کار گەیشتە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە هەرکات بیرم لە ماهییەتەکەی دەکردەوە، لە بریی ئێوە تەزوو بە جەستەمدا دەهات! چونکە ئێوە بەپێی دەستووری: "السبب کالفاعل" هۆکار و بەرپرسی ئەو گوناهـو تاوانانەن کە لەم حاڵەتەوە سەرهەڵدەدەن.

جا هەروەك "ژەهر" تەنها بە ناولێنان ناگۆڕێت بە "دەرمان".. بە هەمان جۆر، دۆزینەوەی هەر ناوێکیش بۆ بارودۆخەکانی ئەو دەستەیەی کە گیانی زەندەقەیان لەخۆدا حەشار داوە و ڕێ بۆ ئیلحاد خۆش دەکەن، هیچ لە کارەکە ناگۆڕێت و، هەر ناوێکی وەك: "نیشتمانی لاو" یان "نیشتمان پەروەرە پیرۆزەکان"ی لێ بنێن واتاکەی هەر یەکسانە و ناگۆڕێت. چونکە ئەو دەستە و تاقمانەی کە لە شوێنەکانی تردا هەن و بە چەند ناوێکی وەك: "ڕێکخراوەکانی لاوان" و "ئەنجوومەنی تورکە نەتەوەییەکان" و "یانەی نوێخوازی" و ناوەکانی تری هاوچەشنیان ناونراون، دەگونجێ لە چەند شکڵ و شێوەیەکی تردا دەربکەون و هیچ زیانێکیشیان نەبێت.

بەڵام هەوڵی سەرومڕی ئەم دەستەیەی کە لەم گوندەدان لە دژی ئێمە، تەنها هەر لە پێناوی زەندەقە و ئیلحاددایە، چونکە ئێمە بە بەردەوامی و ماوەی هەشت ساڵە تەنها لە خزمەتی ئیمان و ڕاستییەکانی ئاییندایین.

بێ گومان کردارەکانی ئەم دەستەیەی کە لە دژی ئێمە تێدەکۆشێت و بە پێچەوانەی ئوسوولی ئایینەوە کار دەکات، هەر لە پێناوی "ئیلحاد"دا دەبێت. تەنانەت سەری ئەم کارانە لە خزمەتی "کوفر" و "زەندەقە"وە دەردەچێت.

ئەمەیە ئەنجامی کار و تێکۆشانەکانیان! ئیتر تۆ چ پێی بزانیت و چ پێی نەزانیت! چونکە بۆ هەموو لایەك ڕوون بووەتەوە کە من هیچ پەیوەندییەکم بە تەوژمە سیاسییەکانەوە نییە و، ئێمە تەنها بە "ڕاستییەکانی ئیمان"ەوە سەرقاڵین.

هەرکەسێك ئێستا لە دژی ئێمە ڕەفتار دەکات، با وا نەزانێت کارەکەی "لە پێناوی حکوومەت"دایە، چونکە ڕێبازی ئێمە ڕێبازێکی سیاسی نییە.. هەروەك ئەو ڕەفتارەی لە پێناوی "بیدعەتە تازە پەیدابووەکان"یشدا نییە، چونکە ئەو

کارەی کە ئێمەی بە ڕاستی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە: بناغەکانی ئیمان و قورئانن.. هەروەها لە پێناوی "فەرمانە ڕەسمی‌یەکانی فەرماندەی کاروباری ئایینی"شدا نی‌یە، چونکە خۆخەریك کردن بە ڕەخنە گرتن لە فەرمانەکانی ئەو فەرمانگەیە و نەیاری کردنی، کاری ئێمە نی‌یە. چونکە گەر پێیەوە خەریك بین هیچ بوارێکمان بۆ ڕاپەڕاندنی کارە خاوێنەکەمان بۆ نامێنێتەوە. بۆیە ئێمە بەم کارەوە خۆمان سەرقاڵ ناکەین و بۆ کەسانی تری بەجێ دەهێڵین، تەنانەت بەپێی توانا هەوڵ دەدەین کە خۆمان لە قەرەی ئەو فەرمانانە نەدەین.

لەبەر ئەوە، هەر کەسێك ڕێبازی دژایەتیمان لە بەرامبەرەوە بگرێت و دەستدرێژیمان بکاتە سەر، ئەوا ئەم دەستدرێژی‌یە - هەر ناوێکیشی لێ نرابێت - بە خزمەتی زەندەقە و ئیلحاد دادەنرێت. چونکە بە درێژایی هەشت ساڵ ئەم گوندە بوو بە خولگەی تەوژمێکی ئیمانی.

ئا لێرەوە پێویستە کە بزانین ئەم بارودۆخە دروست کراوە گەلێ گرنگە و پەیوەندیی بە هەردوو لامانەوە هەیە، لە ڕووی کار و پلەی کۆمەڵایەتیتان و مەنسەبەکەتانەوە (کە مەنسەبی فەتوایە) و دەستەڵاتتان لەم ناوچانەدا و، یارمەتیدانی کوڕەکەتان کە هی سۆزی زیاد لە پێویستتانە بۆ منالەکانتان.

مانەوەی من لێرە هەمیشەیی نی‌یە بەڵکو کاتی‌یە و، منیش لە چاککردنی ئەو بارودۆخە بەرپرس نیم، بەڵکو دەکرێ تا ڕادەیەك خۆم لەو بەرپرسی‌یە قوتار بکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی جەنابتان هۆکار و خالی سەرەکیی ئەم کێشەیەن، ئەوا چاککردنی ئەو ئەنجامە ترسناکانەی کە لەم بارودۆخەوە سەر هەڵدەدەن پێش هەموو کەسێك لە ئەستۆی ئێوەدایە، تاکو ئەو بارودۆخە لە تۆماری کردەوەکانی سەر بە دوارۆژتاندا تۆمار نەکرێت. یان هەوڵ بدەن کوڕەکەتان لەم گوندە بکشێننەوە.

سەعیدی نوورسی

(هاوەڵێتیی ئەهلی حەقیقەت)

بە ناوی ئەو کەسەی کە:

﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّموَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فيهِنَّ وَإِنْ مِــــنْ شَــيْءٍ إلاَّ يُسَــبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء:٤٤).

السلام عليكم ورحـــمة الله وبركاته بعدد حروف رسائل النور المكتوبة والمقـــروءة والمتمثلة في الهواء إلى يوم القيامة. آمين.

ئـەی برایـانی ئـازیز و بـەوەفا و پـیرۆزم و، هاوڕێیـانی بـەهێز و دڵسـۆزم لــە خزمەتکردن بە ئیمان و قورئان!

سوپاس و ستایشی بێ پایـان بۆ خـوای گـەورە کـە ئاواتەکـەی منـی لـە "پەیامی پیران" و ئیددیعاکەمی لە "پەیامی بەرگرییەکان"دا بە ئێوە هێنایە دی.

بەڵێ، بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکان لە ئەزەلەوە تا ئەبەد سـوپاس بۆ خـوای گەورە کە (سی) کەسی، بـەڵکو (سـەد و سـی) کەسی، تەنانـەت (هـەزار و سـەد و سی) هاووێنـەی "عـەبدورڕەحمان"ی لـە ئێوە بە پەیامـەکانی نـوور بەخشـی، کـە هەریەکەیان لە بەرامبەر هەزار کەسەوەیە!

هەرچـەندە بۆ ئـەو برایانـەم دەڕوانم کـە بـەردەوام بۆ خزمـەت لەگـەڵمدان و لــە خەیاڵم دەرناچن، دەیانبینم وەکو ئێوە بەوپەڕی چوسـت و چالاکییـەوە بۆ کـاری پەیامەکانی نوور تێدەکۆشن و دەیانگرنە ئەستۆ و، پارێزگاریان لـێ دەکـەن و، یـەك لە دوای یەك بە یەکتریی دەسپێرن و، بە شوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن و، ڕێـزی شـایان لە هەموو شتێك دەگرن.. کە لە شوێنی خۆمـەوە دەبینـم بەو جـۆرە ئیخلاسیان لـە هی من زیاترە و لە منیش زیـاتر گـەرموگوڕ و چوسـت و چالاکـترن لـە خزمـەت بـە ئیمـان و قورئـان.. ئـەوا بـە شـادمانی و خۆشـحاڵییەکی تـەواوەتی و کـــەماڵی دڵنیاییەوە چاوەڕوانی ئەجەل و مردن و گۆڕەکەی خۆم دەکەم.

برایانم! من لە ڕێی نامەکانتانـەوە و لـە نـاوەندی خزمەتـە بەنرخەکانتانـەوە - کـە هەرگیز لە یادم دەرناچن - هەرچی ڕۆژە چەندین جار دەتانبینم و، بەم کارانەشـتان

شەوق و تاسەمەندیم تێر دەبێت و دڵنیایی بەدەست دەهێنم. ئێوەش بە هەمان جۆر دەتوانن لە ڕێی پەیامەکانەوە گفتوگۆ و دانیشتن لەگەڵ ئەم برا لاوازەتاندا ساز بکەن. چونکە کات و شوێن ڕێ لە گفتوگۆی نێوان ئەهلی حەقیقەت ناگرن، تەنانەت گەر یەکێکیان لە خۆرهەڵات و ئەوی تریان لە خۆرئاوا و یەکێکیان لە دنیا و ئەوی تریشیان لە بەرزەخدا بێت. چونکە پەیوەندیی ئیمانی و قورئانیی نێوانیان وەك ڕادیۆیەکی مەعنەوی وایە، دەتوانن لەو ڕێیەوە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتریدا بکەن.

لە لایەن خاوەن قەڵەمە ئەڵماسییەکانەوە پرسیارێکم ئاراستە کراوە. من ئێستا وەڵامەکەیم لەلا نییە. خۆ هەرکات ئەو وەڵامەم شك برد، پشت بە خوا دەگاتە دەستتان.

تکام وایە ڕوشدی و ڕەئفەت و سولەیمان و ئەو برا بەڕێزانەی تریشم کە ناگونجێ ناویان بهێنم، لەوە دڵگران نەبن کە ناتوانم بە تایبەتی و لە ڕێی نامەوە لەگەڵیان بدوێم.

ئێمە بە ڕێژەی مەزنی و گرنگیی خزمەتەکەمان و، بە ئەندازەی هێز و فرۆفێڵە شەیتانییەکانی نەیارانی ئەم خزمەتە، ناچارین حەزەر و خۆپارێزی بکەین.

ئومێدەواری دوعاکانتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(کات و سەردەمی کۆمەڵ)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بعدد عاشرات دقائق أيام الفراق.

برا ئازیزە بەوەفاکانم و هاوڕێ بەهێز و وریاکانم لە خزمەتی قورئان و ئیماندا!

ئەم سەردەمە کاتی کاری بەکۆمەڵە. نرخ و بایەخ بەپێی کەسێتیی مەعنەویی کۆمەڵ دەبن.. دەبێت ماهییەتی ماددی و فانیی تاك بایەخی پێ نەدرێت، بە تایبەتی

کەسێکی بێچارە و لاوازی وەك من کە خاوەنی هیچ توانا و هێز و دەسەڵاتێك نی‌یە. چونکە ئەگەر هەزار ئەوەندەی خۆی زیاتر بایەخی پێ بدرێت و، هەزاران "ڕەتڵ"[١] بخرێتە سەرشانی - کە تەنها یەك ڕەتڵیشی پێ هەڵناگیرێت - ئەوا بێ هیچ گومانێك لە ژێر ئەم کۆڵە قورسەدا دەپلیشێتەوە.

سوپاس بۆ خوا "پەیامەکانی نوور" بە چەندین تاقیکردنەوەی زۆر و ڕووداوی جۆراوجۆر تەنانەت بۆ مرۆڤە نابیناکانیشیان دەرخستووە کە موعجیزەیەکی قورئانیی ئەوتۆن ئەم چەرخە و تەنانەت چەرخەکەی دوای ئەمەش ڕووناك دەکەنەوە. کەواتە چەندە مەدح و سەنای لەڕادەبەدەری ئەم پەیامانە بکەن شایانی خۆیانە. بەڵام من خۆم بە شایستەی یەك لە هەزاری ئەو بەش و بایەخە نازانم کە ئێوە بۆ منی دادەنێن، بەڵکو من بە ناوی پەیامەکانی نوورەوە، کە نیعمەتێکی مەزنی خواوەندی بەخشندەن، هەتا هەتایە شانازی بە هەوڵ و تێکۆشانی ئێوەی ئازیزەوە دەکەم لە کارە مەزنەکانتان و بەشداریی گەرموگوڕتان لەگەڵ قوتابی‌یە نەجیبەکانی ئەو پەیامانەدا.

شێخی گەیلانی و ئیمامی غەزالی و ئیمامی ڕەببانی و مەردانی گەورەی هاوچەشنیان، بە کەسایەتی‌یە بەهێز و خزمەتگوزاری‌یە مەزن و ڕێنماییە ڕاست و دروست و بەرهەمە بەنرخەکانی خۆیان، تەسدیقی ئەو فەرموودە پیرۆزەیان کردووە کە دەفەرموێ: "علماء أمتي كأنبياء بني إسرائيل"[٢]. جا لەبەر ئەوەی ئەو سەردەمانەی پێشوو - لە ڕوویەکەوە - چەرخی هەڵکەوتووانی شارەزا بووە، ئەوا پەروەردگاری دانا کەسانی وەك ئەو مرۆڤە هەڵکەوتووە ناوازە و زیرەکە پایە بڵندانەی بۆ فریاگوزاریی نەتەوەی ئیسلام ناردووە.

بەڵام ئێستا لەم چەرخەدا و لە پێناوی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە مەزنەدا خوای گەورە "پەیامەکانی نوور"ی - کە لە حوکمی کەسی مەعنەویدان - و

---

(١) ڕەتڵ وریتڵ: بریتی‌یە لە ٢٥٦٤ گم. (وەرگێر)

(٢) قال السخاوي في المقاصد: قال شيخنا يعني ابن حجر: لا أصل له، قال: وقال النجم: وممن نقله جازماً بانه حديث مرفوع الفخر الرازي وموفق الدين بن قدامة وأشار إلى الأخذ بمعناه التفتازاني والسيوطي في الخصائص. (باختصار عن كشف الخفاء ٢/٦٤) (وانظر تذكرة الموضوعات ص ٢٠). (وەرگێر)

قوتابی‌یەکانیشی - کە بەهۆی نهێنیی هاوپەیوەندی و پشتگیریی نێوانیان لە حوکمی تاقانەیەکی ناوازەدان - بۆ ئەم چەرخە ناردووە کە "چەرخی کۆمەڵ"ە و، بە چەندین بارودۆخی ئاڵۆز و حاڵەتی سامناك گەمارۆ دراوە.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە وردە: ئەرکی سەرشانی سەربازێکی وەك من تەنها لەوەدایە کە لە مەقامی موشیرێتیی پڕ لە کاری قورسدا، ڕۆڵی پێشەنگ ببینم.

سڵاو لە هەموو برایانم دەکەم، بە تایبەت لە یەك بە یەکی تایبەتمەندەکان. هەر لەبەر ئەوانی ئازیز و پیرۆزە کە هاودەم لەگەڵ دوعاکانمدا بۆ کەسوکار و خەڵکی گوندەکەم، هەمیشە دوعا بۆ کەسوکار و خەڵکی گوندەکانی ئەوانیش دەکەم و، لەگەڵ خۆمدا دەیانکەمە بەشداری دەسکەوتە مەعنەوی‌یەکانم.

* * *

(چارەسەر و حیکمەتی وەسوەسەکان)

برایانی ئازیز و گیانفیدا و بەوەفام!

لەبەر ئەوەی گوشارێکی توند و چاودێری‌یەکی بەردەوامم لەسەر دانراوە و بە تەواوەتی لە خەڵکی دایان بڕیوم، نەمتوانی نامەتان بۆ بنێرم.

سوپاسی بێ کۆتایی بۆ بەدیهێنەری میهرەبانم کە نیعمەتی صەبر و ئارامێکی گەورەی پێ بەخشیم، بە ڕادەیەك کە نیازە چەپەڵەکەیان سەری نەگرت و شکستی هێنا.

هەموو مانگێکی ئێرەم کە بە دابڕان و دووری لە ئێوە لێم دەگوزەرێت، وەکو ساڵێکی زیندانی تەنهایی وایە. بەڵام بە چاودێریی خوای گەورە، بەرەکەتی دوعا خاوێنەکانتان هەموو ڕۆژێکی ژیانمی وەکو یەك مانگی تەمەنی بەختەوەری بۆ گۆڕیوم.

کەواتە خەمی حاڵ و حەوانەوەی منتان نەبێت، سۆز و بەزەییەکانی میهرەبانیی خواوەند هەر بەردەوامن.

برام صەبری! بە صەبر و ئارام بە و، بایەخ بەو نەخۆشی‌یەت مەدە کە لە دەمارگرژی و وەهمەوە پەیدا بووە. باش بزانە کە هیچ زیان و مەترسی‌یەکی بە

دواوە نی‌یە، لەگەڵ ئەوەشدا من هەر دوعای شیفاتان بۆ دەکەم. چونکە گەر خەیاڵ و ختوورەکان بێ کەڵك و خراپ بن، هیچ زیانێکیان نابێت. ئەوەتا هەروەك وێنەی شتی پیس لەناو ئاوێنەدا پیس نی‌یە و وێنەی مار بە کەسەوە نادات و وێنەی ئاگریش هیچ شتێك ناسووتێنێت، بە هەمان جۆر ئەو خەیاڵ و ختوورە چەپەڵ و ناشیرین و کوفری‌یانەش کە بە بێ ڕەزامەندیی مرۆڤ بە ئەندێشەیدا دێن و بە بێ ویست و ئیختیاری خۆیشی لەسەر ئاوێنەی دڵ و ئەندێشەیدا دەردەکەون، هیچ زیانێکیان نی‌یە. چونکە لە زانستی ئوسوولدا بڕیار دراوە کە: "تەسەوور کردنی کوفر" بە "کوفر" دانانرێت و "جوێندان"یش لە ئەندێشەدا بە "جوێن" لە قەڵەم نادرێت.

بەڵام خەیاڵ و ختوورە باشەکان - لەبەر ئەوەی نوورانین - ئەوا تەسەوور و یادکردنەوەیان لە ئەندێشەدا بە کرداری چاك دادەنرێت، چونکە وێنەی شتی نوورانی لەناو ئاوێنەدا نوور و ڕووناکی دەبەخشێت، کەواتە وێنەی شتە نوورانی‌یەکە لەناو ئاوێنەدا هەمان تایبەتکاریی نوورانیی خودی ئەو شتەی هەیە. کەچی وێنەی شتی چڕ، لەبەر ئەوەی مردوویەکی بێ ژیانە، ئەوا کاریگەریی نی‌یە!

سەبارەت بە ئێش و ئازارە ڕۆحی‌یەکانیش، ئەوا چەند قامچی و شوولێکی پەروەردگارین کە مرۆڤ لەسەر ئارامگرتن ڕادەهێنن و، بۆ موجاهەدەش هانی دەدەن. چونکە "دانایی" داخوازی ئەوەیە کە مرۆڤ دووچاری "نائومێدی" نەبێت و لە هەمان کاتیشدا هەر لە ناوەندی "دڵنیایی" و ئەمینیدا نەمێنێتەوە. بەڵکو هاودەم لەگەڵ شوکر و خۆڕاگریدا، هەمیشە هاوسەنگیی نێوان ترس و ئومێد(الخوف والرجاء) ڕابگرێت.

هەر لەبەر ئەوە، دەستوورێکی بەناوبانگ لای ئەهلی حەقیقەت هەیە کە دەڵێت:

(خولگەی بەرزبوونەوە و پێشکەوتن سەبارەت بە کەسانی بێدارەوە: سەرهەڵدانی حاڵەتی دڵتەنگی و دڵکرانەوە(القبض و البسط)یە لە ڕێی درەوشانەوەی هەردوو ناوی "الجلال" و "الجمال"ی خوای گەورەوە).

برام صەبری!

لە ئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەرکی ئیمامەت لە مزگەوتەکەدا هیچ زیانێك لە پەیامەکانی نوور ناکەوێت، لەم کاتەدا بە نیەتی ڕوخسەت بیکە و سڵی لێ مەکەرەوە.

برایانم!

وریا بن وریا بن! موونافیقان گەلێ زۆرن. لە زارتان دەرنەچێت کە لێرەوە پەیامەکانتان بۆ دێت، بۆ ئەوەی خزمەتی پەیامەکانی نوور دووچاری هیچ زیانێك نەبێت.

گەلێ حەقیقەتی گرنگ بە دڵدا هاتن، بەڵام نەمانتوانی بیاننووسین و بەداخەوە لە دەستمان دەرچوون. من لێرەدا تەنیام و بە تەواوەتی لە خەڵکی دابڕاوم.

* * *

(کام پەیام باشترە)؟

برایانی ئازیز و بەوەفا و خۆبەختکارم! ئەی هاوڕێیانی چوست و چالاك و دامەزراو و خۆڕاگرم لە خزمەتی قورئان و ئیماندا!

لەم دنیایەدا هەر ئێوە مایەی دڵنەوایی و خەمڕەوێنی منن. بە ڕاستی هەرچی هیوا و ئاواتی گەورەم پێتان هەبوو هەموویانتان هێنایەدی. دەسا خوای گەورە هەتاهەتایە لێتان ڕازی بێت. ئامین.

ئەو پەیامانەی کە بۆتان ناردین - بە تایبەت وتەی دەهەم - گەلێ سوودی زۆریان بۆ ئێرە تێدا بوو. خۆ ئەگەر لە توانامدا بوایە لە بەرامبەر هەموو پەڕەیەکی ئەو پەیامەوە دیارییەکی بەنرخم پێ دەبەخشین!

جا لەبەر ئەوەی لە مێژە ئەم پەیامانەم نەدیوە، ئەوا هەرکامیان دەخوێنمەوە لەبەر خۆمەوە دەڵێم: ئەمەیان باشترە. پاشان کە یەکێکی تریان دەخوێنمەوە دەڵێم: ئەمەیان جوانترە! بەم جۆرە پەیام لە دوای پەیام هەر یەکەیانم لەوانی تر پێ باشترە! تا لە ناوەندی ئەم سەرسامییەمدا قەناعەتی تەواوم بۆ پەیدا بوو کە بەشەکانی

پەیامەکانی نوور فەزڵیان بەسەر یەکتردا نادرێت، چونکە هەریەکەیان لە شوێن و ڕێی خۆیدا ڕۆڵی سەرۆکایەتی دەبینێت. ئەمەشتان بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە ئەم پەیامانە موعجیزەیەکی قورئانیی ئەوتۆن کە ئەم چەرخە ڕووناك دەکەنەوە.

کۆمەڵەی کاملی سەرجەمی پەیامەکانی نوور - کە ڕابەرێکی زانستیی مەعنەویی گرنگی ئەم چەرخەن - بە وێنەی کەسایەتی‌یە هەڵکەوتووە مەزنەکان دارای کەرامەتن. ئەم کەرامەتانەش بە چەشنێکن کە چ لەگەڵ ئەو پەیامانە و چ لەگەڵ ڕاستیی زانستیدا دەگونجێن و شیاویانن. ئەوەتا بە چەند جۆرێکی زۆر ئەم کەرامەتانە دەردەکەون، بە تایبەت لە دەرخستن و بڵاوبوونەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیماندا. وەك سێ کەرامەتە ئاشکراکەی پەیامی موعجیزاتی ئەحمەدی و کەرامەتی وتەی دەهەم و وتەی بیست و نۆهەم و پەیامی "الآیـــة الکـــبری"[(١)] و کەرامەتە زۆرەکانی پەیامەکانی تر. چونکە هەریەکەیان کەرامەتی تایبەت بە خۆیان هەیە و بە چەند نیشانە و ڕووداوێکی زۆر دەردەکەون. تەنانەت چەند ڕووداوێکی زۆر و زەبەندە قەناعەتێکی تەواوی دوور لە گومانیان پێ بەخشیم کە سەرجەمی تەواوەتیی پەیامەکانی نوور وەك مورشیدێکی مەعنەوی وان بۆ دەرباز کردنی ئیمانی قوتابی‌یەکانی لە سەرەمەرگدا.

من بە چاوی خۆم بینیم و قەناعەتم کرد کە "الحزب الأکـــبر النـــوري"[(٢)] تەنها نموونەیەکە بۆ ئەو واتایەی کە لەم فەرموودە پیرۆزەدایە: "تفکّر ساعة خیر من عبـــادة سنة"[(٣)]. بۆیە بڕیارم دا هاودەم لەگەڵ "الحزب الأعظم القـــرآني"دا[(٤)] بینێرم بۆتان.

---

(١) نیشکی حەوتەمی کۆمەڵە پەیامەکانی (تیشکەکان)ە. جگە لەوەش، بە سەربەخۆیی بە ناوی (بینینەکانی گەشتیارێك) بڵاومان کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) چەند بیرکردنەوە و تێرامانێکی فیکری‌یە کە مامۆستا نوورسی بە زمانی عەرەبی لە شێوەی موناجاتدا نووسیویەتی. (وەرگێڕ)

(٣) قال الحافظ العراقي في تخریج الإحیاء ٥٨/١: حدیث: تفکر ساعة خیر من عبادة سنة: ابن حبان کتـــاب العظمة من حدیث أبي هریرة بلفظ ستین سنة باسناد ضعیف ومن طریقه ابن الجوزي في الموضوعـــات ورواه أبو المنصور الدیلمي في مسند الفردوس من حدیث أنس بلفظ ثمانین سنة وإسناده ضعیف جداً، ورواه أبـــو الشیخ من قول ابن عباس بلفظ: خیر من قیام لیلة. إهـــ. وانظر کشف الخفاء ٣١٠/١ والأحادیث المشـــکلة ص ١١٣.

(٤) کۆمەڵە ئایەتێکی هەڵبژاردەی قورئانی پیرۆزن کە لە ڕێی بیرکردنەوە و تێرامانەوە لە دەروون و ئاسۆکان، بیرکردنەوەی ئیمانی لە مرۆڤدا قووڵ دەکەنەوە. (وەرگێڕ)

بەڵام ئەمەی دواییان لەبەر ئەوەی دوور و درێژە، ئەوا نەمتوانی داوا لە کەسێك بکەم بۆم بنووسێتەوە. کاتێکیش کە ویستم "الحــزب الأكــبر" وەربگێڕم، بیرم لە برایانی وەك ئێوە کردەوە کە پێویستیان بە وەرگێڕانی نیيە، بۆیە هەر بە شێوە عەرەبیيەکەی بۆتان دەنێرم.

پوختەی مەقامی یەکەمی "الآية الكبرى" کە زووتر بۆم ناردن، بناغەی ئەم "الحزب الأكبر"ەیە. چونکە کاتێ بەبێ ئیختیاری خۆم هەندێ بڕگە و ڕستەی بچووك خرانە سەر ئەو پوختەیە، یەکسەر شێوەیەکی تری لەخۆ گرت و فراوان بوو، ئنجا وەکو ئایەتولکوبراش بەڵگەکانی تەوحید لە ناویدا درەخشانیيان بەدەست هێنا و واتای زیاتریان لەخۆ گرت و خۆشحاڵیيەکی گەورەیان بە ڕۆح و دڵ و فیکرم بەخشی، بە ڕادەیەك کە هەرکات لە دەمی بێزاری و ماندوویيدا بە تێڕامان و بیرلێکردنەوە "الحزب الأكبر" دەخوێنمەوە هەست بە چێژێکی ناسك و شەوقێکی گەورە دەکەم.

* * *

(ژیری و دڵ پێکەوەن لە پەیامەکانی نووردا)

ئەم بڕگەیەم لە وەڵامی پرسیارێکدا نووسیوە، لەوانەیە باسکردنی سوودی بۆ ئێوەش تێدا بێت.

چەند کەسێك لەوانەی کە بە زۆری کتێبەکانی ئەولیا و زانایانیان خوێندبووەوە، ئەم پرسیارەیان لێ کردم:

بۆچی خوێنەری پەیامەکانی نوور زۆر زیاتر لە خوێنەری ئەو کتێبانە ئیمان و ملکەچی لە دڵی خۆیدا دەبینێت و هەست بە شەوقێکی بەردەوام و چێژێکی نوێ دەکات؟

وەڵام:

بەشێکی کتێبە دانراوەکانی زانایانی پێشین و زۆربەی کتێبە کۆنەکانی ئەولیا پیاوچاکەکان، لە "بەروبووم" و "ئەنجامەکانی ئیمان" و ڕێژنە و بەرەکەتی "ناسینی خوا" دەدوێن. چونکە لە چەرخەکانی ئەواندا لەبەر ئەوەی بناغەکانی ئیمان قایم و

دامەزراو بوون، ئەوا بەربەرەکانێی ئاشکرا و هێرشی بێ پەردەی وا نەکراوە کە ڕەگ و ڕیشەی ئیمان دەربهێنێت.

بەڵام ئێستا هێرشێکی بە کۆمەڵی ڕێکوپێك و سەختی ئەوتۆ کراوەتە سەر پایە و بناغەکانی ئیمان کە زۆربەی ئەو کتێب و پەیامە پێشووانەی کە تەنها لەگەڵ کەسانی ئیماندار و مرۆڤە تایبەتمەندەکاندا دەدوان، ناتوانن بەربەستی ئەم تەوژمە بەهێز و سامناکەی ئەم ڕۆژگارە بکەن و بەرەنگاری بینەوە.

"پەیامەکانی نوور" لەبەر ئەوەی موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن، پایە و بناغەکانی ئیمان ڕزگار دەکەن. ئەمەش نەك هەر تەنها بە سوودوەرگرتن لە ئیمانی ڕەگداکوتاوی دامەزراو کە زووتر لەناو دڵدا بووە، بەڵکو بە چەسپاندن و دامەزراندن و پارێزگاری لێکردنی ئەو ئیمانە لەناو دڵاندا و ڕزگار کردنی لە دەستی شوبهە و گومانەکان، بە چەندین بەڵگەی درەخشان و زۆر. ئەم کارەی پەیامەکانی نوور لە ڕادەیەکدایە کە هەر کەسێك بە وردی سەرنجیان لێ بدات، بڕیار دەدات کە بە وێنەی "پێویستیی نان و دەرمان" ئەم پەیامانەش بۆ ئەم چەرخە پێویستن.

کتێبە دانراوەکانی پێشوو بە مرۆڤ دەڵێن:

بیە بە وەلی و.. بە پلە و مەقامەکاندا سەربکەوە و.. ببینە و.. ڕووناکیی ڕێژنەی پیت و بەرەکەتەکان بەدەست بهێنە.

بەڵام پەیامەکانی نوور دەڵێن:

هەر کەسێك هەیت بە.. بەڵام چاو بکەرەوە و بڕوانە و ڕاستی ببینە و ئیمانەکەت ڕزگار بکە، کە کلیلی "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە!

پەیامەکانی نوور لە پێشدا هەوڵی ئەوە دەدەن قەناعەت بە دەروونی دانەرەکەیان ببەخشن، ئنجا لەگەڵ کەسانی تردا دەدوێن. لەبەر ئەوە، ئەو وانەیەی کە بە تەواوی قەناعەتی بە دەروونی بەدخوازی دانەریان بەخشی و توانیی وەسوەسەکانی بە یەکجاری نەهێڵێت، بێ هیچ گومانێك وانەیەکی هێندە بەهێز و بێگەردە کە بە

تەنها خۆی دەتوانێت بێت بە بەربەست لە ڕووی تەوژمی گومڕایی سەردەمدا، کە بەهۆی پێکهاتە و ڕێکخراوە بەکۆمەڵەکانیەوە شێوەی "کەسێتی‌یەکی مەعنەوی"ی وەرگرتووە، تەنانەت ئەم پەیامانە دەتوانن بەرەنگاری ئەم گومڕاییە ببنەوە و بە سەریشیدا سەربکەون.

پاشان پەیامەکان وەك دانراوانی زانایانی تر نین؛ تەنها بەپێی هەنگاونان و بەڵگە و بۆڕوانینەکانی "ژیری" ڕێی خۆیان ببڕن.. وەك ئەولیا سۆفی‌یەکانیش ناکەن؛ تەنها بە چێژ و کەشفەکانی "دڵ" بجوولێن. بەڵکو بە یەکگرتن و تێکەڵ کردنی هەنگاوەکانی "دڵ و ژیری" و یارمەتیدانی "گیان" و "لایەنە ناسکەکان"ی تری مرۆڤ، هەنگاو دەنێن. بەمەش دەگەنە چڵەپۆپەی سەربەرزی و پلەیەکی هێندە بڵند کە ڕوانینی فەلسەفەی هێرشکاری پێ ناگات، چ جای ئەوەی بە هەنگاونان پێی بگات! ئیتر لەم ڕێیەوە نوورەکانی ڕاستی‌یەکانی ئیمان، تەنانەت بە چاوە کوێرە داپۆشراوەکانی ئەو فەلسەفە هێرش بەرەش دەگەیەنن.

* * *

(حیکمەتی دووپات بوونەوەکان)

برا ئازیز و وەفادارە ڕاستەقینەکانم!

ئێوە مایەی "دڵنەوایی" و "خۆشحاڵی"ی منن لەم دنیایەدا. گەر ئێوە نەبوونایە نەمدەتوانی بە درێژایی چوار ساڵ ئەم ئەشکەنجە و ئازارە هەڵبگرم. کەواتە دامەزراوی و خۆڕاگریی ئێوە، ئارام و خۆڕاگری‌یەکی زۆریان لە بەرامبەر ئەم ئازارەوە پێ بەخشیم.

ئەم خاڵانەی خوارەوەم پێکەوە و بە شێوەیەکی کتوپڕ بە دڵدا هاتن:

یەکەمیان:

برایانم! من پێم وایە ئەم بوومەلەرزەیە موعجیزەیەکی قورئانیی وەکو لەت بوونی مانگ وایە، سەرسەخترین کەسی ملنەدەری هێنایە ناو حاڵەتی تەسدیقەوە!

دووهەمیان:

هەر لە کۆنەوە تا ئێستا هیچ کۆمەڵێکی تری وەك "قوتابیانی نوور" نەبووە کە بە گەرمی و چوست و چالاکی تێکۆشابێتن و چەندین خزمەتی گەورەیان لە ڕێی ڕاستی و حەقیقەتدا پێشکەش کردبێت و، لەگەڵ ئەوەشدا بە چەند ماندوبوونێکی کەم لە گێروگرفتەکان ڕزگاریان بووبێت. لە کاتێکدا ئەو کەسانەی کە هێندەی یەك لە دەی خزمەتە ئیمانی و قورئانی‌یەکانی ئێمەیان پێشکەش کردووە، چەندین ئەوەندەی گێروگرفت و ئازارەکانی ئێمەیان هاتووەتە ڕێ! واتە لە حاڵەتێکی ئەوتۆدایین کە هەمیشە بۆ شوکر و سوپاسی خوای گەورە هانمان دەدات.

سێ‌هەمیان:

ئەو پەیامانەم خوێندەوە کە بۆمان نێررابوون، بینیم بەپێی خواستی جێ و شوێنەکان هەندێ "ڕاستی" دووپات بوونەتەوە و، ئەم دووپات بوونەوەیەش لەو مەسەلانەدا ویست و ئیختیاری منیان تێدا نەبووە، تەنانەت حەزیشم پێ نەکردوون. بەم "لەبیرچوونەوە"یەش کە تووشی بووم هەندێك دڵتەنگ بووم، بەڵام کتوپڕ ئەم بێدارکردنەوەیە ئاراستەی دڵم کرا، کە پێی وتم: "سەیری کۆتایی وتەی نۆزدەهەم بکە".

منیش کە سەیرم کرد، بینیم لە حیکمەتە جوانەکانی دووپات بوونەوەکانی قورئانی پیرۆز دەدوێت.

جا هەر خودی ئەم حیکمەتانە لە تەفسیرە ڕاستەقینەکەی قورئانی پیرۆزیشدا - کە "پەیامەکانی نوور"ە - دەرکەوتوونەتەوە و، بینیم ئەو دووپات بوونەوانە بە تەواوی لەگەڵ ئەو داناییانەدا دەگونجێن و یەکاویەك دەردەچن، تەنانەت گەلێ پێویستیشن.

پاشان یەك بە یەکی: "لوتفی" و "عەبدوڕڕەحمان" و "عەلی‌یە بچکۆلە" بە ناوی هەمووتانەوە داوایان لێ کردووم کە بریسکەی عەرەبیی بیست و نۆهەم لێك بدەمەوە و وەری‌بگێڕم بۆ زمانی تورکی. بەڵام من کاتێکی هێندە فراوانم بۆ ئەم کارە بە دەستەوە نی‌یە و بارودۆخی ئێستاشم بواری ئەوەم نادات. پشت بە خوا لە داهاتوودا قوتابی‌یەکی تر لە قوتابیانی نوور ئەو ئەرکە ئەنجام دەدات.

پرسیار:

بۆچی بوومەلەرزەی زەوی "ڕووسیا" ناگرێتەوە، بەڵکو، تەنها... دووچاری دەبن؟

وەڵام:

لەبەر ئەوەی کافربوون و سووکایەتی بە ئایینێکی هەڵوەشاوەی دەستکاری کراو، جیایە لە سووکایەتی کردن بە ئایینێکی حەقی هەتاهەتایی. چونکە ئەمەیان تووڕەیی زەوی دەورووژێنێت و لەرزەی پێ دەخات.

* * *

(پەیامەکان بە خۆیان بڵاو دەبنەوە)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برا ئازیزە دامەزراوە خۆبەختکارە بەوەفاکانم!

یەکەم:

پیرۆزبایی جەژنی داهاتووتان لێ دەکەم و، لە میهرەبانی و سۆزی خوای گەورەی میهرەبان دەپاڕێمەوە کە نزا و لاڵانەوەی برا خاوێن و پیرۆزەکانم لە نیوە و بەرەبەیانی ئەو شەوە پیرۆزانەدا کە بە سوێندی: ﴿وَالْفَجْرِ ۞ وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ نرخ و بەهایان چەسپاوە، بۆ منیش و هەموو ئەهلی ئیمان، بە تایبەت ئەوانەی دوعاکانیان کردووە، بکات بە مایەی بەرەکەت و خێر و ڕووناکی.

......

سێهەم:

هەست دەکەم "خلووصی" دڵتەنگی و نیگەرانییەکی هەیە.. با نیگەران نەبێت. چونکە قوتابیانی پەیامەکانی نوور لە ژێر پارێزگاریی میهرەبانی و چاودێریی خوای گەورەدان. خۆ مادەم گیروگرفتەکانی دنیا پاداشتی دواڕۆژ

دەستی مرۆڤ دەخەن و خۆیشیان فانی و ڕێبوار و لەناوچوون، ئەوا دەبێ لە بەرامبەر ئەو گیروگرفتانەوە مرۆڤ خۆڕاگر و دامەزراو بێت و، لە ناوەندی شوکرانەدا صەبر و ئارامی ببێت و دان بەخۆدا بگرێت.

ئێوە هەمووتان و هەروەها "خلووصی"ش لەناو دوعاکانمدان و، لە دەستکەوتە مەعنەوی‌یەکانمدا بەشدارن.

چوارەم:

"پەیامەکانی نوور" هەر بەخۆیان و لە ژێر چاودێریی قورئانی پیرۆز و پارێزگاریی پەروەردگاردا بڵاو دەبنەوە و، پتر لە نهێنی و پەنهانیدا ڕێژنە و ڕووناکی‌یان زیاد دەکات.

برایانم! هیوام وایە کە تا ئێستا چۆن بوون، لەمەولاش هەر بە هەمان جۆر بەربەستی ئەو ڕووداوانە بکەن کە لەرزە بە ڕۆژگار دەخەن.

با هەمیشە دەستوورمان بریتی بێت لە: "من آمَنَ بالقدر أَمِنَ مِنَ الكدر".

* * *

(دەرمانی موقەددەس)

برا ئازیزەکانم!

منیش لە لایەنی خۆمەوە و لە بەرامبەر پیرۆزباییەکەتانەوە پیرۆزبایی جەژنتان لێ دەکەم.

هەواڵی تەندروستی و حەوانەوەی منتان پرسی بوو..

سوپاسی بێ پایان بۆ بەدیهێنەری بەخشندەم. چونکە "ئیمان"ی هێنا بە هانامەوە، کە دەرمانێکی خاوێن و موقەددەسی هەموو دەردێکە و.. چارەسەری و دەرمانی "ڕازی بوون بە قەزا"شی فریاخستم، کە لە ئیمان بە قەدەرەوە سەرچاوەی گرتووە..

ئەمەش هانی دام کە لە ناوەندی "صەبر و ئارامگرتن"دا "شوکرانە بژێری" پێشکەش بکەم، هەرچەندە زستانی ئێرە زۆر ساردە، بە تایبەت ژوورەکەی من و، جگە لەوەی کە لە سێ ڕووەوە بێزاریی غەریبی دەورەی داوم و، هەر سێ

نەخۆشی‌یە عەصەبی‌یەکانیش دنیایان لێ هێناومەتەوە یەك و، بە تەنیایی و لە خەڵکدابڕانێکی تەواوەتیدا دانراوم و، گیرۆدەی چەندین گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەی لەتوانابەدەریشم.

* * *

(ئەوانەی پەیامەکان بڵاو دەکەنەوە)

برا ئازیز و بەوەفا و بێگەردەکانم!

من سوپاسی بێ کۆتایی پێشکەشی پەروەردگاری میهرەبانم دەکەم کە لە مەردانی وەك ئێوە چەندین کەسی ئەوتۆی بەدی‌هێناوە پەیامەکان بڵاو دەکەنەوە و دەیانپارێزن و دەبن بە خاوەنیان و، کۆڵی قورسی کەسێکی لاواز و بێ توانای وەك منی سووك کرد.

* * *

(قبووڵ نەکردنی زیادەڕەوی)

.....

هەرگیز ناکرێت ئەو گومان باشی‌یە لەڕادەبەدەرەی بەرامبەر بە من دەردەبڕرێت و ئەو پایە و گرنگی‌یەش کە هەزار جار لە سەرووی پلەی خۆمەوەیە و بۆ من دادەنرێت، قبووڵ بکرێت. مەگەر بە ناوی "پەیامەکانی نوور" و خزمەتگوزاری‌یەکانیانەوە بێت و، لەو ڕووەوە کە بانگهێشت و ڕێنمایی خەڵکی بۆلای گەوهەرەکانی قورئانی پیرۆز دەکەن.

بەڵێ، من هەرگیز مافی ئەوەم نی‌یە لە ڕووی "کەس"ی بێ بایەخی خۆمەوە ئەم چەشنە گومانباشی‌یانە قبووڵ بکەم.

* * *

(صەدەقە بەلا دەگێڕێتە دواوە)

برایانی ئازیز و ڕاست و بەڕێز و دامەزراوم!

کارێکی زۆر جوانتان ئەنجام داوە کە لە شێوەی دابەشکردنی کار لە نێوانتاندا نووسینەوەی پێرستەکەتان خستووەتە ئەستۆی کەسی مەعنەویی خۆتان. بەم

کارەشتان مامۆستایەکی ڕاستەقینە و هەمیشەیی‌تان بۆ خۆتان دۆزی‌یەوە. جا ئەم مامۆستا مەعنەوی‌یە، زۆر لەم برا کۆڵەوارەتان باشترە و، تەنانەت هیچ پێویستی‌یەکی ترتان بەم نامێنێت.

برایانم!

کاتێ کە ئێوە بۆ سەربازی بران و، خەمم بۆ خواردن و، سەیرێکی ڕووداوەکانی ڕۆژگارم کرد، ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

شارستانێتیی ئەورووپا کە لەسەر چەند بناغەیەکی گەندەڵ دامەزراوە و بە وێنەی قاروون کە وتی: ﴿إِنَّما أُوتِيتُهُ عَلى عِلْمٍ عِنْدِي﴾ (القصص:٧٨) ئەویش پێی وایە کە هەرچی چاکەیەکی پێ بەخشراوە لە لایەن خۆیەوە بە دەستی هێناوە و، سوپاسی ئەو پەروەردگارەی لەسەر ناکات کە بە فەزڵ و کەرەمی خۆی ئەو چاکەکاری‌یانەی پێ بەخشیوە و.. تای تەرازووی خراپەکانی لەچاو تای چاکەکانیدا بە ڕادەیەك قورس بووە کە بەهۆی بیری چەپەڵی ماددی‌یەوە بۆ ناو چاڵ و چۆڵیی "شیرك" بەربووەتەوە..

ئەم شارستانێتی‌یە، زللەیەکی ئاسمانیی هێندە بەهێزی لێ درا، کە داهاتی پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی سەدان ساڵی لەناو برد و کردی بە سووتەمەنی! چونکە لەبەر ئەوەی ئەم حکوومەتە ئەورووپاییە ستەمکارانە سووکایەتی‌یان بە جیهانی ئیسلامی و مەڵبەندی خەلافەت کرد و پەیمانی سیڤەریان[1] بە سەردا سەپاند، ئەوا ئەو زللە ئاسمانی‌یە زیانێکی سەخت و تێکشکانێکی هەمەکیی ئەوتۆی بەسەریاندا هێنا کە ناتوانن لەو سزا سەختە دۆزەخ ئاسایەی ئەم دنیایە دەربچن، بەڵکو هەر تیایدا هەڵدەقرچێن و هاواری داد و فریادیان لێ بەرز دەبێتەوە! بەڵێ، ئەم تێکشکانەیان تۆڵەی ئەو سووکایەتی پێ کردنەیە!

---

(١) پەیمانێکە بە زیانی دەوڵەتی عوسمانی کە ساڵی ١٩٢٠ز دەوڵەتە هاوپەیمانەکان سەپاندیان بەسەریدا و، وەك تەسلیم بوونێکی دەوڵەتی عوسمانی وایە بۆ ئەوان، چونکە بەپێی ئەو پەیمان نامەیە هەموو گەرووە ئاوی‌یەکانی دەوڵەتی عوسمانی خرانە ژێر چاودێریی لیژنەیەکی نێودەوڵەتی و لایەنە ئابووری‌یەکانیشی بە هاوپەیمانەکان سپێررا کە بەڕێوەی ببەن! جگە لەمانەش لەو بەندانەی تر کە مافی عوسمانی‌یەکانی بە زۆرە ملێ تێدا پێ‌شێل کرابوو! (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە).

چەند کەسێکی بەڕێزی ئێرە بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێیان وایە کە هەردوو پارێزگای ئیسپارتە و قەستەمۆنی - کە دوو مەڵبەندی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوورن - لە چاو پارێزگاکانی تردا لە کارەساتە ئاسمانی‌یەکان پارێزراون.

هۆکاری ئەمەش ئەو ئیمانە تەحقیقی و هێزی باوەڕ و ئایینەیە کە "پەیامەکانی نوور" بە خوێنەرانیانی دەبەخشن. چونکە ئەم چەشنە بەڵا و کارەساتە ئاسمانی‌یانە لە ئەنجامی چەند گوناهێکەوە دادەبارێن کە بەهۆی لاوازیی ئیمانەوە ڕوو دەدەن. ئەوەتا بە فەرموودەی پیرۆز چەسپاوە کە: "صەدەقە بەڵا دەگێڕێتە دواوە"[(١)]. ئەو هێزە ئیمانی‌یەش بەپێی پلەی خۆی، ئەو کارەساتانە دوور دەخاتەوە و بەرەو دوا دەیانگێڕێتەوە.

* * *

(سەعیدی صەعید)!

ئەی سەعید! "صەعید" (واتە: خاك) بە، لە خۆنەویستی‌یەکی ڕەها و فەنایەکی تەواودا بە.. بە یەکجارەکی دەست لە خۆویستیی خۆت هەڵبگرە، بۆ ئەوەی ڕوونیی "پەیامەکانی نوور" لێڵ نەبێت و کاریگەری‌یان لە دەروونەکاندا کەم نەکەیتەوە!

* * *

(دوو مەسەلە)

برایانم! لەم ڕۆژانەدا دوو مەسەلەم بە دڵدا هات، یەکێکیان تایبەتە بە "قوتابیانی نوور" و ئەوی تریشیان تایبەتە بە "ئەهلی دنیا"وە. وا لەبەر گرنگی‌یان هەردووکیان دەنووسم بۆتان:

---

(١) "صدقة السر تطفئ غضب الرب". رواه الطبراني في الصغير، وروى الترمذي عن أنس مرفوعاً: أن الصدقة تطفئ غضب الرب وتدفع ميتة السوء. وقال الترمذي: حسن غريب وصححه ابن حبان. وعند الطبراني: الصدقة تسد سبعين باباً من السوء. ورواه الخطيب بلفظ: الصدقة تمنع سبعين نوعاً من أنواع البلاء أهونها الجذام والبرص (كشف الخفاء ١٥٩٣ باختصار). (وەرگێڕ)

❑ مەسەلەی یەکەم: (دوو نیشانە بۆ عاقیبەت خێری)

چەند ئاماژەیەکی بەرز و بەهێز لە "تیشکی یەکەم"دا هەیە لە بارەی ئەوەی کە قوتابییە ڕاستە بەوەفاکانی نوور بە عاقیبەت خێری دەڕۆنە ناو گۆڕەکانیان و لە ئەهلی بەهەشت دەبن.

ماوەیەك بوو چاوەڕوانی بەڵگەیەکی بەهێزی وا بووم کە پشتی ئەم مەسەلە یەکجار گەورە و مژدە هەرە مەزنە بگرێت. وا سوپاس بۆ خوا دوو نیشانە - پێکەوە - بۆ ئەمە هاتنە دڵمەوە:

*نیشانەی یەکەم:*

لێکۆڵەران و ئەهلی کەشف دەڵێن: هەتا ئیمانی تەحقیقی لە "علم الیقین"ەوە بۆ "حق الیقین" سەر بکەوێت، دووچاری "سەلب بوون" نابێت. هەروەها وتوویانە: لە دەمی سەرەمەرگی مرۆڤدا شەیتان هەر هێندەی پێ دەکرێت کە تەنها گومان و وەسوەسەکانی خۆی بهاوێتە ناو "ژیری"ی مرۆڤەوە. بەڵام خۆ ئەم جۆرە ئیمانە تەحقیقییە تەنها بە سنووری "ژیری"یەوە ڕاناوەستێت و، دەڕوات بۆ: دڵ و ڕۆح و سیڕ و لەتائیفەکانی تر و، بە ڕادەیەکی هێندە بەهێز لەو لایەنە ناسکانەدا جێگیر دەبێت کە هەرگیز دەستی شەیتانی پێ ناگات. کەواتە ئیمانی ئەو جۆرە کەسانە - پشت بە خوا - لە تیاچوون و فەوتان پارێزراوە.

یەکێك لە ڕێگاکانی گەیشتن بەم ئیمانە تەحقیقییە بریتییە لەوەی کە مرۆڤ بە ویلایەتی تەواوەتی و کەشف و شهوود بگات بە "حەقیقەت". کە ئەمەش ڕێی ئیمانی شهوودییە و، تایبەتە بە کەسانی هەرە "خەواص"ەوە.

بەڵام ڕێی دووهەم بریتییە لەوەی مرۆڤ بە "زانستێکی یەقینی"ی ئەوتۆ کە گەیشتبێتە پلەی "بەڵگەنەویستی" و هێزی پلەی "حق الیقین" تەسدیقی ڕاستییەکانی ئیمان بکات. ئەمەش بەهۆی ڕێژنەی بەرەکەتی یەکێك لە نهێنییەکانی سروشی خوای گەورە لە ڕووی "ئیمان بە غەیب"ەوە و، بە بەڵگە هێنانەوەی شێوازی قورئان کە "دڵ" و "ژیری"ی پێکەوە تێدا تێکەڵ دەبن..

جا ئەم ڕێیەی دووهەم، بناغە و هەوێن و گیان و کاکڵەی "پەیامەکانی نوور"ە.

بەڵێ، قوتابیی‌یە تایبەتمەندەکانی پەیامەکانی نوور ئەم ڕاستی‌یە دەبینن. تەنانەت گەر کەسانی تریش بە چاوی ویژدانەوە بڕوانن دەبینن کە پەیامەکانی نوور مەحاڵیی ڕێگا پێچەوانەکانی ڕاستی‌یەکانی ئیمانیان دەرخستووە و، بە بەڵگە ڕوونیان کردووەتەوە کە ئەو ڕێگایانە هێندە بەتاڵ و مەحاڵن کە هەرگیز ناکرێت بگیرێنە بەر.

*نیشانەی دووهەم:*

گەلێ دوعای بێگەرد و گیرا بە بەردەوامی بۆ ئەوە دەکرێن کە قوتابیی‌یە ڕاستەکانی پەیامەکانی نوور عاقیبەت خێرییان پێ ببەخشرێت و ئیمانی کامڵ بەدەست بهێنن. ئەم دوعایانەش هێندە زۆرن کە "زیری" هیچ بوارێك بۆ قبووڵ نەبوونی هیچ کام لەو دوعایانە شك نابات.

بۆ نموونە:

یەکێك لە خزمەتگوزاران و قوتابیانی نوور لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا سەد جار دوعا بۆ عاقیبەت خێریی قوتابیانی نوور و بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەییان دەکات و، لە نێوان ئەو دوعایانەشیدا هەرچی ڕۆژە بە لای کەمەوە سی جار دوعایان بۆ دەکات کە ئیمانیان سەلامەت بێت و، ژیانیان بە خێر کۆتایی پێ بێت و، بە ئیمانەوە بڕۆنە ناو گۆڕەکانیان. ئەم دوعایانەشی لە ناوەندی زۆربەی هەل و مەرجەکانی قبووڵ و گیرابوونی دوعادایە.

پاشان کۆی ئەو دوعایانەی کە لەلایەن خودی ئەو قوتابیانەوە بەرز دەکرێتەوە کە لەم زەمانەدا و لە هەموو لایەکەوە لەسەر ئیمانەکەیان هێرشی زۆریان دەکرێتە سەر، کە هەریەکەیان بە زمانە بێگەرد و خاوێنەکانیان بۆ سەلامەتیی ئیمانی خۆیان و برایانیان دەیکەن، هێندە بەهێزن کە میهرەبانیی فراوانی خواوەندی میهرەبان و دانستە ڕەهاکەی دەست بە ڕوویانەوە نانێن و نایانگێڕنە دواوە. تەنانەت گەر وا گریمان بکرێت کە هەموو ئەو دوعایانە دەستیان بە ڕووەوە بنرێت و

تەنها یەك دانەیان قبوولْ بێت، ئەوا سەروزیادی ئەوەیە کە هەموو یەکێك لە قوتابیانی نوور بە ئیمانی سەلامەتەوە بڕواتە ناو گۆڕەوە، چونکە هەر دوعایەك کە لە لایەن ئەوانەوە دەکرێت ڕووی لە هەموویانە.

❑ مەسەلەی دووهەم: (حیکمەتی شکست هێنانی دەوڵەتی عوسمانی)

لەم کاتەی ئێستادا بەشێك لە وەڵامەکەی سەعیدی کۆن دەرکەوت کە بە ناوی ئەم چەرخەوە وەڵامی پرسیارێکی ئەنجومەنە میسالی‌یە ڕۆحانی‌یەکەی پێ دایەوە، کە لە نێوان خۆیاندا پرس و ڕا و گفتوگۆیان لەسەر چارەنووسی جیهانی ئیسلامی دەگۆڕی‌یەوە و، لە باسی "گفتوگۆیەك لە خەونێکدا" بڵاوکراوەتەوە و، بەشێکە لە کتێبی "سنووحات" کە بیست ساڵ پێش ئێستا لە چاپ دراوە.

ئەو ئەنجومەنە مەعنەوی‌یە لەو کاتەدا لێیان پرسیم:

حیکمەتی شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەم جەنگەدا چی‌یە کە بە شکست هێنانی ئەڵمان کۆتایی پێ هات؟

سەعیدی کۆن لە وەڵامدا وتی:

گەر لەم جەنگەدا سەربکەوتینایە ئەوا - وەك دوای حەوت ساڵ دەرکەوت - لە پێناوی شارستانێتیی ئەورووپادا گەلێ موقەددەساتی ئایینیمان لەدەست دەدا و.. ئەو ڕژێمەی کە لە ئەنادۆڵدا جێبەجێ دەکرێت، بە زۆرە ملێ و بەکارهێنانی هێز و بەوپەڕی ئاسانی و بە ناوی شارستانێتیی ئەورووپاوە بەسەر جیهانی ئیسلامیشدا بە تایبەت هەردوو حەرەمی شەریفدا دەسەپێنرا! بۆیە قەدەری خوای گەورە بە فەزڵی چاودێریی خۆی و بۆ پارێزگاریی ئەو شوێنە پیرۆزانە بواری دا کە ئێمە لەم جەنگەدا شکست بهێنین!

دوای تێپەڕبوونی بیست ساڵی تەواو بەسەر ئەم وەڵامەدا، بە شەو پرسیارێکی وەك ئەو گفتوگۆ ناوبراوەیان ئاراستە کردم و، وتیان:

لە کاتێکدا کە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ سەرکەوتنێکی سیاسی لە ناوەندە جیهانی‌یەکاندا لە بەردەستدا بوو، کە بریتی‌یە لە سیاسەتی "مانەوە لە بێ

لایەنیدا" و دەتوانرا لەم ڕێیەوە مولکی لەدەستچوو بگێڕینەوە و میسر و هیند ڕزگار بکەین و بۆ یەکگرتن لەگەڵ خۆماندا ڕایان بکێشین. کەچی ئەم سەرچاوەیەمان لەدەست دا..

جا ئایا چ حیکمەتێك لەوەدا هەیە کە ئەم سەرچاوە مەزنە نەکەوتە بەرچاوی ئەو کەسە زیرەك و مرۆڤە بلیمەتانە و، ڕێگایەکی زیان بەخشیان گرتەبەر و، پشتی دوژمنێکی گومان لێکراوی بێ سەروبنی بڕوا پێ نەکراوی بێ سوودی وەك ئینگلیزیان گرت[1]؟

ئەم پرسیارەم لێ کرا و، وەڵامەکەشی - کە لە لایەنێکی مەعنەوی‌یەوە هاتە دڵمەوە - بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

ئەو وەڵامەی کە بیست ساڵ پێش ئێستا بۆ پرسیارێکی مەعنەوی دامەوە، کتومت وەڵامی ئەم پرسیارەشە. واتە:

گەر پشتی لایەنە سەرکەوتووەکە بگیرێت، ئەوا ئەو ڕژێمەی کە لێرەدا پیادە دەکرێت، بەسەر جیهانی ئیسلامی و شوێنە پیرۆزەکانیشدا و بە ناوی مەدەنییەتی دەنی و لە ناوەندی مەستیی سەرکەوتندا و بێ هیچ بەرگری‌یەکی ئەوتۆ، جێ‌بەجێ دەکرا و دەسەپێنرا!

کەواتە لەبەر سەلامەتیی سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان، ئەم هەڵە ئاشکرا و ڕوونەیان نەبینی و، بە وێنەی کوێر ڕەفتاریان کرد.

* * *

(چەند ئەنجامێکی دنیایی لە کاری خزمەتگوزاریی پەیامی نووردا)

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

پیرۆزبایی جەژنتان لێ دەکەم و.. خزمەتە مەزنەکانتانم لەبەرچاوە. لە خوا دەپاڕێمەوە کە سەرتان بخات تیایدا. هەروەك سوپاسی بێ کۆتایی بۆ بەدیهێنەری

(١) ئەو کاتە حکوومەتی تورکیا لە ژێر پەردەی بێ لایەنیدا لایەنی ئینگلیزی گرت و، ماوەیەکی کەمیش پێش کۆتایی هاتنی جەنگ بە کردەوە ئەم لایەنگری‌یەی دەرخست و جەنگی لە دژی ئەڵمان ڕاگەیاند. (وەرگێڕ)

میهرەبانم لەسەر ئەوەی کە برایانی دامەزراوی خۆبەختکاری وەك ئێوەی کردووە بە خاوەن و بلاوکەرەوەی "پەیامەکانی نوور". هەر کاتێك ئێوە دێنەوە یادم، "گیان"م خۆشحاڵ و "دڵ"یشم شادمان دەبێت و، خەم بۆ لەدنیا دەرچوونم ناخۆم، بەڵکو وەك هاورێیەك دەروانمە "مردن". چونکە بە مانەوەی ئێوە ژیانی من بەردەوام دەبێت. لەبەر ئەوە، بەبێ هیچ نیگەرانییەك، چاوەڕێی ئەجەلی خۆم دەکەم!

دەسا خوای گەورە بۆ هەتاهەتایی لێتان ڕازی بێت. ئامین. ئامین.

هەروەك زۆربەی قوتابییە کارگوزارەکانی "پەیامەکانی نوور" هەست بە جۆرە کەرامەت و ئیکرامێکی خوایی دەکەن، ئەم برا کۆڵەوارەشتان لەبەر ئەوەی زۆر پێویستی بەو کەرامەت و ئیکرامانەیە، هەست بە زۆربەی جۆرەکانیان دەکات.

قوتابیانی نووری ئەم ناوچانە بە سوێندخواردنەوە دەڵێن:

هەر کات بە خزمەتگوزاریی نوورەوە سەرقاڵ ببین: ڕۆزیمان فراوان و دڵمان گوشاد دەبێت و خۆشی و شادمانی هەموو گیانمان دەگرێتەوە. منیش بە تەواوەتی لە خۆمدا هەست بەمە دەکەم، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە دەروونی بەدخواز و شەیتانەکەشم بە سەرسامییەوە لە بەردەم ئەم ڕاستییە بەڵگەنەویستەدا بێدەنگ دەبن!

* * *

(دوعای گشتی)

بزانن کە من وا ماوەی ساڵێکە خێزان و منداڵ و دایك و باوکی ئەو قوتابیانەی نوور دەخەمە ناو دوعاکانمەوە کە بە پەیامەکانی نوورەوە سەرقاڵن. چونکە هەندێك لەوانە بە خۆیان و خێزان و منداڵ و گشت پەیوەندییەکانیانەوە هاتوونەتە ناو بازنەی خزمەتگوزاریی نوورەوە!

* * *

(بەسوودترین کار لەم کاتەی ئێستادا)

مەدەنییەتی دەنی - کە سووکایەتیی بە ئیسلام دەکرد - دادگەریی خواوەند ئازارێکی مەعنەویی هێندە سەختی هێنایە ڕێی کە خستیە پلەی نزمی دڕندە نەزانەکانەوە! چونکە ئەو ترس و لەرزە بەردەوامەی کە تیایدا ژیان، هەموو چێژ و لەزەتێکی سەد ساڵی شارستانێتیی ئەورووپا و ئینگلیزی لەناو دا و، مەستیی پێشکەوتن و خۆسەپاندنی ئەوانی بەسەر خەڵکیدا، لێ زڕاندن! ئەوەبوو دادگەریی خواوەند ئەو ترسە سامناکەی دەرخوارد دان و بۆمباکانی ترس و سام و دڵەتەپێ و نیگەرانیی بەسەردا تەقاندنەوە[1]!

پێویستترین و بەسوودترین و شایانترین کار و ئەرك لەم کاتەدا: "ڕزگار کردنی ئیمان"ە...

بەڵێ، ئیمانی هەر تاکە کەسێك بگرێت لە ڕاستیدا کلیل و ڕووناکییە بۆ جیهانێکی هەمیشەیی فراوانتر لەم دنیایە. لەبەر ئەوە، هەر کەسێك ئیمانەکەی کەوتبێتە مەترسیی تیاچوونەوە، پەیامەکانی نوور دەڕۆن بە هانایەوە و موڵکێکی لە گۆی زەوی مەزنتری دەست دەخەن و دەستەڵاتی بەسوودتر و دەسکەوت و فتووحاتی گەورەتری پێ دەبەخشن.

* * *

(ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەی پەیوەندیی بە پەیامەکانی نوورەوە کردووە)

ئەمەی خوارەوە کەرامەتێکی "پەیامەکانی نوور" دەردەخات کە لە دەمی نووسینەوەیان، لە دەوروبەری خۆماندا ڕووی داوە:

قوتابییەکی نووری پیری بە ویقار و چوست و چالاك لە کارەکەیدا، خەریکی نووسینەوەی "پەیامی پیران" بوو. کاتێ گەیشتە کۆتایی ئومێدی یازدەهەم و لە شوێنی باسکردنی وەفاتی "عەبدوڕڕەحمان"ی خوا لێخۆشبوودا، قەڵەمەکەی "لا إله

(١) مەبەست ڕووداوە ترسناکەکانی جەنگی جیهانیی دووهەمە. (وەرگێڕ)

إلاّ هو"ی نووسی و، خۆیشی بە زمان وتی: "لا إلـــه إلاّ الله" و، ئیتر لاپەڕەی ژیانی خۆی بە چاکی و عاقیبەت خێری کۆتایی پێ هێنا و گیانی سپاردا بەمەش تەسدیقی ئەو مزگێنییە ئاماژەییەی قورئانی پیرۆزی کرد کە: "قوتابیانی نوور" ژیانیان بە عاقیبەت خێری کۆتایی پێ دێت و بە ئیمانەوە دەڕۆنە ناو گۆڕەکانیان. دەسا ڕەحمەتی فراوانی خوای لێ بێت.

*بێدارکردنەوەیەکی گرنگ بۆ برایانی قیامەتیم!*

ئەم بێدارکردنەوەیە دوو ماددەی لەخۆ گرتووە:

یەکەمیان:

گرنگترین ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەی پەیوەندیی بە پەیامەکانی نوورەوە کردووە بریتییە لە: نووسینەوەیان و، هاندان و بانگهێشتی خەڵکیش بۆ ئەم نووسینەوەیە و، پشت گرتنی بڵاوبوونەوەیان. چونکە ئەو کەسەی کە دەیاننووسێتەوە یان داوا لە یەکێکی تر دەکات بیاننووسێتەوە و دەیانگەیەنێتە دەستی، ناونیشانی "قوتابیی پەیامەکانی نوور" بەدەست دەهێنێت و، لەم ڕێیەوە بەشێك لە دەستکەوتە مەعنەوییەکانم و ئەو دوعا و لاڵانەوە باشانەمی دەست دەکەوێت کە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا سەد جار بەڵکو زیاتریش پێشکەشی خوای گەورەیان دەکەم. جگە لەمەش بەشێکی لە دەستکەوتە مەعنەوییەکانی هەزاران برای دڵسۆزم و دوعا خاوێنەکانیان بەدەست دەهێنێت.

سەرباری ئەمانەش، ئەو کەسە، بە نووسینەوەی پەیامەکان، لە چوار ڕووەوە چوار جۆری عیبادەتی گیرای دەست دەکەوێت. چونکە: ئیمانەکەی خۆی بەهێز دەکات و.. تێدەکۆشێت ئیمانی کەسانی تریش لە تیاچوون بپارێزێت و.. ئەو بیرکردنەوە ئیمانییەی دەستگیر دەبێت کە هەندێ جار سەعاتێکی وەك ساڵێکی عیبادەت وایە - وەك لە فەرموودەدا هاتووە - و خەڵکی تریش بۆ ئەم بیر و تێڕامانە هان دەدات و.. بە یارمەتیدانی مامۆستاکەی هاوبەشی کردارە چاکەکانی ئەو مامۆستایەی دەبێت کە خەتی ناخۆشە و گیرۆدەی بارودۆخە سەخت و دژوارەکان بووە.

بەڵێ، دەتوانێت ئەم چەشنە سوودە مەزنانە بەدەست بهێنێت.

سوێند بە خوا! هەر کەسێك پەیامێکی بچووك بە تێگەیشتنەوە بۆ خۆی بنووسێتەوە، وەکو ئەوە وایە دیارییەکی گەورەی پێشکەش کردبێتم. تەنانەت هەموو لاپەڕەیەکی ئەو نووسینەوەیە هێندە منەتبارم دەکات وەك ئەوەی کە هۆقەیەك[1] شەکرم بە دیاری بۆ هاتبێت!

ماددەی دووهەم:

بەداخەوە دوژمنانی لە ڕێ ترازاوی "پەیامەکانی نوور" لە جینی و ئینس، کە نە ئیمان دەهێنن و نە جێی بڕوا و متمانەشن، لەبەر ئەوەی نەیانتوانی بەرەنگاری قەڵا پۆڵایینە قایمەکانی "پەیامەکانی نوور" و بەڵگە بەهێزەکانیان - کە وەك شمشێری ئەڵماس وان - ببنەوە، دەیانەوێت ئێستا بە چەندین فڕوفێڵی یەکجار پەنهان و هۆکاری شاراوە دەستە چەپەڵە شەیتان ئاساکانی خۆیان لە پەیامەکانی نوور بووەشێنن. ئەمەش لە ڕێی ناندنەوەی ساردوسڕی و خاوکردنەوەی هیممەتی نووسەرەوەکان و هاندانیان بۆ وازهێنان لە نووسینەوەی پەیامەکان، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن! لە کاتێکدا کە نووسەرەوەکان - بە تایبەت لێرە - ژمارەیان یەکجار کەمە و گەلێ پێویستیشن بۆ پەیامەکان و، لەم دەمەدا کە چاودێریی ئەو دوژمنانەی خۆیان مەڵاس داوە لە توندی و زیادبووندایە بەسەرمانەوە. جا لەبەر ئەوەی بەشێك لە قوتابیان توانای خۆڕاگرتنیان نییە، ئەوا تا ڕادەیەك ئەم شارە لەم نوورانە بێبەش دەکەن.

هەر کەسێك - لە مەشرەبی حەقیقەتدا - حەزی لە چاوپێکەوتن و گفتوگۆکردن و دانیشتنە لەگەڵ مندا، هەر پەیامێك بکاتەوە و بیخوێنێتەوە ئەوا نەك کەسی من، بەڵکو چاوپێکەوتنی لەگەڵ مامۆستاکەیدا ساز کردووە کە خزمەتگوزاری قورئانی پیرۆزە و، دەتوانێت بە چێژێکی بێگەرد وانەیەکی لە "ڕاستییەکانی ئیمان" لەلا بخوێنێت.

* * *

---

(١) هۆقە یان حۆقە: کێشێکە سێ یان چوار کیلۆ. بڕوانە فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە. (وەرگێڕ)

(دوو مەسەلەی ورد)

وا دوو مەسەلەی وردتان بۆ دەنووسم کە لـە بێدارکردنەوەیەکی مەعنەوی‌یەوە لێیان ئاگادار کراومەتەوە:

❑ مەسەلەی یەکەم: (ئەنجامی ساویلکەیی موسڵمانان)

لـەو بێدارکردنەوەیەدا دوو هـۆی تایبـەتی بۆ گیرا نـەبوونی ئەو دوعـا زۆرانـە دەستنیشـان کـراوە کـە ڕەمـەزانی ڕابـوردوو بۆ ڕزگـار بـوون و سـەلامەتیی ئـەهلی سوننەت و جەماعەت دەکران:

*هۆکاری یەکەم:*

تایبـەتکاریی ئـەم چەرخـە سـەیرە: سـاویلکەیی و خـۆش بـاوەڕیی لەڕادەبـەدەری موسـڵمانانە و، چاوپۆشـی‌یانە لـە چـەندەها تـاوانی گـەورەی چـەندین تاوانبـاری سامناك! ئەوەتا گـەر یـەکێکیان کردەوەیـەکی چـاك بـە خراپکارێکـەوە ببینێـت کـە هـەزاران کـرداری خراپـی ئـەنجام دابێـت و دەستدرێژیی بـۆ سـەر مافـە مـاددی و مەعنەوی‌یـەکانی هـەزاران کـەس کردبێـت، دەچێـت – لـەبەر ئـەو تاکـە چاکەیـە – لایەنی ئەو ستەمکارە دەگرێت!

ئیتر بەم شێوەیە، گومڕایـان و ستەمکاران، هەرچـەندە ژمـارەی خۆیـان یـەکجار کەمە، کەچی بەهۆی پشتگیریی کەسـانی ساویلکەوە لێیـان زۆرینـەی خـەڵکی بۆ خۆیان پێکدەهێنن!

لەبەر ئەمە، قەدەری خوای گەورە ئەو موسیبەتە گشتی‌یە دەبـارێنێت کـە لـەسـەر بناغـەی هەڵـەی زۆرینـە بنیـات نـراوە و دابـاریوە. تەنانـەت ئـەم کارەیـان یارمـەتیی درێژەپێدان و بەردەوامی و توندوتیژیی ئەو موسیبەتەش دەدات، تـا وایـان لـێ دێـت کە خۆشیان بە دەمی خۆیان بڵێن:

(ئێمە شایانی ئەم موسیبەتەین)!

بەڵێ، ئەو کەسەی کە نرخـی ئەڵماسـی وەك "ئیمـان" و "ئاخیرەت" بزانێـت و، پاشان فەزڵی وردە شووشەی وەك "دنیا" و "سامان"یان بەسەردا بدات، گـەر لـەبـەر زەروورەتێکی بێ گومان و قـەتعی بێـت، ئـەوا ڕوخسـەتی شـەرعیی بـە دەستەوەیە.

بەڵام گەر ئەم فەزڵدانەی لەبەر "پێویستی‌یەکی سادە" یان "ترسێکی جوزئی" یان بۆ "هەوا و ئارەزوو" یان لەبەر "تەماع"ێك بێت، ئەوا بە نەزانی و گەلحۆیی زیانێکی ئەوتۆی بۆ خۆی هەڵبژاردووە کە شایانی ئەوەیە زللەی تەمێ کردنی لێ بدرێت.

پاشان لێبوردن و چاوپۆشیی مرۆڤ لە تاوانەکان کاتێك دەبێت کە ئەو چاوپۆشی‌یە لە مافەکانی خۆی بێت. واتە گەر دەستدرێژی کرایە سەر مافەکانی دەتوانێت لە دەستدرێژکار خۆش ببێت و چاوپۆشیی لێ بکات. بەڵام مافی ئەوەی نی‌یە چاو لەو تاوانبار و ستەمکارانە بپۆشێت کە مافی کەسانی تریان پێشێل و زەوت کردووە. چونکە بەم ڕەفتارەی دەبێت بە هاوکاریان لە ستەمەکانیاندا!

*هۆکاری دووهەم:* ڕێگەی نووسینی نەدرا.

☐ مەسەلەی دووهەم: (تەئویلی مژدەیەك)

برایانم!

هەرچەند ڕاستی و دروستیی ئەو لێکدانەوە و تەئویلانە دەرکەوتن کە لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" لەسەر ریوایەتەکانی سەبارەت بە ڕووداوەکانی قیامەت نووسران، بەڵام لەبەر ئەوەی زانایان و ئیمانداران لەو تەئویلانە بێ ئاگا بوون و نەیانبینی بوو، ئەوا بە پێویستم زانی دەست بە نووسینی ڕوونکردنەوەیەك بکەم لە بارەی خۆیان و حیکمەتەکەیانەوە، نزیکی دوو لاپەڕەشم لەسەر نووسی. بەڵام دوای ئەوە پەردەم لە بەردەمدا دادرایەوە و باسەکە دواکەوت!

لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا شەش جار ویستوومە بینووسم، هەر جارێکیش کە هەوڵی نووسینیم داوە سەرنەکەوتووم تیایدا! بەڵام ئەوەم بە دڵدا هات کە ڕووداوێکی تایبەت بە خۆم باس بکەم، کە بە یەکێك لە لقەکانی ئەو مەسەلەیە دادەنرێت. ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

جاران بە هیوایەکی توند و تۆڵ و باوەڕێکی بەهێزەوە مژدەم بە خەڵکی دەدا کە نوور و ڕووناکی‌یەك لە ئایندە و ڕۆژانی داهاتوودا دەبینم! ئەم مژدەیەشم بۆیە دەدانێ تاکو ئەو نائومێدی‌یە لەسەر ئەهلی ئیمان لاببەم کە لە سەرەتای سەردەمی "سەربەستی" و ماوەیەکی زۆریش پێش سەرهەڵدانی "پەیامەکانی نوور" خەڵکی

گیرۆدەی بووبوون. تەنانەت پێش "سەردەمی سەربەستی"ش ئەم مژدەیەم بە قوتابی‌یەکانم دەدا.

ئنجا وەك لە "سنووحات"دا نووسراوە و، وەك ئەوەش کە "عەبدورڕەحمان" لە مێژووی ژیانمدا نووسیویەتی، تەنها بەهۆی بریسکانەوەی ئەو مژدەیە بوو کە خۆمم لە بەردەم ڕووداوە سامناکەکاندا پێ ڕادەگیرا. ئەو کاتە منیش - وەکو خەڵکی تر - پێم وابوو ئەو نوورە لە بازنەیەکی گەورە و فراوانی جیهانی سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایەتیی ئیسلامیدا دەردەکەوێت. کەچی ڕووداوەکانی جیهان ئەم بۆچوونەی منیان نەهێنایەدی و، لەو هیوا و مژدە خۆشەی ئایندەش نائومێدیان دەکردم!

کتوپڕ ختورەیەك بە دڵمدا هات کە دڵنیایی و قەناعەتی تەواویان بە جۆرێکی بێ گومان پێ بەخشیم، چونکە لەو ختورەیەدا پێم وترا:

تەئویلی ئەو مژدە و هەواڵانەی کە لە مێژە لە بارەی بینینی ڕووناکی‌یەکەوە بە خەڵکیت ڕادەگەیاند و خۆیشت پەیوەندی‌یەکی گەرموگوڕت لەگەڵدا بەستبوو، تەنانەت هەمیشە دووپاتت دەکردەوە.. هەروەها لێکدانەوەی ئەو مژدەیە سەبارەت بە ئێوە و سەبارەت بە جیهانی ئیسلامییش لە ڕووی ئیمانەوە، بریتی‌یە لە: "پەیامەکانی نوور"! چونکە ڕووناکی‌یەکی ئەوتۆن کە بەشی زۆری بایەخی تۆیان گرتووە و، ڕووناکی و پێشەکی و مژدەشن بۆ ئەو حاڵەتە پڕ لە بەختەوەری و ئایینداری‌یانەی کە لە ئەندێشەی خۆتدا پێت وابوو لە بازنەیەکی فراوان و لە جیهانی سیاسەتدا دێنە دی. تۆ ئەو کاتە ئەم نوورەی ئێستات بەو بەختەوەری‌یەی ئایندە تەسەوور دەکرد، بۆیە لە دەرگای سیاسەتدا بۆی دەگەڕایت!

بەڵێ، تۆ بە "هەستی پێش ڕوودان" و سی ساڵ پێش ئێستا هەستت بەمە کرد، بەڵام وەکو کەسێك وا بوویت کە لە پشتی پەردەیەکی سوورەوە سەیری شوێنێکی ڕەش بکات و تۆش ڕەنگەکەت بە سوور دەبینی. کەواتە ئەو نوورەی کە بینیت ڕاست و دروستە، بەڵام بە هەڵە لێکت دایەوە و، فیتنەی سیاسەت بە هەڵەیدا بردیت!

(ئەركی پەیامەكانی نوور)

پەیامەكانی نوور سەرگەرمی تەعمیری ڕووخانكارییە هەندەكییەكان نین و، خانوویەكی بچووكی ڕووخاو ئاوەدان ناكەنەوە، بەڵكو لەگەڵ ئەوەشدا چەندین كاولكاریی گشتی و هەمەكی بنیات دەنێنەوە و، قەڵایەكی مەزنی ئەوتۆش تەعمیر دەكەن كە ئەوەندە مەزنە هەر تەنها بەردەكانی بە قەبارەی چیاكانن و، قەڵایەكە لە هەموو لایەكەوە دەورانـدەوری ئیسلامی داوە و لە ئامێزی گرتووە. ئەم پەیامانە تەنها بۆ چاكسازیی دڵ و دەروونێكی تایبەت تێناكۆشن، بەڵكو لەگەڵ ئەوەشدا ئیعجازی قورئانیان بەدەستەوە گرتووە و (دڵ و دەروونی گشتی) و (بیری گشتی) تیمار و ساڕێژ دەكەن، كە بەو هۆكارە تێكدەرانە زامدار كراون ماوەی هەزار ساڵەكە و ئامادە دەكرێن.. هەروەها ئەم پەیامانە بۆ چارەسەریی (ویژدان و هەناوی گشتی) لێ دەبڕێن كە لە ئەنجامی تێكشكانی بناغە و ڕێڕەو و درووشمەكانی ئیسلامەوە - كە پاڵپشتێكی مەزنی هەموانن بە تایبەت هی عەوامی ئیمانداران - ڕووی لە خراپكاری كردووە..

بەڵێ، ئەم پەیامانە بۆ ئەوە تێدەكۆشن كە ئەو زامە قووڵ و فراوانانە، بە دەرمانەكانی ئیعجازی قورئان و ئیمان تیمار بكەن.

جا لە بەردەم ئەم هەموو كاولكارییە گشتی و سامناك و، درز و كەلێنە فراوان و، زامە بەسۆ و قووڵانەدا، پێویستە چەندین بەڵگەی بەهێزی گومانبڕ و، چەك و كەرەسەی ئامادە كراوی بەتوانا تا پلەی: "حق اليقين" و بەهێز بە ئەندازەی هێز و دامەزراویی چیاكان بن و، چەندین دەرمانی تاقیكراوەی ئەوتۆش ئامادە كرابن كە لە هەزار و یەك دەرمانی دژە ژەهرەكان پتر تایبەتكارییان بێت و وەك چەندین چارەسەری لەژمارەنەهاتوو وابن.

ئەمەیە ئەركی سەرشانی پەیامەكانی نوور.. ئەو پەیامانەی كە لە ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاون. جا لەو كاتەدا كە "پەیامەكانی نوور" ئەم ئەركەی سەرشانیان بە تەواوی جێبەجێ دەكەن، لە هەمان كاتدا بەهرەمەندی

ئەوەیشن کە چەندین پلەی لەسنووربەدەری ئیمان ئاشکرا دەکەن و، سەرچاوەی بەرز بوونەوە و سەرکەوتنن بە پلە بلند و بەرزە بێ کۆتاییەکانی ئیماندا.

بەم جۆرە، گفتوگۆیەکی دوور و درێژم لەسەر ئەم شێوەیە بە تەواوی بیست کە بۆم کورت کردنەوە و، بۆ ئەمەش زۆر سوپاسی خوام کرد.

بە بۆنەی ئەم ڕووداوە، بەسەرهاتێکتان بۆ دەگێڕمەوە کە ئەم ڕۆژانە بە دڵمدا هات:

کاتێ کە لە کۆتایی زیکرەکانی دوای نوێژدا سی و سێ جار وشەی تەوحید (لا إله إلا الله)م دووپات دەکردەوە، ئەم خاتیرەیەم بە دڵدا هات:

ئەو بیرکردنەوەیەی کە لە فەرموودەی پیرۆزی: "تفكّر ساعة خير من عبادة سنة"دا باس کراوە، لە پەیامەکانی نووردا هەیە. کەواتە هەوڵ بدە بیدۆزیتەوە و دەست خۆتی بخەیت.

* * *

(ئەنجامی بایەخدان بە دەنگ و باسە سیاسییەکان)

(وەڵامێکی مامۆستایە بۆ پرسیارێکی ئەمین و فەیزی)

پرسیار:

جەنابتان لە وەڵامەکەتاندا باسی ئەوەتان کردووە کە هەرکەسێك بە گرنگییەوە بە دوای هەواڵی ئەو ڕووداوانەدا بگەڕێت کە لە ناوەندە سیاسییە زۆر و زەبەندەکاندا ڕوو دەدەن، لە ڕووی ئەرکەکانی سەرشانیەوە لە بازنە بچووکە تایبەتییەکاندا، تووشی زیان دەبێت.

تکایە ئەمەمان بۆ ڕوون بکەنەوە.

مامۆستامان دەڵێت:

وەڵام:

(بەڵێ، هەرکەس لەم کاتەدا بایەخ بەم ململانێیانەی گۆی زەوی بدات و، لە ڕێی ڕادیۆوە بە گەرموگوڕی بە دوای هەواڵەکانیاندا بگەڕێت، تووشی گەلێ

زیانی ماددی و مەعنەوی دەبێت. چونكە "عەقڵ"ی خۆی پەرتەوازە دەكات و لە گیان و ناوەرۆكدا دەبێت بە كەسێكی "گێژ و گەوج".. یان "دڵ"ی پەرتەوازە دەبێت و لە گیان و ناوەرۆكدا دەبێت بە "مولحیدێكی كافر".. یان "بیر"ی پەرتەوازە دەبێت و لە گیان و ناوەرۆكدا دەبێت بە كەسێكی "بیانی"!

بەڵێ، پیاوێكی عەوامی خاوەن تەقوا و ئایینم بینی - هەروەها یەكێكی تریش كە خۆی بە ئەهلی زانست لە قەڵەم دەدا - لە ئەنجامی بایەخدانی زۆریەوە بەو شتانەی كە پەیوەندیی پێیانەوە نییە، خەفەتی زۆری تا ڕادەی گریانی بۆ شكستی كافرێكی دوژمنی دێرینەی ئیسلام خوارد و، لە هەمان كاتیشدا لە ڕادەبەدەر دڵخۆش بوو بە پاشەكشێی كۆمەڵێكی سەییدی ئالی بەیت لە بەردەم كافرێكی سەرسەختدا!

ئایا ئەمە سەیرترین نموونەی شێتی و پەرتەوازە بوونی "ژیری" نییە كە مرۆڤێكی عەوام عەقڵی خۆی پابەندی بازنەی فراوانی سیاسەت بكات و، لە ئەنجامدا فەزڵی كافرێكی دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بەسەر سەییدێكی موجاهیدی ئالی بەیتدا بدات؟!

بەڵێ، مەسەلە سیاسییەكان تا ڕادەیەك پەیوەندییان بە كاری كارمەندانی فەرمانگەكانی: كاروباری دەرەوە و ئەركانی جەنگ لەناو سوپادا و سەركردە و بەرپرسەكانەوە هەیە.

بەڵام سەرقاڵ كردن و وروژاندنی عەوامێكی ساویلكە بەم مەسەلانە و، دوور خستنەوەی لە ئەركە پێویستەكانی سەبارەت بە كاروبارە ڕۆحی و ئایینییەكانی، تەنانەت كاروبارە كەسییەكانی خۆیشی و، پێداویستییەكانی ماڵ و خێزان و گوندەكەی.. پاشان تووش كردنی ئەم مرۆڤە - لە ئەنجامی ئەم حەز و خۆ تێهەڵقورتانەوە - بە دەردەكانی: "بەرەڵایی گیان" و "چەنەبازیی ژیری" و "بێ چێژی و بێ هێزیی دڵ" لە بەرامبەر ڕاستییەكانی ئیمان و ئیسلامەوە..

هەروەها وروژاندنی ئەو جۆرە كەسانە بەو بایەخ پێدانە نزمانەی كە لە ناوەرۆكدا - وەك ڕێگا خۆش كردنێك بۆ ئیلحاد - دڵانیان دەمرێنێت و، هانیان

دەدات بۆ گوێ ڕاگرتن لە ڕادیۆ لە بواری چەند کاروبارێکی سیاسیی ئەوتۆدا کە هیچ پەیوەندی‌یەکیان بەوانەوە نی‌یە..

هەموو ئەمانە، زیانێکی لە ڕادەبەدەری ئەوتۆ لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی دەدەن کە مرۆڤ هەرکات بیر لە ئەنجامە ترسناکەکانیان دەکاتەوە تەزووی پێدا دێت و مووەکانی جەستەشی ڕاست دەبنەوە!

بەڵێ، هەموو مرۆڤێك پەیوەندیی بە نیشتمان و نەتەوە و حکوومەتەکەی خۆیەوە هەیە. بەڵام کارێکی گەلێ هەڵەیە کە - بە چاولێکەریی چەند تەوژمێکی کاتی - سوودەکانی نەتەوە و بەرژەوەندیی نیشتمان و حکوومەت بکرێن بە شوێنکەوتەی سیاسەتێکی کاتیی هەندێ کەس، یاخود وا بزانرێت ئەو سوود و بەرژەوەندی‌یانە لەو شوێنکەوتنەدا بێت.. ئەمە جگە لەوەی کە ئەگەر بەشی هەموو کەسێك لەو گیانە نیشتمانی و نەتەوەییەدا و، ئەرکەکانی سەرشانی سەبارەت بەم دوانە (یەك) بەش بێت، ئەوا لە بەرامبەر "ئەرکەکانی دڵ" و "کارە گرنگەکانی "گیان" و "پێداویستی‌یەکانی سەرشانی" لە ڕووی کەسی و ئایینی و ماڵ و خێزان و ڕووەکانی ترەوە، (بیست) بەڵکو (سەد) بەشە..

کەواتە بەختکردنی ئەم پەیوەندی‌یە گرنگ و یەکجار پێویستانە لە پێناوی ئەو "یەك" بەشە پێویست نەبووەی لەمەڕ تەوژمە سیاسی‌یەکان، کە هیچ پەیوەندی‌یەکیان بەمەوە نی‌یە.. دەڵێم: ئەگەر ئەمە شێتی نەبێت، دەبێ چی بێت)؟!

* * *

ئەمە وەڵامەکەی مامۆستامان بوو، کە بە پەلە بۆی وتین و، ئێمەش زۆر بە خێرایی نووسیمانەوە. تکایە چاو لە قسوورمان بپۆشن.

بەڵێ، ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە پشتی ئەم وتانەی مامۆستا دەگرین. چونکە ئەو قسانەی مامۆستامان بە بەرجەستەیی لە خۆمان و هاوڕێیانماندا بینیوە. تەنانەت هەندێکیان نوێژی جەماعەتی - لەوانەیە هەر لە بناغەدا نوێژیشی - لەبەر گوێ ڕاگرتن لە ڕادیۆ واز لێ هێناوە، کە پەخشی هەواڵەکانی لە کاتی نوێژدایە. بە

ڕادەیەك کە ئەو کەسە لە ئەنجامی بایەخدانی زۆر و خۆهەڵقورتاندنی لەڕادەبەدەری لە هەواڵ زانینی ئەم جەنگەدا (کە زللەیەکی توندی یەك لە دوای یەکە لە سەروگوێلاکی شارستانێتیی ئێستا و هەرزەیی و نەفامی و گومڕاییەکەی و، سزای سووکایەتی کردنیەتی بە ئایینی ئیسلام) هەروەها لە ئەنجامی حەز و هەڵپەی لەڕادەبەدەری ئەو کەسە بەو کاروبارە سیاسی‌یانەی کە لە ناوەندە زۆرەکانیدا ڕوو دەدەن و، ڕەفتار کردنی لە کاروبارەکانیدا بەو ڕێنماییانەی کە لە ڕادیۆوە لە لایەن کەسانێکەوە بڵاو دەکرێنەوە کە دەروونیان ژەهراوی و ژیریشیان سەرگەردان بووە..

بێ گومان ئەم ڕەفتارە، زیانێکی گەورە لە کارە خاوێنە پیرۆزەکەی ئەو کەسە دەدات.

لە قوتابیانی نوور
نەمین

لە قوتابیانی نوور
فەیزی

* * *

(تێکچوون و پیس بوونی کەش و هەوای مەعنەوی)

دوای تەواوبوونی مانگە موحەڕڕەمەکان، چ لە خۆم و چ لە قوتابیانی نووری نزیکی ئێرەدا، ماندوو بوون و سستیم لە شەوق و خزمەتدا دەبینی. بە ڕوونیش هۆی ئەمەم نەدەزانی. وا ئێستا دەزانم ئەوەی کە من بە گومانی خۆم بەهۆی ئەمەم دانابوو، دەرکەوت گومان نی‌یە، بەڵکو هۆی ڕاستەقینەیە. کە ئەمەی خوارەوەیە:

هەروەك هەوا ئەگەر پیس بێت، کاریگەریی خراپی دەبێت، بە هەمان جۆر ئەگەر هەوای مەعنەویش، بە جۆرێکی مەعنەوی چەپەڵ بێت، ئەوا کاریگەریی خراپی خۆی لە هەموو کەسێکدا و هەرکەسەش بەپێی لێهاتن و ئامادەیی خۆی، بەجێ دەهێڵێت.

تێکۆشان و لێبڕانی ئیمانداران بە گشتی لەم سێ مانگەدا بۆ دەستخستن و قازانجی بازرگانیی دواڕۆژ، هەوای مەعنەویی جیهانی ئیسلامی جوان و پاکژ

دەکات، بـە ڕادەیـەك کـە دەتوانرێـت بەرامبـەر بـەو دەردوبەڵا و گێچەڵ و کۆسپە سـامناکانەی بـەرەو ڕووی جیـهانی ئیسـلام دەبنـەوە موسـڵمانان خۆیـان ڕابگـرن و بەرگری بکەن، بە چەشنێك کە هەموو ئیمانداڕێك بەپێی پلـەی ئیمـانی خۆی لـەو هەوا خاوێن و بێگەرد و جوانە، سوودمەند دەبێت.

بەڵام لـە دوای بەسـەرچوونی مانگـە پیرۆزەکـان، بـارودۆخی بـازاڕی قیامـەتی ئالوگۆڕی بەسەردا دێت و، دەرگاکانی بازاڕی دنیایی دەکرێنەوە. ئیتر هیممەت و تەقالا و هەوڵەکانیش هەندێ گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. چونکە هەڵمەکان کە لە کاروبـارە نزمەکانـەوە بـەرز دەبنـەوە ئـەو هەوایـە ژەهـراوی دەکـەن و، جوانـی و خاوێنییەکەی تێك دەدەن، ئیتر هەموو ئیمانداڕێك لە شوێنی خۆیدا - هەرکەسـەو بەپێی پلەی خۆی - زیانی پێ دەگات.

چارەسەری ئەم دەردە و ڕزگاربوون لێی لەوەدایە کە:

بە ڕوانگـەی "پەیامـەکانی نـوور" بـۆ هـەموو شـتێك بڕوانرێـت. واتـە هـەتا گیروگرفت زیاتر بێت، بە لێبڕانێکی پتر و شەوقێکی گەورەترەوە هـەوڵ و کۆشـش لە زیادبووندا بێت. چونکە ساردبوونەوەی کەسانی تـر و دەسـت هـەڵگرتنیـان لـە خزمـەتگوزاری، هۆیەکـە بـۆ بزواندنـی هیممـەت و غـیرەتی غیرەتمـەندان و جووڵاندنی شەوقیان. چونکە ناچار دەبێت هەندێ ئەرکی سەرشانی ئەوانی تریـش هەڵبگرێت، بەڵکو هیچ چارێکی تر نییە و دەبێت ئەو ئەرکە بخاتە ئەستۆی خۆی.

* * *

(گوناهەکان لـە ئاخر زەماندا)

ئەمەی خوارەوە مەسەلەیەکە کتوپڕی هێنرایە دڵمەوە:

هەندێ ڕیوایەت هەن لە بارەی گەورەیی و سامناکیی گوناهی مـرۆڤ لـە ئـاخر زەمـاندا.. کـە بـیرم لـێ دەکردنـەوە، دەمـوت: ئایـا دەگونجـێ مرۆڤێـك هـەزاران ئەوەندەی یەك کەس گوناهـ و تاوانی لـێ بووەشێتەوە! دەبێ ئەم گوناهە نەزانراوانـە

چی بن تا خۆیان لە قەرەی بوونەوەران بدەن و توورەیی گەردوون بورووژێنن، تەنانەت بین بەهۆی بەرپابوونی قیامەت و رووخانی دنیا بەسەریاندا؟

کەچی وا بە چاوی خۆمان لەم رۆژگارەی ئێستادا هۆکارە زۆر و زەبەندەکانی ئەمەمان بینی!

*بۆ نموونە:*

بەم ئامێری رادیۆیەی بەردەستم هەندێ لە رووە زۆرەکانی تێگەیشتین. چونکە "یەك کەس" بە تەنها "یەك وشە" کە "یەك جار" لە رادیۆوە لە زاری دەردەچێت، دووچاری "یەك ملیۆن گوناه" دەبێت و، ملیۆنەها گوێ بیستیش بەو گوناهانەوە دەگلێنێت!

بەڵێ، ئامێری رادیۆ بە یەك زمان قسە دەکات، بەڵام بە یەك جار سەدان هەزار وشە دەخاتە ناو شەپۆلەکانی هەواوە. جا لە کاتێکدا کە دەبوو ئەم ئامێرە – کە نیعمەتێکی گەورەی خوایە – سەرجەم گەردیلەکانی هەوای بە حەمد و سەنا و شوکری خوای گەورە پڕ بکردایە، کەچی هەرزەیی ئەنجامی گومرایی مرۆڤ بە پێچەوانەی شوکر و حەمدەوە ئەم ئامێرە بەکار دەهێنێت. گومان لەوەشدا نی‌یە کە لەسەر ئەم کارەی سزا دەدرێت.

بەڵێ، مەدەنییەتی دەنی و ستەمکار لە ئەنجامی پێ نەزانینی چاکەکاری‌یەکانی خواوەند بەسەریەوە و ناشکوری کردنی لە بەرامبەر نیعمەتی کارە دەراسا شارستانی‌یەکانەوە، سزا درا. ئەوەبوو ئەو کارە دەراسایانەی بە رادەیەك لە کاولکاری و رووخاندندا بەکارهێنا کە بە تەواوەتی بەختەوەریی ژیانی نەهێشت و، کەسانی سەر چڵەپۆپەی شارستانێتیی هێنایە پلەیەکی نزمتر لە هی درندە گومراکان و، ئازاری دۆزەخی – پێش ئەوەی برۆنە ناوی – هەر لە دنیادا دەرخواردی خەڵکی دا.

بەڵێ، لەو رووەوە کە ئامێری "رادیۆ" نیعمەتێکی هەمەکیی خوای گەورەیە، داخوازی شوکرانەیەکی هەمەکی‌یە. ئەم شوکرە هەمەکی‌یەش تەنها بەوە دەبێت کە

بەردەوام خوێندنی قورئانی پیرۆزی پێ بڵاو بکرێتەوە، تاکو بە یەك جار بدرێت بە گوێی ئەو خەڵکانەی ئێستادا کە گوفتاری ئەزەلیی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییان ئاراستە کراوە. ئەو کاتەش ڕادیۆ وەك قورئان خوێنێکی ئەوتۆی لێ دێت کە هەزاران هەزار زمانی ببێت! بەم کارەش ئەرکی شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە جێبەجێ دەکات و لە هەمان کاتدا "بەردەوامی"ش بەو نیعمەتە بەخشراوە دەدات.

* * *

(ئایا لەبەرکردنی قورئان باشترە یان نووسینەوەی پەیامەکان)؟!

برا ئازیزە بەوەفاکانم!

چالاکی و ماندووبوونەکانتان، کە زۆر لە هیوا و چاوەڕوانیی من زیاترن، تا کۆتایی ژیانم دەخەنە شوکر و سوپاسێکی بێ کۆتاییەوە بۆ خوای گەورە.

لە نامەکەی ئەم جارەتاندا پرسیارێك هەیە دەڵێت:

کام لەم دوانە باشترە: لەبەرکردنی قورئان، یان نووسینەوەی پەیامەکانی نوور؟!

وەڵامی ئەم پرسیارەتان زۆر ئاشکرایە. چونکە گەورەترین پلە و پایە لە گەردووندا و لە هەموو سەردەمێکدا هەر هی قورئانی پیرۆزە و، خوێندنەوە و لەبەرکردنیشی لە هەموو کارێکی تر باشتر و لە پێشترە. ئەوەتا هەموو پیتێکی قورئان لە (دە) پاداشتەوە تا (هەزاران) پاداشتی هەیە.

جا لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور"یش بریتین لە بەڵگەی ڕاستییە ئیمانییەکانی قورئانی پیرۆز و، هۆکارن بۆ لەبەرکردن و خوێندنەوەی و، تەفسیر و لێکدەرەوەی ڕاستییەکانی ئەو قورئانە پیرۆزەن، ئەوا دەبێ شان بە شانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز هەوڵیش بۆ خزمەتی ئەو پەیامانە بدرێت.

* * *

(ڕاستکردنەوەی شەفەقەتێکی زیاد لە پێویست)

ئەمەی خوارەوە حەقیقەتێکە هۆش و ژیری دەهێنێتەوە بە بەر ئەو کەسانەی کە لەبەر سۆزی لەڕادەبەدەریان شوێن ڕێبازەکانی بیدعەت و گومڕایی کەوتوون!

لەبەر ئەوەی شەفەقەتی مرۆڤ یەکێکە لە درەوشانەوەکانی میهرەبانیی پەروەردگار، ئەوا نابێت مرۆڤ پلەی میهرەبانیی خواوەند بشکێنێت و بیەوێت لە میهرەبانیی پێغەمبەری "رحمة للعالمين ﷺ" زیاتر هەنگاو بنێت! چونکە گەر لەم هەست و سۆزەدا زیادەڕەوی بکات، ئەوا هەرگیز بە شەفەقەت دانانرێت، بەڵکو نەخۆشی‌یەکە "گیان" و "دڵ" دووچاری دەبن و، سەری لە گومڕایی و ئیلحادەوە دەردەچێت!

بۆ نموونە:

تەئویل کردنی سزای کافر و مونافیقان لە دۆزەخدا و، ئەنجامەکانی جیهاد و، ڕووداوەکانی هاوچەشنیان، کە بەهۆی تەسکیی شەفەقەتی مرۆڤ و جێ نەبوونەوەی ئەم شتانە تیایدا، تەئویل دەکرێن.. لە ڕاستیدا ئینکاری کردن و بەدرۆخستنەوەیە بۆ بەشێکی زۆری دەقەکانی قورئانی پیرۆز و ئایینە ئاسمانی‌یەکان. هەروەك لە هەمان کاتدا ستەم و بێ سۆزی‌یەکی لەوپەڕی نارەواییدایە. چونکە پاراستن و بەزەیی هاتنەوە بەو ئاژەڵە دڕندانەی کە گیانەوەرە بەری و داماوەکان لەت و پەت دەکەن، ستەمێکی گەورەیە لە مافی ئەو ئاژەڵە بەستەزمانانە، هەروەك خۆی لە خۆیدا کارێکی دڕندانەی ئەنجامی بێ ویژدانی‌یە.

کەواتە پشتگیری و بەزەیی‌هاتنەوە بەو ستەمکارانەی کە ژیانی هەتاهەتایی هەزاران موسڵمانان لەناو دەدەن و، بە هاندانی خەڵکیش بۆ گوناه و تاوان، سەدان ئیماندار بەرەو بەدئەنجامی و عاقیبەت شەڕی دەبەن.. هەروەها دوعای سۆز و بەزەیی کردن بۆ ئەو کافر و مونافیقانە تاکو لە سزای سەخت ڕزگاریان ببێت.. بێ گومان ئەم ڕەفتارە، ستەمێکی گەورە و غەدرێکی نابەجێ‌یە بەرامبەر بەو ئیماندارە ستەم لێکراوانە!

"پەیامەکانی نوور" بە چەشنێکی بێ گومان چەسپاندوویانە کە:
"کوفر و گومڕایی" سووکایەتی کردنێکی گەورە و ستەمێکی لەڕادەبەدەرە لە بوونەوەران و، هۆکارێکە بۆ هەڵگرتنی میهرەبانی و داباریینی بەڵا و موسیبەتەکان. تەنانەت هەندێ ڕیوایەت هەن لەسەر ئەوەی کە ماسی‌یەکانی بنکی دەریاش لەتاو ستەمی خراپکاران کە حەوانەوەیان لێ زڕاندوون، سکاڵا بۆ لای خوا دەبەن!
لەبەر ئەوە، سۆز و بەزەیی نواندن بۆ "کافر" کە لە دۆزەخدا چەندین جۆر ئازار و ئەشکەنجە دەدرێت، بەزەیی نەهاتنەوە دەگەیەنێت بەو بێ تاوانە لەژمارەبەدەرانەی کە شایانتری میهر و سۆز و بەزەیین! تەنانەت ئەو کەسەی کە بەزەیی بە کافرەکەدا دێتەوە، بەزەیی بەواندا نایەتەوە و ستەمێکی ئاشکرایان لێ دەکات!
جگە لەمە، شتێکی تریش هەیە.. کە بریتی‌یە لەوەی:
کاتێ بەڵا دێت بۆ کەسانی شایان، بەری و بێ تاوانەکانیشی پێوە گیرۆدە دەبن. لەو کاتانەشدا ناگونجێ جیا بکرێنەوە و بێ سۆزی لەگەڵ ئەواندا نەکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا میهرەبانی‌یەکی پەنهان بە تایبەت بۆ ئەو بێ تاوانە ستەم لێکراوانە هەیە کە لە ئەنجامی ئەو بەڵایەی بۆ تاوانکاران نازڵ بووە ئەوانیش زیانیان لێ کەوتووە.
لە یەکەم جەنگی جیهانیدا ماوەیەك خەم و ئازاری زۆرم بۆ ئەو ستەم و کوشتارانە دەخوارد کە دوژمنان دەیانهێنا بەسەر موسڵمانان، بە تایبەت منداڵ و خێزانەکانیاندا و، لەبەر ئەو سۆز و شەفەقەتە لەڕادەبەدەر و بەزەییە زیادەش کە لە سروشتی مندا هەیە گەلێ زیاتر لە توانای خۆم ئازارم دەچەشت و خەمم بۆ دەخواردن.
هەر ئەو کاتە ئەم واتایەی خوارەوە بۆ دڵم هات:
ئەو کوژراوە بەری و بێ تاوانانە: "شەهید"ن و دەچنە پلەی ئەولیا و پیاوچاکانەوە. هەروەك ژیانە فانی‌یەکەیان بۆ دەگۆڕرێت بە ژیانێکی باقی و، ماڵ و

سامانە تیاچووەکانیشیان حوکمی "صەدەقە"یان دەبێت و دەبن بە چەند ماڵ و سامانێکی نەبڕاوە و هەمیشەیی. تەنانەت گەر ئەو ستەم لێکراوانە کافریش بن، ئەوا لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندەوە سەبارەت بەوان و لە بەرامبەر ئەو گیرو گرفتانەی کە لە دنیادا دووچاری بوون، گەلێ پاداشت دەدرێنەوە، بە ڕادەیەك کە: گەر پەردەی غەیب لا بدرێت، ئەوا دەردەکەوێت کە ئەو "میهرەبانی"یەی دەستیان دەکەوێت لە ڕادەیەکدایە کە شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە دەربڕن.

ئیتر کە ئەمەم زانی، قەناعەتێکی تەواوم پێ کرد و، بە فەزڵی خوا لەو ئازارە توندوتیژە دەرباز بووم کە ئەنجامی شەفەقەتی لەڕادەبەدەرم بوو.

* * *

(ڕوانینێك بە پەیامی "مونازەرات"دا)

دوای تێپەڕبوونی سی و پێنج ساڵ بەسەر دانانی پەیامی "مونازەرات"دا، چاوێکم پێدا خشاندەوە. بینیم ئەم پەیامە و دانراوەکانی تری "سەعیدی کۆن" هەندێ شتی نادروست و هەڵەی سووکەڵەیان تێدایە. چونکە ئەو بەرهەمانە لە حاڵەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆدا نووسرابوون کە ئاڵوگۆڕە سیاسییەکە[1] و چەند کاریگەرێکی دەرەکی و هەندێ هۆکاری لەمەڕ دەوروبەر پێکیان هێنابوو.

وا من ئێستا بە هەموو توانایەکم داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەو قسوور و ناتەواوییانەم و، لە میهرەبانییەکەشی ئومێدەوارم چاو لەو هەڵانەم بپۆشێت کە بە مەبەست و نیازێکی جوان و، بۆ ڕەواندنەوەی نائومێدیی ئیمانداران، دووچاریان بووم.

---

(١) مەبەست ڕاگەیاندنی "مەشرووتییەتی دووهەم"ە لە دەوڵەتی عوسمانیدا، کە بریتییە لە بەڕێوەبردنی وڵات لە لایەن ئەنجومەنێکی پەرلەمانی و دەستوورەوە، کە وەزارەت لە بەردەم ئەو ئەنجومەنەدا بەرپرس دەبێت، لەسەر شێواری ڕژێمەکانی خۆرئاوا. (وەرگێڕ)

بەرهەمەکانی "سەعیدی کۆن" - وەك ئەم پەیامە - دوو بناغەی گرنگ بەسەریاندا زاڵن. ئەو دوو بناغەیەش حەقیقەتن. بەڵام هەروەك کەشفی ئەولیاکان پێویستیان بە تەئویلە و خەونە ڕاستەکانیش پێویستیان بە تەعبیرە، ئەو حەقیقەتەش کە "سەعیدی کۆن" لە ڕێی هەستی پێش ڕوودانەوە هەستی پێ کرد، ئەویش بە هەمان جۆر پێویستی بە لێکدانەوە و تەعبیرە، بەڵام تەعبیرێکی ورد. کەچی لەبەر ئەوەی بە بێ هیچ لێکدانەوە و تەعبیرێك هەواڵی ئەو ڕووداوەی ڕاگەیاند و، ئەو دوو حەقیقەتەی دەخستە ڕوو، ئەوا هەندێ ناتەواوی و شتی پێچەوانەی واقیع لە هەواڵەکەیدا دەرکەوت. (دوو بناغەکەش ئەمانەن):

*بناغەی یەکەم:*

بریتییە لەو مژدە خۆشەی کە ئەو دەمە دەیدا بە ئیمانداران سەبارەت بە سەرهەڵدانی نوورێك لە ئاییندەدا، تاکو نائومێدیان لەسەر هەڵبگرێت و بێ هیوایی لە دڵیاندا لاببات..

چونکە بە هەستێکی پێش ڕوودان پەیی بەوە بردبوو کە "پەیامەکانی نوور" ئیمانی زۆر کەس لە ئیمانداران دەپارێزن و لە ڕۆژگارێکی سەخت و گێژەڵوو کاویدا پشتیان دەگرن. بەڵام لە ناوەندی ئەو ڕووداوە سیاسییانەی کە لەگەڵ ئەو ئاڵوگۆڕەدا پەیدا بووبوون بۆ ئەو نوورەی ڕوانی و، ویستی بێ هیچ تەعبیر و لێکدانەوەیەك بەسەر واقیعی حاڵدا بیشکێنێتەوە و، پێی وابوو ئەو نوورە لە جیهانی سیاسەت و بواری هێز و مەیدانێکی فراواندا دەردەکەوێت!

کەواتە هەستەکەی ڕاست بوو، بەڵام بە تەواوەتی لە لێکدانەوە و تەعبیری ئەو مژدەیەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا!

*بناغەی دووهەم:*

"سەعیدی کۆن" بە وێنەی چەند کەسێك لە سیاسەتمەدارانی بلیمەت و ئەدیبانی وریا و زیرەك، زووتر هەستی کردبوو کە "ئیستبداد"ێکی سامناك بۆ ئەم نەتەوەیە بەرێوەیە، بۆیە هەموویان بەرەنگاری بوونەوە. بەڵام ئەم هەستە پێش وەختە پێویستی

بە لێکدانەوە بوو. چونکە ئەوان هێرشیان بۆ سەر سێبەرێکی لاوازی شتێك برد کە بینیبوویان و لە "ئیستبداد"دا هەر تەنها ناوەکەی پێ برِا بوو، بەڵام هی چەندین ئیستبدادی تر بوو کە دوای ماوەیەکی درێژخایەن هاتە گۆڕێ و، هەر ئەو کاتە ترس و سامی هاویشتبووە دڵی ئەمانەوە.

کەواتە ئامانجەکەیان ڕاست بوو، بەڵام نیشانەکەیان نەپێکابوو!

سەعیدی کۆن"یش - بە هەمان جۆر - کاتی خۆی هەستی بەم ئیستیبدادە ترسناکە کردبوو، هەروەك لە هەندێ بەرهەمی ئەو کاتەیدا بە ڕوونی هێرشی بردووەتە سەر و، پێی وابووە کە تەنها "مەشرووتییەتی شەرعی" هۆی ڕزگاربوونە لەو ئیستبدادە سامناکانە. بۆیە تێدەکۆشا کە بە "سەربەستیی شەرعی" و "شوورا" و لە چوارچێوەی "ئەحکامەکانی قورئان"دا پشتی ئەو مەشرووتیەتە شەرعی‌یە بگرێت، بەو هیوایەی کە ئەو گرفت و موسیبەتەیان پێ بگێڕێتە دواوە.

بەڵێ، ڕۆژگار دەری‌خست کە دەوڵەتێك بە هەڵگری بانگەوازی "ئازادی" ناو دەبرێت، ماوەی سێ سەد ساڵ بە سێ سەد کەسی کارمەندی ستەمکار و خۆسەپێنی خۆی، سێ سەد ملیۆن کەسی لە هیندی‌یەکان بە کۆت و زنجیرەوە چەوساندەوە و، هیچ بوارێکی نەدان کە بجووڵێنەوە و، بە سەخت‌ترین شێوەی ستەمی دڕندانە یاسای خۆی بەسەردا سەپاندن و، لەسەر تاوانی یەك کەسی تاوانبار هەزاران بێ تاوانیان تێوە دەتلاند. ئنجا ناوی "دادگەری" و "سەقامگیرکردنی یاسا"یان لەم ستەمەیان نا و، بەم کارەشیان هەموو جیهانیان خەڵەتاند و بە ئاگری ئەم ستەمە ئەوانیشیان سووتاند! جا ئەم دەوڵەتە، ئێستا بووە بە پێشەنگێکی چاولێکراو بۆ ئەو ئیستیبدادەی کە لە ئایندەدا هات!

پەیامی "مونازەرات" چەند تێبینی و کورتە پەراوێزێکی تێدایە کە لە شێوەی نوکتە و قسەی نەستەقدا لەگەڵ قوتابی‌یە وریا و قسەخۆش و زیرەکەکانی ئەو کاتەیدا کراون، چونکە کاروبار و ڕووداوەکانی بە شێوازی دەرس و ڕێنمایی بۆ ڕوون کردوونەتەوە.

پاشان پوختە و گیان و بناغەی ئەم پەیامی مونازەراتە بریتی‌یە لە ڕاستیی دامەزراندنی "قوتابخانەی زەهراء" کە لە کۆتاییەکەیدا باسی هاتووە. کە ئەویش - لە ڕاستیدا - بریتی‌یە لەو لانکەی لە ئایندەدا سەرهەڵدانی "پەیامەکانی نوور" دەبینێت. ئەوەبوو بە بێ ویستی خۆی بەرەو دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە دەدرایە بەر و، بە هەستێکی پێش ڕوودان لە شێوەیەکی ماددیدا بە دوای ئەو ڕاستی‌یە نوورانی‌یەدا دەگەڕا، تەنانەت ڕووە ماددی‌یەکەشی دەرکەوت، چونکە سوڵتان ڕەشاد نۆزدە هەزار لیرەی زێڕینی بۆ دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە بەخشی و، بناغەکانی ئەو قوتابخانەیە دامەزران و بەرز کرانەوە، بەڵام هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ڕێی لە تەواو کردنی ئەو پرۆژەیە گرت.

پاشان دوای نزیکەی شەش ساڵ ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە و لە پێناوی جێ‌بەجێ کردنی ئەو ڕاستی‌یەدا هەوڵەکانی خۆمم خستەوە گەڕ. ئەوەبوو لە کۆی دووسەد ئەندامی پەرلەماندا سەد و شەست و سێ ئەندام ڕەزامەندی‌یان لەسەر ئەوە نواند کە پازدە هەزار لیرەی وەرەقی بۆ بنیاتنانی قوتابخانەکەمان تایبەت بکرێت. بەڵام هەزار هەزار داخ و ئەسەف بۆ ئەوەی کە هەموو قوتابخانە ئایینی‌یەکان داخران و، منیش ئیتر نەمتوانی لەگەڵ ئەواندا خۆم بگونجێنم و، دیسانەوە پرۆژەکە دواکەوتەوە.

بەڵام میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەی بەتوانا تایبەتکاری‌یە مەعنەوی‌یەکان و کاکڵە و جەوهەری ئەو قوتابخانەیەی لە "ئیسپارتە"دا دامەزراند و، "پەیامەکانی نوور"ی هێنایە وجوود. پشت بە خوا "قوتابیانی نوور" ڕووە ماددی‌یەکەی ئەو ڕاستی‌یەش دەهێننەدی و دایدەمەزرێنن.

هەرچەند ئەو کاتە "سەعیدی کۆن" زۆر بە توندوتیژی لە دژی ڕێکخراوی "ئیتیحاد و تەرەقی" ڕاوەستا، بەڵام لایەنی حکوومەتەکەی، بە تایبەت سوپاکەی، گرتن. ئەوەبوو هەڵوێستی ڕێز و سەرسووڕمان و گوێڕایەڵیی لە بەرامبەرەوە نواندن. ئەمەش هی ئەوەبوو کە بە هەستی پێش ڕوودان پەیی بەوە بردبوو کە ئەو

دەستە و تاقمە سەربازی و کۆمەڵە میللی‌یانە، دوای حەوت ساڵ، یەك ملیۆن شەهیدیان لە نێواندا پەیدا دەبێت، کە لە پلەی ئەولیادان. بۆیە بە بێ ویست و ئیختیاری خۆی، دوای چوار ساڵ لایەنی گرتن، کە ئەمەش پێچەوانەی مەشرەبی خۆی بوو. بەڵام هەر کە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپا بوو، هەموو ئەوانی راتەکاند و، رۆن و کەرەی پیرۆز و بەنرخی لەو ماستە جیا کردەوە و، پاشماوەکەی کرد بە دۆیەکی بێ نرخ. ئیتر "سەعیدی نوێ" دەستی دایە جیهادەکەی خۆی و بە پێچەوانەی سەعیدی کۆنەوە رەفتاری نواند.

* * *

(لە بارەی کتێبەکانی ترەوە)

بۆ برا "تایبەتمەندەکان"م لە قوتابیانی پەیامەکانی نوور، کە خاوەن و میراتگری ئەو پەیامانەن!

بۆ برایانی "ئەرکان" کە بناغەی پەیامەکانی نوورن و کەسانی تایبەتی نێوان تایبەتمەندەکانن!

بە بۆنەی بەسەرهاتێکەوە کە لەم رۆژانەدا رووی داوە، ئەمەی خوارەوەتان بۆ دەگێرمەوە:

ئەو پێویستی‌یەی کە خەڵکی بە "راستی‌یەکانی ئیسلام" هەیانە، پەیامەکانی نوور بە تەواوی پڕی دەکەنەوە و هیچ پێویستی‌یەك بە سەرلێدانی کتێبی تر ناهێڵنەوە.

بە چەندین ئەزموونی زۆر و بێ گومان دەرکەوتووە کە کورت‌ترین و ئاسانترین رێ بۆ پشتگیریی هێزی ئیمان و رزگار کردنی و گۆڕینی بە "ئیمانی تەحقیقی" لە پەیامەکانی نووردایە.. چونکە پەیامەکانی نوور لە بریی پازدە ساڵ، بە پازدە حەفتە ئەو رێگایە دەبڕن و، مرۆڤ لەو ماوەیەدا دەگەیەننە ئیمانی راستەقینە.

بەڵێ، لە کاتێکدا کە ئەم برا هەژارەتان بیست ساڵ پێش ئێستا لە رادەبەدەر حەزی لە خوێندنەوەی کتێب دەکرد و تەنانەت جاری وا هەبوو لە تەنها یەك رۆژدا یەك بەرگ کتێبی دەخوێندەوە و لێشی تێدەگەیشت، کەچی وا نزیکەی بیست

ساڵە قورئانی پیرۆز و پەیامەکانی نوور - کە ڕێژنەی قورئانن - پێویستیی ئەویان تەنانەت بە یەك دانە کتێبی تریش نەهێشتووەتەوە و هیچ کتێبێکم لای خۆم گل نەداوەتەوە.

سەرەڕای ئەوەش کە باسەکانی پەیامەکانی نوور لە بارەی گەلێ حەقیقەتی جۆراوجۆرەوە دەدوێن، کەچی وا ماوەی بیست ساڵە لە کاتی دانانیاندا پێویستم بە سەرلێدان و سەیر کردنی هیچ کتێبێك نەبووە!

بێ گومان ئێوەش بە هەمان جۆر پێویستتان بە هیچ کتێبێکی تر نی‌یە و، بیست ئەوەندەی من زیاتر پەیامەکانی نوورتان لێ سەروزیادە.

پاشان لەبەر ئەوەی من هەتا ئێستاش پشتم بە ئێوە بەستووە، ئەوا ئاوڕ لە غەیری ئێوە نادەمەوە و خۆم بە کەسانی ترەوە سەرقاڵ ناکەم. دەبێ ئێوەش بڕوا و متمانەتان بە پەیامەکانی نوور بێت. تەنانەت لەم کاتەدا ئەمە لە هەموو شتێکی تر پێویستترە.

پاشان لە بەرامبەر جیاوازیی ڕێباز و مەشرەبی کتێبەکانی هەندێ لە نووسەرە تازەکانی ئەم ڕۆژگارە و خۆگونجاندنیان لەگەڵ بیدعەتەکاندا، یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی "پەیامەکانی نوور" پاراستنی پیت و خەتی قورئانی پیرۆزە، جگە لە پارێزگاری کردنی "ڕاستی‌یەکانی ئیمان"یش لە بەرامبەر زەندەقە و ئیلحادەوە.

یەکێك لە قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانم، هەرچەندە خۆی وانەی پیتەکانی قورئان دەڵێتەوە، کەچی لەبەر ئارەزوویەکی نەزانراو، چەند کتێبێکی لەوانە کڕیبوو کە هەندێ لە زانایان - لە ژێر پەردەی زانستە ئایینی‌یەکاندا - بۆ وەشاندنی زللەی بەهێز لە پیت و خەتی قورئان بەکاری دەهێنن. یەکسەر بێ ئەوەی بەم کارە بزانم و لەو کاتەدا کە لەسەر چیاکە بووم هەستم بە دڵگرانی و تووڕەبوون کرد بەرامبەر بەو قوتابی‌یە تایبەتمەندانەم!

پاشان ئاگادارم کردنەوە، ئەوانیش بە فەزڵی خوای گەورە بێدار بوونەوە. لە خوا دەپاڕێینەوە کە بە تەواوی لەو کارە هەڵەیە ڕزگاریان بوو بێت.

برایانم!

ڕێبازی ئێمە: بەرگری‌یە، نەك دەستدرێژی.. ئاوەدان کردنەوەیە، نەك کاولکاری. خۆشمان: مەحکومین، نەك حاکم. جا ئەوانەی کە دەستدرێژیمان دەکەنە سەر هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن. بێ گومان چەند حەقیقەتێکی گرنگ لە ڕێبازەکانی ئەواندا هەیە کە - لە ڕاستیدا - کالاّ و تفاقی ئێمەن. ئەوان بۆ بلاّوبوونەوەی ئەو ڕاستی‌یانە پێویستیان بە ئێمە نی‌یە، چونکە هەزاران کەسیان هەیە کە دەیانخوێننەوە و بلاّویان دەکەنەوە. جا گەر ئێمە هەولّی یارمەتیدانیان بدەین ئەوا ئەرکەکانی سەرشانی خۆمان پەکی دەکەوێت و، دەبین بەهۆی لەدەستدانی ئەو بناغە و ڕاستی‌یە بەرزانەی کە دەبێ پارێزگاری بکرێن و هی یەك بە یەکی دەستە و تاقمە جیاجیاکانن.

بۆ نموونە:

لە ژێر پەردەی هەندێ ڕوخسەتی شەرعیدا و بە بیانووی ڕووداوەکانی ڕۆژگار، چەند کتێبێك دانراون کە ڕێگا بۆ جۆرە دوژمنایەتی کردنێکی پیاوچاکان خۆش دەکەن. کەچی ئەرکی بنەڕەتیی پەیامەکانی نوور پاراستنی بناغەکانی ئەو ویلایەتەیە کە لە ناوەندی ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا هەنگاو دەنێت و لەسەر بناغەی تەقوا بنیات نراوە. هەروەها بریتی‌یە لە دەستگرتن بە عەزیمەت و بناغەکانی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ و، بناغە گرنگ و وردەکانی تری هاوچەشنیان. کەواتە ناکرێ بە بیانووی "زەروورەت" و "ڕووداوەکانی ڕۆژگار" واز لەو بناغانە بهێنرێت.

* * *

(لێکدانەوەی فەرموودەیەکی موتەشابیھ)

لەبەر ئەوەی واتا ڕاستەقینەکانی چەند فەرموودەیەکی صەحیح کە تایبەتن بە هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا - درودی خوای لەسەر بێت - لە ئاخر زەماندا و کوشتنی دەجاڵ بە دەستی ئەو، ڕوون نین، ئەوا بەشێك لە زانا ڕواڵەت بینەکان ڕووی ڕواڵەتی ئەو فەرموودە و ڕیوایەتانەیان وەرگرتووە و، لە ئەنجامی ئەمەدا یان کەوتوونەتە ناو گومانەوە، یان ئینکاریی صەحیح بوونی ئەو فەرموودانەیان ڕاگەیاندووە، یاخود واتایەکی خورافیی وەك چاوەڕوان کردنی شێوەیەکی مەحاڵیان بە بەردا پۆشیوە! دیارە بەم کارەشیان زیان بە عەوامی موسڵمانان دەگەیەنن. هەروەك مولحیدانیش بەرەو بە بڵاوبوونەوەی ئەم چەشنە فەرموودانە دەدەن کە بە ڕواڵەت لە ژیریەوە دوورن. لەمەشەوە هێرش دەبەنە سەر ڕاستییەکانی ئیسلام و گاڵتە و سووکایەتییان پێ دەکەن.

بەڵام پەیامەکانی نوور - بە ڕێژنەی بەرەکەتی قورئانی پیرۆز - لێکدانەوە و تەئویلە ڕاستەقینەکانی ئەو فەرموودە موتەشابیھانەیان پێشچاو خستووە.

وا ئێستا بەمەی خوارەوە یەك نموونە دەهێنینەوە:

ڕیوایەتێك هەیە ئەوە دەگەیەنێت کە حەزرەتی عیسا - درودی خوای لەسەر بێت - کە دەچێ بە گژ دەجاڵدا و، لە کاتی کوشتنیدا بە یەك تەکان دەگەز بەرز دەبێتەوە تاکو بتوانێت بە شمشێر لە ئەژنۆی دەجاڵ بدات!

بەو واتایەی کە جەستەی دەجاڵ تا ئەو ڕادەیە لە جەستەی حەزرەتی عیسا - درودی خوای لەسەر بێت - گەورەترە.

بەپێی ئەم واتایە، دەبێ درێژیی دەجاڵ دە هێندە، بەڵکو بیست هێندەی درێژیی حەزرەتی عیسا بێت!

واتای ڕواڵەتیی ئەم ڕیوایەتە بە تەواوی پێچەوانەی حیکمەتی تاقیکردنەوەی بەندەکان و تەکلیفی خواوەندە لێیان، هەروەك لەگەڵ یاسای عادەتی خوای گەورە لە گرۆی مرۆڤدا، یەك ناگرێتەوە.

کەچی تەنانەت لەم ڕۆژگارەشدا یەکێك لە واتا زۆرەکانی ئەم ڕیوایەت و فەرموودەیە بە چەشنێك دەرکەوت کە ئەو زەندیقانە دەمکوت بکات کە - خوا پەنامان بدات - بە خورافەتیان دەزانی و، لە هەمان کاتدا ئەو زانا ڕواڵەت بینانەش بە خەبەر بێنێ کە لەو باوەڕەدا بوون واتا ڕواڵەتی‌یەکە خودی حەقیقەتی ڕیوایەتەکەیە و، هەتا ئێستاش چاوەڕوانی هاتنەدیی ڕواڵەتی ئەو فەرموودەیەن! هەرچەندەش بەشێك لە ڕاستی‌یەکانی ئەو فەرموودەیان بە چاوی خۆیان بینی!

بەڵێ، تەنانەت لەم ڕۆژگارەشدا یەکێك لەو واتا زۆرانەی هاتەدی کە سەرتاپا حەقیقەتە و لەگەڵ واقیعدا بە تەواوی دەست لە ملان و گونجاوە، کە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

حکومەتێك کە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی عیسایی و پاراستنی نەریتە بەردەوامەکانی ئەو ئایینە هەوڵ دەدات، حکومەتێکی تر شەڕی لەگەڵدا دەکات کە لەبەر سوود و بەرژەوەندی‌یە نزم و چەپەڵەکانی خۆی، بە شێوەیەکی ڕەسمی یارمەتی و هاوکاری‌یەکانی بۆ ئیلحاد و بەلشەفیك[1] ڕادەگەیەنێت و تەنانەت پروپاگەندەشیان بۆ دەکات. هەروەها حکومەتێکی تریش کە لەبەر بەرژەوەندی‌یە نزمە بێ‌کەڵکەکانی، دەچێت لە ناوەندی موسڵمانان و ئاسیادا بەگشتی تۆوی ئیلحاد دەچێنێ و پەیمان لەگەڵ چەند حکومەتێکی فێڵبازی گەورەدا دەبەستێت..

جا ئەگەر هەریەك لە کەسی مەعنەویی حکومەتی یەکەم و کەسی مەعنەویی حکومەتە هاوپەیمان و لایەنگرەکانی ئیلحاد بەرجەستە ببن، ئەوا لە سێ ڕووەوە یەکێك لە واتا زۆر و زەبەندەکانی ئەم فەرموودەیە لەم ڕۆژگارەدا دەردەکەوێت. خۆ ئەگەر لە ئەنجامی جەنگەوە حکومەتە زاڵەکە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوا ئەم واتا "ئاماژەیی"یە بۆ پلەی واتای صەریح بەرز دەبێتەوە. گەر بە تەواوەتیش سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت، ئەوا ئەم واتایە هەر واتایەکی ئاماژەیی گونجاو دەبێت:

---

(١) بەلشەفیك: ئایدۆلۆژیای شیوعی‌یەکانی ڕووسیا بووە. (وەرگێڕ)

○ ڕووی یەکەم:

بریتی‌یە لەو کۆمەڵە ڕۆحانی‌یەی کە دەستیان بـە ئـایینی ڕاستەقینەی عیسـاییەوە گرتووە و، دەستە و کۆمەڵێکیان لە بەرامبەرەوەیـە کـە بـرەو بـە ئیلحـاد دەدەن. جـا ئەگـەر ئـەو دوو کۆمەڵـە هەریەکـەیان لـە شـێوەی مرۆڤێکـدا بەرجەستە بـبن، ئـەوا کۆمەڵی یەکەم هێشتا هێندەی منداڵێك نابن لە بەردەم کەسێکدا کـە بـاڵای هێنـدەی منارەیەك بێت!

○ ڕووی دووهەم:

حکوومەتێك کە دانیشتووانی سەد ملیۆن کەسن، بە ڕەسمی ڕایدەگەیـەنێت کـە من ئیلحـاد لـەناو دەبەم و ئیسـلام و موسـڵمانان دەپارێزم، لەگـەڵ حکوومـەتێکدا دەجەنگێت کە حوکمی چوارسەد ملیۆن کەس دەکات و لـەگەڵ چین و ئـەمریکادا هاوپەیمانە، واتە بـە چوارسـەد ملیـۆن کەسـەوە دەجـەنگێت و بـە ئاشـکرا لەگـەڵ بەلشەفی‌یەکاندا هاوپەیمانە. جا ئەگەر جەنگاوەرانی حکوومەتی یەکەم کە گورزی جـەرگبڕ لـەو هاوپەیمانانـە دەسـرەوێنن، لـە کەسـێکی مەعنـەویدا دەربکـەون و، مولحیدان و هاوپەیمانەکانیشیان لـە کەسـێکی مەعنـەویی تـردا بەرجەستە ببن، ئەوا شێوەی مرۆڤێکی بچووك دەبینرێت لە بەرامبەر مرۆڤێکی ترەوە کـە بـاڵای هێنـدەی منارەیەك بەرز بێت.

لە ڕیوایەتێکدا ئەوەش هاتووە کە دەجاڵ حوکمی دنیا دەکات. جا ئەم ڕیوایەتـە ئەوە دەگەیەنێت کە زۆرینەی خەڵکی لایەنی دەگرن، وەك ئێستا لە پێش‌چاودایە.

○ ڕووی سێ‌هەم:

حکوومەتێك کە ڕووبەری خاکەکەی هێندەی ڕووبەری ئـەورووپا نـابێت – کـە بچووکـترینی چـوار کیشـوەرەکانە – بـە سـەرکەوتنەوە لەگـەڵ دەوڵـەتێکدا دەجەنگێت کە بەسەر زۆربەی شوێنەکانی جیـهان لـە ئاسیا و ئەفریقا و ئـەمریکا و ئوستورالیادا خۆی سەپاندووە و، حکوومەتی یەکەم لە بەرامبەر تەوژمە ئیلحادی‌یە دیکتاتۆری‌یەکانەوە پاڵی بە ئایینـەوە داوە و هاوپەیمانـە لەگـەڵ دەوڵـەتێکدا کـە

ئیددیعای وەکالەت و بریکاری حەزرەتی عیسا دەکات و، بە پەرەشووت بەسەر ئەو تەوژمە ئیلحادییەدا دادەبەزن. جا ئەگەر هەردوو لایان بە وێنەی مرۆڤێك شێوەیان بکێشرێت، وەکو ڕۆژنامەکان وێنەی کاریکاتێرییان بۆ دەرخستنی هێزی دەوڵەت و پلەی حکوومەتەکان دەکێشا، ئەوا یەکێك لە واتا زۆرەکانی ئەم فەرموودە پیرۆزە بە تەواوی لەسەر ڕۆژنامەی زەوی و لاپەڕەی ئەم چەرخەدا دەردەکەوێت.

تەنانەت یەکێك لە واتا ئاماژەییەکانی فەرموودەی نازڵ بوونی کەسی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - لە ئاسمانەکانەوە، ئەوەیە:

تاقمێك، کە نوێنەری حەزرەتی عیسان و ڕێبازەکەی ئەو دەگرن، لە فڕۆکەکانەوە بە پەرەشووت وەك بەلایەکی ئاسمانی بەسەر دوژمنانیاندا و لە پشتیانەوە و بە شێوەیەك کە تا ئێستا کەس نەیبیستووە و نەیدیوە، دادەبارێن. ئەمەش واتای ماددیی نازڵ بوونی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - دەردەخات.

بەڵێ، واتای دابەزینی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - کە لە فەرموودەی پیرۆزەوە وەردەگیرێت، بە جۆرێکی بێ گومان چەسپاوە، بەلام واتا ئاماژەییەکەی هەروەك بە ئیعجاز ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات، لە هەمان کاتدا ئاماژەی بۆ گەلێ واتای تریش تێدایە.

کاتێ لەبەر وەڵامی پرسیار و جەختی "فەیزی" و "ئەمین" و بۆ ڕزگار کردنی ئیمانی هەندێ لە عەوامە لاوازەکان دەستم دایە نووسینی چەند دێڕێك لەم مەسەلەیە، بەبێ ویستی خۆم نووسینەکە درێژەی کێشا و حیکمەتی ئەمەشمان نەزانی. ئنجا بە بێ دەستکاری و وەك خۆی هێشتمانەوە، نەبادا حیکمەتێکی تێدا بێت. داوای لێبوردنیشتان لێ دەکەین کە کاتێکی فراوانمان بۆ پاکژ و پێداچوونەوەی ئەم باسە بە دەستەوە نەبوو، بۆیە بە ئاڵۆزی مایەوە.

* * *

(هاورێیەتیی پاڵەوانان)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بعدد حروف القرآن

برا ئازیز و هاورێ ڕاستەکانم!

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە پیت و بەرەکەت بخاتە ناوتانەوە و بەختەوەریتان پێ ببەخشێت.

هەوڵی گەرموگوڕ و چالاکیی بەردەوامتان، شەوق و هیممەتەکان لێرە و لە شوێنەکانی تریشدا دەورووژێنن. سوپاسی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە، کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فتووحاتی پەیامەکانی نوور لە زیادبووندایە و، ئیمانداران پەی بە زام و برینەکانی خۆیان دەبەن و بە "پەیامەکانی نوور" تیماریان دەکەن.

سوپاس بۆ خوا، لەم ڕۆژگارەدا ئەو قوتابیانەی نوور کە لە ناوەندی سوننەتی خاوێندا ئیمانی کاملیان بەدەست هێناوە، ڕێبازێکی ئەوتۆیان گرتووەتە بەر کە سەرنجی ئەولیا و مورشیدەکان ڕادەکێشێت. بۆیە ئەو ڕابەر و مورشیدە ڕاستەقینانەی کە لە هەموو سەردەمێکدا پەیدا دەبن، بێ هیچ گومانێك، هەوڵ دەدەن قوتابیانی نوور ڕابکێشنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە، چونکە گەر مورشیدێك بتوانێت یەك قوتابیی نوور دەستی خۆی بخات، ئەوا لە جێی بیست موریدا دایدەنێت!

وا لە خوارەوەدا ئەو ڕاستییەتان بۆ دەنێرم کە لە بارەی گیروگرفتەکانی خزمەتی پەیامەکانی نوور و، ئەو موجاهەدە و خۆبەخشینەیە کە لەم ڕێگایەدا هەیە لە بەرامبەر چێژ و کێشەکانی ویلایەتەوە و، بۆ "فەیزی"م ڕوون کردووەتەوە. وا بۆ ئێوەشی دەنێرم، بەڵکو سوودێکی بۆ ئەو ناوچانەش تێدا بێت.

سڵاوم بە یەك بە یەکی برایانم بگەیەنن.

برام "فەیزی"!

ئەگەر دەتەوێت لە پاڵەوانەکانی پارێزگای "ئیسپارتە" بچیت، ئەوا دەبێت لە هەموو شتێکدا وەك ئەوان وابیت..

لە بەندیخانەدا شێخێکی مەزن و ڕابەرێکی گەورە و کەسێتی‌یەکی خاوەن جازیبیەتمان لە ئەولیایانی تەریقەتی نەقشبەندی - خوا لێی خۆش بێت - لەگەڵدا بوو. ئەم شێخە بۆ ماوەی چوار مانگ لەگەڵ نزیکەی شەست قوتابیی نووردا دانیشت و تێکەڵیان بوو، هەروەك گەلێ قسە و وتووێژی لێزانانەی بۆ کردن تاکو هانیان بدات بڕۆنە ناو تەریقەتەوە. بەڵام تەنها یەکێکیان نەبێت - ئەویش بە شێوەیەکی کاتی - نەیتوانی کەسیان ڕابکێشێتە لای خۆی!

ئەوان هەرچەند دەیانزانی ئەو کەسە وەلی و پیاوچاکە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پێویستی‌یەکیان پێی نەبوو، چونکە ئەو خزمەتگوزاری‌یە ئیمانی‌یەی کە پەیامەکانی نوور پێشکەشی کردبوون و ئاسوودەییان تێدا بە دەست هێنابوو، سەروزیادیان بوو. ئەو پاڵەوانانە بە دڵی بێدار و بەسیرەتی بینەری خۆیان لەم ڕاستی‌یەی خوارەوە تێگەیشتبوون:

خزمەتگوزاریی پەیامەکانی نوور بریتی‌یە لە: "ڕزگار کردنی ئیمان". بەڵام تەریقەت و مەشیەخەت "پلەکانی ویلایەت" دەستی مرۆڤ دەخەن..

ئاشکرایە کە ڕزگار کردنی ئیمانی کەسێك گەلێ گرنگتر و پاداشتەکەشی یەکجار زۆرترە لە بەرزکردنەوەی (دە ئیماندار) بۆ پلەی "ویلایەت". چونکە ئیمان بەختەوەریی هەمیشەیی دەستی مرۆڤ دەخات و موڵکێکی لە زەوی فراوانتری بۆ بەدەست دەهێنێت، بەڵام ویلایەت بەهەشتی ئیماندار فراوانتر و گەشاوەتر دەکات. جا هەروەك بەخشینی پلەی "پادشایی" بە مرۆڤێکی ئاسایی گەورەترە لە بەرز کردنەوەی (دە سەرباز) بۆ پلەی "فەرماندە"، پاداشتی ڕزگار کردنی ئیمانی مرۆڤێکیش بە هەمان جۆرە؛ گەلێ مەزنترە لەوەی (دە کەس) بگەیەنرێنە پلەی ئەولیا و پیاوچاکان.

"دڵ"ی برایانی "ئیسپارتە"ت بە گشتی ئەم نهێنییەیان بینیبوو، هەرچەندەش "عەقڵ"ی هەندێکیان نەیدیبوو..

لەبەر ئەوە، هاوڕێیەتیی کەسێکی لاوازی گوناهباری وەك منیان گەلێ پێ باشتر بوو لە هاوڕێیەتیی چەندەها ئەولیای گەورە گەورە، تەنانەت لە هاوڕێیەتیی موجتەهیدانیش، گەر لەم سەردەمەدا بین.

جا لەم ڕوانگەیەوە و لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە:

ئەگەر قوتبێك لە ئەولیاکان، یان شێخێکی گەورەی وەکو "گەیلانی" بێت بۆ ئەم شارە و پێت بڵێ: "لە ماوەی (دە ڕۆژدا) دەتگەیەنمە پلەی ویلایەت".. تۆیش شوێنی بکەویت و واز لە "پەیامەکانی نوور" بهێنیت، ئەوا ناتوانی ببیت بە هاوەڵی پاڵەوانەکانی "ئیسپارتە"!

* * *

(تەرازوویەکی ورد لەناو گفتوگۆیەکدا)

"ئەم گفتوگۆیەم بە دڵدا هات و، بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو زیادەڕەوییە نووسیم کە هەندێ برایانم لە قوتابیانی نوور بەرامبەر من هەیانە، تاکو ئەو گومان باشی(حسن الظن)یە لەڕادەبەدەرمیان ڕێك بکرێتەوە".

نزیکەی پەنجا ساڵ پێش ئێستا ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوان من و کاکە مەلا عەبدوڵڵامدا - خوا لێی خۆش بێت - ڕووی دا. وا بۆ ئێوەشی دەگێڕمەوە:

کاکی خوا لێخۆشبووم یەکێك بوو لە موریدە تایبەتمەندەکانی "شێخی ضیائەددین - قُدّس سرّه[1]" کە یەکێکە لە ئەولیا و پیاوچاکەکان.

---

(١) یەکێکە لە ئەولیا و پیاوچاکان. ناوی: شێخ "ضیائەددین عەبدوڕڕەحمان تاغ"ە و، بە "سەیدا" بەناوبانگە و، خەڵکی گوندی "نوورشین"ی نزیك مەڵبەندی پارێزگای "مووش"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی تورکیایە. لە جیهادی جەنگی یەکەمی جیهانیدا قۆڵێکی لەدەست داوە و، سوڵتان ڕەشاد مەدالیایەك و قۆڵێکی دەستکردی پێ بەخشیوە. پاشان لە جیهادی جەنگەکانی سەربەخۆیی وڵاتدا (کە لە پێناوی وەدەرنانی داگیرکەران بەرپا کرابوو) بەشداریی کردووە. (وەرگێڕ)

وەك ئاشکرایە سۆفییانی تەریقەت خۆشەویستیی لە ڕادەبەدەر و زیادەڕەوی لە گومان باشیدا بە مورشیدەکەیان بە شتێکی ئاسایی دەزانن، بەڵکو پێیشی ڕازین. لەبەر ئەوە، ڕۆژێکیان کاکم پێی وتم:

- شێخی "ضیائەددین" زانیارییەکی یەکجار فراوانی هەیە و، بە چەشنی "قوتبی ئەعزەم" ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە کە لە بوونەوەردا ڕوودەدەن!

ئنجا گەلێ نموونەی لەسەر پایەبڵندی و کارە لەعادەت بەدەرەکانی ئەو بۆ گێڕامەوە، بۆ ئەوەی هانم بدات منیش پەیوەندیی لەگەڵدا ببەستم!

بەڵام من پێم وت:

- کاکی بەڕێزم! تۆ زیاد لە پێویست ڕۆدەچیت.. گەر ڕووبەڕووی شێخی "ضیائەددین" خۆیشی ببمەوە لە زۆر مەسەلەدا بە بەڵگە دەیبەستمەوە. ئەوەش بزانە تۆ - وەك من - بە خۆشەویستیی ڕاستەقینە ئەوت خۆش ناوێت، چونکە تۆ ئەو "ضیائەددین"ەت خۆش دەوێت کە لە زەینی خۆتدا بە شێوەی قوتبێکی ئەعزەم و ئاگادار بە هەموو شتێك لە بوونەوەردا ئەندێشەت پیشانتی دەدات! کەواتە تۆ بەم ناونیشان و سیفەتەوە پەیوەندیت لەگەڵ بەستووە و خۆشت دەوێت. خۆ ئەگەر پەردە لە ڕووی لابرێت و حەقیقەتی دەربکەوێت، ئەو خۆشەویستییەت نامێنێت، هیچ نەبێ کەم دەبێتەوە!

بەڵام من - ئەی کاکی بەڕێزم! - ئەو مرۆڤە پیاوچاك و وەلییە موبارەکەم وەك تۆ خۆش دەوێت، تەنانەت ڕێزی شایانیشی لێ دەگرم، چونکە:

ڕابەرێکی مەزنی ئیماندارانە و، لەسەر ڕێی حەقیقەتی شوێنکەوتەی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ. جا ئیتر پلەی ڕاستەقینەی ئەو هەرچییەك بێت با ببێت، من ئامادەم گیانی خۆم بۆ ئەو خزمەتگوزارییە ببەخشم کە ئەو پێشکەشی ئیمانی دەکات. خۆ ئەگەر پەردە لە ڕووی پلەی ڕاستەقینەی لابدرێت، من پشتی لێ هەڵناکەم و وازی لێ ناهێنم و پلەی خۆشەویستییەکەشم بۆی دانابەزێت، بەڵکو پتر پەیوەندیی لەگەڵدا پتەو دەکەمەوە و زیاتر ڕێزی دەگرم و خۆشم دەوێت.

کەواتە - کاکی بەڕێزم! - من "ضیائەددین"م خۆش دەوێت بەو جۆرەی کە هەیە و لەسەر ئەو حەقیقەتەی کە تیایدایە. بەڵام تۆ ئەو "ضیائەددین"ەت خۆش دەوێت کە لە ئەندێشەتدایە[1]!

جا لەبەر ئەوەی کاکی خوالێخۆشبووم بە ڕاستی زانایەکی "بەویژدان" بوو، ڕاکەی منی پەسەند کرد و ڕەزامەندیی لە بەرامبەرەوە دەربڕی و وەری گرت و ڕێزی لێ نا.

دەسا برایانم! ئەی ئەو بەختەوەرانەی کە خۆتان لە پێناوی خوادا بەخت دەکەن!

هەرچەند زیادەڕەویتان لە گومانی باشدا بە من زیانتان پێ ناگەیەنێت، بەڵام کەسانی وەك ئێوەی عەودالی ڕاستی و حەقیقەتبین کاتێ بۆ هەرکەسێك دەڕوانن دەبێت لە گۆشەی خزمەتیەوە بۆ قورئان و ڕادەی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیەوە بەرامبەر قورئان، بۆی بڕوانن. خۆ ئەگەر پەردە لە ڕووی "ڕاستی"ی منی سەرتاپا خلتانی ناو چڵکی قسوور هەڵبماڵرێ، ئەوا بەزەییتان بە حاڵمدا دەهاتەوە و خەمتان بۆ دەخواردم. بەڵام لەو خۆشەویستیی برایەتییە کە یەکیخستووین دوورتان ناخەمەوە. ئنجا بۆ ئەوەش لێی پەشیمان نەبنەوە، ئەوا خۆتان بەو پلەوپایانەوە مەبەستن کە بە تەسەووری خۆتان بۆ منی دادەنێن و لە توانا و سنووری من گەلێ بەدەرن، چونکە من جگە لە برایەکی ئێوە هیچی تر نیم و، لافی ڕابەری و ڕێنوێن و مامۆستایەتی لێ نادەم. تەنها هاوڕێیەکی ئێوەم لە وەرگرتن و خوێندنی وانەی ئیماندا. کەواتە چاوەڕوانی هیممەت و یارمەتی مەبن لە من، بەڵکو من موحتاجی یارمەتی و هیممەتی ئێوەم و، تکاکارم دوعای پڕ شەفەقەت بۆ تەقسیرەکانم بکەن.

خوای گەورە بە چاکەکاری و فەزڵی خۆی نیعمەتێکی بە هەموومان بەخشیوە و، لە خاوێنترین و پیرۆزترین و مەزنترین و سوودمەنترین خزمەتگوزاریدا

(١) چونکە لە بەرامبەر خۆشەویستییەکەتەوە نرخێکی زۆر گرانت دەوێت، لەوەتا لە بەرامبەر ئەو خۆشەویستییەوە بیر لە شتێکی سەد قاتی ئەو نرخە دەکەیتەوە، لە کاتێکدا کە مەزنترین خۆشەویستی لە بەرامبەر پلە و پایەی ڕاستەقینەی ئەو زاتەوە هێشتا هەر بە کەم دادەنرێت. (دانەر)

بۆ ئیمانداران خستووینیەتەکار، کە خزمەتی قورئانی پیرۆزە و، بەپێی کار دابەش کردنی نێوانمان بۆ ئەو خزمەتە هانی داوین. کەواتە ڕێنمایی و مامۆستایی کەسی مەعنەوی کە لە نهێنیی برایەتی و یەکێتیمانەوە پەیدا بووە، سەروزیادمانە.

جا مادەم خزمەتی ئیمان و قورئان لە هەموو خزمەتێکی تری ئەم چەرخە بەرزترە..

مادەم "چۆنێتی" لە "چەندایەتی" باشترە..

مادەم تەوژمە سیاسی‌یە هەمیشە بگۆڕەکان و، ڕووداوەکاتی و لەناوچووەکانیش لە بەردەم خزمەتە بەردەوام و دامەزراوەکانی ئیماندا هیچ بایەخێکیان نی‌یە، تەنانەت هەر ناشگەنە پلەیەکی ئەوتۆ کە لەگەڵیدا بەراورد بکرێن و، ناگونجێن ببن بە تەوەرەی ئەو خزمەتە..

ئەوا دەبێت:

بەو پلە نوورانی‌یەی کە خواوەندی مەزن و پەروەردگارمان لە نووری قورئانی پیرۆزەوە پێی بەخشیوین، ڕازی و دڵنیا بین.

دەسا برا خۆشەویستەکانم!

دامەزراوی.. دامەزراوی!! وەفاداری.. وەفاداری!!

دەبێ ئێمە تەنها لە پەیوەندی و پشتگیریی یەکتر و هەوڵداندا بۆ دەستخستنی برایەتی و ئیخلاسی ڕاستەقینە ڕۆبچین و، ئەم ڕۆچوونەش بکەین بە ڕێیەك بۆ بەرزی و بڵندیمان. لە بریی ئەوەی زیادەڕەوی بنوێنین لە گومانی باش بە یەکتر و چاوگێڕان بۆ چەشنە پلە و پایەیەك کە لە سنووری خۆمان بەرزتر بێت.

* * *

(هەندێك لە کار و ئەرکەکانی حەزرەتی مەهدی)

برایانی ئازیزم!

بە مەبەستی تەواوکردنی ئەو وەڵامەی کە پێشتر بۆم نووسین سەبارەت بە گومان باشیی ئێوە، کە هەڵقوڵاوی وەفای خاوێن و بێگەردتانە بەرامبەر بە من و، زۆر لە

سەرووی سنووری خۆمەوە دەرتان بڕیبوو، دوو ڕۆژ لەمەوبەر ئەم دوو بڕگەیەی خوارەوەم نووسی..

وەلامەکەی حەفتەی پێشوو، کە تاڕادەیەك ئەو گومان باشییەی ئێوەی زامدار کرد کە لە نامەکەتاندا دەبینرا و ئەنجامی وەفای بێگەرد و هیممەتی بەرزتان بوو، حیکمەتەکەی ئەمەی خوارەوەیە:

لەم چەرخەدا چەند تەوژمێکی هێندە بەهێز هەن کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵن و، هەر شتێك بێتە بەردەستیان لە پێناوی خۆیاندا بەکاری دەهێنن، وەك ئەوەی موڵکی خۆیان بێت.. جا ئەگەر بە ڕاستی ئەو کەسە چاوەڕوانکراوە لەم چەرخەدا بێت، ئەوا من پێم وایە ئامانجەکەی دەگۆڕێت و، خۆی لەو کەش و بارودۆخانەی جیهانی سیاسەت دادەماڵێت، تاکو هەوڵ و کۆششەکانی بپارێزێت و نەهێڵێت ئەو تەوژمانە بۆ خۆیان زەوتی بکەن!

پاشان سێ مەسەلە لە گۆڕێدا هەیە:

ژیان.. شەریعەت.. ئیمان.

"مەسەلەی ئیمان" لە ڕوانگەی حەقیقەتەوە گرنگترین و گەورەترینی ئەم سێ مەسەلەیە. کەچی لە بەرچاوی خەڵکیدا بە گشتی و لە ناوەندی داخوازییەکانی بارودۆخی جیهاندا: "ژیان" و "شەریعەت" گرنگترینی ئەو مەسەلانەن!

جا لەبەر ئەوەی گۆڕینی بارودۆخەکانی هەر سێ مەسەلەکە پێکەوە و بە یەك جار لە سەرانسەری زەویدا، هەرگیز لەگەڵ ئەو یاسا و سوننەتەی خوای گەورەدا ناگونجێت کە لە ڕەوتی ژیانی گرۆی مرۆڤدا دەست بەکارە، ئەوا گەر ئەو کەسە چاوەڕوانکراوە لە کاتی ئێستادا هەبێت، گرنگترین و گەورەترینی ئەو مەسەلانە دەکات بە بناغەی کارەکانی، نەك مەسەلەکانی تر، تاکو لە پێش چاوی زۆرینەی خەڵکیدا خاوێنی و بێگەردیی خزمەتی "ئیمان" لەدەست نەچێت و لە ژێریی عەوامەکاندا - کە لەوانەیە بە ئاسانی لە خشتە ببرێن - ئەو ڕاستییە جێگیر بکرێت کە: ئەم خزمەتە هەرگیز ئامراز و هۆکارێك نییە بۆ هیچ ئامانجێکی تر.

پاشان وا ماوەی بیست ساڵە پاچی کاولکردن و ڕووخاندن کەوتووەتە کارڕ و، توندوتیژترینی جۆرەکانی ستەم و خۆسەپاندن بۆ تێکدانی خوورەوشت بەکاردەهێنێت. تەنانەت متمانە و وەفاداری بە ڕادەیەك نەماوە و لەناوچووە کە لە نێوان دە کەس بەڵکو بیست کەسدا باوەڕ و متمانە بە یەك کەس ناکرێت!

جا لە بەرامبەر ئەم حاڵەتانەی کە مرۆڤ سەرسام دەکەن، پێویست بە: دامەزراوی‌یەکی گەورە و، توندوتۆڵی و بەتینی‌یەکی تەواوەتی و، وەفایەکی بێگەرد و، غیرەتێك بۆ ئیسلام دەکات کە لە سەرووی هەموو شتێکەوە بێت، دەنا "خزمەتی ئیمان" نەزۆك و بێ ئەنجام و تەنانەت زیانبەخش دەردەچێت!

بەو واتایەی کە: خاوێنترین و بەرزترین و گەرمترین و لەپێشترینی ئەو خزمەتانە کە شایانی سەرکەوتن بێت، ئەو خزمەتە بەرزەیە کە قوتابیانی پەیامەکانی نوور ئەنجامی دەدەن.

بە هەرحاڵ.. ئەم ئەندازەیە لەم کاتەدا بۆ ئەم مەسەلەیە سەروزیادە.

* * *

(خەتمەی بەکۆمەڵ)

برا ئازیزە بەوەفاکانم!

یەکەم: پیرۆزبایی شەوی "بەرات" و مانگی ڕەمەزانی داهاتووتان لێ دەکەم و، لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە پاداشتی شەوی "قەدر" لە خێری هەزار مانگ زیاتر بۆ ئێمە و ئێوە لە تۆماری کردەوەکانماندا بنووسێت.

بڕیارمان داوە کە هەتا جەژن ئەم دوعایە بڵێینەوە:

"اللهم اجعلْ ليلةَ القَدْرِ في رمضانِنا هذا خيراً من ألفِ شهرٍ لنا ولطلبةِ رسائلِ النورِ الصادقين".

جزمەکانی دوو خەتمەی بەکۆمەڵی قورئانی پیرۆزمان دابەش کرد بەسەر قوتابیانی نووری "خەواص"دا، تاکو هەریەکەیان هەموو ڕۆژێك جزمە تایبەتەکەی

خۆی بخوێنێت و، بەم جۆرە هەموو ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە کۆڕێکی مەعنەویی یەکجار فراواندا، کە هەردوو پارێزگای "ئیسپارتە" و "قەستەمۆنی" بگرێتەوە، دوو خەتمەی قورئانی پیرۆز بکرێت کە "قوتابیانی پەیامەکانی نوور" لە ناوەڕاستی ئەو دوو مەجلیسەدان و هەریەکەیان بەو نیازە دەیخوێنێت کە هەموو قوتابیانی تری لەگەڵدایە. لە خوای گەورە داواکارین لەمەدا سەرمان بخات.

* * *

(بەشداری لە کارەکانی سەر بە دواڕۆژدا)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بقدر حاصل ضرب عاشرات دقائق ليلة القدر في حروف القرآن

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

یەکەم:

پڕ بە گیان و هەناوی خۆم پیرۆزبایی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزتان لێ دەکەم و، لە خواوەندی میهرەبان دەلاڵێمەوە کە هەموو دوعاکانی ئەم مانگە پیرۆزەتان لێ وەربگرێت.

دووهەم:

مانگی ڕەمەزانی ئەمساڵ سەبارەت بە جیهانی ئیسلامی - بە گشتی - گرنگییەکی زۆری هەیە، هەروەها سەبارەت بە قوتابیانی نووریش، بەپێی ناوەرۆکی دەستووری "بەشداری لە کردارەکانی سەر بە دواڕۆژدا" کە دەستوورێکی بنەڕەتییە لە نێوان قوتابیانی پەیامەکانی نووردا. چونکە چ میهرەبانیی خوای گەورە و چ ئەو دەستوورەش خوازیاری تۆمارکردنی سەرجەم

کردەوە چاکەکانی هەموو یەکێکی قوتابیانن لە دەفتەری کردەوە چاکەکانی برایانیدا. لەبەر ئەوە، هەرکەسێك بە ڕاستی و ئیخلاسەوە بڕواتە ناو بازنەی پەیامەکانی نوور، دەستکەوتی لە ڕووی چاکەکاری‌یەوە گەلێ گەورە و گشتی دەبێت، چونکە هەر یەکەیان هەزاران بەشی لەو کردەوە چاکانەدا هەیە.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ئەم هاوبەشی‌یەمان لە کردەوەی چاکدا، بە وێنەی هاوبەشی ماڵ و سامانی دنیا - بەڵام بە بێ لەت بوون - لێ قبووڵ بکات و، بە تەواوی و بە وێنەی ڕۆشتنی ڕووناکیی چرایەك بۆ ناو هەزاران ئاوێنە، چاکەی هەر برایەك بڕواتە ناو دەفتەری چاکەکاریی هەموو یەکێ لە برایانی. بەو واتایەی کە ئەگەر یەك کەس لە قوتابی‌یە ڕاستەکانی "پەیامەکانی نوور" حەقیقەتی شەوی "قەدر" بەدەست بهێنێت و بتوانێت پلەی بەرزی مانگی ڕەمەزانی دەست بکەوێت، ئەوا هیوایەکی گەورەمان بە میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە هەیە کە ئەو دەستکەوتە بکات بە موڵك و دەستکەوتی هەموو قوتابی‌یە ڕاستەکان.

* * *

(ئافرەتان لە ڕێی خزمەتگوزاریی نووردا)

بۆ برایانی ئازیز و بەوەفا و قارەمان و پیرۆزم!

یەکەم:

هەموو یەکێك لە برا تایبەتمەندەکانمان لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا وەك ئەو مەلائیکەتانە وایە کە چل هەزار زمانیان هەیە. واتە چل هەزار زمانی مەعنەویی بە ژمارەی برایانی هەیە! ئەمەش بەپێی دەستووره بنەڕەتی‌یەکەمان کە دەستووری بەشداری کردنە لە کارەکانی سەر بە دواڕۆژدا. لەبەر ئەوە، ئومێدێکی زۆرمان بە میهرەبانیی خوای گەورە هەیە کە بە ژمارەی ئەو زمانانە سەرجەمی ئەو دوعایانە گیرا بکات کە لەم مانگە پیرۆزەدا کردوویانە یان دەیکەن. دەسا ئەم مانگی ڕەمەزانەتان لێ پیرۆز بێت کە ئەم دیاری‌یە بەنرخەی لەگەڵ خۆدا هێناوە.

دووهەم:

دەبوو وەڵامی نامەکانی ئەم جارەتـان (کـە زۆر و، کاریگـەر و، دڵخۆشـکەر و، مژدەدەر بوون) کتێبێکی تەواوەتی و گەورە بوایـە! بـەڵام کـەم وەختـی ڕێـی ئەمـەی لـێ گرتین و.. لە وەڵامە کورتەکەیان دڵگران مەبن.

هەزار هەزار جار سوپاس بۆ خوای گەورە کە خوشکان و دایکانی پیرۆزی ئـەو گونـدە - گونـدی سـاو -[١] پەیامـەکانی نووریـان ناسـیوە و ڕێـزی شـایانیان لـێ گرتـووە. فیداکـاریی ئـەو ئافرەتـە ئـازیز و خوشـکە دڵسـۆزانەی ئاخـیرەتم لـە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نـووردا، فرمێسـکی دڵخۆشـیی بـە چـاوی مـن و هـەموو برایانیشدا هێنا!

ئاشکرایە گرنگترین بناغەی ڕێبازی پەیامـەکانی نـوور بریتی‌یـە لـە "شـەفەقەت". جا لەبەر ئەوەی ئافرەتان سەرچاوە و کانگای شەفەقەتن، ئەوا ماوەیەکە چـاوەڕوانم جیهانی ئافرەتان ناوەرۆکی "پەیامەکانی نوور" تێبگەن. سوپاس بۆ خوا خوشـکانی دەوروبەرمان لە پیاوان زیاتر بە شـەوق و کارامـەیی و گەرموگوڕی‌یـەوە لـێرە کـار دەکەن و، بەمەش چەسپاندیان کە ئەمانەی ئێرە خوشکانی پیرۆزی ئەوانەی گوندی "سـاو"ن. ئەم دوو دیاردەیە گەشبینیی ئـەوەم دەدەنـێ کـە پەیامـەکانی نـوور بـە درەخشانی دەڕۆنە ناو دڵی ئەو ئافرەتانەی کە کانگای شەفەقەتن.

پاشان شوانە ئازاکانی گوندی "ساو"یش کە پەیامەکانی نوور لە هەگبەکانیاندا هەڵدەگرن، تاکو بە دەسـتی نووسـەرەوەکانیان بگەیـەنن، کتومـت وەك خوشـکانی ئەوێ خۆبەختکاری و قارەمانێتی‌یەکی ئـەوتۆیان نوانـدووە کـە هیمـمـەت و شـەوق لەم ناوچانەشدا دەورووژێنێت.

پێمـان خۆشـە نـاوی ئـەو شـوان و خوشـکە بەڕێزانـە بزانـین، تـاکو بـە ناوەکـانی خۆیان بڕۆنە ناوەندی قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانەوە.

---

(١) گوندی "ساو" نزیکە لە "بارلا" کە مامۆستا نوورسی لەوێ نەفی بووە. سەرانسـەری خـەڵکی ئەم گونـدە بە پیر و لاو، ژن و پیاویانـەوە، لـە ڕێـی نووسـینەوە و بڵاوکردنـەوەی پەیامـەکانی نـوورەوە، سەرگەرمی خزمەتی ئیمان بوون. (وەرگێڕ)

(دوو ڕووداوی پڕ لە پەند) ٠

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

دوو ڕووداوی خۆشتان بۆ دەگێڕمەوە کە پەند و مژدەیان تێدایە:

● یەکەمیان: (ڕووبەڕوو بوونەوەی گوناهە هێرش بەرەکان)

بێدارکردنەوەیەکی مژدەهێنەرە و لە ئەندێشـەیەکی نـائومێدی بەخشـەوە سـەری هەڵداوە. چونکە لەم ڕۆژانەدا ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە:

کەسێك تێکەڵی ژیانی کۆمەڵایەتی ببێت، کاتێ توخنـی هـەر شتێك دەکـەوێت زۆربەی جار هەزاران گوناهـ ڕووبەڕووی دەبنەوە، چونکە گوناهـەکان لـە هـەموو لایەکەوە دەوراندەوری مرۆڤیـان داوە. جـا ئایـا چۆن پەرستش و تـەقوای تایبـەتیی مرۆڤ دەتوانن لە بەرامبەر ئەم هەموو گوناهانەوە ڕابووەستن؟

بە بیرکردنەوەی نائومێدانە سەرنجم لەم مەسەلەیە دا. چونکە بـیرم لـە حـاڵی ئـەو قوتابیانەی "پەیامەکانی نوور" کردەوە کە تێکـەڵی ژیـانی کۆمەڵایـەتی بـوون و، لـە هەمان کاتیشدا چەند ئاماژەیەکی قورئانی پیرۆز و مزگێنییەکانی ئیمـامی عـەلی و شێخی گەیلانیم هاتەوە یاد سەبارەت بەوەی قوتابیانی پەیامەکانی نوور - پشت بە خوا - ڕزگاریان دەبێت و لە بەختەوەرانی دوارۆژ دەبن..

لە دڵی خۆمەوە وتم:

چۆن قوتـابیی پەیامـەکانی نـوور دەتوانێـت بـە یـەك زمـان ڕووبـەڕووی هێرشـی چـەندین گوناهـ بووەستێت کـە لـە هـەزار لاوە دەکرێتـە سـەری و، چۆن بتوانێـت بەسەریاندا سەربکەوێت و ڕزگاری ببێت لێیان؟

یەکەم جار ئەم تێڕامانە دووچاری سەرسامیی کردم. بـەڵام دوایـی بەرامبـەر بـەو سەرسامییە ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

بەپێی دەستووری بنەڕەتیی: "بەشداری لـە کارەکـانی سـەر بـە دوارۆژدا" کـە قـوتابییە ڕاستەقینە و ڕاستەکانی پەیـامەکانی نـوور لـە نێـوان خۆیـاندا کـاری پێ دەکـەن و.. بـەهۆی نـهێنیی پشتگیری و هاوپەیوەندیی خـاوێنی نێوانیـان، هـەموو یەکێك لـە قوتابییـە یێگـەرد و ڕاستەکان، نـەك تەنـها بـە یـەك زمـان، بـەڵکو بـە

ئەندازەی زمانی هەموو برایانی، ئەرکی خواپەرستی ئەنجام دەدات و بە ئەندازەی ئەو زمانانەش داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکات و، بە هەزاران هەزار زمانی خواپەرست و دەم بە "ئیستیغفار" ڕووبەڕووی ئەو گوناهانە دەبێتەوە کە لە هەزار شوێنەوە هێرشی بۆ دەبەن.

قوتابییەکی ڕاستەقینە و بێگەرد و خاوەن تەقوا، کە بە وێنەی ئەو مەلائیکەتانەی بە چل هەزار زمان تەسبیحاتی خوا دەکەن، ئەویش بە چل هەزار زمانی برایانی پەرستشی بۆ خوای گەورە دەردەبڕێت، پشت بە خوا ئەم قوتابییە، ڕزگاری دەبێت و، دەڕواتە ڕیزی بەختەوەرانەوە و، بە وەفاداریی بێگەرد و بەپێی پلەی خۆی و بە ئەندازەی کرداری خاوێن و گەرموگوڕی لە بازنەی پەیامەکانی نووردا و، پابەند بوونی بە تەقوا و، دوورەپەرێزیی لە گوناهە گەورەکان، دەبێت بە خاوەنی پەرستشێکی بەرزی گشتی!

جا بۆ ئەوەی ئەم قازانجە گەورەیە لە دەست نەدات، دەبێ بەوپەڕی لێبڕانەوە لە تەقوا و ئیخلاس و وەفادا ڕۆبچێت و تێبکۆشێت.

● دووهەمیان: (جوببەکەی مەولانا خالید)(١)

یەکەم:

کاتێ کە تەمەنم چواردە ساڵان بوو چەند ڕێگرێك بوون بەهۆی ئەوەی کە هیچ مامۆستایەك مێزەرم بۆ نەپێچێتەوە و جوببەم لەبەر نەکات، وەك نیشانەیەك لەسەر

(١) مەولانا خالید کوڕی ئەحمەدی کوڕی حسەینە و لە تیرەی جافی میکایلییە و لە ساڵی ١١٩٣ك لە شارۆچکەی قەرەداخی سەر بە پارێزگای سلێمانی لە کوردستانی باشوور لە دایك بووە و لە ساڵی ١٢٤٢ك لە شام بە نەخۆشیی تاعوون کۆچی دوایی کردووە. لە زانست و تەقوادا یەکەمی چەرخ و ڕۆژگاری خۆی بووە و، تەریقەتی نەقشبەندیشی لە شێخ عەبدوڵڵای دیهلەوی وەرگرتووە. مەولانا نوێکار(مجدد)ی سەردەمی خۆی بووە و چەندین زانای گەورە لە خزمەتیدا بڕوانامەی زانستییان وەرگرتووە و چەندەها ئەولیاش لەسەر دەستیدا پێگەیشتوون. ئەم جوببەیەش کە لێرەدا ناوی هاتووە لە قوتابییەکی مەولاناوە بە میراتی بۆ "ئاسیا خانم" ماوەتەوە کە ئەویش لە ڕێی یەکێك لە قوتابیانی نوورەوە ناردوویەتی بۆ مامۆستا نوورسی و، مامۆستاش تا کۆتایی تەمەنی خۆی پارێزگاریی لێ کردووە و، ئێستا لە لایەن قوتابیانیەوە لە شاری ئورفەی کوردستانی سەر بە تورکیا پارێزراوە. (وەرگێڕ)

بەڵگەنامەی زانستی، کە جاران وەك نەریتێك لە ئاهەنگی وەرگرتنی ئیجازەی زانستیدا باو بوو. چونکە لەبەرکردنی جوببە، کە پۆشاکی زانایان و کەسانی تەمەن گەورەیە، لەگەڵ تەمەنی بچووکی ئەو کاتەی مندا نەدەگونجا.

دووهەم:

زانایانی ئەو کات و سەردەمە، لە بەرامبەر منەوە یان لە هەڵوێستی موونافیسدا بوون، یان بە تەواوی تەسلیم بووبوون. بۆیە نەیانتوانی وەك مامۆستا لە بەرامبەرمەوە خۆیان بنوێنن. پاشان لەبەر ئەوەی کە چەند ئەولیایەکی مەزن کۆچی ماڵئاواییان لەم دنیایە کردبوو ئەوا کەس ئەو شایستەییەی لە خۆیدا نەدەبینی جوببەم لەبەر بکات و مێزەرم بۆ بپێچێتەوە. چونکە پەنجا ساڵ پێش ئێستا من مافی ئەوەم هەبوو کە ئەم نیشانە ڕواڵەتی‌یەی بەڵگەنامە و ئیجازە وەرگرتن بەدەست بهێنم، کە بریتی‌یە لەوەی جوببە بپۆشم و دەستی یەکێك لە مامۆستایان ماچ بکەم و بە مامۆستای خۆمی دابنێم..

بەڵام ئێستا پێشکەش کردن و ناردنی جوببەکەی "مەولانا خالیدی نەقشبەندی" لەگەڵ مێزەرەکەیدا لە دووریی سەد ساڵەوە و بە شێوازێکی تەواو نامۆ لەم ساڵەدا بۆ من، تاکو بیپۆشم.. ئەم کارە بە چەند نیشانەیەك قەناعەتیان پێ بەخشیم کە لەبەری بکەم. وا من ئەم جوببە پیرۆزەی مەولانا خالید – قُدِّسَ سِرُّهُ – لەبەر دەکەم کە تەمەنی سەد ساڵە و، سەدان هەزار شوکر و سوپاس لەسەر ئەمە پێشکەشی پەروەردگارم دەکەم[١].

* * *

(دوو مەسەلە کە هاتنە دڵمەوە)

لەم ڕۆژانەدا دوو مەسەلەی ورد هاتنە دڵمەوە و نەمتوانی بیان نووسم، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەو دەرفەتەم لەدەست چوو، وا تەنها "ئاماژە" بۆ ئەو ڕاستی‌یە گرنگانە دەکەم:

---

(١) ئەم ئەمانەتە پیرۆزەم لە بەڕێز خوشکە "ئاسیا" وەرگرت کە قوتابی‌یەکی بەڕێزی پەیامەکانی نوور و، خوشکی ئاخیرەتمانە. (دانەر)

◆ یەکەمیان: (بۆ ئەو کەسەی کە تەمبەڵی لە زیکرەکانی نوێژدا دەکات)
لەبەر ئەوەی یەکێ لە برایانمان تەمبەڵی و کەمتەرخەمیی لە تەسبیحاتی دوای نوێژدا دەکرد، پێم وت:
زیکرەکانی دوای نوێژ سوننەتێکی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ و.. تەریقەتێکی پیرۆزی محەممەدی ﷺ و.. ویردی ویلایەتی ئەحمەدین ﷺ. لەبەر ئەمە، ئەو ویردانە لەم گۆشەیەوە گەلێ گرنگن.
پاشان حەقیقەتی ئەم قسەیەم بەمەی خوارەوە ڕوون کردەوە:
هەروەك ویلایەتی ئەحمەدی - کە بووە بە ڕیسالەت - لە سەرووی هەموو ویلایەتەکانەوەیە، تەریقەتی ئەو ویلایەتە کوبرایە و ویردەکانیشی کە لە دوای نوێژدا دەخوێندرێن - بە هەمان پلە - لە سەرووی گشت تەریقەت و ویردەکانی ترەوەن.
پاشان ئەم نهێنییەم بەم جۆرەی خوارەوە لێ ئاشکرا بوو:
هەروەك هەموو یەکێك لە زیکرخوێنانی ئەڵقەی زیکر، یان خەتمەی زیکری ناو مزگەوت، هەست بە پەیوەندییەکی ڕۆحیی پەیوەستدەر دەکات لە نێوان خۆی و هاوەڵەکانیدا و، تێکڕا هەموو شیان پێکەوە پەی بە حاڵەتێکی نوورانی دەبەن لە خۆیاندا..
بە هەمان جۆر، مرۆڤی دڵ بێداریش کە هەموو جارێك لە دوای نوێژدا دەڵێ: "سبحان الله.. سبحان الله.. سبحان الله" لە ناخی ڕۆحی خۆیدا هەست بە هاوبەشایەتی دەکات لە ئەڵقەیەکی زیکری سەد ملیۆن کەسیدا. وەك بڵێی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ سەرئەڵقەی ئەو کۆڕی زیکرە فراوانە بێت و، ئەمیش لەوێ دانیشتبێت و ئەو زیکرەی لە خزمەتدا دووپات بکاتەوە!
ئا بەم چەشنە هەست و نەستانەی کە پڕن لە سۆزی مەزنی و سام و شکۆ و بەرزایەتی، مرۆڤی ئیماندار هەموو جارێ لە پاش خوێندنی نوێژەکانی "سبحان الله.. سبحان الله"ش دەڵێتەوە.

پاشان کە بە فەرمانێکی مەعنەویی ئەو سەرئەڵقە بەڕێزە ﷺ ئیماندار - جار لە دوای جار - "الحمد لله.. الحمد لله" دەڵێتەوە، بیر لە مەزنیی ئەو وشەی "الحمد لله"یە دەکاتەوە کە لە سنگ و زاری سەد ملیۆن زیکرخوێنی دووپات کەرەوەی وشەی: "الحمد لله"وە لەو ئەڵقە فراوانەدا دەردەچێت! ئیتر کە ئەمە دەبینێت، پڕ بە دڵ بەشداریان دەکات و هاودەم لەگەڵیاندا دەڵێت:

"الحمد لله.. الحمد لله"!

هەر بەم جۆرە لەگەڵ وشەی "الله اکبر" و "لا إله الا الله"ش دا، کە ئەوانیش سی و سێ جار دووپات دەبنەوە.. ئنجا زیکرەکە کۆتایی پێ دێت.

پاش تەواوبوونی ئەم ویردانە، هەر بەو هەستە ناسك و، تێرامان و سەرنجدانە بەپێزەوە لە واتاکانیان، مرۆڤی زیکرخوێن و برایانی، گشت ئەو واتایانەی کە لەو زیکرانەدا بوون لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن و ڕوو لە سەرئەڵقەی ئەو زیکرە دەکەن (کە پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ) و پڕ بە دڵ پێی دەڵێن:

أَلْفُ أَلْفِ صَلاةٍ وأَلْفُ أَلْفِ سَلامٍ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله!

بەڵێ، ئاوا هەستم کرد و تێگەیشتم و، تەنانەت بە ئەندێشە ئاوا بینیم. لەبەر ئەوە، دەڵێم:

زیکرەکانی پاش نوێژ گرنگییەکی گەلێ مەزنیان هەیە.

◆ مەسەلەی دووهەم: (بۆچی فەزڵی دنیا بەسەر دواڕۆژدا دەدرێت؟)

تایبەتکاریی ئەم چەرخە سەیرە لەوەدایە کە وا لە مرۆڤ دەکات بە ئاگاداری و هەست و زانینی خۆی فەزڵی ژیانی فانیی دنیا بەسەر ژیانی باقیی ئەودنیادا بدات! تەنانەت بە زانینەوە فەزڵی شووشەی قابیلی "شکان" بەسەر ئەڵماسی قابیلی "مانەوە"دا بە ڕادەیەك دەدرێت وەك ئەوەی کە ئەم کارە یاسا و دەستوورێکی گشتی بێت!

پێشتر ئەم دیاردەیە زۆر سەرسامی کردبووم. بەڵام لەم ڕۆژانەدا ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هێنرا:

هەروەك ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ گەر تووشی ئازارێك بێت هەموو ئەندامەکانی تری جەستەی بەو ئازارەوە گیرۆدە دەبن و، واز لە هەندێ ئەرکی سەرشانیان دەهێنن.. بە هەمان جۆر، ئامێری هەڵپە و هەناسەبڕکێ بۆ ژیان و، پاراستن و، لەزەت لێ بردن و، خۆشویستنی ئەم ژیانەش، کە ئامێرێکە لە سروشتی مرۆڤدا دانراوە، لەم چەرخەی خۆماندا زامدار کراوە و لایەنە ناسکەکانی تری مرۆڤی لەبەر چەند هۆکارێکی زۆر، بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە و دەیەوێت ئەو لایەنە ناسکانە ئەرکە ڕاستەقینەکەی سەرشانیان - لەبەر ئەو - لە بیر بچێتەوە.

خۆ ئەگەر ئاهەنگێکی سەرنج ڕاکێشی پڕ لە مەستی و هەرزەیی ساز بکرێت، ئەوا جازیبییەتی ئەو ئاهەنگە، ئافرەتە ڕەفتار پاکە داپۆشراوەکان و ئەوانەش کە پلەی بەرزیان هەیە - بە وێنەی منداڵان و کەسانی بێ ئیشوکار - بۆ لای خۆی کێش دەکات و، هەموویان دەڕۆن و ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانیان واز لێ دەهێنن!

بە هەمان جۆر، ژیانی مرۆڤایەتیی ئەم چەرخەش، بە تایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتی، شێوەیەکی ترسناکی لەخۆ گرتووە، کە جازیبییەتێکی تێدایە و حاڵەتێکی ئازار بەخشی پێوەیە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا حەز و سەرنجەکان دەوروووژێنێت. ئەمەش لە ڕادەیەکدایە کە "ژیری" و "دڵ" و لایەنە ناسکە بەرزەکانی تری مرۆڤ دەکات بە شوێنکەوتەی "دەروونی بەدخواز" و، بە وێنەی پەپوولە بە دەوری ئاگری ئەو فیتنەیەدا هەڵی دەسووڕێنێت، تا بە تەواوی دەیخاتە ناوی!

بەڵێ، لە حاڵەتی "ناچاری"دا شەرع "ڕوخسەت" دەدات کە بە شێوەیەکی کاتی فەزڵی پاراستنی ژیانی دنیا بەسەر هەندێ کاروباری قیامەتیدا بدرێت. بەڵام نابێ ئەمە هەرگیز لەسەر بناغەی زیانێك بێت کە بە دڵنیایی مرۆڤ لەناو نەبات، یان تەنها لەبەر پێداویستییەك بێت. چونکە ڕوخسەتی شەرعی لەمانەدا نییە.

کەچی ئەم چەرخە بە ڕادەیەك خۆشویستنی ژیانی دنیای لە دەمارەکانی مرۆڤدا جێگیر کردووە کە هەندێ کەس واز لە چەند کاروبارێکی ئایینیی یەکجار بەنرخی

وەکو ئەڵماس دەهێنێت، لەبەر پێویستی‌یەکی بچووکی بێ نرخ، یان لەبەر ئەوەی زیانێکی ئاسایی دنیای لێ نەکەوێت!

بەڵێ، ئەم چەرخەی کە لە ئەنجامی ئیسرافی هەمیشە زیادبووی خەڵکەکەی و، چاودێری نەکردنی دەست پێوەگرتن و، پەرەسەندنی بێ قەناعەتی و هەڵپەی لەرادەبەدەرەوە، بەرەکەتی لەسەر هەڵگیراوە و.. هەژاری و موحتاجی و نەبوونی و خەمی گوزەرانی تێدا زیاد بووە و، ئەمانەش چەندین زامی قووڵیان لە ناخی ئاواتەکانی مرۆڤدا بۆ گوزەران و پاراستنی ژیان دروست کردووە و.. داخوازی‌یەکانی ئەم ژیانە سەختەش گەلێ لق و پەلی لێ بووەتەوە و.. سەرباری ئەمانەش، گومڕایان هەر بەردەوامن لە سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی بۆ لای ژیانی دنیا..

هەموو ئەمانە، زامەکەی مرۆڤیان بە ڕادەیەك قووڵ کردووە کە مرۆڤ فەزڵی نزمترین پێویستیی ژیانی دنیا بەسەر مەسەلەیەکی گەورەی ئیماندا دەدات!

بەڵێ، لە بەرامبەر ئەم نەخۆشی‌یە سامناك و سەرسووڕهێنەی ئەم چەرخە سەیرەوە، هەر تەنها "پەیامەکانی نوور" توانای خۆڕاگری‌یان هەیە کە دەرمانەکانی قورئانی پیرۆز بڵاو دەکەنەوە، لەوانەی کە چارەسەری کاریگەرن لە دژی ژەهرەکانی ئەو زام و نەخۆشی‌یە.

هەروەها کەس بەرەنگاریی ئەم دەردە سەختەی پێ ناکرێت، مەگەر قوتابی‌یە بەهێز و دامەزراوەکانی پەیامەکانی نوور کە لەرزەیان پێ ناکەوێت و، تابڵێی خاوێن و، ڕاست و، خۆبەختکارن.

لەبەر ئەوە، دەبێ خێرا بکرێت بۆ چوونە ناو بازنەی نوور و دەست‌پێوەگرتنی بە کەماڵی وەفا و دامەزراوی و ئیخلاس و گەرموگوڕی و باوەڕ و متمانەوە، تاکو مرۆڤ لە ئاسەوارەکانی ئەو نەخۆشی‌یە سەرسووڕهێنە سامناکە ڕزگار بکرێت.

هاوکات لەگەڵ دوعای خێردا، سڵاو لە یەك بە یەکی هەموو برایان دەکەم.

برایانم!

چالاكی و كارامەیی و دامەزراویتان وەك زەمبەلەكی بزوێنەری بازنەی پەیامەكانی نوور وایە، چونكە تەنانەت لێرەش و لە گەلێ شوێنی تریشدا بۆ كار و جموجووڵ هانمان دەدات. دەسا هەتاهەتایە خوای گەورە لێتان ڕازی بێت.

ئامین. ئامین. هەزار هەزار جار ئامین.

* * *

(ئازار لەناو چێژە ڕواڵەتی‌یەكاندا)

بە بۆنەی ئەو نامەیەی كە چەند ڕۆژێك پێش ئێستا لە بارەی زاڵ بوونی ژیانی دنیایی بەسەر ژیانی ئایینیدا بۆم نووسین، واتایەكی هێندە ورد لە دڵمدا دەركەوت كە لەوانەیە دەربڕینی لە توانای قەڵەمدا نەبێت، بەڵام وا بەوپەڕی پوختی ئاماژەی بۆ دەكەم:

بینیم ئەو شتەی كە گومڕایانی ئەم چەرخە سەیرە دەخەڵەتێنێت و وڕ و مەستیان دەكات: ئەو لەزەتە ڕواڵەتی‌یەیە كە لە چەند بارودۆخێكی "فانی"یەوە دەیچێژن و لە ڕاستی و ناوەرۆكدا لەوپەڕی ئازاردایە. لە هەمان كاتدا – بە ڕادەیەك كە ناتوانم دەری ببڕم – هەستم بەوەش كرد كە ئیمانداران و ئەهلی هیدایەت هەر لە هەمان شوێنی ئەو كاروبار و دۆخە فانی‌یانەدا، تام و لەزەتێكی بەرز و بڵند دەچێژن!

ئەوەتا پەیامەكانی نوور لە چەندین شوێندا سەلماندوویانە كە: جگە لە حاڵ و كاتی "ئێستا" هەموو شتێكی تر سەبارەت بە گومڕایان لە دۆخی "نەبوو"دایە. بۆیە هەموو شتێك سەبارەت بەوان پڕە لە ئازاری جودایی. بەڵام "ڕابوردوو" و "داهاتوو" و هەرچی‌یەكیان تێدایە سەبارەت بە ئیمانداران دارای وجوود و ڕووناكین.

بە چاوی خۆم بینیم كە حاڵ و بارودۆخە كاتی‌یە لەناوچووەكانی ئەهلی دنیا لە ناوەندی تاریكستانی فەنای موتڵەقدا نوقمی نەمان و "عەدەم" دەبن. كەچی سەبارەت بە ئیمانداران ئەو حاڵ و بارودۆخانە خاوەنی "وجوود"ن. چونكە كاتێ كە بە حەسرەت و پەژارەوە یادی ئەو بارودۆخە كاتی‌یانەم كردەوە كە بەسەرمدا

تێپەڕیون و چێژ و گرنگی‌یان لە خۆدا هەڵگرتبوو، هەستم بە شەوق و تاسەمەندی دەکرد بۆیان..

بەڵام هەر هێندەی ئەوەم بە زەیندا هات کە ئەو بارودۆخە خۆش و بەلەزەتانە لە ڕابوردوودا گرفتاری فەنا و نەمان بوون، یەکسەر نووری ئیمان یادی خستمەوە کە ئەوانە هەرچەند فەنای ڕواڵەتی‌یان بەسەردا هاتووە، بەڵام لە چەند ڕوویەکەوە بەقا و مانەوەیان بەدەست هێناوە. چونکە لەبەر ئەوەی ئەو حاڵەت و بارودۆخانە چەند درەوشانەوەیەکی ناوی جوانی "الباقي"ی خوای گەورەن، ئەوا لە بازنەی زانستی خوای گەورە و تابلۆ پارێزراوەکان و تابلۆ میسالی‌یەکاندا ماونەتەوە. چونکە ئەو پەیوەندی‌یانەی کە بەو حاڵ و بارودۆخانەمان دەبەستنەوە، نووری ئیمان "مانەوە" و "بوون"ێکیان پێ دەبەخشێت کە لە سەرووی "کات"ەوەیە و، دەتوانیت لە چەند ڕوویەکی زۆرەوە - کە دەڵێی چەند سینەمایەکی مەعنەویی زۆر و زەبەندەن - ئەو بارودۆخانە ببینیت، تەنانەت دەشتوانیت بڕۆیتە ناویانەوە. ئیتر لەبەر خۆمەوە وتم:

"مادەم خوای گەورە هەیە و مەوجوودە، ئەوا هەموو شتێکی تریش هەیە".

جا ئەم وتەیەی سەرەوە کە وەك پەندێکی لێ هات، ڕاستی و کاکڵەی ئەمەی خوارەوە دەنوێنێت:

"من كان لله تعالى كان له كلّ شيء. ومن لم يكن له كان عليه كلّ شيء، فكـــلّ شيء معدوم له".

بەو واتایەی کە:

ئەوانەی فەزلی کێشی یەك درەم لەزەتی پڕ لە ئازار و حەسرەت و تاریکی، بەسەر چەندین قات لەزەتی بێ ئازار - لە هەمان شوێندا - دەدەن، بێ گومان ئەو کەسانە - بە پێچەوانەی خواست و نیازەکانیان - ڕووبەڕووی ئازار لە شوێنی لەزەتدا دەبنەوە!

* * *

(خزمەتگوزاریی ئیمان لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە)

خزمـەتی ئیمـان، بـەلای قوتابی‌یـە ڕاستەقینەکانی پەیامـەکانی نـوورەوە، لـە سەرووی هـەموو شتێکەوەیە. تەنانـەت گـەر پلـەی "قوتبییـەت"یشیان پێ بدرێـت هێشتا هەر خزمەتی ئیمانیان پێ باشترە، لەبەر پارێزگاری کردنی ئیخلاسەکەیان.

کـار و فرمـانی ئێمـەی قوتابیـانی پەیامـەکانی نـوور، خزمـەت کردنـی قورئـان و ئیمانە و، خۆ هەڵنەقورتاندنە لـە کاروبـاری خـوای گـەورەدا و، بنیـات نـەنانی خزمەتگوزاری‌یەکانمانە لەسەر ئەو شتانەی "تاقیکردنـەوە" بگەیـەنن. سـەرەڕای ئەوەش کە ئێمە بایەخ بە "چۆنێتی" دەدەین نەك "چەندایەتی".

چەندین هۆکاری سامناك هەن کـە هـەر لـە کۆنـەوە بوون بـەهۆی تێکچوون و دواکەوتنی ڕەوشت و، پێشخستن و فەزڵدانی ژیانی دنیا بەسەر قیامـەت لـە هـەموو شتێکدا. جا لە نێوان ئەم چەشنە بارودۆخـەی دەوروبـەردا، ئـەو فتووحاتـەی کـە تـا ئێستا "پەیامـەکانی نوور" بەدەستی هێنـاون و دەیانـهێنێت و، شـکاندنی هێرشـی گومڕایی و، ڕزگار کردنی ئیمانی سەدان هەزار کەسی کلۆڵ و، پەروەردە کردنـی سـەدان بـەڵکو هـەزاران ئیمـانداری ڕاستەقینە، کـە هەریەکەیان بەرامبـەر بـە سـەد هەزاری کەسانی ترن..

هەمـوو ئەمـانە، تا ئێسـتا - پشـت بـە خـوا لـە ئایندەشـدا - بـە چەشـنێکی بێ گومـان و بـە چـەندین ڕووداوی ڕاسـتەقینە هـەواڵی هـەواڵدەری ڕاسـتگۆیان ﷺ چەسپاند و، بە کردەوە تەسدیقیان کرد[١].

کە ئەمەش بە ڕادەیەك لەناو دەمارەکاندا ڕیشکی داکوتاوە کە - پشت بە خوا - هیچ هێزێك ناتوانێت لە سنگی ئەنادۆڵدا دەری بهێنێت. تـا - بـە ئیزنی خـوا - لـە ئاخرزەماندا خاوەنـە ڕاستەقینەکانی خۆیـان لـە بازنـە بەرینەکەدا، واتـە: حـەزرەتی مەهدی و قوتابیانی، دێن و فراوانـی بـەو بازنەیـە دەدەن و، تۆوە چێنراوەکـان گـوڵ دەگرن.

---

(١) ئاماژەیە بۆ فەرموودەی: "لا يزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق". (وەرگێڕ)

ئـەو کاتـە ئێمـەش لـە گۆڕەکانمانـەوە بـۆ ئـەو دیمەنــە دەڕوانــین و سوپاســی پەروەردگارمان دەکەین!

* * *

(داوی ئایینداران)

ئەم چەرخە سەیرەی کە قورساییەکی زۆری خستووەتە ئەستۆی مرۆڤ بەوەی کە داخوازییەکانی ژیانی لەسەر زیاد کردووە و سەرچاوەکەشی لـێ هێناوەتەوە یـەك و.. لـە ڕێـی چاولێکـەریی یـەکتەوە شـتانی ناپێویستی هێناوەتـە ئاستی شـتی پێویست و.. ئەم خەڵکەی وا ڕاهێناوە بە تونـدی دەسـت بـەو خووانـەوە بگـرن کـە لەواندا ڕەگی داکوتاوە، بە ڕادەیەك کە ژیان و گوزەرانی دنیای کردووە بەوپـەڕی ئامانج و مەبەست و، ئاواتی هەرە بەرزی مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا..

ئەم چەرخە سەیرە.. بەم چەشنە کارانەی کە باس کـران، پـەردەی بەسـەر ڕووی ژیانی ئایینی و قیامەتی و هەمیشەییدا هێناوە، هیچ نەبێ ئاستی ئەو ژیانـەی هێناوەتـە پلـەی دووهـەم یـان سێهەم لـە بـەرچاوی مرۆڤـدا. لەبـەر ئـەوە و لـە سـزای ئـەم هەڵەیەدا، زللەیەکی ئەوەندە توندوتیژی لە مرۆڤ وەشاند کە دنیاکـەی بـۆ گـۆڕی بە دۆزەخێکی ئەوتۆ هەرگیز ئارامی لەسەر نەگیرێت!

ئاییندارەکـانیش - بـە هـەمان جـۆر - دووچـاری هـەمان دەرد و داو دەبـن و، هەیانە هەر بە خۆیشی نازانێت کە بووە بە تەڵەوە!

بۆ نموونە:

چەند کەسێکم دی ئارەزوومـەندی ئـایین بـوون و حـەزیان دەکـرد فەرمانـەکانی جێبەجێ بکەن، تاکو لە کاروبار و ژیانی دنیایاندا سەرکەوتوو بن!! تەنانـەت هـی وایـان تێـدا بـوو کـە لەبـەر کەشـف و کەرامـەت تەریقـەتی سۆفیی دەویست! واتـە ئارەزووی دوارۆژی دەکرد بە پلیکانە بۆ دەستخستنی کاروبار و شمەکی دنیایی!

ئەو کەسە بە خۆیشـی نـازانێت کـە سـوودە دنیاییـەکانی سـەر بـە ڕاستییەکانی ئایین - ئەو ڕاستییانەی کە بناغەی بەختەوەریی ئەودنیان - بۆ ئەوەن کـە شـەوق و

زەوق و ئارەزوومەندی بە مرۆڤ ببەخشن و، ئەودنیای لەچاو ئەم دنیا لە لا خۆشەویست بکەن. دەنا ئەگەر ئەو سوودانە بگەنە پلەی: "هۆی سەرەکی" بۆ ئەنجامدانی کرداری خێر، ئەوا ئەو کردارە بەتاڵ دەکاتەوە و، هیچ نەبێت ئیخلاسەکەی تێك دەشکێنێت و پاداشتەکەی لەدەست دەدات.

باشترین شتێك کە بە تاقیکردنەوە چەسپابێت و مرۆڤ لە ستەمی ئەم چەرخە نەخۆشە غەددار و شووم و تاریکە رزگار بکات، ئەو رووناکی‌یەیە کە لە "پەیامەکانی نوور"ەوە دەدرەوشێنەوە، بەو تەرازووکاری‌یە ورد و بەراوردە راستانەی کە تیایاندایە. چل هەزار کەس شایەتی لەسەر راستیی ئەمە دەدەن.

واتە: ئەوانەی نزیکی بازنەی "پەیامەکانی نوور"ن، گەر نەچنە ناویەوە، ئیحتیمالێکی بەهێز هەیە کە تیابچن!

بەڵێ، ئەم چەرخە موسڵمانەکانیشی هێندە گرفتار کردووە کە بە زانین و ئارەزووی خۆیان ژیانی دنیایان لە هی قیامەت پێ خۆشترە و، بەسەر ئەودنیادا پێشی دەخەن! وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەکات کە دەفەرموێ:

﴿يَسْتَحِبّونَ الحياةَ الدُنيا على الآخرة﴾ (ابراهيم:٣).

* * *

(چارەنووسی کافرانی بێ تاوان لە بەڵا و کارەساتەکاندا)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

ئەو کارەسات و برسێتی و قات و قڕی‌یەی کە لەم زستانە سەختەدا و لە ئەنجامی ئەم بەڵا بەشەری‌یەوە (جەنگی دووهەمی جیهانی) کەنەفتان و هەژارانی بێ نەوای پێوە گیرۆدە بوون، کاریگەری‌یەکی توندوتیژی لە هەست و نەستەکانمدا بەجێ‌هێشت کە زیاد لە پێویست پەرۆشی و سۆز و بەزەییان لەخۆ گرتووە. بەڵام کتوپڕ بۆ ئەمەی خوارەوە بێدار کرامەوە:

ئەم گیرو گرفتانە و کارەساتەکانی هاوچەشنیان، جۆرە بەزەیی و پاداشتێکیان تەنانەت بۆ کافرانیش تێدایە، بە ڕادەیەك کە ئەو موسیبەتە لەسەر شانیان سووك دەکات و سەبارەت بەوان ئاسان دەبێت.

ئەم بێدارکردنەوەیە بوو بە مەڵهەمێکی شیفابەخش بۆ ئازاری بەزەییەکانم سەبارەت بە منالآن و خێزانەکانی ئەورووپا و ڕووسیا، هەرچەندەش چەند مانگێکە هیچ شتێکم سەبارەت بە دنیا و هەواڵی جەنگ لە کەس وەرنەگرتووە.

بەڵێ، ئەوانەی کارەساتی مەزنی ئەم تاوانەی ستەمکارانیان بەسەردا شکایەوە، گەر منالّ بن هەتا تەمەنی پازدەساڵی، ئەوا لە حوکمی "شەهید"دان، سەر بە هەر ئایینێك بن. دیارە ئەو پاداشتە مەزنەی کە چاوەڕێیانە و بۆیان دانراوە، سەختیی موسیبەتەکەیان لە سەرشان سووك دەکات.

سەبارەت بەوانەش کە لە تەمەنی پازدە ساڵی بەرەو ژوورن، گەر بێ‌تاوان و بەری و ستەم لێکراو بن، پاداشتێکی هێندە گەورەیان هەیە کە لەوانەیە لە دۆزەخ ڕزگاریان بکات. چونکە ئایین – بە تایبەت ئیسلام – لە ئاخر زەماندا بە پەردەی گوێ پێ نەدان دادەپۆشرێت و، ئایینی ڕاستەقینەی حەزرەتی عیساش – دروودی خوای لەسەر بێت – لە ئاخر زەماندا شان بە شانی ئیسلام فەرمانڕەوا دەبێت. کەواتە دەتوانرێت بە بێ هیچ گومانێك بوترێت: ئەو نەصرانی‌یە ستەم لێکراوانەی کە بۆ لای حەزرەتی عیسا – دروودی لەسەر بێت – نیسبەت دەدرێن و لە تاریکستانێکی وەك هی تاریکیی قۆناغی "فەترەت"دا دەژین، هەرچی کارەسات و تیاچوونێکی ئاوایان تووش دەبێت – سەبارەت بەوان – وەك جۆرە شەهیدی‌یەك دەبێت. بە تایبەت کەسانی پیر و گرفتار و هەژار و کەنەفتانی بێچارە و داماو، کە لە ژێر زوڵم و زۆری ستەمکارە خۆسەپێنەکاندا گیرۆدەی کارەساتەکان دەبن.

لە لایەن حەقیقەتەوە پێم ڕاگەیەنرا کە:

ئەو کارەساتانە سەبارەت بەوان دەبێت بەهۆی سڕینەوەی ئەو گوناهانەی کە لە ئەنجامی هەرزەیی مەدەنییەت و پێنەزانی و ناشکوریی نیعمەتەکان و گومڕایی و

کافربوونی فەلسەفەوە دووچاری بوون. کەواتە ئەو کارەساتانە سەد ئەوەندەی زیان بۆ ئەوان قازانجترە.

لەمەشەوە دڵدانەوەم لە بەرامبەر ئەو ئازارە سەختەوە دەست کەوت کە لە بەزەیی و سۆزی زیاد لە پێویست و لەڕادە بەدەرمەوە سەرچاوەی گرتبوو. بۆیە شوکر و سوپاسی نەبڕاوەم پێشکەشی خوای گەورە کرد.

خۆ ئەو ستەمکارە نزم و بێ نرخانەی شەیتانەکانی "جیننی" و "ئینس"یش کە بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی سوودە کەسی‌یەکانی خۆیان ئاگری ئەو ئاشووب و کارەساتانە دادەگیرسێنن، ئەوانە بە تەواوی شایانی ئەو ئازارە ئابڕووبەرەن. کەواتە کارەساتەکان سەبارەت بەوان دادگەرییەکی ڕوون و بێ گومانی پەروەردگارە.

بەڵام ئەگەر گیرۆدەبووان بەو کارەساتانە لەو جۆرە کەسانە بن کە بە خێرایی بۆ فریاگوزاریی ستەم لێکراوان ڕادەپەڕن و لە پێناوی هێنانەدیی حەوانەوەی گرۆی مرۆڤ و پاراستنی بناغەکانی ئایین و موقەددەساتی ئاسمانی و مافەکانی مرۆڤایەتیدا تێدەکۆشن، ئەوا ئەنجامی مەعنەوی و قیامەتیی ئەو خۆبەختکردنەیان هێندە گەورەیە کە ئەو کارەساتانە سەبارەت بەوان مایەی شەرەف و شانازی دەبێت، تەنانەت لە بەرچاویاندا خۆشەویستی دەکات.

* * *

(کارکردن بۆ بناغەکانی ئیسلام لە هەموو شتێك لە پێشترە)

برایانم! لەم ڕۆژانەدا دوو نامەم بە قوتابی‌یە ئازیزەکانمدا سەبارەت بە "هەشت هێماکان" بۆ شوێنێك نارد، بەڵام ڕێگا گیرا و ڕەوانەی ئەوێ نەکران. منیش بە وردی جارێکی تر ئەو دوو نامەیەم خوێندەوە.

لە بیری خۆمم پرسی:

بۆچی پەردە بەسەر ڕووی ئەم ڕێبازەدا درایەوە کە - بە حسابی ئەبجەدی و جەفر - تەوافوق و چێژ و جوانی و بایەخ و نەرمونیانیان تێدایە و، لە بریی ئەوە بەرەو گرتنەبەری ڕێگایەکی تر ئاراستە کراین و خراینە کار؟

کتوپڕ ئەمەی خوارەوە هێنرایە دڵمەوە:

خۆ سەرقاڵ کردن بەو ڕێبازەوە کە دەرگای ئەو نهێنییە غەیبییە داخراوانە دەکاتەوە، زیان بە کار و کۆششمان بۆ بناغەکانی ئیسلام دەگەیەنێت. چونکە ئەم "کار"ە گەلێ لەو "ڕێباز"ە بەنرخ و بەهاترە و، تەوەرەی ژیانی گشتییە و، جێی پێویستیی هەموانیش بۆ کاری لەمەڕ بناغەکانی ئیسلام پڕ دەکاتەوە و، خزمەتێکە بە گەنجینەی ڕاستییەکانی ئیمان ئەنجام دەدرێت و سوودمەند بوونە لێی. لەبەر ئەوە، بۆ گرتنەبەری ئەم ڕێیە درابنە بەر، چونکە وازهێنان لەم ڕێیە و سەرقاڵ بوون بەو ڕێبازەی تر مرۆڤ بەرەو ئەوە دەبات کە مەزنترین و گەورەترین ئامانجەکان – کە ڕاستییەکانی ئیمانە – بخاتە پلەیەکی تری دووهەمەوە.

* * *

(ڕاستییەکانی ئیمان یەکەم ئامانجن)

برا ئازیزە بەوەفاکانم!

بە بۆنەی ئەوەی کە یەکێك لە برایانی ڕاست و وردەکارمان لەم ڕۆژانەدا – لەبەر گوێ نەدانی خۆی بە حەزەر و وریایی – زللەیەکی سوکەڵەی تەمێی لێ درا و.. بە بۆنەی پرسیارەکەی ئەمین و فەیزییەوە کە لەوە سەرسام مابوون من لە ماوەی ئەم چوار مانگەدا، هەرچەند بە ئەندازەی هەزاران کەس پەیوەندیم بە هەواڵەکانی جیهانەوە هەیە، کەچی حەزم نەبووە لەوەی هیچ هەواڵێکی جیهان و سیاسەت و جەنگ ببیستم، تەنانەت هەر بایەخیشم پێ نەداوە..

بە بۆنەی هەموو ئەمانەوە، بە پێویستم زانی، با بە شێوەیەکی جوزئیش بێت، لە ڕاستییەك بدوێم کە زۆر جار لێی دواوم و ڕوونم کردووەتەوە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

لە کاتێکدا کە دەبوو لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا "ڕاستییەکانی ئیمان" یەکەمین و لە پێشترین ئامانج بوونایە و، شتانی تریش لە پلەی دووهەم و سێهەم و

چوارەمدا دابنرانایە.. لەو کاتەدا کە دەبوو خزمەت کردنی ڕاستی‌یەکانی ئیمان بە "پەیامەکانی نوور" گرنگترین کار و ئەرك و جێی بایەخ و حەز و ئامانجی سەربەخۆ بوایە.. کەچی حاڵەتەکانی جیهانی ئێستا، بە تایبەت ژیانی دنیا و، لەویشدا بە تایبەت ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و، بە تایبەت‌تر دەنگوباسی جەنگی جیهانی، کە درەوشانەوەیەکی غەزەبی خوایە و، وەك سزایەك بۆ گومڕایی و هەرزەیی شارستانێتی ئێستا ناردوویەتی و، کە خەڵکی بە لای خۆیدا کێش دەکات و، ڕەگ و دەمارەکان بە ڕادەیەك دەورووژێنێت کە دەڕواتە ناو ناخی دڵەوە و، لە بریی ڕاستی‌یە بەرزە سوودبەخشەکانی ئیمان، حەز و ئارەزووە بێ کەڵك و زیانبەخشەکانی تێدا جێ دەکاتەوە..

لەم چەرخە شوومەدا کە هەتا ئێستاش خەڵکی بەم شتانەوە دەخافڵێنێت و بە بیرەکانی خۆی تا ئێستاش تەلقیحیان دەکات، بە ڕادەیەك کە زانایانی دەرەوەی بازنەی پەیامەکانی نوور، تەنانەت هەندێ کەس لە ئەولیاکانیش بەهۆی پەیوەندی بوونیان بەو ژیانە سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یەوە، لافاوی ئەو تەوژمانە ڕایماڵیون و حوکمی ڕاستی‌یەکانی ئیمانیان هێناوەتە پلەی دووهەم و سێ‌هەم و، ئەو موناقیقانەیان خۆش دەوێت کە لەگەڵیاندا هەڵگری هەمان بیر و بۆچوونن و، دوژمنایەتیی ئەو کەسانە دەکەن کە لە ئەهلی حەقیقەت و تەنانەت ئەهلی ویلایەتیشن و ڕایان لەگەڵ ئەماندا جیاوازە، بەڵکو ڕەخنەشیان لێ دەگرن. ئەمەش لە ڕادەیەکدایە کە هەست و شعووره ئایینی‌یەکانیان کردووە بە شوێنکەوتەی ئەو تەوژمە سیاسی‌یانە..

لەم چەرخەدا و لە بەرامبەر ئەم تیاچوونە سەیر و سەرسووڕهێنانەی کە ئەم سەردەم و ڕۆژگارە لەگەڵ خۆیدا هێناونی، خزمەتی پەیامەکانی نوور و، سەرقاڵ بوونم پێیانەوە بە ڕادەیەك ئەو تەوژمە سیاسی‌یانەی ئێستای لە پێش چاو خستووم کە لە ماوەی ئەم چوار مانگەدا بایەخم بە دەنگوباسی ئەم جەنگە نەداوە و، هیچ هەواڵێکیشم لە بارەیەوە نەپرسیوە!

پاشان قوتابیـیـە تایبەتـمـەندەکانی پەیامـەکانی نـوور لـەو کاتـەدا کـە سـەرگەرمی بڵاوکردنەوەی ڕاستیـیە بەنرخەکانی ئیمانن، نابێ بە سەیر کردنی یاریی شەترەنجی ستەمکاران، لە ئەرکی موقەددەسی خۆیان سست بنەوە و، خـاوێنیی زەیـن و بیری خۆیانی پێ لێـڵ بکەن. چونکـە خـوای گـەورە نـوور و ئـەرکی نوورانیی بـە ئێـمـە بەخشیوە و، چەند گەمە و گاڵتەیەکی تاریك و زاڵمانەشی بەوان داوە.

جـا لـە کـاتێکدا کـە ئـەوان بێز لـە ئێـمـە دەکەنـەوە و، دەسـتی یارمـەتیمان بـۆ ڕاناکێشن و، حەزیان لە ڕووناکیـیـە بـەرزەکانی لای ئێـمـە نیـیـە، کـارێکی گەلـێ هەڵەیە کە ئێمە لەسەر حسابی ئەرکە خاوێن و ڕووناکەکـەی سەرشـانمان دابەزینە ئاستی سـەیرکردنی یارییـە تاریکـەکانی ئـەوان. کـەواتـە چێـژە مەعنەوییـەکان و نوورەکانی ئیمان لەناو بازنەکەماندا سەروزیادی ئێمەیە.

سڵاومان بۆ یەك بە یەکی هەموو برایان و، پیرۆزبایی جەژنیان لـێ دەکەین.

الباقي هو الباقي

سەعیدی نوورسی

* * *

(پێویستی بە پەیامەکانی نوور)

دەست پێکردنی ئەو پیرە دڵپاك و نەخوێندەوارانە بە نووسـینەوەی پەیامـەکان لـە دوای تەمەنی چل ساڵی[1] و، پێشخستنی ئەم کارەیان بەسەر هـەموو شـتێکی تـردا، لەپێناوی خزمەتی پەیامەکانی نـووردا.. هـەروەها دەرس خوێندنی منالـە پـاك و بێ گوناهەکان لای پەیامەکانی نوور و، نووسینەوەی پەیامەکان لە لایەن ئەوانەوە..

ئەم هەوڵـە گـەرموگوڕەی کـە ئـەوان لـەم ڕۆژگـارە و لـەم پێنـاوەدا دەیـدەن، بـە ڕوونـی دەری دەخـات کـە پەیامـەکانی نـوور هێنـدە چێژی مەعنـەوی و ڕووناکیی

(١) لەوانەیە مەبەست ئەوە بێت کە لەو تەمەنەدا و بە نیازی نووسـینەوەی پەیامەکان فێری نووسین و خوێندنەوە بووبێتن، هەروەك هەندێکیشیان بەو نەخوێندەوارییە دەچوون بە وێنەی کێشانی نەخش و نیگار و لەبەر گرتنەوەی وێنەکان لەبەر پەیامەکانیان دەگرتەوە! (وەرگێڕ)

ڕاکێشەریان تێدایە کە سەرجەمی ئەو هۆکارانەی لە قوتابخانەکاندا بۆ هاندانی قوتابیان لەسەر خوێندنەوە و نووسین بەکار دەهێنرێن، لە بەرامبەر ئەو چێژ و دڵخۆشی و شادمانی‌یەوە دەستەوسان بمێنن کە پەیامەکانی نوور بە خوێنەرانی خۆیانی دەبەخشن و، لە ڕادەیەکی ئەوتۆدایە کە ئەو پیر و منداڵانە بخاتە ئەم کارە گەرموگوڕ و چالاکی‌یە سەرومڕەوە!

هەروەها ئەم حاڵەتە ئەوە دەردەخات کە:

پەیامەکانی نوور ڕەگ و ڕیشکی خۆیان بە جۆرێك داکوتاوە کە - بە فەزڵی خوا - هیچ شتێك نەتوانێت دەریان‌بهێنێت و پشت بەخوا تا نەوەکانی ئایندەش هەر دەمێننەوە.

هەوڵدانی ئەو پیرە نەخوێندەوارانە لە بازنەی پەیامەکانی نووردا بە وێنەی هەوڵی ئەو قوتابی‌یە منداڵە بەری و بێگەردانە و بەشێك لە شوانەکان، بە تایبەت لەم ڕۆژگارە و لەم بارودۆخە سەختەدا و، پێشخستنی ئەم کارەیان بەسەر هەموو شتێکی تردا، بۆمان دەردەخات کە:

پێویستیی خەڵکی ئەم زەمان و ڕۆژگارە بە "پەیامەکانی نوور" گەلێ زیاترە لە پێویستی‌یان بە "نان"ا بە ڕادەیەك کە جوتیار و شوانەکانیش پێیان وایە: ڕاستی‌یەکانی پەیامەکانی نوور لە پێویستی‌یە ناچاری‌یەکانی دنیا گەلێ پێویستترن.

* * *

(بەخششی پەیامەکانی نوور بە قوتابیانی)

ئەمەی خوارەوە ڕاستی‌یەکە بۆ برایانی "قەستەمۆنی"م نووسرا. وا بۆ ئێوەشی دەنێرم بەڵکو سوودی لێ وەربگرن:

ئەو نرخ و بەهایەی کە پەیامەکانی نوور لە بەرامبەر دەسکەوتە یەکجار مەزن و ئەنجامە گەورەکانیانەوە لە قوتابی‌یە ڕاست و دامەزراوەکانی دەخوازن، بریتی‌یە لە: وەفای بێگەردی تەواوەتی و، دامەزراویی توندوتۆڵ و نەجووڵاوی هەمیشەیی.

بەڵێ، ئەو ئیمانە تەحقیقی‌یەی کە بە پازدە ساڵ ئنجا دەتوانرێ بەدەست بهێنرێت، پەیامەکانی نوور بە پازدە حەفتە و سەبارەت بە هەندێ کەسیش بە پازدە رۆژ دەستی قوتابیانی دەخەن. بیست هەزار کەس بە ئەزموونی تایبەتیی ماوەی بیست ساڵی خۆیان، شایەتی لەسەر ئەم راستی‌یە دەدەن..

هەروەها پەیامەکانی نوور پاداشتی هەزاران دوعای خاوێنی گیرا بە هەموو یەکێکی قوتابیانیان دەبەخشن، لەو دوعایانەی کە هەموو رۆژێك بەسەر زمانی سەرجەمی قوتابیانیەوەن..

هەروەها بەپێی دەستووری "بەشداری لە کارە قیامەتی‌یەکان"دا، پاداشتی هەموو ئەو کردەوە چاکانەیان پێ دەبەخشێت کە هەزاران پیاوچاك و خاوەن تەقوا ئەنجامیان داون..

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە هەموو قوتابی‌یەکی راستەقینەی راست و دامەزراو لە رووی کارەوە، لە حوکمی هەزاران کەسدایە، سێ هەواڵە کەرامەتدارەکانی ئیمامی عەلی و کەرامەتە غەیبی‌یەکانیەتی، خوا لێی رازی بێت.. هەروەها مژدە و مزگێنی‌یەکانی شێخی گەیلانی‌یە (قدّس سرّه)[1] و رێزنانیەتی لە کارگوزاران.. هەروەها ئاماژەکانی قورئانی پیرۆزە کە ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی قوتابی‌یە خاوێن و بێگەردەکان ئەهلی بەهەشت و بەختەوەری دەبن..

---

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ساڵی (٤٧٠)ی کۆچی هاتووەتە دنیاوە و لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە. بۆ خوێندن رۆیشتووە بۆ بەغدا و سەرجەمی زانستە ئیسلامی‌یەکانی ئەو رۆژگارەی لای زانایانی پایەبەرزی بەغدا، خوێندووە. بەکێکە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئایینی ئیسلام و، چەندەها کەس لە گاور و جولەکەکان لە خزمەتیدا موسڵمان بوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان کردووە و دەستبەرداری کردەوە خراپەکان بوون. چەند کتێبێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە وەك (الغنية) و (فتوح الغيب) و (الفتح الرباني). لە ساڵی (٥٦١ك)دا کۆچی دوایی کردووە و لە قوتابخانەکەی خۆی لە بەغدا نێژراوە. بۆ مەبەستی ناسینی پایەبەرزیی ئەم مەردە مەزنە و ئاشنا بوون بە رۆڵی کاریگەری لە مێژووی ئیسلامدا، خوێنەری بەرێز رەوانەی ئەو فەسڵانە دەکەین کە مامۆستای مێژوونووسی هاوچەرخ (أبو الحسن الندوي) - خوا لێی خۆش بێت - لە بەرگی یەکەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)دا تۆماری کردوون. هەروەها کتێبی: (هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس) نووسراوی: (د. ماجد عرسان الكيلاني) بە تایبەت (الفصل الحادي عشر: مدارس الإصلاح والتجديد، المدرسة القادرية). (وەرگێڕ)

جا ئەم مژدە و ئاماژانە، بەڵگەیەکی گەلێ بەهێزن. بەڵێ، دەسکەوتێکی وەك ئەمە - بێ هیچ گومانێك - شایانی ئەو بەها و نرخە بەرزەیە.

مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا دەبێ کەسانی نزیکی بازنەی پەیامەکانی نوور لە زانایان و تەریقەتداران و خاوەن مەشرەبە سۆفیيەکان، بڕۆنە ناو تەوژمی پەیامەکانی نوورەوە، تاکو بە سەرمایەکەی پێشوویان یارمەتیی ئەم تەوژمە بدەن و، بۆ فراوان کردنی بازنەکەی تێبکۆشن و، شەوق و هاندان بە دەروونی قوتابیيەکانی ببەخشن و، خۆپەرستیيەکانیان کە وەك قاڵبە سەهۆڵ وایە، لەناو حەوزی ئاوی سەلسەبیلی کۆمەڵدا بتوێننەوە، تاکو هەموو حەوزە کەوسەرییەکە ببێت بەهی خۆیان..

دەنا هەرکەسێك ڕێبازێکی تازە و جیا و، ڕێگایەکی تر بگرێتە بەر - بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت - زیان لەم ڕێگا قورئانی و ڕاستە شەقامە دەدات، هەروەك زیان بە خۆیشی دەگەیەنێت. تەنانەت بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت کارەکەی جۆرە یارمەتیيەك دەبێت بۆ زەندەقە و ئیلحاد.

دەسا برایانم!

وریا بن.. وریا بن. ئەم تەوژمە دنیاییانە، بە تایبەت سیاسیيەکانیان، بە تایبەتتر ئەو تەوژمانەیان کە سەرنجەکان بۆ دەرەوە ڕادەکێشن، بەرەو پارچە پارچەیی و شپرزەیی ڕاتان نەماڵن. چونکە ڕەفتاری لەو جۆرە لە بەردەم دەستە و تاقمە گومڕاکاندا لاواز و دەستەوسانتان دەکات..

وریابن حوکمی ئەم دەستوورەی شەیتان - خوا پەنامان بدات - کە دەڵێت: "الحب في السياسة والبغض في السياسة" لە بریی دەستووری ڕەحمانیی: "الحب في الله والبغض في الله"[(١)] لە ئێوەدا ڕایی نەبێت. چونکە ئەو کاتە دەبنە دوژمنی برایەکی خۆتان کە لە ڕاستیدا وەکو مەلائیکەت وایە و، خۆشەویستیش بۆ هاوڕێیەکتان

---

(١) صحيح البخاري ٨/١ وصحيح مسلم برقم ٣٧، ٣٨ ابو داود كتاب ٣٩ باب ٢؛ مسند ابن حنبل ٢/٢٣٧، ٢٩٢.

لە سیاسەتدا دەنوێنن کە بە وێنەی شەیتانە و، لە ستەمەکەی ڕازی دەبن و، لە ناوەرۆکدا دەبن بە بەشداری تاوانەکەی!

دەسا وریا بن.. وریا بن.. گرفتاری ئەم دەردە نەبن!

بەڵێ، سیاسەتی ئێستا "دڵان" تێك دەدات و "گیان"ە هەستیارەکانیش دەخاتە ئەشکەنجە و ئازارەوە. کەواتە هەرکەسێك "سەلامەتیی دڵ" و "حەوانەوەی گیان"ی دەوێت با واز لە سیاسەت بهێنێت!

هەموو مرۆڤێك لەم کاتەی ئێستا و لە سەرتاسەری گۆی زەویدا یان بە "دڵ" یان بە "گیان" یان بە "ژیری" یان بە "جەستە" گرفتاری بەشێکی ئەم موسیبەتەی ئێستایە و ئازاری پێوە دەچێژێت، بە تایبەت گومڕا و بێ ئاگایان. چونکە ئەوان لە میهرەبانیی گشتی و دانستی کامڵی خوای گەورە بێ ئاگان..

جا ئەوان لە ڕووی مرۆڤایەتی‌یان و پەیوەندی‌یەکانیان بە هاوڕەگەزی خۆیانەوە، سەرباری ئازارەکانی خۆیان، بە سۆزی ئەو ئازارە سەخت و سامناکانەشەوە دەتلێنەوە کە گرۆی مرۆڤی ئەم سەردەمە پێوەی گیرۆدە بووە. چونکە ئەوان وازیان لە ئەرکە ڕاستەقینەکانی سەرشانیان و کاروبارە پێویستەکانی خۆیان هێناوە و، بە حەز و تاسەمەندی‌یەوە گوێیان لەو ململانێ سیاسی و کاروبارە ئافاقی و ڕووداوە دەرەکی‌یانە گرتووە کە لە دەرەوەی بازنەی توانای ئەواندایە و خۆیانی تێدا هەڵدەقورتێنن. تا لە ئەنجامدا "گیان"ەکانی خۆیان سەرگەردان و "ژیری"یەکانیشیان دووچاری چەنەبازی کردووە و، بەپێی دەستووری "الراضي بالضرر لا ينظر له" خۆیان خستووەتە دۆخێکی ئەوتۆ کە هیچ کەسێك بەزەیی پێیاندا نایەتەوە و خەمیان بۆ ناخوات. چونکە ئەم دەستوورە ئەوە دەگەیەنێت کە هەرکەسێك بە زیانی خۆی ڕازی بێت، شایانی ئەوە نابێت کە بە چاوی سۆز و بەزەییەوە سەیر بکرێت. ئەوانیش بە هەمان جۆرن، چونکە هەر خۆیان بوون بەهۆی داباریني ئەو بەڵایە بەسەریانەوە.

من پێم وایە لە ناوەندی ئەم کارەساتە گەورە و ئاگرە سووتێنەرانەی کە لە گۆی زەویدا کەوتووەتەوە، هیچ کەسێك ناتوانێت پارێزگاری لە "سەلامەتیی

دڵ" و "حەوانەی گیان"ی خۆی بکات، مەگەر کەسانی ئیماندار و ئەهلی تەوەککول و ڕەزای ڕاستەقینە. لەناو ئەوانیشدا ئەو کەسانەی کە بە وەفاداری‌یەکی تەواوەتی و ڕاستەقینەوە ڕۆشتوونەتە ناو بازنەی خزمەتی پەیامەکانی نوورەوە. ئەوان لەو چەشنە کارەساتانەدا زیاتر پارێزراو دەبن لەچاو کەسانی تر، ئەوەتا لەبەر ئەوەی بە چاویلکەی نوورانیی وانەکانی ئیمانی ڕاستەقینە - کە لە پەیامەکانی نوورەوە وەریان گرتووە - بۆ هەموو شتێك دەڕوانن، ئەوا ئاسەوار و پوختە و ڕووی میهرەبانیی خوای گەورە و کەماڵی دانایی و جوانیی دادگەری‌یەکەی لە هەموو ڕووداوێك و هەموو شتێکدا دەبینن!

لەبەر ئەوە، بە ڕازی بوونی ملکەچی و تەسلیم بوونەوە بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە ڕووبەڕووی سەرجەمی ئەو گیروگرفتانە دەبنەوە کە بریتین لە کاروبارە پەروەردگاری‌یەکانی خواوەند لەناو گرۆی مرۆڤدا. هەروەك سۆز و شەفەقەتی خۆیان بەسەر میهرەبانیی خوای گەورەدا پێش ناخەن و، ئیتر سزای سەخت و ئازار دەرخواردی خۆیان نادەن.

جا لەسەر ئەم بناغەیە، ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت هەر لەم ژیانەدا - چ جای ژیانی ئەودنیا - تامی لەزەت و بەختەوەری بچێژن، دەتوانن ئەو چێژەیان لە دەرسە ئیمانی و قورئانی‌یەکانی پەیامەکانی نووردا دەست بکەوێت.

ئەمانەی خوارەوەش دوو بێدارکردنەوەن کە ئەم ڕۆژانە لە دوو بیرهێنانەوەدا هاتنە دڵەوە:

یەکەم:

ئەو خوشکانەم وەبیرهاتەوە کە لەم شارەدا پەیوەندی‌یان بە پەیامەکانی نوورەوە کردووە، بینیم ئەوان لە ئافرەتانی تر ناچن و، هێندە دامەزراون کە هیچ شتێك نایان بزوێنێت. کتوپڕ فەرموودەی "علیکم بدین العجائز"[(١)] هاتە دڵمەوە. واتە لە ئاخر زەماندا چاو لە دینداریی خاوێن و بیروباوەڕی دامەزراوی پیرەژنان بکەن.

---

(١) رواه الديلمي من حديث ابن عمر بلفظ: "إذا كان آخر الزمان واختلفت الأهواء فعليكم بدين البادية والنساء" وسنده واه. بروانە: ( الدرر المنثرة للسيوطي).

بەڵێ، ژنانی بەتەمەن لەبەر ئەوەی لاوازن و خاوەنی هەستی ناسك و سۆز و بەزەیین، زۆر زیاتر لە کەسانی تر پێویستیان بەو دڵدانەوە و نوورانە هەیە کە لە ئاییندا هەن و شەفەقەتیان لێ دەچۆڕێت و، بەو ئاوڕدانەوە ڕەحمانیيەش کە میهرەبانیی لێ دەتکێت و بە خاڵێکی پشت پێ بەستن و یارمەتی لێ وەرگرتن دادەنرێت. کە هەموو ئەمانەش لە "ئایین"دا هەن.

جا لەبەر ئەوەی "دامەزراویی تەواوەتی" یەکێکە لە داخوازییەکانی سروشتی ئەوان، ئەوا پەیامەکانی نوور کە بە تەواوەتی لەم ڕۆژگارەدا پێداویستییەکانی ئەوان دابین دەکەن، لە هەموو شتێك زیاتر لە "دڵ"ی ئەواندا جێگیر دەبن و، حەوانەوە بە "ڕۆح"یان دەبەخشن.

بێدارکردنەوەی دووهەم:

لەم ڕۆژانەدا چەند کەسێکی جیا جیا هاتن بۆ لام. یەکەم جار وام زانی بە نیازی ئیشوکاری سەر بە ئاخیرەت هاتوون. کەچی دوایی تێگەشتم کە هاتنەکەیان بۆ ڕاوێژ و پرس و ڕا گۆڕینەوە و دوعای سەرکەوتنە لە کاروباری بازرگانیدا.. یان بۆ لابردنی بێ برەویی کاروکەسابەتیان و ڕزگاربوونیان لە زەرەر و زیان، سەرم لێ دەدەن!

بیرم کردەوە لەوەی کە ئایا چی لەمانە بکەم و چیان پێ بڵێم؟

یەکسەر ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

تۆیش بە هەمان جۆر گێژ و دەبەنگ مەبە و، بە گەلحۆیی مەدوێ و، لەو گێژی و وڕیيەی خۆیاندا مەیان هێڵەرەوە! چونکە ئەو کەسەی کە ئەرکی ئامادە کردنی دەرمانی دژ بە ژەهری مارەکانی خرابێتە ئەستۆ و، خەریکی دوورخستنەوەی ئەو ژەهرانە بێت لە خەڵکی، گەر کار و ئەرکی خۆی واز لێ بهێنێت و بچێت یارمەتیی کەسێك بدات کە هەرچەند لەناو مارەکاندایە کەچی لە خەمی هێرشی مێشەکاندایە لەسەری و لەمەشدا یارمەتیدەری زۆری هەیە.. بێ گومان مرۆڤێکی گەلحۆیە و، ئەو کەسەش بەو حاڵەوە پەنا بەم دەبات بە دەبەنگ دادەنرێت و، هەر گفتوگۆیەکیش کە لە نێوانیاندا ڕوو بدات گێژی و وڕی دەگەیەنێت.

بەڵێ، زیانە کەم و کاتیی‌یەکانی ژیانی کورت و فانیی دنیا، لە چاو ژیانی هەمیشەیی ئەودنیادا، وەکو گەستنی مێش وایە لە بەرامبەر زیانەکانی ژیانی ئەو دنیا کە وەکو پێوەدانی مار وان!

* * *

(شەش مەسەلەی جیاجیا کە هی شەش کەسن)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بعدد كلمات القرآن وحروفه

برایانی ئازیز و بەوەفا و بەڕێزم!

ئەی برایانی بەهێز و چالاك و دامەزراوم لە خزمەتی قورئاندا!

شەش کەس - کە یەکەمیان ئەحمەدی دارتاش و دواهەمینیان منم - هەر یەکەیان بە جیا و لەسەر بناغەی بێدارکردنەوەیەکی مەعنەوی، بوون بە مایە و خولگەی سەرهەڵدانی چەند مەسەلەیەك.

❑ یەکەم:

ئەحمەدی دارتاش، کە قوتابیی‌یەکی کارامە و چالاکی پەیام و قوتابخانەی نوورە، لە نامەکەیدا دەڵێت:

منالێك تەمەنی دە ساڵانە، لە گوندێکەوە کە دوو ڕۆژە ڕێ دوورە، هاتووە و وازی لە گوند و ماڵ و حاڵی خۆی هێناوە و، بۆ نووسینەوەی پەیامەکانی نوور لێراوە، هەرچەندەش لەوەوپێش هیچی نەنووسیوە! جا هەروەك ئەمە کەرامەتێکی پەیامەکانی نوورە، لە هەمان کاتدا گوڵێکی دەراسای ناسکی قوتابخانە نوورانیی‌یەکەیەتی.

ئێمەش دەڵێین:

هەروەك پشكووتنی چەند گوڵێكی جوان لە زستانێكی ماددیی سەختدا بە كارێكی دەراسای توانستی خواوەند دادەنرێت.. بە هەمان جۆر پشكووتنی هەزار گوڵی ناسك و جوان و بەروبوومی بەهەشت لە درەختی "ساو"دا – واتە گوندی ساو – لەم زستانە مەعنەوی‌یە سامناكەی ئەم چەرخەدا، بێ گومان موعجیزەیەكی میهرەبانی و كەرامەتێكی چاودێریی پەروەردگارە بۆ ئەم شارە و، ڕێزلێنانێكی دەراسای خواییە بۆ قوتابیانی نوور!

بەڵێ، ئێمە باوەڕمان وایە و، بە نزا و لاڵانەوەشەوە شوكر و سوپاسمان پێشكەشی خوای گەورە دەكەین.

هەروەها ئەحمەدی دارتاش لە نامەكەیدا دەڵێت:

قوتابی‌یە چالاكەكانی گوندەكەمان، بە چالاكی و لێبڕانیان، قوتابیانی گیانفیدای قوتابخانە شەرعی‌یەكانی پێشووانمان یاد دەخەنەوە. كە ئەمەش دڵخۆشی‌یەكی لەڕادەبەدەری بە ئێمە و قوتابیانی نوور بەخشیوە.

خوشكان و كچە قوتابیانی قوتابخانەی نوور كارێكی گەلێ جوان دەكەن كە بە زیكر و ویردە قورئانی‌یەكانیان و دوعا كردنیان بۆ نووسەرەوە خاوەن قەڵەمەكان، یارمەتیی مەعنەوی‌یان دەدەن. كە ئەمەش دەبێت بە ڕێنماییەك بۆ ئافرەتانی ئەم ناوچانەش. دەسا خوای گەورە هەتاهەتایە لەو نووسەرەوانە و، لەو خوشكانە و، لە هەموو قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە و، لە مامۆستاكەشیان ڕازی بێت.

❏ كەسی دووهەم و مەسەلەكەی:

ڕۆژێكیان یەكێك لە قوتابی‌یە لاوەكانی نوور كە قورئانی پیرۆزیان لەبەرە، پێی وتم، وەك زۆر كەسی تریش كە دووچاری هەمان حاڵەت دەبن:

– ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشیی لەبیرچوونەوەم پەرە دەسێنێت، چی بكەم؟

وتم:

هەتا دەتوانیت بە "نەزەری حەرام" مەڕوانە. چونكە وەك لە ئیمامی شافیعی‌یەوە – خوای لێ ڕازی بێت – دەگێڕنەوە فەرموویەتی:

"ڕوانینی حەرام لەبیرچوونەوەی لێ دەکەوێتەوە"[١].

بەڵێ، هەتا ڕوانینی حەرام لەناو موسڵماناندا لە زیادبووندا بێت، ئەوا ئارەزووەکانی دەروونیان پتر هەڵدەچێت و، لەوەشەوە ئیسراف و زیادەڕەوی پەرە دەسێنێت، بە ڕادەیەك كە مرۆڤ ناچار دەبێت لە ماوەی یەك حەفتەدا چەندین جار خۆی بشوات. دیارە ئەمەش - وەك لە زانستی پزیشكیدا زانراوە - توانای لەبەركردنی ئەو مرۆڤە بەرەو لاوازی دەبات.

ئەو هۆیەش كە نەخۆشیی لەبیرچوونەوەی بەو چەشنە گشتی‌یە پەرە پێ داوە: زۆری و پەرەسەندنی ڕووتیی ئافرەتانە لەم سەردەمەدا، بە تایبەت لە ناوچە گەرمەسێرەكاندا. چونكە ئەم كارە بووە بەهۆی زۆربوونی ڕوانینی حەرام، كە ئیسراف و زیادەڕەوی بەرهەم دەهێنێت. ئەمەش لە ڕادەیەكی وەهادایە كە هەموو كەسێك و، هەركەسەش بە ڕادەی گیرۆدە بوونی بەو نەخۆشی‌یە، سكالای لەبیرچوونەوەی لێ دەبیستیت كە دووچاری بووە.

لەوانەیە تەئویلی لایەنێكی ئەو فەرموودە پیرۆزەی كە مەترسیی لابردنی قورئان لە سنگی خەڵكی ئاخر زەماندا ڕادەگەیەنێت، بە زیادبوونی ئەم نەخۆشی‌یە بێتەدی.

واتە: ئەم نەخۆشی‌یە پتر پەرە دەسێنێت هەتا ڕێ دەگرێت لەوەی قورئانی پیرۆز لەبەر بكرێت. ئەو كاتەش تەئویلی فەرموودەكە دێتەدی.

ولا يعلم الغيب الاّ الله.

❑ كەسی سێهەم و مەسەلەكەی:

ئەمەیان كەسێكە پەیوەندی‌یەكی توندوتۆڵی لەگەڵماندا هەیە و، زۆربەی جار سكالایەكی تاڵ دەردەبڕێت و، داوای یارمەتی دەكات و، دەڵێت:

---

(١) لەوانەیە مەبەست لەم شیعرەی ئیمامی شافیعی بێت كە دەفەرموێت:

شكوت إلى وكيع سوء حفظي    فأرشدني إلى ترك المعاصي
وأخبرني بأن العلم نور    ونور الله لا يُهدى لعاصي

بڕوانە: ص٥٤ ديوان الإمام الشافعي، جمع محمد عفيف الزعبي. نشر دار النور - بيروت. (وەرگێڕ)

"لەتوانامدا نی‌یە ببم بە پیاوی ڕاستەقینە.. بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بێ کەڵك و خراپ و ڕسوا دەبم و، ناتوانم ئەنجامی خزمەتە مەعنەوی‌یەکانم ببینم"!

ئێمەش پێی دەڵێین:

ئەم دنیایە خانەی کار و هەوڵدانە و، جێی پاداشت وەرگرتن نی‌یە. کەواتە پاداشت و بەروبووم و نوورەکانی کردارە چاکەکان لە بەرزەخ و ئاخیرەتدا بە مرۆڤ دەبەخشرێن. دیارە هەوڵی ڕاکێشان و بەدەستهێنانی ئەو بەربوومە نەبڕاوانە لەم دنیا فانی‌یەدا، ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ دواڕۆژی خۆی بکات بە شوێنکەوتەی ئەم دنیایەی! ئەو کاتەش ئیخلاسی کردەوە چاکەکانی زامدار دەبێت و ڕووناکی‌یەکەی لەدەست دەچێت.

بەڵێ، ویستنی ئەو بەروبوومانە نابێ تەنانەت بە نیازی دڵیشدا بێن، بەڵکو شوکرانەیان لەسەر پێشکەش دەکرێت، ئەگەر بۆ هاندان لە دنیادا بە مرۆڤ بەخشران.

بەڵێ، وەك لە چەند پەیامێکدا وتراوە:

ئەم سەردەمە، خۆشەویستیی ژیانی دنیای لە مرۆڤدا بە توندی داکوتاوە و بە ناو دەمارەکانیدا گێڕاویەتی و، مرۆڤی هاوچەرخی بە چەندین برینی قووڵ زامدار کردووە، بە ڕادەیەك کە دەبینیت پیرێکی بەتەمەن و مرۆڤێکی زانا و پیاوچاکێکی خاوەن تەقوا، لەبەر ئەوەی کە پێش هەموو شتێك فەرمانی چێژەکانی ژیانی دنیا بەسەریاندا زاڵە، دەچن لەم دنیادا داوای چێژەکانی ژیانی ئەو دنیایان دەکەن!

❑ چوارەم:

یەکێکە پەیوەندیی لەگەڵماندا هەیە و، بە وێنەی زۆر کەسی تر، سکاڵا بۆ نەمانی ئەو چێژ و شەوقانەی دەردەبڕێ کە زووتر لە ویردەکانیدا هەستی پێ کردوون کاتێ کە پابەندی تەریقەتی سۆفی بووە، کەچی ئێستا "دڵتەنگی" و "خەو"ی بەسەردا زاڵ دەبن!

پێمان وت:

هەروەك "هەوا" كاتێ كە پیس دەبێت و تێك دەچێت هەناسەی مرۆڤی پێ تەنگ دەبێت، بە تایبەت ئەو كەسانەی كە حەساسیەت لە سنگیاندا هەیە..

"هەوای مەعنەوی"ش هەندێ جار كە تێك دەچێت و پیس دەبێت بە هەمان جۆرە! بە تایبەت لە مرۆڤی ئەم سەردەمەدا كە لە كاروبارە مەعنەویەكان دوور كەوتوونەتەوە.. بە تایبەت تر لەو ولاتانەدا كە بەرەلا كردنی هەوا و ئارەزووی دەروونیان تێدا بلاوە.. نەخوازەلا دوای سێ مانگە موحەرەم و سێ مانگە پیرۆزەكان، كە بەهۆی بێداریی جیهانی ئیسلام و ڕووكردنی خەڵكی بەگشتی لە خوای گەورە هەوای مەعنەوییان تێدا پاكژ و پاڵفتە دەبێت. بەلام بە تەواوبوونی ئەو مانگە پیرۆزانە و وەستانی ئەو ڕووتێكردنە گشتییەی خەڵكی بۆ خواوەند، گومڕاییەكان دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت كە لە ژێر پاڵەپەستۆكانی زستان و شكستی خۆسەپاندنی ژیانی دنیا و ئارەزووە دەروونییەكاندا، كار بكەنە سەر تێكدان و پیس كردنی هەوای مەعنەوی. لە ئەنجامی ئەمەشدا وەنەوز و خەو، لە بریی شەوق و زەوق، بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبن لە كاتی خوێندنی ویردە خاوێنەكاندا و، لە دەمی كز بوونی شەوقی دوارۆژ لای ئیماندارانی موسڵمان، بە تایبەت بە هاتنی بەهار و دەركەوتنی ژیانی دنیا.

بەلام بەپێی ناوەرۆكی: "خير الأعمال أحمزها"[(١)] (واتە: باشترین كار بەهێزترینیانە) ئەو كردەوە چاك و كاروبارە قیامەتییانەی كە لەگەڵ گیروگرفت و موسیبەتەكاندا هاودەمن – هەرچەندەش هەست بە چێژیان نەكرێت – پاداشتیان گەلێ بەرز و زیاترە. كەواتە دەبێ مرۆڤ لەبەر هیوای زیادبوونی پاداشتەكەی، لە ناوەندی ئەو تەنگانە و گیروگرفتانەدا، بە شادمانییەوە شوكرانەی خۆی پێشكەش بە خوای گەورە بكات و هەمیشە خۆڕاگر و بەئارام بێت.

---

(١) ذكر في اللآلئ عقبة أن مسلماً روى في صحيحه قول عائشة: إنما أجرك على قدر نصبك وهو في نهاية ابن الأثير مروي عن ابن عباس بلفظ سئل رسول الله ﷺ: أي الاعمال أفضل؟ قال: أحمزها. (أقواها وأشدها) (باختصار عن كشف الخفاء ٤٥٩). (وەرگێڕ)

❑ پێنجەم:

یەکێك لە قوتابیانی نوور (زیاد بوونی خەم و خەفەتی ژیان) دەهێنێتەوە بە بیانوو بۆ هەوڵ نەدانی لە خزمەتی "پەیامەکانی نوور"دا!

ئێمەش پێمان وت:

لەبەر ئەوەی تۆ کار بۆ "پەیامەکانی نوور" ناکەیت، ئەوا خەم و خەفەتی گوزەرانت لەسەر زیاد بووە! چونکە هەموو قوتابیەکی ئەم ناوچانە - منیش وەك ئەوان - دان بەوەدا دەنێن کە:

هەرکات هەوڵ بۆ پەیامەکانی نوور بدەین و لەو پێناوەدا تێبکۆشین، ئاسانی لە ژیان و گوزەراندا و خۆشحاڵی و شادمانی لە دڵماندا هەست پێ دەکەین!

❑ شەشەم:

ئەم سەعیدە لاوازەیە. چونکە ئەو رێز و خۆشەویستی و هاودەمیەی کە خەڵکی لە دەرەوەی بازنەی پەیامەکانی نووردا حەزیان لێیەتی و بە دوایدا دەگەرێن، هێندە بەلامەوە قورس و قەبە و ئازار بەخشن کە بە تەواوی لێیان بێزارم.

پێم وایە تایبەتمەندییە بەرزەکانی پەیامەکانی نوور و رەوشتە یەکجار پێشکەوتووەکانی کەسی مەعنەویی قوتابیانی - کە چەند واتایەکی گەورەی هێندەی چیاکانن - گەر بخرێنە ئەستۆی کەسێکی لاوازی کۆڵەواری وەکو من، کە لەرادەبەدەر رێی کۆڵەواریی گرتووەتە بەر، لە ژێریدا دەپلیشێتەوە و لێیان بێزار و دڵتەنگ دەبێت.

بەڵێ، بەم جۆرە تێگەیشتم.

برای ئومێدەواری دوعا و
موشتاقی بینینتان
سەعیدی نوورسی

* * *

(تاکە چارەسەر پەیامەکانی نوورە)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

هەرگیز لەم دەستدرێژی و پەلامارە نوێیەی کە هێنرایە ڕێمـان، دڵگـران مـەبن. چونکە پەیامەکانی نوور لە ژێر چاودێریی خوای گەورەدان.

ئەوەش بزانن کە بە چەندەها تاقیکردنەوە چەسپاوە و دەرکـەوتووە کـە تـا ئێستا ڕووی نـەداوە تـاقمێکی کـارگوزار بووبێـتن و لــە چــەندەها خزمــەتی مــەزندا تێکۆشابن، کەچی وەکو ئێمە بە چەند گێروگرفتێکی کەم ڕزگاریان بووبێت!

ئێوەش و ئـەوانیش بـاش بزانـن کـە هـەروەك "صەدەقە" بـەڵا و گرفتـەکان دەباتـە دواوە، پەیامـەکانی نووریش - بە هـەمـان جۆر - هـۆی دوورخسـتنەوە و لابردنـی بەڵا و گرفتە ئاسمانییەکانن لەسەر ئەنادۆڵ، بە تایبەت ئیسپارتە و قەستەمۆنی.

بەڵێ، پەیـامەکانی نوور بە وێنـەی کـەشـتیی نـووح - درووودی خـوای لەســەر بێـت - وان، چونکـە یـەکێکن لـە هۆکارەکـانی ڕزگـار بوونـی خەڵکـی سـەر ئـەم زەوییە لە سزا و بەڵا لەناودەرەکانی گۆی زەوی، بە ڕادەیەك کـە ئـەنادۆڵی وەکو چیای جـوودی لــێ کـردووە! چونکە ئەو سنوور شکاندن و لـەڕێ لادانـەی کـە ئەنجامی لاوازیی ئیمانە، موسیبەت و گێروگرفتی گشتی بەسـەر زۆرینـەی خـەڵکیدا دەبارێنێت.

جا پەیامەکانی نوور کە ئیمان لەناو دڵاندا بەهێز دەکەن، بوون بـە هۆکـارێك لـە خزمەتی میهرەبانیی خواوەنـددا کـە ئـەو موسیبەت و بـەڵا گشـتییەی لـە دەرەوەی بازنەکەیدایە، لەسەر خەڵکی هەڵبگرێت.

کەواتـە دەبێ ئەوانـە (واتـە ئـەهلی دنیـا و خـەڵکی ئـەنادۆڵ) بـە نیـازی خـراپ توخنی "پەیامەکانی نوور" نەکەون، با خۆیشیان نەڕۆشتبنە ناو بازنەکەیانـەوە! دەنـا گەر خۆیان لە قەرەی ئەو پەیامانە بدەن و دەستدرێژییان بکـەنە سـەر، دەبێ بـیر لـەو ئـاگر و تۆفـان و بڵاوبوونـەوەی تاعوونـەش بکەنـەوە کـە لـەم نزیکانـەدا چـاوەڕوان دەکرێن. دەبا بگەڕێنەوە بۆ لای هۆش و ژیریی خۆیان!

جا لەبەر ئەوەی کە ئێمە دەست لە دنیاکەیان وەرنادەین، ئەوا لە کاتی دەستدرێژیی ئەواندا، کە تا ئەم ڕادەیە و بێ هیچ بەهانە و هۆیەك دەیکەنە سەر ئاخیرەتمان، گریمانێکی بەهێز بۆ داباربینی بەڵا و موسیبەتەکان لە ئارادایە.

دەسا با ئەهلی سیاسەت - هەر چەندە ئێمە هیچ پەیوەندی‌یەکمان پێیانەوە نی‌یە - بەوپەڕی بێ گومانی‌یەوە بزانن کە تاکە چارەسەری ئاژاوە و تیرۆر و دارمان و دواکەوتنی سامناك بۆ نەتەوەی ئەم وڵاتە و لەم چەرخەدا تەنها بناغەکانی پەیامەکانی نوورە.

با ئەو کەسە بەری و بێ گوناهانە و مامۆستاکەشیان کە لە ئەنجامی ئەم ڕووداوەدا دووچاری ئەشکەنجە و ئازار بوون، باش بزانن کە هەرکەسێك لە باروەدۆخێکی سەخت و دژواردا ئێشك(رباط) بگرێت، پاداشتی ساڵێکی پەرستشی دەست دەکەوێت و، سەعاتێکی بیرکردنەوەی ئیمانیی ڕاستەقینەش لە حوکمی ساڵێکی پەرستش و گوێڕایەڵیدایە.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ئازار و ئەشکەنجەکانی ئەوان، ئەم پاداشتەمان دەست بخات.

لەبەر ئەوە، دەبێ ئەو برایانە لە بریی نیگەرانی و ئازار، بە خۆشحاڵی و شادمانی‌یەوە ڕووبەڕووی ئەم چەشنە ڕووداوانە ببنەوە.

* * *

(ئەم خزمەتەمان بۆ ڕزگاریی ڕێسا و ئاسایش تێدەکۆشێت)

کارمەندێکی بەرپرس کە پەیوەندیی بە ئێمە و بە سیاسەتەوە هەیە و، گەلێ سەرقاڵی چاودێری کردنی ئێمەیە، هات بۆ لام و منیش پێم وت:

ماوەی هەژدە ساڵە سەردانی ئێوەم نەکردووە و تەنانەت یەك دانە ڕۆژنامەشم نەخوێندووەتەوە. ئنجا وا هەشت مانگە تەنها بۆ یەك جاریش لە بارەی ڕووداوەکانی جیهانەوە هیچ شتێکم لە کەس نەپرسیوە و، گوێم لە ڕادیۆش

نەگرتووە کە سێ ساڵە لێرەوە دەبیسترێت و بەرگوێ دەکەوێت. هەموو ئەمانەش، لەبەر ئەوەیە کە هیچ زیانێکی مەعنەوی لە خزمەتە بەرزەکەمان نەکەوێت.

هۆکاری ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە:

خزمەتی ئیمان و حەقیقەتەکانی لە هەموو شتێکی ناو گەردوون گەورەترن و، نابن بە ئامراز بۆ هیچ شتێك. لەبەر ئەوە، خزمەتی قورئانی پیرۆز بە هیچ جۆرێك رێمان پێ نادات خۆمان لە قەرەی سیاسەت بدەین. چونکە:

بێ ئاگایان و گومرایانی ئەم رۆژگارە، کە لە پێناوی بەدەستهێنانی شمەکی قەڵبی دنیادا ئایینەکەیان دەفرۆشن و، ئەڵماسی بەنرخ و بەهادار بە پارچە شووشەی شکاو دەگۆڕنەوە، هەوڵ دەدەن ئەو خزمەتە ئیمانی‌یە بەوە تۆمەتبار بکەن کە ئامرازێکە بە دەست چەند تەوژمێکی بەهێزی دەرەوەی وڵاتەوە. تاکو لە شان و شکۆی بەرزی ئەو خزمەتە دابگرن.

جا ئێوەی ئەهلی سیاسەت و حکوومەت هەرگیز لەسەر بناغەی دوودڵی و گومان خۆتان بە ئێمەوە سەرقاڵ مەکەن، بەڵکو دەبێ کۆسپەکانمان لە رێدا نەهێڵن و رێگامان لە بەردەمدا بۆ ئاسان بکەن. چونکە خزمەتگوزاری‌یەکەی ئێمە ئاسایش و رێز و میهرەبانی دادەمەزرێنێت و، بۆ رزگاری و پشتگیری رێسا و ئاسایش و دەرباز کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بەربادی و تۆقاندن و تیرۆر تێدەکۆشێت. کەواتە ئەم خزمەتەی ئێمە پایەکانی کارمەندی‌یە راستەقینەکەی ئێوە جێگیر و بەهێز دەکات و پشتی دەگرێت.

* * *

(لە بارەی بەرهەمەکانی سەعیدی کۆن و نوێ)

لەم رۆژانەدا روانیمە ئەو پەیامانەی کە "صەلاحەددین" لە ئەستەمبوڵەوە هێنابوونی و، بریتین لە: "حبّة، قطرة، شمّة، حباب" و، پەیامە عەرەبی‌یەکانی تری هاوچەشنیان.

بینیم ئەو ڕاستییانەی کە سەعیدی نوێ لە گەشتە قەلبییەکەیدا ڕاستەوخۆ بینیونی، لە ڕاستیدا وەك ناوك وان بۆ پەیامەکانی نوور.

جا ئەم پەیامانە - "شعلة" و "زهرة" نەبێ - هەموویان چەند بەشێکی عەرەبیی پەیامەکانی نوورن، بەڵام ئەوەندە هەیە ڕاستییەکانیان بە چەند دەستەواژەیەکی پوخت و بە زمانی عەرەبی تێدا باس کراوە، چونکە ڕووی گوفتاریان ڕاستەوخۆ لە دەروونی خۆمە و لە دەمی نووسینیاندا جگە لە خۆم ئاوڕ لە کەسی تر نەدراوەتەوە. لە کاتی خۆیشیدا یەك بە یەکی "شیخ الإسلام" و ئەندامانی "دار الحکمة الإسلامیة" و گەورە زانایانی ئەستەمبووڵ بە ڕێز و سەرسووڕمانەوە ئەو پەیامانەیان هەڵسەنگاند.

جا لەبەر ئەوەی ئەم پەیامانە لە بەرهەمەکانی سەعیدی نوێن، ئەوا بە چەند بەشێکی پەیامەکانی نوور دادەنرێن.

سەبارەت بە بەرهەمەکانی سەعیدی کۆنیشەوە "إشارات الإعجاز" پلە و شوێنێکی گرنگی لە نێوانیاندا گرتووە.

پەیامی "چەند بریسکانەوەیەك"یش کە لە نێوان هەردوو هیلالی ڕەمەزاندا هەردوو سەعید بەشدارییان لە دانانیدا کرد و بە بێ ویستی خۆم شێوەیەکی چەشنی هۆنراوەی لەخۆ گرت، دەتوانرێت ئەویش بڕواتە ناو پەیامەکانی نوورەوە. بەڵام بە داخەوە نەمتوانی تەنها یەك نوسخەشم لێ دەست بکەوێت، چونکە لەبەر ئەوەی برەوێکی زۆری هەبوو، هەموو نوسخە چاپکراوەکانی تەواو بوون.

هەروەها سەعیدی کۆن نامیلکەی "قزل إیجاز"یشی لە زانستی مەنتیقدا هەیە کە پاڵێوراوی نامیلکەی چاپ نەکراوی "تعلیقات"ە و، پەیامێکی هێندە ناوازەیە لە زانستی مەنتیقدا کە زانایانی گەورە و بەتوانا سەرسامی و بایەخ و سەرسووڕمانی خۆیان لە بارەوە دەربڕی.

بە شایانی ئەوەم زانی کە سەرنجی زانایانی ناو قوتابیانی نووری بۆ لا ڕابکێشم و، مەودای پەیوەندیشی بە پەیامەکانی نوورەوە دەربخەم، بەڵام گەلێ

قوولە و، لەگەڵ ئەوەشدا لەم ڕۆژانەدا چەند وانەیەکم لەو نامیلکەیە بە "فەیزی" وتەوە. لەوانەیە لە ڕۆژانی داهاتوودا و بۆ سوود گەیاندن بە کەسانێکی تر "فەیزی" ئەو وانەیە بە زمانی تورکی بنووسێتەوە.

* * *

(ڕۆڵی برسێتی لە فیتنەی ئاخر زەماندا)

برایانی ئازیز و بەوەفا و دامەزراو و میراتگرانی ڕاستەقینەم!

لەم ڕۆژانەدا و بە ناوی قوتابیانی پەیامەکانی نوورەوە پرسیارێکی مەعنەویی لەوپەڕی گرنگی و شپرزیم بە دڵدا هێنرا، پاشان هەستم کرد زمانی حاڵی زۆربەی قوتابیانی نووریش هەمان پرسیار دەردەبڕێت.

کتوپڕ وەڵامێکم بۆ ئەو پرسیارە بە دڵدا هات و، بە سەرزارەکی بۆ فەیزیم باس کرد. ئەویش وتی:

با بە پوختی بینووسین.

پرسیارەکە ئەمەی خوارەوە بوو:

لە ڕیوایەتەکانەوە وا دەردەکەوێت کە "برسێتی" ڕۆڵێکی گرنگ لەم فیتنەی ئاخر زەمانەدا دەبینێت و، گومڕایانیش هەوڵ دەدەن لە ڕێی برسی کردنی خەڵکییەوە ئیمانداره لاواز و برسییەکان بە ڕادەیەك لە داخوازییەکانی خەم و خەفەتی ژیان و گوزەراندا نوقم بکەن کە هەست و نەستە ئایینییەکانیان لە بیر بەنەوە، یان دایانبەزێننە پلەی دووهەم و سێهەم!

جا لەبەر ئەوەی ئیمانداران و بێ تاوانان، لە ڕووی قەدەری خواوەندەوە لە هەموو شتێکدا تەنانەت لە ئازار و سزای قاتی و گرانیشدا، ڕوویەکی میهرەبانی و دادگەریی خواوەند ئاوڕیان لێ دەداتەوە.. ئەوا دەبێ "میهرەبانی" و "دادگەری" لەم گێرو گرفتەی ئێستادا بە چ شێوەیەك بێت و، لە چ ڕوویەکەوە ئیمانداران - بە تایبەت قوتابیانی نوور - سەبارەت بە ئیمان و دوارۆژەوە سوود لەم موسیبەتە ببینن و، بە چ ڕەفتار و مامەڵەیەك ڕووبەڕووی ببنەوە؟

وەڵام:

گرنگترین هۆکاری ئەم موسیبەتە بریتی‌یە لەو سەرپێچی و ملنەدانەی کە ئەنجامی کوفری نیعمەت و ناشکوری و رێز لێ نەنانی شایانی بەخششەکانی خوای گەورەیە. بۆیە "دادگەری دانا" بۆ ئەوەی چێژی ڕاستەقینەی نیعمەتەکانی خۆی بە تایبەت خۆراکەکان و بە تایبەت ئەوانەیان کە تایبەتن بە ژیانەوە و نەخوازەڵا نیعمەتی هەرە گەورەی "نان" پیشانی خەڵکی بدات و گرنگیی گەورە و پلەی بەرزی لە خانەی نیعمەتەکاندا پێش‌چاو بخات، ئەوا لەبەر دانستی خۆی خەڵکی بەرەو شوکری ڕاستەقینە دەداتە بەر و، ئەم گرفتە بۆ ئەو کەسانە دەنێرێت کە شوکرانەی پەروەردگاریان ناکەن و، بایەخ بە وەرزشی ئایینیی مانگی ڕەمەزان نادەن. کەواتە دادگەریی خواوەند سەرتاپا داناییە.

ئەرکی سەرشانی ئیمانداران و ئەهلی حەقیقەتیش بە تایبەت قوتابیانی پەیامەکانی نوور لەم کاتانەدا، لەوەدایە کە هەوڵ بدەن وەك هۆکارێکی پەنا بردن بۆ خوای گەورە و، پەشیمان بوونەوە لە گوناهەکان و، ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی خواوەند بۆ ئەم بەڵای برسێتی‌یە بڕوانن، بە وێنەی ئەو برسێتی‌یەی کە مرۆڤ لە دەمی ئەنجامدانی وەرزشی ئایینیی مانگی ڕەمەزاندا دووچاری دەبێت..

هەروەها دەبێت نەهێڵن بە بیانووی "زەروورەت" دەرگا لە بەردەم سواڵ و دزی و بێ سەروبەرەیی بخرێتە سەرپشت و، هەوڵ بدرێت "زەکات" بەو هەژارە برسی‌یانە بدرێت کە هەندێ لە دەوڵەمەندان و مووچە خۆران بەزەییان بە حاڵیاندا نایەتەوە، ئیتر گوێ لە پەیامەکانی نوور ڕابگرن و، بەهۆی هەست کردنیان بەم برسێتی‌یە ناچاری‌یەی خۆیان بەزەییان بە حاڵی ئەوانیشدا بێتەوە..

هەروەها لاوان هەوڵ بدەن ئەو ڕووداوە لە سوود و بەرژەوەندیی خۆیاندا – نەك وەك بەڵایەك لەسەر خۆیان – بەکار بهێنن. ئەمەش بەوە دەبێت کە بە ڕێنمایی پەیامەکانی نوور هەنگاو بنێن و، بە وێنەی کەسانی بەغیرەت سوودیان لێ وەربگرن. چونکە گرفت و موسیبەتەکان سنوورێك بۆ سەرکەشیی دەروونیان

دادەنێن و، دەبن بە بەربەست لە نێوان ئەوان و چێژ و ئارەزووە بێ نرخەکانی دەروونیاندا. ئیتر دەڕۆنە سایەی گوێڕایەڵی و کردەوەی چاکەوە و، تا ڕادەیەکیش لە گوناهـ و ڕەفتاری ناپەسەند دەکشێنە دواوە، دوای ئەوەی کە ماوەیەك بە خۆراکە خۆش و بەلەزەتەکان دەروونی خۆیان لە ڕێ ترازاند و، فام و ژیرییان لەدەست دا و، بەرەو سەرپێچی و هەوا و ئارەزووە نزمەکان دایانە بەر..

هەروەها دەبێ کەسانی خاوەن پەرستش و کردەوەی چاك بە وێنەی وەرزشێکی شەرعی بڕواننە ئەم بەڵایەی کە دووچاری بوون، بە تایبەت لەم کاتەدا کە زۆربەی خەڵکی بە برسێتییەوە دەتلێنەوە و، بە چەشنێکی هێندە ئاڵۆزیش ماڵ و سامانی حەرام و حەڵاڵ تێکەڵ بە یەکتر بوون کە مەحاڵە لە یەکتر جیا بکرێنەوە و، وەکو ماڵی شوبهە لێکراویان لێ هاتووە و، بەو ئەندازە پێویستەی گوزەرانی گشتیی خەڵك – کە لە ناوەرۆکدا هەموان تیایدا بەشدارن – قەناعەت بکەن تاکو پێیان حەڵاڵ بێت و، بەم کارەشیان – لە بریی سکاڵا دەربڕین – بە ڕازی بوونەوە پێشوازی لە قەدەری خوای گەورە بکەن.

سڵاو بۆ هەموو برایان دەنێرم، بە تایبەت خاوەن بەڵا و گیرۆدەبووان و، دوعای سەلامەتییان لای خوای گەورە بۆ دەکەم.

* * *

(پەیوەندیکردن بە پەیامەکانی نوورەوە)

واعیزێکی بەناوبانگ لە ئەستەمبووڵەوە هاتبوو بۆ سەردانم، کەچی نەیتوانی ببینێت و گەڕایەوە.

وا ئەمەی خوارەوە وێنەی نامەیەکە کە بۆ یەکێکیان نێرراوە. لەوانەیە کەسانێك بن – وەك ئەم – پێویستیان بەم گوفتارە بێت:

ئەو قوتابیانەی نوور کە سەردانی ئەستەمبووڵیان کردبوو، هەواڵی هیممەت و چالاکی و ئامۆژگارییە کاریگەرەکانی ئێوەیان پێ گەیاندین و، پڕ بە دڵ

پێخۆشحاڵن کەسێکی بێگەرد و دڵسۆزی دامەزراوی وەك ئێوە لەناو بازنەی پەیامەکانی نووردا ببینن. هەروەك خۆیشم لە ناخەوە پێم خۆشە جەنابتان لە ناوەندی بازنەی پەیامەکانی نووردا ببینم.

دەزانن کە دوو پیتی ئەلف گەر بە جیا جیا بنووسرێن، نرخیان تەنها دوو دەبێت. بەڵام گەر شان بە شانی یەك و لەسەر یەك هێڵ یەك بگرن، نرخیان دەبێت بە یازدە. کەواتە ئەو خزمەتە ئیمانییەی کە بەڕێزتان بە ئامۆژگارییە ڕاست و دروست و کاریگەرەکانتان ئامادەی دەکەن، ئەگەر هەر ئاوا بە تەنیا بمێنێتەوە، گەلێ دژوارە بتوانێت بەرەنگاری هێرشە یەکگرتووەکانی کاتی ئێستا بکات. بەڵام گەر پەیوەندی بە خزمەتی پەیامەکانی نوورەوە بکات ئەوا - بە وێنەی دوو ئەلفەکە - نرخەکەی دەبێت بە "یازدە" بەڵکو "هەزار و سەد و یازدە" و، هێزیشی هەر لەو ئەندازەیەدا دەبێت و، بەرەنگاری گومڕاییەکانی بەرامبەری دەبێتەوە کە یەکیان گرتووە.

* * *

(کەسی مەعنەوی)

ئەم سەردەمە سەبارەت بە شوێنکەوتووانی ڕێگای ڕاستی، سەردەمی کۆمەڵە و، هەرگیز هی کەسێتیی تاك و دەرخستنی خۆویستی و لەخۆباییبوون نییە. چونکە تەنها ئەو کەسێتییە مەعنەوییەی کۆمەڵە کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێت و، بەرامبەر گەردەلوول و زریانەکان ڕادەوەستێت. کەواتە بۆ ئەوەی حەوزێکی مەزن دروست بکرێت، دەبێت "تاك" کەسێتی و خۆویستی و لەخۆباییبوونی خۆی، کە وەك شەختە سەهۆڵێکی ڕەق و تەق وایە، بهاوێتە ناو ئەو حەوزەوە و لەوێدا بیتوێنێتەوە. دەنا بە دڵنیایی ئەو شەختە سەهۆڵە دەتوێتەوە و بەفیڕۆ دەڕوات و، لە هەمان کاتیشدا دەرفەت و سوود وەرگرتنیشی لەو حەوزە لەکیس دەچێت!

گەلێ جێی سەرسووڕمان و مایەی خەفەتە کە شوێنکەوتووانی حەق و ڕاستی بە هۆی جیاوازیی نێوانیان ئەو هێزە هەرە مەزنە لە کیسی خۆیان دەدەن کە لە

یەکگرتندایە. کەچی گومڕایان و دووڕووان لە نێوان خۆیاندا لەسەر ئەو هێزە گرنگە یەکدەگرن، هەرچەندەش ئەم کارە پێچەوانەی مەشرەبی ئەوانە. ئیتر لەم ڕێیەوە بەسەر ڕێژەی لە سەدا نەوەدی ئەهلی حەقیقەتدا سەردەکەون. لە کاتێکدا کە خۆیان لە سەدا دە زیاتر نابن!

* * *

(ئازایەتیی خۆبەختکاران)

برا ئازیز و وەفادارەکانم!

دە خولەك پێش ئێستا، دوو کەسی نەخوێندەوار بە ئازایەتی و جوامێرییەوە هاتن بۆ لام، کە یەکێکیان ئەوی تری هێنابووە ناو بازنەی پەیامەکانی نوورەوە!

منیش پێم وتن:

ئەو ئەنجامە مەزنانەی کە ئەم بازنەیە دەیانبەخشێت لە بەرامبەرەوە داوای "وەفایەکی نەجووڵ" و "دامەزراوییەکی نەگۆڕ" دەکەن. چونکە بناغەی ئەو خزمەتەی نوور کە قارەمانانی ئیسپارتە پێش چاوی دەخەن: "وەفای دەراسا" و "توندوتۆڵی" و "دامەزراوی"ی لەڕادەبەدەریانە. هەروەك "هێزی ئیمان" و "ڕەوشتی ئیخلاس"یش هۆی ئەم توندوتۆڵی و دامەزراوییەی ئەوانە و، هۆکاری دووهەمیش "ئازایەتیی سروشتی"یە!

هەروەها پێم وتن:

ئێوە بە ئازایەتی و مەردایەتی ناسراون، تەنانەت هەندێ جار بۆ شتانی بێ نرخی دنیاییش قارەمانێتی و گیانفیدایی دەنوێنن. بێ گومان لە خزمەتی بەرزی پەیامەکانی نووردا و لە بەرامبەر ئەنجامە قیامەتییەکانیەوە کە بە هیچ نرخێکی دنیا بەهایان بۆ دانانرێت، ئێوە هەر بە هەمان جۆر "وەفا"ی خۆتان دەپارێزن و "توندوتۆڵی" و "دامەزراوی"ی مەردانی بەغیرەت و "ئازایەتی"ی خۆبەختکارانی گیانفیدای تێدا دەنوێنن.

ئەمەم پێ وتن و، ئەوانیش پەسەندیان کرد و پێی ڕازی بوون.

* * *

(بۆچی وەك کەسێکی سیاسەتمەدار بۆت دەڕوانن)؟

"ئەمەی خوارەوە وەڵامی پرسیارێکی ئەو قوتابیانەی نووره کە بەردەوام لە خزمەت مامۆستادان و لە ئیش و کارەکانیدا یارمەتیی دەدەن".

پرسیار:

ئێمە زۆر لە مێژە لە کاروبارەکانتاندا یارمەتیتان دەدەین و، لەم ماوەیەشدا نەمان بینیوە کە بایەخ بە دنیا بدەن و بڕواننە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری. چونکە ئەو کارەی کە بە تەواوی ئێوەی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە بریتی‌یە لە وانەکانی "ئیمان" و "ئاخیرەت". زانیویشمانە کە ماوەی هەژدە ساڵە ئێوە لەسەر ئەم حاڵەن..

ئیتر لەبەر چی ئێوەیان بەرەو دادگا دایەبەر و.. بە بێ هیچ پێویستی و داخوازێکیش خەڵکیان لە ئیسپارتەدا ورووژاند و.. نەیانتوانی لە سەد کەسی هاوڕێتاندا هیچ پەیوەندی‌یەك بە دنیا و سیاسەتەوە بدۆزنەوە، مەگەر بەهانەیەکی لاواز کە دوای لێکۆڵینەوەی چوار مانگ دۆزی‌یانەوە و، هەتاهەتایشە خۆیان و دادگاکەیانی پێ شەرمەزار دەبێت و.. ئنجا لە نێوان سەد کەسدا تەنها حوکمی چەند مانگێکیان بەسەر چەند کەسێکی کەمدا سەپاند.. پاشان وا شەش ساڵ زیاتریشە ئێوە لە ژێر چاودێریی پۆلیسدان و، بەهۆی پەنجەرەکانی ژوورەکەتەوە بەردەوام هەموو حاڵەتێکت لە پێش چاوی پاسگادا دیارە و.. تا دوو سێ مانگ پێش ئێستاش بە ئاشکرا و پەنهانی چاودێریان لەسەر دانابوویت و.. چەندین جاریش ژوورەکەتیان پشکنیوە، تاکو هاوڕێیانت لێ بتەکێننەوە..

جا ئایا بۆچی تا ئەم ڕادەیە وەك سیاسەتمەدارێکی بەتوانای گێرەشێوێن بۆت دەڕوانن؟ ئێمە هەروەك ئازار بۆ ئەم حاڵەت دەچێژین لێیشی سەرسامین. خۆ هەر تەنها چەند مانگێکە دەتوانرێت بە ئازادی سەردانتان بکرێت، چونکە پێشتر بە پەنهانی و ترس و لەرزەوە دەهاتین بۆ لات؟

تکایە ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەنەوە.

وەڵام:

منیش وەك ئێوە، بەڵکو زیاتریش، سەرسام ماوم و سەرم لەمە سووڕماوە! وەڵامی ڕوونی ئەم پرسیارەتان لە بریسکەی بیست و حەوتەمدایە کە بەرگریی بەردەم دادگایە، هەروەك لە مەکتووبی شازدەهەمیشدا ئەم وەڵامە دراوەتەوە.

وا ئێستا بە پوختی دوو بناغە ڕوون دەکەمەوە:

■ بناغەی یەکەم:

یەکێك لە داخوازییەکانی ئەرکی سەرشانی بەرپرسانی ڕێسا و بەڕێوەبردنی وڵات و پۆلیسی ئاسایش: پاراستنی ڕێبازەکەی ئێمەیە و هاندانی خەڵکە بۆ ئەوەی بیگرنەبەر. نەك ئەوەی بکەونە وەهم و گومان و دوودڵییەوە. چونکە بەردی بناغەی کارمەندی و ئەرکی سەرشانیان بریتییە لە: "ڕێز" و "بەزەیی" و "زانینی حەڵاڵ و حەرام" و "سەقامگیر کردنی ڕێسا و ئاسایشی ژیانی کۆمەڵایەتی" بە دەستوورەکانی: "گوێڕایەڵی" و "پابەندی" و "ملکەچی".

خۆ پەیامەکانی نووریش کە دەڕواننە ژیانی کۆمەڵایەتی هەموو ئەم بناغانە دەهێننەدی. هەروەك لە ڕاستیشدا ئەنجامی ئەمە دەرکەوتووە.

جا لەبەر ئەوەی گرنگترین مەڵبەندەکانی پەیامەکانی نوور هەردوو پارێزگای "ئیسپارتە" و "قەستەمۆنی"ن، ئەوا گەر ئەفسەرانی ئاسایش بە ویژدانەوە ورد بینەوە و لە چاو پارێزگاکانی تردا لە بارودۆخی ئاسایشی ئەم دوو پارێزگایە بکۆڵنەوە، بێ هیچ گومانێك یارمەتیی پەیامەکانی نوور بۆ ئەوان و ئەرکەکەی سەرشانیان – کە ڕاگیر کردنی ئاسایشە – بە ئاشکرا دەبینن.

پاشان سەرباری زۆریی قوتابیانی پەیامەکانی نوور و سەرەڕای ئەوەش کە تا ئەم ڕادەیە هێز و حەقیان بە دەستەوەیە، کەچی بە هیچ شێوەیەك خۆیان لە قەرەی تێکدانی ئاسایش و ڕێسای دەوڵەت نەداوە، تەنانەت هەزار کەس لەوان هێندەی دە کەسی تر دەستیان لە ژیانی کۆمەڵایەتی وەرنەداوە. ئەمەش دەرەنجامێکە هەرکەسێك دڵی نەشێوابێت بە ئاشکرا دەیبینێت.

حیكمەتی ئەم مەسەلەیەش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

"ئیمان" و "شەریعەت" و "ژیان" سێ مەسەلەی گەورەی جیهانی ئیسلامی و مرۆڤایەتین.

گەورەترینی ئەم سیانەش: ڕاستی‌یەكانی ئیمانە.

جا لەبەر ئەوەی ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان و قورئان نەبن بە ئامڕاز و داردەستی تەوژم و هێزەكانی تر.. هەروەها بۆ ئەوەی بوار نەدرێت شان و شكۆی ڕاستی‌یەكانی قورئان - كە وەك ئەلماس بەنرخن - بهێنرێنە خوار بۆ ئاستی پارچە شووشەی شكاو.. هەروەها بۆ ئەوەی خزمەتگوزاریی خاوێنی "ڕزگار كردنی ئیمان" بە تەواوەتی بەجێ بهێنرێت.. لەبەر هەموو ئەمانە، قوتابی‌یە تایبەتمەند و ڕاستەكانی پەیامەكانی نوور بە هەموو هێز و توانایەكیانەوە لە سیاسەت هەڵدێن و دوورەپەرێزی و نەفرینی لێ دەكەن.

تەنانەت ئەم برایەتان - وەك خۆتان ئاگادارن - هەژدە ساڵە بۆ تەنها یەك جاریش سەرم لە حكوومەت نەداوە، تاكو خۆم لە قەرەی سیاسەت و ژیانی كۆمەڵایەتی نەدەم، هەرچەندەش پێویستم پێ‌یەتی. لەم نۆ مانگەی ڕابوردووشدا تەنها بۆ یەك جاریش پرسیارم لە بارەی پشێوی و ئاشووبەكانی گۆی زەوی لە كەس نەكردووە و، حەزم لە زانینی نەبووە و، نەم ویستووە قسە و باسی لە بارەوە بكەم. بە ڕادەیەك كە تا ئێستا نازانم جەنگ تەواو بووە یان نا؟ لایەنە شەڕكەرەكان جگە لە ئینگلیز و ئەڵمان كێی ترن؟ ئێوە خۆتان باشتر ئەمە دەزانن.

ئنجا ئێوەی هاوڕێ و هاوەڵم دەزانن كە تەنها دوو جار نەبێت گوێم بۆ ڕادیۆ نەگرتووە و پرسیارم لە بارەوە نەكردووە، هەرچەندەش سێ ساڵە دەنگی دەگاتە گوێمان و لە ژوورەكەمەوە دەبیسترێت، كە ئامێرێكە خەڵكیی دووچاری چەنەبازی و سەرسامیێ و بێ ئاگایی كردووە.

جا ئەو كەسانەی كە دەست دەهێننە ڕێی خزمەت و ڕێبازی ئەم پیاوەی كە تا ئەم ڕادەیە پەیوەندیی بەم بارودۆخانەوە نی‌یە و هەر بۆیشیان ناڕوانێت، پاشان

ورووژاندنی گومان لێی و چاودێری دانـان لەسـەری و تـەنگ پێهـەڵچنینی، دەبێ چەندە لە ویژدانەوە دوور بن؟ دوورترین کەس لە ویژدانەوە دان بەمەدا دەنێت.

■ مەسەلەی دووەم:

برایانم!

دەزانن کـە ئێمـە - بـەپێی ڕێبازەکـەمان - چۆن لـە ژەهـری کوشـندە خۆمـان دەپارێزین، بـە هـەمان جۆر لـە "خۆپەرستی" و "لـەخۆباییبوون" و "خۆشویستنی زات" و هەوڵدان بۆ ئەو "پلە و پایانە"ش کە لە ژێر پەردەی ناوبانگدان، هـەڵدێین و بە تەواوی لەو شتانە دوورەپەرێزی دەکەین کە ئەو حاڵەتانەیان لەخۆ گرتبێت.

بۆ نموونـە: بـە درێژایـی حـەوت سـاڵ لـێرە بـە چـاوی خۆتـان بینیتـان و بـە لێکۆڵینەوەکانیشتان لە ماوەی بیست ساڵدا بۆتـان دەرکـەوتووە کـە مـن نامـەوێت ڕێز و پلەوپایە بۆ کەسی خۆم بەدەست بهێنم و، بە توندی ڕۆشتووم بـە گژتـاندا و، بێزار دەبم لێتـان گـەر پلەیـەکی زیـاتر لـە سنووری خۆمـم بۆ دابنێن. مـن جگـە لـە سیفەتی قوتابیی پەیامەکانی نوور - کە موعجیزەی مەعنەویی قورئانی حەکیمن لەم ڕۆژگارەدا - هیچ سیفەتێکی تر قبووڵ ناکەم و، سوپاس بۆ خوای گەورە بەوپـەڕی ملکەچی و سەلماندنەوە پەیوەندیم تەنها بەو پەیامانەوەیە.

لەبـەر ئـەوە، دروسـت بوونـی گومـان و دوودڵـی لـە زەینـی کاربەدەسـتانی حکوومەت و کارگێڕانی دەوڵەت و بەرپرسانی ئاسایشدا سـەبارەت بـە کەسـانێك کە تا ئەم ڕادەیە خۆیان لە خۆپەرستی و لـە خۆبـاییبوون و ڕیاکـاریی ژێـر پـەردەی ناوبانگ پاراستووە و، ئەم دوورەپەرێزییەش دەستووری ژیانیانە.. دروست بوونی ئەم جـۆرە گومـان و دوودڵییانـە هێنـدە کـارێکی نابـەجێ و بێ نرخـە کـە تەنانـەت کەسانی گێژ و دەبەنگیش ڕادەی بێ نرخییەکەی دەزانن!

سەعیدی نوورسی

* * *

(سەرکەوتنی پەیامەکانی نوور)

برایانی ئازیز و بەوەفا و دامەزراوم!

دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی گیرۆدەبووان لە دادگاوە، کە بە سەرکەوتنێکی مەعنەوی دادەنرێت بۆیان، نەك هەر تەنها ئێمە بەڵکو سەرجەمی ئیماندارانی ئەم وڵاتەی دڵخۆش و شادمان کرد. چونکە ئەم بڕیاری بێ تاوانی‌یە بواری یاسایی بۆ بڵاوبوونەوەی "پەیامەکانی نوور" ڕەخساند. ئێمە تا ئێستا لە ترسی دەست بەسەراگرتنی پەیامەکان ناچار دەبووین هەمیشە لە وریایی و حەزەردا بین و، لە ماوەی ئەم هەژدە ساڵەی ڕابوردوودا، بە تایبەت ئەم شەش ساڵەی ئێرە، گەلێ گیروگرفتی زۆرمان هاتە ڕێ لە شاردنەوەی پەیامەکاندا و، هەمووشمان هەمیشە لە دڵەتەپێ و خەمی پەیامەکاندا بووین.

دەسا بە ئەندازەی ژمارەی پیتەکانی پەیامەکانی نوور شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە، چونکە سەرکەوتنی مەعنەویی ئەم جارەی پەیامەکان و، دڕاندن و لادانی پەردەکانی ستەم و تاریکی لە لایەن ئەم پەیامانەوە بە ماندووبوونێکی کەم، ڕێگای بۆ چەندین فتووحاتی فراوان و پاداشتی گەورە کردەوە. ئەوەبوو ماوەی ئەم دوو مانگەی بەندبوونمان بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور بە شێوەیەکی تر و لە فراوانترین بازنەدا، وەك ئەوەی کە لە بەندیخانەدا ڕووی دا.

برایانم!

پیرۆزبایی‌تان لێ دەکەم، بە تایبەت لە گیرۆدەبووان، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەت لە حافظ محەممەد و، پێیان دەڵێین:

سوپاس بۆ خوا لەسەر سەلامەتیی هەمووتان.

ئەو دادگایەی کە سەد کەسی بۆ ماوەی سەد ڕۆژ لەسەر یەك پەیام کە پەیامی "پۆشتەیی"یە خستە بەندیخانەوە، ئەم جارە نەیتوانی تەنانەت یەك کەسیش بۆ ماوەی یەك ڕۆژ بەند بکات کە سەدان پەیامی وەك ئەوەیان پێ بوو! ئەمەش ئەنجامی ئیخلاسی ناوازە و، توندوتۆڵیی نەجووڵ و، پەیوەندیی بەهێزی نێوانتان بوو.

ئەمەشمان هێندە بە بێ گومانی بۆ چەسپاوە کە هیچ شوبهە و دوودڵی‌یەکمان تیایدا نەماوە.

دەسا هەتاهەتایە خواتان لێ ڕازی بێت. ئامین.

* * *

(خۆ تێکەڵ کردنیان لەگەڵ قوتابیانی نووردا)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

پیرۆزبایی هاتنی سێ مانگە پیرۆزەکەتان لێ دەکەم کە زیاتر لە هەشتا ساڵی تەمەنی مەعنەویتان دەست دەخات. بە تایبەت شەوە تایبەتەکان.

تەبریئەبوونتان لە دادگا و سەرکەوتنی مەعنەویتان بەسەریاندا، ستەمکارانی دووچاری سەرسامی کردا

ئەم جارە لێرە پلانەکەی خۆیان گۆڕیوە و وازیان لە هێرشی دوژمنانە هێناوە. چونکە خەریکن بە ناوی هاوڕێیەتی‌یەوە دەڕۆنە ناو قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانی پەیامەکانی نوورەوە، تاکو لە خزمەتی "پەیامەکانی نوور" دوایان بخەن و، دەچن سەرقاڵی و ئەرکی کارمەندی‌یان بۆ دەدۆزنەوە، یان مووچەکەیان بەرز دەکەنەوە و، دەیانگوێزنەوە بۆ چەندین کارمەندیی تر، یاخود سەرقاڵیی تریان بۆ دەڕەخسێنن!

گەلێ ڕووداوی وەك ئەمانە لێرە ڕووی داوە. وا دیارە ئەم دەست هێنانە ڕێیە - لە ڕوویەکەوە - زیانی زیاتر بێت لە دوژمنایەتیی ڕاستەوخۆی پێشوویان.

* * *

(پەیامەکان بە پیتی لاتینی)

پەیامێکی کاریگەر لە پەیامەکانی نوور لێرە ڕۆشتە ناو قوتابخانەی ئامادەییەوە! چونکە بەهۆی ئیزنێکی مەعنەوی ڕوخسەتمان دا کە بە ئامێری چاپکەر و بە پیتی لاتینی بنووسرێتەوە. پەیامەکەش لەمانەی خوارەوە پێکهاتووە:

هەڵوێستی یەکەمی وتەی سێ و دووهەم.. دوو ناوی "العدل" و "الحکم"ی بریسکەی سێهەم.. پەیامی سروشت تا کۆتاییەکەی.. مەقامی یەکەمی پەیامی "الآیة الکبری" تا پلەی هەژدەهەم، جگە لە دوو پلەی "وەحی" و "ئیلهام".

جا ئێوەش ئەم چوار پارچەیەی پەیامەکان بکەن بە یەك بەرگ و، بە پیتە نوێیەکان بینووسنەوە و، بە وێنەی بۆمبایەکی مەزن بە سەر و ڕووی ئەهلی ئیلحاددا بیتەقێننەوە.

لەبەر ئەوەی ئەمساڵ لەوپەڕی پەککەوتەیی و لاوازی و پیریدام، ئەوا تکا لە برا لاوەکانم دەکەم کە بە دوعاکانیان لەم سێ مانگە پیرۆزەدا یارمەتیی مەعنەویم بدەن.

سڵاوم بە هەموو یەکێکی برایان بگەیەنن و، منیش دوعای سەلامەتیی هەردوو دنیایان بۆ دەکەم.

سەعیدی نوورسی

* * *

(تەقوا و کردەوەی چاك)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

لەم ڕۆژانەدا بیرم لە: بناغەکانی "تەقوا" و "کردەوەی چاك" کردەوە، کە لە ڕوانگەی قورئانەوە دوای "ئیمان" بە دوو بناغەی یەکجار مەزن دادەنرێن.

"تەقوا" بریتی‌یە لە: وازهێنان لە حەرام و دوورەپەرێزی لە گوناهـ و تاوان.

"کردەوەی چاك"یش بریتی‌یە لە: جێبەجێ کردنی ئەو شتانەی لە لایەنی خوای گەورەوە فەرمان دراوە بەجێ بهێنرێن، بە مەبەستی دەستکەوتنی خێر و پاداشتی باش.

جا لەم سەردەمەدا کە بە بۆنەی وروژاندنی حەز و خواستەکانی دەروونی بەدخواز و پەت بچڕاندنی ئارەزووکانەوە، کاولکاریی: "ڕەوشتی و گیانی" پەرەیان سەندووە، "تەقوا" دەبێت بە بناغەیەکی گەلێ مەزن، تەنانەت بە بەردی هەموو بناغەیەك و، لە هەموو شتێك باشتر و مەزنتر دادەنرێت. چونکە "تەقوا" – لە

خۆیدا - دوورخستنەوەی خراپکاریە و وازهێنانە لە تاوانە گەورەکان. ئەو دەستوورەش کە دەڵێت: "دوور خستنەوەی خراپکاری لە نزیك خستنەوەی شتی سوودمەند باشترە" دەستوورێکە لە هەموو کاتێکدا ڕەفتاری پێ دەکرێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا ئەو تەوژمە وێرانکارانە لە پەرەسەندندان کە "گیان" و "ڕەوشتی مرۆڤ" تێکدەشکێنن، ئەوا "تەقوا" بووە بە بناغەیەکی گەلێ مەزن و بەربەستێکی یەکجار گەورە بۆ بەرهەڵست کردن لەم کاولکاریە سامناکە.

جا ئەو کەسەی کە فەرزەکانی بەجێ دەهێنێت و ناڕوات بە لای تاوانی گەورەدا، بە ئیزنی خوا، ڕزگاری دەبێت. چونکە بەجێهێنانی کردەوەیەکی خاوێن و بێگەرد، لە ناوەندی ئەم هەموو تاوانە گەورانەی دەوروبەردا، یەکجار دەگمەنە.

"کردەوەی چاك" با کەمیش بێت، لە نێوان ئەم مەرجە گران و بارودۆخە سەختەدا بە زۆر دادەنرێت. ئنجا هەر لەناو "تەقوا"دا "کردەوەی چاك"یش هەیە! چونکە وازهێنان لە حەرام واجبە، پاداشتی بەجێهێنانی واجبیش گەلێ لە هی سوننەتەکان زیاترە.

جا دوورەپەرێزی لە تەنها یەك دانە گوناهـ، لەگەڵ بەجێهێنانی کردەوەیەکی کەم، ئا لەم چەشنە کاتانەدا کە تاوان و گوناهـ لە هەموو لایەکەوە هێرش بۆ مرۆڤ دەهێنن، وەك وازهێنان وایە لە سەدان گوناهـ (کە لەو تەنها گوناهەوە پەیدا دەبوون گەر بکرایە) و، وەك جێبەجێ کردنی سەدان واجب وایە.

ئەم حاڵە شایانی بایەخ پێدانە و، بە: "نییەتی خاوێن و، تەقوا و، مەبەستی هەڵهاتن لە گوناهباری" نەبێت، بەدەست نایەت. مرۆڤ لەم ڕووەوە دەتوانێت پاداشتی چەندین کردەوەی چاکی دەست بکەوێت کە تیایاندا ماندوو نەبووە.

گرنگترین ئەرکێ لەم کاتەدا دەکەوێتە ئەستۆی قوتابیانی نوور و خزمەتگوزارانی قورئانەوە، ئەوەیە کە:

"تەقوا" بکەن بە بناغەی هەموو کردارەکانیان و، لە بەردەم تەوژم و لێشاوی کاولکاریی سامناك و هێرشبەر و، لە بەرامبەر ئەو گوناهـ و تاوانانەی ئابڵوقەیان داون، بەپێی "تەقوا" هەنگاو بنێن، چونکە مرۆڤ لە هەموو خولەکێکی ئەم چەشنە ژیانە کۆمەڵایەتی‌یانەی ئێستادا ڕووبەڕووی سەدان گوناهـ دەبێتەوە. خۆ بێ هیچ گومانێك تەنها تەقوایە لە ڕێی مرۆڤدا کە هێندە پاداشتی بۆ دەستەبەر بکات وەك ئەوەی سەدان کردەوەی چاکی بەجێ هێنابێت، چونکە بە بۆنەی "تەقوا"وە لەو سەدان حەرام و گوناهانە دوورەپەرێزی دەکات.

شتێکی ئاشکرایە کە: بیست کەس ناتوانن لە بیست ڕۆژدا کۆشکێك بنیات بنێن، کەچی یەك کەس دەتوانێت لە یەك ڕۆژدا بیڕووخێنێت! لەبەر ئەوە، دەبێت لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە سەرگەرمی کاولکاری‌یە "ڕەوشتی و گیانی"یەکانە، بیست کەس هەبن ئەو لایەنانە بنیات بنێن و ئاوەدانیان بکەنەوە.. کەچی ئێمە پێچەوانەی ئەمە دەبینین؛ ئەوەتا هەزاران کاولکار تەنها یەك بنیاتنەر و ئاوەدانکەریان لە بەرامبەرەوەیە، ئەویش "پەیامەکانی نوور"ە.

کەواتە بەرگری کردنی خزمەتگوزارانی قورئان، بە تەنها خۆیان، لە بەرامبەر ئەو کاولکاری‌یە سامناکانەوە، لە ڕاستیدا، کارێکی نائاسایە. خۆ ئەگەر ئەو دوو هێزە بەرامبەرە لە یەك ئاستدا بوونایە، ئەوا شتی لەعادەت بەدەری زیاتر و فتووحاتی گەلێ مەزنترت لە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی "گیانی و ڕەوشتی"دا دەبینی.

با تەنها یەك نموونە لەسەر ئەمە بهێنینەوە:

گەورەترین بەردی بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە: "بچووك ڕێزی گەورە بگرێت و، گەورەش بەزەیی بە بچووکدا بێتەوە". کەچی دەبینین ئەم بناغەیە لە زۆر لاوە درز و کەلێنی تێ کەوتووە. تەنانەت ئێستا لە ئەنجامی تێکچوونی ئەم بناغەیە، چەندەها هەواڵی یەکجار دڵتەزێن و ڕووداوی تەواو ناهەموار بەرامبەر باوکان و دایکان، دەبیستین.

بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە، پەیامە قورئانی‌یەکان بڕۆنە هەر جێگایەك، بەرەنگاری کاولکاری دەبنەوە و نایەڵن ئەم بناغە کۆمەڵایەتی‌یە بڕووخێت، بەڵکو هەوڵی چاك کردنەوەشی دەدەن.

هەروەك بە ڕووخانی بەربەستەکەی "زولقەرنەین" یەئجووج و مەئجووج دەست دەدەنە خراپکاری لە ڕووی زەویدا، بە هەمان جۆر لە ئەنجامی جێ لەق بوونی بەربەستی مەزنی قورئانیشدا کە شەریعەتی خاوێن و بێگەردی حەزرەتی محەممەدە ﷺ خراپکاریی گەلێ زیاتر لەوەی یەئجووج و مەئجووج لە وشکایی و دەریاکانی سەر ڕووی زەویدا بڵاو بووەتەوە، کە بە تاریکایی تۆقاندن و ئاژاوە چواردەوری جیهانی داگرتووە و، چەندەها ستەم و ئیلحادی لەڕادەبەدەریش سەرانسەری ژیان و ڕەوشتی مرۆڤیان داپۆشیوە.

کەواتە جیهادی مەعنەویی قوتابیانی نوور کە بەرەنگاریی لافاوی ئەم تەوژمە ڕامالەر و سەختەی پێ دەکەن، بە ئیزنی خوا، بە جیهادێکی ئەوتۆ بۆیان دەنووسرێت کە پاداشتی گەورە و زۆریان دەست بخات، چونکە تروسکاییەك لە جیهادی هاوەڵە بەڕێزەکان، کە لەسەر کردەوەی کەم پاداشتی زۆریان دەدرێتەوە، تێکەڵی جیهادی ئەمان بووە.

دەسا برا ئازیزەکانم!

گەورەترین هێزی ئێمە، لەم کاتە پڕ لە تەنگانە و لە بەردەم ئەم ڕووداوە مەزنانەدا، دوای هێزی "ئیخلاس"، بریتی‌یە لە هێزی: "بەشداری کردن لەو کردارانەدا کە بە نیازی پاداشتی دواڕۆژ ئەنجام دەدرێن"! چونکە بەم بەشداری‌یە هەموو یەکێکی ئێوە چەندین کردەوەی چاك لە دەفتەری چاکەکاری‌یەکانی برایانیدا دەنووسێت، هەروەك بە زمانیشی هێز و یارمەتی و پشتگیری بۆ قەڵا و سەنگەر و سپێرەکانی "تەقوا" دەنێرێت، بە تایبەت ئەم برا هەژارەی خۆتان کە لە هەموو لایەکەوە هێرشی سەخت و نائامانی لەسەرە، چونکە لەم سێ مانگە پیرۆز و ڕۆژە بەبەرەکەتانەدا زۆر پێویستی بە یارمەتیی ئێوەیە.

ئەمەش لە ئێوە بە دوور نازانم، چونکە ئێوە شایانی ئەم هەوڵەن و پاڵەوانی وەفادارن و بەزەییتان بە حاڵی ئەم برایەتاندا دێتەوە.

وا من بە هەموو جەستە و زمانم و لە قووڵایی و ناخی دڵمەوە داوای ئەم یارمەتیدانە مەعنەوی‌یەتان لێ دەکەم و، لە لایەنی خۆیشمەوە لە دوعا و چاکەکاری‌یە مەعنەوی‌یەکانمدا قوتابیان هاوبەش دەکەم، تەنانەت هەندێ جار لە ماوەی یەك ڕۆژدا سەد جار زیاتر بە ناوی "قوتابیانی نوور" ناوتان دەهێنم و دوعاتان بۆ دەکەم، بە مەرجی دەستبەردار نەبوون لە "ئیمان" و "وەفا" کە دەستووری بەشداری‌یە لە کردەوەکانی سەر بە دواڕۆژدا.

* * *

(بوار نەدان بە خۆهەڵقورتاندنی دەروون)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

بە بۆنەی هاتنی هێزێکی سوپا دوێنێ بۆ ئەم ناوچانە، ئەمین پێی وتم: "پەیوەندیی ڕووسیا بە قەفقاسەوە پچڕا". لە کاتێکدا کە من نەمدەزانی و حەزیشم نەدەکرد کە بزانم ڕووسەکان هەر لە جەنگدا بەردەوامن. بۆیە قسەکەم پێ بڕی! بەڵام "دڵ"م بایەخێکی بە باسەکە دا!

ئەمڕۆش کە لە نوێژدا بووم و، لە ویردەکانی دوایشیدا، بە شێوەیەکی مەعنەوی ئەمەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

لە ئەنجامدا یەکێك لە تەوژمەکانی جەنگ لەم ململانێ‌یەی ئێستای گۆی زەویدا، چ بیانەوێت و چ نەیانەوێت، مەیلی بە لای ئیسلام و قورئان و پەیامەکانی نوور و ڕێبازەکەی ئێمەدا دەبێت. کەواتە دەبێ لەم گۆشەیەوە سەیری ئەم ململانێ‌یە بکرێت..

خۆ هەرچەندە ئەو هۆکارانەی کە لە دوو نامەکەی پێشوودا بۆ سەیر نەکردنی ئەم ململانێ‌یە نووسیمن، سەروزیادی "دڵ" و "ژیری"ن، کەچی حەزی "دەروون" بۆ زانینی ڕووداوەکان تێر ناکەن..

هەر لەو زیکرانەدا ئەوەم بە دڵدا هات کە:

هۆی گرنگی ئەمە:

بێداربوونەوەی هەستی پشت گرتنی لایەنێکە کاتێ سەیری رووداوەکان دەکرێت. چونکە روانینی کەسی "لایەنگر" تاوانەکانی ئەو لایەنە نابینێت کە مەیلی بە لایدایە و، بە ستەمەکەی رازی دەبێت و، تەنانەت لە دڵیشەوە پێی خۆش دەبێت! لە کاتێکدا کە هەروەك رازی بوون بە کوفر لە ناوەرۆکدا "کوفر"ە، رازی بوونیش بە ستەم - بە هەمان جۆر - ستەمە و بە ستەم دادەنرێت.

خۆ بێ گومان ئەم ململانێیەی ئێستای گۆی زەوی هێندە ستەم و کاولکاریی ئەوتۆی لە خۆدا هەڵگرتووە کە ئاسمانەکان لە تاو گەورەیی ئەو ستەمانە فرمێسك هەڵدەرێژن! لەبەر ئەوەی مافی زۆر کەسی بەری و بێ تاوان و ستەم لێکراو لەم ناوەندەدا تیا دەچێت. چونکە دەستووری ستەمکارانەی مەدەنییەتی دەنی کە لەم بوارانەدا پیادە دەکرێت بریتییە لە بەختکردن و قوربانی دان بە "تاك" لە پێناوی "کۆمەڵ"دا و، ئاورنەدانەوە لە مافە جوزئییەکان لە پێناوی سەلامەتیی نەتەوەدا!

ئەم دەستوورە، دەرگای لەسەر چەندین ستەمی چەپەڵ و ناشیرینی ئەوتۆ خستووەتە سەرپشت کە سەدەکانی پێشوو هاوشێوەی ستەمی وایان بە خۆیانەوە نەدیوە. بەڵام دادگەریی راستەقینەی قورئانی پیرۆز هەرگیز مافی "تاك" لەبەر پارێزگاری کردنی "کۆمەڵ" بەخت ناکات. بەڵکو حەق هەر حەقە بە لایەوە، چ زۆر بێت و چ کەم.

یاسای ئاسمانی و دادگەریی راستەقینە ئەمەیە.

لەبەر ئەوە، هەر کەسێك وەك قوتابیانی پەیامەکانی نوور بە خزمەتی راستییەکانی قورئانەوە سەرقاڵ بێت، گەر هیچ پێویستییەکی ناچارەکیی بۆ نەیەتە پێش، ئەوا هەر تەنها لەبەر تێرکردنی خولیا و حەزی خۆهەڵقورتاندن و بێ ئەوەش هیچ سوودێکیان دەستگیر ببێت، بۆ ئەو کاروبارانە ناڕوانن. تەنانەت هەر خۆ سەرقاڵ کردنی فیکری و بە دوادا گەڕانی هەواڵەکانی ئەو تەوژمەش، بە هیوای ئەوەی لە ئەنجامدا خزمەتی ئیسلام و قورئان بکات، هەرگیز شایانی ئەوان

نی‌یە! چونکە ئەو ئەنجامە نەهاتووەتـە دی. کەواتـە هیـچ پێویسـتی‌یەك بۆ پشـتگیریی ستەمی کاولکاریی ئەوانە شك نابەن.

بـەم جـۆرە "دەروون"یـش تێگەیشـت و، شـوێن "دڵ" و "ژیـری" کـەوت و دەستبەرداری خۆهەڵقورتاندن بوو!

بەڵێ.. بەم جۆرە تێگەیشتم.

مەسەلەی دووهەم:

سەرکەوتنی پەیامەکانی نوور لە ئیسپارتەدا هێنـدە ناکـاو بـوو کـە زەندیقـەکانی سەرسام کرد! لەبەر ئەوە، یەکێك لەو زەندیقە سەرسەختانەی کە گیـانی چەپەڵ و بیر و بۆچوونـەکانی کەسـە مـردووە لەناوچووەکـەیان هـەڵگرتووە، بـە مەبەسـتی شـاردنەوەی شکستەکەیان، بە پەنـهانی و لـە کتێبێکـدا کـە بـڵاوی کـردووەتـەوە، هێرشی بردووەتە سەر قورئانی پیرۆز و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ.

ئەم کەسەش - کە بـە موسـڵمان نـاودەبرێت - لـە کتێبەکـەیدا چـەند وشـەیەکی بێزلێکراوی نەشیاوی بەکار هێناوە، وەك ئەوەی لـەو مونازەرەیەدا بـەکار هـاتووە کە لەگەڵ شەیتان و دەستە و تاقمەکەیدا ئەنجام درا. چونکە هاوچەشنەکانی خۆی، لە جوولەکە و فەیلەسووف و زەندیقە مولحید و سەرسـەختەکانی ئەوروپا، لـە دێـر زەمانـەوە تـا ئێسـتا هـەرچی بوختـان و درۆ و دەلەسـەیەکیان سـەبارەت بـە قورئـانی پیرۆز و پێغەمبـەری خۆشەویستەوە ﷺ رێکخستووە، چووە هـەموو ئەوانـەی لـە کتێبەکەیدا کۆ کردووەتەوە!

جـا ئـەم زەندیقـە فێڵبـازە، بە مەبەستی ئەوەی کـە ئـەم قسـانە بـدات بـە گوێـی موسـڵمانانی سـاویلکە و کەسـانی بێ ئاگـا لـە پەیامـەکانی نـوور و بیانخاتـە پێـش چاویان، بە فێڵ و ساختەکاری رێگایەکی لە نووسینەکەیدا گرتووەتەبەر کە زۆر بە وردی و شـارەزایی و، بـە شـێوەیەك کـە گـرەوی لـە شـەیتانیش بردووەتـەوە، ئیلحاد و بێ بڕواییەکەی خۆی شاردووەتەوە!

گەلـێ ئازار و خەفەتم بۆ ئەمە خوارد.

برای بەڕێزمان کاك صەبری لە نامەکەیدا دەڵێت:

ئەو فێڵ و تەڵەکە و "داو"انەی کە مولحیدە سەرسەختەکان لـە بەرامبەر تـەوژمی پەیامـەکانی نـوورەوە سـازیان دەکـەن، گەڵـێ لـە تـانوپۆی جاڵجاڵۆکـە لاوازتـرن. چونکە ئەو پەردانەی شەیتان کـە خۆیـانی لـە پشتەوە دەشـارنەوە هێنـدە لاوازن کـە هەرگیز توانای بەرگرییان نیيە و لە بەردەم پەیامەکانی نووردا شڕوشیتاڵ دەبن.

نووسینەکەی ئەو زەندیقە سەرسـەخت و گیانـە چەپەڵـەی پیـاوە مردووەکـە، بـە ڕواڵەت لە بەرژەوەندیی نەتەوایەتیی تورکە. کەچی لە ڕاستیدا کتێبەکەی بۆ ئـەوە بڵاو کردووەتـەوە کـە لـە شـان و شـکۆی گـەورە و پلـەی بـەرزی قورئـانی پیرۆز و پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کەم بکاتەوە. بەڵام بەم کارەی سـەری خـۆی لـە بـەرد داوە! هەرگیز ئەو نووسینەی هێشتا وەك تانوپۆی جاڵجاڵۆکەش نابێت لە بەرامبـەر موعجیزاتی قورئان و موعجیزاتی ئەحمەدیيەوە، بەڵکو یەکسـەر دەتوێتـەوە و لـەناو دەچێت.

بەڵام هەزار داخ و مخابن کە زیانێکی زۆر بەو کەسـانە دەگەیـەنێت "پەیامـەکانی نـوور"یـان نـەدیوە، هـەروەك ئەوانـەش کـە دیویانـە حـەزی خۆهـەڵقورتاندن دەیانبزوێنێت و دەڵێن: با بزانین چیی تێدایە؟ ئیتر لەم ڕێیەوە خاوێنیی دڵی خۆیان لێڵ دەکەن، یان بەلای کەمەوە دەیخەنە دوودڵی و گومانەوە.

پێویستە قوتابیانی پەیامـەکانی نـوور لـە بەرامبـەر ئەم جۆرە شتانەوە وریـابن و، زیـاتر چـالاکی بنوێنن. چونکـە خـۆ خـەریك کـردن بـە شـتی بێ کەڵکـەوە ئـەویش کارێکی بێ کەڵك و بێهوودەیە. بۆیە ئەم مەسەلەیەم بە پوختی بۆ کورت کردنەوە.

کەواتـە هـەرگیز بایـەخی پـێ مـەدەن و، سـەرنجی حـەزی خەڵکییشـی بـۆ لا مەوروووژێنن. با بیشزانرێت کە جگـە لـە نـاوە پیرۆزەکـان و واتـای هـەندێ ئایـەتی پیرۆز، سەرتاپای کتێبەکەی بێ نرخ و بەهایە. ئنجا بۆ ئەوەش کە بزانن ئەو کەسە تا چ ڕادەیەك سنووری خۆی شکاندووە، ئەوا لـە ڕوانگـەی ئـەم نموونەیـەی خـوارەوە بۆی بڕوانن:

گەر کەسێکی گێژ و گەلحۆ لە دوورەوە سەیری کۆڕێکی یەکجار دوور بکات کە گەلێ زانای وردەکاری پسپۆڕ لەوێ لە کتێبێك ورد بینەوە و لێی بکۆڵنەوە و لە خزمەت مامۆستایەکی بەتوانادا دەرس بخوێنن. ئەم گەلحۆیەش لە دوورەوە بڕیاری خۆی بە ڕەخنەگرتن لە زانایانی ئامادەبووی ئەو کۆڕە دەربکات، ئەوا ئەم ڕەخنە و بڕیارەی لە "وڕێنە" زیاتر هیچ ناوێکی تری لێ نانرێت.

اللهم احفظ أهل الإيمان وطلاب رسائل النور من أمثال هؤلاء. آمين.

سەعیدی نوورسی

* * *

(بە دوعا و نزاکانتان یارمەتیمان بدەن)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

دوای ئەوەی کە خۆڕاگریی ناوازە و ئیخلاسی تەواوەتیی ئێوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و، موسیبەتەکەش برایە دواوە و نەما، ئەهلی دنیا پلانی ڕووبەڕوو بوونەوەیان گۆڕیوە. چونکە بە فڕوفێڵی زەندیقەکان هێزە ماددی و مەعنەوی‌یەکانی خۆیان لەم ناوچانەدا و بە پەنهانی بەرامبەر بە ئێمە کۆ کردووەتەوە و، زۆر بە وردی دەجوولێن و، بە ساختەکاری و شەیتان ئاسا هەوڵ دەدەن هێزی ڕاستەقینەی قوتابیانی پەیامەکانی نوور تێك بدەن کە بریتی‌یە لە "پشتگیری" و "پەیوەندیی توندوتۆڵ"ی نێوانیان. کەواتە هەر لەو کاتەدا کە پەیامەکانیان دایەوە دەستی خۆتان، کەچی بە فێڵ و تەڵەکەبازی، پیلانی پەنهان و نوێتان لە دژ دەسازێنن!

خۆ هەرچەند ئێمە لە ڕاستیدا لقێکین لە ئێوە، کەچی ئەوان بە بناغە و مەڵبەندمان لە قەڵەم دەدەن، بۆیە بە شێوەیەکی چڕوپڕ فڕوفێڵەکانیان بەسەر ئێمەدا جێبەجێ دەکەن. بەڵام پارێزەری ڕاستەقینە هەر تەنها خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە. پشت بە خوا ناتوانن هیچ زیانێکمان پێ بگەیەنن. دەبێ

ئێوەش – برایانم! – بە دوعا خاوێن و بێگەردەکانتان لە ڕۆژ و شەوەکانی ئەم مانگە پیرۆزانەدا، یارمەتیمان بدەن.

لێرە شتێك نی‌یە شایانی باس بێت.. بەڵام ئێوە وریا بن و، هەتا دەتوانن خۆتان بپارێزن.

* * *

(وتووێژێك لەگەڵ کۆمەڵێك لاودا)

ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لاوی جوانخاس و وریا و زیرەك هاتن بۆ لام و، داوای چەند ڕێنمایی و بێدارکردنەوەیەکی بەهێز و باشی وایان لێ کردم کە بیانپارێزێت لە پزیسکی شەڕ و ئاژاوەی داخوازی‌یەکانی ژیان و هەرەتی لاوی و هەوا و ئارەزووی دەوروبەر.

منیش بەو چەشنە وەڵامەی کە دامەوە بۆ ئەوانەی داوای یارمەتی‌یان لە پەیامەکانی نوور کرد، وەڵامی ئەم لاوانەشم وا دایەوە و وتم:

باش بزانن ئەم بەهارەی تەمەن و جوانی‌یەی ژیانتان کە ئێستا لەزەتی لێ دەچێژن، بێ هیچ گومانێك دەڕوات و نامێنێت. جا ئەگەر خۆتان لە چوارچێوەی سنوورەکانی شەرعدا نەهێڵنەوە و لەو سنوورانە دەربچن، ئەوا لاوی‌یەکەتان زایە دەبێت و بە خۆڕایی لەکیستان دەچێت و، چ لە دنیا و چ لە گۆڕ و چ لە قیامەتدا ئەوەندە گیرو گرفتتان دەهێنێتە ڕێ کە لەو تام و لەزەتەی لاوی و تەمەنی دنیاتان گەلێ زۆر و زیاتر بێت.

بەڵام ئەگەر بەهاری لاویتان لە: دەروون پاکی و پارێزگاریی شەرەف و گوێڕایەڵیی خوادا بردەسەر، بەوەی کە خۆتان بە پەروەردەی ئیسلام پێگەیاند و بەمەش شوکرانەی ئەو نیعمەتی لاوی و گەنجی‌یەتان دەربڕی کە خواوەند پێی بەخشیون، ئەوا کاکڵە و ناوەرۆکی ئەو سەردەمی لاوی‌یەتان دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت و، دەبێ بە هۆیەك بۆ دەستکەوتنی لاوی‌یەکی هەمیشەیی لە بەهەشتی نەمری و هەتاهەتاییدا.

"ژیـان" گـەر لـە "ئیمـان" بـەتاڵ بیێـت، یـان بـەهۆی زۆریـی گوناهـو سـەرپێچی کردنەوە لـە فەرمانـەکانی خـوای گـەورە، کاریگـەریی ئیمـانی تێـدا نەمایێت، ئەوا لەگەڵ تام و لەزەتە ڕواڵەتی و کەم خایـەن و کورتـەکانیدا، چـەندین ئەوەندەی ئەو تام و لەزەتانـە خـەم و خەفـەت و ئـازار دەرخـواردی مـرۆڤ دەدات.

چونکە لەبەر ئەوەی مرۆڤ بیر و ژیریـی دراوەتێ، ئـەوا پەیوەندییەکی سروشتیی بـەتینی لەگـەڵ ڕابـوردوو و داهـاتوودا هەیـە، سـەرەڕای کـاتی ئێسـتای. ئـەم پەیوەندییەی ئەو لەگەڵ ئەو کاتانەدا ئەوەندە بەتینە کە دەتوانێت تامی لەزەتەکانی ئەو سەردەمانە و ئازارەکانیان بچێژێت، بە پێچەوانەی ئاژەڵ کە خەم و پەژارەکانی ڕابوردوو و مەترسـییە چـاوەڕوان کراوەکـانی داهـاتووش، لەزەتـەکانی کـاتی ئێستای لـێ ناشێوێنن و تێکی نادەن، چونکە بیرکردنەوەی نەدراوەتێ.

لەبەر ئەوەیە کـە ئـەو مرۆڤـەی کەوتووەتـە شـێوی گومڕایی و، بێ ئاگاییش بە تەواوی هەر شەشـدەری لـێ گرتووە، خەفەتەکانی کاتی ڕابوردووی و دڵەتەپێ و نیگـەرانییەکانیشی بۆ داهـاتووی، تامی لەزەتـەکانی ئێسـتای نـاهێڵن و ژیـانی بە خـەم و ئـازار و خـەیاڵ لـێ دەشـێوێنن، بـە تایبـەت لەزەتـە ناڕەواکـان کـە وەك هەنگوینی ژەهراوی وان.

واتە لە ڕووی چەشتنی تام و لەزەتەکانی ژیانی دنیاوە، مرۆڤ سەد پلە لە خـوار ئاژەڵەوەیـە، تەنانەت "ژیـان" و "بوون" و "جیهـان"ی گـومڕا و بێ ئاگایان تەنـها ئەمڕۆ و کاتی ئێستایانە. چونکە کاتە بەسەرچووەکان و هەرچییـەکیان تێدایـە، بـە حوکمـی گومڕاییەکـەیان، "نـەبوو" و "مـردوو"ن. ئیـتر لـەوێوە هـەموو جـۆرە تاریکییەکیان بۆ دێت و تیایدا دەتلێنەوە.. کاتەکانی داهاتوویش سەبارەت بەوان، بە هەمان جۆر "نـەبوون" و "بـوون"یان نییـە، چونکـە ئـەوان باوەڕیـان بـە "غـەیب" نییە، کەواتە ئەو جوداییە هەمیشەییانەی کە تەواو نابن و لەبن نایەن، ژیـانی ئەوانـە بە چەندین تاریکیی ڕەش پڕ دەکـات، مـادەم خـاوەنی عـەقڵ و ژیـری بـن و، لەگـەڵ ئەوەشدا ئینکاریی حەشر و زیندووبوونەوە بکەن.

بەلام ئەگەر "ئیمان" ببێت بە "ژیان"ی ژیان و تیشکی خۆی بهاوێتە ناو ژیانەوە، ئەوا هەموو کاتەکانی "ڕابوردوو" و "داهاتوو" ڕووناك دەبنەوە و "مانەوە"یان دەست دەکەوێت و، لە گۆشەی ئیمانەوە چەندین تام و چێژی مەعنەوی و بەرز و ڕووناکی "بوون" و "مانەوە" بە "دڵ" و "گیان"ی مرۆڤی ئیماندار دەبەخشن.

ئەم ڕاستی‌یە، لە ئومێدی حەوتەمی "پەیامی پیران"دا بە تەواوی ڕوون کراوەتەوە، با سەیر بکرێت.

ژیان ئاوایە.. جا ئەگەر دەتانەوێت تامی ژیان بچێژن، ئەوا ژیانتان بە "ئیمان" بژیەنن و، بە ئەنجامدانی فەرزەکان بیڕازێننەوە و، بە دوورەپەرێزی کردنیشتان لە بێ‌فەرمانیی خواوەند بیپارێزن.

ڕاستیی ئەو "مردنە"ش کە مردوان هەرچی ڕۆژە لە هەرچی شوێنە سامناکی و مەترسی‌یەکانیمان پیشان دەدەن، وا لە نموونەیەکدا پێش چاوی دەخەم، وەك بۆ چەند لاوێکی تری وەك ئێوەم ڕوون کردەوە:

وا دابنێین لێرەدا چەندین سێدارە دانراون و لە تەنیشتی ئەو سێدارانەشەوە فەرمانگەیەك هەیە بەخششی زۆر و گەورە گەورەی تێدا دابەش دەکرێت بەسەر بەختەوەراندا..

ئێمەش کە دە کەسین لێرەدا، بمانەوێت و نەمانەوێت، بۆ ئەوێ بانگ دەکرێین. بەلام لەبەر ئەوەی کاتی بانگ‌کردنمان نازانین، ئەوا هەموو خولەکێك چاوەڕوانین پێمان بڵێن:

(وەرە بڕیاری لە سێدارەدانت وەربگرە و بە سێدارەکەتدا سەربکەوە)!

یان بڵێن:

(وەرە بلیتێك وەربگرە کە بۆت دەرچووە و قازانجی ملیۆنەها لیرەی زێڕینی لێ بەدەست دەهێنیت)!

لەم کاتەدا کە ئێمە ڕاوەستاوین و لە چاوەڕوانیداین، لای دەرگاکەوە دوو کەس پەیدا بوون:

*یەکێکیان:*

ئافرەتێکی جوانی نیمچە ڕووتی گاڵتەچی‌یە، پارچەیەك شیرینیی بە دەستەوە گرتووە و دەیەوێ پێشکەشی ئێمەی بکات، بە ڕواڵەت لەوە دەچێت خۆش و بەتام بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ژەهراوی‌یە..

*ئەوی تریان:*

پیاوێکی بەویقاری وریایە، نە فێڵبازە و نە ئەوەندەش بێ ئەزموونە کە بخەڵەتێ. لە دوای ئەو ئافرەتەوە هات و، وتی: من مەتەڵێکی سەیر و وانەیەکی پڕ لە پەندم بۆ هێناون. ئەگەر ئەم وانەیە بخوێنن و لەو شیرینی‌یە نەخۆن، ئەوا لەو پەتی قەنارانە ڕزگارتان دەبێت و، بەم مەتەڵە بلیتی ئەو بەخشش و خەڵاتە بەنرخەتان دەست دەکەوێت. ئەوەتا ئێوە بە چاوی خۆتان دەبینن کە هەر کەسێك لەو شیرینی‌یە بخوات تا سەردەکەوێتە سەر قەنارەکەی بە سکێشەوە دەتلێتەوە.

ئەوانەش کە بلیتەکەیان بۆ دەرچووە، هەرچەند لە ئێمەوە دیارنین و بە ڕواڵەت وا دیارە بە قەنارەکاندا سەردەکەون، بەڵام زیاتر لە ملیۆنەها شایەت هەواڵمان پێ دەدەن کە ئەوانە لە سێدارە نەدراون، بەڵکو داری سێدارەکانیان بە وێنەی پلیکانە بەکارهێناوە و بە ئاسانی پیایاندا سەرکەوتوون بۆ ئەو فەرمانگەیەی کە بەخششەکانی تێدا دابەش دەکرێت.

فەرموون لە پەنجەرەکانەوە بڕوانن، با بە چاوی خۆتان ببینن کە چۆن گەورە لێپرسراوان و سەرپەرشتیارانی دابەش کردنی ئەو بەخششانە پڕ بە دەم دەڵێن:

(خاوەنانی ئەو مەتەڵە سەیر و سەرسووڕهێنەرە، بلیتەکەیان بۆ دەرچووە. ئەمە بەوپەڕی دڵنیاییەوە بزانن، هەروەك بە بینینی یەقینی ئەوانەتان بینی کە بە سێدارەکاندا سەرکەوتن و، هیچ گومانێکتان لەمەدا نەبێت، چونکە وەك خۆری نیوەڕۆ شتێکی ئاشکرا و ڕوونە).

بەم جۆرە و بە چەشنی ئەم نموونەیە:

تام و لەزەتە حەرام و ناڕەواکانی "لاوی" وەك هەنگوینی ژەهراوی وان..

مردنیش لای ئەو کەسەی کە بلیتی ئیمانی ون کردووە - ئەو بلیتەی کە بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ خاوەنەکەی دەباتەوە - وەك سێدارە وایە و، ئەو کەسە هەمیشە چاوەڕوانی جەللادی "مردن"ە، کە لەبەر نەزانراویی کاتەکەی دەگونجێ هەموو چاوترووکاندنێك ئامادە بێت، تاکو بێ جیاوازی لە نێوان پیر و لاودا مـلان بپەڕێنێت و بیانخاتە ناو چاڵی گۆڕەوە، ئەو گۆڕەی کە بە ڕواڵەت دەرگای تاریکی هەمیشەییە.

بەڵام ئەگەر "لاو" پشتی لەو تام و لەزەتە حەرامە هەڵکرد کە وەك هەنگوینی ژەهراوی وایە و، هەوڵی دا ئەو مەتەڵە قورئانیی‌یەی دەست بکەوێت کە بریتیی‌یە لە (ئیمان و بەجێهێنانی فەرزەکان) ئەوا سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەری ڕاستگۆ - درووودیان لەسەر بێت - و چەندین ئەولیا و پیاوچاك و زانای خواناسی لەژمارەبەدەر، هەموویان بە یەك دەنگ و بە پیشاندانی شوێنەواری هەواڵ و مژدەکەیان، مزگێنیی دەدەنێ کە: ئیماندار بلیتێکی وای بۆ دەردەچێت بەختەوەریی هەمیشەیی دەست دەخات.

پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:

بێ هیچ گومانێك "لاوی" دەڕوات و نامێنێت. جا ئەگەر لە پێناوی قۆزتنەوەی تام و لەزەت و کەیف و شادیی هەڵەشەیی و لەخۆباییبووندا بەسەرچووبێت، ئەوا هەزاران بەڵا و ئازاری پڕ ئێش بۆ ئەو مرۆڤە بەجێ دەهێڵێت، چ لە دنیا و چ لە قیامەتدا.

ئەگەر دەتانەوێت تێبگەن لەوەی کە ئەم حاڵەتەی ئەو چەشنە لاوانەی تێدان، لەبەر هەڵسوکەوتی هەڵەشە و زیادەڕەوی و تووشبوونیان بە چەندین نەخۆشیی دەروونی، زۆربەی جار دەیانگەیەنێتە خەستەخانەکان..

یان گەر دەتانەوێت بزانن ئەو حاڵەی ئەوان، بەهۆی لەخۆباییبوون و هەوا و ئارەزوویانەوە، دەیانگەیەنێتە بەندیخانەکان و ئەو مەڵبەندانەی کە بە چاوی سووك سەیری مرۆڤیان تێدا دەکرێت..

یـان بـەهۆی ئـەو دڵتـەنگی و دەروون تەسـکی‌یەی کـە لـە ئـەنجامی ئـازار و نیگەرانی‌یە مەعنەوی و دەروونی‌یەکانەوە دووچاری دەبـن، بۆ مـەلها و مەیخانـەکان دەیانبەن..

بەڵێ، ئەگـەر دەتانەوێت لـەم ئەنجامانـە دڵنیـابن، ئـەوا پرسیار لـە خەستەخانە و بەندیخانـە و گۆڕسـتانەکان بکـەن! بـێ گومـان ئـەو کاتـە لەسـەر زمـانی حـاڵی خەستەخانەکانەوە گوێتـان لـە ئـاخ و داخـی چـەندین نەخۆشـی وەهـا دەبـێ کـە نەخۆشی‌یەکانیان لە ئارەزووبازی و زیادەڕەویی لاوانەوە پەیدا بوون..

هەروەها لە بەندیخانەکانیشەوە ئاهوناڵەی خەم و دەنگـی پەشیمانی و هەنسکی حەسـرەت دەبیسـتن کـە لـە زاری ئـەو لاوانـەوە دەردەچـن دوای هەڵەشـەیی و لـەخۆبایی‌بوونیان کـەوتبوون و، ئێسـتا لـە ئـەنجامی پشـتگوێ خسـتن و سـنوور شکاندنی فەرمانەکانی شەرع، زللەی تەمێ کردنیان لـێ دراوە. ئەو کاتـە ئـەوەش دەزانن کە زۆربەی ئەو شتانەی مایەی ئازاری گۆڕن - ئەو گۆڕەی کـە جیـهانێکی بـەرزەخیی ئەوتۆیە لەبەر زۆریی ئەوانـەی تێی دەچـن هەمیشـە دەرگاکـانی لـە کردنەوە و داخستندان - هەڵسوکەوتە هەڵە و خراپەکانن کە ئەو مرۆڤە لە ساڵانی لاویدا دووچاریان بووە، وەك بـە بینینی ئەوانـەی گۆڕیـان بۆ کەشف دەبێـت و بـە شایەتیی هەموو زانایان و ئەهلی حەقیقەت چەسپاوە..

یان گەر حەز دەکەن لەوە دڵنیـا بـن، فـەرموون پرسیار لـە "پیران" و "بیمـاران" بکەن کە زۆرینـەی چین و توێژەکـانی ئادەمیزاد پێکدەهێنـن. گـەر پرسیاریان لـێ بکەن، ئەوا لە زۆربەی ئەوانەوە دەبیستن کە دەڵێن:

(داخی بە جەرگم بـۆ ئەو تەمەنـەی لـە دەستمان دەرچوو! بـەهاری لاویمان لـە چەندین شتی بێ نرخدا بەزایە دا، تەنانەت لە چەندین شتی زیانبەخشدا لەدەسـتمان چوو. نەکەن چاو لە ئێمە بکەن و شوێن پێمان هەڵبگرن)!

چونکە ئەو کەسەی کە لە پێنـاوی ئـەوەی پێنج یـان دە سـاڵی تەمـەنی لاویی بـە چەندین چێژی حەرام بباتە سەر، ساڵەهای سـاڵی ژیـانی دنیـای بـە خـەم و خەفـەت

لێ بڕوات و، پاشان لە دۆزەخیشدا سزا بچێژێت.. ئەو کەسە، شایانی بەزەیی پێداهاتنەوە نییە، هەرچەندەش لە حاڵێکی ئەوەندە سەختدایە کە لە هەموو کەسێك زیاتر بەزەیی مرۆڤ دەبزوێنێت، چونکە ئەگەر کەسێك بە ڕەزامەندیی خۆی زیانی بۆ خۆی هەڵبژارد و پێی خۆش بوو، شایستەی ئەوە نییە مرۆڤ بەزەیی پێدا بێتەوە و بە چاوی میهرەبانییەوە بۆی بڕوانێت، بەپێی ئەو دەستووره حەکیمەی کە دەڵێت:

"الراضي بالضرر لا يُنظر له"!

لە خوا داواکارم ئێمە و ئێوەش لە فیتنە و ئاشووبی لەخشتەبەری ئەم کات و سەردەمە بپارێزێت و، لە شەڕ و خراپەکاری ڕزگارمان بکات. ئامین.

* * *

(ڕاستییەك کە دەمکوتی ڕەخنە و ئیعتیرازەکان دەکات)

برایانی ئازیز و بەوەفا.. قوتابیانی پەیامەکانی نوورم!

ناچار بووم ڕاستییەك بخەمە ڕوو تاکو ئەو ڕەخنە و بیانووانە بنەبڕ بکات کە زیان بە قوتابییە لاوازەکانی پەیامەکانی نوور دەگەیەنن، وەك ڕەخنە چاوەڕوان نەکراوەکەی ئەو زاتە.

جارێکی تر ئەوە دووپات دەکەمەوە کە بە یەکێك لەوانەم وت:

گەلێ جێی داخ و سەرسووڕمان و سەرسامییە کە ئەهلی حەقیقەت ئەو هێزە دەراسایە لەدەست خۆیان دەدەن کە لە ئیتیفاق و یەکگرتندا هەیە و، لە ئەنجامدا شکست دەهێنن.. کەچی دووڕووان و گومڕایان - بە پێچەوانەی مەشرەبەکەیان - لە نێوان خۆیاندا یەکدەگرن، تاکو ئەو هێزە گرنگەی کە لە یەکگرتندا هەیە دەستی خۆیانی بخەن!

خۆ هەرچەند ئەوان ژمارەیان لە سەدا (دە) زیاتر نابێت، کەچی بەم یەکگرتنەی نێوانیان بەسەر لە سەدا نەوەدی ئەهلی حەقیقەتدا زاڵ دەبن!

لـە هـەموو شتێك زیـاتر ئەمـەی خـوارەوە سەرسـامی و سەرسووڕمانی مـرۆڤ دەورووژێنێت:

لە کاتێکدا کە ئێمە چاوەڕوانی یارمەتی و هاندانی گەورە بووین لە لایەن ئەو کەسانەوە، چونکـە لـە ڕووی ئیسـلامەتی و ڕێبـاز و جێبـەجێ کردنـی ئـەرکی ئایینی‌یەوە ئەم یارمەتیدانە ئەرکێکە و لە ئەستۆیاندایە.. کەچی دەستی یارمـەتیمان بۆ درێژ ناکەن، تەنانەت ئەو زاتە - لەسـەر بناغـەی تێگەیشـتنێکی هەڵـەی خـۆی - ڕەخنـەی لـە چەند ڕوونکردنەوەیەك گرتووە کـە تایبەتن بە ڕاستی‌یەکەوە و، لـە شێوەیەکی وەهاشدا کە سارد و سڕی بخاتە نێوان قوتابیانی پەیامەکانی نـوورەوە و، لەمەشدا پشتی بە پلەوپایە و ڕێ و شوێنی کۆمەڵایەتیی گرنگی خۆی بەستووە.

من نـازانم ڕەخنـەی لـە چ مەسـەلەیەك گرتـووە و ئـەو مەسـەلەیەش تایبەتـە بـە چ ئایەتێکەوە. لەوانەیە هی مەسـەلەیەکی پـەیامی "ئاماژەکـانی قورئـان" بێـت کـە پێـی دەوترێت: تیشکی یەکەم و، وەك پەیامێکی یەکجار تایبەتی و نهێنی لەناو قوتابیاندا دەستاودەستی پێ دەکەین.

وا ئـەم بـرا کۆڵـەوارەتان ئەمـەی خـوارەوە بـۆ ئـەو هـاوڕێ بـەڕێزە دێرینـە و، بـۆ زانایان و، بۆ ئێوەش، دەخاتە ڕوو:

ئەو بەڵگە ڕاستەقینە و مەنتیقی‌یە زۆرانەی کە تایبەتن بە ڕاستی‌یەکانی ئیمـان و، سەعیدی نوێ بـە ڕێژنـە و بەرەکـەتی قورئـانی پیرۆز دەیانهێنێتـەوە، نـەك هـەر تەنـها زانایـانی ئیسـلام ناچـاری تەسـلیم بـوون و سـەلماندن دەکـەن، بـەڵکو مـل بـە سەرسەخت‌ترین فەیلەسووفە ملنەدەرەکانی ئەورووپاش دادەنوێنن.

قورئانی پیرۆز و، ئیعجازە مەزنەکەی و، خواستی ڕەوانبێژی‌یە دەراسـاکەی ئـەم قورئانـەی کـە بریتی‌یـە لـە زمـانی غـەیب، داخـوازی ئـەوەن کـە چـەندین هێمـا و ئاماژەیان سەبارەت بە سەرنج ڕاکێشـانی خـەڵکی بۆلای "پەیامـەکانی نـوور" تێـدا بێـت، کـە موعجـیزەی مەعنـەویی قورئـانن لـەم سـەردەم و ڕۆژگـارەدا. وەك هەواڵدانەکانی ئیمامی عەلی - خوای لـێ ڕازی بێت - و شێخی گەیلانی - قـدّس

ســـڕە - کە بە شێوازی هێما و ئاماژە لـە بارەی گرنگی و بەهای "پەیامـەکانی نووره"وە ڕایان گەیاندووە.

بەڵێ، لە بەندیخانەکەی ئەسکی شەهر و لە کاتێکدا کە ئێمە زۆر پێویستمان بە دڵدانەوەیەکی قودسی بوو، ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە لە خۆمم پرسی:

تۆ چەند شـایەتێکی نێـوان قسـە و گوفتارەکـانی ئـەولیا پێشـینەکان لەسـەر "ئەحەققییـەت" و "قبـووڵ بـوون"ی پەیامەکانی نـوور دەهێنیتـەوە. کـەچی بـەپێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا رَطْبٍ وَلا يَابِسٍ إِلاّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعـام:٥٩) خاوەنی گوفتار لەم مەسەلەیەدا قورئانی پیرۆزە..

جا ئایـا قورئـانی پیرۆز لـە پەیامـەکانی نـوور ڕازیـیە؟ ئایـا چۆن دەڕوانێتـە ئەم پەیامانە؟

ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە سەیرە بوومەوە و، پەنام بۆ قورئانی پیرۆز برد و، داوای یارمەتیم لێ کرد. یەکسەر لە ماوەی یەك کاتژمێردا هەستم کرد کە:

"پەیامـەکانی نـوور" تاکێکـە لـە نـاوەندی ئـەو واتـا ئاماژەییـە هەمەکی‌یـەی کـە ئەویش یـەکێك لە چینەکانی ئەو لـق و پەلانە دەنوێنێـت کە لـە واتـای ڕاشـکاوی سی و سێ ئایەتی پیرۆزی قورئـاندا هـەن. هـەروەك نیشـانەیەکی بەهێزیشـم دەست کـەوت لەسـەر ئەوەی کـە پەیامـەکانی نـوور ئـەو واتایـە دەیانگرێتـەوە و تایبەتـە بەوانەوە. چونکە بەشێکی ئەم نیشانەیەم تا ڕادەیەك بـە ڕوونـی و بەشـەکەی تریشـیم بە کورتی و پوختی بینی. ئیتر هیچ شوبهە و گومان و دوودڵی و وەسوەسەیەکم لەو قەناعەتـەمدا نـەما. بۆیـە ئـەو قەناعەتـە بێ گومانـەی خۆمـم نووسـی و، دام بـە بـرا تایبەتمەندەکانم، بەو مەرجەی بە نهێنی هەڵی بگرێت. ئەمـەش بـە نیـازی پارێزگـاری کردنی "ئیمان"ی ئیمانداران بە پەیامەکانی نوور.

ئێمە لەو پەیامەدا نەمان وتـووە واتـای ڕاشـکاوی ئایەتـە پیرۆزەکـە ئەمەیـە، هـەتا زانایان بڵێن: "ئیه نظر"! هەروەها نەشمان وتـووە: هەمـەکی بوونـی واتـا ئاماژەییەکە بریتی‌یە لـەمە. بەڵکو دەڵێین:

لە ژێر واتای ڕاشکاوی ئایەتە پیرۆزەکەدا چەند چینێکی جیاجیای "واتا" هەیە. یەکێك لەم چینانە واتای هێما و ئاماژەییە. ئنجا ئەم واتا ئاماژەییەش خۆی لە خۆیدا هەمەکی(کلـي)یە و، لە هەموو چەرخێکدا چەند واتایەکی هەندەکی(جزئي)ی هەیە. جا پەیامەکانی نوور لەم چەرخەدا یەکێکە لە دانە دانە و تاك تاکە جوزئییەکانی هەمەکێتیی چینی ئەو واتا ئاماژەییە.

ئنجا هەر لە کۆنەوە دەستووری "حسابی ئەبجەدی و جەفر" لە نێوان زانایاندا بۆ دۆزینەوەی نیشانە و بەڵگەکان کاری پێ کراوە. جا ئەم جۆرە حساب و لێکدانەوەیە هەرگیز ئایەتە پیرۆزەکە و واتا ڕاشکاوەکەی زامدار ناکات. بەڵکو هەندێ جار هۆیەك دەبێت بۆ دەرخستنی ئیعجازی قورئان و مەزنیی ڕەوانبێژییەکەی.

کەواتە لە ڕووی ڕاستییەوە هیچ ڕەخنەیەك لەسەر ئەم ئاماژە غەیبییانە لە گۆڕێدا نییە. چونکە ئەو کەسەی کە نەتوانێت ئینکاریی ئەو وردەکاری و لێ دەرهێنانە لەژمارەبەدەرانەی ئەهلی حەقیقەت بکات کە لە ئاماژە نەبڕاوە و بێ سنوورەکانی قورئان دەریان هێناون، دەبێ ئینکاریی ئەمەش نەکات، بەڵکو هەر ناشتوانێت بیکات.

ئنجا بە سەیر زانینی ئەو ڕەخنەگرەش کە بە دووری زانیوە ئەم کتێبە بەنرخە – پەیامەکانی نوور – لە پیاوێکی ئاسایی بێ بایەخەوە سەرهەڵبدات، جێی سەرنجە! چونکە ئەگەر بیری لە گەورەیی توانستی خوا بکردایەتەوە کە درەختێکی گەورە و بەرز لە تۆوێکی بچووکی سنەوبەر بەدی دەهێنێت، ئەوا بێ گومان ناچار دەبوو قبووڵی ئەوەش بکات کە دەرکەوتنی ئەم بەرهەمە لەم کات و ڕۆژگارەدا و لەسەر دەستی کەسێکدا کە لە دەستەوسانیی ڕەها و هەژاریی ڕەهادایە و لەڕادەبەدەر موحتاجە، بەڵگەیەکە لەسەر میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە!

وا من چ ئێوە و چ ئەو کەسانەش کە ڕەخنە لە تایبەتکاری و شەرەفی بەرزی پەیامەکانی نوور دەگرن، دڵنیا دەکەمەوە کە:

ئەم ئاماژە و هەواڵ و هێما ئاماژەییانەی ئەولیاكان، هەردەم بەرەو شوكر و سوپاسی خوای گەورە و داوای لێخۆشبوون لە گوناهەكانم منیان بردووە و، هیچ كات و هیچ خولەكێكی ژیانم ئاسەوارێكی ئەوتۆیان لە مندا بەجێ نەهێشتووە كە بگونجێ ببێت بە مایەی "شانازی" و "لەخۆ بایی بوون" و "خۆپەرستیی دەروونی بەدخواز"م. ئەمەشم بە هەموو لایەنە وردەكانی ژیانی خۆم چەسپاندووە كە بیست ساڵە لە پێش چاوتاندایە.

جگە لەم ڕاستی‌یەش، مرۆڤ هیچ كات لە "قسوور" و "لەبیرچوونەوە" و "سەهوو" بەدەر نی‌یە. كەواتە گەلێ گوناهی زۆرم هەن كە خۆم پێیان نازانم و، لەوانەیە "بیر"م لە شتێكدا خۆی هەڵقورتاندبێت و چەند هەڵەیەكی لە پەیامەكاندا دروست كردبێت..

بەڵام ئایا بۆچی ئەم ڕەخنەگرە گوێ بە گۆڕینی پیتە قورئانی‌یە پاك و پیرۆزەكان نادات كە بۆ چەند پیتێكی ناتەواو گۆڕراون و، تەرجەمەیەكی دەستكردی قەڵەم تێبراوی تەحریف‌كراوی پڕ لە تەئویلی خراپ و ناتەواوی گومڕایانی بۆ دانراوە كە واتا ڕاشكاوەكانی قورئانی پیرۆز دەڕووشێنێت؟؟

بۆچی گوێ بەمە نادات و دەچێ ڕوانینی خۆی لەسەر كەسێكی لاوازی ستەم لێكراو چڕ دەكاتەوە كە سەرنجێكی ئیعجازی قورئانی ڕوون كردووەتەوە تاكو ئیمانی برایانی خۆی پێ بەهێز بكات؟ ئەوەتا بە جۆرێك ئەو ڕەخنەیەش دەگرێت كە ساردوسڕی و سستی لە خزمەتی ئیماندا بنێتەوە. لە كاتێكدا كە خاڵی ڕەخنەكەشی بە جۆرێكی وەهایە هەرگیز ناگونجێت كەسێك كێشی گەردیلەیەك ویژدانی تێدا بێت بەجێی ڕەخنەی بزانێت!

هەروەها ئەمەش جێی سەرسامی و مایەی سەرسووڕمانمە كە:

ئەو ڕەخنەگرە بەڕێزە قوتابیی "شێخ فەهیم"ە كە یەكێكە لە مامۆستا بەتواناكانم لە زنجیرەی زانستیدا، كە ئەو مامۆستایەش یەكێكە لە قوتابیانی ئیمامی ڕەببانی – خوای لێ ڕازی بێت – و، پەیوەندی‌یەكی توندوتۆڵی لەگەڵدا هەیە. كەواتە

دەبوو ئەو بەڕێزە زیاتر لە هەموو کەسێکی تر بە هەموو هێزێکیەوە بۆ یارمەتیدانم تێبکۆشایە و ئاوڕی لە گوناهەکانم و ژیانی تێهەڵکێش و پەشێوی ڕابوردووم و هەڵچوون و تووڕەییم، نەدایەتەوە. کەچی - بە داخەوە - ئەم ڕەخنەیەی - وەك بیستوومانە - ساردوسڕیی لای هەندێ هاوڕێی لاوازماندا بەجێ هێشتووە و شتێکی شێوە بەڵگەشی داوە بە دەستی گومڕایانەوە.

ئێمە چاوەڕوانی ئەوەین لەو زاتە بەڕێزە کە ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەی خۆی چارەسەر بکات و، هەوڵ بدات سەرلەنوێ بنیاتی بنێتەوە، هەروەك هیوامان وایە کە بە دوعا و ئامۆژگارییە ڕەوان و کاریگەرەکانی یارمەتیمان بدات. جگە لەوەش، ئەمەی خوارەوە پێش چاو دەخەم:

ئەو بانگەوازە حەق و یەکجار بەهێزانەی کە ملیۆنەها ئیماندار لە ژێر سایەی ئاڵاکەیدا کۆبوونەتەوە، لەوانەی کە هەرچەند مەشرەب و مەزهەب و تەریقەتیان لە یەکتر جیاوازە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بۆ هەموو خۆبەخت کردنێك ئامادە و لەسەرپێن.. لەم کاتەدا وا دەردەکەوێت کە هەموو ئەو بانگەوازانە بەرامبەر دەست وەشاندنی سەخت و توندوتیژی گومڕایی بە پاشەکشێ بەرەو دواوە گەڕابنەوە و پاڵیان دابێتەوە..

کەچی هەر لەم کاتە دژوارەدا "پەیامەکانی نوور" نەگەڕانە دواوە، بەڵکو بەرەنگاری سەرجەمی ئەو هێرشانە بوونەوە و، هەموو ئەرکێکیان خستە ئەستۆی خۆیان و ڕێی ئیمانیان بڕی و پێش هەموانیش کەوتنەوە.

لەبەر ئەوە، ناکرێت دانانی ئەم پەیامانە بدرێتە پاڵ پیاوێکی کۆڵەواری نیمچە خوێندەوار کە تەمەنی لە نێوان ڕەهەندەیی و بەندیخانە و چاودێریی دەسەڵاتداریی دەوڵەتدا بردووەتە سەر و، بە چەندین پڕوپاگەندەی ژەهراوی و نیازی چەپەڵ خەڵکیی لێ دوور خراوەتەوە..

هەرگیز ناگونجێ پیاوی وا خاوەنی ئەم پەیامانە بێت و، نابێت بۆ خۆی شانازییان پێوە دەرببڕێت. چونکە لە زیرەکی و کارامەیی خۆیەوە هەڵنەقوڵاون،

بـەڵکو یـەکێکن لـە موعجـیزاتی قورئـان و چاکەیـەکن لـە چاکەکاریـیـەکانی میـهرەبانیی خـوای گـەورە، تەنـها ئـەوەندە هەیـە کـە ئـەم پیـاوە و هـەزاران لـە هاوڕێیانی دەستیان بۆ وەرگرتنی ئەو دیارییە بەنرخە ڕاکێشاوە، بەڵام ئەو بۆ بڵاوکردنەوەیان هەڵبژێرراوە.

باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە: ئەم پەیامانە هی وایان هەیە لە شەش سەعاتدا و، هی تریان لە دوو سەعاتدا و، هەندێکیان لە یەك سەعاتدا و، هەندێکی تریشیان لـە (دە) دەقیقەدا نووسراون!

وا مـن سوێندتان بۆ دەخۆم کـە ئەگـەر ئێستا زیرەکـی و توانـای یـاد و بـیری سەعیدی کۆنیشم ببوایە، نەمدەتوانی بە (دە سەعات) ئەو پەیامە بنووسم کـە بـە (دە دەقیقـە) نووسـرا و، نـەمدەتوانی بـە (دوو ڕۆژ) ئەوەشـیان بنووسـم کـە لـە (یـەك سەعات)دا نووسرا.

ئەوەتا ئەو پەیامەی کە لە بارەی چییەتیی "من" (خودیی مرۆڤ)[1] دەدوێت و لە ماوەی (شەش سەعات)دا نووسراوە، هەرگیز ناگونجێ نە لـە لایـەن منـەوە و نـە لـە لایەن فەیلەسووف و نووسەرە بلیمەتەکانیشەوە بە (شەش ڕۆژ) بنووسرێت.

کەواتـە ئێمـە هەرچـەند خۆمـان موفلیسـین و دارای هیـچ شـتێك نیـین، بـەڵام خزمەتگوزار و دەڵاڵین لە پیشانگای بەنرخترین گەوهەر و مرواریدا.

لە خوای گەورەی بەخشندە دەپاڕێینەوە کە بە چاکەکاری و بەخشندەیی خۆی ئێمە و هەموو قوتابیانی پەیامەکانی نوور بە ئیخلاسـی تەواوەتییـەوە لـەم خزمەتـەدا سەربخات.

ئامین.

* * *

(١) مەبەست (وتەی سیهەم)ە لە کتێبی (وتەکان). (وەرگێڕ)

(کورتە ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی ئیعجازی قورئان)[1]

لە خەونێکدا کە لەمەوبەر دیومە، خۆم لە ژێر چیای "ئارارات"دا بینی. کتوپڕ لەو خەونەدا چیاکە تەقییەوە و بەردی گەورە گەورەی بە ئەندازەی شاخەکانی بۆ هەموو جێیەکی دنیا هەڵدا و، جیهانی بە تەواوی پەشۆکاند و خستیە لەرزەوە..

کتوپڕ پیاوێك لە تەنیشتمەوە ڕاوەستا و پێی وتم: چی لە بارەی جۆرەکانی ئیعجازی قورئانەوە دەزانیت بە پوختی و کورتی ڕوونیان بکەرەوە.

هێشتا لە خەونەکەمدا بووم بیرم لە تەعبیرەکەی کردەوە و، وتم:

تەقینەوەی ئەم چیایە نموونەیەکە بۆ ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بەسەر گۆی ئادەمیزاددا دێن و، بێ هیچ گومانێکیش ڕێنمایی قورئانی پیرۆز بە بەرزی و بڵندی باڵی بەسەر ئەو ئاڵوگۆڕەدا ڕادەکێشێت و، ڕۆژێك دێتە پێش کە ئیعجازی قورئانی تێدا ڕوون دەکرێتەوە.

بۆیە وەڵامی ئەو پیاوەم دایەوە و وتم:

ئیعجازی قورئان لە حەوت سەرچاوەی هەمەکییەوە دەردەکەوێت و لە حەوت ماك(عنصر) پێکدێت.

---

(١) تێبینیی وەرگێڕ:

مامۆستا نوورسی لە ناوەندی "پاشبەندی قەستەمۆنی"دا سێ پارچەی پەیامی "چەند بریسکانەوەیەك"ی داناوە کە بریتین لە: (هەموو ئازارێك لە گومڕاییدایە.. کورتە باسێك لە بارەی ئیعجازی قورئانەوە.. دوو بەڵگەی مەزنی تەوحید). ئەمەش بەپێی ئەو دەستوورەی کە لە "مەسنەویی نووری" لە کۆتایی پەیامی "دڵۆپێك لە دەریای تەوحید"دا باسی کردووە. ئەوەتا لەوێ دەڵێت:

"... چونکە من قورئان بە سەرچاوەی هەموو ڕێژنە و بەرەکەتێك دەبینم. خۆ هەرچی جوانیی حەقیقەتەکان لە بەرهەمەکانمدا هەیە، تەنها لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوەیە. هەر لەبەر ئەمەیە کە دڵم ڕازی نابێت هیچ بەرهەمێکم پوختەیەکی لە بارەی تایبەتکارییەکانی ئیعجازی قورئانەوە تێدا نەبێت".

جا لەبەر ئەوەی پەیامی "چەند بریسکانەوەیەك" لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "بریسکەکان"دا بڵاوکراوەتەوە، ئەوا لێرەدا هەر تەنها یەکێك لەو سێ پارچەیە دەهێنین، کە بریتییە لە: "کورتە ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی ئیعجازی قورئان". خۆ هەرکەسێك لە خوێنەرانی بەڕێز ئارەزووی لە خوێندنەوەی هەموویەتی، با بفەرموێت ئەو دوو پارچەیەی تر لە شوێنی ناوبراودا سەیر بکات. (وەرگێڕی چاپە عەرەبییەکە)

❒ سەرچاوەی یەکەم:

ڕەوانیی زمـانی قورئـان لـە پـاراوی(فەصاحـەت)ی لەفزەکەیـەوە پـەیدا دەبێـت، چونکە بریسـکـەی بەیانی "لەفز" لە ڕەوانیی هۆنین و، ڕەوانبێژیی مـانا و، نـاوازەیی واتاکان و، بەرزیی ناوەرۆك و، بێ هاوتایی شێوازەکانەوە، سەر هـەڵدەدات.. ئیتر لە تێکەڵ کردنی هەموو ئەمانە و لە ناوەندی یەکێك لە جۆرێکی ئیعجازی وادا کە مرۆڤ هەرگیز لە دووپـات کردنـەوەی بێزار نـابێت نەخشـونیگارێکی "بـەیانی"ی سەرسووڕهێن و زمانپاراوییەکی ناوازە پەیدا دەبێت.

❒ ماکی دووهەم:

بریتییـە لـــە هــەواڵدانە ئاسمانییـەکان سـەبـارەت بـە ڕاســتییە پەنهانـەکانی گەردوون و نهێنییە غەیبییەکانی لەمەڕ حەقیقەتە خواییەکان.

چونکە گەنجینەی زانستی شتانی غەیبی و پەنهان لە: کاروبارە غەیبییەکانی نـاو دووتوێی "ڕابوردوو" و، بارودۆخە شارراوە نەهاتووەکانی "داهاتوو" پێکدێت. جا قورئانی پیرۆز لەم ڕووەوە زمانی "جیهانی غەیب"ە کە بـە هێمـا لـە بـارەی پایەکانی ئیمانەوە لەگەڵ "جیهانی بینراو"دا دەدوێت و، مەبەستیشی لێرەدا ڕەگەزی مرۆڤـە. خۆ ئەمەش جۆرێکە لە بریسکانەوەیەکی نوورانیی ئیعجازی قورئان.

❒ سەرچاوەی سێهەم:

بریتییـە لــەوەی کـە قـورئانی پیرۆز لـە پێنـج لاوە، واتـە لــە: (لـەفز و، واتـا و، ئەحـکام و، زانست و، ئامانجەکانی)دا جامیعییەتێکی دەراسای تێدایە.

*لەفزەکەی:*

گەلـێ گریمانی فراوان و ڕووی زۆر و زەبەندەی لەخۆ گرتووە، بە جۆرێـك کـە هەموو یەکێ لەو ڕووانە بەلای ڕەوانبێژییـەوە جوانـە و، زانسـتی زمـانی عـەرەبیش بەلایەوە پەسەندە و، شایستەی نهێنیی تەشریعیشە.

*سەبارەت بە واتاکەشی:*

ئـەو بەیانـە خـاوەن ئیعجـازەی قورئـان سـەرجەمی مەشـرەبەکانی ئــەولیا و، چێژەکـانی خواناسـان و، ڕێڕەوەکـانی سالیکان و، ڕێگاکـانی زانایـانی کـەلام و،

ڕێبازەکانی دانایانی گرتووەتەوە، تەنانەت هەموویانی لەخۆ گرتووە. ئەوەتا دەلالەتەکانی دارای شوولییەتن و واتاکانیشی تابلێی بەربلاون.

ئای ئەم مەیدانە چەندە فراوانە، ئەگەر لەم پەنجەرەیەوە بۆی بڕوانیت!

*گشتگیریی ئەحکامەکانی:*

ئەوەتا ئەم شەریعەتە خاوێنە لەو قورئانە پیرۆزە وەرگیراوە. چونکە شێوازی ڕوونکردنەوەکانی: سەرجەم دەستوورەکانی بەختەوەریی دنیا و قیامەت و، هۆکارەکانی ئاسایش و دڵنیایی و، وابەستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و، هۆکارەکانی پەروەردە و، حەقیقەتەکانی سەرجەم حاڵەتەکانی، لەخۆ گرتووە.

*گشتگیریی زانستەکەی:*

زانستە گەردوونی‌یەکان و زانستە خواییەکان، بە چەند پلەیەك و لە ڕێی چەند بەڵگە و هێما و ئاماژەیەکەوە، لەناو شوورای سوورەتەکانی قورئاندا دانراون.

*سەبارەت بە مەبەست و ئامانجەکانیش:*

ئەوەتا بە: هاوسەنگی و، بەردەوامی و، یەکاویەك بوون و، یەکخستنی ئامانج و مەبەستەکان، چاودێری‌یەکی تەواوی دەستوورەکانی سروشتی کردووە. بەمەش هاوسەنگیی خۆی پاراستووە.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز جامیعییەتی ئاشکرای خۆی لە:

هەمەلایەنگیریی وشە و، فراوانیی واتا و، گشتگیریی ئەحکام و، سەرتاسەریی زانست و، هاوسەنگیی ئامانجەکاندا.. دەرخستووە.

☐ ماکی چوارەم:

بریتی‌یە لەوەی کە: بە ئەندازەی پلەی تێگەیشتنی هەموو چەرخێك و، ئاستی ئەدەبی گشت چینێك و، بە گوێرەی توانا و پلەی لێهاتنی یەك بە یەکیان، نوورانێتیی خۆی پەخشاندووە.. ئەوەتا دەرگای قورئان بۆ سەرجەم چینەکانی گشت چەرخێك لەسەر پشتە، بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەو گوفتارە ڕەحمانی‌یە بۆ هەموو شوێن و کاتێك بە ڕاستەوخۆ و تایبەتی نازڵ بووە!

خۆ تا ڕۆژگاریش پیر ببێت قورئانی پیرۆز زیاتر لاو دەبێتەوە و هێماکانی پتر ئاشکرا دەبن، چونکە ئەو وتارخوێنە ئیلاهی‌یە - واتە قورئان - پەردەی سروشت و هۆکارەکان دەدڕێنێت و، هەموو کات لە هەموو ئایەتێکدا نووری یەکتایی دەتەقێنێتەوە و، ئالآی شایەتیدانی "تەوحید" لەسەر "غەیب" لەم "جیهانی بینراو"ەدا.. هەڵدەکات.

"بەرزیی گوفتاری قورئان" سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت و بۆ تێرامان و بیرکردنەوە بانگهێشتی دەکات. چونکە قورئانی پیرۆز زمانی جیهانی غەیبە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ جیهانی بینراودا دەدوێت.

لەم ماکەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

لاوێتیی دەراسای قورئان گشتی و هەمەلایەنە و، هاوڕازی و هاودەمی‌یەکەشی کردوویەتی بە خۆشەویستی جینی و ئادەمیزاد. ئەمەش لە ڕێی دابەزاندنی شێوازی تێگەیاندنەکانیەوە بۆ ئاستی ژیریی مرۆڤ کە پێی دەوترێت: "التنـزلات الإلهية الى عقول البشر" کە شێوازە جۆراوجۆرەکانی قورئانە. بۆ ئەوەی زەینەکان ڕابهێنێت و هاودەمی و هاوڕازی‌یان لەگەڵ ئەو ئاستانەدا بۆ دەستەبەر بکات.

❑ سەرچاوەی پێنجەم:

هەواڵدانەکانی قورئان لە شێوازێکی ناوازەی تۆکمە و پڕ واتادان و، خاڵە بنچینەییەکانی هەواڵە ڕاستەکان وەك شایەتێکی بینەری ئامادەی ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە و، لەم ڕێیەوە مرۆڤیان لێ ئاگادار دەکاتەوە.

ئەو شتانەش کە دەیانگێڕێتەوە بریتین لە: هەواڵەکانی پێشینان و، حاڵەتەکانی بەرەکانی ئایندە و، نهێنی‌یەکانی بەهەشت و دۆزەخ و، ڕاستی‌یەکانی جیهانی غەیب و نهێنی‌یەکانی جیهانی بینراو و، نهێنی‌یە خواییەکان و، پەیوەندی‌یە گەردوونی‌یەکان. هەموو ئەم هەواڵانەش قورئانی پیرۆز بە چاو دەیانبینێت ئنجا ڕایاندەگەیەنێت، بە ڕادەیەك کە واقیع و مەنتیق هەرگیز ناتوانێت بە درۆیان

بخاتەوە و پووچەڵیان بکاتەوە، با خۆیشی نەتوانێت هەستیان پێ بکات و پەی بپات پێیان!

هەر قورئانە کە جێی بڕوای زانای شارەزای کتێبە ئاسمانی‌یەکان بێت، چونکە لە شوێنەکانی یەکگرتنەوەی ئەو کتێبانە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، ڕاستیی قورئان دەسەلمێنێ و.. لەوانەشدا کە یەك ناگرنەوە، لە ڕووی قورئانەوە هەڵەکانی ئەو کتێبانە ڕاست دەکاتەوە!

بە ڕاستی ئەمە موعجیزەی ڕۆژگارە، کە ئەم کاروبار و شتە نەقلی‌یانە لە "نەخوێندەوار"ێکەوە دەربچێت!

❑ ماکی شەشەم:

قورئانی پیرۆز دامەزرێنەر و لەخۆگری ئایینی ئیسلامە. ئەگەر هەموو کات و شوێنێك بپشکنیت، نە لە "ڕابوردوو" نە لە "داهاتوو"دا ئایینێکی وەك ئیسلام نادۆزیتەوە.

قورئانی پیرۆز ئەو ڕاگیرکەرە بەتین و بەهێزەیە کە خوای گەورە گۆی زەویی پێ ڕاگیر کردووە، تاکو لە تەوەرە دەرنەچێت و ڕۆژانە و ساڵانە هەڵی دەسووڕێنێت و دەیخولێنێتەوە و بەڕێوەی دەبات. قورئانی پیرۆز قورسایی و ویقاری خۆی لەسەر گۆی زەویدا داناوە و جڵەوی زەویی بە دەستەوە گرتووە و بواری ملنەدان و سەرپێچیی بۆ نەهێشتووەتەوە.

❑ سەرچاوەی حەوتەم:

ئەو شەش نوورەی کە لە ڕێژنەی ئەم شەش سەرچاوەیەوە هەڵقوڵاون، تێکەڵی یەکتری دەبن و تیشکی جوانی‌یەکی ناوازە پەخش دەکەن و حەدسێکی زیهنی‌یان لێ پەیدا دەبێت کە هۆکارێکی نوورانی‌یە و، لەمەشەوە چێژێك سەرهەڵدەدات کە بە هۆیەوە پەی بە ئیعجاز دەبرێت. ئەو چێژەی کە زمانمان لە ئاستیدا هێندە کۆڵەوارە ناتوانێت دەری‌ببڕێت و، بیریش هێندە کورتە کە ناتوانێت بە داوێنی بگات. بەڵێ، ئەو ئەستێرانەی ئاسمان بە چاو دەبینرێن بەڵام بە دەست ناگیرێن!

قورئانی پیرۆز خۆی لە خۆیدا بەڵگەی ئیعجازە، چونکە وا سیازدە سەدەی ڕەبەقە لە لایەکەوە دوژمنانی قورئان گیانی بەربەرەکانێ و بەرەنگاربوونەوەیان بەرامبەر بە قورئان هەڵگرتووە و، لە لایەکی تریشەوە دۆست و خۆشەویستانی گیانی چاولێکەری و تاسەمەندی‌یان بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی قورئانی پیرۆز تێدا پەیدا بووە..

لە ئەنجامی ئەم دوو ئارەزووە توند و بەتینەشەوە ملیۆنەها کتێب بە زمانی عەرەبی نووسراون، جا ئەگەر ئەو ملیۆنان کتێبە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بەراورد بکرێن ئەوا هەر کەسێك دەیانبینێت یان دەیانبیستێت، تەنانەت عەوامترین کەسیش، چ جای مرۆڤی زیرەکی دانا، دەڵێت:

ئەو کتێبانە بەشەرین و ئەم قورئانەش ئاسمانی‌یە!

بێ هیچ گومانێکیش بڕیار دەدات کە هیچ کام لەو کتێبانە لە قورئان ناچن و هەرگیز ناگەنە ئاستی..

جا یان قورئان لە خوار هەموویانەوەیە، کە ئەمەش بە ئاشکرا گریمانێکی مەحاڵ و بەتاڵە، یان گریمانەکەی ترە کە بریتی‌یە لەوەی:

قورئان لە سەرووی هەموویانەوەیە!

لە درێژایی ئەم ماوە زۆرەدا قورئانی پیرۆز دەرگاکانی خۆی بۆ مرۆڤ خستووەتە سەر لا و ناوەرۆك و بابەتەکانی خۆیشی پێش‌چاو خستوون و، گیان و زەینەکانی ئەوانیشی بۆ لای خۆی بانگ کردووە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گرۆی مرۆڤ نەیانتوانی بەرەنگاری قورئان ببنەوە و هەرگیز ناشتوانن، چونکە کاتی تاقیکردنەوە دوایی هات!

قورئانی پیرۆز لەگەڵ کتێبەکانی تردا بەراورد ناکرێت و هەرگیز لەوان ناچێت.

چونکە – لەبەر حیکمەتێکی پەروەردگاری – ئەم قورئانە پیرۆزە بەش بەش و جار جار لە ماوەی بیست و ئەوەندە ساڵدا نازڵ بووە و، هەر جارەی چەند

هۆکارێکی جیاجیا بۆ نازڵ بوونی هاتووەتە کایەوە و، بۆ وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی دووپات بووی جۆراوجۆر و، بۆ ڕوونکردنەوەی بڕیاری چەندین ڕووداوی جیا جیا و، لە چەند کاتێکی جیاواز و جۆراوجۆر و چەند حاڵەتێکی وەرگرتنی لەیەك نەچوودا و، بۆ تێگەیاندنی چەند قسە بۆکراوێکی جۆراوجۆر و لەیەکتر دوور و، بۆ چەندەها ئامانجی ڕێنمایی یەك لە دوای یەکی جیاجیا.. نازڵ بووە.

وێڕای ئەم هەموو بناغە جیاوازانە و یەك نەبوونی کاتەکانی نازڵ بوونی قورئان، کەچی لە ڕووی ڕەوانبێژی و وەڵام و گوفتارەکانیەوە، کەماڵی ڕەوانی و ڕێکی و لەگەڵ یەك گونجان و پشتگیریی یەکتریی، لە خۆیدا دەرخستووە. ئەوەتا زانستی "بەیان" و "مەعانی"ت لە بەردەستدایە، فەرموو لە چاویلکەی ئەم دوانەوە سەیری ئەو لایەنە ناوبراوانەی قورئان بکە.

هەروەها قورئانی پیرۆز "تایبەتکاری"یەکی تێدایە کە لە هیچ قسە و گوفتارێکی تردا نیيە:

چونکە هەر گوفتارێك لە هەر کەسێك ببیستیت ئەوا لەناو ئەو قسەیەدا یان لە پشتیەوە خاوەنەکەی دەبینیت، چونکە شێوازی گوفتار ئاوێنەی مرۆڤە.

دەسا ئەی مرۆڤە پرسیارکەرەکەی جیهانی میسال!

تۆ داوای ڕوونکردنەوەی ئیعجازت لێ کردم، وا منیش ئاماژەم بۆ کرد.

خۆ ئەگەر داوای درێژەپێدانی باسی ئیعجاز دەکەیت، ئەوا لە سنوور و توانای مندا نیيە، چونکە ئایا مێش دەتوانێت هەموو ئاسمانەکان ببینێت؟!

کتێبی (إشارات الإعجاز) لەناو چل جۆردا تەنها ڕوونکردنەوەی یەك جۆر ئیعجازی گرتە ئەستۆ، کەچی هێشتا سەد لاپەڕەی ئەو تەفسیرە مافی تەواوی بە ڕوونکردنەوەی یەك جۆری ئیعجاز نەداوە.

لەبەر ئەوە، من داوای درێژەی ڕوونکردنەوەی "ئیعجاز"ت لێ دەکەم، چونکە خوای گەورە ڕێزی لێ ناویت و ڕێژنەیەکی ئیلهاماتی ڕۆحیی پێ بەخشوویت!

کۆتایە دەستی:

"ئەدەب"ی غەربی هەوەسبازی هەواکاری "دەهاء"دار

ناگاتە ئاستی:

"ئەدەب"ی هەر ئەبەدیی: قورئانی ڕووناکباری شیفاکاری "هودا"دار!![1]

چونکە ئەو حاڵەتەی کە چێژی بەرز و بڵندی "مرۆڤانی کامڵ" تێر و دڵنیا دەکات، دڵی ئەو چەشنە کەسانەی پێ خۆش و شادمان نابێت کە پابەندی هەوا و ئارەزووی مناڵانە و هەڵگری خوو و ڕەفتاری هەرزە و نەفامانن!

جا لەسەر بناغەی ئەم "دانایی"یە:

هەر "چێژێك"ی نزم و هەرزە ئاسا، کە لەناو زەلکاوی هەوەسبازی و هەوا و ئارەزووی "دەروون"دا گەشەی سەندبێت، بە تامی چێژەکانی "گیان" ئاشنا نییە و بەکامی دڵ حەزیان لێ ناکات!

کەواتە ئەدەبی ئێستاکەی مرۆڤایەتی، کە داچۆڕاوی ئەدەبی ئەورووپایە و، لە دەلاقەی هەل ومەرجی "ڕۆمان"ەوە ئەدەب هەڵدەسەنگێنێت، لە بەرامبەر بینینی وردەکارییە نیان و بڵندەکانی قورئاندا کوێر و کۆڵەوارە و.. لە ئاستی چەشتنی ئەو وردەکاری و چێژە بەرزانەشدا بێ توانا و دەستەوسانە. لەبەر ئەوە، هەرگیز ئەو ئەدەبە بیانییە ناتوانێت پێوەرەکانی خۆی بکات بە سەنگی مەحەك بۆ هەڵسەنگاندنی قورئانی پیرۆز!

ئنجا "ئەدەب" لە سێ مەیداندا هەڵدەسووڕێت و لێیان لا نادات:

مەیدانی حەماسەت و جوامێری..

مەیدانی عیشق و جوانی..

مەیدانی وێنەکێشانی واقیع و ڕاستی.

هەرچی ئەدەبی بیانییە:

---

(١) بۆ دارشتنەوەی کوردیی ئەم برگەیەی ناونیشانی باسەکە، زیاتر دەقە تورکییەکە رەچاوکراوە تا وەرگێرراوە عەرەبییەکە. (وەرگێر)

❖ لە مەیدانی "حەماسەت"دا:

عەودالی "ڕاستی" نییە.. بەڵکو لە ڕێی هەڵنان و پێدا هەڵگوتنی ستەم و لە سنوور دەرچوونەکانی ستەمکارانەوە، هەردەم شەیدا بوونی بەدەستهێنانی "هێز" بە گوێی هەستی مرۆڤدا دەچرپێنێت و، عەودالی "زاڵ بوون" و "بەهێز نازینی" دەکات..

❖ لە مەیدانی "عیشق و جوانی"شدا:

ئاشنای عیشقی حەقیقی نییە.. بەڵکو جێ بۆ چەشتنی چێژی هەوا و ئارەزوویەکی شەهوانیی بە تەوژم لە دەروونەکاندا، دەکاتەوە.

❖ لە مەیدانی "وێنەکێشانی ڕاستی و واقیع"یشدا:

لەو گۆشەیەوە ناڕوانێتە بوونەوەران کە دەری بخات: ئەو بوونەوەرانە سنعەتی خوای گەورە و بەدیهاتووی میهرەبانیی ئەون. بەڵکو هەموو توانا و بایەخێکی دەتربجێنێتە گۆشەی "سروشت" و وێنەی ڕاستییەکان لەو ڕوانگەیەوە دەکێشێت، بێ ئەوەی بتوانێت خۆی لەو گۆشە نیگایە دەرباز بکات. لەبەر ئەوە، هێندە عیشقی سروشت و بە خوا دانانی مادده بە گوێی مرۆڤدا دەدات تا لە ناخی دڵدا جێیان دەکاتەوە. ئەو کاتەش مرۆڤ بە ئاسانی لەو گێژاوە ڕزگاری نابێت.

پاشان ئەو ئەدەبە بیانییەی کە ئاوێتەی هەرزەییە، هیچ سوودێك بەو نیگەرانی و شڵەژاوییەی "گیان"ی مرۆڤ نابەخشێت کە ئەنجام و بەروبوومی گومڕاییە. بەڵکو بە ڕواڵەت هێمنی دەکاتەوە و بە پەنامەکیش پتر گەشەی پێ دەسێنێت! پێیشی وایە کە ڕێگا چارەیەکی بۆ ئەو گیروگرفتە دۆزیوەتەوە و لەو گومانەشدایە کە تاکە چارەسەر بێت. ئەویش بریتییە لەو داستان و ڕۆمانانەی پێشکەشیان دەکات. خۆ ئەگەر سەرنج لەمانەش بدەیت، دەبینیت:

لە ڕێی کتێبەوە دەیانخاتە ڕوو.. کە زیندوویەکی مردووە!

یان لە ڕێی سینەماوە.. کە چەند مردوویەکی بزۆکن..

یاخود شانۆ.. کە تارماییەکانی تێدا دەژێینەوە و بە پەلە و یەك لە دوای یەك لەو گۆڕستانە فراوانەوە دێنەدەر کە ناوی "ڕابوردوو"ی لێ نراوە!

ئەمەیە جۆرەکانی ڕۆمانی ئەو ئەدەبە..

ئیتر مردوو چۆن دەتوانێت ژیان ببەخشێت؟!

ئەو ئەدەبە بیانی‌یە، بێ هیچ شەرم و ڕوویەك، زمانێکی درۆزنی لە دەمی مرۆڤدا جێگیر کردووە و، چاوێکی فاسق و لە ڕێ ترازاویشی لە ڕوخساریدا داناوە و، کراسی ئافرەتە سەماکەرێکی بێ ئابڕووشی بە بەری دنیا پۆشیوە!

ئایا ئەم ئەدەبە لە کوێ "جوانیی پەتی(موجەڕڕەد)" دەناسێت و چۆن پێی ئاشنا دەبێت؟!

تەنانەت گەر بیەوێت "خۆر" پیشانی خوێنەرەکەی بدات، ئەوا ئافرەتە ئەکتەرێکی لەشولار جوانی سووورباوی قژ زەردی یاد دەخاتەوە.

ئەو ئەدەبە بیانی‌یە بە ڕواڵەت دەڵێت:

(هەرزەیی ئەنجامەکەی ناهەموارە و شایستەی مرۆڤ نی‌یە) جگە لەمە، ئەنجامە زیانبەخشەکانیشی دەخاتە ڕوو..

بەڵام وێنەی ئەو "هەرزەیی"یە بە شێوەیەك دەکێشێت کە لیك بە دەماندا دەهێنێتە خوارێ و، جڵەوی "ژیری"یەکان لە دەستی خاوەنەکانیان دەترازێنێت و، هێندەش ئاگر لە هەوا و هەوەس و ئارەزووەکان بەردەدات و دەیانوروژێنێت تا بە جارێ پەتیان پێ دەبچڕێت و هانیان دەدات ملکەچی هیچ شتێکی تر نەبن!

بەڵام هەرچی ئەدەبی قورئانی پیرۆزە:

هەوا و ئارەزووی مەنگ و بێ دەنگی مرۆڤ ناشڵەقێنێت و هەرگیز نایوروژێنێت، بەڵکو هەستی خۆشویستنی "ڕاستی" و عەوداڵ بوون بە دوای "حەقیقەت"دا بە مرۆڤ دەبەخشێت.. شەیدای جوانیی پەتیی دەکات.. تامی عیشقی "جوانی" و تاسەمەندیی خۆشویستنی "ڕاستی"ی پێ دەچێژێت.. هەرگیز خوێنەرانی ناخەڵەتێنێت.

ئەدەبی قورئان لە گۆشەی سروشتەوە ناڕوانێتە بوونەوەران. بەڵکو بە سنعەتێکی خوایی و جێ دەستێکی میهرەبانیی خواوەندیان دەبینێت و دەیانخاتە ڕوو، بێ ئەوەی ژیریی هیچ کەسێك گرفتاری سەرگەردانی بکات.

لەبەر ئەوە، ئەم ئەدەبەی قورئان:

نووری "ناسینی بەدیهێنەر" بە گوێی مرۆڤدا دەدات و.. نیشانەکانی ئەو بەدیهێنەرەش لە هەموو شتێکدا ئاشکرا دەکات.

ئنجا هەردوو ئەدەبەکە "خەم"ێکی کاریگەر لە ناخی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵن، بەڵام هیچ کام لەو خەمانە لەیەك ناچن؛ چونکە:

ئەو خەمەی ئەدەبی خۆرئاوا لە دڵدا بەجێی دەهێڵێت، چەشنی پەژارەی کەسێکی خەفەتبارە.. خەمێك لە: نەمانی خۆشەویستان و، لەدەستچوونی خاوەن و، نەبوونی پەنا و پشتیوانەوە سەری هەڵداوە.

ئەو ئەدەبە هەرگیز ناتوانێت خەمێکی بەرز و بڵند و شیاو بە مرۆڤ ببەخشێت، چونکە ئیلهام وەرگرتنی هەست و نەستی ئەدیب لە "سروشت"ێکی کەرو کاس و "هێز"ێکی چەواشە و کتوکوێر، ئازار و پەژارەیەکی وەها دەهاوێتە ناو ئەدەبەکەیەوە کە جیهانی لە بەرچاودا دەکات بە ماتەمینگایەکی سەرتاسەری و، مرۆڤیش دەخاتە ناوەندی بێگانە و کەسانێکی نامۆ، بێ ئەوەی پارێزگار و پشت و پەنا و خاوەنێکی بۆ فەراهەم بهێنێت!

بەم چەشنە، مرۆڤ لە ماتەمینییەکی بەردەوامدا دەهێڵێتەوە و، چرای ئاواتەکانی قووڵایی ناخیشی - یەك لە دوای یەك - لێ دەکوژێنێتەوە! تا لە ئەنجامدا ئەم هەستە ئازاربەخش و پەژارە بەسۆیە بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێت و، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو گومڕایی و ئیلحاد و ئینکاریی "بوون"ی بەدیهێنەری مەزنی دەبات. هێندەش لە ڕێ دەیترازێنێت کە گەڕانەوەی بۆ سەر ڕاستەشەقام گەلێ دژوار و دەگمەن دەبێت و، لەوانەشە هەر هەوڵێك لەم پێناوەدا بدرێت بێ ئاکام دەربچێت!

بەڵام ئەدەبی قورئانی پیرۆز:

"خەم"ێکی بەرز و بڵند و ناسك بە مرۆڤ دەبەخشێت؛ خەمی عاشقان نەك هی پەژارەی هەتیوان.. خەمێك کە لە جودایی خۆشەویستانەوە هەڵقوڵاوە، نەك لە تیاچوون و نەمانیان..

لەو گۆشەیەوە دەڕوانێتە بوونەوەران کە هەر هەموویان سنعەتی خوای گەورەی بینەر و میهرەبانن، نەك لە گۆشەی "سروشت"ی کتوکوێرەوە. تەنانەت هێندە سروشت فەرامۆش دەکات کە هەر لێشی نادوێت! بەڵکو "توانستی خاوەن دانست" و "چاودێریی گشتیی خواوەند" ڕوون دەکاتەوە، لە بریی ئەو "هێز"ە کتوکوێرەی کە ئەدەبی بیانی ئیلهامی لێ وەردەگرێت.

لە گۆشە نیگای ئەدەبی قورئانەوە بوونەوەران شێوەی ماتەمینگایەکی سەرانسەری و سامناك ناگرنە خۆیان. بەڵکو بوونەوەران لە بەرچاوی ئەو ئەدەبەدا دەبن بە کۆڕ و کۆمەڵێکی خۆشەویستی یەکتری. چونکە هاودەنگی و بەدەم یەکەوە چوونی بەشەکانی بوونەوەران لە هەموو گۆشەیەکی گەردووندا دەبینرێت و لە گشت لایەکیشیدا هاودەمی و خۆشەویستیی یەکتریی تێدا بەرچاو دەکەوێت و، لێڵی و دڵتەنگیی تێدا بەدی ناکرێت.

خەم و پەژارەی عاشقانە، ئاوایە..

مرۆڤ لە ناوەندی کۆڕێکی ئاوەهادا، ئیلهامی هەستێکی بەرز و باڵا وەردەگرێت، نەك پەژارە و خەمێك کە پتر دڵانی پێ تەنگ و تار دەبن!

هەردوو ئەدەبە کە "شەوق و شادی" بە مرۆڤ دەبەخشن..

بەڵام ئەو شەوق و تاسەمەندییەی ئەدەبە بیانییەکە پێی دەدات، هەوا و ئارەزووەکانی دەبزوێنێت و، دەرگای بۆ هەوەسبازیی "دەروون" لێ دەخاتە سەر پشت. بێ ئەوەی هیچ چەشنە خۆشی و شادمانییەك بە "گیان"ی ببەخشێت!

هەرچی ئەو شەوق و تاسەمەندییەشە کە قورئانی پیرۆز دەیبەخشێت، گشت گۆشە و کەنارەکانی "گیان"ی مرۆڤ بۆی دەلەرێتەوە و گیانی ئەو بەرەو بەرزاییەکان سەردەخات!

هەر لەسەر بناغەی ئەم نهێنییەشە کە:

شەریعەت "نەهی"ی لە "لەهوو"(کاری گاڵتە وگەپ) و هەر شتێك کردووە کە مرۆڤ بەرەو لەهوو ببات. ئەوەتا هەندێ ئامرازی "لەهوو"ی حەرام کردووە و، هەندێکی تریشیانی بە موباح داناوە..

بەو واتایەی کە:

هەر ئـامرازێك کاریگـەریی خـەم و شـەوقێکی قورئانی‌یانـەی بـەجێ دەهێشـت، زیانی نی‌یە..

بەڵام گەر کاریگەریی خەم و پەژارەی هەتیوانەی لـە مرۆڤدا جێ دەهێشـت و، شەوقی هەوا و ئارەزووی "دەروون"ی لـەودا دەورووژانـد، ئـەوا بـەکارهێنانی ئـەو ئامرازە بە "حەرام" دادەنرێت.

ئەم حـاڵـەتەش لە یەکێکـەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت و.. هەموو خەڵکی، لـەم هەسـت و نەستەدا، یەکسان نین.

* * *

(دەستکەوتی مەعنەویی بەکۆمەڵ)

باسمە سبحانە

السلام علیکم ورحمة اللّٰہ وبرکاتە

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بەڵگەی بێ گومان لەسەر ئەوەی کـە هـەموو قوتابی‌یەکی ڕاستی "پەیامـەکانی نوور" ئەو دەسکەوتە دەراسایە بەدەست دەهێنێت کە لـە نـهێنیی "شـەوی قـەدر"ەوە سەرچاوەی گرتووە و، مرۆڤ لەو ڕێیەوە هەشتا و سێ ساڵی تەمەنێکی مەعنەویی دەستگیر دەبێـت.. هـەروەها ئـەوەش کـە لـە نـهێنیی ئیخـلاس و پشـتگیریی یـەکتر و بەشـداری لـە کردەوەکـانی سـەر بـە دوارۆژدا سـەرچاوەی گرتـووە و لـە نێـوان قوتابیانی پەیامەکانی نووردا کاری پێ دەکرێت، ئەمەی خوارەوەیە:

گرێمانێکی بەهێز هەیە بۆ ئەوەی کە نەك هەر تەنها یـەك دوانێـك یـان دە کـەس و بیست کەس، بەڵکو سەدان کەسی ناوبازنەی نوور، کـە چـل هـەزار تەنانـەت سـەد هەزار ئیمانداری ڕاستەقینە و بێگەردی لـەخۆ گرتووە، ئـەو دەسـتکەوتە دەراسـا و مەزنەیان دەست بکەوێت.

جـا ئێمـە و ئێـوەش لـە ڕێـی نـهێنیی "ئیخـلاس" و بـەپێی دەسـتووری "بەشـداری کردن لە کاروبارەکانی سەر بەدوارۆژ"دا، پێکەوە ڕوو دەکەینە حەقیقەتی "شـەوی

قەدر" و خۆمان وا دادەنێین کە لە ناوەندی هەموو برایانماندایین و هەر یەکەمان بە ناوی هەمووانەوە و بە شێوازی کۆ(جمع) لەم مانگە پیرۆزەدا بڵێین:

"أَجِرْنا.. إرحمنا.. واغفرلنا.. ووفقنا.. واهدنا.. واجعل ليلة القدر في هـذا الشـهر - شهر رمضان - خيراً في حقنا من ألف شهرٍ"..

لە ناوەندی ڕاناوی "نا"ی هەموو یەکێکی دوعاکانیشدا نییەتی هەموو برایانمانی لێ بهێنین. دەبێ ئێوە بەو نیاز و نییەتە خاوێنەتان یارمەتیی تایبەتی ئەم برا لاوازەتان بدەن لە ئەرکە قورسەکەی سەرشانیدا.

* * *

(بۆچی هەر تەنها بە پەیامەکانی نوورەوە خەریك دەبین)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا کە زۆر پێویستم بەوە هەیە دنیا لە بیری خۆم ببەمەوە و سەیری کاروبارە ئافاقییەدەرەکییەکان نەکەم، کەچی بەداخەوە هەندێ جار ناچاریان کردم بۆ ئەو کاروبارانە بڕوانم. لە خوای گەورە داواکارم کە ئەم ڕوانینەمان بە جۆرە پەرستشێك بۆ بنووسێت، چونکە نیازمان خزمەتی ئیمانە.

بەڵێ، هەروەك دەست دەهێننە ڕێی ئێوە، بە هەمان جۆر و بە چەندین شێوازی جیاجیاش کارێك دەکەن کە هەست بکەین دەست دەهێننە ڕێی ئێمەش. بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەنجامی دەستدرێژییەکەیان پێچەوانەی ئامانجەکەیان دەردەچێت و یارمەتیی فتووحاتی پەیامەکانی نوور دەدات!

کاك "نەزیف"، کە قوتابییەکی قارەمانە، دەڵێت: ڕەخنە و ئیعتیرازی مەلاکەی ئەستەمبووڵ بوو بەهۆیەك بۆ فتووحات و درەخشانیی زیاتری پەیامەکانی نوور! هەروەك لە هەر شوێنێکدا کە دەستدرێژی دەکەنە سەر ئیشوکارە بچووکەکانیشمان، هەمان ئەنجامی دەبێت. بەڵام ئێستا بۆ مەبەستی ترساندنی هەندێ زانای لاواز و ئەهلی تەسەووف و ساردکردنەوەیان لە پەیامەکانی نوور، هۆیەکیان دۆزیوەتەوە کە بە خەیاڵدا نایەت و، دەڵێن:

"سەعید" هیچ کتێبێکی تر لای خۆی گل ناداتەوە! واتە ئەو کتێبانەی بە دڵ نیيە و، تەنانەت حەزیش لە کتێبەکانی ئیمامی غەزالی[1] ناکات و کتێبەکانی ئەو لای خۆی دانانێت!

بەم قسە سەیر و سەرسوورهێنەر و نابەجێیانە، زەینی خەڵکی لێڵ دەکەن. دەبێ بیشزانین کە هەر تەنها زەندیق و موڵحیدەکانن برەو بەم چەشنە پڕوپاگەندانە دەدەن، بەڵام هەندێ زانای ساویلکە و ئەهلی تەسەووف دەکەن بە داردەست و هۆی بڵاوکردنەوەیان.

ئێمەش لە بەرامبەر ئەمەوە دەڵێین:

حاشا.. سەد جار حاشا.. ئەرکی سەرشانی پەیامەکانی نوور و قوتابییانی بریتییە لە پارێزگاری کردنی ڕێبازی مامۆستاکەیان کە "حوججەتولئیسلام ئیمامی غەزالی"یە و، بەرگری لێکردن و دەرباز کردنیەتی لە هێرشی گومڕایان، تا ئەو ئەندازەیەی کە لە توانایاندایە. ئنجا ئیمامی غەزالی تاقانە مامۆستامە کە بە ئیمامی عەلییەوە - خوا لێی ڕازی بێت - پەیوەستم دەکات.

---

(١) ئیمامی غەزالی (٤٥٠ - ٥٠٥ك) یەکێکە لە گەورە مەردانی ئیسلام و، ناوی ئەبوو حامید محەممەدی کوڕی محەممەدی غەزالییە. کەڵە زانای زانستەکانی فیقهی شافیعی و کەلام بووە و، بە فەیلەسووف و زاهید و چاکسازێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی و خاوەن پەیامێکی ڕۆحی دادەنرێت کە جێ دەستی لە ژیانی ئیسلامیدا هەر لە سەردەمەکەی خۆیەوە هەتا ئێستا ئاشکرا و نمایانە. لە شاری "تووس"ی سەر بە خۆراسان لە دایك بووە و، پاش تەواو کردنی خوێندن لە زانستەکانی کەلام و فەلسەفە بە تایبەت هی ئیبن سینا و فارابی، هەروەها لە زانستەکانی دەستەی باتینی کۆڵیوەتەوە، بەڵام هیچ کام لەوانە نەیانتوانیوە پێویستیی زیریی ئەو بە یەقین و دڵنیایی تێر بکەن و ڕەزامەندیی حەز و خواستی دڵیشی لە بەدەستهێنانی بەختەوەریدا دەستەبەر بکەن، هەتا خۆی بە ڕێبازێکی جیاواز لە هەموو ئەوانە توانیویەتی بەو ئامانجە بگات و، دوایی هەر خۆی لە کتێبی (المنقذ من الضلال)دا ئەو گەشتە فیکری و ڕۆحییەی تۆمار کردووە. ماوەیەك لە قوتابخانەی نیزامییەی بەغدا (کە گەورەترین زانکۆی ئەو سەردەمە بووە) سەرگەرمی وانە وتنەوە بووە، پاشان سەردانی زۆر شاری وەك دیمەشق و بەیتولمەقدیس و قاهیرە و ئەسکەندەریە و مەککە و مەدینەی کردووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێهێشتووە کە ئەمە ناوی هەندێکیانە: "إحياء علوم الدين"، "تهافت الفلاسفة"، "المنقذ من الضلال"، "الأربعين في اصول الدين". پێم خۆشە خوێنەی بەڕێز بۆ زیادە شارەزابوون لە ژیان و ڕۆڵی گرنگی ئەم مەردە ناوازەیە بەرگی یەکەمی کتێبی (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)ی خوالێخۆشبوو (سەعید ئەبولحەسەنی نەدەوی) و، (هكذا ظهر جيل صلاح الدين)ی (د. ماجد الگيلاني) (بە تایبەتی: الفصل العاشر) بخوێنێتەوە. (وەرگێڕ)

ئەوەندە هەیە کە هێرشی زەندیقەکانی سەردەمی ئەوان هێندە سامناك نەبوو کە لەرزە بە پایەکانی ئیسلام بخات، بۆیە ئەو چەکانەی کە زانا لێکۆڵەرە مەزنەکان و موجتەهیدە گەورەکان بەپێی چەرخەکانیان لە مونازەرە و وتوێژە زانستی و ئایینی‌یەکانیاندا بەکاریان دەهێنا، هەروەك بە خێرایی لەم سەردەمەدا بەدەست ناهێنرێن، لە هەمان کاتیشدا دوژمنانی سەرسەختی ئەم ڕۆژگارە بە تەواوی سەرکوت ناکەن..

بەڵام پەیامەکانی نوور، بە ئیلهام وەرگرتنیان لە "قورئانی پیرۆز"ەوە، چەند چەکێکی نوێیان دۆزیوەتەوە کە دەتوانرێت بە خێرایی بەدەست بهێنرێن و، لە هەمان کاتیشدا هێندە بەهێز و کاریگەرن کە دوژمن تەفروتوونا دەکەن. بۆیە سەر لە کارگەی چەکەکانی ئەو مەردە هەڵکەوتووە بەرز و پیرۆزانە نادرێت. چونکە قورئانی پیرۆز کە سەرچاوە و کانی و مەرجەع و مامۆستای ئەو زانا بەرزانەیە، بووە بە مامۆستایەکی تەواوەتیش بۆ پەیامەکانی نوور.

جگە لەمانەش، ئێمە هێندە کاتمان بە دەستەوە نی‌یە و خۆشمان لاوازین و، بواری ئەوەمان بۆ نارەخسێت کە سوود لەو بەرهەمە نوورانی‌یانە وەربگرین. ئنجا سەدان هێندەی کەسانی وەك قوتابیانی پەیامەکانی نوور خەڵکانی تر هەن کە بەو کتێبانەوە سەرقاڵن و، ئێمە ئەو ئەرکەمان بۆ ئەوان بەجێ هێشتووە. دەنا ئێمە هەرگیزاو هەرگیز بەو شێوازە ناڕوانینە ئەو کتێبانە. بەڵکو بە ئەندازەی خۆشویستنی گیانی خۆمان بەرهەمە خاوێن و پیرۆزەکانی مامۆستا پایەدارەکانمان خۆش دەوێت. بەڵام هەریەك لە ئێمە یەك مێشك و یەك دەست و یەك زمانمان هەیە و، هەزاران دەستدرێژی کەریشمان لە بەرامبەرەوەیە و، کاتێکی یەکجار کەم و تەسکیشمان لە بەردەستدایە. خۆ مادەم دواهەمین چەکی ئۆتۆماتیکیمان لە بەردەم خۆماندا دۆزیوەتەوە – کە بەڵگەکانی پەیامەکانی نوورە – ئەوا ناچار بووین کە ئەو چەکە سەروزیادمان بێت و دەستی لێ گیر بکەین.

* * *

(هاندەری ڕیاکاری و ڕێگران لێی)

برایانی ئازیز و بێگەرد و دڵسۆزم!

ئەی هاوڕێیانی ڕاستەقینە و چوست و چالاکم لە خزمەتی قورئاندا!

بەبۆنەی بڵاوبوونەوەی پەیامی "ئیخلاس" لە دەوروبەری خۆمان و لە پارێزگای ئیسپارتەشدا و، بەبۆنەی ڕوودانی دوو سووکەڵە ڕووداو، خاتیرەیەکی بەهێز هاتە دڵمەوە. وا ئێستا سێ خاڵ دەنووسرێن کە تایبەتن بە "ڕیا"وە:

● یەکەمیان:

"ڕیا" هەرگیز توخنی فەرز و واجب و شەعائیرەکانی ئیسلام و شوێنکەوتنی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ و دوورەپەرێزی لە حەرام، ناکەوێت. چونکە هەرگیز دەرخستنی ئەم کارانە بە ڕیا دانانرێت. مەگەر کەسێك سروشتی لەسەر ڕیاکاری دامەزرابێت و ئیمانەکەشی زۆر لاواز بێت. تەنانەت ئاشکرا کردنی ئەو پەرستشانەی کە پەیوەندییان بە شەعائیرەکانی ئیسلامەوە هەیە لە شاردنەوەیان گەلێ پاداشتی زیاتری هەیە، وەك "حوججەتولئیسلام ئیمامی غەزالی، خوا لێی ڕازی بێت" ڕوونی کردووەتەوە.

خۆ هەرچەندە شاردنەوەی سوننەتە "نەوافیلەکان" گەلێ پاداشتی زۆرە، بەڵام ئەو نەوافیلانەی کە پەیوەندییان بە شەعائیرەکانی ئیسلامەوە هەیە، بە تایبەت لەم چەشنە کاتانەی کە بیدعەتەکان پەرەیان سەندووە و، ئاشکرا کردنی ئەو تەقوایەش کە بریتییە لە وازهێنان و دەستبەرداربوون لە حەرام لە ناوەندی ئەم هەموو گوناهە گەورە و زۆر و بڵاوانەدا.. هەموو ئەمانە، ئاشکرا کردنیان زۆر لە شاردنەوەیان پاداشتی زیاتری هەیە، چ جای ئەوەی بە "ڕیا" دابنرێن.

● خاڵی دووهەم:

چەند هۆکارێکی زۆر هەن کە مرۆڤ بەرەو ڕیاکاری دەدەنە بەر. لەوانە:

❖ هۆکاری یەکەم: لاوازیی ئیمانە..

ئەو کەسەی کە بیر لە خوای گەورە نەکاتەوە، "هۆکارەکان" دەپەرستێت و، بە حەزی خۆدەرخستن لە پێش‌چاوی خەڵکیدا، خۆی دەخاتە دۆخی ڕیاکردنەوە.

"قوتابیانی پەیامەکانی نوور" لە ڕووی بەندایەتی‌یەوە، نرخ و گرنگی نە بۆ هۆکارەکان و نە بۆ خەڵکی دانانێن، تاکو لە پەرستشەکانیاندا نیازیان دەرخستنی بێت لە پێش‌چاوی خەڵکیدا و، لەم ڕێ‌یەوە گرفتاری ڕیا نابن. چونکە وانەیەکی ئیمانی و ڕاستەقینەی بەهێز لە پەیامەکانی نوورەوە وەردەگرن.

❖ هۆکاری دووهەم: هەڵپە و تەماعکاری، لە گۆشەی هەژاری و لاوازی‌یەوە، مرۆڤ هان دەدەن کە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و بکەوێتە ناو چەند بارودۆخێکی پڕ لە تەکەللوفی ئەوتۆ کە ڕیاکاری و خۆ دەرخستنی پێوە دیار بێت.

جا لەبەر ئەوەی قوتابیانی نوور لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ڕێنمایی و دەرسەکانی پەیامەکانی نوور (چەشنی: دەست پێوەگرتن (ئیقتیصاد) و، قەناعەت و، پشت بە خوا بەستن و، ڕازی بوون بەو بەشەی کە خوای گەورە داویەتی) عیززەتی ئیمانی بەدەست دەهێنن، ئەوا ئەم عیززەتە نایەڵێت خەریکی لەخۆڕازی بوون و ڕیاکاری بن و، لە پێناوی بەرژەوەندی‌یەکانی دنیا دەست لە کاری خۆیان هەڵبگرن.

❖ هۆکاری سێ‌هەم: هەڵپە و هەوڵ بۆ ناوبانگ و، حەز کردن لە پلەوپایە و، سەرکەوتن بەسەر هاوەڵاندا و، هاوچەشنی ئەمانە لەو جۆرە هەست و نەستانە.. هەروەها خۆپیشاندان لە شێوەیەکی جوانی بەرزدا و، چوونە سەر تەرزی کەسانی مەزن کە ئەم شایستەی نەبێت و، ڕاکێشانی سەرنج و ڕوانین و سەرسووڕمانی خەڵکی بە چەشنێ کە لە سەرووی توانا و لە دەرەوەی سنووری خۆیەوە بن، ئەمانە و هاوچەشنیان لە جۆرەکانی تەکەللوف لە هەڵسوکەوتدا، تێکڕا مرۆڤ دووچاری ڕیاکاری دەکەن.

بەڵام لەبەر ئەوەی قوتابیانی نوور "من"یان نەهێشتووە و کردوویانە بە "ئێمە" واتە: وازیان لە خۆویستی هێناوە و چوونەتە ناو بازنەی کەسێتیی مەعنەویی کۆمەڵەوە و، بە ناوی ئەو کەسێتی‌یەوە لە هەموو کارێکیاندا تێدەکۆشن و، لە بریی ئەوەی بڵێن: "من"، دەڵێن: "ئێمە" و.. بە وێنەی ئەوەی شوێنکەوتووانی تەریقەت بە هۆکارەکانی: کوشتنی "دەروونی بەدخواز" و جێ‌بەجێ کردنی دەستوورەکانی

"الفناء في الشيخ" و "الفناء في الرسول" لە دەست ڕیاکاری خۆیان ڕزگارکرد، ئەوا یەکێکی تریش لەو هۆکارانە: "الفناء في الإخوان"ە. واتە تواندنەوەی کەسێتیی تاکە لەناو حەوزی کەسێتیی مەعنەویی برایانیدا و بنیاتنانی هەموو ئیش و کارێکیەتی لەسەر ئەم بناغەیە.. جا هەروەك ئەهلی حەقیقەت بەو هۆکارە ناوبراوانە لە گۆبەندی ڕیاکاری ڕزگاریان بوو، پشت بە خوا قوتابیانی نووریش بەم نهێنی‌یە ڕزگاریان دەبێت لێی.

● خاڵی سێ‌هەم:

ئەو تەرز و بارودۆخە بەرز و بڵندانەی کە ئەنجامدانی ئەرکی ئایینی و شیرین کردنی ئایین لە بەرچاوی خەڵکیدا داخوازیانن، هەرگیز بە ڕیاکاری و لەخۆ ڕازی بوون دانانرێن، مەگەر کەسێك ئەنجامدانی ئەو ئەرکە بۆ خۆویستی و مەبەستی "کەسی"ی خۆی بەکاربهێنێت.

بۆ نموونە:

پێشنوێژی مزگەوت بە دەنگی بەرز نوێژ و زیکرەکان دەخوێنێت، ئەمەش بەشێکە لە ئەرکی ئایینیی سەرشانی و ڕیای تێدا نی‌یە. بەڵام گەر بیەوێت ئەو زیکرانە بە گوێی کەسانی تردا بدات، ئەوا لەبەر ئەوەی ئەم کارە بە یەکێك لە ئەرکەکانی سەرشانی دانانرێت، لەوانەیە ڕیای تێکەڵ ببێت. کەواتە گەر دەنگ بە خوێندنەوەی ئەو زیکرانە بەرز نەکاتەوە پاداشتی گەلێ زیاترە لەوەی کە بە دەنگی بەرز بیانخوێنێت.

لەبەر ئەمەی کە باس کرا، قوتابی‌یە ڕاستەقینەکانی نوور لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی ئایینی و بەجێهێنانی پەرستشەکانیاندا بەپێی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ و، دەست گرتنیان بە تەقواوە کە دوورەپەرێزی‌یە لە گوناهە گەورەکان.. ئا لەم کاتانەدا، ئەوان بە "کار پێ سپێرراو" دادەنرێن لە پێناوی خزمەتی قورئاندا، ئێمەش لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ڕیاکاری ئاوێتەی کارەکانیان نەبێت. مەگەر کەسێك بۆ ئامانجێکی تری جگە لە خزمەتی قورئان ڕۆشتبێتە بازنەی پەیامەکانی نوورەوە.

* * *

(لە بارەی ئەرکەکانی حەزرەتی مەهدییەوە)

... ئەو کەسەی کە نەتەوەی ئیسلام چاوەڕوانیەتی و لە ئاخر زەماندا دێت، سێ ئەرکی گرنگی لە ئەستۆدایە. گرنگترین و مەزنترینی ئەم سێ ئەرکەش بریتییە لە "بڵاوکردنەوەی ئیمانی تەحقیقی" و "ڕزگار کردنی ئیمان" لە دەست گومڕایی..

ئەرکی دووهەمیشی بریتییە لە جێبەجێ کردنی "شەریعەتی خاوێن و پیرۆزی ئیسلام". جا لە کاتێکدا کە ئەرکی یەکەم پشت بە هێزی ماددی نابەستێت، بەڵکو پاڵپشتەکەی تەنها هێزێکی مەعنەوییە کە لە "ئیخلاس" و "وەفا" و "هێزی باوەڕ" پێکهاتووە، کەچی ئەم ئەرکەی دووهەم پێویستی بە هێزێکی ماددیی هێندە مەزن هەیە کە مایەی ترس بێت بۆ دوژمنانی و دەستەڵاتێکی بەتواناشی هەبێت تا بتوانێت ئەم شەریعەتە خاوێنە جێبەجێ بکات.

ئەرکی سێهەم بریتییە لە خزمەتی ئیسلام لە ڕێی "ڕاگەیاندن و دامەزراندنی خەلافەتی ئیسلامی"یەوە. ئەمەش بە پشت بەستن دەبێت بە یەکێتیی موسڵمانان و ڕێککەوتن لەگەڵ نەصرانییە ڕۆحانییەکاندا کە لە پێناوی خزمەتی ئیماندا پاڵ بە موسڵمانانەوە دەدەن. ئەم کارمەندی و ئەرکە بەهۆی دەستەڵاتێکی مەزن و هێزێکی گەورە و ملیۆنەها گیانفیدای خۆبەختکەرەوە دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت.

ئەرکی یەکەم بە چەندین پلەی زۆر لە هی دووهەم و سێهەم بەرز و بڵندترە، بەڵام ئەم دوانەی تر، لەبەر ئەو جازیبەیەی کە تیایاندایە، لە پێش چاوی خەڵکیدا، بە تایبەت چینی عەوام، درەخشانتر و فراوانتر دەردەکەون!

پوختەی ئەم قسانە:

بەکارهێنانی ناوی "مەهدی" بۆ هەرکەسێك لەم سەردەمەدا، یەکسەر هەر سێ کارمەندییەکە پێکەوە بە زەینی مرۆڤدا دەهێنێت و، لەمەشەوە هەڵە ڕوو دەدات و، لەوانەشە ئیخلاسی مرۆڤی پێ زامدار ببێت و، تا ڕادەیەکیش هێز و تینی "ڕاستییەکان" بەلای چینی عەوامەوە لاواز دەبێت و، ئەو ڕاستییە یەقینییانەش کە لەسەر بناغەی بەڵگە دامەزراون لە بەرچاویاندا وەك "ظەننی غالیب"ی کێشە

قبووڵ کراوەکانی لێ دێت. ئەو کاتەش ئیماندارە سەرسامەکان ناتوانن بە تەواوی سەرکەوتن بەسەر گومڕایی و زەندەقەی سەرکەشدا بەدەست بهێنن و، ئەهلی سیاسەتیش ترس و گومان دەورووژێنن و، هەندێکیش لە زانایان دەست دەدەنە ڕەخنە و ئیعتیراز گرتن.

* * *

(وەڵامی نامەیەك)

ئەمەی خوارەوە بۆ ڕاستکردنەوەی گومان باشی‌یەکی زیاد لە پێویست نووسراوە، کە زانایەکی گەورە و بەڕێز بەرامبەر مامۆستا دەری بڕیوە. وا دەینێرین بۆتان، بەڵکو سوودی بۆ ئێوەش تێدا بێت.

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته بعدد عاشرات دقائق شهر رمضان.

بۆ برای ئازیز و ڕاستگۆ و بەڕێزمان مامۆستا حیشمەت!

بە ڕێز و سەرسووڕمانەوە نامەکەی ئێوەی بەڕێزمان لە بارەی "موجەددید"ەوە خوێندەوە و، بۆ مامۆستای بەڕێزیشمان باس کرد. ئەویش فەرمووی:

(بەڵێ، ئەم چەرخە پێویستی بە موجەددیدێکی لێهاتووی بەتوانا هەیە، تاکو نوێ کردنەوەی کاروباری ئایین و ئیمان و.. ژیانی کۆمەڵایەتی و شەریعەت و.. مافە گشتی‌یەکانی سیاسەتی ئیسلامی بگرێتە ئەستۆ.

بەڵام گرنگترینی ئەو ئەرکانە بریتی‌یە لە نوێ کردنەوە لە بواری پارێزگاریی "ڕاستی‌یەکانی ئیمان"دا. چونکە ئەم کارە گەورەترینی ئەو سێ ئەرکەیە. بۆیە بازنەکانی "شەریعەت" و "ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی" لە چاو بازنەی "ئیمان"دا دەکەونە پلەی دووهەم و سێهەم و چوارەمەوە.

ئنجا ئەو گرنگی‌یە لەڕادەبەدەرەش کە لە فەرموودەی پیرۆزدا بە نوێکردنەوەی ئایین دراوە، تەنها لە ڕووی نوێکردنەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیمانەوەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی بیری زۆرینەی خەڵکی و ئەو کەسانەش کە بایەخی خۆیان ترنجاندووەتە

ژیانی دنیا، یەکەم شت ڕووی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی و سیاسەتی ئایینیە، کە لەبەر جازیبە و سامی دەستەڵات و فەرمانڕەوایی، لە بەرچاودا گرنگتر و فراوانتر لە چاو شتی تردا دەردەکەون، ئەوا بەو چاویلکەیە و لەو گۆشەیەوە دەڕواننە کاروبارەکان و لە ڕووناکیی ئەوەشدا لێکیان دەدەنەوە.

پاشان کۆبوونەوەی ئەم سێ ئەرکە پێکەوە لە تەنها کەسێك یان تەنها یەك کۆمەڵی ئەم چەرخەدا و بە شێوەیەکی تەواو کامڵ و بێ ئەوەی هیچ کامیان ڕێ لەوانی تر بگرێت، کارێکی تەواو دوورە و تەنانەت مەحاڵیشە. بەڵکو ئەم ئەرکانە پێکەوە تەنها لە "خودی حەزرەتی مەهدی"دا کۆ دەبنەوە کە نوێنەری کۆمەڵی نوورانیی ئالی بەیت و کەسی مەعنەویی کۆمەڵەکەیانە لە ئاخر زەماندا.

سوپاسی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە کە ڕاستی و کەسی مەعنەویی قوتابیانی پەیامەکانی نووری لەم چەرخەدا خستە کار بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی نوێکاری لە ڕووی پاراستنی "ڕاستییەکانی ئیمان"ەوە. وا ماوەی بیست ساڵە لە ڕێی بڵاوکراوە کاریگەرەکانیەوە، کە دڵان فەتح دەکەن، ئەم ئەرکە خاوێن و پیرۆزە ڕادەپەڕێنن و، دەبن بە بەربەستی هێرش و پەلامارەکانی گومڕایی و زەندەقەی بەهێز و سامناك و، ئیمانی سەدان هەزار کەسی ئیماندار دەپارێزن. کە ئەمەش زیاتر لە چل هەزار کەس شایەتیی لەسەر دەدات).

هەروەها مامۆستامان دەفەرموێت:

(نابێت چاو ببڕنە کەسی لاواز و کۆڵەواری خۆم و، ئەم کۆڵە قورسەی کە هەزاران پلە لە سەرووی توانای خۆمەوەیە، مەخەنە ئەستۆم).

هەروەك بە تایبەتی سەلامتان بۆ دەنێرێت و، ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە سڵاوی تایبەتیمان بۆ خۆتان و هەموو ئەو کەسانە ئاراستە دەکەین کە لەوێ پەیوەندییان بە پەیامەکانی نوورەوە هەیە.

لە قوتابیانی پەیامەکانی نوور:

ئەمین، فەیزی، کامیل

(دەستی قەدەر و دەستی مرۆڤ لە ڕووداوەکاندا)

یەکێك لە دەستووورە بنەڕەتی‌یەکانی "پەیامەکانی نوور" ئەوەیە کە:

هەموو ڕووداوێك "دەستی مرۆڤ" و "دەستی قەدەر"ی پێکەوە تێدایە. بەڵام مرۆڤ ستەم دەکات، چونکە بۆ هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکە دەڕوانێت. کەچی قەدەر دادگەرە، چونکە هۆکارە پەنهانەکەی ئەو موسیبەتە دەبینێت!

بە چەندەها تاقیکردنەوە چەسپاوە کە دەستی چاودێری و میهرەبانیی خوای گەورە لە هەموو ئەو موسیبەت و گیرو گرفتانەدا هەبووە کە تا ئێستا هاتوونەتە ڕێی پەیامەکانی نوور.

* * *

(فەتوای "أمين الفتوى"!)

بەڕێز "عەلی ڕەزا" کە گەورەترین زانای ئەستەمبووڵە و لە هەمووشیان زیاتر لە شت دەکۆڵێتەوە و زۆر کاتیش مەنسەبی "مفتي الأنام"ی گرتووەتە ئەستۆ و، "أمين الفتوى"ی پێشووە.. دوای ئەوەی تیشکی یەکەمی خوێندەوە، کە چەند ئاماژەیەکی قورئانیی لەخۆ گرتووە و، ئایەتولکوبرا و چەند پەیامێکی تری وەك ئەمانەشی بینی، بە "حافظ ئەمین"ی وت، کە یەکێکە لە قوتابی‌یە بەتواناکانی پەیامەکانی نوور:

(بەدیعوززەمان لەم ڕۆژگارەدا گەورەترین خزمەتی پێشکەش بە ئایینی ئیسلام کردووە و، کتێبەکانیشی تابلێی ڕاست و دروستن و، هیچ کەسێکی تر لەم چەشنە ڕۆژگارە وشك و برنگەدا دانان و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی وای لە توانادا نەبووە. چونکە پشتی لە دنیا هەڵکردووە و وازی لێ هێناوە و، لە هەموو ڕوویەکەوە شایانی پیرۆزبایی لێ کردنە و، پەیامەکانی نووریش نوێ کەرەوەی ئایینن. لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە بۆ کاری خێر پشتگیر و پشتیوانی بێت. ئامین).

هەروەك داکۆکیی لە ڕیش نەهێشتنەوەی هەندێك کردووە و، بەسەرهاتەکەی "سلطان العلماء"ی هێناوەتەوە کە یەکێکە لە باپیرانی جەلالەددینی ڕۆمی. پاشان وتوویەتی:

(بێ گومان "بەدیعوززەمان"یش ئیجتیهادێکی وەك ئەمەی هەیە و، ڕەخنەگران حەقیان بە دەستەوە نی‌یە).

هەروەها فەرمانی دابوو بە مامۆستا مستەفا و پێی وتبوو کە بە ناوی منەوە ئەمەی بۆ بنووسە:

(سڵاو و ڕێزی تەواوەتی و تایبەتیم بۆ "بەدیعوززەمان" بنێرن. من بەردەوام لە نزای خێری ئەوە دام کە دانانی کتێبەکانتان تەواو بکەن. لە ڕەخنەی هەندێ زانای خراپکار(علماء السوء) دڵگران مەبە، چونکە: (بەردگرتنە درەختەکان بۆ کەوتنە خوارەوەی بەروبوومەکانیان) پەندێکی بەناوبانگە!

لەسەر جیهادی خۆتان هەر بەردەوام بن. ئێمەش لە خوا دەپاڕێینەوە کە بە زوویی لە ئامانجەکەتدا سەرت بخات و هەر لە ئەمانەت و پارێزگاری خوای گەورەدا بیت).

"أمين الفتوى"ی پێشوو

عەلی ڕەزا

بەم جۆرە زانایەکی مەزن و وردەکارێکی بەڕێز و خاوەن قسەی ئەم زەمانە، لە ڕووی شەریعەت و قورئانی پیرۆزەوە، بڕیاری وابووە. دەبێ قوتابیانی پەیامەکانی نووریش زمانیان بپارێزن و ناوی ئەو زانایە نەدرکێنن، بەڵکو لە ناوەندی دوعاکانیاندا دوعا بۆ ئەویش بکەن.

سڵاومان بە هەموو برایان بگەیەنن.

* * *

(بناغەکانی مامەڵە کردن لەگەڵ ڕەخنەگراندا)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

لەبەر ئەوەی ئەولیا پیاوچاکەکان ناتوانن ئاگاداری غەیب بن، گەر خوا بە ئیلهام ئاگاداریان نەکات، چونکە جگە لە خوای گەورە کەس ئاگادار و شارەزای غەیب نییە.. لەبەر ئەوە، مەزنترین وەلی و پیاوچاك ناتوانێت حەقیقەتی حاڵی

وەلی‌یەکی تر بزانێت، لەوانەشە لەبەر ئەم نەزانینەی دوژمنایەتیی بکات. ئەوەی لە نێوان هەندێ هاوەڵانی عەشەرەی موبەششەرەدا - خوایان لێ ڕازی بێت ڕووی دا، ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر ئەم دەرەنجامەی کە ئەگەر وەلی‌یەك ڕەخنەی لە وەلی‌یەکی تر گرت، ئەم کارە هیچیان لە پلەوپایەی ویلایەت داناگرێتە خوارەوە، مەگەر کارێك ڕووبدات بە تەواوی پێچەوانەی ڕواڵەتی شەرع بێت.

جا مادەم وایە، ئەوا:

١-لەبەر ڕەفتار کردن بە ئایەتی پیرۆزی:

﴿والكاظمينَ الغَيْظَ والعافِينَ عنِ النّاس﴾ (آل عمران:١٣٤).

٢- بۆ مەبەستی پارێزگاری کردنی ئیماني ئیمانداران نەبادا کەلێنی تێ بکەوێت، ئەمەش بەوەی کە ئەو گومانە باشەی بە شێخ و گەورەکانیان هەیانە، هەر بمێنێت.

٣- بەپێی ئەوەی کە پێویستە قوتابیانی بێگەرد و ئەرکانی نوور لە: "توندوتیژیی زیانبەخشی تووڕەبوون" بپارێزرێن - با لەسەر حەقیش بن - بەرامبەر بەو ڕەخنە ناڕەوایانەی ئاراستەیان دەکرێن.

٤- بۆ مەبەستی دوورەپەرێزی لەوەی کە ئەهلی ئیلحاد لەوانەیە سوود و دەرفەت لە ناکۆکیی نێوان دوو تاقمی ئەهلی ئیمان وەربگرن، کە دەگونجێ هەر بە چەکی دەستی یەکێکیان ئەوی تر زامدار بکەن و ڕەخنە لە یەکتر بگرن و، هەرکەسەیان بە بەڵگەکانی خۆی بریقەی ئەوی تر بشارێتەوە و، ئەمەش ببێت بە مایەی تیاچوونی هەردووکیان لە ئەنجامدا.

بەپێی ئەم بناغانەی پێشوو، دەبێت قوتابیانی نوور:

بە توندوتیژی ڕووبەڕووی ڕەخنەگران نەبنەوە و، ڕەفتاری "وەك یەك"یان لەگەڵدا نەنوێنن. بەڵکو دەبێت تەنها بەرگری لە خۆیان بکەن، لەگەڵ دەرخستنی گیانی ئاشتەوایی و وەڵامدانەوەی ئەو خاڵانەی کە مایەی ڕەخنە بوون. چونکە لەم چەرخەی خۆماندا "خۆویستیی مرۆڤ" بە چەشنێك بەرجەستە بووە و ملی

دەرکێشاوە کە هیچ مرۆڤێك ئامادە نییە خۆویستیی خۆی- کە وەك شەختە سەهۆڵێك وایە و بە ئەندازەی خۆیەتی - بیتوێنێتەوە و نایەوێت بیگۆڕێت، بەڵکو هەمیشە بەهانە و پاساو بۆ خۆی دەهێنێتەوە. لەمەشەوە ناکۆکی لە نێواندا دروست دەبێت و، ناحەقرەوان و گومڕایانیش، لەسەر حسابی حەقرەوان و ئیمانداران، بۆ خۆیان کەڵك و سوود وەردەگرن.

ڕووداوی ئیعتیرازەکەی ئەستەمبوڵ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە: هەندێ لەو زانایانەی لە مەشرەبەکانی خۆیان ڕازین و خۆپەرستانی ناو سۆفییەکان و هەندێ لە مورشیدان و ئەهلی حەق لەوانەی کە هێشتا نەفسی ئەممارەی خۆیان نەکوشتووە و، لە داوی حەز لە پلەوپایە ڕزگاریان نەبووە، بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن و برەودان بە مەشرەب و ڕێبازەکانیان و، بەدەستهێنانی ڕووتێکردنی شوێنکەوتووانیان، ڕەخنە لە "پەیامەکانی نوور" دەگرن، تەنانەت گریمانێکی زۆر بەهێزیش هەیە کە بە توندی ڕووبەڕوویان بینەوە.

جا لە کاتی ڕوودانی ئەم چەشنە ڕووداوانەدا، دەبێ زۆر لەسەرخۆ و ئارام و خۆڕاگر بن و، بەسەر دەروونتاندا زاڵ بن و، دان بە خۆتاندا بگرن و، خۆتان دووچاری دوژمنایەتی نەکەن و، لە شان و شکۆی سەرۆکەکانی دەستە و تاقمانی ڕەخنەگران نەشکێنن.

خۆ ئەگەر بە فەرزی مەحاڵ لە لایەن قوتبی ئەعزەم و لە مەککەی پیرۆزیشەوە ڕەخنەیەك لە پەیامەکانی نوور بگیرێت، ئەوا قوتابیانی پەیامەکانی نوور خۆیان ڕادەگرن و لەرزەیان پێ ناکەوێت، بەڵکو ڕەخنەکەی ئەو قوتبە ئەعزەمە وەك ئاوڕ لێدانەوەیەکی ڕێز و سڵاو لێکردن وەردەگرن و، هەوڵ دەدەن ڕووتێکردنی ئەو بەدەست بهێنن و، دەستەکانی ماچ بکەن و، مایەی ڕەخنەکەش بۆ ئەو مامۆستا مەزنەیان ڕوون بکەنەوە.

* * *

(نەخۆشیی ئەم چەرخە)

بەڵێ برایانم!

لە ناوەندی ئەو تەوژمە سامناك و ڕووداوانەی کە لەرزەیان بە ژیان و جیهان خستووە، دەبێت مرۆڤ لەڕادەبەدەر دامەزراو بێت و، لە ئەندازەبەدەر خۆڕاگر بێت و، ئامادەبوونێکی بێ کۆتایی تێدا بێت بۆ خۆبەخت کردن.

کە ئیمانداران فەزڵی ژیانی دنیا بەسەر دواڕۆژدا دەدەن، لە کاتێکدا کە دەشزانن دواڕۆژ هەیە و ئیمانیان پێیەتی..

هەروەها کە بە حەز و ئارەزووی خۆیان نرخ و بەها بۆ وردە شووشەی بێ بایەخ دادەنێن، کە دەشزانن ئەڵماس بەنرخترە..

هەروەها کە لەزەتێکی کاتی و کەمی ئێستایان پێ باشترە لە چاو چەندین لەزەتی بێگەردی لەمەولادا..

هۆی هەموو ئەمانە: زاڵ بوونی هاندەری هەستە کتوکوێرەکانە، کە پاشەڕۆژ نابینن.

ئەمە نەخۆشی‌یەکی سامناکە دووچاری ئەم چەرخە بووە. بەڵکو یەکێکە لە بەلاّ و گرفتەکانی سەردەم و، ناوەرۆکی ئاماژەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێت:

﴿يَسْتَحِبُّونَ الحياةَ الدُّنيا على الآخِرةِ﴾ (إبراهيم:٣).

لە ئەنجامی ئەم گرفتەشەوە ئیمانداره ڕاستەقینەکان هەندێ جار دەکەونە هەڵەیەکی گەورەی وەك "پشتگیری کردنی گومڕایان"!

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ئەهلی ئیمان و قوتابیانی پەیامەکانی نوور لە شەڕ و زیانەکانی ئەم موسیبەتە بپارێزێت. ئامین.

سەعیدی نوورسی

* * *

(ڕۆزیی زانستخواز)

دوای نزیکەی هەزار تاقیکردنەوە قەناعەتی تەواوم بۆ دروست بوو کە:

هەر ڕۆژێك کار بۆ خزمەتی پەیامەکانی نـوور ئـەنجام بـدەم، بـە ئـەندازەی پلـەی ئـەو خزمەتـە، دڵ کراوەیی و خۆشـحاڵی و پیـت و بەرەکـەت، لـە دڵ و جەسـتە و مێشك و گوزەراندا دەبینم. تا ئێستا تێبینیی هەمان حاڵەتم لە برا زۆرەکـانی ئێرە و ئەوێشدا کردووە و، زۆرێك لەوان دان بەمەدا دەنێن و دەڵێن: "ئێمەش لـە خۆمـاندا ئەم هـەستە شك دەبەین". تەنانەت مـن لـەو بـاوەڕەدام کـە – وەك سـاڵی پار بۆم نووسین – نهێنی ژیانی کەفاف و مایەی بژێوم لەو بەرەکەتەوەیە.

ڕیوایەتێك لـە ئیمـامی شـافیعییەوە – خـوای لـێ ڕازی بێـت – دەگێڕنـەوە کـە فەرموویەتی:

"من زامنی ڕۆزیی قوتابیی ڕاست و دڵسۆزی زانستم، چونکە فراوانی و پیـت و بەرەکەت لە ڕۆزییەکەیاندا هەیە".

مادەم ڕاستی ئەمەیە و، قوتابیانی پەیامەکانی نووریش لەم ڕۆژگارەدا شایستەیی تەواوەتییان بۆ ناوی "قوتابیی زانست" پێوە دەرکەوتووە، ئەوا نـابێت لـە بەرامبـەر ئەم قـاتی و برسێتییە بڵاوەدا واز لـە خزمـەتی پەیامـەکانی نـوور بـهێنرێت. دەبێـت بیشـزانرێت کـە باشـترین چارەسـەر بـۆ ئـەم حاڵەتـە بریتییـە لـە "شـوکر" و "قەناعەت" و، وابەستەیی بە سیفەتی "قوتابیی پەیامەکانی نـوور" و، واز نـەهێنان لـە خزمەت و، هەڵپە نەکردن بە دوای داخوازییەکانی ژیان و گوزەراندا، بە بیانووی "زەروورەت".

بەڵێ، خەم و خەفەتی ژیان و گوزەران لـە هـەموو لایەکەوە دەورەی خەڵکیان داوە و، گومڕایـانیش ئـەم حاڵـەی خـەڵکی دەقۆزنـەوە و، ئـایینداریش پێیـان وایـە عوزریان بۆ دروست بووە و دەڵێن: "چی بکەین، ناچارییە"!

لەبەر ئـەوە، دەبێ قوتابیـانی پەیامـەکانی نـوور بـەم پەیامانـە ڕووبەڕووی بـەڵای "برسێتی" و "زەروورەت" ببنەوە! چونکە ئـەرکی سەرشـانی هـەموو یـەکێکی ئـەو قوتابیانە تەنها ڕزگار کردنی ئیمانەکەی خۆی نییە، بەڵکو لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبێ

ئیمانی کەسانی تری غەیری خۆیشی بپارێزێت. ئەمەش تەنها بەوە دەبێ کە بە گەرموگوڕی و چالاکی لە خزمەتدا بەردەوام بێت.

زووتر بۆم نووسین کە: بە "دوژمنایەتی" ڕووبەڕووی نەیارەکان مەبنەوە، بەڵکو تا دەتوانن هاوڕێی ئەهلی تەقوا و زانست بن. دەبێ ئەمەش بگرنە گوێ کە: هیچ جۆرە کەسێك مەخەنە ناو ڕیزەکانتانەوە کە بگونجێت زیان بە پەیامەکانی نوور بگەیەنێت و خۆی لە قەرەی توندوتۆڵیی قوتابیانی ئەو پەیامانە بدات، چونکە ئەو جۆرە کەسانە گەر بە نیازێکی بێگەرد و خاوێن نەڕۆنە ناو ئەو بازنەیەوە، لەوانەیە سستی و ساردوسڕی لە نێوان قوتابیاندا بنێنەوە. خۆ ئەگەر خۆپەرستی و خۆشویستنی زاتی خۆی تێدا بێت، ئەوا توندوتۆڵیی قوتابیانیی پەیامەکانی نوور دەشکێنێت و سەرنجیان بۆ دەرەوەی بازنەی پەیامەکانی نوور ڕادەکێشێت و بیریان پەرتەوازە دەکات. لەم کاتەی ئێستادا بێداریی تەواوەتی و وریایی کارێکی گەلێ پێویستە.

سەعیدی نووری

* * *

(موعجیزەیەکی مەعنەوی)

"پەیامەکانی نوور" تەریقەتی سۆفی نین، بەڵکو "حەقیقەت"ن. هەروەها نوورێکن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە بەهرەمەند بوون و، هەرگیز لە هونەر و زانستەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا وەرنەگیراون، بەڵکو موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن کە تایبەتە بەم زەمانەوە.

* * *

(گەڕان بە دوای هەواڵەکانی جەنگدا)

"وەڵامی پرسیارێکە کە لە لایەن قوتابیانی پەیامەکانی نوورەوە ئاراستە کرابوو".

پرسیار:

ساڵی پار لە پرسیارێکدا وتمان:

وا پەنجا ڕۆژ تێپەڕی، کەچی ئێوە هەر هێشتا ئاوڕێکتان نەدایەوە لـەم تەوژمانـەی کە لە جیهاندا هەڵدەسووڕێن و پرسیارێکتان لـە بارەوە نـەکرد. هـەر ئـەو کاتـەش وەڵامـی ئـەو پرسـیارەت داینـەوە. خۆ هەرچەندە ئەو وەڵامـە سـەرتاپا ڕاسـتی‌یە و سەروزیادیشە، بەڵام هەر دەبوو هیچ نەبێ لـە گۆشـەی کـار و خزمـەتی پەیامـەکانی نـوور و بڵاوبوونـەوەیان و سـوود گـەیاندن بـە جیـهانی ئیسـلامی، ئاوڕێکتــان لــێ بدایەتەوە. جا ئایا لەم گۆشەیەشەوە هەر بایەخی پێ نـادەیت و پرسـیاری لـە بـارەوە ناکەیت؟

وەڵام:

ئەو کەسـەی کـە ئـەم جەنگـە ڕووخێنـەرە دەنێتـەوە و تیـایدا بەشـدارە، زۆر بـە ڕاستی و جوانی ئەم ئایەتە پیرۆزە لە خۆیدا بەرجەستە دەکات کە دەفەرموێت:

﴿إِنَّهُ كانَ ظَلُوماً جَهولاً﴾ (الأحزاب:٧٢)!

لەبەر ئەوە، دروست نی‌یە مرۆڤ بۆ ئەو ستەمە سەرسـووڕهێنەرانە بڕوانێـت، چ جـای ئـەوەی پشـتی ئـەو تەوژمانـە بگرێـت و، بـە دوای هەواڵـەکانیاندا بگـەڕێت و گـوێ لـە پڕوپاگـەندە درۆ و دەلەسـە خەڵەتێنـەرەکانیان ڕابگرێـت و، بـە خـەم و خەفەتەوە سەیری جەنگەکانی نێوانیان بکات. چونکە ڕازی بـوون بـە "سـتەم" هـەر ستەمە و، گەر حەزیشی لـێ بێت بە ستەمکار دادەنرێت و، ئەگەر پشتیشـی بگرێـت ئەوا سەرزەنشتی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیگرێتەوە کە دەفەرموێت:

﴿وَلا تَرْكَنُوا إِلى الَّذينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ (هود:١١٣)!

بەڵێ، ئەم جەنگە ڕووخێنەرە هەرگیز بۆ جێگیر کردنـی "حـەق" و دامـەزراندنی "ڕاستی" و بەرز کردنەوەی بایەخی "ئایین" و سەقامگیر کردنـی "دادگـەری" نی‌یـە. بەڵکـو پـاڵی بـە سـەرسـەختی و دەمـارگیریی نەتەوایـەتی و، بەرژەوەنـدیی ڕەگەزایەتی و، تیر کردنی خۆپەرستیی دەروونەوە داوە. لە ئەنجامی ئەمەشدا ستەمی

هێندە چەپەڵ و، کارەساتی ئـەوەندە ئـازار بـەخش ئـەنجام دەدرێـت کـە لـە جیـهاندا هاووێنەیان نەبینراوە.

بەڵگەش لەسەر ئەمە:

لەناوبردنی منداڵ و خێزان و پیر و بیمارە بێ تاوانەکانە، بە بیانووی بوونـی تەنـها یەك دوو سەربازی دوژمن لە نێوانیاندا و.. یـەکگرتنی سەرسـەختترین دیکتـاتۆرە بورژوازییەکانـە لەگـەڵ ئـاژاوەچی و تیرۆریسـتەکاندا، کـە سۆشیالیسـت و شیووعییە توندڕەوەکانن و.. ڕشتنی خوێنی هـەزاران بـەڵکو ملیۆنـەها کەسـی بێ تاوانە و.. بەردەوام بوونـە لـەم جەنگـەدا کـە زیـان بـە سـەرجەمی گـرۆی مـرۆڤ دەگەیەنێت و.. نەویستن و پشتگوێ خستنی ڕێککەوتن و ئاشتییە.

لەبەر ئەوە، ئایینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز - بێ هیـچ گومـانێك - لـەم چەشـنە جەنگە ڕووخێنەرانە بەرین کە نە لەگەڵ هیچ یاسایەکی "دادپەروەری" و نە لەگـەڵ "مرۆڤایـەتی" و نـە لەگـەڵ هیـچ دەسـتوورێکی "ڕاسـتی" و "یاسـای مافـەکان"دا ناگونجێت و یەك ناگرێتەوە..

هەروەها ئایینی ئیسـلام و قورئـانی پیرۆز دانابەزنـە ئاسـتی ئـەو زەلیلـییەی کـە یارمـەتیی ئەوانـە بـدەن، چـونکە فیرعەونایەتیـیـەکی سـامناك و بـەرژەوەندی پەرستییەکی سەیر بەسەر ئەو لایەنە شەڕخوازەدا زاڵ بووە، بە چەشنێك کە دەستی یارمەتی بۆ قورئانی پیرۆز و ئایینی ئیسلام درێژ ناکـەن، بـەڵکو هـەوڵی ئـەوە دەدەن کە ئەم دوانە بە وێنەی دوو ئامراز لە پێناوی ئامانجەکانی خۆیاندا بخەنەکار!

بێ گومان ئەحەقیقەتی قورئانی پیرۆز هـەرگیز مل بۆ ئـەوە نـادات کـە پـاڵ بـە شمشـێری سـتەمکارانێکی وەك ئەوانـە بداتـەوە، بـەڵکو پێویسـتە لەسـەر شوێنکەوتووانی ئیسلام و قورئان، لە بریی پاڵدانەوەیان بە هێزێکەوە کـە بـە خوێنـی ملیۆنـەها بـێ تـاوان هەویرەکـەی شـێلراوە، پشـت بـە توانسـت و میـهرەبانیی خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە ببەستن!

هەرچەند ئیلحاد بەهۆی پاڵدانەوەیەوە بە یـەکێك لـەو دوو هـێزە شـەڕخوازە ئـایینداران دەچەوسێنێتەوە و دەیانـهاڕێت و، لایـەن گرتنـی تەوژمـە پێچەوانەکـەی

ئیلحاد و زەندەقەش وەك هۆکارێك بۆ ڕزگار بوون لە ستەمی ئەوان لـە پێش چـاودا دەردەکـەوێت، کـەچی تاقیکردنەوەکان چەسـپاندیان ئـەو لایەنگرتنـەش - لـەم کاتەدا - هەروەك هیچ سوودێکی نی‌یە، گەلێ زیانی زۆریشی لێ دەبێتەوە!

پاشان ئیلحاد بەهۆی نیفاقەوە تەنها هەر لەگەڵ بەرژەوەندیی خۆیدایـە، لـە هـەر شوێنێکەوە بەدەستی بهێنێت. تەنانەت هاوڕێکـەت دەکـات بـە هاوپەیمانی خـۆی و پاشان دەیکات بە گژی تۆدا. ئەو کاتەش ئەو کۆڵی گوناهەت لەسـەر شـان گەلـێ قورس دەبن کە لە ڕێی لایەن گرتنەوە لە ئەستۆی خۆتت ناون..

جـا لەبەر ئـەوەی ئـەرکی سەرشـانی قوتابیـانی پەیامـەکانی نـوور تەنـها هـەر "ئیمان"ە، ئەوا بایەخ بەو کاروبارانە نادەن کـە لـە "ژیـان"دا ڕوو دەدەن و، خۆیـانی تێدا هەڵناقورتێنن و بە حەز و شەوقەوە بۆیان ناڕوانن.

جـا لەسـەر بناغـەی ئـەم ڕاستی‌یە، مـن مـافی خۆمـە کـە نـەك هـەر تەنـها سیازدە مانگ، بەڵکو سیازدە ساڵی ڕەبەقیش بۆ ئەو شتانە نەڕوانم!

خۆ ئێوە بۆ ئەو شـتانەتان ڕوانی، ئایـا جگـە لـە گوناهـ چی‌تـان دەسـت‌کەوت؟ منیش کە سەیرم نەکردوون چیم لەکیس چووە؟

پرسیاری دووهەم:

هۆی چی‌یە کە قوتابیانی تایبەتیی پەیامەکانی نوور بەوە تایبەتمـەندن لـە نـاوەندی ئەو دەستە و تاقمەدا بن کە ئایەتی پیرۆزی: ﴿الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْـــهِمْ﴾ی سـوورەتی "فاتیحە" ناساندوونی و، لـە ڕیـزی ئـەو دەستە موجـاهیدەی ئـاخر زەمانیشـدان کـە فەرموودەی پیرۆزی "لا تزال طائفة مـــن أمتي"[١] پێناسـەی کـردوون و، تـاکێکن لـە دانە و تاکەکانی واتای ئاماژەیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُــوا﴾.. تـا کۆتـایی سوورەتی "العصر"؟

---

(١) فەرموودەکە صەحیحە و، بە چەند دەقێکی لە یەکتر نزیك هاتووە، کە ئەمە یەکێکیانە: (لا تـــزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم مَن خَذَلَهُم حتى يأتيَ أمـــرُ الله وهـــم كذلـــك). رواه البخاري في كتاب الإعتصام، ومسلم في كتاب الإيمان برقم ٢٤٧ وكتاب الامارة برقـم ١٧٠، ١٧٣، ١٧٤ . (وەرگێڕ)

وەڵام:

هۆی ئەمە بریتی‌یە لەوەی کە: پەیامەکانی نوور نزیکەی سەد دانە نهێنیی ئایین و مەتەڵی ڕاستی‌یەکانی قورئانیان ئاشکرا و شی کردووەتەوە، بە چەشنێك کە نەزانینی یەکێك لەو نهێنی و مەتەڵانە کەسانێکی زۆر دووچاری شوبهە و گومان دەکات و، لە دوودڵی ڕزگاریان نابێت، تەنانەت لەوانەشە ئیمانەکەیان لەدەست بدەن. بەڵام ئێستا و دوای دەرخستنی ئەو نهێنی‌یانە و کردنەوەی ئەو مەتەڵ و گرێ کوێرانە مولحیدەکان ناتوانن سەرکەوتن بەسەر ئیمانداراندا بەدەست بهێنن، با لە نێوان خۆیاندا پشتی یەکتریش بگرن.

لە مەکتووبی بیست و هەشتەم (واتە لە باسی حەوت چاودێری‌یەکاندا) ئاماژەمان بۆ هەندێ لەو نهێنی و مەتەڵانە کردووە. پشت بە خوا لە کۆمەڵە پەیامێکی سەربەخۆدا کۆ دەکرێنەوە.

* * *

(پەیامەکانی نوور چەند بێدارکردنەوەیەکن لە دڵدا دەرکەوتوون)

مەسەلە و بابەتەکانی پەیامەکانی نوور لە "زانست" و بەگەڕخستنی "بیر" و بەکارهێنانی "نیاز و ویست و مەبەست"ەوە سەرچاوەیان نەگرتووە، بەڵکو زۆربەی ڕەهای ئەو پەیامانە چەند بێدارکردنەوە و ختوورەیەکن کە بە دڵدا هێنراون و لەسەر دڵدا دەرکەوتوون.

* * *

(چۆن لە ئازاری شەفەقەت ڕزگارم بوو)؟

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بە هاندەری سۆز و بەزەیی مرۆڤێتیمەوە هەستم بە خەم و ئازارێکی گەلێ زۆر کرد بۆ گیرۆدە بوونی گرۆی مرۆڤ لەم زستانە سەختە ماددی و زستانە مەعنەوی‌یە سامناکەدا کە مرۆڤایەتیی خلتانی خوێن کردووە. یەکسەر - وەك لە

زۆر شوێندا بە ڕوونی لێی دواوم – دانست و میهرەبانیی بەدیهێنەری بەخشندە، کە "أرحم الراحمین" و "أحکم الحاکمین"ە، یارمەتیی دام و، ئەم واتایەی هێنایە دڵمەوە:

ئەم ئازارە زۆرەت وەکو ڕەخنەگرتنێك وایە لە دانست و میهرەبانیی خواوەندی دانای میهرەبان!

خۆ – لە ڕاستیدا – هیچ سۆز و بەزەییەك نی‌یە بتوانێت کە پێش بەزەیی و میهرەبانیی خواوەند بداتەوە و، هیچ دانستێکیش نی‌یە لە دانستە پەروەردگاری‌یەکەی ئەو تەواوتر بێت. کەواتە بیر بکەرەوە و بزانە کە لەم بەڵا و گرفتەدا سەرسەخت و ملنەدەرەکان دووچاری سزای خۆیان دەبن و، بێ تاوان و ستەم لێکراوانیش "دە" هێندەی گیروگرفتەکانیان پاداشت دەدرێنەوە.

کەواتە دەبێ لە گۆشەی "میهرەبانی" و "دانست" و "دادگەری" و "پەروەردگاریتی"ی خوای گەورەوە بڕوانیتە ئەو ڕووداوانەی کە لە دەرەوەی بازنەی توانستی خۆتدان.

بەم جۆرە و بە فەزڵی خوای گەورە، لە ئازاری سەختی هەڵقوڵاوی "شەفەقەت" ڕزگارم بوو.

وا لە خوارەوەدا وەڵامێکی سەعیدی کۆن دەهێنرێت کە هی پرسیارێکە و لە کتێبی "مونازەرات"دا هێناویەتی، کە سی ساڵ پێش ئێستا چاپ کراوە.

ئەوە بوو سی ساڵ پێش ئێستا لە کاتی گەڕانی بە ناو تیرە و هۆزەکاندا ئەم پرسیارەی لێ کرا:

پرسیار:

ئایا سکاڵا کردن لە "زەمان" و ڕەخنە گرتن لە "ڕۆژگار" بە ڕەخنە دانانرێت لە سنعەتە ناوازەکانی کردگاری مەزن؟

وەڵام:

نەخێر.. نەخێر. بەڵکو لەوانەیە سکاڵا کردن ئەمەی خوارەوە بگەیەنێت:

کەسی سکاڵاکار وەك ئەوە وایە کە بڵێت:

ماهییەتی جیهان، کە بە دەستووری دانستی ئەزەلی ڕێك خراوە، بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی من دەمەوێت و ئەو حاڵەتەی حەزم لێیەتی ئامادە نی یە و.. ئەو یاسایەی گەردوون کە بە دەستی چاودێریی ئەزەلی نەخشێنراوە، بواری پێ نادات و.. سروشتی ڕۆژگار، کە لە چاپخانەی ویستی ئەزەلیدا چاپ کراوە، لەگەڵیدا یەك ناکەوێت و.. دانستی خواوەندیش، کە لەسەر بناغەی بەرژەوەندی یە گشتی یەکان بنیات نراوە، ڕوخسەتی نادات!

بۆیە، ئەو بەروبوومانەی کە ئێمە لە جیهانی "مومکینات"دا بە ئەندازیاریی مێشکی خۆمان و حەزی هەوا و ئارەزووەکانمان داوای دەکەین، دەستی توانستی پەروەردگار بە جیهانی مومکیناتی نابەخشێت. تەنانەت گەر "توانستی خوایی"ش ئەو بەروبوومانە بە مومکینات ببەخشێت، ئەوا مومکینات ناتوانن وەری بگرن و پارێزگاریی لێ بکەن. گەر بەروبوومەکان بۆ خۆیان دابکەونە خوارەوە، ئەوا هەر مومکینات ناتوانن هەڵیان بگرن.

بەڵێ، هەرگیز ناگونجێت لەبەر ئارەزووی کەسێك بازنەیەکی گەورە لە جووڵە و بزووتنی گرنگی خۆی ڕابووەستێت!

ئنجا پەیامەکانی نوور لە باسی بوومەلەرزەشدا بەم جۆرەی خوارەوە پەراوێزێك زیاد دەکات:

لە کاتێکدا کە هەموو یەکێك لە توخمەکان و یەك بە یەکی ڕووداوە ماددی و مەعنەوی یەکانی وەك "زستان" و "بوومەلەرزە" سەدان ئەنجام و ئامانجی باش و خێریان تێدایە، لە هەمان کاتدا ڕاگرتنی و بەرگرتن لە ڕوودانی (لەبەر ڕوونەدانی شەڕ و ئەنجامە زیانبەخشەکان) لە ڕاستیدا بریتی دەبێت لە ئەنجامدان و بەدەستهێنانی سەدان شەڕ و زیان کە لە وازهێنان و دەست بەرداربوون لەو سەدان ئەنجامە خێرانەوە پەیدا دەبن. خۆ ئەمەش پێچەوانەی "دانست" و "ڕاستی" و "پەروەردگارێتی"یە.

سەبارەت بەو کەس و تاك تاکانەش کە لە یاسا گشتی‌یەکان وەڕس و بێزار دەبن، ئەوا خواوەندی میهرەبان بە چاودێری و یارمەتی و چاکەکاریی تایبەتیی خۆی یارمەتیی هەموو یەکێکی لاواز و دەستەوسانی ئەوان دەدات و، دەرمانێك بە هانای دەردەکەیانەوە دەنێرێت. بەڵام نەك بەپێی هەوا و ئارەزووی ئەو کەسە، بەڵکو بەپێی سوودە ڕاستەقینەکەی. لەوانەشە لە بریی ئەو وردە شووشانەی کە ئەو کەسە لاوازە لە دنیادا داوای کردوون، لەو دنیادا ئەڵماسی بەنرخی پێ بدرێت!

* * *

(خەم و خەفەتی قورسی ژیان)

زۆر دڵتەنگ و نیگەرانی ئەوە بووم کە قوتابیانی پەیامەکانی نوور - کە زۆربەیان هەژار و دەستکورتن - لە بەردەم ئەم حاڵەتە سامناکانەی خەمی ژیان و گوزەراندا کە ئەستۆی هەژارانی قورس کردووە و، ئەم گرانی‌یەش کە - لەگەڵ زۆری ڕزق و ڕۆزیشدا - خەڵکی پێوە گیرۆدە بوون و لەم زستانە ماددی و مەعنەوی‌یەدا گەیشتووەتە چڵەپۆپە، پشتگیریی نێوانیان هەڵبووەشێنێتەوە و لەرزەی پێ بکەوێت..

چونکە ئێوە - ئەی برایانم! - لە دەمی ئەم زریانە سەختانەدا لە هەموو کاتێك زیاتر پێویست و ئەرکی سەرشانتانە کە پەیوەندی و یەکێتیی نێوانتان بپارێزن و، چاوپۆشی لە کەموکووڕیی برایانتان بکەن و، ڕەخنە لە دژی یەکتری بڵاو نەکەنەوە.

وریا بن.. وریا بن! هەرگیز کەستان لەوی تر بێزار نەبێت و ڕەخنەی لێ نەگرێت. دەنا دەرخستنی لاوازیی خۆتان - با کەمیش بێت - مونافیقان دەیقۆزنەوە و زیانی زۆرتان پێ دەگەیەنن.

دەبێ ئێوە لە بەرامبەر پێویستی‌یەکانی خەمی گوزەرانەوە هەرگیز لە "قەناعەت" و "دەست پێوە گرتن" لانەدەن.

جا لەبەر ئەوەی بەرژەوەندییەکانی دنیا گەلێ کەسی ئەهلی حەقیقەت و تەریقەتی بەرەو جۆرێکی مونافەسە دایە بەر، ئەوا لەم لایەنەوە ترسم بۆ قوتابیانی نووریش لێ نیشتووە کە تا ئێستا - سوپاس بۆ خوا - لەرزەی پێ نەخستوون. لە خوای گەورە دەپارێینەوە کە لە ئاییندەشدا لەرزەیان پێ نەخات.

بەڵام قوتابیان هەموویان لەسەر یەك شێوە ڕەوشت و ڕەفتار نین. جا ئەگەر هەندێکیان لە ناوەندی بازنەی شەرعیدا بە دوای حەوانەوەی خۆیدا گەڕا، ڕەخنەی لێ مەگرن. ئەو قوتابییەش کە گیرۆدەی باری ناچاری بوو بێت، دەتوانێت "زەکات" وەربگرێت..

هەروەها جۆرێکی خزمەتی پەیامەکانی نوور یارمەتیی زەکاتدانە بە "ئەرکان"ی قوتابیانی نوور کە هەموو کاتێکی خۆیان بۆ خزمەت تەرخان کردووە و، بەوانەش کە لە خزمەتدا تێدەکۆشن. بەڵکو پێویستە یارمەتی بدرێن. بەڵام نابێت لە ڕێی هەڵپە و تەماع و داوای زمانی حاڵەوە پێیان بدرێت، دەنا دەرگا بۆ دەستدرێژیی گومڕایان دەخرێتە سەرپشت کە بڵێن: "ئەوانە لە پێناوی هەڵپە و تەماعدا ئایینەکەی خۆیان واز لێ هێناوە". چونکە لە کاتێکی وادا دەچن لە چاویلکەی دەروونی بەدخوازی خۆیانەوە بۆ ئێوەش دەڕوانن و، بەوە تۆمەتبارتان دەکەن کە بڵێن: بەشێکی قوتابیانی نوور ئایینەکەیان وەك ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی دنیاکەیان بەکار هێناوە!

دەبێ تاوێك پەیامی "ئیخلاس" و "ئیقتیصاد" و تاوێکی تر پەیامی "شەش هێرشەکان" لە نێوان خۆتاندا بخوێننەوە.

خۆڕاگریی ناوازە و، توندوتۆڵیی مەحکەم و، پشتگیریی تەواوەتی و، یەکگرتنی مەزنی نێوانتان، دەبێت بە مایەی شانازیی ئەم وڵاتە. تەنانەت دەشتوانێت دوارۆژتان ڕزگار بکات. وریابن ئەم زریانە نوێیەی کە ڕووبەڕوومان دێت، برایەتیی نێوانتان تێك نەدات.

* * *

(ڕاستیەك كە پەیوەندیی بە زانایانەوە هەیە)

باسمه سبحانه

برایانی ئازیزم!

پەیامی "الحزب النوري" كەرامەتێكی مەعنەویی هەیە كە پەیوەندیی بە خۆمەوەیە. وا ئێستا كاتی ڕوونكردنەوەی هاتووە:

بیست و سێ ساڵ پێش ئێستا كە "سەعیدی كۆن" گۆڕا بە "سەعیدی نوێ" و ڕێبازی "بیركردنەوە"ی هەڵبژارد، بە دوای نهێنیی "تفكر ساعة خير من عبادة سنة"دا گەڕا. ئەوەبوو هەموو یەك دوو ساڵێك ئەو نهێنییە شێوەكەی خۆی دەگۆڕی و، یان پەیامێكی عەرەبی یان پەیامێكی توركیی بەرهەم دەهێنا. ئەم ڕاستیەش هەر لە پەیامی عەرەبیی "قطرة"وە هەتا پەیامی "الآية الكبرى" لەسەر شێوە گۆڕینە جۆراوجۆرەكانی خۆی بەردەوام بوو، دوای ئەوە شێوە هەمیشەییەكەی لە "الحزب النوري"دا گرتە خۆ.

وا ماوەی بیست ساڵە هەر كاتێك دڵتەنگ دەبم و، بیر و دڵم ماندوو دەبن و، لە تاوا پەنا بۆ خوێندنەوەی ورد و لەسەرخۆ و تێڕامانی بەشێكی "الحزب النوري" دەبەم، یەكسەر دڵتەنگی و بێزاری و ماندووبوونەكەم دەڕەوێنێتەوە. وا ئەمە هەزار جاریش دووپات بووەوە و، خوێندنەوەی شەشیەكی ئەو حیزبە لە پێش نوێژی بەیانیدا هیچ شوێنەوارێكی بێزاری و ماندووبوونی بەجێ نەهێشت كە دەبوو لە ئەنجامی خوێندنەوەی ماوەی پێنج شەش سەعاتی شەودا بەجێی بهێشتایە. بەڵێ، ئەم حاڵەتە تا ئێستاش هەر بەردەوامە.

بە بۆنەی ئەم ڕاستیەوە، مەسەلە و حەقیقەتێكی گەورەتان بۆ ڕوون دەكەمەوە كە لەم كاتانەدا پەیوەندیی بە زانایان و خەڵكانی قوتابخانەی شەرعیەوە هەیە:

شوێنكەوتووانی قوتابخانەی شەرعی هەر لە مێژە ملیان بۆ تەكیە و خانەقاكانی سۆفیەیان كەچ كرد. واتە بۆ دەستخستنی بەروبوومی ویلایەت و چێژەكانی ئیمان و نوورەكانی حەقیقەت شوێنیان كەوتن. بە ڕادەیەك كە جاری وا هەبووە زانایەكی مەزنی قوتابخانەی شەرعی دەستی وەلیەكی بچووكی شێخی سۆفیەیانی

ماچ كردووە و شوێنی كەوتووە. كەواتە ئەو زانایانە لەناو تەكیە و خانەقاكاندا بە دوای ئەو سەرچاوە پڕ لە ئاوی ژیانەدا گەڕاون.

بەڵام پەیامەكانی نوور – وەك لە بەرچاوتاندایە – بە موعجیزەی مەعنەویی قورئانی پیرۆز سەلماندیان كە هەر لە هەمان قوتابخانەی شەرعیشدا ڕێیەكی كورت هەیە مرۆڤ دەگەیەنێتە نوورەكانی حەقیقەت و، كانیاوێكی بۆ زانستەكانی ئیمان تێدایە كە لە هەرچی سەرچاوە و كانیی تر هەن خاوێنترە و، لە زانستی شەرعی و ڕاستییەكانی ئیمان و زانستی كەلامی ئەهلی سوننەتدا ئەوەندە كار و خواپەرستی و ڕێی ویلایەت هەن كە گەلێ بەرزتر و شیرینتر و بەهێزترن لەوەی كە لە تەریقەتی سۆفیدا هەیە.

لە كاتێكدا كە لە هەموو شتێك پێویستتر هەوڵدانی زانایانی قوتابخانەی شەرعییە كە بە شەوق و شانازییەوە پشتی پەیامەكانی نوور بگرن، كەچی بە داخەوە زۆربەیان نازانن كە ئەم گەنجینە مەزن و نەبڕاوە و سەرچاوە بەپیتە بەخوڕەم و ژیان بەخشە، موڵكی قوتابخانەكەی خۆیانە و.. بە دوایدا ناگەڕێن و.. هەوڵی پارێزگاری لێكردنی نادەن!

بەڵام – سوپاس بۆ خوا – وا ئێستا خەریكە نیشانەكانی ئەم پێزانینە دەردەكەوێت، چونكە كۆمەڵە پەیامی "وتەكان" زانایانی ئایین و مامۆستایانی قوتابخانەی نوێی پێكەوە بەرەو نوورەكان ڕاكێشاوە.

* * *

(خەڵكی گەلێ پێویستیان بە ڕاستییەكانی ئیمانە)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

شوكر و سوپاسی نەبڕاوە بۆ خوای گەورە كە پارێزگای ئیسپارتەی كرد بەو قوتابخانەی زەهرا و مزگەوتی ئەزهەرەی كە لە مێژە ئامانجی ئەندێشەم بووە. چونكە قەڵەمەكانتان جێی چاپخانەیان بۆ پەیامەكانی نوور گرتووەتەوە و، بڵاوبوونەوەی ئەم ژمارە زۆرەی نوسخە بێ هەڵە و خاوەن تەوافوقانەی كە بە ڕۆنیۆ و لە

ماوەیەکی کەمدا بڵاوتان کردنەوە، دەعواکەی منی چەسپاند کە ئەم بەیانیە ڕامگەیاند و پاشان "ئەمین"یش کەمێك پێش نیوەڕۆ ئەم نوسخانەی هێنا کە بەروبوومی باخچەکانی بەهەشتن. دەعواکەشم ئەوەیە کە:

ڕاستییەکانی ئیمان - کە پەیامەکانی نوور خزمەتیان دەکەن - لە هەموو شتێك گەورەترن و لەم کاتەی ئێستادا لەڕادەبەدەر پێویستن. بەڵام موڵحیدەکان لەبەر ئەوەی دڵانی خۆیان مراندووە و دەروونەکانیشیان بە هەوا و ئارەزووەکان لە ڕێ ترازاندووە، ئینکاریی ئەوە دەکەن کە مرۆڤ پێویستی بە "ڕاستیی ئیمان" هەبێت و، دەڵێن:

هەر تەنها پێویستی و ئامانجەکانی دنیایە کە ئاینداران و زانایان دەبزوێنێت!

بەم جۆرە، تۆمەتباریان دەکەن و بەپێی ئەم تۆمەتەش ستەمێکی توندوتیژیان دەدەنە پاڵ.

جا دەمکوت کردنی تەواوەتی و ڕاستەقینەی ئەو موڵحیدە بەدبەختانە، پێویستی بە کەسانێکی گیانفیدای وەها دەبێت کە گەورەترین سەرقاڵییەکانی دنیا پێویستیی ئەوان بۆ ڕاستییەکانی ئیمان تێر نەکات، تەنانەت زیانە سەخت و گەورەکانی دنیاش لەو خزمەتە دووریان نەخاتەوە.

ئایا هیچ کەسێك هەیە ئاوا بێت؟

بەڵێ هەیە، ئەوەتا پارێزگای ئیسپارتە و دەوروبەری لە پێش چاوتاندایە!

* * *

(دەروونێکی بەدخوازی تر)

(ئەمەی خوارەوە مەسەلەیەکی وردە بۆ بێدارکردنەوەی یەکێك لە برایانمان نووسرا کە قسووری خۆی نەبینی. وا دەینێرم بۆتان بەڵکو سوودی بۆ ئێوەش تێدا بێت)

جارێکیان سەرنجم دا هەندێ لە ئەولیا گەورەکان، لەوانەی کە لە چڵك و چەپەڵیی دەروونی بەدخواز(نەفسی ئەممارە)یان ڕزگاریان بووە، موجاهەدەی

نەفسیان دەکەن و سکالآیانە لە دەستی! زۆر سەرم لەمە سوورما.. بەلاّم پاش ماوەیەکی زۆر بۆم دەرکەوت کە جگە لە "دەروونی بەدخواز"ی ڕاستەقینە و هۆکارەکانی، دەروونێکی تری بەدخوازی مەعنەوی هەیە، لەوەی یەکەم گەلێ سەرسەخت و بێ گوێ ترە و، زیاتریش لە گوێڕایەڵیی خوای گەورە هەڵدێت و، لەویش زیاتر برەو بە ڕەوشتە خراپەکان دەدات. ئەم دەروونە دەروونێکی تری دووهەمە و، ئاوێتەیە کە لە هەوەس و هەست و تەبیعەتەکان پێکهاتووە و، لە ڕەگ و دەمارەکاندا بە قووڵی ڕۆچووە و، دواهەمین قەلاّیە کە "دەروونی بەدخواز" پەنای پێ دەبات و، هەر ئەویشە کە دوای پاکژبوونی دەروونی بەدخوازی پێشوو، کار و فرمانەکانی ئەو دەگرێتە ئەستۆ و، کارێك دەکات "موجاهەدە" هەتا کۆتایی تەمەن بەردەوام بێت.

کاتێ ئەمەم دی، تێگەیشتم کە ئەو پیاوچاك و ئەولیا بەرز و پیرۆزانە سکالآیان لە دەروونە بەدخوازە ڕاستەقینەکە نەبووە، بەڵکو سکالآیان لە دەست دەروونێکی بەدخوازی مەجازی‌یە. پاشان بینیم "ئیمامی ڕەببانی"ش (ئەحمەدی فارووقیی سەرهەندی، خوا لێی ڕازی بێت)[1] لەم دەروونە مەجازی‌یە دواوە.

(١) "ئیمامی ڕەببانی" (٩٧١-١٠٣٤ ك) ناوی (ئەحمەدی کوڕی عەبدولئەحەد)ە و خەڵکی (سەرهەند)ی هیندستانە و نازناوی بە "فاروقی" بلاّوبووەتەوە چونکە لە نەوەی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتابە، خوای لێ ڕازی بێت. نوێکاری ئایین(مجدد) بووە لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی کۆچیدا و بە ڕاستیش ئەرکی تازەکردنەوەی بەجێ هێناوە. لە زانستەکانی سەردەمی خۆیدا دەستێکی تابڵیی بالاّی بووە، جگە لەوەی کە خاوەنی دەروونێکی پاك و ئیخلاصێکی کەم وێنە و ڕۆحێکی پەروەردەکراو بووە لە بەندایەتییدا بۆ خوای گەورە و، دڵێکی هەمیشە بێداری بووە. چەندین جار پلەوپایەی بەرزی دراوەتێ هیچیانی وەرنەگرتووە. ئەو ئاشووبەی (ئەکبەرشا)ی هیند بۆ لەناوبردنی ئیسلام هەڵی گیرساند، ئەم زاتە توانیی بەرەنگاری ببێتەوە و ڕووبەڕووی ڕابووەستێت و دەوڵەتی مەغۆل لە هیندستاندا لە "ئیلحاد" و "بێ بڕوایی" و "بەرهەمی"یەوە بگێڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام لە ڕێی بلاّوکردنەوەی پەیڕەوی بەیعەت و برایەتی و ڕێنمایی خەڵکی‌یەوە و، توانیی (تەصەووف) لەو شتانەی تێکەڵی بووبوون و لێڵیان کردبوو، پاك بکاتەوە. بەم پێیە ئیمامی ڕەببانی بە خۆری تیشکداری قوتابخانەی نەقشبەندی دەژمێررێت لە تەصەووفدا. بانگەوازەکەی بە شێوەیەکی بەربلاّو لە نیوە دوورگەی هیندا بلاّو بووەوە و، یەکێك لە بەروبومەکانی (ئۆرنگ زیب) شای خواناس بوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا سەری ئیسلام و موسڵمانان بەرز بووەوە و کافرانیش

جـا لـەبـەر ئەوەی هەسـتیارەکانی ئەم دەروونە بەدخـوازە دووهـەمە کـەڕ و کوێـرن و، خـاوەنی هەسـت کـردن نـین، ئـەوا لـە وتـەکانی "ژیـری" و ئامۆژگاری‌یەکانی "دڵ" بێ ئاگان و گوێیان بۆ ڕانا گرن، تاکو ئەویش چاك ببێت و هەست بە کەموکووڕیی خۆی بکات..

لـەبەر ئەوە، واز لە خراپکاری ناهێنێت، مەگەر بە زللـەی تەمێ دان و، ئازار پێ چەشتن و، خۆبەخت کردنی تەواوەتی، بە چەشنێك کە لەبەر ئەو ئامانجەی لە پێناویدا تێدەکۆشێت هەموو هەست و نەستێکی تەنانەت هەموو شتێکی بەخت بکات و، بە تەواوی واز لە خۆویستیی خۆی بهێنێت، وەك قوتابی‌یە تایبەتی‌یەکانی نوور وازیان لـێ هێنا.

لـەم سـەردەمە سـەیرەدا، هـەردوو دەروونـە بەدخوازەکـە (ڕاسـتی و مـەجازی) چەندین دەرسی سامناك دادراون و، یەکیان گرتووە و، مرۆڤ هـان دەدەن کە بە ویست و ئارەزووی خـۆی دووچاری گوناهـ و تاوانباری ببێت، گوناهی وا کە لەتاو گەورەیی تاوانەکەیاندا هەموو بوونەوەران تەزوو بە جەستەیاندا دێت.

تەنانەت من خۆم لە مـاوەی یـەك خولـەکدا و، بـە بۆنـەی تەنگانەیەکی یـەکجار کەمـەوە، لـە نێـوان موجاهەدەیـەکی مەعنەویی مـەزندا کـە (دە) خولـەکی خایـاند، چاکەیەکی گەلـێ مەزنم لە کیسی خۆم دا. ئەوەبوو یەکێك لەوانـەی کە لـە ڕیـزی من و لەگەڵ مندا بوو، ڕیزی دوژمنانی بە چەشنێك بڕدابوو کە شپرزی کردبوون و دەتگوت چـەندین گوللـە تۆپیـان تـێ دەگرێـت. ئا لـەم کاتـەدا، هـەردوو دەروونـە بەدخوازەکە یەکیان گرت و، پێکـەوە دەرفـەتیان لـەو بـێ ئاگاییـە کاتی‌یـەم هێنـا و، هەستم بـە بزووتنـی دەمـارێك کـرد کـە بۆ چەپەڵترین ڕیـا و حـەسوودی لێـی دەدا.

---

سـەرشۆڕ کران. تەریقەتەکەی بەهێزی گەورە زانا و کەسایەتیی بەناوبانگی کورد: "مەولانا خـالیدی نەقشـبەندی"یـەوە (١١٩٢-١٢٤٢ ك) لـە هـەمـوو جـیهانی ئیسـلامیدا بڵاوبووەتـەوە.. چـەند بەرهـەمێکی دوای خـۆی بـەجێ هێشـتووە، بەناوبانگەکـەیان "مـەکتووبات"ە کـە "محەمـەد مـوراد مەنزیلەوی" کردوویەتی بە عەرەبی. هەروەك لـەم سـاڵانەی دوایـیدا (ساڵی ١٤٢٥ کۆچی) مامۆستا محەممەد ئەییوبی گەنجی لە سنە لێکۆڵینەوەیەکی ڕێکوپێکی لە دەقە فارسی‌یەکەی مەکتووباتدا بە ئـەنجام گەیاندووە و، لە لایەن ئینتیشاراتی صدیقی لە زاهیدان بـە چاپێکی قەشـەنگ و بـەرگێکی جوان بڵاو کراوەتەوە. خوا پاداشتی خێریان بداتەوە. (وەرگێڕ)

چونکە لەبەر خۆمەوە وتم: "بۆچی خۆم ئەو تۆپانەم نەهاویشت"؟! ئەمە و هاوچەشنی لەو جۆرە هەستە ستەمکارانەیە، لە بریی ئەوەی شوکرانەبژێریی ئەو نیعمەتەم بکردایە.

هەزار و یەك شوکر و سوپاس بۆ بەدیهێنەری بەخشندەم کە "پەیامەکانی نوور" بە تایبەتی پەیامەکانی "ئیخلاس" بە تەواوی فروفێڵەکانی ئەو دوو دەروونەیان نەهێشت و ئەو زامانەشیان ساڕێژ کرد کە هێنابوویانەوە سۆ، ئەو حاڵەتانەشیان بە تەواوی لابرد کە لە ماوەی یەك خولەك و دە خولەکدا ڕوویان دا. ئیتر - سوپاس بۆ خوا - بە قسووری خۆمم زانی، ئەو زانینەی کە ئیستیغفارێکی مەعنەوی‌یە و، بە فەزڵی خوای گەورە لە ئازار ڕزگارم بوو، کە سزایەکی خێرای ئەو هەڵەیەمە.

* * *

(نیگەرانی‌یەك کتوپڕ بە دڵدا هات)
وا بۆتان باس دەکەم:

بۆم دەرکەوتووە و هەستم کردووە کە: "گومڕایان" لەبەر ئەوەی نەیانتوانی بەربەستێك لە بەردەم شمشێرە ئەڵماسی‌یەکانی "پەیامەکانی نوور"دا بنیات بنێن، هەوڵ دەدەن لەرزە بە پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوان قوتابیانی ئەو پەیامانە بخەن. بۆ ئەم مەبەستەش تێدەکۆشن کە سوود لە چەند دەمارێکی لاوازی لەمەڕ جیاوازیی مەشرەب و هەست و شعوورەکان وەربگرن و، پێداویستی‌یەکانی گوزەران و بێ ئاگایی وەرزی بەهار بقۆزنەوە..

دەسا وریابن و ئاگاتان لە خۆتان بێت، "جیاوازی" درز و کەلێن نەخاتە نێوانتانەوە. بزانن کە مرۆڤ هیچ کاتێك لە هەڵە بەدەر نی‌یە و، دەرگای تۆبە و پەشیمانیش هەردەم کراوەتەوە. هەرکاتێك "دەروونی بەدخواز" و "شەیتان" هانی ئێوەیان دا کە لەسەر هەر حەقێك ڕەخنە لە براکەتان بگرن، پێیان بڵێن:

"ئێمە دەبێ لە پێناوی پشتگیریی نێوانماندا - کە پەیوەندیی توندوتۆڵی پەیامەکانی نوورە - ژیان و ڕێز و بەختەوەریی دنیامان ببەخشین، چ جای ئەوەی

ئاوڕ لەم کاروبارە جوزئی‌یانە بدەینەوە. ئەرکی سەرشانمان واز لـێ هێنـان و بـەخت کردنی هەموو ئەو شتانەیە کە پەیوەندی‌یان بە دنیـا و خۆپەرستیی مرۆڤەوە بێـت، لەبەر ئەو ئەنجامە مەزنانەی کە پەیامەکانی نوور دەستی ئێمەیان دەخەن".

بەم جۆرە "دەروونی بەدخواز" دەمکوت و بێ دەنگ دەکەن.

خۆ ئەگەر گفتوگۆ و مشتومڕ لەسەر هەر کێشەیەك هاتە کایەوە، ئێـوە لـە نێـوان خۆتاندا پرس و ڕا بە یەکتر بکەن و، توندوتیژی مـەنوێنن و، نـەرمونیان بـن. چونکـە خـەڵکی لـە ڕووی مەشرەبەوە هـەموویان یەکسـان نـین. کەواتـە دەبێ لـەم کاتـەی ئێستادا چاو لە یەکتری بپۆشن.

سڵاومان بە یەك بە یەکی هەموو برایان بگەیەنن.

* * *

(لە نێوان خۆتاندا بوار بە ڕەخنە مەدەن)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

وریا بن.. وریا بـن! لـە نێـوان خۆتـاندا بـوار بە ڕەخنـە مـەدەن، تـاگو گومڕایـان جیـاوازیی مەشـرەب و دەمـاری لاواز و پێداویسـتی‌یەکانی ژیـان و گـوزەرانتـان نەقۆزنەوە. هـەوڵ بـدەن بـە دامـەزراندنی "شـوورای شـەرعی" لـە نێـوان خۆتـاندا کـارێك بکـەن کـە ڕا و بۆچوونـەکانتان جیـاواز نـەبێت. هەمیشـە دەسـتوورەکانی "پەیامی ئیخلاس" لە پێش چاوی خۆتان دابنێن. دەنا ئیختیلافێکی کـەم لـەم کاتـەدا دەتوانێت زیانێکی زۆر بە پەیامەکانی نوور بگەیەنێت.

* * *

(چی ڕێی سیاسەتمان لـێ دەگرێت)؟

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

ئەمڕۆ صەلاحەددین هات بۆ لام و، یەکێکیش لە بەرپرسانی ئاسـایش کـەوتبووە شوێنی و، دوای ئەو خۆی کرد بە ژوورەکەمدا!

منیش بەو جاسووسەی حکوومەتم وت:

"پەیامەکانی نوور" کە ئێمە دەرسی تەواوەتیی لەلا دەخوێنین، هەرگیز ناکەین بە ئامرازێك بۆ دەستخستنی هەموو دنیا، چ جای سیاسەتەکەی. خۆ ئێمە دەست لە دنیای ئەهلی دنیا وەرنادەین، کەواتە مەترسیی سەرهەڵدانی زیان لە لایەن ئێمەوە، گێژی و گەلحۆییە. چونکە:

یەکەم:

قورئانی پیرۆز ڕێی سیاسەتی لە ئێمە گرتووە، تاکو ئەو ڕاستییانەی کە هێندەی ئەڵماس بەنرخن، لە پێش‌چاوی ئەهلی دنیادا دانەبەزنە ئاستی وردە شووشە بێ نرخەکان.

دووهەم:

شەفەقەت و ویژدان و حەقیقەتیش ڕێی سیاسەتمان لێ دەگرن. چونکە ئەگەر ڕێژەی ئەو مولحید و مونافیقانەی کە شایانی سزا و تۆڵەن، لە نێوان دە کەسدا تەنها دوو دانە بێت، ئەوا حەوت هەشت کەس لە خزم و کەس و کاریان بێ تاوانن و، منداڵ و خێزان و پیر و نەخۆشیان لە نێواندایە. جا ئەگەر بەڵا و موسیبەت داباریێت، ئەوا هەشت کەسە بەری و بێ تاوانەکەش بەو موسیبەتەوە گرفتار دەبن و، لەوانەیە تەنها زیانێکی کەم بەو یەك دوو مولحید و مونافیقانە بگات. لەبەر ئەوە، باش بزانن کە ئەو شەفەقەت و میهرەبانی و حەق و ڕاستییەی لە ناوەڕۆکی پەیامەکانی نووردان، بوارمان نادەن کە لە ڕێی هۆکارەکانی شێواندنی ڕێسا و تێکدانی کارگێڕیی وڵاتەوە بڕۆینە ناو سیاسەتەوە. جگە لەوەش، ئەو ئەنجامانەی کە لە سیاسەتەوە چاوەڕوان دەکرێن جێی گومانن بێنەدی و، هەرگیز بە چەند ئەنجامێکی یەقینی دانانرێن.

سێهەم:

ئەم نیشتمان و نەتەوە و حکوومەتە، لەسەر هەر شکڵ و شێوەیەك بێت، هەر پێویستیی لەڕادەبەدەریان بە "پەیامەکانی نوور" دەبێت. کەواتە سەرسەخت‌ترین

مولحیدیشیان دەبێ لایەنی ئەو دەستوورانەی پەیامەکانی نوور بگرێت کە لەسەر حەق و ئایین دامەزراون، چ جای ئەوەی لێیان بترسێت و هەڵوێستی دوژمنایەتیان لێ بگرێت. مەگەر - خوا نەخواستە - مەبەستی خیانەتێکی ئاشکرا بێت بەرامبەر نەتەوە و نیشتمان و فەرمانڕەوایەتیی ئیسلام. چونکە ڕزگار کردنی ئەم نەتەوە و نیشتمانە لە ئاژاوە و تیرۆر و مەترسییە گەورەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسییاندا، پێنج بناغەی پێویستە:

یەکەم: میهرەبانی.

دووهەم: ڕێز گرتن.

سێهەم: ئاسایش و متمانە.

چوارەم: دوورەپەرێزی لەو شتانەی کە حەرامن و، لە یەك جیاکردنەوەی حەرام و حەڵاڵ.

پێنجەم: گوێڕایەڵی و وازهێنان لە بەربادی و بەرەڵایی.

جا "پەیامەکانی نوور" کاتێ کە دەڕواننە ژیانی کۆمەڵایەتی، ئەم پێنج بناغەیە دەهێننە دی و، ستوون و پایەکانی ڕێسای وڵاتیان پێ جێگیر دەکەن.

دەسا با ئەوانەی کە دەستدرێژی دەکەنە سەر پەیامەکانی نوور! باش بزانن کە ئەم هەڵوێستەیان دوژمنایەتییە لەگەڵ نیشتمان و نەتەوە و ڕێسای وڵات لە پێناوی ئاژاوە و تیرۆردا.

ئەمانەم بە کورتی بەو جاسووسەی حکوومەت وت.

هەروەها پێم وت:

هەموو ئەمانەی کە بۆم باس کردیت بۆ ئەو کەسەیان بگێڕەرەوە کە تۆی بۆ ئێرە ناردووە!

هەروەها پێیان بڵێ:

ئەو کەسەی کە بە درێژایی هەژدە ساڵ بۆ مەبەستی دابین کردنی حەوانەوەی خۆی سەری لە حکوومەت نەداوە و.. هیچ زانیارییەکی لە بارەی ئەم جەنگەوە نییە کە یازدە مانگە دنیای سەرەوژێر کردووە و.. نایەوێت هیچ پەیوەندییەکی

دۆستایەتی لەگەڵ کەسانی پلەوپایە بەرزی دەوڵـەتدا ببەستێت.. پیـاوێك کـە ئەمـە حاڵی بێت، گەر هەر کەسێك بە جێی گومانی بزانێت و پێی وابێت دەست دەخاتە ناو دنیاکەیان و، لەسەر بناغەی ئـەم مەترسـی‌یەش گوشـاری بخرێتـە سـەر، ئـەم ڕەفتـارەی کـە لەگـەڵ پیـاوی وادا بکرێـت، بـە چـی لێـك دەدرێتـەوە و چ بەرژەوەندی‌یەکی تێدایە و چ یاسـایەك ڕێ بەمـە دەدات؟ خۆ تەنانەت کەسـانی گێژ و دەبەنگیش دەزانن دەستدرێژی کردن بۆ سەر پیاوێکی وا، ئەوپـەڕی شێتی و گەلحۆییە.

ئەمەمان پێ وت و، ئنجا ڕۆشتە دەرەوە!

* * *

(پێوەدانی مێشوولـە سەرقاڵتان نەکات)

برا ئازیزەکانم!

لەو باوەڕەدام کە پێویستتان بە دەرس و ڕێنمایی تازە نی‌یە، چونکە ئـەم جـارە لـە نێوان پەیامـەکانتاندا پەیامـەکانی "ئیخـلاس"م دی، کەواتـە بـۆ لای وانـەکانی ئـەو پەیامانەتان دەنێرم..

بەڵام دەمەوێت بۆ ئەمەی خوارەوە ئاگادار و بێدارتان بکەمەوە:

مادەم ڕێبـازی ئێمـە پاڵی بـە ئیخلاسـەوە داوە و، لەسـەر بناغـەی ڕاستی‌یەکانی ئیمان دامەزراوە، ئەوا بەپێی ئەم ڕێبازە بە پێویستی دەزانین کە لە ئیشوکاری ژیـانی کۆمەڵایەتی و دنیادا خۆمـان هەڵنـەقورتێنین، گـەر ڕاپێـچ نـەکرێین و ناچـار نـەبین.. دەبێـت بـە تـەواوی دەسـتبەردار و دوورەپـەرێز بـین لـەو چەشـنە حاڵەتانـەی کـە ئەنجامەکەیان بەربەرەکانێ و لایەنی خۆگرتن بێت و قرەوبڕەی لێ پەیدا ببێت.

جا هەزار جار ئاخ و داخ بۆ کەسـانی لاوازی خـاوەن تـەقوا و زانسـت کـە لـەم کاتـەی ئێسـتادا دووچـاری چـەندین هێرشـی سـامناکی هەژدیهاکان دەبن و هیـچ خەمێکیشی بۆ نـاخۆن، کەچی بە چـەند هەڵەیـەکی سـاکاری چەشـنی ئـازاری

پێوەدانی مێشوولە خۆیان دەخلافێنن و ئاورێك بە لای ئەو هێرشانەدا نادەنەوە کە دەکرێنە سەریان و، بە ڕەخنەگرتنیان لە یەکتری یارمەتیی ئەو مار و هەژدیها ستەمکار و دەستدرێژیکەرانە و یاریدەی مونافیقە زەندیقەکان دەدەن لە کاولکارییاندا، تەنانەت هاوکارییان دەکەن بۆ لەناوبردنی خۆیشیان بە دەستی ئەو چەپەڵانە!

برای تەواو دڵسۆزمان کاك "حەسەن عاطف" لە نامەکەیدا دەڵێت:

مامۆستایەکی ئامۆژگار و زانا هەڵوێستێکی نواندووە کە زیان بە پەیامەکانی نوور بگەیەنێت، چونکە ویستوویەتی - لە ڕێی سووکایەتی کردنەوە بە کەسایەتیی لاوازی من - دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو پەیامانە، گوایا بە بیانووی ئەوەی کە من سوننەتێکی پیرۆزم (واتە: ڕیش هێشتنەوەم) واز لێ هێناوە. لە کاتێکدا کە جێبەجێ نەکردنی ئەو سوننەتە لەبەر دوو عوزری گرنگە:

یەکەم:

با ئەو (کەسە) بزانێت، هەروەها ئێوەش بزانن کە: من خزمەتگوزاری پەیامەکانی نوورم و دەلالی ئەو دووکانەم. پەیامەکانی نووریش تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن و، پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە قورئانەوە هەیە، کە ئەویش کتێبێکە بە عەرشی هەرەمەزنەوە پەیوەستە. کەواتە هەڵە و ناتەواوییە کەسییەکانی من ئاراستەی پەیامەکان ناکرێن..

دووهەم

لە وەکیلیی منەوە سەلام بەو زانا ئامۆژگارە بگەیەنن. من بەوپەڕی سنگ فراوانییەوە ڕەخنەکانی وەردەگرم کە ئاراستەی لایەنی (کەسیی) منی کردوون.

ئێوەش لە لایەنی خۆتانەوە ئەو زانا بەڕێزە و زانایانی تری هاوچەشنی بەرەو موناقەشە ڕامەپێچن، خۆ ئەگەر دەستدرێژیمان بکرێتە سەر، ئێوە تەنانەت بە دوعا لێکردنیش بەرپەرچیان مەدەنەوە، چونکە ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکاتە سەرمان یان ڕەخنەمان لێ دەگرێت، هەر کەس بێت، مادەم ئیماندارە ئەوا لە ڕووی

ئیمانەوە برامانە. گەر ئەو دوژمنایەتیمان بکات، ئێمە بەپێی ڕێبازی خۆمان ناتوانین - وەك ئەو - هەڵوێستی دوژمنایەتیی لێ بگرین، چونکە چەندەها دوژمنی درِندە و ماری گەزندە هەن (کە بۆ دەرفەت دەگەڕێن).

ئێمە کوتەك هەڵگر و گورز وەشێن نین، جگە لە "نوور" هیچی تر شك نابەین، خۆ نووریش ئازاربەخش نیيە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕووناکیيە، ئەوا نەرمونیانە. بە تایبەت بەرامبەر بە زانایان، نەکەن غرووری زانستییان بورووژێنن، گەر ئەوانە دارای غروور و خۆویستی بن! بەڵکو هەتا دەتوانن بەپێی دەستووری ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕەفتار بکەن کە دەفەرموێ: ﴿وإذا مرّوا باللّغوِ مرّوا كِراماً﴾ (الفرقان:٧٢).

پاشان (ئەو کەسە بەڕێزە) کاتی خۆی لە بازنەی پەیامەکانی نووردا و لە دەستنووسیی پەیامەکاندا بەشدار بووە، کەواتە خۆیشی لەو بازنەیەدایە. لەبەر ئەوە، با ئەو هەڵەیەکی فیکریشی هەبێت، ئێوە هەر لێی خۆش بن.

دەبێت نەك تەنها ئەم مرۆڤە بەڕێزە و کەسانی هاوچەشنی کە خاوەنی ئایین و تەقوان و سەر بە تەریقەتە سۆفیيەکانن، بەڵکو ئەو ئیماندارانەش کە سەر بە پێڕ و تاقمە گومڕاکانیشن، لەم سەردەمە سەیرەدا، دژایەتی و ڕقەبەرایەتییان نەکەن. تەنانەت لەگەڵ "گاوران"یشدا، مادەم ئیمانیان بە خوا و دوارۆژ هەیە، نابێت لایەنەکانی جیاوازی و ناکۆکی بکرێن بە مایەی قسە و هەوێنی موناقەشە کردن.

ئەم چەرخە سەیرە و.. ئەو ڕێبازەی گرتوومانەتە بەر و.. خزمەتە بەرز و خاوێنەکەمان.. داخوازی ئەمەن!

جا بۆ ئەوەی بوار بە سەرهەڵدانی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەدرێت لە بەردەم بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەوا دەبێ قوتابیانی پەیامەکانی نوور ڕێبازی سوڵح و ئاشتی لەگەڵ ئەوانەدا بگرنە بەر. هەرگیز خۆتان لە نوێژی جومعە و جەماعەتی زانایاندا[1] هەڵمەقورتێنن و ڕەخنەش لەو کەسانە مەگرن کە تیایاندا بەشدارن.

---

(١) چونکە بانگ و قامەت و خوتبە بە زمانی تورکی بوون.

سەبارەت بە قسەکەی ئیمامی رەببانییش کە فەرموویەتی: (مەڕۆنە ئەو شوێنانەی بیدعەتیان تێدا دەکرێت) مەبەستی ئەوەیە کە پاداشتی تێدا نییە. نەك بەو واتایەی کە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. چونکە بەشێك لە پیاوچاکانی پێشین نوێژیان لە پشت سەری یەزید و وەلیدەوە خوێندووە.

بەڵام گەر مرۆڤ لە دەمی ڕۆشتنی بۆ مزگەوت و گەڕانەوەیدا دووچاری گوناهی کەبیرە دەبوو، باشتر وایە هەر لە شوێنی مانەوەکەیدا بێت و نەڕواتە دەرەوە.

ئەو برایەمان لە نامەکەیدا باسی برایانی نوێ و ئازا و دامەزراومان دەکات..

ئێمە لە گیان و هەناوی خۆمانەوە بە برای خۆمانیان قبوول دەکەین. بەڵام ئەوانەی کە دێنە ناو بازنەی پەیامەکانی نوورەوە، بۆ ئەوەی ڕێزی ڕاستەقینە و شایان لە ئازایەتیی کەسیی خۆیان بگرن، دەبێ بە دامەزراوییەکی نەجووڵ و توندوتۆڵییەکی مەحکەم و پەیوەندییەکی نەپچڕاو لەگەڵ برایانیدا، ئازایەتییەکەی بخاتە کار. واتە دەبێ ئازایەتییە کەسییەکەی خۆی، کە وەك چەند پارچە شووشەیەکی شکاو وایە، بگۆڕێت بە ئەڵماسی خۆبەختکاریی صددیقانە کە بە دوای حەقیقەتدا عەودالە.

بەڵێ، گرنگترین بناغەی ڕێبازەکەمان لە دوای "ئیخلاسی تەواوەتی" بریتییە لە: "دامەزراوی" و "توندوتۆڵی". ئەم توندوتۆڵییەش لە چەند ڕووداوێکی زۆردا چەسپاندی کە هەموو یەکێکی ئەو جۆرە کەسانەی ژیانی خۆیان بۆ خزمەتی ڕاستییەکانی پەیامەکانی نوور بەخت کردووە، لە بەرامبەری سەد کەسەوەیە. چونکە یەك کەسی ئاسایی ئەمان کە تەمەنی لە سی ساڵ تێپەڕ ناکات، پێشی چەندین ئەولیا کەوتنەوە کە تەمەنیان لە شەست ساڵ تێپەڕیوە.

پاشان کەسێك کە زۆر ئازا و جوامێر بێت، دوای ئەوەی کە ڕۆشتە ناو کۆمەڵێکی هاوپەیوەندیی توندوتۆڵەوە، لەبەر پارێزگاری کردنی حەوانەوەی کۆمەڵەکەی و لەرزە نەخستن پێیان، ناتوانێت ئەو ئازایەتییە کەسییەی بەکار

بهێنێت. کەواتە دەبێ بەپێی فەرموودەی پیرۆزی: "سیروا علی سـیر أضعفکـم"[(١)] ڕەفتار بکرێت و، ئەو بابەتانەی کە مایەی ناکۆکین قسەیان تێدا نەکرێت و، بابەتەکانی: شەپقە و، بانگ و، بەکارهێنانی ناونیشانەکانی دەجاڵ و سوفیانی لەگەڵ کەسانی نامۆدا نەخرێنە بەر باس و وتووێژ، چونکە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە زانایان و ئەهلی سیاسەت هەڵوێستی دوژمنایەتی و ڕووبەڕوو بوونەوە بەرامبەر بە "پەیامەکانی نوور" بنوێنن. کەواتە وریایی و دان بەخۆدا گرتن لە هەموو شتێك پێویستترە. تەنانەت حەزەر نەکردن لە شتانی جوزئی کار دەکاتە سەر ئێرەش!

"پەیامەکانی نوور" تەنها یەك بازنە نین، بەڵکو چەند چینێکی وەك بازنە هاوچەقەکانی هەیە. ئەوەتا چینەکانی ئەرکان و، خاوەنەکان و، خەواص و، بڵاوکەرەوان و، قوتابیان و، پشتگیران و، چینەکانی تری هاوچەشنی ئەمانەیان هەیە..

جا ئەگەر یەکێك شایانی ئەوە نەبوو کە بڕواتە ناو چینی "ئەرکان"ەوە، لە بازنەکە دەرناکرێت، بە مەرجێ پشتی تەوژمێکی پێچەوانەی پەیامەکانی نوور نەگرێت. هەروەها کەسێك تایبەتکارییەکانی "خەواص"ی تێدا نەبێت، دەتوانێت ببێت بە "قوتابی" بە مەرجێك دژە ڕێبازێك نەگرێتە بەر.. ئەو کەسەش کە ڕەفتار بە بیدعەت[(٢)] دەکات دەگونجێ ببێت بە "هاوڕێ" بە مەرجێ لە دڵەوە پشتگیری ئەو بیدعەتە نەبێت.

لەبەر ئەمە، هیچ کەسێك، لەبەر هەڵەیەکی کەم، لە بازنەکەتان دەرمەکەن، تاکو نەڕواتە ڕیزی دوژمنانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئەو جۆرە کەسانە لەو تەگبیر و ڕا وردانەدا بەشدار بکرێن کە "ئەرکان" و "خاوەنان"ی پەیامەکانی نوور ئەنجامیان دەدەن.

---

(١) قال في المقاصد: لا أعرفه بـهذا اللفظ، ولكن معناه في قوله ﷺ: أَقْدِرِ القومَ بأضعفِهم فإن فيـهم الكبير والسقيم والبعيد وذاالحاجة. ورواه الشافعي في مسنده وكذا الترمذي وحسّنه، وابـن ماجـه والحاكم وقال: على شرط مسلم، وابن خزيمة وصححه. (كشف الخفاء ١٥١٨ باختصار) **(وەرگێڕ)**

**(٢) مەبەست بانگ و قامەت و نوێژە بە تورکی (وەرگێڕ)**

(قوتابیانی نوور "خزمەت"یان لە "قوتبییەت" پێ باشترە)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

لەم دوو ڕۆژەی ڕابوردوودا دوو شت ڕوویان دا و چەند مەسەلەیەکیان هێنایە دڵمەوە، کە ئەمانە هەندێکیانن:

یەکەمیان:

برای بەڕێزمان کاك "صەلاحەددین" لە ئەنقەرەوە نووسیویەتی کە دەستیان داوەتە دەستدرێژی کردن بۆ سەر شوێنکەوتووانی تەریقەتە سۆفییەکان. هەروەك لە ئەنقەرە و خۆرهەڵاتدا هەڵمەتێکی خەڵك گرتن لەسەر ئەم مەسەلەیە دەستی پێ کردووە. بەڵام قوتابیانی پەیامەکانی نوور، بە چاودێریی پەروەردگار، لە هەموو لایەکەوە پارێزراون. چونکە "ئیخلاسی پتەویان" و "پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوانیان" و "بەکارهێنانی حەزەر" ئەو چاودێرییەی پەروەردگاریان لەسەر بەردەوام دەکات.

دووهەمیان:

هەموو خەڵکی لەم ڕۆژانەدا سکاڵا لە دەست "دڵتەنگی" دەکەن کە دووچاریان دەبێت. وەك بڵێی "چەپەڵ بوونی هەوای مەعنەوی" نەخۆشییەکی بێزاری و دڵتەنگیی مادییشی بە شێوەیەکی گشتی بڵاو کردووەتەوە، تەنانەت ئەم نەخۆشییە بۆ ماوەی یەك ڕۆژ منیشی گرتەوە. جا لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور دەرمانی هەموو ئەو نەخۆشی و گیروگرفتانەن کە دێنە ڕێمان، ئەوا ئەو کەسانەی کە پێیانەوە سەرقاڵ دەبن، بە پشتیوانیی خوا تووشی ئەو نەخۆشییە نابن، یاخود بە سووکی بەریان دەکەوێت.

......

چوارەمیان:

لە هەندێکی ئەو نامانەدا کە ڕەوانە کرابوون، چەند وەسفێکی لەڕادەبەدەر و زیاد لە پێویستم سەبارەت بە مامۆستاکەیان چاو پێکەوت. کە ڕوانیمە خۆم، بینیم شایانی تەنانەت زەکاتی ئەو وەسفانەش نیم و، مافی ئەوەم نییە بە هی خۆمیان

بزانم. لە خۆمم پرسی: ئەو برایانەم کە عەودالّی حەق و ڕاستین، چ سوود و بەرژەوەندییەك بەدەست دەهێنن لەو زیادەڕەوییە کە لە گومان باشیدا هەیانە، ئەوەتا سەرباری بێدارکردنەوەی یەك لە دوای یەکیشم بۆیان، کەچی هەر لەسەری بەردەوامن؟

یەکسەر ئەمەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

ئەو برایانە و شارەکەیان کە پارێزگای ئیسپارتە و دەوروبەرییەتی، پیت و بەرەکەتی خۆش باوەڕی و گومان باشیی زۆریان بینیوە و، لەمەشدا شوێن پێی ئەولیاکانی وەك: "عوسمانی خالیدی" و "شوکری تۆپالّ"یان هەڵگرتووە. کەواتە ئەوان کاتێ لەم گۆشەیەوە ڕوانیویانە، هیچ زیادەڕەوییەکیان نەکردووە، چونکە "ڕاستی"یان بینیوە. بەڵام هەروەك کەشفی ئەولیاکان پێویستیان بە تەئویل و، خەونەکانیش پێویستیان بە تەعبیرە، بڕیارە "تایبەتی"یەکانیش گەر بکرێن بە "گشتی" ئەوا لە ڕوویەکەوە هەڵەیان تێدا دەردەکەوێت. ئەو برادەرانەش بە هەمان جۆرن، چونکە ئەو سوودەی کە لە لایەن کەسی مەعنەویی پەیامەکانی نوورەوە بەوان و بە شارەکەیان دراوە، داویانەتە پاڵ یەکێك لە نوێنەرەکانی ئەو کەسە مەعنەوییە کە ئەم برایەی خۆتانە و ناوی "مامۆستا"یان لێ ناوە. ئیتر ڕووداوی سوودی ئەو شارەیان بە ڕووداوێکی گشتی بینیوە و لەو گۆشەیەوە بۆیان ڕوانیوە، لەمەشەوە زیادەڕەوی لەو گومانباشییەدا دەرکەوتووە.

شەشەم:

دوو سێ ڕۆژ پێش ئێستا گوێم لە وتەی بیست و دووهەم گرت لە دەمی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیدا. بینیم کە: زیکرێکی هەمەکی و، بیرێکی فراوان و، تەهلیلێکی زۆر و، وانەیەکی ئیمانیی بەهێز و، دڵ ئامادەییەکی بێ غەفڵەت و، دانستێکی بەرز و، پەرستشێکی فیکریی بڵند و، نوورەکانی هاوچەشنی ئەمانەی تێدایە. هەروەك لە حیکمەتی ئەوەش تێگەیشتم کە بۆچی بەشێکی قوتابیان بە نیازی پەرستش پەیامەکان دەنووسنەوە، یان دەیانخوێننەوە، یان گوێیان لێ

ڕادەگرن. ئیتر منیش پشتی ئەو کارەیانم گرت و، دوعای پیت و بەرەکەت و سەرکەوتنم لەو ئەرکەیاندا بۆ کردن.

بە پوختی:

پیرۆزبایی و دەست خۆشی لە برایانی وەك حافظ عەلی و خەسرەو دەکەین کە تەسدیقی دەعواکەی منیان کرد، کە دەموت:

قوتابیيە ڕاستەقینەکانی پەیامەکانی نوور خزمەتی ئیمانیان بەلاوە لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە. تەنانەت گەر پلەی قوتبییەتیشیان پێ بدرێت، هەر لەبەر پارێزگاریکردنی ئیخلاس، خزمەتی ئیمانیان پێ باشترە.

* * *

(قوتابخانەیەکی مەعنەوی لە بەرزەخدا)

ئەو دەمەی قوتابی بووم، لە کەسانی باوەڕ پێکراوم دەبیست کە لە چەند پێشەوایەکی مەزنەوە دەیانگێڕایەوە و، دەیان وت:

(ئەو قوتابییە چالاك و دڵسۆزانەی حەزیان لە زانستە و لە کاتی خوێندنی زانستەکاندا کۆچی دوایی دەکەن، لە بەرزەخیشدا لەناو قوتابخانەیەکی مەعنەویی چەشنی خوێندنگەکەی پێشوویاندا دەبن و، خوای گەورە حاڵێکیان پێ دەبەخشێت کە بۆ ئەو جیهانە بگونجێت).

ئەم گوفتارە لەسەر زمانی قوتابیانی زانستی ئەو کاتەدا بە زۆری دەوترایەوە.

جا لەبەر ئەوەی قوتابیانی نوور لەم کاتانەدا پوختەی قوتابیانی زانستەکانن، ئەوا بێ هیچ گومانێك ئەرکی سەرشانی "محەممەد زوهدی" و "عاصم" و "لوتفی" و قوتابییە کۆچ کردووەکانی هاوچەشنیان - خوا لێیان خۆش بێت - هەر بەردەوامە، بۆ ئەوەی بە قەڵەمە مەعنەوییەکانیان، کە پشت بە خوا هەر لە کاری خۆیاندا بەردەوامن، کردەوەی چاکی تر لە تۆماری چاکەکارییاندا زیاد بکەن.

* * *

(پەرستشی فیکری ئامانجی دنیایی پێ داوا ناکرێت)

"پەیامەکانی نوور" هەرگیز نابن بە "هۆ"ی دەستخستنی بەرژەوەندیی دنیایی و ناگونجێ بکرێن بە قەڵغان لە ڕووی زیانەکانی دنیادا. چونکە ئەم پەیامانە پەرستشێکی فیکریی گرنگ و بایەخدارن. کەواتە نابێت ڕاستەوخۆ ئامانج و مەبەستەکانی ژیانی دنیایان پێ داوا بکرێت. دەنا ئیخلاس دەشێوێت و شێوەی پەرستشە مەزنەکەیش دەگۆڕێت و، مرۆڤ – لە حاڵەتێکی وەهادا – وەك ئەو مناڵە نەفامانەی لێ دێت کە لە کاتی شەڕدا جزمەکانی قورئان دەکەن بە قەڵغان کە دەرسیان تێدا دەخوێنن، چونکە بێ هیچ گومانێك ئەو زیانەی بەر سەری دەکەوت بەر جزمەکەی دەکەوێت! لەبەر ئەوە، نابێت لە بەرامبەر ئەو دوژمنە نەیار و سەرسەختانەوە "پەیامەکانی نوور" بکرێن بە قەڵغان.

بەڵێ ڕاستە، ئەوانەی کە بوون بە دوژمنی پەیامەکانی نوور و دەستدرێژییان کردە سەر، چەندین زللەی تەمێیان ئاراستە کرا. سەدان ڕووداو هەن کە ئەمە دەچەسپێنن. بەڵام نابێت پەیامەکان بۆ زللە لێدان بەکاربهێنرێن و، ئەو زللانەشیان بە نیازی زللەوە لێ نادرێت، چونکە ئەوە کارێکی دژی ئیخلاس و بەندایەتیی بێگەردە بۆ خوای گەورە.

کەواتە هەرکەس ستەممان لێ بکات، حەواڵەی پەروەردگاری مەزنمانی دەکەین کە پاراستووینی و لە خزمەتی پەیامەکانی نووردا خستووینەتیە کار.

بەڵێ، گەلێ ئەنجامی نائاسایی سەر بە ژیانی دنیا لە خزمەتی پەیامەکانی نوورەوە پەیدا دەبن، بە چەشنی ئەوەی کە لە ویردە گرنگەکاندا هەیە. بەڵام ئەو ئەنجامانە بە داواکردن بە دەست نایەن، بەڵکو دەبەخشرێن! کەواتە هۆکار(عیللەت) نین بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو خزمەتە، ئەوەندە نەبێ کە لەوانەیە سوودێکیان ببێت. خۆ ئەگەر بە داواکردن و بەشوێن گەڕاندا هاتنەدی، ئەوا دەبن بە هۆکار. دیارە ئەو کاتەش ئیخلاسە کە تێکدەدات و بەشێك لەو پەرستشە بەتاڵ دەکاتەوە.

بەڵێ، هۆی بەرەنگار بوونەوەی سەرکەوتووانەی پەیامەکانی نوور بەرامبەر بەو هەموو ملنەدەر و سەرسەختە زۆر و زەبەندانە، تەنها هی نهێنیی ئیخلاسە کە تیایاندایە و، هی ئەوەشە کە "هۆکار" نین بۆ هیچ ئامانج و مەبەستێك و، ڕاستەوخۆ ڕوویان لە بەختەوەریی هەمیشەییە و، جگە لە خزمەتی ئیمان بە شوێن هیچ مەبەستێکدا ناگەڕێن و، ئاوڕ بە لای کەشف و کەرامەتی "کەسی"دا نادەنەوە، کە هەندێ لەشوێنکەوتووانی تەریقەت بایەخی پێ دەدەن.. هەروەها هی ئەوەیە کە ئەم پەیامانە هەموو کار و ئەرکێکی خۆیان لە پەخشاندنی نوورەکانی ئیمان و ڕزگار کردنی ئیمانی باوەڕداراندا چڕ کردووەتەوە. ئەمەشیان لە نهێنیی میراتگریی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ماوەتەوە، بە چەشنی هاوەڵە بەڕێزەکان کە خاوەن و هەڵگری "ویلایەتی کوبرا"ن.

بەڵێ، ئەو دوو ئەنجامەی کە بە لێکۆڵینەوە چەسپاون و لەم کات و سەردەمە سامناکەدا پەیامەکانی نوور بە قوتابیانی خۆیانی دەبەخشن، شایانی بایەخ پێ دانن و، لە هەموو شتێك گرنگترن و لە ڕادەیەکی ئەوتۆدان کە هیچ پێویستییەك ناهێڵنەوە کە مرۆڤ بۆ پلەوپایە مەعنەوییەکان و کاروباری تر بڕوانێت و چاویان بۆ بگێڕێت.

ئەنجامی یەکەمیان ئەوەیە کە:

هەرکەسێ بە وەفادارییەکی ڕاست و، قەناعەتێکی تەواوەتی دەڕواتە ناو بازنەی "پەیامەکانی نوور"ەوە، ژیانی بە باشی کۆتایی پێ دێت. واتە بە ئیمانەوە دەڕواتە ناو گۆڕەکەیەوە! گەلێ بەڵگەی بەهێز لەسەر ئەمە هەن.

ئەنجامی دووهەمیشیان ئەوەیە کە:

بەشداریی مەعنەوی لە کاروباری دوارۆژدا، کە بێ ویست و زانینی خۆمان ئێمەی بۆ ڕاپێچ کراوین و لە بازنەی خزمەت بە پەیامەکانی نووردا جێگیر بووە و چەسپاوە، ئەم بەشدارییە، هەموو قوتابییەکی ڕاستگۆ و ڕاستەقینە هان دەدات کە بە هەزاران دڵ و زمان بپاڕێتەوە و داوای لێبووردن بکات و خواپەرستی بەجێبهێنێت و، بە چل هەزار زمان - وەك هەندێ مەلائیکەت - تەسبیحاتی

خوای گەورە بکات. هەروەها ئەم بەشداری کردنە هانی دەدات کە بە سەدان هەزار دەستیش بە دوای ڕاستییە بەرز و بڵندەکاندا بگەڕێت، بە چەشنی ئەوەی کە بە دوای حەقیقەتی شەوی "قەدر"ی ڕەمەزاندا دەگەڕێت.

لەبەر ئەم چەشنە ئەنجامەیە کە "قوتابیانی نوور" خزمەتی پەیامەکانی نووریان گەلێ پێ باشترە لە پلەی "ویلایەت" و، هەرگیز چاو بۆ "کەشف و کەرامەت" ناگێڕن و، هەوڵ نادەن بەروبوومی قیامەتیان لە دنیادا بچنن! ئنجا سەرکەوتنیان لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکاندا و، پێشوازیی خەڵکی لەم پەیامانە و، برەودانیان پێیان، پاشان دەستکەوتنی ناوبانگ و چێژەکان و چاودێریی خوای گەورە، کە ئەمان شایستەیانن و، هەر شتێکی تری جگە لەمانەش کە لە دەرەوەی بازنەی ئەرك و فەرمانبەریی سەرشانی ئەواندایە.. هەموو ئەوانە، دەدەنە دەستی خوای گەورە و، خۆیان لەو کاروبارانەدا هەڵناقورتێنن و، هەوڵ و کۆششیان لەسەر بناغەی ئەو شتانە بنیات نانێن. بەڵکو بە ئیخلاسێکی بێگەرد و تەواوەتییەوە کاری خۆیان ئەنجام دەدەن و، دەڵێن: ئەوەندەمان سەروزیادە کار و فرمانی خۆمان جێبەجێ بکەین، کە ئەویش تەنها و تەنها خزمەتی ئیمانە.

* * *

(هەندێ تایبەتمەندیی پەیامەکانی نوور)

✻ "پەیامەکانی نوور" لەم چەرخەدا و بە تایبەت لەم کاتەدا، دەستاوێزێکی مەحکەمن. واتە: زنجیرێکی ئەوەندە بەهێزن کە هەرگیز ناپچڕێن و، ئەو ڕشتەی پەیمانەیە کە خوا دایناوە لێی لا نەدەن. کەواتە هەرکەسێك دەستی پێوەبگرێت ڕزگاری بووە.

✻ "پەیامەکانی نوور" بەڵگەیەکی ڕوونی بەهێز و، تەفسیرێکی بەنرخ و، یەکێك لە بریسکانەوە بەشەوقەکانی ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن و، نمێکی ئەو دەریایە و، تیشکێکی ئەو خۆرەن و، ڕاستییەکن لە گەنجینەی زانستی

حەقیقەتەوە ئیلـهام کـراون و، تەرجەمەیـەکی مەعنـەویی ئـەوتۆن کـە لـە ڕێژنـەکانی ئەوەوە هەڵقوڵاون.

* "پەیامـەکانی نـوور" وەك کتێبـە دانراوەکـانی تـر نـین، کـە لـە چـەندەها سەرچاوەی جۆراوجۆری زانستی و هونەریەوە زانیاری وەربگـرن، نـەخێر.. جگە لـە قورئـانی پیرۆز هیـچ سـەرچاوە و مامۆستایەکیان نییە و، دانەریشیان لـە کاتی دانانیاندا جگە لە قورئان هیچ کتێبێکی تری لەلا نەبووە، واتـە ڕاستەوخۆ لـە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە ئەم پەیامانە ئیلـهام کـراون. کەواتـە لـە ئاسمـانی قورئـان و ئەستێرەی ئایەتەکانیەوە نازڵ بوون.

* ئەوانـەی کـە وەڵام و بەرپـەرچی پـەلـپ و بیـانووی مولحیـدان دەدەنـەوە، کـە هەزار ساڵی ڕەبەقە بـۆ شـکاندنی بەها و شـان و شـکۆی قورئـان ئامـادە دەکرێـن.. ئەوانەی دوودڵـی و گومـانی فەیلەسووفە کافرەکـان دەسڕنەوە کە زۆر لـە مێـژە کەڵەکەیان کـردووە و ئێستا دەرفەتی بڵاوبوونـەوەیان بـۆ ڕەخسـاوە.. هـەروەها ئەوانەی کە دەبـن بـە بەربەسـتێك لـە بـەردەم ڕق و کینـەی جوولەکـەکان کـە دوژمنایەتی و تۆڵەسەندنەوەیان لە نیازدایە بەرامبەر بەو قورئانە پـیرۆزەی بە تونـدی سەرزەنشتی کردوون.. ئەوانەی کە بەرامبەر هێرشـی چـەندین دیـانی لـەخۆبایی بۆ سەر قورئان ڕادەوەستن..

بەڵێ، ئەوانەی کە بەرەنگاری هەموو ئەم هێرشـانە دەبنـەوە و دەیانگێڕنـە دواوە، چەند پاڵەوانێکی ئازا و چەندین قەڵای مەعنەویی مەحکەمی قورئانی پیرۆزن، کە لە هەموو چـەرخێکدا بەردەوام بوون و هـەن. بـەڵام ئـەم چـەرخ و سـەردەمەی ئـەمڕۆ گەلـێ پێویستیی زیاتری بەو پاڵەوانانـە هەیـە، چونکـە ژمـارەی هێرشـبەران لـە یـەك دوو کەسەوە گەیشتووەتە سەد و، ژمارەی بـەرگریکارانیش لـە قورئـانی پیرۆز لـە سـەدەوە دابەزیوەتـە دوو سـێ کـەس! ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە فـێربوونی ڕاستییەکانی ئیمـان لـە ڕێـی زانسـتی کـەلام و قوتابخانـە شـەرعییەکانەوە – بـە گوێرەی ڕێبازی زوو – کاتێکی درێژخایەنی دەوێت کـە بـارودۆخی ئـەمڕۆ بـواری پێ نادات. کەواتە ئەو دەرگایەش داخرا..

بەڵام "پەیامەکانی نوور" ڕاستییە هەرە قووڵەکانی ئیمان فێری گشت خەڵکی دەکەن، بە شێوازێك کە هەموو کەسێك، لە کورتترین کاتیشدا، لێیان تێدەگەن و فێریان دەبن.

* یەکێك لە تایبەتمەندییە ڕوونکەرەوەکانی "پەیامەکانی نوور" ئەوەیە کە:

لەم سەردەم و چەرخە سەیرەدا، ئیمان و کوفر لە زۆرانبازیی نێوانیاندا پەنا بۆ دواهەمین قەڵای خۆیان دەبەن و پشتی پێ دەبەستن! "پەیامەکانی نوور"یش ئەو دواهەمین بناغە و پاڵپشتانەی ئیمان بە شێوەیەکی گومانبڕ و بەهێز ڕوون دەکەنەوە. ئەم تایبەتمەندییە بە جوانترین شێوە لە پەیامی "الآیـة الکـبری"[1]دا دەبینرێت، چونکە ئەم پەیامە ململانێی نێوان ئیمان و کوفر لە ئاخرین پەنا و پاڵپشتیاندا دەخاتە ڕوو.

با ئەمە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

لە مەیدانی جەنگێکی گەلێ مەزن و کاتی کۆبوونەوەی سوپای زۆری هەردوو لادا، دوژمن پەیتا پەیتا چەك و پێداویستیی جەنگ بۆ تیپەکەی خۆی دەنێرێت، تاکو پشتی وورە و هێزی مەعنەوییان پتر بگرێت و، لەم پێناوەدا چیی لە توانادا بێت درێغی ناکات. یەکێك لەوانە: بە کەم پیشاندانی هێزی مەعنەوی و وورەی ئیماندارانە و، پەك خستن و تەفروتوونا کردنی یەکێتی و پەیوەندیی نێوانیانە. واتە هەر هۆکارێکی بێتە دەست بۆ نەهێشتنی وورەی مەعنەویی ئیمانداران - کە هێزێکی یەدەك و پشتگیری ئیماندارانە - لەکیسی خۆی نادات و کەڵکی لێ وەردەگرێت. بە ڕادەیەك کە ئەو دوژمنانە کۆمەڵێکی یەکگرتووی پەیوەندیدار و خاوەن گیانی کاری بەکۆمەڵ و ڕێکخراوی تایبەتی بۆ سەر تیپەکان و یەك بە یەکی سوپای موسڵمانان لەو جەنگەی نێوانیاندا ڕەوانە دەکەن..

جا لەم کاتەدا کە دوژمن خەریکە وورە و هێزی مەعنەویی تیپی موسڵمانان لەناو بەرێت، یەکێکی وەك حەزرەتی خضریان - دروودی لەسەر بێت - لێ پەیدا دەبێت و دەڵێت:

(١) واتە پەیامی (بینینەکانی گەشتیارێك) کە تیشکی حەوتەمی کتێبی (تیشکەکان)ە (وەرگێڕ)

- (کاکی موسڵمان! نائومێد مەبە! ئەوەندە داڵدە و پاڵپشتی توندوتۆڵت هەیە کە هەرگیز جێیان پێ لێژ نابێت و، چەندین سوپای هێندە زۆر و هێزی یەدەکی ئەوتۆشت لە پشتە کە تەواو نابن و لەبن نایەن و هیچ هێزێك ناتوانێت بەسەریاندا زاڵ ببێت، بە ڕادەیەك کە ئەگەر هەموو دنیا بە گشتی لە دژیان کۆببنەوە، ئنجا ناتوانن لەگەڵیاندا بکەونە زۆرانەوە، بەڵکو هەر ناشوێرن بێنە مەیدانیانەوە. مەگەر یەکێك بتوانێت هەموو گەردوون بڕووخێنێت، دەنا کەس ناتوانێت تێکیان بشکێنێت.. هۆی تێکشکانی ئێستاشت ئەوەیە تەنها یەك سەربازت ناردووەتە مەیدان کە بەرامبەر کۆمەڵێکی ڕێکخراوی خاوەن کەسێتیی مەعنەوی و گیانی بەکۆمەڵ بجەنگێت.. کاکی موسڵمان! هەوڵ بدە "یەك بە یەکی" سەربازەکانت لە حوکمی "کۆمەڵ" و "کەسێکی مەعنەوی"ی ئەوتۆدا بن کە وره و هێزی مەعنەویی خۆی لە بازنەکانی دەوروبەریەوە وەربگرێت).

بەم جۆرە دڵی ئەو موسڵمانە بەم وتەیەی حەزرەتی خضـر - دروودی لەسەر بێت - لە قەناعەت و دڵنیایی و ئاسوودەیی پڕ دەبێت.

هەروەك ئەمە وایە، پەیامی "الآیـة الکـبری"ش بە هەمان جۆرە؛ چونکە ئەو گومڕایانەی کە پەلامار و هێرشی کتوپڕی بۆ سەر ئیمانداران دەبەن، وەك گیانێکی چەپەڵیان لێ هاتووە لەناو نەتەوەدا و، کەسێتییەکی مەعنەوین، دارای گیانی بەکۆمەڵ و ڕێکخراوی تایبەتین و، خەریکی تێکدانی دڵ و دەروونی خەڵکن - بە گشتی - لە جیهانی ئیسلامدا و، ئەو پەردە ئیسلامییە بەرزە دەدڕێنن کە بیروباوەڕی تەقلیدیی موسڵمانی عەوام دەپارێزێت و، ئەو هەست و شعوورانەشیان دەسووتێنن کە لە باوك و باپیرانیانەوە بۆیان ماونەتەوە، ئەو هەست و نەستانەی کە ئەگەر بمێنن ژیانی ئیمانیی ئەوان بە بەردەوامی دەهێڵنەوە.

جا لە کاتێکدا کە هەموو موسڵمانێك هەوڵی نائومێدانە دەدات تاکو خۆی لەم ئاگرە سامناکە بپارێزێت کە هەموو جیهانی گرتووەتەوە، ئا لەم کاتەدا، پەیامەکانی نوور وەك حەزرەتی خضـر - دروودی لەسەر بێت - دێن و دەستی یارمەتیی بۆ درێژ دەکەن و، پەیامی: "الآیة الکبری"ش بە چەشنی سەربازێکی گوێڕایەڵ و خاوەن

هێزی لەعادەتبەدەر، دەردەپەڕێتە مەیدان و، ئەو کۆمەك و یاریدە ماددی و مەعنەوی‌یەی کە هەرگیز بەرەنگاری ناکرێت، لە یەك بە یەکی سوپاکانی خۆی وەردەگرێت کە هەموو گەردوونیان گرتووەتەوە.

بۆ خۆتان خاڵەکانی تری نموونەکە لەگەڵ ئەمەدا بەراورد بکەن، تاکو پوختەی ئەم نهێنی‌یەتان بۆ روون ببێتەوە.

* هەروەها "پەیامەکانی نوور" تفاق و ڕووناکی‌یەکی ئەوتۆ نین کە لە زانستەکانی خۆرهەڵات و، فەلسەفە و هونەری خۆرئاوا وەرگیرابن، نەخێر. بەڵکو لە عەرشی بڵند و ئاسمان ئاسای پلەی بەرزی قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون کە لە سەرووی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوەیە.

* لێکۆڵینەوە و ئامادەسازی بۆ تێگەیشتن لە پەیامەکانی نوور - ئەو پەیامانەی کە ڕووناکیی مەعنەوین و، زانستێکن لە یەك کاتدا لەوپەڕی بەرزی و قووڵیدان - پێویستی بە زۆر لەخۆکردن و ماندوو بوون و هێنانی مامۆستای تر نی‌یە، چونکە هەموو کەسێك بە گوێرەی پلەی تێگەیشتنی خۆی، لەو زانستە بەرزانە تێدەگات و بێ ئەوەی ئاگری ماندووبوون دابگرسێنێت ڕووناکیی مەعنەویی ئەو زانستانەی دەستگیر دەبێت و، سوود بە خۆی دەگەیەنێت. تەنانەت لەوانەشە لە ڕێی ئەم پەیامانەوە ببێت بە زانایەکی لێکۆڵەرا

* پرسیار:

بۆچی لە نێوان کتێبە بەنرخەکاندا هەر پەیامەکانی نوور تایبەتمەندن بە چەند ئاماژە و ئاوڕلێدانەوەیەکی قورئانی پیرۆز و، ڕێز و تەقدیری ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و، مژدە و بۆڕوانینی شێخی گەیلانی، قدّس سرّه؟ ئایا چ حیکمەتێك لە بایەخ پێدانی و ڕێزلێنانی ئەم دوو مامۆستا بەڕێزەدا هەیە - تا ئەم ڕادەیە - بە پەیامەکانی نوور؟

وەڵام:

ئاشکرایە هەندێ جار تەنها یەك خولەك بە ئەندازەی سەعاتێکی تەواو بایەخدار دەبێت و، بە قەدەر ئەو سەعاتە تەنانەت ئەوەندەی بەرهەمی ڕۆژێکی تەواو، بەڵکو

بە ئەندازەی بەرهەمی چەندەها ساڵیش بەپیت و بەرەکەت و بەرهەمدار دەبێت. هەندێ جاری تریش تەنها یەك سەعات بە ئەندازەی ساڵێکی تەمەن، تەنانەت هەموو تەمەنیش بەرهەم بەخش و بایەخدار دەبێت.

بۆ نموونە:

ئەو کەسەی لە ڕێی خوادا شەهید دەبێت - کە یەك خولەك دەخایەنێت - پلەی ئەولیایانی دەست دەکەوێت.. هەروەها ئەو کەسەی بۆ ماوەی تەنها یەك سەعات لەسەر سنوورێك لە سنوورەکانی وڵاتی ئیسلام و لە دەمی توندوتیژیی سەرما و سەختیی هێرشی ترسناکی دوژمندا ئێشك دەگرێت، لەوانەیە ئەوەندەی ساڵێکی تەواوی خواپەرستی کارەکەی بایەخدار بێت و بەو ئەندازەیە پاداشتی بۆ بنووسرێت..

پەیامەکانی نووریش بە هەمان جۆرن.. چونکە هۆی ئەو گرنگی و بایەخەی بەدەستیان هێناوە دەگەڕێتەوە بۆ: گرنگیی ئەو کات و چەرخەی تیایدان و.. سەختی و مەزنیی ئەو کاولکارییانەی کە ئەم سەردەمە لە شەریعەت و دروشمەکانی ئایینی پێغەمبەرماندا ﷺ ئەنجامی داون و.. ئەم فیتنە و ئاشووبەی ئێستای ئاخر زەمان کە نەتەوەی ئیسلام هەر لە مێژە لەتاو مەترسییەکانی پەنایان بە خوا گرتووە و.. لەو گۆشەیەشەوەیە کە ئەم پەیامانە ئیمانی باوەڕداران لە هێرش و پەلاماردانی فیتنە و ئاشووبەکان ڕزگار دەکەن.

لەبەر هەموو ئەم هۆیانەیە کە "پەیامەکانی نوور" گرنگییەکی یەکجار مەزنیان بەدەست هێناوە. بە ڕادەیەك کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەهێزی بۆ کردوون و ئاوڕی بەنرخی لێ داونەتەوە. هەروەك ئیمامی عەلیش - خوا لێی ڕازی بێت - بە سێ کەرامەت موژدەی هاتنی ئەو پەیامانەی ڕاگەیاندووە و، شێخی گەیلانیش - خوا لێی ڕازی بێت - هەواڵی خاوەن کەرامەتی لەبارەیانەوە ڕاگەیاندووە و دانەرەکەیانی بۆ ئەو خزمەتە هان داوە.

بەڵێ، قەڵا تەقلیدییەکانی ئیمان لە ئەنجامی هێرشە سامناکەکانی ئەم چەرخەوە، تێکڕا لەرزەیان پێ کەوتووە و، درز و کەلێنیان تێدا پەیدا بووە و، لە

خەڵکی دوور خراونەتەوە و، چەندین پەردەیان بەسەر ڕوودا دادراوەتەوە. ئەمەش داخوازی ئەوەیە کە (هەموو یەکێك) لە باوەڕداران خاوەنی ئیمانێکی تەحقیقیی یەکجار بەهێز بێت تاکو بتوانێت (هەر بە تەنها خۆی) بەرامبەر "هێرشی بەکۆمەڵی گومڕایان" بەرهەڵستی بنوێنێت و خۆی پێ ڕاگیر بکرێت.

جا پەیامەکانی نوور لە تاریکترین و سامناکترین و پێویستترین و تەنگانەترین کاتدا ئەم فەرمانبەری و ئەرکە جێبەجێ دەکەن و، بە شێوازێك کە هەموو کەسێك لێی تێبگات خزمەتی ئیمانیی خۆیان بەجێ دەهێنن و، بە چەندین بەڵگەی بەهێز، قووڵترین و وردترین و پەنهانترینی ڕاستییەکانی قورئان و ئیمانیان چەسپاندووە، بە ڕادەیەك کە هەر قوتابییەکی ڕاست و وەفاداری پەیامەکانی نوور ئیمانی تەحقیقیی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتبێت، لە ڕووی خزمەتگوزارییەکانیەوە بۆ ئیمان وەکو "قوتب"ێکی شارراوەی ئەولیاکان وایە لەو شار و دێهاتانەی تیایاندا دەژین، ئەوانە هەرچەندە ئاشکرا نین و نەناسراون و هیچ کەسێك ئاوڕیان لێ ناداتەوە و بایەخیان پێ نادات، بەڵام هەر یەکەیان بەو عەقیدە و بیروباوەڕە مەعنەوییەی هەیەتی، وەك ئەفسەرێکی ئازای ناو سوپا وان، هێز و پێز و یاریدەی مەعنەوی بە دڵی ئیمانداران دەبەخشن و گیانی وره و ئازایەتی و حەماسەتیان تێدا دەبزوێنن.

* برا وەفادار و ڕاست و ئازیزەکانم! ئەی ئەوانەی مایەی دڵنەواییمن لەم دنیایەدا! ئەی ئەو هاوەڵانەم کە لە خزمەت کردنی حەقیقەتدا سستی ناکەن و چوستی دەنوێنن!

کاتێ کە لەم ڕۆژانەدا پەژارە دایگرتبووم، لەبەر ئەوەی زەینم دووچاری هەندێ سەرقاڵیی بەرگری کردن بوو لە بەردەم دادگاکاندا، ئەمەی خوارەوەم - لەم کاتەدا - بە دڵدا هات:

(ئەو سەرقاڵ بوونەش هەر خەریك بوونە بە زانستەوە، چونکە خزمەتێکە لە پێناوی بڵاوبوونەوەی ڕاستییەکانی ئیمان و هێنانەدیی سەربەستییان و ئاشکرا کردنیان. کەواتە لەم ڕووەوە ئەو بەرگرییانەش بە جۆرێکی پەرستش دادەنرێن).

خۆیشم هەر کاتێ دڵتەنگی لە خۆمدا شك ببەم، بەوپەڕی لەزەت لێ چەشتنەوە دەست دەدەمە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور، هەرچەندە سەد جاریش خوێندوومنەتەوە، بە ڕادەیەك کە بۆم دەرکەوت "بەرگرییەکانیش" وەك پەیامە زانستییەکانی نوور وان.

یەکێك لە برایانم پێی وتم:

(هەمیشە هەست بە شەوق و پێویستی دەکەم بۆ خوێندنەوەی چەندین جارەی "پەیامی حەشر" هەرچەندەش سی جار خوێندوومەتەوە)!

لەم وتەیەی ئەم برایەوە بۆم دەرکەوت کە:

پەیامەکانی نوور تەفسیری بەنرخ و ڕەسەن و، ئاوێنەی تیشك دەرەوەی ڕاستییەکانی قورئانن و، تایبەتکارییەکی بەرزی قورئانی پیرۆزیان تێدایە، ئەویش بێزارنەبوونە لە خوێندنەوەیان.

* عەوامی ئیماندارانی ئەم ڕۆژگارە، زۆر پێویستیان بە خاڵێکی پشت پێ بەستن هەیە کە پاڵی پێوە بدەن. سوپاسی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە لەسەر ئەوەی کە ئەم خاڵەیان لە پەیامەکانی نووردا دۆزییەوە. چونکە پەیامەکانی نوور نابن بە هۆکار و داردەستی هیچ شتێك، هەروەك هیچ مەبەست و ئامانجێك تێکەڵیان نابێت و، بواریش بە هیچ شوبهە و گومانێك نادەن کە بڕواتە ناویانەوە و، هیچ دوژمنێکیش بەڵگەی بۆ زامدار کردن و هەڵوەشاندنەوەیان دەست ناکەوێت..

ئنجا ئەو کەسانەش کە بۆ بڵاوکردنەی ئەم پەیامانە لێ دەبڕێن، تەنها لە پێناوی ڕاستی و حەقیقەتدا تێدەکۆشن، بێ ئەوەی کە ئامانجەکانی دنیا تێکەڵی هەوڵ و کۆششەکانیان ببێت.

ئەمانەش لەبەر ئەوە دەخەینە ڕوو، تاکو کەسانی دوور لەم پەیامانە لەو ڕاستییە دڵنیا بین و، باوەڕ و متمانەی تەواوەتیشیان بە کەسانی ڕاستگۆی بڵاوکەرەوەی ئەو پەیامانە ببێت، تاکو ئیمانی خۆیان بپارێزن، لە بەرامبەر هێرشی زەندیق و مولحیدان و ڕەخنە و ئینکاریی فەیلەسوفەکانەوە کە دەیکەنە سەر ئایین.

* بەڵێ، ئەو ئیماندارانە، بە زمانی حاڵیان دەڵێن:

(چەندین دوژمنی درندەی زۆر نەیانتوانی ئەم ڕاستی‌یە پووچەڵ بکەنەوە و ڕەخنەی لێ بگرن.. قوتابیانی ئەو ڕاستی‌یەش لە هەوڵ و تەقالایاندا هیچ نیازێکی تری جگە لە خزمەتی حەقیان لە دڵدا نی‌یە. کەواتە دەبێ ئەو ڕاستی‌یە حەق و حەقیقەتی ڕووت و بێ گومان بێت).

بەم جۆرە، بە تەنها یەك بەڵگەی ئەوتۆ کە لە هەزار و یەك بەڵگە بەهێزترە، ئیمانەکەی خۆیان بەهێز و ڕزگار دەکەن و، دوای ئەوە هیچ گومانێك توخنیان ناکەوێت.

* لەبەر دڵنیا کردنی ئیماندارانی عەوام و بۆ ئەوەی کە بێ هیچ دوودڵی‌یەك ڕاستی‌یەکانی ئیمان وەربگرن، لەم کاتەی ئێستادا پێویست بە بوونی چەند مامۆستایەکی ئەوتۆ هەیە کە هێندە خۆنەویست بن نەك هەر تەنها بەرژەوەندی و سوودەکانی دنیایان، بەڵکوو سوود و بەرژەوەندی‌یەکانی ئەو دنیاشیان لە پێناوی سوودی دواڕۆژی ئەهلی ئیماندا بەخت بکەن. ئەو کاتەش دەرسە ئیمانی‌یەکە هێندە خاوێن و بێگەرد دەبێت کە هەرگیز بیر لە سوودە کەسی‌یەکانی خۆیان نەکەنەوە، هەرچەندە و لە هەر ڕادەیەکیشدا بێت. بەڵکو هەوڵ دەدەن لە پێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا و، لەبەر عیشقی حەقیقەت و، شەوق و تاسەمەندی بۆ حەق و، ڕاست و دروستیی خزمەت بە ڕاستی‌یەکان، خزمەتی ئیمان بکەن. تاکو هەرکەسێك کە پێویستی بە ئیمانە بە تەواوی لێی دڵنیا بێت، بێ ئەوەی پێویست بە هێنانەوەی بەڵگەکان بکات. هەروەها بۆ ئەوەی نەڵێت: (ئەم کەسە دەمان خەڵەتێنێت و بۆ لای خۆی ڕامان دەکێشێت). هەروەها بۆ ئەوەش بزانێت کە "حەقیقەت" خۆی لە خۆیدا هێندە بەهێزە کە بە هیچ حاڵ و شێوەیەك لەرزەی پێ ناخرێت و ناشبێت بە ئامراز و داردەستی هیچ شتێك..

ئەو کاتە ئیمانەکەی بەهێز دەبێت و دەڵێت:

"ڕاستە، ئەو وانە ئیمانی‌یە عەینی حەقیقەتە".

ئیتر هەموو وەسوەسە و گومانەکانی دەڕۆن و دەپووکێنەوە.

(ئەو ڕاپۆرتەی کە خەبیرەکانی ئەنقەرە بە یەکدەنگی خستیانە بەردەستی بەرپرسەکان):

ئێمە ناواخنی پێنج سندووقی پڕ لە کتێبمان کردەوە و خوێندمانەوە. ئنجا لەبەر ئەوەش دەسەلاتمان پێ دراوە کە لە هەموو کتێبەکانی ناو ئەو سندووقانە ورد ببینەوە و لێیان بکۆڵینەوە، ئەوا لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەماندا لێیان، بۆمان دەرکەوت کە بریتین لە:

چەند کتێبێکی چاپکراو کە سەعیدی نوورسی داینـاون و.. چەند بەشێکی چاپ نەکراوی پەیامەکانی نوور و.. هەندێ نامەی زانستی و ئایینی چەند کەسێك لە قوتابیانی نوورسی و.. چەند نامەیەکی تری ئاسایی کە لە نێوان قوتابییەکان خۆیاندا یان لە نێوان ئەوان و سەعیدی نوورسیدا نووسراون و، کۆمەڵە کلێشەیەکیش.

جا بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی هەموو ئەمانە ڕوون بکەینەوە، دەبێ بیانکەین بە دوو بەشەوە:

● ئەو پەیامانەی کە بۆ تەفسیری ئایەتێك یان بۆ ڕوونکردنەوەی فەرموودەیەکی پیرۆز نووسراون، لەسەدا نەوەدی ناواخنی سندووقەکان پێك دەهێنن.

ئەم پەیامانە بە ڕوونی ئەو بیر و باوەڕانەیان لێکداوەتەوە و ڕوونیان کردوونەتەوە کە تایبەتن بە ئایین و ئیمان بە خوا و بە پێغەمبەر ﷺ و بە قورئان و بە ڕۆژی دوایی، هاودەم لەگەڵ هێنانەوەی نموونە لەسەریان و، چەند تێڕوانینێکی وردی زانستی و، هەندێ ئامۆژگاریی ڕەوشتی کە ئاراستەی پیران و لاوان کراون و، هێنانی چەند ڕووداوێکی پڕ لە پەند و عیبرەت کە لە ژیاندا بەسەری هاتوون و، باسی چەند شتێکی سوودبەخش بۆ خەڵکی و کاسبکاران..

ئنجا نووسەر لە هەموو ئەم پەیامانەدا بە هیچ جۆرێك لە "ئیخلاس" و "لێبڕان" و "زانست" لای نەداوە و، هەرگیز شتێکی پێچەوانەی بناغەکانی ئایینی نەوتووە.

هەروەك زۆر روون و ئاشكرایە كە ئەم پەیامانە شتێكی ئەوتۆیان تێدا نییە كە رێسای وڵات بشێوێنێت و، بە پێكهێنانی "كۆمەڵە"كان ئایین بەكار بهێنێت و بیقۆزێتەوە.

● ئەو نامە ئاساییانەش كە لە نێوان سەعید نوورسی و قوتابیانیدا بۆ یەكتری نووسراون، ئەوانیش هەر لەم جۆرەن:

١ - سەعیدی نوورسی دەڵێت: ئەو ناوبانگەی كە لە ئەستەمبووڵ بە دەستی هێنا لە راستیدا خەوێكی قووڵ و دێوەزمەیەكی كاتی و بێ ئاگاییەكی رێبوارانە بوو. هەروەها لە ماوەی دوو ساڵی مانەوەیدا لە ئەستەمبووڵ لە رێی "ژیری"ی خۆیەوە رۆشتووەتە ناو سیاسەتەوە و، ئەمەشی لە شێوەی مردنی دنیادا باس كردووە. هەر بەم بۆنەیەشەوە دوو كەسایەتیی جیاوازی خۆی لە یەك جیا دەكاتەوە كە ناویان دەنێت "سەعیدی كۆن" و "سەعیدی نوێ". هەروەها ئەوەش دەڵێت كە دابەزین بۆ كاروباری سیاسەت، هەڵەیە.

٢ - لە بەشی موناجاتی گرنگترین كتێبەكانی سەعیدی نوورسیدا كە ناوی "الحجة البالغة"یە ئەمەی خوارەوەی تێدایە:

ئەم دنیایە "براوە"یە و، گرنگترین خواستیش تیایدا بەدەستهێنانی جیهانی "نەبراوە"یە. خۆ ئەگەر باوەڕی مرۆڤ راست و دروست نەبێت ئەوا كێشە و دەعواكەی دەدۆڕێنێت. بەڵێ، خواستی راستەقینە هەر ئەمەیە و، بایەخدانیش بە هەر شتێكی دەرەوەی ئەم خواستە گەمە و كات بەزایە دانە. كەواتە ئەو كەسەی كە بە كاروباری سیاسەتەوە سەرقاڵ دەبێت، لە راپەڕاندنی گەلێ ئەركی گرنگی سەرشانی دوا دەكەوێت و، لە ئەنجامی شەوق و حەز كردنیشی لە ململانێ سیاسییەكان سەلامەتیی دڵی خۆی لەدەست دەدات.

٣ - هەروەها لە بریسكەی بیست و شەشەمیشدا لەوە دوواوە كە:

ئەركی راستەقینەی سەرشانی لەم دنیا پیربووەدا، تەنها بڵاوكردنەوەی نهێنییەكانی قورئانە و، دەڵێت: من لە رووی هەست و نەستی غیرەتی

ئیسلامی‌یەوە پەیوەندیم بەم وڵاتەوە هەیە، دەنا خانەولانەیەك، تەنانەت ماڵ و مناڵیشم نی‌یە.

٤ - لە بریسکەی بیست و یەکەم و دەستووری یەکەمی ئەو ئامۆژگاری‌یانەدا کە ئاراستەی برایانی خۆی کردووە، دەڵێت:

ئەم دەستوورە بریتی‌یە لەوەی کە لە کارەکانتاندا تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورەتان مەبەست بێت. چونکە نابێت ئەو کارانە سوودی ماددی‌یان پێ بەدەست بهێنرێت.

هەروەها دەڵێت:

من سۆفی نیم و ڕێبازەکەشمان تەریقەتی سۆفی نی‌یە و، حەزکردنیش لە پلەوپایە و، سەرنج ڕاکێشانی خەڵکییش بۆ لای نەفس و زات نەخۆشی‌یەکی ڕۆحی‌یە و، ناوی دەنێت "شیرکی پەنهان".

هەروەها دەڵێت:

گەر ڕێبازەکەمان "شێخایەتی" بوایە ئەوا یەك مەقام لە گۆڕێدا دەبوو، پاڵێوراوانیش ژمارەیان زۆر دەبوو. لە ڕاستیدا ڕێبازمان "برایەتی‌یە" و، هیچ برایەك خۆی ناخاتە پلەی باوك و سیفەتی مورشیدەوە سەبارەت بە براکەی خۆی.

* * *

(گفتوگۆیەك لەگەڵ دەروونی خۆمدا)

ئەم گفتوگۆیەی کە لەگەڵ دەروونی خۆمدا کردوومە، دەیخەمە بەر دیدی ئێوە، تاکو - دوای ڕاستکردنەوە و هەڵەگیریی پێویست - بیدەن بە گوێی بەرپرسانی ئەنقەرەدا.

ئەگەر "حاکم" و "موددەعی" هەر یەك کەس بن، دەبێ سکاڵا بۆ لای کێ ببرێت؟! زۆر لە مێژە سەرم لەم کێشەیە سووڕماوە!

بەڵێ، حاڵی ئێستام کە لە بەندیخانە بەردراوم و چاودێریم لەسەر دانراوە، زۆر بەلامەوە دژوارترە لەو ڕۆژگارانەی کە لە بەندیخانەدا بووم! چونکە تەنها یەك

ڕۆژی ئەم جۆرە ژیانە لە مانگێکی تەواوەتیی ئەو زیندانە تاکەکەسی‌یە زیاتر ئـازارم دەدات..

ئەوەتا سەرباری پیری و لاوازیم، لەم زستانە سەختەدا هەموو شتێکم لـێ قەدەغە کراوە و، مەگەر منالێك یان کەسێکی نەخۆش دەنا چاوم بە هیچ کەسێك ناکەوێت، جگە لەوەی کە وا ماوەی بیست ساڵیشە بە بەندی و زیندانی تاکەکەسی دووچار و گیرۆدە کراوم.

تەنگ پێ هەڵچنین و چاودێری دانانی زیاتریان لەسەرم و دابڕ کردنم لە خەڵکی، زیاد لەم ڕادەیە، غیرەتی خوای گەورە دەورووژێنێت و، ئەنجامەکەشی ترسناك دەبێت!

من دەڵێم:

گرنگترین ئەرکی ئەم حکوومەتە - بە کاربەدەستانی داد و بەرپرسانی ئاسایشیەوە - کە ڕەفتارێکی مرۆڤانە و بەویژدانم لەگەڵ دەنوێنن، بریتی‌یە لەوەی بە تەواوی پارێزگاریم لـێ بکات. چونکە حکوومەت و سێ "دادگای عەدلی" دوای لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەیان بۆ ماوەی نۆ مانگ لەسەر ئەو کتێب و نامانەم کە لە ماوەی بیست ساڵدا نووسیومن و دامناون، بڕیاری بێ تاوانی و ئازادی‌یان بۆ دەرکردین..

بەڵام ئەو ڕێکخراوە نهێنی‌یەی کە بە دزی و پەنامەکی هەوڵ و تەقالا بۆ خزمەتی بیانی‌یەکان دەدات، دوودلـی و گومانی خستووەتە دڵی هەندێ لە کارمەندان و دەنکە گەنمێکی لە بەرچاویاندا هێندەی گومەزێك بە گەورە پیشان داوە، بۆ ئەوەی ئازادبوونەکەمان لـێ تێك بدەن. ئامانجیشیان لەمەدا ئەوەیە کە ئارامم لـێ ببڕێت و بڵێم: "بەسە.. بەسە"!

هۆکاری ڕق و تووڕەیی ئێستایان لە من: بێ دەنگیم و خۆهەڵنەقورتاندنمە لە کاروباری دنیا! وەك بڵێی دەیانەوێت خۆم لەو کاروبارانەدا هەڵبقورتێنم، تاکو ئامانجەکەیان بۆ بێتەدی!

وا هەندێ لەو فێڵانەی ئەوانتان بۆ ڕوون دەکەمەوە کە بە مەبەستی وورووژاندنی شك و گومان لە دڵی هەندێ کارمەندی حکوومەتدا بەکاری دەهێنن. چونکە پێیان دەڵێن:

(سەعید لە ناوەندە گشتییەکاندا قسەی دەڕوات و، کتێبەکانیشی زۆرن و، کاریگەریی لەڕادەبەدەریان لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا هەیە. ئەوەتا هەرکەسێك لێی نزیك دەبێتەوە، دەبێت بە هاوڕێی. کەواتە دەبێ ئەم توانا و دەسەڵاتەی بشکێنین و، لەم پێناوەدا لە هەموو شتێك دایبڕین و، سووکایەتیی پێ بکەین و، بایەخی پێ نەدەین و، خەڵکیی لێ دوور بخەینەوە و، خۆشەویستانیشی بترسێنین)!

بەم جۆرە، حکوومەت لەمەدا سەرسام ماوە و، لە تاوا زیاتر گوشارم دەخاتەسەر!

منیش دەڵێم:

ئەی ئەو برایانەی کە ئەم وڵات و نەتەوەیەتان خۆش دەوێت!

بەڵێ ڕاستە، قسە ڕۆیشتن و کاریگەرییەك لە ئارادا هەیە، وەك ئەوەی کە مونافیقان لێی دەدوێن. بەڵام دڵنیا بن کە هی من نییە، بەڵکو هی پەیامەکانی نوورە! چونکە پەیامەکانی نوور ڕووناکییەکن هەرگیز ناکوژێنەوە و، هەر شتێك توخنیان کەوتبێت و هەرکاتێك دەست درێژییان کرابێتە سەر هێزی پەیامەکانی پتر پێ زیاد بووە! هەروەك جگە لە بەرژەوەندییەکانی وڵات و نەتەوە بۆ هیچ شتێکی تر بەکار نەهێنراون و بەکاریش ناهێنرێن.

وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی دەساڵی ڕەبەقی دوو دادگای عەدلی لەسەر ئەو پەیامانەی کە لە ماوەی بیست ساڵدا نووسیومن، نەیتوانی هیچ بیانوویەکی ڕاستەقینە بۆ تاوانبار کردنمان بە دەستەوە بدات. ئەمەش بەڵگەیەکی بێ خەوش و شایەتێکی ڕاستە لەسەر دەعواکەمان.

بەڵێ، ئەو کتێبانە کاریگەرییەکی لەڕادەبەدەریان هەیە، بەڵام بۆ بەرژەوەندی و سوودی وڵات و نەتەوە. ئەمەش لەوەدا دەبینرێت کە ڕێنمایی سەد هەزار کەسیان بۆ ئیمانی تەحقیقی کردووە، بێ ئەوەی هیچ خراپەیەکیان بەرامبەر بە هیچ کەسێك

لـێ وەشـابێتەوە. کەواتـە کاریگـەریی ئـەم پەیامانـە لـە هـەوڵ و تەقالایاندایـە بـۆ هێنانەدیی بەختەوەریی دنیا و ژیانی هەتاهەتایی ئەودنیای ئەم خەڵکە.

سـەدان بـەندکراوی حوکـم لەسـەردراو لـە بەندیخانـەی "دەنـیزلی"دا - کـە هەندێکیان بڕیـاری سزای سەختیان لەسەر دەرچووبوو - دوای ئەوەی کە هەر تەنها پەیامی "بـەری درەختی ئیمـان"یـان خوێنـدەوە، بوون بە ئـاییندار و خـاوەن ڕەوشتی بەرز. تەنانەت ئەوانـەش کـە قـاتڵ بوون و سێ کەسیان کوشتبوو، دوای خوێندنەوەی ئەو پەیامە، دەسـتیان لـە کوشتنی مێشـوولەی نـاو جێگەکـەی خۆیـان دەگێڕایەوە! ئەم دیاردەیەش بەڕێوەبەری بەندیخانەی ناچار کرد دان بەوەدا بنێت کە بەندیخانەکـە وەك قوتابخانەیـەکی پـەروەردەیی لـێ هـاتووە!! هـەموو ئەمانـەش بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر ڕاستیی دەعواکەمان.

بەڵێ، دوای ڕوون بوونـەوەی هـەموو ئەمانـە، ئیتر دامـاڵین و بێبەش کـردنم لـە هەموو مافە مرۆییـەکانم لـە ڕاستیدا ستەم و سزایەکی دووچەندانەیە و، لـە هـەمان کـاتدا غـەدر و خیانەتێکیشـە لـەم نەتەوەیەی کە هەرچەند نزیکەی چل سـاڵ لـە ناویـاندا مامـەوە بـەڵام کەسیان هیـچ زیانێکیـان لـە منـەوە تـووش نـەبوو. چونکـە بەڵگـەی گومـانبڕ لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەم نەتـەوە ئـاییندارە پێویسـتی بـە هـێزێکی مەعنەوی و دڵدانەوەیەکی مـەزن هەیـە، ئەوەیـە کـە ئـاوڕ لـەو پروپاگـەندە چەپـەڵ و ڕقاوییانە نادەنەوە کە لە دژی من دەخرێنە ناوەندەکانـەوە. بـەڵکو ئـەم نەتەوەیـە لـە هـەموو شـوێنێکدا بـە حـەز و تاسـە و شـەوقەوە ڕوو دەکەنـە پەیامـەکانی نـوور و، تەنانەت هێندە ڕێزم لێ دەگرن کە لە شایستەیی خۆم سەد جـار زیـاترە و خـۆم بـە شایانی ئەو ڕێزەیان نازانم.

بیستوومە کە بەرپرسانی دەوڵەت ڕاییکردنی ژیان و گوزەرانی دنیایی منیان بـە حکوومەتی ئـەم ناوچەیـە سپاردووە. مـن هاوکـات لەگـەڵ دەربڕینـی سـوپاسمدا بـۆ ئەوان لەسەر ئەم هەڵوێستەیان، ئەوەشیان پێ ڕادەگەیەنم کە:

سەربەست کردنم لـە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشـانم، لـە هـەموو شتێك بەلامـەوە گرنگـترە. چونکـە یەکـەم پایـەی دەسـتووری ژیـانم "سەربەسـتی"یـە. بـەڵام

لێ‌سەندنەوەی ئازادیم بە بڕوبیانووی گومانی درۆینە، یان بەستنەوەی بە کۆت و زنجیرەکانی ستەم و ناڕەوایی، هانم دەدات کە بە تەواوی ژیانم لە بەرچاودا بێزرێت، بە ڕادەیەك کە نەك هەر تەنها زیندان و بەندی، بەڵکو گۆڕیشم لەم حاڵە گەلێ پێ باشتر بێت. ئەو شتەی کە ورەم پێ دەبەخشێت و بۆ ئارامی و خۆڕاگرتن هانم دەدات تەنها ئەو پاداشتەیە کە بە ئەندازەی ڕادەی ماندووبوون لە پێناوی خزمەتی ئیماندا، بە مرۆڤ دەبەخشرێت.

ئەوانەی کە نایانەوێت ستەمم لێ بکەن، دەبێ لە پێش هەموو شتێکدا ئازادی و سەربەستیی خۆمم بۆ بگێڕنەوە و، بە هیچ نیازێکی خراپ دەستی بۆ نەبەن. چونکە من دەتوانم بە بێ "خواردن" بژیم، بەڵام ناتوانم بە بێ "ئازادی" ژیان بەسەر بەرم!

بەڵێ، ئەو کەسەی کە بە درێژایی نۆزدە ساڵ بە بڕی دوو سەد لیرەی تورکی - نەك زیاتر - ژیاوە و، ئەوپەڕی دەست پێوەگرتن و وەرزشی ڕۆحیی توندوتیژی ئەنجام داوە، تاکو سەربەستی و عیززەتی زانستیی خۆی بپارێزێت، بێ ئەوەی خۆی لە قەرەی زەلیلیی سواڵ و وەرگرتنی سەدەقە و زەکات و مووچە و دیارییەکان بدات.. بێ گومان ئەو کەسە، ئەمڕۆ زیاتر پێویستی بە ئازادی هەیە لە چوارچێوەی دادگەریدا، تا ژیاندن و بەڕێ کردنی گوزەرانی!

وا لە بریی تەنها "دە" کەس کە ڕێمان لێ دەگیرێت یەکتر ببینین، دەیان هەزار بەڵکو سەدان هەزار موسڵمان هەن، کە بێ ئەوەی بایەخ بە هیچ جۆرە بەربەست و تەگەرەیەك بدەن، بۆ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی پەیامەکانی نوور لێ دەبڕێن! هەموو یەکێکی ئەو هەزاران نوسخانەی پەیامەکانی نووریش کە لە سەرانسەری وڵات و جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەتەوە، جێی من - بەڵکو لە من باشتریش - دەگرنەوە لە قسە و گوفتار و ڕوونکردنەوەدا، لەبەر ئەو ڕاستییە توندتۆڵ و سوودە زۆرانەی کە تیایاندایە. کەواتە بە بێ دەنگ بوونی من هەرگیز پەیامەکان بێ دەنگ نابن، تەنانەت هیچ هێزێك ناتوانێت لە دەنگ و گوفتاریان بخات!

* * *

(گفتوگۆیەك لەگەڵ وەزیری داد و ئەو دادوەرانەدا کە پەیوەندییان بە پەیامەکانی نوورەوە هەیە)

بەڕێزان!

بۆچی بەبێ هیچ پێویستی و هۆیەك خۆتان بە ئێمە و پەیامەکانی نوورەوە سەرقاڵ دەکەن؟

وا من بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەمەی خوارەوەتان پێ ڕادەگەیەنم:

نە من و نە پەیامەکانی نوور هیچ کاممان ململانێتان لەگەڵدا ناکەین، بەڵکو هەر بیریشتان لێ ناکەینەوە. تەنانەت ئەمە بە کارێکی بەدەر لە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دادەنێین. چونکە پەیامەکانی نوور و قوتابییە ڕاستەقینەکانی خزمەتێکی مەزن پێشکەش بە نەوەی داهاتوو دەکەن کە لە دوای پەنجا ساڵ دێن! هەروەها بۆ پاراستنی ئەوان لە گێروگرفتێکی گەورە و، دەرباز کردنی وڵات و نەتەوەش لە مەترسییەکی سامناك هەوڵ دەدەن..

کەواتە ئەو کەسەی ئێستا خۆی بە ئێمەوە سەرقاڵ دەکات، ئەو کاتە لەناو گۆڕەکەیدا ڕزیوە و جەستەی بووەتەوە بە خاك! تەنانەت گەر وا دابنرێت ئەم کارەی ئێمە - کە بۆ هێنانەدیی بەختەوەری و ئارامییە - زۆران و ململانێ بێت لەگەڵ ئێوەدا، ئەوا نابێ ئەو کەسانە بگرێتەوە کە ئەو کاتە گڵی ناو گۆڕ دەبن!

ئەو بایەخ پێنەدانە کەمەی کە ئەندامانی ئیتیحاد و تەرەقی لە بەرامبەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایین و ڕەوشتە نەتەوەییەکانەوە نواندیان، دوای نزیکەی سی ساڵ بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ئەم بارودۆخانەی ئێستای لەمەڕ ئایین و ڕەوشت و شەرەف و داوێنپاکی. بێ گومان ئەنجامی ئەم بارودۆخانەی ئێستاش دوای پەنجا ساڵ بەسەر نەوەی داهاتووی ئەم نەتەوە قارەمانە ئاییندارە بە شەرەف و غیرەتەوە دەردەکەون! خۆ ئەو ڕەوشت و ڕەفتارە ئایینی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتییە هەرگیز لای ئێوە شارراوە نییە کە دوای پەنجا ساڵ لەناو ئەم نەتەوەیەدا سەرهەڵدەدەن! چونکە بەشێك لە نەوەی داهاتوو بە چەند پەڵەیەکی ترسناك ڕابوردووی زێڕینی

هەزار ساڵەی ئەم نەتەوە گیانفیدایە چەپەڵ دەکات و، لەوانەشە هەر بە تەواوی - دوای پەنجا ساڵ - ئەو ڕابوردووە بسڕێتەوە!

لەبەر ئەوە، باشترین خزمەت بەم نەتەوە و نیشتمانە پاراستنی بەشێکی نەوەی داهاتووە لەو نوشوستی‌یە ترسناك و چاوەڕوان کراوە، ئەویش لە ڕێی ئەو ڕاستی‌یانەی کە پەیامەکانی نوور ڕوونیان کردوونەتەوە. کەواتە ئێمە ڕووی گوفتارمان لە مرۆڤی ئەم زەمان و ڕۆژگارە نی‌یە، بەڵکو لە مرۆڤی ئەو ڕۆژگارەیە!

بەڵێ بەڕێزان! هەرچەند "پەیامەکانی نوور" تەنها دەڕواننە ئەودنیا و، ئاوڕ لە شتی تر نادەنەوە و، جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە و ڕزگار کردنی ئیمان هیچ ئامانجێکی تریان نی‌یە و، قوتابیانیشی تەنها بۆ پاراستنی خۆیان و هاوولاتییانیان لە ئیعدامی هەمیشەیی و بەندیخانەی تاکەکەسیی هەتاهەتایی تێدەکۆشن.. کەچی لە هەمان کاتیشدا خزمەتەکەیان هێندە مەزنە کە سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دنیایە و، وڵات و نەتەوەش لە ئاژاوەکان و نەوەی داهاتووش لە کەلبە و چڕنووکی گومڕایی ڕەها ڕزگار دەکەن. چونکە موسڵمان لە کەسی تر ناچێت! ئەوەتا گەر ئایین لە ئەستۆی خۆی داماڵێت، جگە لە گومڕاییەکی ڕەها هیچی تر لە بەردەم خۆیدا نابینێتەوە و، دەبێت بە کەسێکی تۆقێنەری ئاژاوەچی و، هەرگیز بە ڕێسا و بەڕێوەبردن بەرەو گوێڕایەڵی و ملکەچی نادرێتەبەر!

بەڵێ، لە کاتێکدا کە دەبینین لە سەدا پەنجای ئەوانەی لەسەر پەروەردەی کۆن پێگەیشتبوون، بایەخ بە نەریتە میللی و ئیسلامی‌یەکان نادەن.. بە دڵنیاییەوە پەنجا ساڵ دوای ئێستا لە سەدا نەوەدیان، بە هاندەری دەروونی بەدخوازی خۆیان، ئەم نیشتمان و نەتەوەیە بەرەو بەربادی و ئاژاوەیەکی هەمەلایەنە دەدەنە بەر. بێ گومان هەر تەنها بیرکردنەوەم لەم بەڵا و گیروگرفتە مەزنە و دۆزینەوەی هۆکارەکانی بەرەودوابردن و چارەسەرکردنیان، بیست ساڵ پێش ئێستا دەستی منیان بە تەواوی لە سیاسەت داتەکاند و، هانیان دام خۆم بە خەڵکی ئەم کات و ڕۆژگارەوە سەرقاڵ نەکەم! هەروەك لەبەر ئەم هۆکارانە بوو کە پەیامەکانی نوور و قوتابیانیشی

پەیوەندی‌یان بە کێشە و ملململانێکانی ئەم ڕۆژگارەوە پچڕی و، ململانێیان لەگەڵدا ناکەن و پێیانەوە سەرقاڵ نابن.

مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئەوا یەکەم ئەرکی سەرشانی "دەزگای دادگەری" تاوانبار کردنی من و قوتابیانی نوور نی‌یە، بەڵکو پاراستنی پەیامەکانی نوور و قوتابیانیەتی لە هەموو دەستدرێژی‌یەك. لەبەر ئەوەی پەیام و قوتابیانی نوور پارێزگاریی گەورەترین مافی وڵات و نەتەوەیان لە ئەستۆ گرتووە.

لە ڕاستیدا هەر دوژمنە ڕاستەقینەکانی ئەم وڵات و نەتەوەیەن کە هێرش بۆ سەر پەیامەکانی نوور دەبەن و، دوای ئەوەی کە دەزگای دادگەری دەخەڵەتێنن، هانیشیان دەدەن تاکو ناشیرینترین ستەم و تاوانیان پێ ئەنجام بدەن.

وا دوو نموونەی بچووکتان دەخەمە بەر چاو:

یەکەم:

نامەی هاوڕێیەکە لە بەندیخانەدا کە هەواڵ پرسینی تێدایە و، دە "بەنکەنووت"یشی[1] لەگەڵدایە کە نرخی نامیلکەیەکی عەرەبیی منە تاکو بدرێت بەو کەسەی ئەرکی چاپەکەی لە ئیسپارتە لە ئەستۆ گرتووە. کەچی حکوومەت و فەرمانگەکانی داد لە ئەنجامی ئەم نامەیەوە تەنگیان پێ هەڵچنیم و ماڵی ئەو کەسەشیان پشکنی کە بوو بەهۆی چاپ کردنی ئەو پەیامە..

جا بە گەورە گرتنی مەسەلەی ئەم نامەیە و بایەخ پێدانی - کە لە ڕاستیدا شایانی ئەندازەی باڵە مێشێك بایەخ پێدان نی‌یە - کە تاقە نامەیەکە لە ماوەی شەش مانگدا نێرراوە و، بە هەند وەرگرتنی.. بێ گومان ئەم کارە، شایانی شەرەف و کەرامەتی "دەزگای داد" نی‌یە.

نموونەی دووهەم:

ترساندنی خەڵکی لە کەسی منی میوان و لاواز و پیر و نامۆ کە هەموو دادگاکان بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکردووم، تەنانەت ترساندنی ئەو کەسانەش

---

(١) بەنکەنووت: لە تورکیا بە پارەی وەرەقی دەڵێن. (وەرگێڕ)

کە لە کاروبارە تایبەتی‌یەکانمدا یارمەتیم دەدەن، بە پڕوپاگەندەی چەپەڵ و بە شێوەیەکی ڕەسمی. پاشان دووچار کردنم بە حاڵەتێکی ئازار بەخش، هەرگیز ئەم چەشنە ڕەفتارە شایانی غیرەتی نەتەوایەتیی حکوومەتی ئەم پارێزگایە نی‌یە.

بەڵێ، بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ڕقاوی و چەپەڵ و، ترس هاویشتنە دڵی خەڵکی و، پیشاندانی زیانێکی وەهمیی هیچ و پووچ لە شێوەی زیانێکی ڕاستەقینەی گەورەدا و، پرسینی بەردەوامی ئەوەی کە ئایا چاوی بە کێ دەکەوێت؟ کێ سەری لێ دەدات؟ هەروەها پرسیارەکانی تری هاوشێوەی ئەمانە.. بێ گومان دەبێت دانایی و فەرمانڕەوایەتیی حکوومەت دانەبەزێتە ئاستی ئەم حاڵەتە سەیرەوە.

بە هەرحاڵ.. زۆر بابەت هەن - وەك ئەم دوو نموونەیە - کەسانی ئاگادار لێیان دەخەنە سەرسامی‌یەوە.

بەڕێزان!

گومڕایی و فەساد گەر لە نەزانی‌یەوە سەریان هەڵدابێت لەناوبردن و چارەسەرکردنیان ئاسانە، بەڵام زۆر دژوارە چارەسەر بکرێن ئەگەر لەسەر بناغەی زانینەوە هاتبن و دامەزرابن!

جا "گومڕایی" ئەم ڕۆژگارە لە "زانین"ەوەیە. بۆیە هەرکەسێکی نەوەی داهاتوو پێوەی گیرۆدە ببێت، مەگەر بە نووسراوێکی پڕ بایەخی وەك "پەیامەکانی نوور" دەنا ئەو گومڕاییە لا نابرێت و ئەو کەسەش لە دەستی ڕزگاری نابێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە پەیامەکانی نوور خاوەنی ئەم نرخ و بەهایەن، ئەوەیە کە:

ماوەی بیست ساڵە هیچ کام لە نەیارە سەرسەختە زۆرەکانم و هیچ کەسێکیش لە فەیلەسووفە ملنەدەر و ئینکارەکان نەیانتوانیوە و ناشتوانن بەرەنگاری پەیامەکانی نوور ببنەوە، یان زامداریان بکەن.. هەروەها سێ فەرمانگەی داد و کارشناسەکانی مەڵبەندی حکوومەت دوای نۆ مانگی ڕەبەقی پشکنین و گەڕان بە

ناو سەد كتێبدا، ماددەیەكیان نەدۆزیەوە پێی تاوانبار ببین.. هەروەها ئەم پەیامانە قەناعەتی تەواو بە هەزاران قوتابیی وردەكاری خۆیان سەبارەت بە ڕاستییەكانیان دەبەخشن.

بەڵێ.. دوو دادگا و، مەڵبەندی حكوومەت و، ئەفسەرانی ئاسایشی چەند پارێزگایەك و، دادگای دەنیزلی، لە ماوەی دە ساڵدا هیچ ماددەیەكیان لە پەیامە تایبەتی و گشتییەكاندا نەدۆزییەوە كە سزامان بەسەردا بسەپێنێت و زیان بە نەتەوە و نیشتمان بگەیەنێت. ئەمەش دەیسەلمێنێت كە پەیامەكانی نوور چەند "ماف"ێكی گەورە و گشتی و هەمەكییان لەم نیشتمانەدا هەیە.

جا لەبەر ئەوەی ئەركی سەرشانی فەرمانگەكانی "داد" بریتییە لە پارێزگاریی "مافەكان" و بوارنەدان بە دەستدرێژی و سنوور شكاندن، ئەوا پشتگوێ خستنی ئەم مافە گرنگانە و دەست بەسەردا گرتنی پەیامەكان بە وێنەی كاغەزی ئاسایی و زەوت كردنی مافی نەتەوە و ئەو كەسانەش كە پێویستیان بە ڕزگاریی ئیمانە، هاودەم لەگەڵ گرنگی و بایەخدان بە مافی كەسی ئاسایی.. دوای ئەوەی كە خزمەتی پەیامەكانی نوور لە پێناوی بەختەوەریی سەد هەزار كەس لە ماوەی بیست ساڵدا، سەلما..

ئەوا من یادتان دەخەمەوە كە ئەم كارە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ناوەرۆكی دەزگای داد و ڕاستیی دادگەریدا ناگونجێت.

ئێمە دەترسین لەوەی كە دەستدرێژی بۆ سەر پەیامەكانی نوور و، گوێ نەدان بە كتێبە زۆرەكانی زەندیقانی وەك دكتۆر "دوزی" ببێت بە هۆیەك بۆ داباریینی غەزەبی خوای گەورە!

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە كە ویژدان و میهرەبانی بە ئێوە و، ئارامی و خۆڕاگریش بە ئێمە ببەخشێت.

سەعیدی نوورسی
بەندكراو بە شێوەیەكی ناڕەسمی
لە زیندانی تاكەكەسیدا

(پرس و ڕایەك)

باسمه سبحانه

بە مەبەستی شوێنکەوتنی ئەم فەرمانە خواییەی کە دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ (آل‌عمران) بە پێویستی دەزانم پرس و ڕا بە برایانم بکەم.

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

من ئێستا لە بەردەم واقیعێکی دژواردام. چونکە کاربەدەستان فەرمانیان داوە بڕی دوو بەنکەنووت و نیو پارە بۆ خەرجیی ژیانی ڕۆژانەم تەرخان بکرێت، لەگەڵ خانوویەکدا بە کەل و پەل و ناوماڵی پێویستەوە بەو شێوەیەی کە خۆم بمەوێت.. کەچی ئەو دەستوورەی ژیانم، کە نزیکەی شەست ساڵە لەسەری ڕۆشتووم، داخوازی ئەوەیە شتی وا قبووڵ نەکەم. چونکە نزیکەی دوو ساڵ نەبێت کە لە "دار الحكمة الإسلامية"دا ئەندام بووم، دەنا هیچ مووچەیەکم وەرنەگرتووە، کە ئەویشم بۆ لە چاپدانی کتێبەکانم و پاشان دابەش کردنیان بەسەر خەڵکیدا - بە خۆڕایی - خەرج کردووە و، لەم ڕێیەوە داومەتەوە بە خۆیان.

بەڵام گەر ئێستا ئەم بڕە پارەیە بە ناچاری وەربگرم، لەبەر ئەوەیە کە ئێوە و پەیامەکانی نوور زیانتان پێ نەگات، بە مەرجێ لە ئایندەدا ئەو پارەیە بدەمەوە بە خەڵکی و، مەگەر کەمێکی نەبێت بە ئەندازەی "زەرروورەت"ی ناچاری و بێ گومان، دەنا هیچی لێ خەرج نەکەم.

بیستووشمە کە ئەگەر دەست بە ڕووی ئەمەوە بنێم، ئەوا ئەو کەسانە دڵگران دەبن کە لە بەرژەوەندیی ئێمە بە تایبەت بۆ ژیان و گوزەرانی من هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن، لە هەمان کاتدا نەیارەکانیش دەڵێن: کەواتە گوزەرانی ئەم کەسە لە شوێنێکی ترەوە دابین دەبێت! دەسا بزانن کە چەندە ئەوانە لە بەرەکەتی گەورەی "دەستپێوەگرتن" بێ ئاگا و نەشارەزان! چونکە نەیان بینیوە کە کولێرەیەکی پێنج قورشی بەشی دوو ڕۆژم دەکات!

بەڵام گەر قبووڵیشی بکەم ئەوا حەفتا ساڵی تەمەنی ڕابوردووم لێم بێزار دەبن، سەرباری دڵگران بوونی ئیمامی عەلیش - خوای لێ ڕازی بێت - کە ڕای گەیاندووە: زانا خراپکارەکانی ئەم ڕۆژگارە ئەوانەن لە پێناوی تێرکردنی ئارەزووەکانیاندا و لەبەر تەماعی مووچە وەرگرتن، خۆیان دووچاری گوناهباری دەکەن و بە بیدعەتەکانەوە دەگلێن و چەپەڵ دەبن!

جگە لەمە، لایەنێکی تریش هەیە، کە بریتییە لەوەی ئیخلاسی ڕاستەقینە و خاوێنی "پەیامەکانی نوور" تاوانی بێ ئیخلاسی دەداتە پاڵم.

لەبەر ئەمانە، من ئێستا لەمەدا سەرسام ماوم.

هەروەها بیستووشمە کە ئەگەر وەری نەگرم، گوشارم لەسەر زیاد دەکەن و، لەوانەشە ڕێ لە بڵاوبوونەوەی پەیامەکان بگرن و، بە تەواوی هیچ سەربەستییەکی بۆ نەهێڵنەوە. تەنانەت بۆم دەرکەوتووە کە هەموو ئازار و گوشارێکی ئەوان بەرامبەر بە من بۆ ئەوەیە کە ناچاری قبووڵکردنی ئەم بژێوییەم بکەن.

جا مادەم ئەمە وایە و، لەولاشەوە قاعیدەی شەرعیی "الضرورات تبیح المحظورات" بوارم پێ دەدات لە کاتی ناچاریدا وەری بگرم، ئەوا لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە هیچ زیانێکمان پێ نەگات گەر کار گەیشتە ڕادەی "زەروورەت".

لەگەڵ ئەوەشدا، قبووڵم نەکرد.. وا ئەم کارە بە شوورا و پرس و ڕای ئێوە دەسپێرم.

برا ئازیزەکانم!

هیچ خەمی منتان نەبێت. چونکە لە هەموو کارێکی سەختدا ئاسەوارێکی میهرەبانی و بریسکەیەکی چاودێریی خواوەند بە ئاشکرا دەبینم. کەواتە دڵتەنگ مەبن، چونکە کۆشش و هیممەت و یارمەتیی ئێوە بۆ من هەموو تەنگانەیەك لا دەبات و هەمیشە خۆشی و شادمانی بڵاو دەکاتەوە.

* * *

(ئێمە لە ژێر چاودێریی پەروەردگاردایین)

برایانم!

هەرگیز نیگەران مەبن. چونکە قەناعەتی تەواوم بۆ پەیدا بووە کە ئێمە لە ژێر چاودێریی پەروەردگاردایین و، بە ویستێکی غەیبیی سەرووی ویست و ئیختیار و توانای خۆمان لە کارێکی مەزنی تابلێی گەورە و بایەخداردا دەخرێینە کار و، گەلێ جار نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەمان دەست دەکەوێت کە دەفەرموێت:

﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة:٢١٦).

بەڵێ، هەرچەند کارەکەمان ماندووبوونێکی کەمی تێدایە، کەچی پاداشتەکەی یەکجار زۆرە.

* * *

(هەرچییەکتان لەدەست دێت دریغیی لێ مەکەن)!

کاتێ کە بەروبوومە فیردەوسی و یووسفییەکانی قارەمانانم پاکژ و بژار دەکرد، پەیامی "بەری درەختی ئیمان" لە ناویاندا سەرنجی ڕاکێشام. چونکە لەو کاتەدا گرنگییەکەیم لێ دەرکەوت. ئیتر بە دەنگی بەرز وتم:

(گیروگرفت و ماندووبوونەکانی بەندیخانە گەر سەد هێندەش زیاد بن، هەر ئەم پەیامە لەوان زیاتر کاری خۆی ئەنجام داوە. چونکە ئەم پەیامە بوو بە هۆی ئەوەی کە لە ناوەندە گشتییەکاندا بیخوێننەوە، تەنانەت سەرسەختەکانیش بەرەو ئیمان بداتە بەر.

دەسا ئەی ئەو بەدبەختانەی کە هەمیشە گوشار دەخەنە سەرم!

هەرچیتان لەدەست دێت و چ ڕەفتارێکتان لێ دەوەشێتەوە دریغیی لێ مەکەن، چونکە هەر هەوڵێك بدەن هێشتا هیچ نرخێکی نییە و، هەرچی گرفتێکیش بێتە ڕێمان بە شتێکی سووك و ئاسانی دەزانین، تەنانەت بە چاودێری و میهرەبانییەکی بێگەردی خوای گەورەی دادەنێین).

ئەمەم وت و، دڵنەوایی تەواوم تێدا بەدەست هێنا.
سڵاومان بە هەموو قوتابیانی نوور بگەیەنن و، دوعای سەلامەتی‌یان بۆ دەکەین.
سەعیدی نوورسی

* * *

(ئێمە بەربەستێکی قورئانی دادەمەزرێنین)

شوکری لەڕادەبەدەر و نەبڕاوە بۆ خوای گەورە لەسەر ئەوەی حاڵەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە لە پێناوی حەوانەوەی لاوازەکان و لابردنی ئەرك و گرفتی سەرشانیاندا، هەزاران شەرەف و کەرامەتی خۆم بەخت بکەم..

بۆیە بڕیارم دا: گوێ بە هیچ سووکایەتی پێ کردنێکی ئەوان نەدەم و، چاو لە هەموو نیازێکی چەپەڵی دڵ و دەروونیان بپۆشم، لە پێناوی سەقامگیر بوونی ئاسایش و ڕێسا لەم وڵاتەدا، بە تایبەت بۆ حەوانەوەی منداڵانی بێ تاوان و پیرانی بەڕێز و نەخۆش و هەژارە لاوازەکان و لەبەر بەختەوەریی هەردوو دنیایان.

ئێمە بە هەموو هێزێکمانەوە بۆ ئەوە تێدەکۆشین کە لە بەردەم لافاوی ئاژاوە و تۆقاندن و خراپکاریدا بەربەستێکی قورئانیی وەك بەربەستەکەی "زولقەرنەین" دائەمەزرێنین..

کەواتە ئەو کەسانەی دەستدرێژیمان دەکەنە سەر - لە ڕاستیدا - ڕێ بۆ ئاژاوە و شیوعییەت خۆش دەکەن.

بەڵێ، گەر وەك داب و ڕەفتاری پێشووم - بە مەبەستی پاراستنی عیززەتی زانست - بەرپەرچی هەموو سووکایەتی‌یەکم بدایەتەوە..

گەر ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانم تەنها بەند نەبوایە بە کاروباری دواڕۆژەوە و، بە مەبەستی ڕزگار کردنی موسڵمانان نەبوایە لە ئیعدامی هەمیشەیی مردن..

گەر بۆ بەدەستهێنانی شمەکی قەڵبی دنیا هەوڵم بدایە و، بە دوای کاروبارە سەلبی‌یەکانی سیاسەتدا ڕام بکردایە.. ئەوا:

ئەو مونافیقانەی کە لە پێناوی ئاژاوە و تیرۆردا هەوڵ دەدەن، دەبوون بەهۆی سەرهەڵدانی دەیان ڕووداوی وەك ڕووداوەکەی "مەنمەن"[١] و بەسەرهاتی "شێخ سەعید"[٢].

بەڵام کەسێکی وەك من - سوپاسی بێ پایان بۆ خوای گەورە - ئێستا لەسەر لێواری گۆڕەکەیدا ڕاوەستاوە و، پەیوەندیی بە هیچ شتێکی دنیاوە نی‌یە و تەنانەت دوورکەوتووەتەوە لێی و، لە ڕووتێکردن و ڕێزی خەڵکی هەڵهاتووە و، هیچ حەزێکی لە بەدەستهێنانی ناوبانگ و لە خۆڕازی بوون و ڕیاکانی هاوچەشنیان، نەماوە..

ئیتر لەم حاڵەدا هیچ بایەخ و گرنگی‌یەك بۆ ئەو سووکایەتی‌یە نایاساییە نەماوەتەوە کە بەرامبەر "کەس"ی من دەینوێنن.

بۆیە من ئەم ڕەفتارەی ئەوان بە خوای گەورەی بەتوانا دەسپێرم و، تەنها بیر لەوانە دەکەمەوە کە لەسەر بناغەی دوودڵی و گومان ئازاریان دام و، بە ڕاستی بەزەییم بە حاڵیاندا دێتەوە و، دەڵێم:

ئەی پەروەردگارا ئیمانی ئەوانە بەهۆی پەیامەکانی نوورەوە ڕزگار بکە و، بە نهێنیی قورئانیش مردنەکەیان لە "ئیعدامی هەمیشەیی"یەوە بۆ بگۆڕە بە "کارتی ڕایی بوون"یان لە ژیان!

---

(١) ئەم ڕووداوە زیاتر لەوە دەچێت ڕووداوێکی دەست هەڵبەست و ئامادەکراو بوویێت کە لە لایەن حکوومەتی مستەفا کەمالەوە ساز کرایێت. چونکە وا ڕاگەیەنرا کە سەرپێچی‌یەکی ئیسلامی لە مزگەوتێکی ناوچەی "مەنمەن"دا بە سەرۆکایەتیی مرۆڤێکی شێتۆکە سەری هەڵداوە. ئیتر ئەمە کرا بە بیانوویەك و بەوپەڕی توندوتیژی دەست لە خەڵکی شارەکە وەشێنرا و، ڕووداوەکە بۆ لێدانی هەست و شعووری ئیسلامی قۆزرایەوە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست شێخ سەعیدی پیرانە کە شێخێکی کوردی تەریقەتی نەقشبەندی‌یە و باپیریشی خەلیفەی مەولانا خالید بووە. لە سەردەمی "مستەفا کەمال"دا بە هاندەری ئایین سەرکردایەتیی شۆڕشێکی لە کوردستانی باکووردا لە دژی ڕژێمی فەرمانڕەوا گرتە ئەستۆ بەرامبەر بە سیاسەتی دوژمنایەتی کردنی ئایین و ماف خواردن و چەوساندنەوەی میللەتەکەی. لە ١٩٢٥/٢/١دا شۆڕش هەڵگیرسا و لە ١٩٢٥/٤/١٥دا سەرکوت کرا و شێخ سەعید و چل وحەوت کەسی هاوڕێ و کەسوکاری لە ١٩٢٥/٦/٢٩دا لە دیاربەکر بە بڕیاری دادگای شۆڕشی مستەفا کەمال شەهید کران. (وەرگێڕ)

ئەو کاتە منیش لە لایەنی خۆمەوە چاویان لێ دەپۆشم و دەست لە مافی خۆم هەڵدەگرم.

سەعیدی نوورسی

* * *

(بۆچی دوعا گیرا نەبوو)؟

وەڵامی پرسیارێکە - بە ناوی زۆر کەسەوە - یەکێك لەو قوتابیی‌یە بچووکانەی نوور ئاراستەی کردم کە لە کاروبارە کەسی‌یەکانمدا یارمەتیم دەدات.

پرسیار:

مامۆستای بەڕێزم! بۆچی ئەو نوێژ و دوعایە گیرا نەبوون کە بۆ بارانبارین کران، ئەوەبوو چەند جارێك هەورەکان کۆبوونەوە، کەچی پاشان - بێ ئەوەی باران ببارێت - ڕەوینەوە!

وەڵام:

نەبارینی باران "کات"ی ئەم جۆرە دوعا و نوێژەیە و، هەرگیز "عیللەت" و "حیکمەت"یان نی‌یە! چونکە هەروەك نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران لە کاتی گیرانی ڕۆژ و مانگدا ئەنجام دەدرێن و، نوێژی مەغریبیش لە کاتی ئاوابوونی خۆردا دەکرێت، بە هەمان جۆر بێبارانیش "کات"ی خوێندنی نوێژ و دوعای "ئیستیسقا"یە.

ئاشکرایە کە "هۆ"ی پەرستش و پاڕانەوە: فەرمانی خوای گەورەیە بە کردنیان. هەروەك "ئەنجام"ەکەشیان: ڕەزامەندیی خوایە و، سوودەکانیشیان لە دوارۆژدایە..

جا ئەگەر نوێژ و عیبادەت تەنها بە نیازی چەند ئامانجێکی دنیایی ئەنجام بدرێن، ئەوا نوێژ و پەرستشەکە گیرا نابن و قبووڵ ناکرێن. چونکە هەروەك نوێژی شێوان لەبەر خۆرئاوابوون و، نوێژی مانگگیرانیش بۆ دەرکەوتنی مانگ ناکرێن، بە هەمان جۆر نوێژە بارانێش گەر بۆ مەبەستی باران بارین بکرێت کارێکی هەڵە دەبێت، چونکە ئەو بارینە بە فەرمانی خوای گەورەیە و، واجبی ئێمە لە بەرامبەر

خواوەندەوە تەنها بەندایەتی و پاڕانەوە و دوعایە، بێ ئەوەی خۆمان لە کارێکدا هەڵبقورتێنین کە جڵەوەکەی بە دەست خوای گەورە خۆیەوە بێت.

خۆ هەرچەند ئەنجامی ڕواڵەتیی نوێژەبارانێ بریتییە لە باران بارین، کەچی ئەنجامە ئەسڵی و ڕاستەقینە و سوودبەخش و بەروبوومە خۆش و جوانەکانی، بریتییە لەوەی کە:

هەموان هەست بکەن: نە دایك و باوکیان و، نە دوکان و کەسابەتەکەیان، پەروەردەیان ناکات و خۆراکیان پێ نابەخشێت، بەڵکو ئەو کەسە دەیان ژیێنێت و ڕۆزییان دەدات کە هەورە قورسەکان بە کۆڵێ ئاوی زۆرەوە دەنێرێت. تەنانەت منالی بچووکیش بە ژیرییە بچووکەکەی خۆی لەم واتا فراوانە دەگات. چونکە ڕاهاتووە لەسەر ئەوەی کە هەرکات برسیی دەبێت، دەگری و دەپاڕێتەوە!

کەواتە ئەو واتایەی لە نوێژە بارانێدا هەیە، ئەوە دەگەیەنێت کە: ئەو کەسەی بە وێنەی بەڕێوەبردنی خانوویەکی بچووك ئەم دنیا گەورەیەش بەڕێوە دەبات و، خۆراك بۆ منیش و هەموو منالەکان و سەرجەمی خاو و خێزان دابین دەکات و، ڕۆزی بۆ یەك بە یەکمان دەنێرێت، تەنها هەر خوای گەورەیە. کەواتە گەر خواوەند ڕۆزی نەدات، هیچ کەسێك ناتوانێت بیدات و سوود بگەیەنێت. لەبەر ئەوە، دەبێ تەنها لەو بپاڕێینەوە. بەم جۆرە مرۆڤ ئیمانەکەی بەهێز دەبێت.

وا بەم بۆنەیەوە بە پوختی شەش خاڵ ڕوون دەکرێنەوە:

● خاڵی یەکەم:

نرخی نیعمەت و میهرەبانیی خوای گەورە تەنها "شوکرانە بژێری"یە. بەڵام ئێمە مافی ڕەوامان بەم شوکرانە بژێرییە نەدا.. ئنجا هەروەك نرخ و بەهای شوکرانەی ئەم میهرەبانییەی خوای گەورەمان نەدا، بە ستەم و سەرپێچیشمان، تووڕە بوونی خوای گەورەمان هێنایە خرۆشان و، گرۆی مرۆڤ بەو ستەم و کاولکاری و کوفر و سەرپێچییەی بە ئاشکرا دەری دەبڕێت خۆی شایانی سزا کرد و، لە ئەنجامی ئەمانەشدا بە چەند جۆرێکی سزا و ئازاری توندوتیژ سزا درا. بێ گومان ئێمەش بەشمان لەو تۆڵە و سزایەدا دەبێت.

● خاڵی دووهەم:

لە واتای فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئەوە هاتووە کە:

تەنانەت ماسی‌یەکانی ناو دەریاش لای خوای گەورە سکاڵا لـە دەست یـاخی و ستەمکاران دەکەن، کە بـەهۆی ستەمی ئەوانـەوە بـاران نابـارێت و ڕۆزی‌یـان کـەم دەبێتەوە!

بەڵێ، ستەم و گوناهـەکانی ئەم زەمـان و ڕۆژگـارە لـە ڕادەیـەکدان کـە هیـچ بوارێکیـان بۆ داواکردنی میـهرەبانی لـە خـوای گـەورە نەهێشتووەتەوە! تەنانـەت ئاژەڵە بێ‌تاوانەکانیش بەهۆیانەوە دووچاری ئازار دەبن.

● خاڵی سێ‌هەم:

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿وَاتَّقُوا فِتْنَةً لا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً﴾ (الأنفال:٢٥).

چونکـە ئەگـەر بـە شێوەیەکی دەراسـا "بێ تاوانـەکان" لـە موسـیبەتی گشـتیدا ڕزگاریـان ببوایـە، ئـەوا حیکمـەتی ئـایین کـە بریتی‌یـە لـە "تاقیکردنـەوە" لـەدەسـت دەچـوو! ئـەو کاتـەش کەسانی بێ‌کـەڵك و خراپـی وەك ئـەبوو جـەهل بـە وێنـەی حەزرەتی ئەبوو بەکری صددیـق - خـوای لـێ ڕازی بێـت - ڕاستی‌یەکانی ئـایینی دەسـەلماند! لەبـەر ئـەوە، بـێ تاوانـەکانیش بـە گـیرو گرفت و بـەلای موسـیبەتە گشتی‌یەکانەوە گیرۆدە دەکرێن و پێوەی دەتلێنەوە.

● خاڵی چوارەم:

لە ئەنجامی پەرەسەندنی بەرتیل و فروفێڵـەوە، بە زۆری حـەرام تێکـەڵی ڕۆزی و ماڵ و سامانەکان بـووە و، جگـە لەمـەش ستەم و ناشـکوری پـەرەی سـەندووە، کـە هەموو ئەمانەش بـوون بـەهۆی ئـەوەی خـەڵکی مـافی بـەزەیی پێداهاتنـەوە لەدەست بدەن.

● خاڵی پێنجەم:

"پەیامەکانی نوور" هۆکارێکی گرنگن بۆ دوورخستنەوەی بەلا و موسـیبەتەکان لەسەر ئـەنادۆڵ! چونکـە هـەروەك "سـەدەقە" بـەلا دەگێڕێتـە دواوە، بلاوکردنەوە و

خوێندنەوەی پەیامەکانی نووریش سەدەقەیەکی "هەمەکی"ن و هۆکارێکن بۆ دوورخستنەوەی بەڵاکانی ئاسمان و زەوی. کە ئەمەش بە چەند نیشانە و ڕووداوێکی زۆر دەرکەوتووە. تەنانەت بە چەند ئاماژەیەکی قورئانی پیرۆز هاتووەتە دی و بەرجەستە بووە.

● خاڵی شەشەم:

"بێ بارانی" بەڵا و موسیبەت و سزای کارێکە. کەواتە دەبێ لە بەرامبەر ئەم موسیبەت و سزایەوە مرۆڤ بە: گریان و خەم و دڵشکاوی و لالانەوەی بەکوڵ و پەشیمانیی ڕاستی و تۆبە و داوای لێخۆشبوونی گوناه و بە دوعا و بەندایەتی هانا بۆ خوای گەورە ببات و، هەموو ئەمانەش لە بازنەی سوننەتی نەبەویدا ئەنجام بدات و، لەسەر ئەو شێوەیەی کە شەریعەت دەستنیشانی کردووە، بێ ئەوەی بیدعەتەکان خۆیانی تێدا هەڵبقورتێنن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم چەشنە موسیبەتە گشتییانە ئەنجامی گوناهی زۆرینەی خەڵکن، ئەوا تەنها بەوە دەبڕێنە دواوە کە زۆربەی خەڵکی بە تۆبە و پەشیمانی داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن.

* * *

(ئایین ناکەین بە هۆکار بۆ دەستکەوتەکانی دنیا)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحـــمة الله وبركاته

برا صددیق و ئازیزەکانم!

(ئەمە وەڵامی پرسیارێکی ماددی و مەعنەوییە کە لە چەند لایەکەوە لێم کرا، ناچار بووم بینووسم)

پرسیار:

بۆچی پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا نابەستیت، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەی کە بایەخ بە سیاسەت دەدەن، بەڵکو تا دەتوانیت

دەست بە رووی ئەمەوە دەنێت و، نایەڵێت قوتابیانی نووریش بە هیچ جۆرێك توخنی ئەو لایەنانە بکەون! خۆ ئەگەر پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستیت، هەزاران کەس بە کۆمەڵ و تاك تاك دێنە ناو بازنەی "پەیامەکانی نوور" و بۆ بڵاوکردنەوەی ڕاستییە پرشنگدارەکانی ئەم پەیامانە تێدەکۆشن. سەرەڕای ئەوەش، تا ئەم ڕادەیە دووچاری گیروگرفت و تەنگ پێ هەڵچنینی ناڕەوا نابیت؟

وەڵام:

گرنگترین هۆی دوورەپەرێزی و بایەخ نەدانمان بەو لایەنانە: "ئیخلاس"ە، کە بناغەی ڕێبازمانە. واتە ئیخلاس ڕێی ئەوەمان لێ دەگرێت. چونکە مرۆڤ لەم سەردەمی بێ ئاگاییەدا، بە تایبەت ئەو کەسەی هەڵگری چەند بیروڕایەکی ئەوتۆی سەر بە لایەنێکی دیاریکراوە، هەوڵ دەدات هەموو شتێك بکات بە داردەستی ئەو بیرەی خۆی، تەنانەت ئایین و کردارەکانیشی کە بۆ دواڕۆژ دەیانکات، هەموویان دەکات بە پلیکانە و "هۆ" بۆ ئەو ڕێبازە دنیاییە.

بەڵام ڕاستییەکانی ئیمان و خزمەتگوزاریی خاوێنی "نوور" هەرگیز خۆیان نادەن بە دەستەوە تا بکرێن بە "هۆکار" بۆ هیچ شتێك لە هەموو گەردووندا و ناگونجێت جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێکی تریان بێت.

لە ڕاستیشدا پارێزگاری کردنی نهێنیی "ئیخلاس" لە ناوەندی ململانێ و کێشمەکێشی نێوان لایەنەکانی ئێستادا کارێکی گەلێ دژوارە. هەروەها ئەوەش کارێکی یەکجار سەخت و ئەستەمە کە ئایین نەکرێت بە "هۆکار" بۆ دەستخستنی دەستکەوتەکانی دنیا! لەبەر ئەوە، باشترین چارەسەر بۆ ئەمە بریتییە لە پشت بەستن بە چاودێریی خوای گەورە و سپاردنی ئەم کارە بە تەوفیقدانی پەروەردگاری عالەمیان، لە بریی پاڵدانەوە بە هێزی دەستە و لایەنەکانی ئێستای دنیا.

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئەم دوورەپەرێزییەمان: "شەفەقەت"ە، کە یەکێکە لە چوار بناغەکانی پەیامەکانی نوور و، بریتییە لەوەی خۆمان لە ستەم و زیانی کەسانی ترەوە نەگلێنین و بە ڕەفتاری لەو جۆرە لەکەدار نەبین. چونکە مادەم

مرۆڤ گەلێ ستەمکار و نەزانە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (إبراهيم:٣٤) ئەوا دەبینین لەم سەردەمەدا بێ هیچ بەزەییەك و بە ستەمێکی یەکجار ڕەق و توندوتیژ بەرپەرچی هەڵسوکەوتی بەرامبەرەکەی دەداتەوە و، بە پێچەوانەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿ولا تزرُ وازرةٌ وِزرَ أُخرى﴾ (الأنعام:١٦٤) کە دەستووری ویستی خوای گەورەیە، ڕەفتار دەکات. چونکە زۆربەی جار سۆز و لایەنگیریی بۆ لایەنێك بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئەو کاتەش تەنها بە دوژمنایەتی کردنی تاوانبارەکەوە ڕاناوەستێ، تەنانەت بە تێوەگلاندنی هەموو خزم و کەسوکاریشی ڕازی نابێت، بەڵکو دەیەوێت هەر کەسێ کە پەیوەندییەکی دوور یان نزیکی بە تاوانبارەکەوە بێت، هەموویان سزا بدات، بە ڕادەیەك ئەگەر دەسەڵات و فەرمانیشی بەدەست بێت ئەوا لەبەر تاوانی یەك دانە کەس گوندێکی تەواو بە "بۆمبا" وێران دەکات! لە کاتێکدا ویژدان داخوازی ئەوەیە کە لەبەر سەد تاوانباریش - نەك یەکێك - نابێت یەك کەسی بێ تاوان لەناو ببرێت و بەهۆی ئەوانەوە ستەمی لێ بکرێت. ئەم بارودۆخەی ئێستا پێچەوانەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە؛ سەد کەسی بێ تاوان لە چەندین بەڵا و زیانەوە دەگلێنێت، بەهۆی چەند کەسێکی کەمی تاوانبارەوە!

بۆ نموونە:

لەناوبردنی دایك و باوکی بەتەمەن و، دەربەدەرکردنی منداڵانی ورد و، زەلیل و هەژارکردنی هەموویان بە بیانووی لایەنگیریی لایەنێك، تەنها لەبەر ئەوەی خزمێکیان هەڵەیەکی لێ ڕوودابێت.. ئەم کارە، بە تەواوی دژی بناغەی "شەفەقەت"ە بەرامبەر بەدیهێنراوانی خوای گەورە.

کەواتە بە لایەنگیریی ئەم پێڕ و دەستە و لایەنانەی کە ئێستا هەن، موسڵمانە بێ تاوانەکان لە ستەم ڕزگاریان نابێت، بەڵکو بەم لایەنگرتنە ستەم - بە جۆرێکی گشتی - بڵاو دەبێتەوە، بە تایبەت لە ڕێی ئەو هۆیانەی کە هاندەری شڵەژان و بەرپابوونی شۆڕشەکانن.

خۆ ئەگەر ئێستا جیهادی ئیسلامی لەگەڵ کافراندا لە گۆڕێدا بوایە، ئەوا حوکمی منالی کافران، کە لەو جیهادەدا دەکەوتنە دەستی موسڵمانان، وەك خۆی دەمایەوە و، لەوانەیە بە دەستکەوتی جەنگ دابنرانایە و، موسڵمانان دەیانتوانی بیانخەنە ژێر سەرپەرشتیی خۆیان، یاخود بیانکەن بە غولامیان. بەلام ئەگەر موسڵمانێکی ولاتی ئیسلام کافر ببێت، ئەوا بە هیچ جۆرێك خاوەنی منالەکانی خۆی نابێت و، نابێت دەستدرێژی بۆ سەر مافی ئەو منالانە بکرێت. چونکە ئەو منالانە بە بۆنەی پەیوەندیی ئیسلامەتی‌یەوە، بە ئایینی ئیسلام و کۆمەڵی موسڵمانانەوە پەیوەستن، ئەو پەیوەندی‌یەی کە لەگەڵ باوکیاندا بچڕا لەگەڵ ئەواندا هەر ماوە. هەرچی منالی کافرانیشن، هەرچەند ئەهلی نەجاتن، بەلام لە ماف و ژیانیاندا شوێنکەوتەی باوکیانن. لەبەر ئەوە، یان دیل دەبن یان لە کاتی جیهاددا بە بەندە دادەنرێن.

* * *

(کورتە وەلامێك لە بارەی تەوافوقەوە)

گەر "تەوافوق" لە هەر شتێکدا هەبوو، ئەوا بە "نیشانە"یەکی بچووك دادەنرێت. بەو واتایەی کە ویست و ئامانجێك لەو شتەدا هەیە و بە "ڕێکەوت" ڕووی نەداوە.

خۆ ئەگەر تەوافوقەکە لە چەند لایەکەوە بوو، ئەوا نیشانەکە بەهێز دەبێت، بە تایبەت گەر لە نێوان دوو شتی تایبەتیدا بوو کە سەد ئیحتیمالی تری جگە لەو تەوافوقە لە ئارادا بێت و ئەو دوو شتەش پەیوەندی‌یەکی پتەویان لە نێواندا بێت. چونکە ئەو کاتە ئاماژەکەی ئەو تەوافوقە لە حوکمی "بەڵگەی ڕاشکاو"دا دەبێت و، دەردەکەوێت کە بە ویست و ئامانجێك و، لەبەر مەبەستێکی دیاریکراو ڕووی داوە. کەواتە هەرگیز گریمانی "ڕێکەوت"ی تێدا نی‌یە.

* * *

(پێویستیی فیطرەت)

برا ئازیزە بەوەفاکانم!

"منالە خاوێن و بێ تاوانەکان" لە پێشەکیی هەموو ئەوانەوەن کە دەبن بە قوتابیی ڕاستەقینەی پەیامەکانی نوور، بەپێی داخوازی سروشتیان و، ڕووداوەکانی سەردەم. چونکە ئەو منالە ئەگەر هەر لە کاتی منالیدا وانەیەکی ئیمانیی بەهێز وەرنەگرێت، گەلێ دژوارە دوایی پایەکانی ئیمان و ئیسلام لە ڕۆحیدا جێگیر ببێت، تەنانەت کارێکی یەکجار قورس و پڕ گیروگرفت دەبێت، بە چەشنی ئەوەی داوا لە ناموسڵمانێك بکرێت ئیسلام وەربگرێت! بەڵکو زیاتر لەوەش بەلایەوە نامۆ دەبێت! بە تایبەت ئەگەر دایك و باوکی خۆی بە تەقوا و ئایینداریەوە نەدیبێت و، مێشکیشی تەنها بە زانستە دنیاییەکان ئاخنرابێت و گۆش کرابێت..

لەم حاڵەتەدا، ئەم منالە لە بریی ئەوەی چاکە لەگەڵ دایك و باوکیدا بکات، بە ئەرکێکی قورسیان دەزانێت و چاوەڕوانی مردنیان دەبێت! لە قیامەتیشدا شەفاعەتکاریان نابێت، بەڵکو سکاڵایان لەدەست دەکات و دەڵێت:

(بۆچی ئیمانتان نەپاراستم و لەسەر ئیسلامەتی پەروەردەتان نەکردم)؟!

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە:

بەختەوەرترین منالْ ئەوانەن کە ڕۆشتوونەتە ناو بازنەی پەیامەکانی نوورەوە. چونکە ئەوان بەرامبەر باوکان و دایکانیان باش و خزمەتگوزاری بێ وەی و ئەمین دەبن بۆیان و، ڕێزی شایانیان دەگرن و، دوای مردنی باوکان و دایکانیشیان، بە کردەوە چاکەکانی خۆیان، چاکە لە دەفتەری کردەوەکانی ئەو دایك و باوکانەدا تۆمار دەکەن و، لە قیامەتیشدا - هەر کەس بەپێی پلەی خۆی - شەفاعەتیان بۆ دەکەن.

بەشی دووهەمی قوتابیانی نوور: ئەو ئافرەتانەن کە لە سروشتی خۆیاندا هەست بە پێویستی دەکەن بۆ پەیامەکانی نوور. بە تایبەت ئەوانەی کە کەمێك لە دنیا دوورە پەرێزن. تەنانەت ئەوانەی دەستیان لێ داتەکاندووە، چونکە گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرزی تەمەن.

پەیامەکانی نوور بۆ ئەوانە خۆراکێکی مەعنەوی‌یە، چونکە یەکێك لە بناغەکانی پەیامەکانی نوور "شەفەقەت"ە، کە یەکێکە لە جیلوەکانی ناوی: "الرحیم"ی خوای گەورە و، لە هەمان کاتیشدا هەوێن و کاکڵە و گەوهەری تایبەتیی ڕەگداکوتاوی ناو سروشتی ئافرەتە و، تایبەتمەندیی سەرەکی‌یانە.

بەشی سێهەم: ئەو نەخۆش و پیرانەن کە بە وێنەی پێویستی‌یان بە نان و دەرمان، پێویستیان بە پەیامەکانی نوورە، با بە شێوەیەکی ناسروشتیش بێت. چونکە پەیامەکانی نوور بە وێنەی ڕووناکیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان ژیانی هەمیشەییان بۆ ڕوون دەکاتەوە و ماهییەتی ژیانی فانیی دنیایان پێش چاو دەخات. جا ئەو کەسانەی کە بەهۆی "نەخۆشی" یا "پیری"یەوە ئازار بە ژیانیان گەیشتووە و ئەوانەش کە مردن بە ئیعدامی هەمیشەیی دادەنێن، بەهۆی بێ ئاگایی و گومڕایی دەوروبەریان، هەموو ئەوانە پێویستیان بەو دڵنەوایی و دڵدانەوە و نووری ئومێدە هەیە کە لە پەیامەکانی نووردایە. بە ڕادەیەك کە "نەخۆشی" و "پیری"یان هێندە لەلا شیرین دەکات کە فەزڵی بەسەر "تەندروستی" و "لاوی"دا بدەن!

سەعیدی نوورسی

* * *

(بە نووری قورئان تێدەکۆشین)

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

لەم وەرزی هاوین و، کاتی بێ ئاگایی و، ماوەی سەرقاڵی بووندا بە خەمی گوزەران و، بەدەستهێنانی پاداشتی زۆری خواپەرستی کە لەم سێ مانگەدا بەجێ دەهێنرێن و، لەم ململانێ ڕامیاری‌یە زریان ئاسایەی کە گشت سەرزەویی گرتووەتەوە، سەرەڕای ئەو ململانێ‌یەش کە بە چەك ئەنجام دەدرێت.. ئا لەم کاتەدا، گەر ئەوپەڕی هێز و توندوتۆڵی و دامەزراوی لە بەجێهێنانی خزمەتگوزاریی نووردا بەکار نەهێنرێت، ئەوا سستی و لە کاروەستان ڕوودەدات، کە لە بەرژەوەندیی "پەیامەکانی نوور"دا نی‌یە.

برا ئازیزەکانم!

بەوپەڕی بێ گومانی و دڵنیاییەوە بزانن کە ئەو کار و فرمانەی قوتابیانی نوور سەرگەرمن پێوەی (واتە: پەیامەکانی نوور) مەزنترینی کێشەکانی تێکڕای گۆی زەوییە.

کەواتە لەم ئەرکە نەبڕاوە و نەفەوتاوەتاندا هەرگیز سستی مەکەن و ئاوڕ بەلای کێشە سەرنج ڕاکێشەکانی دنیادا مەدەنەوە.

مەسەلەی چوارەمی پەیامی "بەری درەختی ئیمان" بە زۆری بخوێننەوە، تاکو هێز و ورەی مەعنەویتان سست و لاواز نەبێت.

بەڵێ، هەموو ئەو مەسەلە و کێشە گەورانەی کە "ئەهلی دنیا" پێیانەوە سەرقاڵن، هەرهەموویان بەپێی دەستووری ستەمکار و بێ بەزەییانەی "مشتومڕ و ململانێ"ن و، لە چوارچێوەی ژیانی فانیی دنیادان، بە شێوەیەك کە لە پێناوی دەستکەوتنی شمەك و تفاقی بێ نرخ و بەهای دنیادا موقەددەساتی ئایینی بەخت دەکرێن..

لەبەر ئەوە، هەر لە نێوان ئەو تاوانانەی کە ئەوانە ئەنجامیان دەدەن، قەدەری خوای گەورە دووچاری ئەشکەنجەی دۆزەخێکی مەعنەوییان دەکات.

بەڵام ئەوەی کە پەیام و قوتابیانی نوور بۆی تێدەکۆشن و ئەو ئەرکانەی خراوەتە ئەستۆیان بۆ ژیانێکی نەبڕاوەی هەمیشەیین لە بریی ئەم ژیانە فانییەی دنیا. ئەویش دەرخستن و ئاشکرا کردنی ڕاستیی "مردن"ە بەوەی کە دەری دەخەن ئەو مردنەی دنیاپەرستان تابڵێی لێی دەترسن و بە جەللادی دەزانن، لە ڕاستیدا پەردەیەکە بەسەر ڕووی ژیانێکی هەمیشەیی دادراوەتەوە. ئنجا چەسپاندنی ئەم ڕاستییەشە بە دڵنیاییەکی بێ گومانی وەك ئەوەی کە یەکێك بیسەلمێنێت دوو جار (دوو) دەکاتە (چوار)!

پەیامەکانی نوور تا ئێستا ئەم ڕاستییەیان چەسپاندووە کە مردن و ئەجەل تەنها پەردە و هۆن بۆ ئەوەی ئەهلی ئیمان بە بەختەوەریی هەمیشەیی بگەن.

پوختەی قسە:

گومرایان لە پێناوی ژیانێکی کاتیی دنیادا تێدەکۆشن، بەڵام ئێمە بە نووری قورئان موجاهەدەی مردن دەکەین.. لەبەر ئەوە، گەورەترین کێشەی خەباتی ئەوان - لەبەر ئەوەی شتێکی کاتی‌یە - هێشتا بەرامبەر بچووکترین کێشەی ئێمە دەرناچێت، چونکە کێشەکانی ئێمە روویان لە ژیانی هەمیشەیی و نەمری‌یە.

مادەم ئەوان - بە نەفامی و گێلیی خۆیان - لە کەڵی شەیتان نایەنە خوار و، واز لە خۆهەڵقورتاندن ناهێنن لە کاروبارە مەزنەکانماندا، ئیتر بۆچی ئێمە بە تاسە و گرنگی پێدانەوە بە دوای هەواڵی کێشە بچووك و نزمەکانی ئەواندا بگەڕێین لەسەر حسابی فەرمانبەری‌یە خاوێن و بەرزەکانی خۆمان؟!

بیر لەم ئایەتە پیرۆزە بکەنەوە کە دەفەرموێ:

﴿لا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذا اهتَدَيْتُمْ﴾ (المائدة:١٠٥).

واتە: گومرایی خەڵکی زیان لە هیدایەتی ئێوە نادات، کەواتە پێیانەوە سەرگەرم و خەریك مەبن. هەروەها بیر لەم دەستوورە گرنگەی ئوسوولی شەریعەت بکەنەوە کە دەڵێت: "الراضي بالضرر لا يُنظر له". واتە: نابێت بە چاوی بەزەیی و شەفەقەتەوە بۆ ئەو کەسە بڕوانرێت کە بە زیانی خۆی ڕازی بێت.

جا مادەم ئەم ئایەتە پیرۆزە و، ئەم دەستوورە بەنرخە ڕێمان نادەن بەزەییمان بەواندا بێتەوە کە هەرچەند دەشزانن زیان دەکەن کەچی بە زیانی خۆیان ڕازی دەبن، ئەوا دەبێت هەموو کات و هێز و بایەخێکمان بۆ ئەرکە پیرۆز و خاوێنەکەی خۆمان بەکار بهێنین و، هەرچی‌یەك لە چوارچێوە و بازنەی ئەو کارەی خۆمان بەدەر بێت، بە کاری خۆمانی نەزانین و بە مەبەستمانی دانەنێین و کاتەکانیشمانی تێدا بەزایە نەدەین. چونکە ئێمە تەنها "نوور"مان هەیە، نەك گورز و گۆپاڵ. با لە لایەن ئێمەوە بە هیچ جۆرێ دەستدرێژی نەکرێتە سەر مافی هیچ کەسێك. خۆ ئەگەر دەست درێژیشمان بکرێتە سەر، ئەوا "نوور" پیشان دەدەین و ڕوونی دەکەینەوە. کەواتە ئێمە لە دۆخی جۆرە بەرگری‌یەکی نوورانیداین.

(ڕاستی‌یەکانی قورئان لە پەیامەکاندا)

بەشەکانی پەیامەکانی نوور زیاتر لـە سـەد نـهێنیی ئـایین و شـەریعەت و قورئـانی پیرۆزیان ڕوون کـردووەتەوە و، سـەرسـەختترین کەسـی ملـنـەدەر و مولحیدیشیان بۆڕ داوە و لـەغاویان لـە دەم نـاون و، بـە چەشـنی خـۆری ڕوونـاکی ناوجەرگـەی ئاسمانیش ئەو ڕاستی‌یانەیان چەسـپاندووە کـە پێشـتر وا گـومـان دەبـرا لـە ژێری‌یـەوە دوورن، وەك: ڕاسـتی‌یەکانی قورئـان و، میعراجـی پێغەمبـەر ﷺ و، حەشـری جیسـمانی. هـەموو ئەمانـەیان بـۆ سەرسـەختترین و سەرکەشـترین فەیلەسـووف و زەندیقەکان چەسپاندووە، بە ڕادەیەك کە هەندێك لەوانەشیان هێناوەتە نـاو بازنـەی ئیمانەوە..

جا پەیام گەلێك ئەمە کاریان بێـت، بێ هیـچ گومـانێك، هـەر هـەموو جیـهان و دەوروبەری جیهانیش بەگشتی پەیوەندی‌یان لەگەڵدا دەبێـت و، گومـانیش لـەوەدا نی‌یە کە ئەو پەیامانە ڕاستی‌یەکی قورئـانیی ئـەوتۆن کـە ئـەم چەرخـە و ئـاییندەش بە خۆیانەوە سەرقاڵ دەکەن و، سەرنجیان بە تەواوی بۆ لای خۆیان ڕادەکێشـن و، بێ هیچ گومانێك شمشێرێکی ئەڵماس ئاسای بەبڕشتن بەدەست ئەهلی ئیمانەوە.

* * *

(پۆزش لە دوو مەسەلەدا)

برایانی ئازیزم!

بۆ مەبەستی ڕزگار کردنی کەسانی لاوازی ناو قوتابیانی نوور، یان ئەوانەی کە تازەکی بەو پەیامانە ئاشنا بوون، لـە داوی شـوبهە و گومانـەکان، ئەمـەی خـوارەوە ڕوون دەکەمەوە:

بە ڕێنمایی ئەو پیلانە زۆرانـەی کـە چـەند ڕێکخراوێکـی نـهێنی دایـان ڕشتووە، هەندێ زانای ساویلکە و هەندێ کەسیش لە نەیارانی پەیامەکانی نوور و لایەنگری بیدعەتەکان، دەچن گەلـێ هەڵە و ناتەواویی کەسیی من - کە دانیان پێدا دەنێـم - بڵاو دەکەنەوە و لـە شـان و بایـەخم دادەشـکێنن، تـاکو لـەم ڕێ‌یـەوە مستەکۆڵێکی

توند لە "پەیامەکانی نوور" بسرەوێنن و ڕێ لـە ڕاستـیـیە زامـدار نـەکراوەکانی ئەو پەیامانە بگرن! چونکە لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا بیست ڕووداوی گرنـگ ڕووی داوە کە پشتی ئەمە دەگرێت، بە ڕادەیەك کە بوون بـەهۆی ئەوەی دووجـار بمانخەنە بەندیخانەوە.

وا ئەمەی خوارەوە بۆ هەموو برادەرانم و سەرجەمی قوتابیـانی پەیامـەکانی نـوور ڕادەگەیەنم:

سوپاسی زۆرم بۆ پەروەردگارم لەسەر ئەوەی کـە وای لـێ نـەکردووم لـە خـۆم ڕازی بم، چ جای پیاهەڵدان و خۆ مەدح کردن. هەروەك ناتـەواوی و گوناهـەکانی خۆمی پێ ناساندووم. بۆیە بە شەرمەزارییەوە داوای لێخۆشبوونی ئەو ناتەواوی و گوناهانەم لە خـوای پـەروەردگارم دەکـەم. هیـوادارم ئیخـلاس و لیـبڕانی قوتابیـیە پیرۆزەکانی پەیامەکانی نوور و شەفاعەتە مەعنەوییەکانیان بۆ من ببن بـە کـەفارەتی گوناهەکانم.

جا ئەوانـەی کـە ڕەخنـەم لـێ دەگرن، لـە ڕاستیدا ئاگایـان لـە عەیبـە پەنـهان و نادیارەکانم نییە و، تەنها هەندێ هەڵەی ڕواڵەتیم وەك بەهانە و بیـانوو بـە دەستەوە دەگرن و، پێیان وایە کە "پەیامەکانی نوور" موڵکی من بن، بۆیە هەوڵ دەدەن پەردە بەسەر ڕووی ئەو نوورانەدا بگێڕن و تەگەرە و کۆسپ لـە بـەردەم بڵاوبوونـەوەیاندا دابنێن و، دەڵێن:

سـەعید نایـەت بـۆ نوێـژی جومعــە و، ڕیــش ناهێڵێتــەوە و.. ڕەخنـەکانی تـری هاوچەشنی ئەمانە.

وەڵام:

مـن لەگـەڵ دان نـانەدا بـە زۆریـی تەقسـیر و گونـاهی خۆمـدا، کـەچی چـەند عوزرێکم لەم دوو مەسەلەیەدا هەیە.

یەکەم:

من شافیعی مەزهـەبم و، یـەکێك لـە مەرجـەکانی نوێـژی جومعـەش – بـەپێی ئـەم مەزهەبە – ئەوەیە کە چل کەسی مەئمووم سـوورەتی فاتیحـە بخوێنـن، لەگـەڵ چـەند

مەرجێکی تردا. لەبەر ئەوە، من لێرە جومعەم لەسەر فەرز نییە. لەگەڵ ئەوەشدا بە تەقلیدی مەزهەبی حەنەفی هەر بە سوننەت جومعەکانم جێبەجێ دەکەم.

دووهەم:

ماوەی بیست ساڵە ڕێی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ خەڵکیدا لێ گرتووم. تەنانەت وا چوار مانگیشە فەرمان بە کاربەدەستە بەرپرسەکانی ئێرە دراوە کە هیچ کەسێکم لێ نزیك نەبێتەوە! سەرەڕای ئەوەی کە بیست و پێنج ساڵیشە بە گۆشەگیری و دووری لە خەڵك دەژیم. لەبەر ئەوە، من هەرگیز لە شوێنە پڕ لە خەڵك و جەنجاڵەکاندا ناحەوێمەوە و، بەپێی مەزهەبەکەشم ناتوانم لە پشت سەری هەموو پێش نوێژێکەوە بەشداری نوێژی جەماعەت بم، چونکە فریای خوێندنی "فاتیحە" ناکەوم و، هێشتا ناگەمە نیوەی ئەو سوورەتە پێشنوێژەکە دەڕواتە ڕکووعەوە. لە کاتێکدا کە خوێندنی فاتیحە - لەم مەزهەبەدا - یەکێکە لە ڕوکنەکانی نوێژ.

سەبارەت بە ڕیش هێشتنەوەش، ئەوا: ڕیش هێشتنەوە سوننەتێکی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و، هەر تەنها تایبەت نییە بە زانایانەوە.

منیش هەر لە سەرەتاوە ڕیشم نەهێشتووەتەوە و، لەناو ژینگە و کۆمەڵێکدا گەورە بووم کە لەسەدا نەوەدیان ڕیش ناهێڵنەوە.

لە لایەکی تریشەوە دوژمنانمان هەمیشە هێرشمان دەکەنە سەر و، لە ڕاستیشدا ڕیشی هەندێ لە خۆشەویستانی منیان تاشی. ئیتر لەم چەشنە ڕووداوانەوە لە حیکمەتی ڕیش نەهێشتنەوەم تێگەیشتم و، زانیم کە سەبارەت بە من چاودێرییەکی پەروەردگارە. چونکە گەر من ڕیشم بهێشتایەتەوە و پاشان ئەوان بیانتاشیبایە، ئەوا "پەیامەکانی نوور" زیانێکی گەورەیان پێ دەگەیشت، چونکە ئەم ڕەفتارەم پێ قبووڵ نەدەکرا و دەمردم!

هەندێك لە زانایان وتوویانە: دروست نییە ڕیش بتاشرێت. مەبەستیان لە تاشینی ڕیشە لە دوای هێشتنەوەی. چونکە تاشینی دوای هێشتنەوەی حەرامە. بەڵام گەر کەسێك هەر لە سەرەتاوە نەیهێشتبێتەوە، ئەوا سوننەتێکی جێبەجێ نەکردووە.

ئێمە وا لەبەر خۆپاراستنمان لە گەلێ گوناهی کەبیرە، ماوەی بیست ساڵمان بە ژیانێکی سەختی وەك بەندیخانەی تاکەکەسی بردە سەر. لە خوای گەورە داواکارین کە بۆمان بکات بە کەفارەتی جێبەجێ نەکردنی ئەو سوننەتە پیرۆزە.

هەروەها ئەمەش بە ئاشکرا و ڕاشکاوی و بێ گومانی ڕادەگەیەنم کە:

پەیامەکانی نوور موڵکی قورئانی پیرۆزن، من جورئەتم لە کوێ بوو لافی خاوەندارێتیان لێ بدەم!

لەبەر ئەوە، هەرگیز هەڵە و ناتەواوییەکانم نابن بە هی ئەو پەیامانە، چونکە من جگە لە خزمەتگوزارێکی گوناهباری ئەو نوورە و بانگەوازکار و دەڵاڵی ئەو گەوهەر و ئەڵماسانە، هیچی تر نیم. کەواتە حاڵەتە پەشێواوەکانی من هەرگیز کار ناکەنە سەر ئەو پەیامانە، تەنانەت هەر نزیکیشیان نابنەوە.

لە ڕاستیدا ئەو وانەیەی کە لە پەیامەکانی نوورەوە فێری بووین بریتییە لە:

دەستگرتن بە ئیخلاسەوە و، وازهێنان لە خۆویستی و، زانینی ئەوەی کە "نەفس" تەقسیربارە و، خۆپاراستنی زۆریش لەوەی کە لە خۆمان ڕازی بین..

ئێمە هەرگیز خۆمان دەرناخەین، بەڵکو کەسێتیی مەعنەویی "پەیامەکانی نوور" دەردەخەین و ڕوونی دەکەینەوە.

ئێمە سوپاسی هەر کەسێك دەکەین کە ناتەواوییەکانی خۆمانمان پیشان دەدات، بە مەرجێك ناتەواویی ڕاستەقینە بێت و، پێی دەڵێین: خوای گەورە لێت ڕازی بێت. چونکە هەروەك سوپاسگوزاری ئەو کەسە دەبین کە دووپشکێکمان پێوە دەبینێت و فرێی دەدات پێش ئەوەی پێمانەوە بدات، بە پیشاندانی ناتەواوی و کەموکورییەکانیشمان بە هەمان جۆر ڕازی دەبین و، سوپاسی ئەو کەسە دەکەین کە ئاگادارمان بکاتەوە لێیان، بە مەرجێ ئامانجی کەسی و سەرسەختیی تێکەڵ نەبێت و، نەکرێت بە هۆکارێك بۆ یارمەتیدانی گومڕایان و ئەهلی بیدعەت.

* * *

(خواستەکانی خزمەت بە ئیمان)

ئەی برایانی ئازیز و بەوەفا و خۆڕاگر و دامەزراو و گیانفیدا و لەق نەبووم!

دەزانن کە خەبیرەکانی ئەنقەرە نەیانتوانی ئینکاریی کەرامەتەکانی پەیامەکانی نوور و ئەو ئامـاژە غەیبیـیانەش بکەن کە پەنجـەیان بۆ ئەم پەیـامانە ڕاکێشـاوە. بەڵام - بە هەڵە - ڕەخنەیان لەوە گرتبوو کە گوایا من بەشـم لـەو کەرامەتانـەدا بێـت و، وتبوویان: دەبێ ئەم جۆرە شتانە لە کتێبدا بڵاو نەکرێتەوە، چونکە کەرامەت نـایێت ئاشکرا بکرێت!

منیـش لـە بەرگـرییەکانمدا و لــە بـەرامبـەر ئەم ڕەخنـە سـەرپێیەوە، وەڵامـم دانەوە و، وتم:

ئەو کەرامەتانە هی من نین و من مافی ئەوەم نییە کـە خـۆم بـە خاوەنیـان دابنێـم. بـەڵکو کەرامـەتی ئـەو پەیامانـەی نـوورن کـە چـەند بریسـکە و نمێکـی موعجـیزەی مەعنـەویی قورئـان و تەفسـیری ڕاسـتەقینەی ئـەو قورئانـە پـیرۆزەن کـە شـێوەی کەرامەتیان لەخۆ گرتووە، تاکو ورەی قوتابیـانی نـوور بـەرز بێتـەوە و، لـە جۆری ئیکرام و ڕێزلێنانـە خواییـەکانن کـە دەرخستنیان بـە شـوکرانەبژێری دادەنرێـت و، کارێکی ڕاست و دروستە.

وا ئێستا لەسەر بناغەی هۆیەکی گرنگ، وەڵامەکە تا ڕادەیەك ڕوون دەکەمەوە. لەبەر ئەوەی ئەم پرسیارەی خوارەوە سەری هەڵدا:

بۆچی ئەو ئیکرام و ڕێزلێنانە خواییە دەردەخـەم و، لەبـەرچی ئـەم هـەموو قسـە و گوفتارەیان لە بارەوە دەکەم، تەنانەت زۆربەی نامەکانیش ڕوویان لەو ئیکرامانەیە؟

وەڵام: ئەو خزمەتگوزارییەی ئیمان کە لەم کاتەدا "پەیامەکانی نـوور" ئـەنجامی دەدەن و لە لایەن هەزاران کاولکـارەوە بەرهەڵسـت دەکرێـن، پێویستی بـە سـەدان هەزار ئاوەدانکار و بنیاتنەر هەیە کە بە مەبەستی پشـتگیری لە ڕیزی ئـەم پەیامانـەدا بن و.. دەبێـت - بە لای کــەمەوە - ســەدان کـەس یارمـەتیدەر و نووســەرەوەم لەگـەڵـدا بێت و.. لە نەتەوە و کاربەدەستانیش داخوازی ئەوەیە کـە بـە ڕێزلێنانـەوە دەسـتی یارمەتیی بۆ درێژبکەن و، بۆ خزمـەتی ئیمان هانمان بدەن و، گـرنگیی پێ

بدەن و، پەیوەندیی توندوتۆڵ لەگەڵ ئەم خزمەتەدا دابمەزرێنن، نەك دوورەپەرێز بن و لە مەیدان دوور بکەونەوە. بەڵکو دەبێ ئیماندارانی ئەم پەیامانەیان لە سەرقاڵی و سوودەکانی ژیانی دنیا گەلێ پێ باشتر بێت، چونکە خزمەتگوزاریی ئیمان ڕاستەوخۆ ڕووی لە ژیانی دوارۆژە.

جا لە کاتێکدا کە دەبوو کارەکان بەم جۆرە برۆشتنایە، کەچی بە پێچەوانەوەیە!

با خۆم بە نموونە بهێنمەوە:

قەدەغە کردنم لە هەموو شتێك و، نەهێشتنی پەیوەندی لەگەڵمدا و، بڕینی ڕێگەی هەموو یارمەتییەك لێم، سەرباری کزکردنی ورەی هاوڕێیانم لە ڕێی هەڵبەستنی پڕوپاگەندەی چەپەڵ بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە و، بەکارهێنانی هەموو ئەو هۆکارانەی لە دەستەڵاتیاندایە بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لە من و لە "پەیامەکانی نوور"..

دەڵێم: دانانی ئەرکێ کە هەزاران کەس لە ژێریدا دەناڵێنن لەسەر شانی کەسێکی ئاوا دەستەوسانی لاوازی نەخۆش و پیر و ئاوارەی وەك منی دوور لە خزم و کەسوکار، لەم بارودۆخانە و لە ناوەندی ئەم هەل و مەرجانەی خرانە ڕوو، سەرباری دوور خستنەوەی خەڵکی لێم وەك بڵێی دووچاری نەخۆشییەکی گوازراوە(درم) بووبێتم، بۆ ئەوەی ناچار بم لێیان دوور بکەومەوە و تێکەڵیان نەبم و.. زیاد لەمانیش؛ بڵاوکردنەوەی سام و دوودڵی و گومان خستنە ناو دڵی خەڵکی لە بارەی خزمەتکردنی ئیمانەوە، بۆ ئەوەی ورە و هێزی مەعنەوییان کەم بکەنەوە..

لە بەرامبەر گشت ئەم ڕێگرانەی باس کران، کە هەر هەموویان لە دەرەوەی ویستی ئێمەدان.. بەرامبەر بەمانە، پێویستە چەندین هێزی مەعنەوی لە دەوری "پەیامەکانی نوور" کۆبکرێنەوە. ئەمەش بەوە دەبێت کە هەموو ئەو ڕێزنانە خواییانە باس بکرێن کە مایەی هێز و پێزی مەعنەویی قوتابیانی نوورن و.. پاشان بەوە دەبێت هێزی پەیامەکانی نووریش بخرێتە ڕوو کە وەك سوپایەکی مەزنی ئەوتۆیە

هیچ پێویستی‌یەکی بە یارمەتیی هیچ کەسێك لە خەڵکی نی‌یە، تەنانەت هەر تەنیا ئەو پەیامانەن کە لە دوژمن ڕاپەڕیون و بەرەنگاریان بوونەتەوە.

بەڵێ، لەبەر ئەم حیکمەتە ناوبراوانەیە، کە ئەو ڕێزلێنانە خواییانە و هاوچەشنیان نووسران.

دەنا ئێمە پروپاگەندە بۆ خۆمان ناکەین و، بە دوای ڕێز و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیدا ناگەڕێین و، هانیان نادەین مەدح و ستایشمان بکەن، بۆ ئەوەی ئیخلاسەکەمان بپارێزین کە بناغەیەکی گرنگە لە بناغەکانی پەیامەکانی نوور.

* * *

(هەستی پێش وەخت بە پەیامەکانی نوور)

برا ئازیزەکانم!

قەناعەتێکی تەواوم بەوە هێناوە کە چل ساڵ پێش سەرهەڵدانی پەیامەکانی نوور، ئەو پەیامانە بە هەستێکی فراوانی پێش وەخت و بە شێوازێکی سەرسووڕهێنەر لە خۆم و گوندەکەمان (نوورس) و شارەکەمان (خیزان)دا خۆیان دەرخستبوو!

کاتی خۆی حەزم دەکرد ئەم نهێنی‌یە لای برایانم و قوتابیانی پێشووم وەك "شەفیق" و "عەبدولمەجید" بدرکێنم. بەڵام وا ئێستا بۆ ئێوەی باس دەکەم، چونکە خوای گەورە گەلێ کەسی وەك "عەبدولمەجید" و "عەبدوڕڕەحمان"ی بە ئێوە بەخشیوە.

کاتێ کە لە تەمەنی دە ساڵیدا بووم حاڵەتێکی بەخۆنازین و شانازیم لە "ڕۆح"ی خۆمدا دەبینی، تەنانەت هەندێ جار لە شێوەی پێ خۆش بوونی مەدح و سەنادا ئەو حاڵەتە دەردەکەوت! ئەوەبوو - بە پێچەوانەی حەز و ئارەزووی خۆم - وەك پاڵەوانێکی گەورە و پێشەوایەکی مەزن و خاوەن کارێکی گرنگ خۆم پیشان دەدا! هەر بۆ خۆیشم لە خۆمم دەپرسی:

ئەم خۆدەرخستن و فیز و دەمارەت لەبەر چی‌یە، بە تایبەت لە بواری ئازایەتیدا، لە کاتێکدا کە خۆت پێنج پارە ناهێنیت[1]؟ ئیتر بە سەرسامی دەمامەوە و وەڵامی ئەم پرسیارەم نەدەزانی.

بەڵام دوو مانگ پێش ئێستا بەمەی خوارەوە وەڵامی ئەو سەرسامی‌یەم درایەوە: "پەیامەکانی نوور" بە "هەستی پێش وەخت" هاتنی خۆیان بە گوێی هەستی تۆدا چرپاند.

تۆ بۆ خۆت هەر تەنها دەنکە تۆوێکی بچووکی بێ بایەخیت، بەڵام لەبەر ئەوەی پێش هاتن و سەرهەڵدانی ئەو پەیامانە هەستت بە هاتنیان کردووە، ئەوا هێشووە بەهەشتی‌یەکانت (پەیامەکانی نوور) بە هی خۆت زانیوە و شانازیت پێیانەوە نواندووە.

سەبارەت بە گوندەکەشمان (نوورس) ئەوا خەڵکی ئەوێ و قوتابی‌یە دێرینەکانیشم ئاگادارن کە خەڵکی ئەو گوندە مەدح و ستایشیان گەلێ پێ خۆش بوو، تاکو دەری بخەن کە هەر ئەوان یەکەم کەس و پێشەنگی هەڵمەت و ئازایەتین! بۆیە پێیان خۆش بوو لە شێوەی قارەمانانەدا خۆیان دەربخەن، وەك بڵێی وڵاتێکی گەورەیان فەتح کردبێت!

ئیتر زۆر سەرم لە خۆم و گوندەکەم سوور دەما. وا ئێستا لە ڕێی ئاگادارکردنەوەیەکی حەقیقی‌یەوە لەو نهێنی‌یە تێگەیشتم کە:

ئەو خەڵکانەی گوندی نوورس بۆیە شانازی‌یان دەنواند چونکە گوندەکەیان لە دواییدا بەهۆی پەیامەکانی نوورەوە شانازی‌یەکی مەزن بەدەست دەهێنێت. تەنانەت ئەو کەسانەی کە زووتر ناوی پارێزگا و ناوچەکەشیان نەبیستووە، دوایی لە ڕێی پەیامەکانەوە و بە گرنگی پێدانەوە بە گوندەکەش ئاشنا دەبن.

کەواتە ئەو نوورسی‌یانە لە ڕێی هەستێکی پێش وەختەوە و لە شێوەی فەخر و شانازیدا، شوکرانە بژێری خۆیان بەرامبەر بەم نیعمەتە دەردەبڕن.

---

(١) چل "پارە" دەکاتە یەك "قورش" دە قورشیش دەکاتە یەك لیرەی تورکی! (وەرگێڕ)

بەڵێ، لە کاتێکدا کە هەموو خەڵکی کوردستان شانازییان بە زۆریی قوتابیان و زانایانەوە دەکرد، کە بەهۆی هیممەت و تێکۆشانی مامۆستا مەلا "عەبدورڕەحمان"ی تاغییەوە - کە لە ناوچەکەمان (ئیسپاریت) و قەزاکەمان (هیزان) بە "سەیدا" بەناوبانگە - پێگەیشتبوون و کۆتاییان بە خوێندن هێنابوو.. منیش لە نێوان ئەواندا و لە ناوەندی ئەو مونازەرە بەرز و هیممەتە بڵند و بازنە فراوانە زانستی و سۆفییانەدا، وا هەستم دەکرد کە ئەو زانایانە سەرانسەری گۆی زەوی فەتح بکەن!

ئەو کاتە کە من هێشتا لە دەهەم ساڵی تەمەنمدا بووم، کاتێ مەناقیبی زانایانی بەناوبانگی پێشین و ئەولیا مەزنەکان و قوتبە گەورەکانم دەبیست، وام بە دڵدا دەهات کە ئەم قوتابی و زانایانەش گەلێ ئاسۆی فراوانی زانست و ئایین فەتح دەکەن. چونکە گەر هەر کامێکیان نەختێ زیرەکیی زیاتری تێدا بێت، ئەوا سەرنجی بایەخ پێدانی ئاراستە دەکرێت و، گەر هەر کامێکیشیان لە مونازەرەیەکی زانستیدا سەرکەوتن لە هەر مەسەلەیەکدا بەدەست بهێنێت، گەلێ شانازی بەو سەرکەوتنەیەوە دەردەبڕێت.

جا من سەرم لەمە سوورِ دەما! چونکە ئەو هەستانە لە خۆیشمدا هەبوون!

تەنانەت لە نێوان شێخانی تەریقەت و بازنەی تەسەووفی ناوچە و قەزا و پارێزگاکەشماندا پێشبڕکێیەکی سەرسوورِهێن و سەرنج ڕاکێش هەبوو کە لە هیچ شارێکی تردا بەو ڕادەیە نەم بینیوە!

وا ئێستا قەناعەتم هێناوە بەوەی کە:

ڕۆحیانەتی هاوڕێیانی قوتابیم و مامۆستایانی زانا و شێخ و ڕابەرانیشم لە ئەولیاکان - بە "هەستی پێش وەخت" و دوور لە پێزانینی "ژیری" - هەستیان کردبوو کە لە نێوان قوتابیان و موریدانی ئەو مامۆستا و ڕابەرانەدا نوورێکی درەخشان - لە کاتی پێویستدا - سەر هەڵدەدات، بە چەشنێك کە ئەو نوور و ڕووناکییە فریای ئیمانداران دەکەوێت!

جا ئەو نیعمەتە خواییەی کە ئەو کاتە هەست دەکرا لە ئاییندەدا و، لە ناوەندی چەند بارودۆخێکی لەڕادەبەدەر قورس و نامۆدا ببەخشرێت و، لە بەرامبەر چەند نەیارێکی لەژمارەبەدەری سەرسەخت و ڕووبەڕووی گومراییەك کە هەزار ساڵە پەرە دەسێنێت و لە نێوان دوژمنانێکدا کە ئەوپەڕی چەپەڵی و ساختە و فڕوفێڵیان لە ژێر سەردایە، سەر هەڵبدات..

ئەو نیعمەتە، تەنها هەر "پەیامەکانی نوور"ە کە دوای چەند لێکۆڵینەوەیەکی بەردەوامی دوو دادگای عەدلی و بە شێوەیەکی دەراسا بەسەر دوژمناندا سەرکەوتن و، ڕووناکی‌یەکانیان بە پەنهانی دەدرەوشێتەوە و، بە کوێرایی چاوی دوژمن و ملدانی ناچاری‌یان سەربەستیی بڵاوبوونەوەیان بەدەست هێنا..

لە هەموو ئەمانەوە دەردەکەوێت کە:

پەیامەکانی نوور شایانی ئەو پلەوپایە بەرزەن، بە ڕادەیەك کە خەڵکی گوند و ناوچە و پارێزگاکەشم - پێش وەخت - هەستیان پێ کرد و، دڵخۆشی و شادمانی‌یان بۆ دەربڕی!

بۆیە ئەم نهێنی‌یەشم لە لا درکاندن، چونکە ئێوە بە وێنەی قوتابیانی پێشینم و، برایانم و، عەبدولمەجید و، عەبدوڕڕەحمان دادەنێم.

بەڵێ، هەروەك من، لەبەر هێزی شعوور و هەستی دەمارەکانم بە شێ و تەڕی، بیست و چوار سەعات پێش ئەوەی باران ببارێت هەست بە هاتنی باران دەکەم، بە هەمان جۆر خەڵکی گوند و ناوچەکەم و تەنانەت خۆیشم، بە هەستێکی پێش وەخت و، چل و چوار ساڵ پێش سەرهەڵدانی "پەیامەکانی نوور" هەستمان بە بارانی ڕەحمەتی ئەو پەیامانە کردبوو!!

سڵاومان بە هەموو برایان و هاوولاتیانمان بگەیەنن و، دوعای خێریان بۆ دەکەین و، ئومێدەوارین ئەوانیش دوعای خێرمان بۆ بکەن.

* * *

(پاشماوەی باسی هەستە پێش وەختەکە)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

ئەم "پاشماوە"یە بە بۆنەی باسی هەستە هەمەکی‌یە پێش وەختەکەی سەرهەڵدانی پەیامەکانی نوورەوە نووسرا. چونکە لە چۆنێتی و جۆری ژیانی بەشێکی قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانی پەیامەکانی نوورەوە دەردەکەوێت و، هەندێکیشیان بۆ خۆیان دانی پێدا دەنێن کە ژیانیان بۆ ئەنجامدانی ئەم خزمەتە مەزنە ساز و ئامادە کراوە، بە وێنەی ئامادەکردنی "پەیامەکانی نوور" بۆ ئەم خزمەتە!

"هەستی پێش وەخت" چ بە شێوەیەکی هەمەکی و چ بە شێوەیەکی هەندەکی لە هەموو کەسێکدا، تەنانەت لە ئاژەڵەکانیشدا هەیە. بەشێکی گرنگی خەونە راستەکان (الرؤيا الصادقة) جۆرێکن لەم هەستە پێش وەختە. هەروەك هێزی ئەو هەستە لە لای هەندێك دەگاتە پلەی کەرامەت..

هەستکردنی منیش بە هاتنی باران لە پێش بیست و چوار سەعاتدا، بەهۆی ئەو هەستەی کە لە دەمارەکانمدا هەیە بەرامبەر شێ و تەڕی، دەگونجێت لە لایەکەوە بە "هەستی پێش وەخت" دابنرێت و، لە لایەکی تریشەوە بەم هەستە دانەنرێت!

کاتێ سەرنجی جۆری ژیانی ئەو برایانەشم دا کە شوێنیان لە خزمەتی پەیامەکانی نووردا هەیە، بینیم ڕەوتی ژیانی ئەوانیش - وەك هی من - بە جۆرێك ئامادە کراوە و بەرێ خراوە کە ئەنجامێکی گەورەی وەك خزمەتی پەیامەکانی نوور بەرهەم بهێنێت.

بەڵێ، شێوازی ژیانی پێشووی برایانم: "خەسرەو، فەیزی، حافظ عەلی، نەزیف" چەند بارودۆخێکی وایان بۆ ڕێکخراوە کە ئەم خزمەتە نووری‌یە بەرهەم بهێنێت. خۆیشیان هەست بەمە دەکەن!

هەروەك دەبینم برا یەکجار تایبەتەکانی ئێرەشم ژیانیان - وەك هی من - بە چەشنێك ڕێك خراوە کە ئەم بەروبوومە نوورانی‌یانە بگرێت. خۆ ئەوانەشیان کە هەست بەمە ناکەن، گەر بە وردی سەرنج بدەن، ئەوانیش لە خۆیاندا هەستی پێ دەکەن.

جاران بەشێکی ئەو دیاردە دەراسایانەی کە لە سەردەمی پێشووی ژیانمدا دەردەکەوتن بە هی زنجیرە کەرامەتەکانی شێخی گەیلانیم - قدّس سرّە - دەزانی، بەڵام وا ئێستا دەرکەوت کە هی زنجیرە کەرامەتەکانی "پەیامەکانی نوور"ن!

○ بۆ نموونە: کاتێ - پێش سەردەمی سەربەستی - هاتم بۆ ئەستەمبووڵ، هەندێ کتێبی تایبەت بە "زانستی کەلام"م کڕی و بە وردی خوێندمنەوە. ئنجا کە هاتم بۆ ئەستەمبووڵ زانایان و مامۆستایانی قوتابخانە ئایینییەکانم بۆ موناقەشە و وتووێژ بانگهێشت کرد و، ڕامگەیاند کە: "وەڵامی هەموو پرسیارێکتان دەدرێتەوە". بەڵام لەوەدا سەرسام بووم کە ئەو کەسانەی دەهاتن بۆ سەردانم پرسیاریان لە بارەی ئەو شتانەوە ئاراستە دەکردم کە لە ڕێی سەفەری هاتنمدا بۆ ئەستەمبووڵ وەڵامەکانیانم خوێندبووەوە، یان ئەوانە بوون کە لە یادم مابوون! چونکە هەموو ئەو مەسەلانەی کە فەیلەسووفەکان بەرچاویان خستبوون لە زەینمدا مابوونەوە و، پرسیارەکانی ئەوانیش هەر لەو بابەتانەدا بوون!

وا ئێستا نهێنیی ئەمەم بۆ ڕوون بووەتەوە و، تێدەگەم کە ئەو سەرکەوتنە ئاشکرا و ڕاگەیاندنە سەیرەم و، دەربڕینی ڕێز و سەرسووڕمانی خەڵکییش، کە زۆر لە سەرووی سنووری خۆمەوە بوون، تەنها لەبەر ئەوە بوو کە ناوەندێکی گونجاو بۆ وەرگرتنی "پەیامەکانی نوور" لە ئەستەمبووڵ و لای زانایانی ئەوێ ساز و ئامادە بکرێت و، ڕادەی گرنگیی ئەو پەیامانە لەوێ بزانرێت.

○ نموونەیەکی تر:

هەر لە منالیمەوە پارە و پوول و دیاریی خەڵکیم بە هیچ جۆرێك لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە و، هەرچەندەش هەژار بووم و گەلێ پێویستم بە پارە بوو، کەچی هەرگیز بە خۆمم ڕەوا نەبینیوە پێویستییەکانم لە لای خەڵکی بدرکێنم، لەگەڵ ئەوەشدا زاهید و، سۆفی و، وەرزشکاری ڕۆحی و، خانەدان و خاوەن نەسەب و دارای ناوبانگیش نەبووم!

بەرامبەر بەمە، خۆم و ئەو برادەرانەش کە دەیانناسیم سەریان سووڕ دەما و ئەم حاڵەتەمان بەلاوە سەیر بوو. پاش چەند ساڵێك لە حیکمەتی ئەمە تێگەیشتم.

ئەوەبوو بۆم دەرکەوت کە ئەو حاڵەتە ڕۆحی‌یە ناوبراوەی خوای گەورە پێی بەخشیبووم، لەبەر ئەوە بووە سەر بۆ پارە و تەماع دانەنەوێنم و، پاشانیش هیچ ڕەخنەیەك ئاراستەی "پەیامەکانی نوور" نەکرێت لەو موجاهەدانەی کە ئەم پەیامانە خستوویانەتە ئەستۆیان. دەنا دوژمنە سامناکەکانم لەو ڕووەوە مشتەکۆڵێکی جەرگبڕیان تێ دەسرەواندم.

○ نموونەیەکی تر:

هەرچەند "سەعیدی کۆن" زۆر لە کاروباری سیاسەتدا ڕۆچووبوو، ئنجا "سەعیدی نوێ"ش گەلێ پێویستی بە کەسانێك هەبوو کە بە زۆری پشت و لایەنی بگرن، کەچی زریان و گێژەڵووکەی "سیاسەت" هەرگیز بە خۆیانەوە سەرقاڵیان نەکرد و، نەیانتوانی سەرنجی ڕابکێشن و، بە سەریدا زاڵ بن و، ناچار بێت بایەخ بە زانینی هەواڵی ئەم تۆفانە ڕامالەرە مرۆییە بدات کە پێنج ساڵ زیاترە سەرجەمی گرۆی مرۆڤی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە[1].

من لەم حاڵەی خۆم زۆر سەرسام بووم هەروەك ئاشنا و ناسراوەکانیشم لەمەدا سەریان سووڕمابوو! تەنانەت لەبەر خۆمەوە بە خۆمم دەوت: ئایا من شێت بووم وا بایەخ بەم حاڵە نادەم کە لەرزەی بە هەموو دنیا خستووە؟ یان خەڵکی هەموویان شێت بوون؟ ئەمەم دەوت و، هەر لەو سەرسامی‌یەشدا دەمامەوە! بەڵام وا ئێستا بە ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی و بەو هەستە پێش وەختەی کە باسکرا و بەهۆی سەرکەوتن و بەدەستهێنانی سەربەستی بۆ پەیامەکانی نوور، دەرکەوت کە ئەو حاڵەتە ڕۆحی‌یە سەیرەم بۆیە پێ درا تاکو بۆ هەموو خەڵکی بچەسپێت کە ئەو ڕاستیی ئیخلاسەی لە پەیامەکانی نووردایە جگە لە "ڕەزامەندیی خوای گەورە" هەرگیز ناگونجێت شوێنکەوتەی هیچ شتێکی تر بێت و، جگە لە قورئانی پیرۆزیش هیچ پاڵپشتێکی تری نی‌یە!

سەعیدی نوورسی

* * *

(١) مەبەست دووەم جەنگی جیهانی‌یە. (وەرگێڕ)

(ئەو شتەی کە شایانی بایەخ پێدانە)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

لە مەسەلەی چوارەمی پەیامی "بەری درەختی ئیمان"دا باسێك هەیە کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

هۆی خۆهەڵنەقورتاندم لە کاروبارە سیاسی‌یەکانی گۆی زەویدا ئەوەیە کە ئەرکی سەرشانی مرۆڤ لەو بازنە فراوانەدا یەکجار کەم و بچووکە، بەڵام سەرنجی ئەو کەسانە بەلای خۆیاندا ڕادەکێشێت کە بایەخی پێ دەدەن و حەزیان لە زانینی هەواڵی ڕووداوەکانە، بە ڕادەیەك کە بایەخدانیان بەو ئەرکانە - کە لە پلەی دووهەمدا دێن - کارمەندی و ئەرکە مەزن و ڕاستەقینەکانی خۆیان لە بیر دەباتەوە، یان بە ناتەواوی پێیان بەجێ دەهێڵێت. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو بازنە فراوانانە مرۆڤ ڕادەپێچن کە لایەنگریی لایەنێکی لە دڵدا دروست ببێت و مەیلی بەلایدا بچێت، ئەو کاتەش گوێ بە ستەمی ستەمکارانی ئەو لایەنە نادات کە مەیلی بە لایاندایە، بەڵکو لەوانەیە لە دڵەوە ئەو ستەمانەشی پێ خۆش بێت! دیارە ئەو کاتەش دەبێتە بەشداری تاوانەکانیان.

دەسا ئەی ئەو بەدبەختانەی کە لە ئەنجامی خۆهەڵقورتاندن و بایەخدانەوە بەو بازنە دوورانە لەزەت لەو بێ‌ئاگاییە مەستکەرە دەچێژن کە لە هەواڵ زانینی ڕووداوە دەرەکی‌یەکاندا هەیە!

گەر خۆهەڵقورتاندن و بایەخدان و حەزی شت زانینی ناو سروشتی مرۆڤ، لە "ڕووی مرۆڤایەتی"یەوە و لەسەر حسابی کارمەندی‌یە مەزن و پێویستەکانی سەرشانتان، بۆ ئەم بایەخ پێدان و بە دوای هەواڵ گەڕانەدا هانتان دەدات و، دەڵێن: ئەمەش هەر پێداویستی‌یەکی مەعنەویی سروشتیی مرۆڤە، ئەوا منیش دەڵێم:

هەروەك خەڵکی بایەخ و حەزی شت زانین و ئاگاداری‌یان تێدا دەهەژێت کاتێ کە مرۆڤێکی دوو سەر یان سێ قاچ ببینن، کەچی مرۆڤی کاملی بێ عەیبی پڕ لە موعجیزات سەرنجیان ناوروژێنێت و بایەخی پێ نادەن..

بە هەمان جۆر، ئەو ڕووداوانەش کە بەسەر گرۆی مرۆڤدا تێدەپەڕن، سەرنجی مرۆڤ بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن. چونکە ڕووبەرێکی فراوانی دەنگ و باس و هەواڵەکان دەگرن. لە کاتێکدا کە هەموو ئەو ڕووداوانە: کاتی و فانی و تەنانەت لەم چەرخەدا ڕووخێنەریشن! کەچی لە هەمان کاتدا سەد هەزار نەتەوەی بەدیهاتووانی وەك ڕەگەزی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی لەگەڵ مرۆڤدا دەژین کە هەر هەموویان شایانی سەرنج لێدان و بایەخ پێدانن، خۆ ئەگەر - بۆ نموونە - لە وەرزی بەهاردا تەنها سەیری یەکێك لەو نەتەوانە - با بڵێین "هەنگ" یان "تریێ" - بکەین ئەوا خۆمان لە بەردەم گەلێ موعجیزات و کاری دەراسای هێندە مەزندا دەبینینەوە کە زۆر زیاتر و بە چەندین قات لە ڕووداوەکانی ناو گرۆی مرۆڤ شایانترن بۆ سەرنج ڕاکێشان و بایەخ پێدان! تەنانەت کاتێ کە بە وردی سەرنجیان دەدرێت، بایەخی مرۆڤ بە تەواوی دەجووڵێنن و، گەلێ چێژ و لەزەتی ڕۆحی و مەعنەویی دەرخوارد دەدەن.

کەواتە بایەخ پێنەدان و وازهێنان لەو چێژ و لەزەتە مەعنەوی و ڕاستەقینانە و، ئاوڕدانەوە لە چەند ڕووداوێکی زیانبەخشی خراپی ڕێبواری نارەسەنی ناو گرۆی مرۆڤ، پاشان پابەندکردنی "ڕۆح" و "ژیری" پێیانەوە و، بایەخ پێدانی لەڕادەبەدەریان، هەرگیز کارێکی ڕاست و دروست نییە.

بەڵێ، ئەگەر دنیا هەمیشەیی بوایە و، ئەو ڕووداوانەش بە بەردەوامی بمانایەتەوە و، سوود و زیان لەوانەوە بهاتایە و، کەسانی هەڵسووڕێنەریشیان توانای بەدیهێنانیان ببوایە..

ئەوا ئەو کاتە بایەخ پێدانیان بە کارێکی ڕاست و دروست دادەنرا! کەچی ئەو حاڵەتانە - بە وێنەی هەڵکردنی با - کتوپڕ و بێ بار و ڕێبوارن و، کاریگەریی هۆکارەکانیشیان کاریگەرییەکی لاوەکیی ناڕاستەقینەیە و، خۆیشیان "جوزئی"ن و، سوود و زیانەکانیشیان نە لە خۆرهەڵات و نە خۆرئاوا و نە لە زەریاکانەوە نایەت، بەڵکو لە لایەن ئەو پەروەردگارە مەزنەوە دێت کە لە ڕەگی

لامـلی خـۆت نزیکـترە و، دڵـی مـرۆڤ لــە نێـوان پەنجــەکانیدایە و، پـەروەردەت دەکات و، کاروبارەکانت ڕێکدەخات و دەیانسازێنێت.

جا ئایا بایەخ نەدانت بە "پەروەردگاری" و "دانسـت"ەکەی ئەو خواوەنـدە، بە شێتی و نەفامی دانانرێت؟

خۆ ئەگەر لە گۆشەی ئیمان و حەقیقەتەوە بڕوانینە مەسەلەکە، ئەوا دەبینـین ئـەم چەشنە بایەخ پێدانانە گەلێ زیانی گەورەیان لـێ دەبێتەوە، چونکـە مـرۆڤ دەخەنـە ناو گۆڕەپانێکی فراوانی بێ یاسا و دەستووری ئەوتۆ کە تەنانەت مرۆڤ دووچاری "بێ ئاگـایی" و نوقمـی کاروبـاری دنیـا دەکـەن و، کـار و ئەرکـە ڕاسـتەقینەکانی سەبارەت بە دواڕۆژەوە، لە بیر دەبەنەوە.

بێ گومان فراوانترینی ئەو بازنە بەرینانە بازنەی سیاسەت و ڕووداوەکانیەتی. بە تایبەت ڕووداوە گشتی‌یەکانی وەك جەنگ، کە "دڵ"ی مـرۆڤ نوقمی بێ ئاگـایی دەکەن تەنانەت دەیشی‌خنکێنن! بە ڕادەیەك کە مەگەر بە ئیمانێکی درەخشانی وەك خۆر کە جێ دەستی قـەدەری خواوەنـد و توانستی پەروەردگار لـە هـەموو شت و بارودۆخ و وەستان و جموجووڵێکدا ببینێت، بتوانرێت ئەو دڵە لەو گێژاوە ڕزگـار بکرێت، تاکو لە ناوەندی تاریکستانە چڕوپڕەکاندا ئەو دڵە نوقـم نـەبێت و نـووری درەخشـانی ئیمانەکـەی نەکوژێتـەوە و "زیـری"ش پێـی بـۆ چــەمکی "سروشــت" و "ڕێکەوت" نەخلیسکێت.

ئا لێرەوەیە کـە دەبینـین "ئـەهلی حەقیقـەت" بـۆ ئـەوەی بگـەن بـە ڕاسـتی و ڕێـی ناسینی خوای گەورە بدۆزنەوە، هەوڵ دەدەن بازنەی زۆری (الكثرة) لە بیر خۆیـان ببەنەوە، تاکو "دڵ" و "بایەخدان" و "چێژ" و "شەوق"یان بەم لا و ئەولادا پەرتەوازە نەبێت و هەموویان لە شتانی پێویستدا بەکار بـهێنن، نەك شـتانی فـانی کـە هـەرگیز سەبارەت بە مرۆڤەوە پێویست نین.

هەر لەم نهێنی‌یە وردەوەیە کـە دەبینـرێت زۆربـەی مرۆڤـە سیاسی‌یەکان تـەقوای کامڵیـان تێدا نی‌یە و، ئەوانەش کە تەقوا و صەلاحەتی تەواویان تێدایـە سیاسـی نـین! جگە لە هاوەڵە بەڕێزەکان و موجاهیدەکانی هاوچەشـنیان لـە پیاوچاکـانی پێشـین.

بەو واتایەی کە: ئەو کەسانەی سیاسەتیان کردووە بە ئامانجی خۆیان، ئایین بە لایانەوە لە پلەی دووهەمدا دێت و حوکمی شوێنکەوتەی دەبێت. کەچی ئاییندار ڕاستەقینە، بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە بە مەزنترین ئامانجی خۆی دەزانێت لە گەردووندا و، بە چاوی عاشقی شەیداوە بۆ سیاسەت ناڕوانێت، بەڵکو بەپێی قۆناغی ئەو سیاسەتە لە پلەی دووهەم یان سێ‌هەمدا دایدەنێت و، دەتوانێت بە وێنەی ئامرازێکی خزمەتگوزار بۆ ئایین و حەقیقەت بەکاری بهێنێت. دەنا - بە پێچەوانەی ئەمەوە - لە نرخ و بەهای ئەڵماسی بەنرخ دادەشکێنێت و دەیهێنێتە ئاستی وردە شووشەی بێ نرخەوە!

پوختەی قسە:

هەروەك حاڵەتی "مەستی" لەزەتێکی شوومی کاتی بۆ مرۆڤی مەست فەراهەم دەهێنێت و، ئەو ئازارانەی لە بیر دەباتەوە کە لە دەمی ئەنجامدانی ئەرکە ڕاستەقینە و پێداویستی‌یەکانی سەرشانیدا دێنە ڕێی.. بە هەمان جۆر، بایەخدانیش بەم جەنگە ڕووخێنەر و ڕووداوە فانی‌یانەش جۆرە "مەستی"یەکی ئەوتۆیە کە بە چەشنێکی کاتی پێداویستی‌یەکانی مرۆڤ بۆ ئەرکە گرنگەکانی سەرشانی و ئازارەکانی ماندووبوونیشی بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەوە لە بیر دەباتەوە و، لەزەتێکی شوومی دەداتێ، یان دووچاری نائومێدی‌یەکی ڕووخێنەری دەکات. کە ئەمەش پێچەوانەی ئەو فەرمانەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت:

﴿لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ﴾ (الزمر:٥٣).

دیارە ئەو کاتەش شایانی تەمێ کردن و تۆڵەی ئەو سەرزەنشتە توندوتیژە خواییە دەبێت کە دەفەرموێت:

﴿وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ (هود:١١٣).

چونکە بە ویستی خۆی و بە شێوەیەکی ناوەکی لە ستەمی ستەمکاراندا بەشداریی کردووە، ئیتر سزای شایانی خۆی لە هەردوو دنیادا وەردەگرێت.

* * *

(ڕزگارکردنی ئیمان مەزنترین چاکەیە لەم سەردەمەدا)

باشترین کردەوەی چاك و مەزنترین فەرمانبەری بەلامەوە - لەم سەردەمەدا - ڕزگارکردنی ئیمانە و هەوڵدانە بۆ بەهێز کردنی ئیمانی کەسانی تر.

کەواتە - براکەم! - وریابە! نزیکی خۆویستی و لەخۆبایی بوون مەبەرەوە و، توخنی هیچ شتێك مەکەوە کە لەمانە نزیکت بخاتەوە. بەڵکو دەبێت "ئەهلی حەقیقەتی ئەم سەردەمە" بە تەواوی خۆیان لە بەشی دەروونی خۆیان داماڵن و واز لە خۆویستی و لەخۆباییبوون بهێنن، بەڵکو ئەمە لە هەموو شتێك پێویستترە جێبەجێی بکەن. چونکە مەزنترین مەترسی کە لەم سەردەمەدا ڕوو دەکاتە مرۆڤ لە ڕێی خۆویستی و لەخۆڕازیبوونەوە دێن. کەواتە با هەموو یەکێك لە ئەهلی حەقیقەت هەمیشە بۆ ناتەواوی و کەمتەرخەمییەکانی خۆی بڕوانێت و، بە تەواوی خۆنەویستی بنوێنێت.

پارێزگاریی ئیمانەکەتان و بەندایەتیتان بۆ خوای گەورە، بە پاڵەوانێتییەکی بێ وێنە لەم بارودۆخە دژوارەدا، پلەیەکی گەلێ بەرزە.

بەڵێ، پەیامەکانی نوور لە بەرامبەر هەموو هێرشە دڕندانەکانی ئەم چەرخەوە هەرگیز شکستیان نەهێناوە، بەڵکو سەرسەختترین ملنەدەر و کەسانی نەیاریان بە ڕەسمی ناچار کرد کە بە بڵاوبوونەوەیان ڕازی بن. تەنانەت وا ماوەی دوو ساڵە و دوای وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر پەیامەکان، بەرپرسە گەورەکان و خاوەن پلە و پایە بەرزەکانی وەزارەتی داد ڕێیان بە سەربەستیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور دا و، پەیامە گشتی و نامە تایبەتییەکانیان بە خاوەنەکانیان دایەوە.

یەکێك لەو شتانەی کە دەیچەسپێنن پەیامەکانی نوور موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن لەم چەرخەدا، شکست نەهێنانی ڕێبازی پەیامەکانی نوورە، وەك ئەو شکستەی کە بەسەر ڕێباز و تەریقەتە سۆفییەکاندا هات، بەڵکو سەرکەوتنیەتی بەسەر نەیارانیدا و هێنانی زۆر کەسی ملنەدەر و سەرسەختە لە لایەن ئەو پەیامانەوە بۆ ناو بازنەی ئیسلام، کە ئەمەش گەلێ ڕووداوی زۆر شایەتن

لەسەری. ئەو ڕووداوانەش قەناعەتیان پێ داین کە خزمەتکردنی ئایین - بە زۆری لەم وڵاتەدا - لە دەرەوەی بازنەی پەیامەکانی نووردا هەرگیز خزمەتێکی کامڵ دەرناچێت، چونکە هەوڵێکی تایبەتی و جوزئی و تاکەکەسی.. یان کارێکی شکست پێهاتووی پشتی پەردە دەبێت.. یان لە ناوەندی چەند تەحریف و تەئویلێکی نابەجێدا چاوپۆشی و نەرمونیانی لە بەرامبەر بیدعەتەکانەوە دەنوێنێت!

برام! مادەم تۆ هیممەتێکی بەرز و ئیمانێکی بەهێزی دامەزراوت هەیە، ئەوا ببە بە قوتابیی پەیامەکانی نوور و، بە ئیخلاس و دامەزراوی و تەوازوعی تەواوەتی‌یەوە دەستیان لێ گیر بکە، تاکو ببیت بە هاوبەشی دەسکەوتە قیامەتی‌یەکانی هەزاران بەڵکو سەدان هەزار قوتابیی نوور، بەپێی دەستووری هاوبەشیی مەعنەوی و قیامەتی‌یانەی کردارەکان. بەم کارەشت خێر و چاکەکانت لە کردەوەی چاکی "جوزئی" و "تاکەکەسی"یەوە دەگۆڕێت بە خێر و چاکەی "هەمەکی" و "بەکۆمەڵ" و، قازانجی بازرگانی‌یەکی سوودبەخشت لەو دنیادا دەست دەخات.

* * *

(چی هانی خەڵکی دەدات بۆ نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی پەیامەکان)؟

برا ئازیز و صدیقەکانم!

ئەمڕۆ کۆمەڵە پەیامێکم بینی لەوانەی کە منالآنی بێ گوناهـ و پیرە کاملەکان نووسیبوویاننەوە و لە ناوەندی ئەو کۆمەڵە پەیامانەدا بوون کە دوای دوو ساڵی وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە، لە لایەن دادگاوە درانەوە بە من.

بە بینینی ئەم کۆمەڵە پەیامە خاوێن و بێگەردانە، قەناعەتم هێنا بەوەی کە لەبەرگرتنەوەیان لە لایەن نەخوێندەوارە بێ‌گوناهەکانەوە بۆ بەربەست دانان لە بەردەم گومانەکانی فەیلەسووف و گومڕایاندا[1]، گەورەترین هۆکارن بۆ

(١) مەبەست ئەوەیە کە ئەوانە هەرچەند نەخوێندەوار بوون، بەڵام وەکو کێشانی نەخش و نیگار لەبەر پەیامە نووسراوەکانیان گرتووەتەوە، تاکو بەشداری خێری نووسینەوە و بڵاوکردنەوەی پەیامەکان بن، دەنا خوێندنەوەیان ئەستەم بووە! (وەرگێڕ)

سەرکەوتن بەسەر نەیارە سەرسەختەکاندا و.. بۆ ناچار کردنی کەسانی بێ ویژدانیش تاکو ویژدان بەکار بهێنن.

جا ئەم بەش بەش و کۆمەڵە پەیامانەی کە لە لایەن نەخوێندەوارەکانەوە نووسراونەتەوە، لە سێ بەرگدا کۆمان کردنەوە.

"پەیامەکانی نوور" هێندە چێژی مەعنەوی و رووناکیی سەرنج ڕاکێش و دڵخۆشیی لەڕادەبەدەریان تێدایە کە هانی گەورە و بچووك دەدەن بۆ نووسینەوەیان لێ ببڕێن، بە ڕادەیەك کە هیچ کام لە داهێنانە تازە و هۆکارە نوێیەکانی هاندانی منداڵ بۆ خوێندنەوە و نووسین، ناگەنە ئاستیان.

ئەمەش دەری دەخات کە پەیامەکانی نوور لە کاری خۆیاندا هەر بەردەوام دەبن و، ڕەگەکانیان بە ناخی دڵ و دەروونەکاندا بڵاو دەکەنەوە و، هەتا سەردەمی نەوەکانی داهاتووش دەمێننەوە و - پشت بە خوا - هیچ هێزێك ناتوانێت ریشەکەنیان بکات.

ئنجا هەروەك دەستنووسەکانی ئەو منداڵە بەری و بێ گوناهانە لە چەند بەرگێکدا کۆکرانەوە، بە هەمان جۆر دەستنووسەکانی ئەو پیر و بەتەمەنانەش کە هاتوونەتە ناو بازنەی پەیامەکانی نوورەوە و لە دوای تەمەنی چل ساڵییەوە دەستیان داوەتە خوێندنەوە و نووسین، خرانە چەند بەرگێکی ترەوە.

ئەو پیرە نەخوێندەوارانەی کە هەندێکیان شوان و ڕەوەند و دەشتەکین، لەم بارودۆخە سەختەدا و سەرباری هەموو تەنگ و چەڵەمەیەك، کار و کۆششیان بۆ پەیامەکانی نوور و خزمەتی ئیمان لە هەموو شتێك بە لاوە لە پێشتر و پێ باشترە. ئەمەش بە ئاشکرا دەری دەخات کە پێویستیی خەڵکی بە "پەیامەکانی نوور" لە پێویستییان بە "نان" زۆر زیاترە، تەنانەت شوانەکان و جووتیاران و ئەوانەی خەریکی دروێنەن، بگرە دەشتەکییەکانیش، خزمەتکردنی پەیامەکانیان لە پێداویستییەکانی خۆیان بە لاوە پێویستترە.

کاتێ خەریکی پێداچوونەوە و هەڵەگیریی ئەو پەیامانە بووم کە منداڵان و پیران نووسیبوویاننەوە و، بە دەست کەم وەختییەوە دەمناڵاند، ئەم خاتیرەیەم بە دڵدا هات:

پێویست بە دڵتەنگی و بێزاری ناکات، چونکە ئەو کەسانەی کە لەسەر خوێندنەوەی پەلە ڕاهاتوون، بە خوێندنەوەی نوسخە دەستنووسەکانی ئەمان ناچار دەبن لەسەرخۆ بیانخوێننەوە! ئەم لەسەرخۆییەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەر یەك لە "ژیری" و "دڵ" و "گیان" و "نەفس" و یەك بە یەکی هەموو هەستەکان ڕاستییەکانی ئەم پەیامانە بچێژن کە بۆ ئەوان وەك خۆراك وان. دەنا بە خوێندنەوەی پەلە تەنها "ژیری" بەشی خۆی وەردەگرێت و، ئەوانی تر بێ خۆراك دەمێننەوە!

لەبەر ئەوە، نابێت پەیامەکانی نوور بە چەشنی خوێندنەوەی زانست و کتێبەکانی تر بخوێنرێنەوە، چونکە ئەو ئیمانە تەحقیقییەی کە لەم پەیامانەدان، لە زانیارییەکانی تر ناچن. کەواتە - جگە لە ژیری - نوور و هێزێکی یارمەتیدەری گەلێ "لەتائیفی" تری مرۆڤن.

پوختەی ئەم قسانە:

نووسینەوە ناتەواوەکانی ئەو منداڵە بێ گوناهـ و پیرە نەخوێندەوارانە، دوو سوودیان تێدایە:

یەکەمیان: خوێنەر ڕادەهێنن کە بە وردی و لەسەرخۆ بیانخوێنێتەوە!

دووهەمیان: مرۆڤ هان دەدەن کە بە ڕێز و سەرسوورمانەوە وانەی مەسەلە ورد و ناسك و بەلەزەتەکانی پەیامەکانی نوور بخوێنێت و، لەو زمانە پاك و بەری و خاوێنانەیان ببیستێت.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(دەرسی حەقیقەتم لای کێ خوێندووە)؟

گومان باشیی زیاد لە پێویستتان بەرامبەر بە من هێندە زۆر و لە سەرووی سنووری خۆمەوەیە کە ناتوانم قبوڵی بکەم، مەگەر بە ناوی کەسی مەعنەویی

پەیامەكانی نوورەوە بێت. دەنا هەرگیز لە توانا و سنووری مندا نی‌یە كە تایبەتكاری‌یەكانی ئەو پلە بەرزانە دەربخەم!

پاشان ڕێبازی پەیامەكانی نوور ڕێبازی تەریقەتی سۆفی نی‌یە، بەڵكو هی حەقیقەتە و، لە نووری ڕێبازی هاوەڵە بەڕێزەكانەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - وەرگیراوە!

ئەم ڕۆژگار و زەمانە هی تەریقەتی سۆفی نی‌یە، بەڵكو زەمانی ڕزگار كردنی ئیمانە.

سوپاس بۆ خوا پەیامەكانی نوور تاكو ئێستا و لە دژوارترین بارودۆخدا ئەم ئەركەی سەرشانی خۆیان ڕاپەڕاندووە.

بازنەی پەیامەكانی نوور لەم ڕۆژگارەدا بریتی‌یە لە بازنەی قوتابیانی ئیمامی عەلی و حەزرەتی حەسەن و حسەین و شێخی گەیلانی، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. چونكە لەسەر شێوازی وەیسی قەرەنی[1]، وانەی حەقیقەتم ڕاستەوخۆ لای ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و بەهۆی شێخی گەیلانی و ئیمام زەینولعابیدین و حەزرەتی حەسەن و حسەینەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - خوێندووە! لەبەر ئەوە، بازنەی كار و خزمەتەكانی ئێمە بازنەكەی ئەوانە.

پاشان من دان بەوەدا دەنێم كە بە هیچ جۆرێك شایانی ئەو پلە بەرزە نیم تا ئەو بەرهەمە بەنرخە لای خوا وەرگیراوە بە هی خۆم دابنێم. بەڵام بەدیهێنانی درەختێكی گەورە و بەرز لە تۆوێكی یەكجار بچووك كارێكە لە توانستی خوای گەورە بەدەر نی‌یە و، بەپێی یاسای كارای خواوەند لە گەردووندا هەمیشە ڕایی دەكرێت و، بەڵگەی مەزنیی ئەو یاسایەی خوایە.

---

(١) یەكێكە لە گەورە مەردانی تابیعین و خەڵكی یەمەنە. لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ژیاوە و موسڵمان بووە، بەڵام لەبەر خزمەتكردنی دایكە پیرەكەی نەیتوانیوە لە مەدینە سەردانی بكات و بە خزمەتی بگات. لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا - خوا لێی ڕازی بێت - هاتووە بۆ مەدینە و پاشان لە كووفە نیشتەجێ بووە. لە جەنگی "صیففین" لەگەڵ حەزرەتی عەلی‌دا بووە - خوا لێی ڕازی بێت - لەوێش دەچێ كە هەر لەو جەنگە و لە ساڵی ٣٧ی كۆچی‌دا شەهید بووبێت. خوا لێی ڕازی بێت. بڕوانە: "أسد الغابة ١/١٧٩ حلیة الأولیاء ٢/٧٩ الأعلام ٢/٣٢". (وەرگێڕ)

وا من سوێندتان بۆ دەخۆم و دڵنیاتان دەكەم كە مەبەستم لە ستایشی پەیامەكانی نوور: پشتگیریی ڕاستییەكانی قورئان و چەسپاندن و بڵاوكردنەوەی پایەكانی ئیمانە.

سوپاسی بێ پایان پێشكەش بە پەروەردگاری میهرەبانم كە ڕاینەهێناوم لە خۆم ڕازی بم، هەروەك عەیب و ناتەواوییەكانی خۆمی بە ڕادەیەك پیشان داوم كە هەرگیز حەزم لەوە نییە خۆم پێش چاوی خەڵكی بخەم.

بەڵێ، كەسێك لەسەر لێواری گۆڕ بێت، ئاوڕ لەو دنیا فانییە ناداتەوە كە لە پشتی خۆیەوە بەجێی هێشتووە. خۆ ئەگەر بۆی بڕوانێت و ئاوڕی لێ بداتەوە ئەوا كارێكی نەفامانەی بە ئەنجام گەیاندووە و زیانێكی گەورەشی لە خۆی داوە.

دەسا خوایە گیان!

لەم چەشنە زیانانە بمان پارێزە. ئامین.

دوعا و سڵاومان بە یەك بە یەكی هەموو برایان بگەیەنن و، تكای دوعای خێریان لێ دەكەین.

* * *

(ڕاستیی "هەمیشەیی" لەسەر شانی كەسانی "فانی" بنیات نانرێت)

... ئەمجارەیان پرسیاری لە بارەی ڕاستییەكی هێندە مەزنەوە كردووە كە هەزار جار لە سەرووی پلە و سنووری خۆمەوەیە و، لەم پرسیارەشیدا پاڵی بە خۆش باوەڕییە زیاد لە پێویستەكەیەوە داوە. دەیەوێت لە گۆشەی كارمەندیی بەرز و مەزنی كەسی مەعنەویی پەیامەكانی نوور و لە گۆشەی یەكێك لە كارمەندییە بەرزەكانی خەلافەتی نبووەتەوە بۆ من بڕوانێت! چونكە لەو ڕووەوە كە من مامۆستای ئەوم تیشكێكی ئەو كارمەندییە ناوبراوانەی لە مندا بینیوە و، هەوڵ دەدات لە گۆشەی ئەو كارمەندییە موقەددەسەوە بۆ كەسی ئاسایی من بڕوانێت و، دەیەوێت من بە مەزهەرێكی ئەو خەلافەتە مەعنەوییە ببینێت!

یەکەم:

"ڕاستیی نەمر و هەمیشەیی" هەرگیز لەسەر شانی کەسانی لەناوچووی "فانی" بنیات نانرێت، دەنا ستەمێکی زۆر سەرهەڵدەدات. چونکە ئەو ئەرکە گرنگەی کە لە هەموو لایەکەوە سیفەتی بەردەوامی و کەماڵی تێدا بێت، نابێ ببەسترێت بە کەسانێکەوە کە دووچاری نەمان و گرفتاری سووکایەتی دەبن. خۆ ئەگەر ببەسترێت پێیانەوە ئەوا خودی ئەو ئەرکە گرنگە تووشی زیانێکی زۆر دەبێت.

دووهەم:

پەیامەکانی نوور زادەی بیری دانەر نین کە بە ڕێژنەی قورئانی پیرۆز یاخود زمانی پێداویستییە ڕۆحییەکانی دانەرەکەیان هەڵقوڵابێتن. واتە چەند ڕێژنە و بەرەکەتێکی ئەوتۆ نین کە تەنها ڕوویان لە موحتاجی و توانا و لێهاتنەکانی خودی دانەر بێت. بەڵکو لە داواکاریی گوێبیستان و هاوڕێ بەڕێز و بێگەرد و ڕاست و توندوتۆڵەکانی دانەرەوە لە دەرسی قورئاندا، سەرچاوەیان گرتووە، کە بە "ڕۆح" داواکاری ئەو ڕێژنە و بەرەکەتانە بوون و پڕ بە دڵ سەلماندوویانە و قبووڵ و جێبەجێیان کردووە. کەواتە چەند ڕێژنەیەکن کە زۆر لە سەرووی توانا و لێهاتنەکانی دانەریانەوەن.

جا هەروەك ئەو هاوڕێ و گوێبیستانە بوون بەهۆی سەرهەڵدانی پەیامەکانی نوور، هەر ئەوانیشن کە قوتابیان و حەقیقەتی کەسی مەعنەویی پەیامەکانی نوور پێکدەهێنن. بەڵام دانەر تەنها بەشێکی لەو ڕاستییەدا هەیە کە لەوانەیە بریتی بێت لە شەرەفی ڕچەشکاندن و پێشکەوتن، گەر بە بێ ئیخلاسی پووچەڵی نەکاتەوە.

سێهەم:

ئەم زەمانە ڕۆژگار و زەمانی کۆمەڵە. چونکە ئەگەر زیرەکی و بلیمەتیی یەك بە یەکی تاکەکەسەکان بگاتە ڕادەی "کاری نائاسایی"ش هێشتا هەر لەوانەیە لە بەرامبەر زیرەکیی کەسی مەعنەویی کۆمەڵەوە شکست بخوات. بۆیە وەك ئەو برا بەڕێزەی کە نووسیویەتی، منیش دەڵێم: ئەرکێکی ئیمانیی گرنگ و مەزنی ئەوتۆ کە لە ڕوویەکەوە جیهانی ئیسلام ڕووناك بکاتەوە و لە ڕووناکییەکانی

زیرەکی‌یەکی قودسی‌یەوە سەری هەڵدابێت، هەرگیز ناخرێتە ئەستۆی یەك کەسی لاوازی بە ڕواڵەت شکست پێهاتوو، کە چەندین دوژمنی لە ژمارەبەدەر و ڕقەبەری سەرسەخت لە مەڵاسدان بۆی و، دەیانەوێت بە سووکایەتی پێکردنی لە شان و شکۆی دابشکێنن. خۆ ئەگەر ئەو ئەرکە مەزنە بخرێتە ئەستۆی ئەو کەسە لاوازەوە و، ئەویش لە ژێر لێدانی توندوتیژی ئەو هەوڵەی دوژمنانیدا لەرزەی پێ بکەوێت، ئەوا کۆڵی سەرشانی لێ دەکەوێتە خوارەوە و ورد و پەراش دەبێت.

* * *

(ئیمانداران پێویستیان بە ڕاستی‌یەکی خاوێنە)

برا ئازیز و صدیق و دامەزراو و دڵسۆز و بێگەردەکانم!

ئەوانەی پەیوەندی‌یان پێمانەوە هەیە، پرسیارێکی گرنگی ماددی و مەعنەویم لێ دەکەن و، هەمان پرسیار بە دەروونی خۆیشمدا دێت، کە ئەمەیە:

بۆچی ڕەفتارێك دەنوێنیت کە تا ئێستا هیچ کەسێك لەو جۆرە ڕەفتارەی لێ نەبینراوە؟ بۆ ئاورێك بە لای ئەو هێزانەدا نادەیتەوە کە گەلێ گرنگن و دەتوانن لە کاروبارەکانتدا یارمەتیت بدەن؟ بۆچی لەم بابەتەدا هەڵوێستت پێچەوانەی خەڵکی‌یە؟ ئەوەتا بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنیت کە هیچ پێویستی‌یەکت بەوانە نی‌یە؟

پاشان بۆچی بە توندی دەست بە ڕووی هەموو پلە و پایەیەکی بەرزەوە دەنێیت کە قوتابی‌یە تایبەتی‌یەکانی نوور - بە یەکدەنگی - تۆ بە شایانیان دەزانن، ئەوەتا بە هەموو توانایەکتەوە لەو پلەوپایانە دوور دەکەویتەوە، لە کاتێکدا کە خەڵکی ئاواتیان بۆ دەخوازن و بە دوایاندا دەگەڕێن! ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانن چەندین سوود و خزمەتی زۆر بە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور بگەیەنن و، ڕێ بۆ فتووحاتی ئەم پەیامانە ئاسان بکەن؟

وەڵام:

ئەهلی ئیمان، لەم کاتەی ئێستادا، تابڵێی پێویستیان بە ڕاستی‌یەکی گەلێ خاوێن و بێگەردە کە هەرگیز نەگونجێت ببێت بەهۆی دەستخستنی هیچ

دەسکەوتێك و، شوێنکەوتەی هیچ شتێك نەبێت و، پلیکانە نەبێت بۆ ئامانجێکی تر و، هیچ مەبەستێك نەتوانێت چلکن و چەپەڵی بکات و، فەلسەفە و گومانەکانیش نەتوانن خۆیانی لە قەرە بدەن و زەفەری پێ ببەن..

ئیمانداران پێویستیان بە ڕاستییەکی ئاوا خاوێن و بێگەردە کە بەرەو ڕاستییەکانی ئیمان ڕێنماییان بکات. تاکو لەم سەردەمەی ئێستادا، کە هێرشی گومڕایی تێدا سەخت بووە و گومان و دوودڵیی هەزار ساڵی ڕەبەقی تێدا کۆبووەتەوە، ئیمانی ئیمانداران بپارێزێت.

جا لە ڕوانگەی ئەم خاڵەوە کە باس کرا، بازنەی خزمەتی پەیامەکانی نوور ئاوڕ لەو کەسانە ناداتەوە کە دەستی یارمەتیی بۆ درێژ دەکەن، چ لە ناوەوەی ولاتدا بن چ لە دەرەوەی! هەروەها گوێ بەو هێزە بایەخدارەشیان نادات کە هەیانە، تەنانەت هەر بە شوێنیشیاندا ناگەڕێت، تاکو لە بەرچاوی موسڵماناندا نەبێت بە هۆکارێك بۆ دەستخستنی ئامانجە دنیاییەکان. چونکە ئەم پەیامانە هۆی ژیانێکی نەبڕاوەی هەمیشەیین و، جگە لەمە هیچ مەبەستێکی تریان نییە.

مادەم ئەمە وایە، ئەوا پەیامەکانی نوور، بە بۆنەی لێکۆڵینەوە لەعادەتبەدەر و هێزە ناوازە و بێ وێنەکانیانەوە، دەتوانن ئەو هەموو گومان و دوودڵییانە لا ببەن کە هێرش بۆ سەر ئیمان دەهێنن و، بە یەکجاری ڕایان بماڵن.

* * *

پلەوپایە نوورانییەکانی دوارۆژ چەند پلەیەکی مەعنەوین و لە لای تێکڕای ئەهلی حەقیقەت بە ڕەوا دادەنرێن، تەنانەت هەموویان ئارەزوومەندی ئەو پلەوپایانەن، کە هیچ زیانێکیان نییە. برا دڵسۆزەکانیشمان، لەبەر باوەڕی باشیان بەرامبەرت پێیان ڕەوا بینیویت، کەواتە ئەگەر پێیان ڕازی بیت ئەوا نە زیان لە ئیخلاست دەکەوێت و نە ئەو برایانەشت پێیان ناخۆش دەبێت، چونکە بەڵگەی زۆریان لایە کە تۆ شایانی ئەو پلەوپایانەیت! کەچی لەگەڵ ئەمەشدا تۆ پێیان ڕازی نابیت و، بە تووڕەیی و توندوتیژییەك دەست بە ڕووی ئەو پلە وپایانەوە دەنێیت

کە هەرگیز بە تەوازوع دانانرێت. زیاد لەمانەش، دەچیت هەستی ئەو برایانەشت زامدار دەکەیت کە ئەو مەقامانەت پێ ڕەوا دەبینن..

جا ئایا بۆچی تا ئەم ڕادەیە و بەم شێوە توندوتیژە دووربەپەرێزی لەو پلەوپایانە دەنوێنیت؟

وەڵام:

هەروەك مەردێکی بەغیرەت لە پێناوی ڕزگار کردنی ژیانی هاوڕێکانیدا خۆی بەخت دەکات، بە هەمان جۆر، لەبەر پاراستنی ژیانی هەمیشەیی ئیماندارانی لە بەرامبەر هێرشی چەندین دوژمنی ترسناکەوە، گەر پێویست بێت (کە ئێستا ئەو پێویستییە هەیە) نەك تەنها ئەو پلەوپایانەی شایانیان نیم، بەڵکو چەندین پلەوپایەی ڕاستەقینەی ژیانی هەمیشەییش لەو پێناوەدا بەخت دەکەم. ئەمە لە پەیامەکانی نوورەوە فێر بووم کە بریتییە لە "شەفەقەت" بەرامبەر بە خەڵکی!

بەڵێ، دەبێت لە هەموو کاتێکدا ئەمە وا بێت. بە تایبەت لەم سەردەمەدا و، بە تایبەتتریش لە دەمی پەرەسەندنی ئەو بێ ئاگاییەدا کە "گومڕایی" لە ناوەندی زاڵ بوونی تەوژمە سیاسی و بیروڕا فەلسەفییەکاندا، بۆ خەڵکی فەراهەمی هێناوە..

لە چەرخێکی وەك ئەم چەرخەی ئێمەدا کە لەخۆبایی بوون و لەخۆڕازی بوونی تێدا ورووژاوە، پلەوپایە بەرزەکان دەیانەوێت هەموو شتێك بکەن بە ئامرازێکی گوێڕایەڵی بەردەستی خۆیان و، هەرچی شت هەیە لە پێناوی ئامانج و مەبەستەکانیاندا بەکاربهێنن. تەنانەت موقەددەساتیشیان دەکەن بە هۆکاری گەیشتنیان بەو پلەوپایانەی دنیا!

خۆ ئەگەر پلەوپایەی مەعنەوی لە ئارادا هەبێت، ئەوا پتر دەرفەتی لێ وەردەگیرێت و، زیاتر لە هەموو شتێك دەتوانرێت بکرێت بە هۆیەکی کاریگەر بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانیان!

لەبەر ئەوە، هەر کەسێك ئەو پلەوپایە مەعنەوییەی ببێت هەمیشە بە تۆمەتبار تەماشا دەکرێت و خەڵکی دەڵێن:

ئەمە بۆ ئەوەی لە بەرچاوی خەڵکیدا پارێزگاریی خۆی بکات و، وا پیشان بدات کە شایانی ئەو پلەوپایانەیە، دەچێت چەندین خزمەتی پیرۆز و خاوێن و ڕاستیی بەرز ئەنجام دەدات، بەڵام دەیانکات بە چەند هۆکار و پلیکانەیەك تاکو بە ئامانجەکانی خۆی بگات!

بەم چەشنە، دەردەکەوێت کە ئەگەر پلەوپایە مەعنەوییەکان تەنها یەك پاداشتیان بۆ مرۆڤ و پلەکەی تێدا بێت، هەزار و یەك زیانیان تێدایە بۆ خەڵکی و بۆ خودی ڕاستییەکانیش، بەهۆی ئەو بێ ڕەواجییەی کە لە گومان و دوودڵییەکانەوە پەیدا دەبن و دێنەرێی ئەو ڕاستییانە!

پوختەی ئەم قسانە:

"ڕاستیی ئیخلاس" نایەڵێت توخنی هەر شتێك بکەوم کە لەوانە بێت بقۆزرێتەوە بۆ دەستخستنی ناوبانگ و گەیشتن بە پلەوپایە ماددی و مەعنەوییەکان.

بەڵێ، هەرچەند ئەمە زیانێکی زۆر بە خزمەتگوزاریی نوور دەگەیەنێت! بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە ڕێنمایی بێگەرد و ڕاستەقینەی (دە کەس)دا پلەی خزمەتگوزاریی هەبێت و ڕاستییەکانی ئیمانیان تێبگەیەنێت کە لە سەرووی هەموو شتێکەوەن، ئەوەم گەلێ پێ باشترە لەوەی کە مرۆڤ لە پلەی "قوتبێکی مەزن"دا بێت و ڕێنمایی (هەزار کەس) بکات. چونکە "چۆنێتی" لە "چەندایەتی" باشترە و، ئەو دە کەسەش حەقیقەتەکانیان لە هەموو شتێك بەلاوە بەرز و باشتر دەبێت و، هەمیشە خۆڕاگر دەبن و، دەگونجێت دڵانی ئەوان - کە لە حوکمی "تۆو"دان - درەختێکی مەزنی زەبەلاحی لێ سەوز ببێت. بەڵام هەزار کەسەکە لەوانەیە لەتاو ئەو هێرش و گومانانەی کە لە لایەنی ئەهلی دنیا و فەلسەفەوە ڕوو بە ڕوویان دەبنەوە، دەوری ئەو قوتبە مەزنە چۆڵ بکەن و بەم لا و ئەو لادا پەرتەوازە بین، چونکە لایان وایە ئەو قوتبە لە گۆشە نیگای خۆی و پلەوپایە و هەستە تایبەتەکانیەوە دەدوێت!

لەبەر ئەوە، خزمەتکاریم پێ باشترە لەوەی خاوەن پلەوپایە بم!

تەنانەت من گەلێ دڵگران بووم و لە خوای گەورە پاڕامەوە کە ئەم جارەیان ئەو مرۆڤە دووچاری هیچ شتێك نەکات کە بۆ ئەنجامدانی پیلانی دوژمنانم و، بێ

هیچ ڕێ و شوێنێکی یاسایی و بە پێنج شێوە و لـە ڕۆژانی جەژندا سووکایەتی پێ کردم. چونکە باسەکە لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەتەوە و، ترسام گەر خوای گەورە دووچاری گرفتێکی بکات، خەڵکی پلەوپایەم بۆ دابنێن و، بڵێن: ئەمەی دووچاری ئەو کەسە بوو ئەنجامی کەرامەتێکی لەعادەتبەدەرە. لەبەر ئەوە، وتم:

"ئەی پەروەردگارم! ئیسڵاحی حاڵی بکە، یان تۆڵەیەکی وای لـێ بسێنەرەوە کە شایانی بێت، بێ ئەوەی ئەو تۆڵەسەندنەوەیە بە شێوەیەك بێت کەرامەتێکی مەعنەوی بگەیەنێت"!

* * *

(بۆ بەرێز بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی لە ئەنقەرە)

ئەگەر دەتەوێت چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێکی لاوازدا ساز بکەیت کـە بـە شێوەیەکی نـاڕەسمی مـاوەی بیست ساڵی ڕەبەقی لـە زینـدانـی تاکەکەسی و دابڕ کردنی تەواوەتی لە خەڵکی بردبێتە سەر و، تەنگ و چەڵەمە و گێروگرفتی بێ وێنەی تووش بووبێت و، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بە بێ دەنگی دانیشتبێت.. گەر دەتەوێت چاوپێکەوتنێکی جیددی و ڕاستەقینەی ناڕەسمیی لەگەڵ ئەو کەسەدا ئەنجام بدەیت، ئەوا فەرموو وا من کەمێك بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵتدا دەدوێم.

یەکەم: دوای وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەکانی دوو دادگا بۆ ماوەی دوو ساڵ لەسەر ئەو کتێب و نووسینانەم کە لە ماوەی بیست ساڵی ژیانمدا دامناون، نەیانتوانی هیچ ماددەیەکیان تێدا بدۆزنەوە کە خۆی لە قەرەی کاری بەڕێوەبردن و ڕژێمی وڵات دابێت، چونکە شتی وایان هەرگیز تێدا نی‌یە. بەڵگەی بێ گومانیش لەسەر ئەم دەعوایە ئەوەیە کە هەموو پەیامە گشتی و نامە تایبەتی‌یەکانیان بۆ گێڕاینەوە و دایانەوە بە خۆمان.

سەبارەت بە ژیانی ڕابوردووی پێش ئەو بیست ساڵەشم، ئەوا بە خۆبەختکاری و گیانفیدایی لـە پێناوی ئەم وڵات و نەتەوەیەدا بەسەر چووە.

باشترین بەڵگەش لەسەر ئەمە، ڕێزلێنانمە لە لایەن سەرکردەی گشتییەوە کە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا و لە ژێر چاودێریی ئەودا سەرکردایەتیی تیپەکانی یاریدەدەرانی خۆبەختکارم دەکرد.. هەروەها ڕێز و ستایشی سەرۆکەکانی ئەنقەرەیە بەرامبەر بە خزمەتگوزارییەکانم لە دەمی جەنگی سەربەخۆییدا.. هەروەها پێشوازی و ڕێزلێنانمە لە لایەن ئەندامانی ئەنجوومەنی پەرلەمانەوە کاتێ کە ڕۆشتم بۆ لایان..

واتە ئەو ئەشکەنجە و ئازارەی کە بە درێژایی ئەم بیست ساڵە تووشی بووم، مامەڵەیەکی نایاسایی و هەڕەمەکی بووە. وا چل جەژنی پیرۆزم لە ماوەی بیست ساڵدا بە تەنیایی و دوور لە خەڵکی بردووەتە سەر! بەڵام وا ئێستا ئەم مامەڵە نایاساییە گەیشتووەتە ڕادەیەك کە خەریکە ئارامم لا هەڵبگرێت. ناچارم مەکەن بەم پیرییە و لەسەر لێواری گۆڕەکەمەوە ئاوڕ لە دنیا بدەمەوە!

پاشان ئێوە لەو ڕووەوە کە پایەی بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایشتان هەیە، دەبێ سۆزێك بۆ خزمەتگوزارییەکانم بنوێنن. چونکە وەك بۆ دادگاکان سەلما: کاتێك وانەی پەیامەکانی نوور دەڕوانێتە دنیا ئەو ڕێیە پیشانی قوتابیانی دەدات کە هەتا دەتوانن پارێزگاریی ڕێسای وڵات بکەن و بوار بە سەرهەڵدانی گەندەڵیی شۆڕش و ئاژاوەکان نەدەن..

هەروەك ئەفسەرانی ئاسایشی سێ پارێزگا هەستیان بەوە کردووە کە قوتابیانی پەیامەکانی نوور لە حوکمی ئەفسەری مەعنەویی ئاسایشدان.

لەم ماوانەی دواییدا تێگەیشتم لەوەی کە بۆچی کارمەندەکان بە زۆری لە چاوپێکەوتنی من دەترسێنرێن؟ تاکو ئەو ڕێز و ڕووتێکردنەی خەڵکی لە من - کە لە سنوورێکدایە لە سەرووی توانامەوەیە و پلەیەکە من شایانی نیم - کەم بکەنەوە و لە نرخی دابگرن..

وا بەوپەڕی ڕوونی و بێ گومانی و، وەك لە چەند نامەیەکی تایبەتیدا بۆ برا تایبەتمەندەکانم نووسیوە بۆ ئێوەشی ڕوون دەکەمەوە کە: هەرگیزاو هەرگیز ڕووتێکردنی خەڵکی بەرامبەر بە کەس و زاتی خۆم قبووڵ ناکەم و بە توندی

دەست بە رووبەوە دەنێم و دەیگێڕمە دواوە، چونکە دژ و پێچەوانەی ڕێباز و ئیخلاسمانە. تەنانەت هەستی گەلێ برای تایبەتمەندم لەم ڕووەوە زامدار کردووە.

بەلام من لە کتێبەکانمدا هەوالدانی ئەو مەردە مەزن و بەڕێزانەم نووسیوە کە پێشتر لەمەڕ گرنگی و نرخ و بەهای پەیامەکانی نوورەوە - کە تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی حەکیمن - ڕایان گەیاندووە و، چەسپاندوومە کە من تەنها خزمەتگوزارێکی سادە و ئاسایی قورئانی پیرۆزم..

خۆ ئەگەر بە فەرزی مەحالیش وا دابنرێت کە من حەزم لەوە بێت خەلکی ڕووم تێبکەن، ئەوا ئەم ڕووتێکردنە لە خزمەتی سەقامگیر بوونی ڕێبازدایە و، سوودەکەی چ ئێوە و چ بەرپرسەکانی تری هاووێنەتان دەگرێتەوە.

مادەم "مردن" لەناو نابرێت و هەموو کەسێك ڕووبەڕووی دەبێتەوە، ئەوا بە مەسەلەیەکی گەلێ مەزنتر لە "ژیان" دادەنرێت. جا لەکاتێکدا کە لە سەدا نەوەدی خەلکی بۆ سەلامەتیی ئەم "ژیانە" تێدەکۆشن، کەچی ئێمەی قوتابیانی پەیامەکانی نوور جیهادی ئەو هێرشە بەهێزەی "مردن" دەکەین کە هەموو کەسێك دەگرێتەوە.

کەواتە سوپاس بۆ خوای گەورە کە پەیامەکانی نوور تا ئێستا توانیویانە ئیعدامی هەتاهەتایی "مردن" سەبارەت بە سەدان هەزار کەس بگۆڕن بە پسوولەی تەواوکردنی کار. دەشتوانین سەدان هەزار شایەت لەسەر ئەمە بخەینە پێش چاو.

جا لە کاتێکدا کە دەبوو ئێوە و کەسانی هاووێنەتان لەوانەی کە نیشتمان و نەتەوەیان خۆش دەوێت، لە گۆشەی ئەم ڕاستییەوە، هانی ئێمەیان بۆ ئەم خزمەتە بدایە و پشتگیرمان بوونایە، کەچی تاوانبارکردنمان لە ئەنجامی چەند شوبهە و گومانێك و، پاشان بێزارکردنمان بە چاودێری و موراقەبەی بەردەوام، کارێکی گەلێ دوورە لە غیرەت و ویژدانەوە. چارەسەری ئەم دیاردەیەش بە ویژدانی بەڕێزتان دەسپێرین.

بەندکراو بە شێوەیەکی نارەسمی
لە بەندیخانەی تاکەکەسی
سەعیدی نوورسی

(بۆ بەڕێوەبەری ئاسایشی پارێزگای ئافیوون)

لەبەر ئەوەی متمانەم بە ویژدان و مرۆڤایەتیتان هەیە، ئەوا کاروبارە یەکجار تایبەتی‌یەکانم بۆ ئێوە ڕوون دەکەمەوە. چونکە بە حوکمی کارمەندی و ئەرکی سەرشانتان لە چەند ڕوویەکی زۆرەوە پەیوەندیتان بە ئێمەوە هەیە. ئەوەتا لە ماوەی بیست ساڵدا و لە لایەن سەدان هەزار کەسی قوتابیانی پەیامەکانی نوورەوە، تەنانەت یەك دانە ڕووداویش کە ڕێسای وڵات بشێوێنێت، ڕووی نەداوە. بەڵگەش لەسەر ئەمە: دان پێدانانی گەلێ ئەفسەری ئاسایشە و، تۆمار نەکردنی هیچ شتێکە لە دژمان لە لایەنی ئەوانەوە.

لە مێرد منداڵێکم بیست کە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی هاتووە بۆ ئێرە. وتم بێ گومان هەواڵی حاڵی منیش دەپرسێت. بۆیە لە بریی قسەکردنم لەگەڵی شتێکم بۆ نووسی، چونکە بەدەست چەند نەخۆشی‌یەکەوە گیرۆدەم. کەچی کتوپڕ بیستم شاری بەجێ هێشتووە!

لەبەر ئەوە هاودەم لەگەڵ ئەم نامەیەدا ئەو نووسینەمتان بۆ دەنێرم کە بۆ بەڕێوەبەری گشتیم نووسیبوو، ئەگەر ڕاتان لەسەری بوو، وەك زانیاری‌یەك، بۆی بنێرن.

لەبەر ئەوەی چاوم بە کەس ناکەوێت و تێکەڵی خەڵکی نابم، هیچ ئاگایەکم لە کاروباری دنیا نی‌یە و، لێرەش جگە لە تۆ کەسی ترم نی‌یە ڕاوێژی پێ بکەم.

ئەو مەسەلەیەی کە تایبەتە بە کەس و زاتی خۆمەوە، شتێکی جوزئی‌یە و بەلامەوە گرنگ نی‌یە. بەڵام ئەو مەسەلەیەی کە پەیوەندیی بە پەیامەکانی نوورەوە هەیە، سەبارەت بەم نەتەوە و نیشتمانەوە گەلێ گرنگە.

بە قەناعەتی یەقینی و دوور لە گومانی خۆم، کە لە چەند نیشانەیەکی زۆرەوە هەستم پێ کردووە، پێتان ڕادەگەیەنم کە ئەم حکوومەت و وڵات و نەتەوەیە لە نزیکترین کاتدا پێویستی‌یەکی زۆریان بە چەند کتێبێکی وەك پەیامەکانی نوور دەبێت بۆ جیهانی ئیسلامی و هەموو دنیا بە گشتی. هەروەها "بوون" و "ڕێز" و

"حورمەت" و "شانازی‌یەکانی مێژووی خۆیان" بە دەرخستن و پیشاندانی ئەم نووسینانە پێش‌چاو دەخەن.

سەعیدی نوورسی

* * *

(لە بارەی نوێژی جەنازەوە)

مەبەست لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا تُصَلِّ عَلى أَحَدٍ مِنهُمْ مَاتَ أَبَداً وَلا تَقُمْ عَلى قَبْرِهِ﴾ (التوبة: ٨٤) ئەو مونافیقانەیە کە لەو سەردەمەدا بە بێ گومانی نیفاقەکەیان دەرکەوتبوو.

کەواتە نابێت لەسەر بناغەی "گومان کردن لە نیفاق"ی کەسێك نوێژی جەنازەی لەسەر نەخوێنرێت. چونکە مادەم بە زمان دەڵێت: "لا إله إلاّ الله" ئەوا بە ئەهلی قیبلە دادەنرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت، گەر تۆبەی لە کرداری خراپی کردبێت و، کوفری ئاشکرا و ڕاشکاوی لە زار دەرنەچووبێت.

جا لەبەر ئەوەی عەلەوی‌یەکان بە زۆری لەو گوندەدا(عەلی کۆی) هەن و، هەندێکیشیان ڕۆشتوونەتە ناو ڕافزی‌یەکانەوە، ئەوا نابێت هیچ کامیان بخرێتە ڕیزی حەقیقەتی مونافیقەکانەوە. چونکە مونافیق ئەو کەسەیە کە ئیمانی نی‌یە و دڵی بە "ئیمان" لێ نادات و، ویژدانی تێدا نی‌یە تا ببزوێت و، دوژمنایەتیی پێغەمبەر ﷺ دەکات. بە وێنەی زەندیقەکانی کاتی ئێستا.

بەڵام عەلەوی و شیعە زیادڕۆچووەکان دوژمنایەتیی پێغەمبەریان ﷺ لە دڵدا نی‌یە، بەڵکو خۆشەویستی‌یەکی زیاد لە پێویستیان بۆ "ئالی بەیت" لە دڵدایە! کەواتە ئەوان لە بەرامبەر گوێ پێ نەدان و قسووری "مونافیقان"ەوە سەبارەت بە خۆشویستنی ئالی بەیت، دەچن زیاد لە پێویست خۆشیان دەوێن! خۆ کاتێ کە سنووری شەریعەت دەبەزێنن، ئەوا بە مونافیق دانانرێن، بەڵکو بە فاسق و ئەهلی بیدعەت دەژمێررێن و، ناڕۆنە ناو کۆمەڵی زەندیقانەوە، گەر قسە بە سێ خەلیفە ڕاشیدەکان (حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان) نەڵێن! کە خودی حەزرەتی

عەلی لێیان ڕازی بووە و یارمەتیی داون، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. هێندە بەسە كە هەروەك حەزرەتی عەلی خۆشی دەویستن، ئەمانیش خۆشیان بوێن و نوێژە فەرزەكانیان جێبەجێ بكەن.

گەورەترین مامۆستای قوتابیانی پەیامەكانی نوور، لە دوای پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عەلی‌یە، خوای لێ ڕازی بێت. كەواتە گەر ئەو شیعە و عەلەوی‌یانەی كە خەڵكی بۆ خۆشویستنی حەزرەتی عەلی بانگ دەكەن، لە ئەهلی سوننەت زیاتر گوێ بۆ پەیامەكانی نوور ڕانەگرن، ئەوا لاف و دەعوای خۆشەویستی‌یان بۆ ئەهلی بەیت لە شوێنی خۆیدا نی‌یە!

دوو ساڵ پێش ئێستا بیستم كە منداڵانی بێ گوناهی ئەو گوندە، بە هیممەتی گەرموگوڕ و شەوقی مەزنی سێ براكەی ئەوێمان، پەیامەكانی نووریان نووسیوەتەوە. ئیتر لەو كاتەوە هەموو خەڵكی گوندەكەم خستووەتە ناو دوعاكانمەوە. پشت بە خوا و، پاشان بە فەزڵی هەوڵ و كۆششی ئەو برایانەمان، دوعاكانم بۆ ئەو گوندە، بە خۆڕایی ناڕۆن و بێ ئامانج نابن و، ئەهلی سوننەت و عەلەوی‌یەكانی ئەوێ لە داهاتوودا یەكدەگرن!

* * *

(ژنهێنانی برایانی خەواص)

كاك صەلاحەددینی برامان لە بارەی مەسەلەیەكی تایبەتیی خۆیەوە دەپرسێ، كە دەیەوێ ژن بهێنێ و بڕواتە ناو ژیانی دنیایی و كۆمەڵایەتی‌یەوە. جا مادەم ئەم برایە یەكێكە لە "قوتابی‌یە تایبەتمەندەكان"ی پەیامەكانی نوور، ئەوا نابێت ژن بهێنێت گەر ژن هێنانەكەی زیان بە كاری پەیامەكانی نوور بگەیەنێت!

بەڵام گەر دەزانێت لە توانایدایە خێزانەكەی بكات بە یاریدەدەری خۆی لەم كار و خزمەتەدا - وەك حاڵی ئێستای هەندێ لە برا تایبەتمەندەكانمان - ئەوا دەتوانێت ژن بهێنێت. چونكە ژیانی قوتابی‌یە خەواصەكان تایبەتە بە پەیامەكانی

نوورەوە و، بە ڕای کەسیی مەعنەویی قوتابیانی نوورەوە بەستراوە! خۆ ئەگەر ڕەزامەندیی دایك و باوکیشی لەگەڵدا بێت، ئەوا باشترە و، پشت بە خوا زیانی نابێت.

* * *

(ڕێ و شوێنی کەرامەت لە پەیامەکاندا)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

برا ئازیز و صدیقەکانم!

ئەوەم بە دڵدا هێنرا کە چوار مەسەلەتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

یەکەمیان:

وەڵامی پرسیارێکە بە زمانی حاڵ و گوفتار و چەند حاڵەت و ڕواڵەتێکی جۆراوجۆر، دەکرێت و دەوترێت:

مادەم پەیامەکانی نوور کەرامەتیان هەیە و، زیاتر لە تەریقەتە سۆفی‌یەکان پێشکەوتن و بەرزبوونەوە لە دەرکەوتنی ڕاستی‌یەکانی ئیماندا بە خوێنەرانیان دەبەخشن، تەنانەت هەندێ لە قوتابی‌یە ڕاستەکانی ئەم پەیامانە - لە ڕوویەکەوە - ئەولیا و پیاوچاکن.. ئیتر بۆچی چەند ڕواڵەت و چێژێکی ڕۆحی و کەشفی مەعنەوی و کەرامەتی ماددیی بەرجەستەی وەك هی ئەولیاکانیان پێوە نابینرێت، جگە لەوەش هەر بە دوای ئەم جۆرە شتانەدا ناگەڕێن و بایەخی پێ نادەن؟ ئایا حیکمەت لەمەدا چی‌یە؟

وەڵام:

*یەکەم:*

هۆی ئەمە نهێنیی "ئیخلاس"ە! چونکە ئەو کەسانەی کە نەیانتوانیوە بەسەر دەروونی بەدخوازی خۆیاندا زاڵ بن، چێژ و کەرامەتە فانی و کاتی‌یەکانی دنیایان

بەلاوە دەبێت بە ئامانجی سەرەکی و، بە هاندەری ئەو چێژانە کارەکانی سەر بە دوارۆژیان رادەپەڕێنن! دیارە ئەمەش "ئیخلاس" پووچەڵ دەکاتەوە. چونکە نابێت مرۆڤ لە کارەکانی سەر بە دوارۆژدا بە دوای ئامانجەکانی دنیا و چێژەکانیدا بگەڕێت. خۆ گەر داوایان بکات و بە دوایاندا بگەڕێت ئیخلاسەکەی تێك دەچێت و دەشێوێت.

*دووهەم:*

کەشف و کەرامەتەکان بۆ ئەوەن کە دڵنیایی و متمانە بە دەروونی ڕێبوارانی عەوامی تەریقەت ببەخشن، لەوانەی کە ئیمانێکی تەقلیدییان لە دڵدایە و، نەگەیشتوونەتە پلەی ئیمانی تەحقیقی. هەروەك هەندێ جاریش بۆ بەهێز کردنی ئیمانی ئەو کەسە لاوازانەن کە دووچاری شوبهە و گومان دەبن..

کەچی ئەو بەڵگانەی کە پەیامەکانی نوور بۆ ڕاستییەکانی ئیمان دەیانهێننەوە، هێندە بەهێز و دامەزراون کە لە هیچ لایەکەوە هیچ بوارێك بۆ سەرهەڵدانی شوبهە و گومانەکان ناهێڵنەوە. هەروەك لەم حاڵەدا هیچ پێویستی و داخوازێك بۆ ئەو کەشف و کەرامەتانە نامێنێتەوە کە لەبەر دڵنیا کردن و قەناعەت بەخشین پیشانی مرۆڤ دەدرێن. چونکە ئەو ئیمانە تەحقیقییەی کە پەیامەکانی نوور دەیبەخشن زۆر زیاتر لە کەشف و کەرامەت و چێژەکان بەرزترن. بۆیە قوتابییە ڕاستەقینەکانی پەیامەکانی نوور بە دوای ئەو چەشنە کەرامەتانەدا ناگەڕێن.

*سێیەم:*

یەکێك لە بناغەکانی پەیامەکانی نوور بریتییە لەوەی کە مرۆڤ لە ناخی دەروونیدا شارەزای ناتەواوییەکانی خۆی بێت و، بە لەخۆبوردەیی و خۆبەخت کردن و تەنها لە پێناوی ڕەزامەندیی خوای گەورەدا بۆ خزمەتی ئیمان لێ ببڕێت، بێ ئەوەی ئاوڕ لە هیچ کەسێکی تری غەیری خوای گەورە بداتەوە.

کەچی ئەو ئیختیلافەی کە لە نێوان خاوەن کەشف و کەرامەتەکانی ئەهلی تەریقەتدا هەیە و، حەسوودی و مونافەسەی نێوانیان، بە تایبەت لەم چەرخەدا کە

"خۆویستی" و "لە خۆبایی بوون" تیایدا پەرەی سەندووە، وای لە گومڕایان کردووە گومانی بەد بەو مەردە پاك و پیرۆزانە ببەن و، بە "خۆویست" ناوزەد و تۆمەتباریان بکەن..

ئا لێرەوە تێدەگەین کە بۆچی قوتابیانی نوور داوای کەشف و کەرامەت بۆ کەس و خودی خۆیان ناکەن و، بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی هەڵپە و هەناسەبڕکێیان بە دوای ئەم جۆرە شتانە تێدا نی‌یە و، دەزانرێت کە ئەم ڕەفتارە لە هەموو شتێك بۆ ئەوان پێویست‌ترە.

پاشان لە ڕێبازی پەیامەکانی نووردا بایەخ و گرنگی بە "کەس"ی مرۆڤ نادرێت. چونکە هەموان لە ڕووی هاوبەشیی مەعنەویی کردەوەکان و توانەوەی هەریەکەیان لە براکانیاندا، ئەو هەزاران کەرامەتە زانستی‌یەیان لێ سەروزیادە کە پەیامەکانی نوور بەدەستیان هێناوە لە ڕووی "ئاسانیی بڵاوبوونەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیمان" و، لەو ڕووەشەوە کە ئەو قوتابیانە "بەرەکەت لە ژیان و گوزەرانی خۆیاندا دەبینن"..

بەڵێ، ئەمانە و ڕێزلێنانە خواییەکانی تری هاوچەشنی ئەمانەیان بەلاوە سەروزیادە، بۆیە بە دوای کەمالات و کەرامەتی کەسیدا ناگەڕێن.

*چوارەم:*

ئاشکرایە کە هەزاران باخی دنیا تەنها تاقە درەختێکی بەهەشت ناهێنن، چونکە یەکەمیان فانی و دووهەمیشیان نەبڕاوە و هەمیشەییە!

خۆ هەست و نەستە ماددی‌یەکانی مرۆڤ هێندە کول و کوێرن کە چێژ و لەزەتی خێرای دنیایان پێ خۆشە و، فەزڵی "بەر"ێکی ئامادەی ئێستا بەسەر "باخ"ێکی نەبڕاوەی بەهەشتی ئەو دنیادا دەدەن!

لەبەر ئەوەیە کە قوتابیانی نوور لەم دنیایەدا داوای چێژە ڕۆحانی و کەشف و کەرامەتە مەعنەوی‌یەکان ناکەن. ئیتر "دەروونی بەدخواز" ئەم حاڵەتە سروشتی‌یەی ناو ناخی مرۆڤ بۆ ئامانجە تایبەتی‌یەکانی خۆی ناقۆزێتەوە!

ڕووداوێك هەیە زۆر لەم حاڵەتەی قوتابیانی نوور دەچێت.. ئەوەتا دەگێڕنەوە کە:

سەختیی ژیان و قورسیی گوزەران زۆری بۆ یەکێك لە وەلیـە پیاوچاکەکان و هاوسەرە خاوەن وەرع و تەقواکەی هێنا، کە هەردووکیان پلەوپایەیان لای خوای گەورە هەبوو. بەڵام موحتاجی و ناچاریی لەڕادەبەدەر وای لە هاوسەرە ئایینداره‌کەی ئەو پیاوچاکە کرد کە بە مێردەکەی بڵێت:

- ئێمە زۆر موحتاجین!

یەکسەر خشتێکی زێڕی خالیسیان خرایە بەردەم!

پیاوەکە بە خێزانەکەی وت:

- ئەم خشتە لە کۆشکەکەی بەهەشتمانەوە بۆمان نێرراوە!

ژنە خواناسەکەی کە ئەمەی بیست، یەکسەر وتی:

- هەرچەند "هەژاری" ماندووی کردووین و زۆری بۆ هێناوین و تا ئەم ڕادەیەی کە لە پێش چاوتدایە دەست کورت و بێ گوزەرانین و، لەولاشەوە گەلێ خشتی زێڕی وەك ئەمەمان لە بەهەشتدا هەیە. ئەوا دەترسم ئەم خشتەی بەهەشت لەم دنیا فانی‌یەدا بەزایە بدەین. بۆیە - ئەی هاوسەرە ئازیزەکەم! - تکات لێ دەکەم کە لە خوای گەورەی بەخشندە بپاڕێیتەوە ئەم خشتە بنێرێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی لە بەهەشت و، لێرەدا نامانەوێت! ئەمەی وت و، یەکسەر لە ڕێی کەشفەوە بینییان خشتەکە ڕۆشتەوە بۆ شوێنەکەی ناو بەهەشتی.

ڕووداوەکە بەم جۆرە دەگێڕنەوە.

جا ئەم دوو پێشڕەوەی ئەهلی حەقیقەت، نموونەیەکی باش و پێشەنگێکی چاکن بۆ قوتابیانی نوور، لەوەدا کە ئەوانیش لەم دنیایەدا بە دوای چێژ و کەرامەتەکاندا نەگەڕێن.

* * *

(خواستی باوك و فرزەندایەتی)

گەلێ دڵخۆش بووم بەو نامە جوانە بێگەردانەی کە لە برایانی شاری "ئەینەبۆلی" و دەوروبەریەوە هاتبوون، کە ماوەیەك ناونیشانی "ئیسپارتە بچکۆلە"ی لەخۆ گرتبوو. هەروەك لە هەموو شارێکی تر زیاتر لە کێشەکەی پێشووماندا دووچاری گرفتی بەندیخانە بوون.

بەڵام ڕێك نەکەوتنی تەواوەتیی ئەو کوڕ و باوکە، لەبەر جیاوازیی مەشرەبەکانیان - لە کاتێکدا کە هەردوو کیان دوو پاڵەوانی نێوان پاڵەوانەکانی نوورن - نیگەرانی کردم. چونکە کوڕ دەبێت ڕەزامەندیی باوکی بەدەست بهێنێت، تەنانەت گەر باوکی لەسەر حەقیش نەبێت.. هەروەها باوکیش نابێت کوڕەکەی لە میهر و سۆزی خۆی بێ بەش بکات، تەنانەت گەر خراپیش بێت بەرامبەری. بگرە ئەگەر جیاوازیی نێوان هەردوو کیان زۆر دووریش بێت و گەیشتبێتە ڕادەی دوژمنایەتی.

جا لە پێناوی پەیامەکانی نوور و.. ئەو "خۆنەویستی"یەی کە لە نێوان قوتابیانی نووردایە و.. نەگرتنی ڕەخنە لە یەکتر و.. چاوپۆشییان لە کەموکوڕیی یەکتری و.. دەستوورەکانی تری پەیامەکانی نوور، قوتابیان ناچارن کە لە نێوان خۆیاندا بسازێن و ئاشت ببنەوە. نەخوازەڵا ئەم باوك و کوڕەی کە گەلێ ڕەوشتی جوان و ڕەفتاری بەرزیان تێدایە و، لە ڕیزی پێشکەوتووانی قوتابیانی پەیامەکانی نووردان.

دەبێ ئەم دوو برایەم چەند شتێکی سەر بە هەست و سۆزی جوزئیی دنیا نەکەن بە مایەی قسە و باسی نێوان خۆیان و، ئەو ڕێز و میهرەبانییەی کە کوڕ و باوکایەتی داخوازیەتی لە خۆیاندا بهێننەدی، سەرەڕای ئەو چاوپۆشی و لە هەڵە خۆشبوونەی کە سیفەتی قوتابی بوون بۆ پەیامەکانی نوور داخوازی دەبێت. دەبا ئەو دوو برایەم - کە زۆرم خۆش دەوێن - لەبەر خاتری من دەستبەرداری ڕەخنە لە یەکگرتن بین و وازی لێ بهێنن.

* * *

(تەرازووی قەناعەت و هەڵپەکردن)

برا بەوەفا و ڕاستەکانم!

پرسیار:

تۆ ناتەوێت لە دەرەوەی بازنەی "نوور"دا پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەدا بەستیت کە گەلێ باوەڕی باشیان پێت هەیە و پلەیەکی مەزنت بۆ دادەنێن، هەرچەندە ئەوان پەیوەندییەکی پتەویان بە "پەیامەکانی نوور"ەوە هەیە و، تۆش خۆشەویستییان لەگەڵدا دەگۆڕیتەوە، بەڵکو پێت خۆشە زیاتر لەگەڵ ئەو کەسانە دابنیشیت و گفتوگۆ بکەیت کە - وەك ئەوان - باوەڕی باشی لەڕادەبەدەریان بەرامبەرت نییە. ئەوەتا بۆ ئەمانە زیاتر دەکرێیتەوە و پتر ڕێزیان لێ دەگریت.. هۆی ئەمە چییە؟

وەڵام:

لە مەکتووبی دووهەمی وتەی سی و سێهەمدا ئەوەمان باس کردووە کە:

خەڵکی ئەم سەردەمە چاکەی خۆیان بە نرخێکی گران بە موحتاجان دەفرۆشن. بۆ نموونە: کولێرەیەکی نانم دەداتێ بۆ ئەوەی دوعایەکی گیرایان بۆ بکەم، گومانیان وایە کە گوایا من پیاوێکی سالحم! چاکەکارییەك بەم چەشنە و بەم نرخە گرانە بێت، هەرگیز نامەوێت! وەك ڕوونم کردووەتەوە ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی وەرنەگرتنی ئەو دیارییانەی پێشکەشم دەکرێن.. کەواتە کەسانی غەیری قوتابیانی نوور وا دەزانن من دارای پلەیەکی مەزن و بەرزم و، ئنجا پەیوەندییەکی بەهێز و ئامادەبوونیان بۆ خزمەت دەردەبڕن. بەرامبەر بەمەش، هەر لەم دنیایەدا، داوای ئەنجامی نوورانیی وەك هی ئەولیاکانم لێ دەکەن. کەواتە ئەوان ئەمەیان دەوێت بەرامبەر بەو چاکە مەعنەوییەی کە بە پەیوەندی و خزمەتەکەیان بەرامبەرم دەینوێنن!

جا لەبەر ئەوەی من هیچ کام لەو جۆرە شتانە لە خۆمدا شك نابەم کە ئەوان بەرامبەر بە چاکەکارییە مەعنەوییەکانیان لە منیان دەوێت، ئەوا لە ڕوویاندا

شەرمەزار دەبم. ئەوانیش کە دەبینن من دارای ئەو تایبەتکاری‌یانە نیم کە گومانیان دەبرد، نائومێد دەبن و لەوانەیە لە خزمەتگوزاری سست و سارد ببنەوە.

هەرچەندەش هەڵپە و هەوڵدانی زۆر و بێ وچان بۆ کاروباری دوارۆژ - لە رووبەکەوە - کارێکی خراپ نی‌یە.. بەڵام لەم رێباز و خزمەتەی ئێمەدا لەوانەیە، لەبەر چەند لەمپەر و تەگەرەیەك، هۆی ناشکوری و نائومێدی بێت، نەك شوکرانە بژێری! چونکە مرۆڤی هەڵپەکار گەر ئەنجامی کردەوەکانی نەبینێت، لەوانەیە نائومێدی سەری تێبکات و، دووریش نی‌یە واز لە خزمەتگوزاریی ئیمان بهێنێت.

لەبەر ئەوە، ئێمە بەپێی رێباز و خزمەتگوزاریمان و لە بازنەی "ئیخلاس"دا "قەناعەت"مان خراوەتە ئەستۆ و، نابێت هەڵپە بۆ ئەنجام و بەرهەمی خزمەتگوزاری‌یەکانمان بکەین، هەرچەندەش گەرموگوڕی و لێبڕان و هەوڵدانی زۆرمان لەم خزمەتەدا پێوە دیارە، چونکە "قەناعەت بوون بە ئەنجام" هەمیشە بەرهەمەکەی "شوکرانە بژێری" و "دامەزراوی" دەبێت لەسەر ئەو رێ‌یە.

بۆ نموونە:

ئەنجامی خزمەت و هەوڵدانمان بۆ سەقامگیری و دامەزراندنی ئیمان لە دڵ و دەروونی هەزاران ئیمانداری پارێزگای "ئیسپارتە"دا، سەروزیادە بۆ ئەوەی قەناعەتێکی تەواومان سەبارەت بە خزمەتەکەمان پێ ببەخشێت، بە رادەیەکی ئەوتۆ کە ئەگەر یەکێك بێت و پلەی دە "قوتب"ی ئەولیا سۆفی‌یەکانیشی ببێت و بتوانێت هەزاران کەس بگەیەنێتە پلەی "ویلایەت" ئەم کارەی ئەو هیچ شتێك لە گرنگی و بایەخ و بەروبوومەکانی کارەکەی ئێمە کەم ناکاتەوە!

لەبەر ئەوە، قوتابیانی نوور لەوپەڕی متمانە و دڵنیاییدان لەم چەشنە بەروبووم و ئەنجامانە. چونکە ئەو قەناعەتەی کە لە "دڵ"ی موریدەکانی ئەو قوتبە مەزنەدایە لەو پلە و پایە بەرزەوە سەری هەڵداوە کە مامۆستا و رابەرەکەیان هەیەتی و هی ئەو بڕیارانەیەتی کە لە کێشە و رووداوەکاندا دەری دەکات! بەڵام "پەیامەکانی نوور" قەناعەتێکی ئەوتۆ لای قوتابیان دروست دەکەن کە گەلێ لە قەناعەتی

موریدانی ئەو قوتبە مەزنە زیاتر بێت، بەهۆی ئەو "بەڵگە" گومان بڕانەی کە تیایاندایە و، لە قوتابیانیەوە دەماودەم دەڕۆن و بە دڵی کەسانی تر دەگەن و، سوود بەوانیش دەبەخشن و تەنها لە دڵ و دەروونی قوتابیانی پەیامەکاندا نامێننەوە..

کەچی ئەو قەناعەتەی لە دڵ و دەروونی ئەو موریدانەدا هەیە قەناعەتێکی تایبەت بە خۆیانە و، بە چەشنی ئەو "بەڵگانە"ی پەیامەکان نی‌یە هەتا بڕواتە ناو دڵ و دەروونی کەسانی تر. چونکە وەك لە زانستی "مەنتیق"دا ڕوون بووەتەوە: وەرگرتنی وتەی پیاوانی مەزن، گەر بەڵگەی لەگەڵدا نەبێت، دڵنیایی و بێ گومانی بە دڵی مرۆڤ نابەخشێت، مەگەر لەو کێشەیەدا مرۆڤ خۆش باوەڕی و گومان باشی‌یەکانی زاڵ بن و، لەم ڕێیەوە قەناعەت و متمانەی بۆ دروست ببێت..

بەڵام قەناعەتی ڕاستەقینەی پشت بەستوو بە بەڵگە - وەك لە زانستی مەنتیقدا ڕوون کراوەتەوە - بۆ پلە و پایەی ئەو کەسە ناڕوانێت کە قسەکەی لە زار دەردەچێت، بەڵکو بۆ ئەو بەڵگەیە دەڕوانێت کە ئەوەندە بەهێزە زامدار ناکرێت!

جا هەموو بەڵگەکانی "پەیامەکانی نوور" لەم بەشەن، واتە "بەڵگەی یەقینی"ن. چونکە ئەو حەقیقەتانەی کە ڕێبوارانی ڕێی ویلایەتی سۆفیێتی لە ئەنجامی کردار و پەرستن و سلووك و وەرزشی ڕۆحی پێیان دەگەن، هەروەها ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە ئەوان لە پشت پەردەوە دەیانبینن، پەیامەکانی نووریش وەك ئەوان دەیانبینن و پێیان دەگەن. بەڵام ئەم پەیامانە ڕێیەکی تریان بۆ ئەمە گرتووەتەبەر..

ئەوەتا لە شوێنی "پەرستش"دا ڕێیەکیان لە ناوەندی "زانست"ەوە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت دۆزیوەتەوە و گرتوویانەتەبەر..

لە شوێنی "سلووك و ویردەکان"دا ڕێیەکیان لە ناوەندی "بەڵگە مەنتیقی و زانستی"یەکانەوە لێداوە کە ڕاستەوخۆ مرۆڤ دەگەیەنێتە ڕاستیی هەموو ڕاستی‌یەکان..

لە جێی "تەسەووف و تەریقەت"دا ڕێیەکی ڕاستەوخۆیان بۆ ویلایەتی کوبرا لە بازنەی "زانستی کەلام و عەقیدە و ئوسووڵی دین"ەوە دۆزیوەتەوە، کە بە هۆیەوە

توانییان بەسەر گومڕاییەکانی فەلسەفەدا سەربکەون (ئەو فەلسەفەیەی کە لەم سەردەمەدا بەسەر تەوژمی حەقیقەت و تەریقەتدا سەرکەوت). کە واقیع شایەتە لەسەر ئەمە!

جا هەروەك "ڕاستیی قورئان" کە ئەوپەڕی هێزی لەخۆ گرتووە و گوفتاری ڕاست و ڕەوای خوایە، ئایینەکانی تریشی لە هێرش و زاڵبوونی فەلسەفەی سروشتی ڕزگار کردووە و، لەم ڕووەوە قورئان بووە بە مایەی هێز و ورە و پشت پێ بەستنی ئەو ئایینانەی تریش، کە تا ڕادەیەك توانییان - بە بۆنەی قورئانەوە - ئەو چەشنە بناغە و ئوسوولانەی خۆیان بپارێزن کە تەنانەت لە عەقڵیشەوە دوورن..

"پەیامەکانی نوور"یش بە هەمان جۆرن، چونکە یەکێکن لە موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز و، نوورێکن لە قورئانی پیرۆزەوە ڕووەو ئەم سەردەمە درەوشاونەتەوە و ئاراستە کراون..

ئەم پەیامانە لە بەرامبەر هێرشی ئەو گومڕاییە سامناکە زانستییەی کە لە فەلسەفەی ماددییەوە پەیدا بووە، ئیمانی تەقلیدیی باوەڕدارانی عەوامیان پاراست و، بوون بە خاڵی پشت پێ بەستن و مایەی هێز و ورەی هەموو ئیماندارێك و، بە وێنەی قەڵایەکی مەحکەمی سەخت وان کە دەستی بەسەردا ناگیرێ بۆ سەرجەمی ئیمانداران بە گشتی، چ دوور بن چ نزیك! بە چەشنێك کە لە ناوەندی ئەم گشت گومڕاییە سامناکە بێ وێنانەدا، باوەڕی ئیماندارە عەوامەکانی لەوەش پاراستووە کە گومان ڕوو بکاتە "ئیمان"ەکەیان و، پڕوپاگەندە بەتاڵ و ناڕەواکانیش دەکوژێننەوە کە ئاراستەی "ئیسلامەتی"یەکەیان دەکرێت.

بەڵێ، هەر ئیماندارێك لە هەر شوێنێکی جیهاندا، تەنانەت لە چین و هیندستانیش، گەر لە ئەنجامی پەرەسەندن و زاڵ بوونی گومڕایی سەیر و سەمەرە و سامناکی ئەم سەردەمەوە هەر چەشنە دوودڵی و گومانێك بە دڵیدا بێت، لە خۆی دەپرسێت:

ئایا هیچ ناڕەواییەك لە ئایینی ئیسلامدا هەیە تا ئاوای لێ هاتووە؟

کاتێ ئەو لەو سەرسوورمانەدا دەبێت، یەکسەر دەبیستێ کە پەیامێك هەیە بە چەشنێکی گومان بڕ هەموو ڕاستییەکانی ئیمان دەچەسپێنێت و، پشتی فەلسەفە دەشکێنێت و، زمانی کوفر و ئیلحادیش لاڵ دەکات.. هەر کە ئەمە دەبیستێت، بە یەکجارەکی گومان و دوودڵییەکەی دەڕەوێتەوە و، ئیمانەکەی لە چنگی ئەو گومانە دەرباز دەکات و پتر زیاد و بەهێز دەبێت .

* * *

(ئەم هەموو بەڵگەهێنانەوەیە لەبەر چی)؟

....

دووهەم:

برای بەڕێزمان "عەلییە بچکۆلەی ڕۆح بەرز" کە یەکێکە لە قارەمانەکان و، لە جێی (عەبدوڕڕەحمان و لوتفی و حافظ عەلی)دایە، پرسیارێکی ئاراستە کردووم کە لە سەدان شوێنی پەیامەکانی نووردا وەڵامی دراوەتەوە.

ئەمەش پرسیارەکەیەتی:

بۆچی لە پەیامەکانی نووردا ئەم هەموو کۆمەڵە بەڵگانە لەسەر پایەکانی ئیمان دەهێنرێنەوە؟ خۆ وەك لە زانا پێشینەکانمان بیستووە: ئیمانی کەسێکی ئیمانداری عەوام وەك هی وەلییەکی گەورە وایە؟!

وەڵام:

باسەکانی پلەکانی ئیمان لە پەیامی "الآيــة الكــــبرى"دا و.. فەرمایشت و بڕیارەکەی ئیمامی ڕەببانیی نوێکاری هەزارەی دووهەمیش کە دەفەرموێت:

"گرنگترین ئەنجامی تێکڕای تەریقەتە سۆفییەکان بریتییە لە دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ڕاستییەکانی ئیمان"

هەروەها ئەوەش کە فەرموویەتی:

"ڕوونبوونی مەسەلەیەکی ئیمانم لە هەزار کەرامەت پێ باشترە"..

هەروەها ئەو باسەی کە لە کۆتایی پەیامی "الآية الكبرى"دا هاتووە و.. مەسەلەی دەهەمی پەیامی "بەری درەختی ئیمان"یش کە لە پاشبەندەکانەوە وەرگیراوە، لە بارەی حیکمەتی دووپات بوونەوەکانی قورئان و هۆی بەڵگەهێنانەوەی زۆری قورئانەوە دەدوێت سەبارەت بە "پایەکانی ئیمان" بە تایبەت پایەی "تەوحید"..

هەموو ئەو حیکمەتانە، لە تەفسیرە ڕاستەقینەکەی قورئانیشدا هەیە کە "پەیامەکانی نوور"ە!

ئەمە وەڵامی پرسیارەکەیە.

پاشان پەیامەکانی نوور هەموو بەشەکانی ئیمانی (تەحقیقی و، تەقلیدی و، ئیجمالی و، تەفصیلی) و.. خۆڕاگریی ئیمانیشیان لە بەرامبەر هەموو دوودڵی و گومان و هێرشە دڕندانەکانی کوفرەوە، بە ڕوونی پێش چاو خستووە. جا ئەم ڕوونکردنەوانەی پەیامەکانی نوور هیچ پێویستی‌یەکیان بۆ زیادە وەڵامدانەوەی برای ئازیزمان نەهێشتووەتەوە.

*ڕووی دووهەمی مەسەلەکە:*

"ئیمان" تەنها پوختە باوەڕ و تەسدیقێکی چاولێکەرانە نی‌یە، بەڵکو گەلێ پلەی یەکجار زۆری چەشنی پلەکانی نێوان "تۆوی گەشە کردوو" تا دەگاتە "درەختی بەردار"ی تێدایە.. یان ئەو پلانە وەك پلەکانی دانەوەی ڕووناکیی خۆر وان لە ئاوێنە بچووکەکەی ناو دەستماندا هەتا دەگاتە دانەوەی ئەو ڕووناکی‌یە لە تەختایی دەریاکاندا و، تەنانەت لە خودی خۆریشدا.

"ئیمان" ڕاستیی یەکجار زۆر و زەبەندەی هەیە. چونکە گەلێ حەقیقەت لە حەقیقەتەکانی هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورە و.. چەندین ڕاستیی پایەکانی تری ئیمانیش، پەیوەندی‌یان بە ڕاستی‌یەکانی گەردوونەوە هەیە. بە ڕادەیەك کە هەموو ئەهلی حەقیقەت لەسەر ئەوە یەکیان گرتووە کە بەنرخترینی سەرجەمی زانستەکان و لوتکەی زانین و کەماڵی مرۆڤ لە "ئیمان" و ئەو "خواناسی"یە بەرز و قودسی‌یەدایە کە بە بەڵگەکانی "ئیمانی تەحقیقی" ڕوون کراوەتەوە.

بەڵێ، "ئیمانی تەقلیدی" دووچاری هێرشی وەهم و دوودڵی و گومانەکان دەبێت، بەڵام "ئیمانی تەحقیقی" زۆر لەو فراوانتر و بەهێز و قایمترە و، پلەی زۆریشی هەیە..

یەکێك لەوانە پلەی "علم الیقین"ە، کە بە هێز و توانای بەڵگەکانی خۆی بەرەنگاری شوبهە و گومانە هێرش بەرەکان دەبێتەوە. کەچی ئیمانی تەقلیدی لە بەردەم تەنها یەك گومانیشدا توانای بەرگریی نامێنێت!

پلەیەکی تری بریتی‌یە لە پلەی "عین الیقین" کە ئەویش چەندین پلەی یەکجار زۆری لەخۆ گرتووە و، لە چەندین ئاوێنەی بە ئەندازەی ژمارەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا دەردەکەوێت. تەنانەت بە وێنەی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز "گەردوون" دەخاتە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوای گەورە.

پلەیەکی تری بریتی‌یە لە پلەی "حق الیقین". ئەمیش گەلێ پلەی تری لەخۆ گرتووە و، گەر سوپای هەموو گومانەکان هێرش ببەنە سەر خاوەنی ئەم ئیمانە، ناتوانن زەفەری هیچ شتێکی پێ ببەن.

زانایانی زانستی "کەلام" لە هەزاران بەرگی کتێبەکانی خۆیاندا، کە تیایاندا پاڵیان بە ژیری و مەنتیقەوە داوە، لە ڕێی هێنانەوەی بەڵگەی عەقلی‌یەوە ئەو ناسینە ئیمانی‌یەیان ڕوون کردووەتەوە.

ئەهلی "حەقیقەت" و "تەسەووف"یش لە ڕوویەکی ترەوە و بە شێوەیەکی تر و لە سەدان کتێبیاندا - کە پاڵیان بە کەشف و چێژی خۆیانەوە داوە - ئەو ناسینە ئیمانی‌یەیان ڕاڤە کردووە.

بەڵام ڕێبازی ئیعجازبەخشی "قورئان" کە لە هەموویان بەرز و بەهێزترە، بە شێوەیەکی زۆر بڵند و بەهێزتر لە چاو ڕوونکردنەوەکانی ئەو زانا و ئەولیایانە ڕاستی‌یەکانی "ئیمان" و "ناسینی خوای گەورە"یان خستووەتە پێش چاو.

جا "پەیامەکانی نوور" تەنها ئەم ڕێبازە بەهێز و بەرز و گشتی‌یەی قورئانی پیرۆز دەگرنەبەر و پایەکانی ئیمانی پێ ڕاڤە دەکەن، هەر بەو ڕێبازەش ڕووبەڕووی ئەو تەوژمە گەندەڵ و ڕووخێنەر و لە ڕێ لادەرانە دەبنەوە کە ئاراستەی قورئانی پیرۆز

دەکرێن و، ماوەی هەزار ساڵە لە پێناوی جیهانەکانی عەدەمدا دەیانەوێت زیان بە ئیسلام و مرۆڤایەتی بگەیەنن!

بێ گومان پەیامەکانی نوور لە بەرامبەر ئەو دوژمنە لەژمارەبەدەرانەوە پێویستیان بە هێنانەوە و کەڵەکەکردنی چەندین بەڵگەی بێ سنوورە، تاکو بەم بەڵگانەی کە لە ڕێژنەی قورئانەوە سەرچاوەیان گرتووە، ببن بەهۆی پارێزگاری کردنی ئیمانی باوەڕداران.

چونکە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە:

"فوالله لأن يهدي الله بك رجلاً واحداً خير من أن يكون لك حمر النعم"(١).

هەروەها:

"تفكر ساعة خير من عبادة سنة".

جا بۆ گەیشتن بەم جۆرە بیرکردنەوەیە، نەقشبەندییەکان بایەخێکی زۆر گەورە بە "زیکری خەفی" (واتە یادی خوا بە پەنهانی) دەدەن.

سڵاومان بە یەك بە یەکی هەموو برا خۆشەویستەکانمان بگەیەنن و، دوعای خێر بۆ هەموویان دەکەین.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(ڕێ گرتن لە هاتوچۆی مزگەوت)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

چەند مانگێکە فڕوفێڵ لە دژم ساز دەکرێت، وا ئێستا ئەو فڕوفێڵانە ئاشکرا بوون و دەرکەوتن. بەڵام بە فەزڵی چاودێریی خوای گەورە هەموویان بە سووك و ئاسانی ڕۆشتن و بەسەرچوون.

---

(١) جزء من حديث صحيح، أخرجه البخاري في المغازي: باب غزوة خيبر، وفي الجهاد: باب دعاء النبي ﷺإلى الإسلام والنبوة، وباب فضل من أسلم على يديه رجل، وفي فضائل أصحاب النبي ﷺ: باب مناقب علي بن أبي طالب، رضي الله عنه. وأخرجه أحمد: ٥/ ٣٣٣ ، ومسلم برقم: ٢٤٠٦. (وەرگێڕ_ لە چاپە عەرەبییەکەوە).

لە کاتە چۆڵەکاندا جار بە جـار دەچـووم بـۆ مزگـەوت و، قوتابیـانیش - بـە بێ ئاگاداریی خۆم - ژوورێکی بچووکیان لە تەختە لە شوێنی قورئـان خوێنـەکاندا بـۆ دروست کردبووم، تاکو لە سـەرما بمپـارێزێت، بڕیاریشـم دابـوو کـە ئیـتر نـەڕۆم بـۆ مزگەوت. بەڵام ئەفسەرە ناسراوەکەی ئاسایش ئەو ژوورە بچووکە تەختەیەی لابرد و، بە ڕەسمی پێیان ڕاگەیاندم کە سەردانی مزگەوت نەکەم!

ئنجا بەوەشەوە نەوەستان.. بەڵکو هەرا و هوریایەکیان لەناو خـەڵکیدا نایـەوە و ڕووداوەکەیان بە شتێکی گەورە خستە پێش چاوی خەڵکی و دەنکە گەنمێکیان لـێ کردن بە گومەزێکی گەورە.

ڕووداوەکە هیچ گرنگی و بایەخێکی نییە. ئێوە نیگـەران مـەبن. پێـم وایـە بۆیـە بـەم بڕوبیـانووە پڕوپووچانـە سـووکایەتیم پـێ دەکـەن تـاکو - لـە لایەکـەوە - سـنوورێك بۆ ڕووتێکردنی خـەڵکی لـە مـن دابنێـن کـە لـە ڕادەیەکدایـە زۆر لـە شایستەیی و توانای خۆم زیاترە.

ئەوان بۆ ژیانی ڕابوردووم دەڕوانـن و، چاوەڕوانی ئـەوەن کـە بـە وێنـەی ژیـانی پێشووم سووکایەتی پێکردنی ئەوان قبـووڵ نەکـەم. کـەچی مـن ئێسـتا گـەر هـەموو ڕۆژێك هەزار و یەك جار سووکایەتی بهێنرێتە ڕێم (بە مـەرجێ زیـان بـە سـەلامەتیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکان نەگەیەنێت) هەروەها ئەگـەر پـتر لـەمـەش گوشـارم لەسـەر دابنێن، هەر هێشتا شوکرانەی زیاتر پێشکەشی خوای گەورە دەکەم.

جا برایانم!

هـەروەك مـن بایەخـم بـەم مەسـەلـەیە نـەدا، قوتـابیانی ئـێرەش لـەرزەیان پـێ نەکەوت و، ئەم ڕووداوەش - کە چاوەڕوان بووین ڕوو بدات - سوپاس بۆ خوا بـە سەلامەتی تێپەڕ بوو.

دوعا و سڵاومان هەیە بۆ هەموو یەکێك لە برایانمان.

* * *

(ساردکردنەوەی برایانی کارگوزار)

برایانی بەوەفا و ڕاست و ئازیزم!

ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی و بەهێز ئاراستەی دڵم کراوە بۆ ئەوەی کە مەسەلەیەکی یەکجار گرنگتان بۆ دووپات بکەمەوە، هەرچەندەش زووتر بە پوختی بۆم باس کردوون. ئەو مەسەلەیەش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

دوژمنە مونافیقەکانی پشتی پەردە، وەك پیشەی هەموو جارێکی تریان، فەرمانگەکانی داد و سیاسەت و کارگێڕیی دەوڵەتیان وەك ئامرازێکی لەبار بۆ ئیلحادی ئاشکرا بەکار هێناوە و، لەوێوە هێرشەکانی خۆیان کردووەتە سەرمان. بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە هەموو پلان و فڕوفێڵەکانیان شکستیان هێنا و نەزۆك دەرچوون. لەبەر ئەوە، وازیان لەو نەخشانەی پێشوو هێنا کە بوون بە مایەی فتووحاتی پەیامەکانی نوور و، ئەم جارە چەند پلانێکی فێڵبازانە تر و زۆر چەپەڵتریان لەوانەی پێشوو داڕشتووە، بە چەشنێك کە تەنانەت شەیتانیش سەری لێیان سوور دەمێنێت و، هەندێ لە نیشانەکانی ئەم فرت و فێڵە تازانەشیان لێرە دەرکەوتووە.

گرنگترین بناغەکانی ئەو فێڵە سامناکانە: سارد کردنەوەی برا تایبەتمەندە دامەزراوەکانمانە لە خزمەت، بۆ ئەوەی - گەر بۆیان سەربگرێت - وازیان لە پەیامەکانی نوور پێ بهێنن..

ئەوەتا درۆ و دەلەسەی وەهایان هەڵبەستووە و پیلان و فڕوفێڵی ئەوتۆشیان ڕێکخستووە کە مرۆڤ سەرسام دەبێت لێیان. دیارە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەمەش "دامەزراوی" و "توندوتۆڵی" و "وەفا"یەکی ڕاست و بێگەرد و پتەوی وەك ئاسنی دەوێت، بە وێنەی قارەمانەکانی ئیسپارتە..

هەندێ جاریش لە پۆشاکی هاوڕێیەتی و ئامۆژگاریدا بە ناو ریزەکانتاندا بڵاو دەبنەوە. یاخود ترس و وەهمەکان بڵاو دەکەنەوە، گەر بزانن جێیان بۆ دەگرێت و کاریان بۆ ئاسان دەکات. دەبینیت بێ نرخترین و بچووکترین شتی وەك دەنکە

گەنم هێندەی گومەزێك بە گەورە پیشان دەدەن و، ئامۆژگاریی لاوازەکان بەوە دەکەن کە پێیان دەڵێن: (توخنی سەعید مەکەون.. چاودێریی لەسەر دانراوە.. چواردەوری بە جاسووسەکانی حکومەت گیراوە)! تاکو بۆ وازهێنان لە پەیامەکانی نوور هانیان بدەن. تەنانەت چەند کیژێکی تازە پێگەیشتوو بەسەر قوتابیە لاوەکاندا زاڵ دەکەن، تاکو هەوا و ئارەزووی دەروونیان بورووژێنن..

هەروەها دەچن لاوازی و ناتەواوییە کەسییەکانی من بۆ قوتابییە ئەرکانەکانی نوور باس دەکەن، هاودەم لەگەڵ باسی چەند دینداریکی بەناوبانگی ئەهلی بیدعەتدا و پێیان دەڵێن: "ئەوەتا ئێمەش موسڵمانین و، ئایین تەنها بەند نییە بە ڕێبازەکەی سەعیدەوە"!!

هەروەها زانا و ئاییندارە ساویلکە و خۆش باوەڕەکانیش دەخەڵەفێنن و، وەك ئامرازێك بۆ ئیلحاد و بلاوکردنەوەی ئاژاوە و تۆقاندنی خەڵکی هەڵیان دەسووڕێنن..

بە پشتیوانیی خوا ئەوانە لە هەوڵەکانیاندا نائومێد دەبن و، هەموو نەخشە و پلانەکانیان پووچەڵ دەبێتەوە.

دەسا برایانم!

ئێوە بەو چەشنە کەسە نزمانە بڵێن:

ئێمە قوتابیی پەیامەکانی نوورین و، سەعیدیش یەکێکە لە ئێمە.. هەروەها سەرچاوە و گەنجینە و بناغەی پەیامەکانی نوور هەر قورئانی پیرۆزە.. نرخ و بەها و سەرکەوتنی ئەم پەیامانەش بەسەر قین لە دڵترین دوژمندا سەلماوە و دەرکەوتووە، سەرباری ئەوەی کە ماوەی بیست ساڵ دوژمنان لەو پەیامانەیان کۆڵییەوە و شەڕیان پێ فرۆشتن و بە دوایانەوە بوون.. ئنجا سەعیدی دانەر و خزمەتگوزاریشیان تەنانەت گەر - پەنا بە خوا - بڕواتە بەرەیەکی دژ بەو پەیامانەش هێشتا متمانە و وەفامان بۆ "پەیامەکانی نوور" لەرزەی پێ ناکەوێت و پەیوەندیی توندوتۆڵیشمان بەو پەیامانەوە ناپچڕێت.

بەم جۆرە گوفتارانە، دەرگایان لەسەر دادەخەن.

هەروەها دەبێت تا دەتوانن بە نووسینەوە و خوێندنەوەی پەیامەکانی نوورەوە خەریك بین و، بایەخ بە پڕوپاگەندە گەورەکراوەکان نەدەن و، هەروەکو جارانی پێشووتان حەزەری تەواوەتی ئەنجام بدەن.

سڵاومان بە یەکە یەکەی برایانمان بگەیەنن.

سەعیدی نوورسی

* * *

(موناقەشە لەگەڵ زانایاندا مەکەن)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەی میراتگرە بەڕێز و بریکارە ئەمینەکانم!

یەکەم:

بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێتان ڕادەگەیەنم کە چاودێریی پەروەردگار و پشتگیریی‌یە صەمەدانی‌یەکەی سەبارەت بە ئێمە و خزمەتی پەیامەکانی نوور هەر بەردەوامە. چونکە لە ژێر پەردە بە ڕواڵەت ناشیرینەکانەوە هەندێ ئەنجامی لەوپەڕی جوانیدا هەیە. لە بەرامبەر یەك زیانەوە کە پێمان دەگەیەنرێت، سەد و یەك سوودمان لە لایەن خوای گەورەوە پێ دەبەخشرێت. کەواتە گوێ بە گیروگرفتە ڕێبوار و بوومەلەرزە کاتی‌یەکان مەدەن.

سێهەم:

هەرچەند من لێرە گەلێ بێزارم و دڵم تەنگە، بەڵام کە بیر لە هەوڵ و کۆششی بێ وچان و بەردەوامی ئێوە دەکەمەوە و، نامە دڵدەرەوەکانتانم بەدەست دەگات، هەموو دڵتەنگی و بێزاری‌یەکم لەسەر دەڕەوێتەوە. تەنانەت دەبن بە دڵخۆشی و شادمانی.

پێنجەم:

برایانم! دەبێت ئەوپەڕی حەزەر و خۆپاراستن بەکار بهێنن. بە هیچ جۆرێك دەرگای موناقەشە لەگەڵ زانایاندا مەکەنەوە. بەڵکو دەبێ تا لە توانادایە مامەڵەی جوان و ڕەفتاری باشیان لەگەڵدا بکرێت و، هەرگیز خۆتان لە قەرەی غرووره زانستیەکەیان مەدەن، تەنانەت گەر ئەو کەسە مەیلیشی بەلای بیدعەت و شتە تازە پەیدابووەکانیدا بێت[1]. چونکە زەندەقە و ئیلحادی سامناکمان لە بەرامبەرەوەیە و، نابێت ئەو زانا بیدعەتکارانە بۆ ناو ڕیزی مولحیدان پاڵ پێوە بنرێن.

خۆ ئەگەر "زانایانی ڕەسمی"یان بە تایبەتی نارد بۆ لاتان، ئێوە هەرگیز دەرگای قڕە و مشتومڕیان لەگەڵدا مەکەنەوە، چونکە ڕەخنەی ئەوان بە ناوی زانستەوە دەبێت بە بیانوو بەدەست موونافیقانەوە.

ئێوە ئاگاداری ئەو زیانەن کە ئەو مەلا زانایەی ئەستەمبووڵ نایەوە. هەتا دەتوانن لە بەرژەوەندیی پەیامەکانی نووردا هەڵی بگێڕنەوە.

سڵاومان بە هەموو یەکێکی برایانمان بگەیەنن.

* * *

(میهرەبانیی خوای گەورە لە ژێر پەردەی موسیبەتەکاندا)

برایانم!

یارمەتیدانی ئێوە بۆ من - لە دوو ڕووەوە - زۆر گەورە و ئاشکرایە..

یەکەمیان:

هەوڵی بەردەوام و بێ وچانتان لە خزمەتی پەیامەکانی نووردا، هەموو تەنگانە و گیروگرفتێکم لەسەر لادەبات و دەیگۆڕێت بە خۆشی و شادمانی.

---

(١) مەبەست ئەو دوژمنایەتی کردنەی ڕژێمی کەمالیستە بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام لەو قۆناغەدا، چەشنی سەپاندنی بانگ و نوێژ و قورئان خوێندن بە زمانی تورکی و.. هتد، کە بە داخەوە هەندێ زانای ئایینی ساویلکەیان لەو پێناوەدا کردبووە داردەستی خۆیان. (وەرگێڕ)

دووهەمیان:

بە یەقین و دڵنیاییەوە بزانن کە دوعاکانی ئێوە ستەمە ئازاربەخشەکانی ئەوان دەگۆڕن بە چەند سۆز و میهرەبانی‌یەکی پڕ لە چاودێریی و بەرژەوەندی. من هیچ گومانێکم لەمەدا نەماوە.

بۆ نموونە: ترساندنی خەڵکی لە من و مەترسی خستنە دڵی کارمەندەکانەوە تاکو توخنم نەکەون، منیان لە گەلێ هەڵە و مەرایی چەندین حاڵەتی پێچەوانەی ئیخلاس و کات بەزایەدان، ڕزگار کرد! ئەوەبوو "قەدەر" لە ناوەندی ستەمی مرۆڤدا دادگەریی خوای گەورەی سەبارەت بە من دەرخست.

جا بە وێنەی ئەمە، هەرچی موسیبەت و گیروگرفتم دێنە ڕێ، هەر هەموویان میهر و سۆزی خواوەندیان لە پشتەوەیە. بۆ نموونە: سەرقاڵ بوونیان تەنیا بە منەوە، با زیانێکیشی بۆ من تێدا بێت، کەچی سەدان پەیامی نوور ڕزگار دەکات.

لەبەر ئەوە، هەرگیز ئێوە - برایانی بەڕێزم! - خەمی منتان نەبێت. تەنانەت لەو کاتانەدا کە سووکایەتیی لەڕادەبەدەرم پێ دەکەن و، زامی قووڵ دەکەنە هەست و نەستەکانم و، لە تاوا دەمەوێت دوعایان لێ بکەم، یەکسەر ئەو مردنەی کە ئەوان ئیعدام دەکات و، دووچاربوونیان بە سزای گۆڕەکانیان کە بەندیخانەی تاکەکەسی‌یە و، ئنجا ئەو سوود و بەرژەوەندی‌یانەش کە لە ئەنجامی سووکایەتی پێ کردنەکەی ئەوان بەم خزمەتمان دەگات..

هەموو ئەمانە، ڕێی ئەوەم لێ دەگرن کە دوعایان لێ بکەم، بۆیە واز لەو دوعایە دەهێنم!

* * *

(لە کاتی بیستنی هەواڵی ناخۆشدا)

با ئەو برایە هەرکاتێك هەواڵی ناخۆش دەبیستێت، وەکو باوکی خوا لێخۆشبووم (میرزا) بکات، نەك وەکو (نووریە)ی دایکم!

چونکە هەرکاتێ هەواڵی ناخۆش بۆ دایك و باوکم بیرایە، وەك ئەوەی یەکێك پێی بوتنایە: (کوڕەکەتان کوژراوە.. یان لێی دراوە.. یان بەند کراوە) باوکم بە بیستنی ئەم چەشنە هەواڵانە دڵخۆش دەبوو.. بە پێکەنینەوە دەیوت:

- ماشاء الله! کەواتە کوڕەکەم هێندە گەورە بووە کە قارەمانێتی بنوێنێت و کارێکی وا مەزن ئەنجام بدات کە خەڵکی باسی بکەن!

کەچی دایکم لە بەرامبەر ئەم خۆشحاڵی‌یەی باوکمەوە، بەکوڵ دەگریا!

دوایی ڕۆژگار دەری خست کە زۆر جار باوکم لەو هەڵوێستەیدا لەسەر حەق بووە!

* * *

(تەئویلی فەرموودەیەکی پیرۆز)

برا ئازیز و صدیقەکانم!

ڕاستی‌یەکی ئیمانی دەبینم کە سەد هێندە زیاتر بەلامەوە گرنگە.

جا لەبەر ئەوەی ماوەی دانانی پەیامەکان تەواو بووە، ئەوا هەرچەندە هەوڵم دا ئەو ڕاستی‌یە دەستگیر بکەم، سەرکەوتنم بەدەست نەهێنا. ناچار چاوەڕوانی ئەوەم کرد کە بە هەست و شعوور پەیی پێ ببەم، ئنجا بە ڕوونی دەری ببڕم. کەچی لەوەشدا سەرکەوتوو نەبووم! وا ئێستا بەوپەڕی پوختی و بە ئاماژەیەکی یەکجار کورت لەو ڕاستی‌یە تەواو فراوانە دەدوێم:

فەرموودەی پیرۆزی: "إنَّ اللّٰه خلقَ آدمَ على صورة الرحمن"[1] یەکێکە لە "جوامع الكلم"[2] و حەدیسە موتەشابیهەکان[3].

---

(١) "خلق الله عز وجل آدم على صورته..." حديث صحيح أخرجه البخاري برقم ٦٢٢٧ ومسلم برقم ٢٨٤١ وأحمد ٢ / ٣١٥ وابن خزيمة في التوحيد ص٢٩ . أما حديث "إن الله خلق آدم على صورة الرحمن" فقد عزاه الحافظ في الفتح ٥ / ١٨٣ لابن أبي عاصم في السنة والطبراني من حديث ابن عمر رضي الله عنهما، وقال الحافظ باسناد رجاله ثقات.

(٢) "جوامع الكلم" بەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ دەوترێت کە وشەی کەمیان تێدا بەکار هاتووە، بەڵام گەلێ واتای زۆریان لەخۆ گرتووە. (وەرگێڕ)

(٣) واتە: ئەو حەدیسانەی کە وەك ئایەتی موتەشابیهـ وان، یان دەبێ بێ چەند و چۆن و لێکدانەوە باوەڕیان پێ بکرێت بەو شێوەیەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستیەتی، یان دەبێ بەو دەستوورە زانستی‌یانەی کە زانایان پابەندی بوون لێکبدرێنەوە. (وەرگێڕ)

لە دەمی خوێندنی "خلاصة الخلاصة" و "الجوشن الكبير"دا[1] سەرنجە گشتی و مەزنەکەی ئەم فەرموودەیە لە ڕووی دڵم دەرکەوت و، منیش بە وێنەی پەرلە (شفرة) و لە نێوان پلەی حەڤدەهەم (شایەتیی زمانی قورئان) و پلەی هەژدەهەم (شایەتیی گەردوون)ی "خلاصة الخلاصة"دا چەند ئاماژەیەکم بۆ دانا. ئەو ئاماژە شفرە ئاسایانەش بەم جۆرەی خوارەوەن:

لا إله إلاّ اللهُ الواجبُ الوجود الواحد الأحد بلسان الحقيقة الإنسانية، بكلمات: حياتــها وحسياتــها وسجياتــها ومقياسيتها ومرآتيتها.. وبكلمات: صفاتــــها وأخلاقها وفهرستيتــها وأنانيتــها.. وبكلمات: مخلوقيتها الجامعــــة وعبوديتــها المتنوعة واحتياجاتــها الكثيرة وفقرهــا وعجزهــا ونقصــها الغــير المحــدودة واستعداداتــها الغير المحصورة.

لا إله إلاّ الله بمحيط لسان الكائنات الكتاب الكبير المجسم والقرآن الجســـماني المعظم، بكلمات: وارداتــها وصرفياتــها وسكنتها ومشتملاتــها وتجديداتــــها وتبديلاتــها بالإنتظام والميزان.. وبكلمات: الحـــدوث والإمكـــان والتغــير في سكنتــها والتغيير والتصوير والتدبير بالإنتظام في جميع مشتملاتــــها والتعــاون والتساند والتناسب بالميزان في عموم أجزائها.

وا زۆر بە پوختــی واتـای ئەم شـفرە کورتـە ڕوون دەکەمـەوە، ئێـوەش بیکـەن بـە پەراوێزی: "خلاصة الخلاصة".

بەڵێ، لە دەمی خوێندنی "خلاصة الخلاصة"دا گەردوونی مەزن لـە بەرچاومدا وەك ئەڵقەیەکی گەورەی زیکری لـێ دێـت، بەڵام لەبەر ئـەوەی زمـانی هـەموو یەکێك لە جۆرەکانی بوونەوەرانی گەردوون گەلـێ فراوانن، ئەوا "ژیری" لـە ڕێـی "بیر"ەوە هەوڵێکی زۆر دەدات و تێدەکۆشێت تاکو بە "علم اليقين" مل بۆ "ناو" و

(١) "خلاصة الخلاصــة" چەند زیکر و تەهلیل و تێفکرینێکی ئیمانییە، مامۆستا نوورسی بەردەوام خوێندوویەتی و، پوختەی پەیامی (الآية الكبرى) و ویردی (الحزب الأكبر النوري)یە. بەڵام (الجوشن الكبير) نزا و پاڕانەوەیەکە بە ناوە جوانەکانی خوای گەورە، لە پێشوا زەینولعابیدینەوە ڕیوایەت کراوە و، هەندێکیشی لە (المستدرك)ی ئیمامی حاکمدا هەیە. (وەرگێڕ)

"سیفەتەکان"ی خواوەند کەچ بکات، ئنجا دوای ئەمە دەتوانێت بە ڕوونی ئەو ڕاستی‌یە ببینێت.

بەڵام کە "ژیری" لە ناوەندی ئەو پێوەرە گشتی و نەخشە بچووك و نموونە ڕاست و تەرازووە بچکۆلەیە و، لەو هەستکردنەدا بە "منێتی" سەیری حەقیقەتی مرۆڤ دەکات، ئەوا بەوپەڕی ئیمان و دڵنیایی و ویژدانی ملکەچ و بینەر و، بەوپەڕی ئاسانی و، لە ڕێی ئاوێنە ئامادە و نزیکەکەی خۆیەوە، بێ ئەوەی ناچاری گەشتی فیکری بێت، ئەو ڕاستی‌یە دەسەلمێنێت و، لەم ڕێیەوە ئیمانی تەحقیقی بەدەست دەهێنێت و، لە ناوەرۆکی ئەم فەرموودەیە تێدەگات کە دەفەرموێت: "إنَّ اللهَ خلقَ آدمَ على صورة الرحمن". چونکە مەبەست بە "صورة" لێرەدا: "سیرەت و، سیفەت و، ڕەوشتەکان"ە، لەبەر ئەوەی مەحاڵە خوای گەورە "صورة" واتە: (وێنە)ی ببێت.

بەڵێ، هەروەك ڕێڕەوانی ڕێبازی تەسەووف بۆ ناسینی خوای گەورە دوو ڕێگایان گرتووەتە بەر، یەکێکیان: ئافاقی و، ئەوی تریان: ئەنفوسی‌یە و، بۆیشیان دەرکەوتووە کە: کورتترین و ئاسانترین و بەهێزترین و دڵنیاترین ڕێ، ڕێی گەشتی "ئەنفوسی"یە، واتە ئەو گەشت و گەڕانەیە کە بە "دڵ"و لە ڕێی زیکری پەنهانەوە ئەنجام بدرێت..

بە هەمان جۆر، پایە بەرزانی ئەهلی حەقیقەتیش دوو ڕێگایان گرتووەتە بەر، بەڵام نەك بە: "معرفة" و "تصوّر"، بەڵکو بە "ئیمان" و "تەسدیق"[1] کە گەلێ لەوان بەرزتر و شایانترن.

یەکەمیان: تەماشاکردنی ئاسۆکان(ئافاق)ە لە ڕێی خوێندنەوەی کتێبی گەردوون. وەك ئەوەی لە "الآية الكبرى"[2] و "الحزب الأكبر النوري" و "خلاصة الخلاصة" و هاووێنەیاندا دەردەکەوێت.

---

(١) بۆ زانینی واتای ئەم زاراوانە بڕوانە پەراوێزی ل (٦٣٧)ی کتێبی (مەکتووبات). (وەرگێڕ)

(٢) کە بریتی‌یە لە تیشکی حەوتەمی کتێبی (تیشکەکان) و، بە سەربەخۆییش بە ناوی (بینینەکانی گەشتیارێك) بڵاومان کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

ئەوی تریان: بەرزبوونەوەیە بۆ پلەی ئەو ئیمانەی کە هیچ چەشنە دوودڵی و گومانێکی ئاوێتە نەبوویێت. ئەمەش لە ڕێی خوێندنەوەی نەخشە(خريطـــة)ی حەقیقەتی مرۆڤ و پێرستی "منێتی" و ماهییەتی ئادەمیزادەوە. کە ئەمەش - تا ڕادەیەك - بەهێزترین پلەی ویجدانی و شعووری و شهوودییە، چونکە تا پلەی "حق اليقين" دڵنیایی دەبەخشێت، بە ڕادەیەك کە ڕووی لە نهێنی: "ئەقرەبییەتی ئیلاهی" و "میراتگریی پێغەمبەرایەتی"یە.

لە باسی "من"ی وتەی سیھەم و، پەنجەرەی "ژیان" و پەنجەرەی "مرۆڤ" لە مەکتووبی سی و سێھەم و، گەلێ شوێنی تری پەیامەکاندا، شتێکمان لە ڕاستیی "بیرکردنەوەی ئەنفوسی" ڕوون کردووەتەوە.

* * *

(پەیامەکان ئەرکی سەرشانیان ڕادەپەڕێنن)

برا بەوەفا و ڕاستەکانم!

هیچ خەمێکتان نەبێت.. من کە باسی ئەو نەخۆشییە سەختەی خۆمتان بۆ دەکەم، کە ئەنجامی ئەو ژەهرە بوو بە پیلان دەرخواردم درا، تەنها لەبەر ئەوەیە دوعا و نزاتانم دەست بکەوێت. کەواتە هیچ پێویست بە خەم و نیگەرانی ناکات، چونکە سوپاس بۆ خوای گەورە ئەو نەخۆشییە ڕێی خوێندنی ویردەکانم و واجبی ڕاستکردنەوەی هەڵەی دەستنووسی پەیامەکانی لێ نەگرتم.

لە خوای گەورە داواکارم پاداشتی ئەو نەخۆشییەم بۆ بنووسێت. خۆم - لە ڕوویەکەوە - بەم نەخۆشییەم ڕازیم، کەواتە ئێوەش خەمی منتان نەبێت. وا ئەرکی سەرشانم لە ژیاندا ڕوو لە تەواوبوونە و، هەر نوسخەیەکی پەیامەکانی نووریش (بە تایبەتی کۆمەڵەکانیان) زۆر لەو باوەڕە باشەی بە (سەعید) هەتانە باشتر دەتوانن ئەرك و فرمانم بەڕێوە ببەن، بەڵکو لە ڕاستیشدا و بە کردار وا خەریکن بەڕێوەی دەبەن. هەر قوتابییەکی فیداکاری تایبەتیی نووریش دەتوانێت بە تەواوی کار و فرمانی ئەو (سەعید)ە جێبەجێ بکات.

کەواتە ئەگەر تەنها یەك (سەعید) لە ئێوە کەم بێتەوە، سەدان سەعیدی مەعنەوی (واتە پەیامەکان) و هەزاران سەعیدی ماددی (واتە قوتابیانی نوور) هەن کە دەتوانن زۆر بە باشی و ڕێکوپێکی ئەو ئەرکە بخەنە ئەستۆیان و ئەنجامی بدەن. هەروەك ئێستا لە ڕاستی و واقیعدا ئەنجامی دەدەن.

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یە، بایەخێکی ئەوتۆ بە "کەس"ی من و ئەو ڕووداوانەی دێنە ڕێم مەدەن، بەڵکو هەمیشە بە دوعا و نزا لە خوای گەورە بپاڕێنەوە کە لەسەر ئیخلاس ڕاگیرمان بکات و، بەم دوعایانەشتان - کە گومان لە گیرابوونیاندا نی‌یە! - یارمەتیی منیش بدەن لەبەر ئەم پیری و ئازارە زۆرانەی دێنە ڕێم.

* * *

(ئەو فەلسەفەیەی کە پەیامەکان هێرش دەکەنە سەری)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برایانی ئازیز و صدديقم!

لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور خەریکن بە ئامێری "ڕۆنیۆ" بڵاودەبنەوە و، زۆر کەس لەو قوتابیان و مامۆستایانەش کە لە قوتابخانەکاندا فەلسەفەی نوێ دەخوێنن، ڕوویان لە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور کردووە، ئەوا بە پێویستی دەزانم کە ئەم ڕاستی‌یەی خوارەوە ڕوون بکەمەوە:

ئەو فەلسەفەیەی کە پەیامەکانی نوور هێرشیان دەکەنە سەر و زللەی توند و بەهێزیان تێ دەسرەوێنن، تەنها فەلسەفە زیانبەخشەکەیە و تێکڕای فەلسەفە نی‌یە. چونکە بەشی "حیکمەت" لە فەلسەفەدا، کە خزمەتی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەکات و یارمەتیی ئاکار و ڕەوشتە بەرزەکان دەدات و ڕێ بۆ پێشکەوتنی پیشەسازی خۆش دەکات، پەیوەندیی باشی لەگەڵ قورئاندا هەیە و سازە لەگەڵی،

بەڵکو خزمەتکاری حیکمەتی قورئانی پیرۆزە و لە دژی ڕاناوەستێت، تەنانەت هەر ناشتوانێت لە دژی ڕابوەستێت. لەبەر ئەوە، پەیامەکانی نوور بەر لەم بەشەی فەلسەفە ناگرن.

بەڵام بەشی دووهەمی فەلسەفە، هەروەك لە لایەکەوە بووە بەهۆی بەربوونەوەی خەڵکی بۆ ناو گومڕایی و ئیلحاد و لیتاوی بۆگەنی فەلسەفەی سروشتی، لە هەمان کاتدا و لە لایەکی تریشەوە بە هەرزەیی و گەمە و گاڵتەوە مرۆڤ بەرەو بێ ئاگایی و گومڕایی دەداتە بەر. ئنجا لەبەر ئەوەی بەو کارە دەراسایانەی خۆی کە وەکو سیحر وان، سنگ لە ڕاستییەکانی موعجیزەی قورئانی پیرۆز دەردەپەڕێنێت، ئەوا پەیامەکانی نوور لە زۆربەی بەشەکانیاندا و بە دامەزراندنی چەندین تەرازووی ورد و دەستووری توندوتۆڵ و، لە ڕێی سازدانی چەندەها بەراوردی پشت بەستوو بە بەڵگەی بەهێز، ڕووبەڕووی ئەم بەشە گومڕایەی فەلسەفە دەبنەوە و زللەی توندوتیژی تێ دەسرەوێنن، لە کاتێکدا کە کاریان بەسەر بەشە ڕاست و سوودبەخشەکەی فەلسەفەوە نییە.

لەم ڕوانگەیەوەیە کە قوتابیانی قوتابخانە نوێیەکان ڕەخنە لە پەیامەکانی نوور ناگرن، بەڵکو بەبێ هیچ دوودڵی و دڵەڕاوکێیەك دەڕۆنە ژێر ئاڵاکەی، پێویستیشە کە بڕۆن.

بەڵام ئەو مونافیقانەی کە لە پشتی پەردەوە چەند زانایەکی ئایینییان لە خشتە برد و لەبەر چەند هۆکارێکی تا بڵێی پڕوپووچ و بێ نرخ ئەوانیان کرد بە دوژمنی پەیامەکانی نوور، لە کاتێکدا کە پەیامەکان کاڵا و تفاقی قوتابخانە شەرعییەکانن و ئەو زانایانەش خاوەنی ڕاستەقینەیانن.. دوور نییە هەر ئەو مونافیقانەی پشتی پەردە بە هەمان جۆر، هەندێك لە کەسانی خاوەن فەلسەفە لە خشتە ببەن و، غرووری زانستییان لە لا بورووژێنن و، بیانکەن بە گژی پەیامەکانی نووردا.

لەبەر ئەوە، نووسینەوەی ئەم ڕاستییە لە پێشەکیی هەردوو کۆمەڵە پەیامی "عەصای مووسا" و "ذوالفقار"دا بە کارێکی زۆر پێویست و گونجاو دەزانم.

سەعیدی نوورسی

(نامەیەك بۆ زانایانی ئەزهەر)

لە لایەنی خۆمەوە پێداچوونەوە و هەڵەگیریم لەو دوو نوسخەیەدا نەکردووە کە دەنێررێن بۆ زانایانی ئەزهەر. کەواتە بێ گومان هەندێ وردە هەڵە و سەهوویان تێدا دەبێت، چ لە ڕووی سەروبۆری وشەکان و چ لە ڕووی دارشتنی دەستەواژە عەرەبی‌یەکانەوە، بە تایبەت لە "خلاصة الخلاصة"دا کە دەکەوێتە کۆتایی. چونکە چەند وردە هەڵەیەکی لەم جۆرەم لە چەند نوسخەیەکی تردا بینی..

لەبەر ئەوە، هەرکاتێ بە گونجاوتان زانی و، دوای پێداچوونەوە و هەڵەگیری لە لایەن زانایانی زمانی عەرەبی‌یەوە، سەرو نوسخە لە کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا" و "زولفەقار"یان بۆ بنێرن و، ئەمەی خوارەوەشی لەگەڵدا بکەن بە هاوپێچ:

(قوتابخانەی زەهرای "پەیامەکانی نوور" گەلێ پێویستی بە مزگەوتی ئەزهەر هەیە، بە وێنەی پێویستیی منالی بچووك بۆ دایکە میهرەبانەکەی. بۆیە هەمیشە داوای ئەوەی لێ دەکات کە لە سۆز و شەفەقەتی خۆی پێ ببەخشێت، چونکە یەکێکە لە قوتابیانی و، وانەی لێ وەرگرتووە و، بووە بە نیشانەی تیری گەلێ دوژمنی دڕندە..

جا ئەم قوتابخانەی زەهرایە لقێکی بچووککراوەیە لە لقەکانی ئەو مزگەوتە مەزنەی کە سەرۆکایەتیی سەرجەم قوتابخانە ئایینی‌یەکانی لە ئەستۆدایە و، جیهانی ئیسلامیی پێ ڕووناك دەبێتەوە..

لەبەر ئەوەیە کە ئەم قوتابی‌یە بچووکە چاوەڕوانی یارمەتیی ئەو مامۆستا بەڕێز و باوکە میهرەبان و ڕابەرە مەزنەیەتی و، تکای وایە دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکات).

* * *

**(دەسکەوتەکانی کارکردن بۆ پەیامەکانی نوور)**

(یوزن مداد العلماء بدماء الشهداء)[١].

(من تمسك بسنتي عند فساد أمتي فله أجر مئة شهيد)[٢].

**بە ئیلهام وەرگرتن لەم دوو فەرموودە پیرۆزە، وا لە نێوان سوودە زۆرە دنیایی و قیامەتی‌یەکانی نووسینەوەی پەیامەکانی نووردا، کە لە بەشەکانی ئەو پەیامانەدا باس کراون و بە تەسدیق و ئەزموونی قوتابی‌یەکانیان چەسپاوە، چەند دانەیەك پێش چاو دەخەین:**

***پێنج جۆر عیبادەت:***

**١ - نووسینەوەی پەیامەکان جیهادی هەرە گرنگی مەعنەوین لە بەرامبەر گومڕایاندا.**

**٢ - ئەو کەسەی کە دەیان نووسێتەوە، خزمەتێك پێشکەش بە مامۆستاکەی دەکات و لە بڵاوکردنەوەی "حەقیقەت"یشدا یارمەتیی دەدات.**

**٣ - لە ڕووی ئیمانەوە خزمەتێکە بە هەموو موسڵمانان.**

**٤ - بەدەستهێنانی زانستە لە ڕێی نووسینەوەیانەوە.**

**٥ - عیبادەتێکی فیکریی ئەوتۆیە کە لەوانەیە ماوەی یەك سەعاتی وەك یەك ساڵ پەرستش پاداشتی بۆ بنووسرێت.**

---

(١) نص الحديث: (يوزن يوم القيامة مداد العلماء ودم الشهداء، فيرجح مداد العلماء على دم الشهداء) رواه الشيرازي في كتاب الألقاب عن أنس والموهبي في فضل العلم عن عمران بن حصين وابن الجوزي في كتاب العلل عن النعمان بن بشير. قال المناوي في فيض القدير (٦ / ٤٦٦) أسانيده ضعيفة لكن يقوي بعضها بعضاً وذكره العجلوني في كشف الخفاء (٢ / ٥٦١) وأورده الغزالي في الإحياء في كتاب العلم قال العراقي: سنده ضعيف. وانظر السيوطي في الجامع الصغير (١٠٠٢٦) وتمييز الطيب ٢٠١ وضعيف الجامع الصغير برقم ٦٤٦٤ .

(٢) رواه ابن عدي في الكامل وابن بشران في الأمالي ٢ / ١٩٣ و ١٤١ وعزاه المنذري في الترغيب والترهيب للبيهقي. والثابت في الحديث الصحيح قوله ﷺ: "إن من ورائكم زمان صبر، للمتمسك فيه أجر خمسين شهيداً منكم" أخرجه الطبراني في الكبير ١٠٣٩٤ والبزار ١ / ٣٧٨ وقال الهيثمي في المجمع (٧ / ٢٨٢): ورجال البزار رجال الصحيح غير سهل بن عامر البجلي وثقه ابن حبان. اهـ. وفي الصحيحة (٤٩٤) قال عن إسناد الطبراني: وهذا إسناد صحيح رجاله كلهم ثقات رجال مسلم.

*پێنج سوودی دنیاییشی تێدایە:*

١ - بەرەکەت لە ڕۆزیدا.

٢ - دڵخۆشی و شادمانی لە دڵدا.

٣ - ئاسانی لە ژیان و گوزەراندا.

٤ - سەرکەوتن لە کاروباردا.

٥ - بەشداربوون لە دوعا تایبەتەکانی هەموو قوتابیانی نووردا، بەهۆی بەدەستهێنانی ناونیشانی "قوتابیی زانست".

دوو ئەنجامی گرنگی کارکردن بۆ پەیامەکانی نوور چ بە قەڵەم و چ بەوەی کە مرۆڤ ببێت بە قوتابی‌یان:

*یەکەم:* عاقیبەت خێری، وەك ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئاماژەیان بۆ دەکەن!

*دووەم:* بەشداربوون لە دەسکەوتە مەعنەوی‌یەکانی هەموو قوتابیانی نووردا، بەپێی خواستی هاوبەشیی مەعنەوی لە بازنەی پەیامەکانی نووردا و، بەدەستهێنانی بەشی خۆی لە کردارە چاکەکانی هەموویاندا.. هەروەها ڕۆشتنە ناو بازنەی "قوتابیانی زانست"ە لەم زەمانەدا کە قوتابیی زانستەکانی تێدا نەماوە.. هەروەها بەدەستهێنانی ڕێزی شایانە لە لایەن مەلائیکەتەکانەوە[1]! تەنانەت بەدەستهێنانی ژیانی شەهیدانیشە لە جیهانی بەرزەخدا - گەر بۆ ئەمە یارمەتی بدرێت و بەختێکی باشی هەبێت - بە وێنەی ئەوەی "حافظ عەلی"ی قوتابیی بەناوبانگی پەیامەکانی نوور بەدەستی هێنا، کە لە پەیامی بەری درەختی ئیماندا باس کرا!

* * *

(خزمەتگوزاریی ئیمان وا دەخوازێت)

یەکەم:

ئەگەر لە مەککەی پیرۆزیشدا بم پێویستە و دەبێت بێم بۆ ئێرە، لەبەر ڕزگار کردنی ئیمان و خزمەتکردنی قورئان. چونکە ئێرە زۆر پێویستی بەم کارە هەیە. جا

(١) کە بە بینینی هەندێ ئەولیای ئەهلی کەشف بە بێ گومانی چەسپاوە. (دانەر)

ئەگەر هەزار و یەك گیانیشم ببێت و، دووچاری هەزار و یەك نەخۆشی ببم و، هەزاران جۆری ئازار و دەردی سەریم بێتەرێ، ئەوا بڕیاری خۆم و بڕیاری هەمووشمان: مانەوەمانە لێرە بۆ خزمەتکردنی ئیمانی ئەم نەتەوەیە و، هەوڵدان بۆ ئەوەی بەختەوەریی هەمیشەییان دەست بخرێت.

ئەمە ئەو دەرسەیە کە لە قورئانی پیرۆزەوە فێری بووین.

دووهەم:

برای بەڕێزم! لە بارەی ئەو سووکایەتی پێکردنەی کە لە بریی ڕێز و ئیحتیرام دەهێنرێتە ڕێم، نامەت بۆ نووسیبووم، تیایدا دەڵێیت:

"ئەگەر لە (میسر) یان لە (ئەمریکا) بوویتایە، بە شانازی و ڕێزەوە لە مێژوودا ناوت دەهێنرا".

برای ئازیز و تێگەیشتووم!

ئێمە بەپێی داخوازی ڕێبازەکەمان تا دەتوانین لە دەست ڕێز و ئیحتیرام و باوەڕباشیی خەڵکی و ئیعجابیان پێمان، هەڵدێین! چونکە ڕاکردن بە دوای ناوبانگدا، کە ڕیایەکی سەیرە و.. چوونە ناو مێژوو بە شانازییەوە، کە لە خۆڕازی بوونێکی فیتنە ئەنگێزە و.. حەز لە خۆدەرخستن و بەدەستهێنانی ئیعجابی خەڵکی.. هەموو ئەمانە، دژ و پێچەوانەی "ئیخلاس"ن کە یەکێکە لە بناغە و ڕێبازەکانی پەیامەکانی نوور. کەواتە ئێمە (سەبارەت بە خۆمان) لەم شتانە ڕادەچڵەکێین و، بە ترسەوە لە دەستیان هەڵدێین، چ جای ئەوەی حەزیان لێ بکەین.

بەڵام (سەبارەت بە پەیامەکانی نوور) کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاون و، بریسکانەوەی ئیعجازی مەعنەوی و، تەفسیر و دەرخەری ڕاستی و نهێنییەکانی ئەو قورئانەن.. سەبارەت بەم پەیامانە، ئێمە لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدەوار و تکاکارین کە ڕەواج و برەویان پێ بدات و، بە خەڵکیی بسەلمێنێت کە پێویستیان پێیانە و، بەها و نرخی هەرەبەرزی ئەم پەیامانە لای هەمووان ئاشکرا بکات و، سەرنجی ڕێز و قەدرزانییان بۆ لا ڕابکێشێت و،

کـەرامەتە مەعنـەوی و یـەکجار ڕوونـەکانیان و سـەرکەوتنیان بەسـەر هـەموو جۆرەکانی کوفر و ئیلحاددا - بە هۆی ئیمانەوە - بۆ هەموو کەسێ دەربخات.

ئێمە دەمانەوێت ئەم شتانە ڕابگەیەنین و، خـەڵکیان لـێ تێبگەیـەنین و، ئـەو تایبەتکارییانە ئاشکرا بکەین.. بەڵێ، ئومێدەواری هاتنەدیی هەموو ئەمانەین لە میهرەبانیی خوای گەورە.

* * *

(یاد و پەندێك)

ئا لەم کاتەدا کە گیرو گرفت و تەنگانە دەورەی داوین، "دەروون"ی شڵەژاوی بێ ئارامم بێزاری کردم.. بەڵام ئەم بڕگەیەی خوارەوە دەمکوت و بێ دەنگی کرد و، خستیە دۆخی شوکرانەبژێرییەوە.

وا ئەم بڕگەیە، کە لە پشتی سەرمەوە دانراوە، لەگەڵ ئەم نامەیەدا دەنێرم بۆتان، بەڵکو سوودی بۆ ئێوەش تێدا بێت:

١ - نەفسەکەم! لەو چێژانەی کە بە دوایاندا دەگەڕایت، تۆ بەشی خۆتت بە زیادەوە وەرگرتووە لە چاو ئەوەی کە لە سەدا نەوەدی خەڵکی وەریان گرت. کەواتە هیچ بەشێکی تۆیان تێدا نەماوە.

٢ - لە کاتێکدا "چێژەکان" هەموویان کاتی و لەناوچوون، کەچی تۆ دەتەوێت هەر بمێننەوە و لەناو نەچن! لەبەر ئەوەشە کە لە ئەنجامی پێکەنینێکدا یەك خولەکی خایاندبێت، دە سەعاتی ڕەبەق فرمێسك دەڕێژیت!

٣ - ئەو ستەم و بەڵا و گرفتانەی هاتنە ڕێت و بەسەرتا دابارین، دادگەریی قەدەری خوایان تێدایە. ئەوان لەسەر تاوانێك ستەمت لێ دەکەن کە ئەنجامت نەداوە، بەڵام قەدەری خوا لەسەر "هەڵە و گوناهە نادیارەکانت" بە دەستی بەڵا و موسیبەتەکان تەمێت دەکات و، لەم ڕێیەوە ئەو گرفتەت بۆ دەکات بە کەفارەتی هەڵەکانت.

٤ - ئەی نەفسە بێ ئارامەکەم! بەهۆی سەدان تاقیکردنەوەی ژیانی خۆت، دڵنیا بوویت لەوەی کە هەموو بەڵا و گرفتە ڕواڵەتییەکان و ئەنجامەکانیان، لە پاشاندا

سەریان لە چەندین بەروبوومی تابلێی بەتام و لەزەتی چاودێریی خواوەندەوە دەردەچێت. چونکە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وعسى أنْ تكرهُوا شيئاً وَهُوَ خيرٌ لكم﴾ (البقرة:٢١٦) وانەی ڕاستی‌یەك دەڵێتەوە كە لەوپەڕی بێ گومانی و دڵنیاییدایە. كەواتە با هەمیشە ئەم وانەیەی قورئانی پیرۆزت لە یاددا بێت. ئەوەش بزانە كە ئەو یاسا خواییەی گەردوون بەڕێوە دەبات - كە یاسایەكی فراوان و مەزنی قەدەری خواوەندە - هەرگیز لەبەر خاتری تۆ ناگۆڕێت!

٥ - دەستووری: "مَنْ آمَنَ بالْقَدَرِ أمِنَ مِنَ الْكَدَرِ" بكە بە ڕابەری خۆت و.. وەك منداڵی نەفام بە دوای تام و چێژی بێ نرخی كاتیدا هەڵپە مەكە و.. هەمیشە بیر بكەرەوە لەوەی كە چێژە لەناوچووەكان چەندین خەم و پەژارە و ئازاری مەعنەویت بۆ بەجێ دەهێڵن، بەڵام ئازار و دەردیسەری‌یەكان چەندین تام و چێژی مەعنەوی و پاداشتی دواڕۆژت بۆ هەڵدەگرن. جا ئەگەر وریا بیت و گێل نەبیت، ئەوا تا دەتوانیت تەنها لەبەر "شوكرانە بژێریی خواوەند" تام و چێژە كاتی‌یەكانت بوێت، چونكە تەنها لەبەر شوكرانە بژێریی خوای گەورەیە كە چێژ و تامە كاتی‌یەكانی دنیا بە مرۆڤ بەخشراون.

* * *

(گفتوگۆیەك لەگەڵ نەفسدا)

برا بەوەفا و ڕاست و ئازیزەكانم!

یەكەم: ئەوەم بە دڵدا هات كە نامەتان بۆ بنووسم، تاكو لەو گفتوگۆ تایبەتی‌یەی نێوان خۆم و "دەروون"م ئاگادارتان بكەمەوە، كە ئەمەی خوارەوەیە:

ئەو تابلۆیەی كە دەیزانن و لە پشت سەرمەوە دانراوە، بە تەواوی "دەروونی بەدخواز"م بێ دەنگ دەكات و ورتەی لێ دەبڕێت. بەڵام ئەمشەو هێرشێكم لە لایەن هاندەرانی هەست و نەستە كوێرەكانەوە كرایە سەر كە زۆر سوورن لەسەر بەكارهێنانی چەكی دەروونی بەدخواز. ئەم هێرشە كاریگەری‌یەكی زۆری لە ڕەگ و دەمارەكانمدا بەجێ هێشت.. لە كاتێكدا كە خۆم لە حاڵەتێكی گەلێ سەیردا بووم، حاڵەتێك كە زادەی ئازارەكانی نەخۆشی و ژەهراوی بوون و

هەست ناسکی‌یە، جگە لە کاریگەریی چرپەچرپەکانی شەیتان بە گوێی دەروونىدا و، خۆشویستنی ژیانیش کە لە سروشتی مرۆڤدا جێگیر بووە و چەسپاوە.. لە ناوەندی ئەم حاڵەتەدا بوو کە ئەو هەست و نەستە کوێرانە هێرشیان کردە سەر "دڵ" و "ڕۆح"م و، ئەوەیان بە گوێمدا چرپاند کە لەوانەیە بمرم و دنیا بەجێ بهێڵم!

بەم چەشنە، نائومێدی‌یەکی ڕەش و ئازارێکی قووڵیان بەسەر "دڵ" و "ڕۆح"مدا هێنا و، هانیان دام کە پتر لەسەر ژیان سوور بم و حەزی پێ بکەم!

ئەو "دەروون"ە بەدخوازە دووهەمە لەگەڵ "شەیتان"دا وتیان:

بۆچی بۆ حەوانەوەی ژیانی خۆت هەوڵ نادەیت؟ بەڵکو دەچیت دەست بە ڕووی ئیسراحەت و حەوانەوەی خۆتەوە دەنێیت؟ بۆچی بە دوای ژیانێکی خۆش و خاوێندا ناگەڕێیت کە لە بازنەی نووردا هەموو تەمەنتی تێدا بەسەر بەریت، بەڵکو بە مردن ڕازی دەبیت و داوایشی دەکەیت؟

کتوپڕ دوو ڕاستیی توندوتیژ و بەهێز پەیدا بوون و، دەروونی بەدخوازی دووهەم و شەیتانیان دەمکوت کرد. ئەو دوو ڕاستی‌یەش ئەمانەی خوارەوەن:

ڕاستیی یەکەم:

مادەم بەهۆی مردنی منەوە کار و فرمانی پاك و پیرۆزی ئیمانیی "پەیامەکانی نوور" بە ئیخلاسێکی زیاترەوە دەردەکەوێت و ڕوون دەبێتەوە، چونکە لە هیچ لایەکەوە بەوە تاوانبار ناکرێت کە ئامرازێك بێت بۆ دەستخستنی دنیا و هۆیەك بێت بۆ خۆویستی و لەخۆڕازی بوون و.. لە دوای مردنم فەرمانبەری و خزمەتگوزاریی ئیمان بە ئیخلاسێکی زیاتر و نزیکتر لە کەماڵەوە بەردەوام دەبێت، چونکە شتێك نامێنێت کە پەیوەندیی بە ژیانی کەسیمەوە ببێت و، حەسوودیی حەسوودکاران بیزوێنێت.

خۆ هەرچەندەش مانەوەم لە ژیاندا لەوانەیە جۆرە یارمەتیدانێکی تێدا بێت بۆ ڕەوتی خزمەتگوزاری‌یەکە، بەڵام کەسێتی‌یە سادەکەشم حەسوودکار و ڕەخنەگری گەلێ زۆری هەیە کە دەتوانن چەندین تۆمەت بۆ ئەو کەسێتی‌یەم ڕێك

بخەن و، بە بۆنەی بێ ئیخلاسی‌یان هێرش بکەنە سەر پەیامەکانی نوور تاکو بۆ خۆیان سوودی لێ وەرنەگرن و، کەسانی تریشیان لێ دوور بخەنەوە.

ئنجا مادەم پاسەوانی فەرمانگەیەك گەر وەنەوز بیباتەوە و خەوی لێ بکەوێت، ئەوا غیرەتمەندانی ئەو فەرمانگە نوورانی‌یە بە وریایی ڕادەپەڕن و، لە بریی ئەو یەك دانە پاسەوانە ئاساییە، هەزاران پاسەوان و ئێشکگر لە مەیداندا دەردەکەون..

لەبەر ئەمە و لە پێناوی هەموو ئەمانەدا، دەبێت بەو مردنەی کە لەمەولا دێت، بوترێت: "بەخێربێیت.. سەرچاوان"!

پاشان بۆچی - ئەی دەروونەکەم! - دەتەوێت لە ڕووی بەخشندەییەوە لە کەسانێکی زۆری قوتابیانی نوور دوابکەویت؟ ئایا هەر ئەوان نەبوون کە سامان و حەوانەوە و هەموو خۆشی‌یەکی دنیایان، تەنانەت گەر پێویست بوو بێت ژیانیشیان لە پێناوی خزمەتگوزاریی نووردا بەخت کرد؟!

بەوپەڕی بێ گومانی‌یەوە بزانە ئەی نەفسەکەم! ڕازی بوون بە ماڵئاوایی کردن لە ژیانی فانی و ماندوویی پیری - گەر پێویست بێت، یان کاتی بێتە پێشەوە - لە پێناوی دەستخستنی ژیانی هەمیشەییدا بۆ گەلێ کەسی بەدبەخت و کڵۆڵ بەهۆی پەیامەکانی نوورەوە، ڕازی بوون بەمە لە بریی ئەوەی بەرەو "نەمان" و "نەبوون" بڕۆیت، شەرەفمەندی‌یەکی گەلێ مەزنە و، لەوپەڕی لەزەت و خۆشیدایە.

ڕاستیی دووهەم:

ئەگەر کۆڵێکی (دە) باتمانی بخرێتە سەرشانی یەکێکی لاواز کە لە هەڵگرتنی یەك باتماندا دەستەوسان بێت، ئنجا هاوەڵەکانیشی لە بریی ئەوەی یارمەتیی بدەن داوای یارمەتی‌یان لێ کرد، چونکە لەبەر ئەوەی لاوازی‌یەکەی ئەویان لێ پەنهان بوو، وایان دەزانی مرۆڤێکی بەهێزە و توانای کۆڵ هەڵگرتنی هەیە.. ئەم کەسە لاوازە لە حاڵەتێکی وادا هەوڵ دەدات یەکجار بەهێز خۆی دەربخات تاکو لە بەرچاوی هاوڕێیانی نەکەوێت و، گومانەکەشیان بە درۆ نەخاتەوە و، لێی نائومێد نەبن. دیارە ئەمەش دەیگەیەنێتە ئەوەی کە دووچاری "تەکەللوف" بێت و خۆی بە

خاوەنی هێزێکی وا پیشان بدات کە لە ڕاستیدا لێی بێ بەشە. ئەمانەش چەند شتێکی قورس و بێزلێکراوی بێ تام و چێژن.

جا هەروەك حاڵی ئەم مرۆڤە وایە، تۆش - ئەی دەروونی بەدخوازی دووهەم و ڕۆچووی ناو قووڵایی هەست و نەستە کوێرەکان! - باش بزانە کە:

ئەم کەسێتی‌یە ئاسایی و سادەیەی من و توانا و لێهاتنم کە دارای هیچ بایەخێك نی‌یە، وەك "تۆو" وایە.. خۆ کەسێك کە بەو جۆرە بێت هەرگیزاو هەرگیز سەرچاوە و کانگا و خولگەی ئەو ڕاستی‌یانەی "پەیامەکانی نوور" نابێت کە لە دەرمانخانەی پاك و پیرۆزی قورئانەوە هەڵقوڵاون و، بە چاکە و سۆز و چاودێریی خواوەندی میهرەبان لەم سەردەمە تاریك و پڕ لە دەرد و ئازارەدا بە دەستی ئێمە سپێرراون.

لە کاتێکدا کە من تەنها هەژار و لاواز و دەستەوسان و سوالکەرێکم لە دەرگای قورئانی پیرۆزدا و، هۆکارێکم بۆ گەیاندنی بە موحتاجان، قوتابی‌یە دڵسۆز و بێگەرد و بەوەفا و ڕاست و پاك و فیداکارەکانی پەیامی نوور، لە بڕواباشی‌یاندا بەرامبەرم، سەد هێندەی ئەوەی لە توانای مندایە زیادەڕەوی دەنوێنن.

جا بۆ ئەوەی لەو گومانەیاندا نائومێدیان نەکەم و هەستەکانیان ئازار نەدەم و، لەو شەوقەدا کە بۆ خزمەتی "نوور" هەیانە ساردیان نەکەمەوە و، ئاستی نزمی ئەو کەسە دەرنەخەم کە نازناوی "مامۆستا"یان لێ ناوە و.. لە هەمان کاتیشدا دووچاری چەندەها جۆری تەصەنوعی بێزلێکراوی ئازاراوی نەبم، ئەوا واز لە چاوپێکەوتنی خەڵکی دەهێنم، تەنانەت بە گیان ناچار دەبم وازی لێ بهێنم، چونکە هەست دەکەم حەزم لە تێکەڵ بوونی خەڵکی نی‌یە. ئەمەش لەو ژیانی تاکەکەسی‌یەوە پەیدا بووە کە لە ماوەی بیست ساڵی ڕەبەقدا بردمە سەر. بەڵکو واز لە بینینی برادەرانیش دەهێنم، مەگەر پەیوەندیی بە خزمەتگوزاریی نوورەوە بێت. بەم کارەش لە تەکەللوف ڕزگارم دەبێت و خۆم بە چەشنێك پیشان نادەم

کە لە سەرووی نرخ و بەهای خۆمەوە بێت و، لە بەرچاوی ئەو کەسانەی کە لە بروای باشیاندا بەرامبەرم گەلێ ڕۆچوون، خۆم بە کەسێکی خاوەن پلە و پایە پیشان نادەم و، لە "خۆ بە گەورە زانین" دوورەپەرێز دەبم کە بە یەکجاری دژی ئیخلاسە و، بێز لە تام و چێژی خۆویستی و لەخۆباییبوون دەکەمەوە کە لە ژێر پەردەی "ویقار"دا داپۆشراون.

دەسا ئەی نەفسەکەم! ئەی شەیدای ئەو تام و چێژانە!

ئایا ئەم حاڵەتانەی پێشوو سەرجەمی ئەو چێژانە لەناو نابات؟

ئەی نەفسەکەم!

ئەی داخوازییەکانی هەستی بەدبەختی نابینا و گرفتاری تام و چێژی دنیا!

ئەگەر هەزاران جۆر تام و لەزەتی خۆشی چەشنی لەزەتی دنیا - بەم حاڵەت و بارەی باس کرا - بچێژیت، ئەوا بزانە کە هەر هەموویان ڕوو لە نەمانن و تیادەچن، تەنانەت ئەو چێژانە خۆیشیان دەبن بە ئازار!

مادەم لە سەدا نەوەدی ئەو خۆشەویستانە ڕۆشتوون و کەوتوونەتە ڕابوردووەوە، وەك بڵێی - لە ڕاستیدا - منیش بۆ جیهانی بەرزەخ بانگ دەکەن، ئەوا ناچارم لەو "دە" هاوڕێیەی ئێستام - کە لێرە ماون - هەڵبێم. خۆ گومانیش لەوەدا نییە ژیانی مەعنەویی بەرزەخ لەم ژیانی پیری و تەنیاییەی ئێرە هەزاران جار باشترە.

بەم جۆرە، ئەم دوو ڕاستییە، بە تەواوی دەروونی دووهەمی بەدخوازیان بێ دەنگ کرد. کەواتە سوپاس و شوکرانەی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە، چونکە ئیتر "نەفس" بەو چێژە ڕازی بوو کە لە "دڵ"ەوە دێت و دەچێتە ناو "ڕۆح"ەوە، "شەیتان"یش قسەی نەما و دەمکوت بوو، تەنانەت ئەو نەخۆشییە ماددییەش کە لەناو دەمارەکاندا جێگیر بووە، ئەویش گەلێ کز و کەم بووەوە!

پوختەی قسە:

گەر من بمرم، ئەوا خزمەتگوزاریی نوور پتر زیاد دەبێت و، بە ئیخلاسێکی تەواوترەوە ڕوون دەبێتەوە، چونکە ئەو کاتە نە کەس حەسوودیی پێ دەبات و نە

تۆمەتیشی بۆ رێك دەخرێت. سەرەڕای رزگاربوونیش لە ئازاری قورس و بێزلێکراوی تەکەللوف و، ڕزگاربوون لە کۆڵی قورسی "لە خۆڕازی بوون" و زیانەکانی "ڕیاکاری".. بەڵێ، لە هەموو ئەمانە ڕزگارم دەبێت لە بریی لەزەتێکی هەندەکی وکاتی - کە لەم زەمانەدا - من بە دوایدا ناگەڕێم و، لە بریی ئەو لەزەتەش - کە بە گوێرەی ڕوانینی دنیایی - لە فتووحاتی نوورەوە بە دەست دێت و هەستی پێ دەکرێت.

پاشان - ئەی نەفسەکەم! - لەم ساڵدا بەناو هەموو لاکانی ڕابوردوودا، تۆیش و ڕۆح و دڵ - با بۆ جارێکیش بووبێت - گەشتی ڕاستەقینە و ئەندێشەییتان بەو شارانەدا کرد کە ژیانی بەتام و چێژی پێشووم تێدا بەسەر بردبوون، بۆ بینینی ئەوانەی لە تاسەدا بوون بۆیان و چاو پێکەوتنی ئەو خۆشەویستانەی کە مایەی دڵشادیی ماوەیەکی ژیانم بوون، ئەو برایانەی کە گەلێ خەفەتی پڕ لە ئازارم بۆ جوداییان چەشت..

ئێوە لەو گەشتەدا کە بەناو ئەو نیشتمانە خۆشەویستانەدا گەڕان، یەك دوانێك نەبێت، کەستان لەو خۆشەویستانە نەبینی، چونکە ئەوانی تر کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کردبوو! تابلۆکانی ئەو ژیانەش کە سەرانسەر لەزەت و خۆشی بوون، هەموویان گۆڕابوون بە چەند تابلۆیەکی ئازاربەخشی ئەوتۆ کە خەم و پەژارەیان لێ دەچۆڕا. کەواتە ئەو نیشتمانانەی کە لەو خۆشەویستانە چۆڵ بووبن، جێی نیاز و شایانی سەرلێدان نین!

جا لەبەر ئەم ڕاستییە، پێش ئەوەی ئەم ژیان و دنیایە ئێمە بەدەرنێت و پێمان بڵێت: بڕۆن چۆڵی بکەن.. دەبێت ئێمە بە سەربەرزیی تەواوەتی بەو بڵێین:

خواحافیز.. خوات لەگەڵ.

بەڵێ، دەبێت عیززەت و سەربەرزیی خۆمان ڕابگرین و بیپارێزین و، واز لەو چێژە فانییانە بهێنین.

هەزار هەزار دوعا و سڵاو بۆ گشت برایانمان، لەم برا نەخۆشە دڵخۆشەتانەوە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(جیاوازیی نێوان ئیمان و ئینکاری نەکردن)!

برا ئازیز و ڕاست و بەوەفاکانم!

قارەمانە ئازاکانی پەیامەکانی نوور!

ئەوان بڵاویان کردووەتەوە کە گوایا:

"خەڵکی خوا دەناسن.. هەموو کەسێکی ئاسایی بە وێنەی وەلی‌یەکی خواناس، ئیمانی بە خوای گەورە هەیە"!

ئەمەشیان بۆیە بڵاو کردووەتەوە تاکو لە نرخ و مەزنیی پەیامەکانی نوور - با بە ئەندازەیەکی کەم و بچووکیش بێت - کەم بکەنەوە و، وا پیشان بدەن کە پێویست بەو هەموو بەڵگە بەهێز و بەنرخانە ناکات کە پەیامەکانی نوور بە زۆری دەیانهێنێتەوە. وەك بڵێی - بە لای ئەوانەوە - ئەم بەڵگە هێنانەوانە کارێکی زیاد بن!

ئەوەتا لە ئەستەمبووڵدا دەستەیەك لەو مونافیقانەی کە دووچاری کوفری موتڵەقی ئاوێتەی ئاشووب و کاری تۆقاندن و ئیرهاب بوون، بە جۆرێکی سامناك، برەو بە وتەیەکی لەو جۆرە دەدەن و دەڵێن:

"ئیمان پێویستی بە دەرسی زۆر نی‌یە، چونکە هەموو نەتەوەیەك، تەنانەت هەموو خەڵکی بە گشتی، خوا دەناسن".

ئەمەش هەوڵێکە ئەوانە دەیدەن بۆ مەبەستی بەربەستی کردن لە (پەیامەکانی نوور) و بێ‌بەش کردنی خەڵکی لەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە لەو پەیامانەدا هەن، ئەو ڕاستی‌یانەی کە خەڵکی بە ئەندازەی پێویستی‌یان بە "نان" و تینوێتی‌یان بۆ "ئاو" پێویستیان پێیانە و تینوون بۆیان.

لە کاتێکدا "ناسینی خوای گەورە" و، ئیمان هێنان بە ڕاستی‌یەکانی: "لا إله إلاّ الله" داخوازی تەسدیق کردنی دڵ و ئیمانی ڕەها و بێ‌گومانە بە: پەروەردگارێتیی گشتی و گشتگیری خوای گەورە لە گەردووندا و، بەوەی کە: کاروباری هەموو شتێك - هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان - بە

هەمەکی و هەندەکی‌یانەوە، تێکڕا لە چنگی دەستەڵاتی ئەو خواوەنـدە مەزنـەدان و، تەنها بە توانست و ویستی ئەو بەڕێوە دەبرێن، چونکـە هیـچ هاوبەشێك لـە مولکـی ئەودا نی‌یە.

بەڵام وتنی سەرزارەکیی: "خوا هەیە".. ئنجـا سپاردنی کاروبـاری مولکـی ئـەم خوایـە - بـە کـردەوە - بـە دەسـتی "هۆکـارە" لەژمارەبەدەرەکان و "سروشـت" و، بڕیاردانی چەندین هاوبەش بۆ خوای گەورە و، ئنجا تێنەگەیشتن لە زانستی ڕەهـا و ویستی جێ‌بەجێ کراوی ئەو خوایە و ملکەچیی هەموو شتێك بۆ ئەو، پاشان بایـەخ نـەدان بـە ئـەمر و نەهی‌یەکانی و، نـەزانینی سـیفەتە مەزنـەکانی و، نەناسـینی ئـەو پێغەمبەرانەی کە ئەو ناردوونی..

بێ گومان هەموو ئەمانە، هیچ فڕێکیان بەسەر ئیمانەوە نی‌یە!

خۆ ئـەو کەسـەی کـە بـە کـردار ئەمـە حاڵیـەتی و بـە گوفتـاریش ئـەوە وتـەی سەرزاریەتی، دەیـەوێت دڵـی خـۆی بـەو چەشنە هەڵوێستانە بداتـەوە و خـۆی لـەو ئەشکەنجە و ئازارە ڕۆحی‌یەی دنیـا ڕزگـار بکـات کـە کوفـری موتڵـەق - هـەر لـە دنیادا پێش قیامەت - دەرخواردی شوێنکەوتووانی خۆی دەدات!

بەڵێ، "ئینکاری نەکردن" شتێکە و، "ئیمـان"یـش شتێکی تـری تـەواو جیـاوازە لەوا چونکە هیچ خاوەن هەست و شعوورێك نـاتوانێت "ئینکـاری"ی بەدیهێنـەری شکۆمەند بکات کە هەموو بەشەکانی بوونەوەران شایەتی لەسـەر پـەروەردگاری و مەزنی و دانایی و جوانیی ئەو دەدەن. خۆ ئەگەر بیـەوێت ئینکـاریی ئـەو بەدیهێنـەرە بکات، ئەوا هەموو بوونەوەران ڕێی لـێ دەگرن و، ئـەویش ناچـار لاڵ و بێ دەنـگ دەبێت و، لە گەردووندا بە تەنیایی و ئاوارەیی و بێ پشتگیری دەمێنێتەوە.

هـەرچی "ئیمـان"یشـە، ئـەوا قورئـانی پیرۆز تێی گـەیاندووین کـە بریتی‌یـە لـە: سەلماندن و تەسدیق کردنی "دڵ" سەبارەت بە بوونی بەدیهێنەری مەزن، بـە هـەموو سیفەتە خـاوێن و پیـرۆز و نـاوە جوانەکانیـەوە، کـە ئەمـەش سەلماندنێکە شـایەتیی هەموو گەردوونی لە پشتەوەیە..

هەروەها "ئیمـان" جێبەجێ کردنـی ئـەو ئـەمر و نەهی‌یانەیـە کـە پێغەمبـەرە بەڕێزەکان - درووودیان لەسـەر بێت - لـە لایەن خـوای گەورەوە هێناویـانن. خۆ ئەگەر "دەروونی بەدخواز" مرۆڤێکی دووچاری کردەوەیەکی خـراپ کـرد، ئـەوا دەرگای تۆبە و پەشیمانی و گەڕانەوە هەمیشە لەسەر پشتە. بەڵام ئەگەر کەسێك بە بێ پەروایی و بێ هیـچ بایـەخ و گوێ دانێك بە فەرمانەکانی خوای گەورە و بێ پەشیمانی و گەڕانەوە، تاوان و کردەوەی خراپ ئەنجام بدات، ئەم کارەی بێ هیـچ گومانێك، بەڵگەی بێ ئیمانیی ئەو مرۆڤەیە!

* * *

(لە بارەی خۆشویستنی ئالی بەیتەوە)

برای ئازیز و بەڕێزم!

بە گرنگی و بایـەخ پێدانـەوە نامـە پـڕ لـە تێبینی‌یـە ورد و گەرموگوڕەکـەتانم خوێندەوە کە بە ئەندازەی توێژینەوەیەکی چڕوپڕ زانیاریی لەخۆ گرتبوو.

پێشەکی دەڵێم: ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - مامۆستای پەیامەکانی نوورە و، هەر ئەویشە کە بە چەند هێما و ئاماژەیەك لـە قەسیدەی "البديعــة"دا بایـەخێکی گرنـگ و زۆری بـە پەیامەکانی نـوور داوە و، مامۆسـتای تایبەتیمـە لـە ڕاستی‌یەکانی ئیماندا!

خۆشویستنی ئالی بەیت لە قورئانی پیرۆزدا بە دەقی ئەم ئایەتە پیرۆزە داوا کراوە:

﴿قُلْ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِلاّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ (الشورى:٢٣).

ئەم خۆشویستنەی کـە قورئـان داوای کـردووە، بناغـەی پەیامـەکانی نـوور و ڕێبـازی ئێمەیـە. دەبێ قوتابی‌یـە ڕاستەقینەکانی پەیامەکانی نوور هیـچ مـەیلێکیان بەلای دوژمنایـەتی کردنی ئالی بـەیتدا نـەبێت. چونکە گومڕایی و ئیلحـاد هەمیشـە ئیختیلافـەکانی ئـەم چەرخـە بۆ ئامانجـەکانی خۆیـان دەقۆزنـەوە. تەنانـەت چـەند تەوژمێکی بەهێزی ئەوتۆ لەم چەرخـەدا بروویـان هەیـە کـە ئیمـانداران لـە ئاستیاندا

سەرسام دەمێنن! ئەوەتا بە ئاشکرا هەوڵی ئاڵوگۆڕ لە شەعائیرەکانی ئیسلامدا دەدرێت و، هێرشێکی دژواریش دەکرێتە سەر قورئان و ئیمان. لەبەر ئەوە، نابێت دەرگای وتوویژ لەو کاروبارە جوزئییانە بخرێتە سەر پشت کە لە بەرامبەر ئەم دوژمنە سەرسەختەوە جیاوازی و شپرزی لە نێوان موسڵماناندا دەنێنەوە.

هەروەها زەمی ئەو کەسانەش کە لە دنیا دەرچوون و کۆچیان بۆ ئەو دنیا و خانەی سزا و پاداشتدانەوە کردووە، هەرگیز پێویست نییە. چونکە خۆشویستنی ئالی بەیت - کە داوا کراوە لێمان - هیچ کاتێ داخوازی ئەوە نییە کە قسوور و ناتەواوییەکانی ئەوانی تر پێش چاو بخرێت و، کاری لەو جۆرە هیچ سوودێکی تێدا نییە، بەڵکو زیانیشی لێ دەکەوێتەوە.. لەبەر هەموو ئەمانەیە کە "ئەهلی سوننەت و جەماعەت" ڕێیان بە لێدوان و موناقەشەی ئەو فیتنە و ئاشووبانە نەداوە کە لە سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکاندا - خوایان لێ ڕازی بێت - ڕوویان داوە.

هەروەها لەبەر بەشداریی کەسانی وەك حەزرەتی زوبەیر و تەلحە کە مژدەی بەهەشتیان دراوەتێ و، حەزرەتی عائیشەی دایکیشمان - خوایان لێ ڕازی بێت - لە جەنگی "جەمەل"دا، ئەوا ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەو جەنگەیان بە ئەنجامی ئیجتیهاد داناوە و، پێیان وا بووە کە حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - لەم ئیجتیهادەیدا پێکاویەتی و لەسەر حەق بووە و، ئەوانی تریش حەقیان نەپێکاوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ڕووداوەکە ئەنجامی ئیجتیهاد بووە، چاویان لێ دەپۆشرێت.

پاشان ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێیان وایە کە باس و لێدوان لە کاری "باغی"یەکانی جەنگی "صِفّـــین" زیانی هەیە، چونکە ئەو موناقەشەیە دوو دژە لایەنگری دەورووژێنێت: یەکێکیان دژی خۆشویستنی ئالی بەیت و، ئەوی تریشیان - بە وێنەی ڕافزییەکان - لە خۆشویستنیاندا زیاد لە پێویست ڕۆ دەچێت! دیارە ئیسلامیش لە ئەنجامی ئەمەدا زیانی پێ دەگات.

سەعدی تەفتازانی، کە پێشەوای زانستی کەلامە، وتوویەتی:

(دروستە لەعنەت لە یەزید و ستەمکارەکانی هاوچەشنی وەك حەججاج و وەلید بکرێت).

بەڵام نەیوتووە: لەعنەت لێ کردنیان واجبە.. یان خێر و چاکەیە.. یان پاداشتی تێدایە! چونکە ئەوانەی کە ئینکاریی قورئانی پیرۆز و پێغەمبەر ﷺ دەکەن و، دان بە هاوەڵێتیی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا ﷺ نانێن، هێندە زۆرن کە لە ژمارە نایەن و، لە بەردەمماندا دێن و دەڕۆن.

بەپێی شەرع ئەگەر مرۆڤ لەو کەسانە نەدوێت کە شایانی لەعنەتن و هەرگیز لەعنەتیان لێ نەکات، هیچ زیانێکی پێ ناگات، چونکە "زەم" و "لەعنەت" وەکو "مەدح" و "خۆشویستن" نین و، نارۆنە ڕیزی کردەوە چاکەکانەوە. بەڵام گەر زیانیان تێدا بێت ئەوا زیانێکی گەلێ گەورە دەبێت!

لەم کاتەی ئێستاماندا مونافیقەکان هەندێ زانایان لە خشتە بردووە و، هەستێکی دژی ئالی بەیتیان تێدا وروژاندوون. لە کاتێکدا کە ئەرکی ئەستۆی زانایان پارێزگاری کردنی ئیسلام و ڕاستییەکانی ئیمانە. جا ئەو زانایانەی کە لە خشتە براون هێندە لەم لایەنەدا ڕۆچوون کە هێرش بۆ سەر "ئەهلی حەقیقەت" دەبەن و بە شوێنکەوتەی "شیعە" تۆمەتباریان دەکەن! تا ئەو ڕادەیەی کە دوژمنایەتی لە نێوانیاندا سەری هەڵداوە و، گەیشتووەتە ئەوەی مونافیقەکان گورزی خۆیان لە هەردووکیان وەشاندووە و هەردوو لایان لە بەرامبەری یەکەوە ڕاگرتووە و، هەریەکەشیانی لە دژی ئەوی تر بەکار هێناوە!

جا هەموو ئەوانەی کە موسڵمانانیان بەم دەردە بردووە و، دەیانەوێت گورزی جەرگبڕ و لەناوبەر لە ئیسلام بووەشێنن، لە بەرچاوماندا دێن و دەڕۆن. تۆ بۆ خۆیشت بەشێکی ئەمەت لە نامەکەتدا نووسیوە.

برام! تۆ خۆت باش دەزانیت کە ئەو مونافیقانە چەپەڵترین هۆکاری کاریگەریان لە دژی پەیامەکانی نوور و خودی من، کە تا ئێستاش بەکاری دەهێنن، لە لایەنی زاناکانەوە دەست کەوت!

هەندێ لەو زانایانەی کە خۆیان لە چەپەڵیی بیدعەتەکانەوە گلاندووە، دەتوانن بە بیانووی ئیجتیهادەکەتانەوە، کە ئەنجامی خۆشویستنی ئالی بەیتە و لەم کاتەدا

پێویست بە دەرخستنی نی‌یە، دەستت لێ بووەشێنن. چونکە ئەوانە لە پشتی ئەو وەهابییەتەوە خۆیان حەشار داوە کە حوکمی هەردوو حەرەمی پیرۆزی لە دەستدایە! ئەوەتا ماوەیەکە لە ئەستەمبووڵ چەند کتێبێکی سەرنج ڕاکێشی "ابن تیمیة" کە یەکێکە لە بلیمەتە ناودارەکان و قوتابی‌یەکەشی "ابن قیّم الجوزیة" لە نێوانیاندا دەستاودەستی پێ دەکرێت، بە تایبەت دوای ئەوەی کە وا بڵاوکرایەوە گوایا ڕووکاری نووسینەکانیان لە دژی ئەولیایە و، مەشرەبەکەشیان هەندێ چاوپۆشیی لە بیدعەتەکان تێدایە!

جا مادەم هیچ فەرمانێکی شەرع لە بارەی "زەم نەکردن" و "تەکفیر نەکردن" لە کایەدا نی‌یە، بەڵام "تەکفیر" و "زەم" حوکمی شەرعی‌یان لە بارەوە هەیە، ئەوا ئەم تەکفیر و زەمە گەلێ زیانەکەیان گەورە دەبێت گەر بە ناحەق بێت. بەڵام هیچ پاداشتێکیان تێدا نی‌یە گەر مرۆڤ تیایاندا لەسەر حەق بێت! چونکە گەلێ کەسی لەژمارەبەدەر هەن کە شایانی زەم و تەکفیرن.

واتە تەکفیر نەکردن و زەم نەکردن هیچ حوکمێکی شەرعی‌یان لە بارەوە نی‌یە. هەروەك مرۆڤ هیچ زیانێکی پێ ناگات گەر توخنیان نەکەوێت.

لەبەر ئەم ڕاستی‌یە، ئەهلی حەقیقەت و سوننەت، لە پێشەکیی هەموویانەوە هەر چوار پێشەواکان و دوازدە ئیمامەکانی ئالی بەیت، دەستوورێکی بەرز و گرنگیان بۆ خۆیان داناوە و، لەمەشدا پاڵیان بەو ڕاستی‌یەوە داوە و، وتوویانە:

(باسکردنی ئەو فیتنە و ئاشووبانەی کە لە نێوان موسڵمانانادا ڕووی دا، دروست نی‌یە و کارێکی بێ سوودە، تەنانەت زیانیشی تێدایە).

پاشان هەرچی چۆن بێت چەند هاوەڵێکی بەڕێز لە هەردوو لادا هەن. خۆ باسکردنی ئەو فیتنە و ئاشووبانەش هەندێ لایەنگیری لایەنێك بە دڵدا دەهێنێت. ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی کە ڕەخنە لەو هاوەڵە مەزنانەی چەشنی تەلحە و زوبەیر - خوایان لێ ڕازی بێت - کە لە "عەشەرەی موبەششەرە"ن، یان نەویستنیان، لە دڵی مرۆڤدا سەرهەڵبدات!

خۆ ئەگەر ئەوان دووچاری هەڵەیەکیش بووبێتن مایەی ڕەخنە بێت، ئەوا گریمانی بەهێزیش هەیە کە تۆبەیان لێ کردبێت.

هەرگیز شایانی ئیمانداری ژیر و بەسەلیقە و ئەرکە خاوێنەکەی سەرشانی نییە کە - بە تایبەتی لەم کاتەدا - واز لەو کەسانە بهێنێت بە کردار و ڕەفتاریان گورزی بەهێز لە ئیسلام دەوەشێنن و، هەزاران جار شایستەی زەم و لەعنەت لێکردنن و، بروات بۆ سەردەمانێکی دێرین و، بە دوای چەند حاڵەتێکی ئەوتۆدا بگەڕێت کە هەرگیز شەرع فەرمانی بەو گەڕان و پشکنینە نەداوە و، لە ڕاستیدا کارێکی بێ سوودە، بەڵکو زیانیشی تێدایە!

برام! نامەوێت ئەوەت لێ بشارمەوە کە موناقەشە سووکەڵە و بچووکەکەی نێوان تۆ و "صەبری" زیانێکی زۆر بە پەیامەکانی نوور و بڵاوبوونەوەی ڕاستییەکانی ئیمان دەگەیەنێت. من لێرەوە هەستم بەو زیانە کردووە و ئازارم پێ گەیشتووە. چونکە لەو کاتەدا کە ئێمە بە هاتنی "صەبری" بۆ لاتان چاوەڕێی ئەوە بووین هەردووکتان خزمەتێکی ئیمانیی مەزن ئەنجام بدەن و هۆکارێکی کاریگەر بن بۆ بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور لەوێ. کەچی تۆی زانای لێکۆڵەر بە پێچەوانەی ئەمە و لە سێ ڕووەوە هەستت بە زیانێکی گەورە کرد، بەڵکو ئەو زیانەشت بە چاوی خۆت بینی.

لەبەر خۆمەوە پرسیم: ئایا دەبێ چی بووبێت بەهۆی ئەم زیانە؟ دوای سێ ڕۆژ هەواڵم پێ گەیشت کە صەبری موناقەشەیەکی بێ جێ و بێ سوودی لەگەڵدا کردوویت و، تۆیش تا ڕادەیەك تووڕەیی بەسەرتا زاڵ بووە.

لە لایەنی خۆمەوە زۆر خەفەتم بەمە خوارد و، وتم: ئاخ..

ئنجا لە خوا پاڕامەوە و، وتم: خوایە گیان موناقەشەی نێوان ئەم دوو برایە مەهێڵە کە لە ئەرزڕۆمەوە هاتوون، تاکو لە خزمەتی ئیماندا یارمەتیم بدەن.

هەروەك لە پەیامی ئیخلاسدا هاتووە:

"ئەهلی حەقیقەت و ئیمان"ی ئەم سەردەمە نەك تەنها لە نێوان خۆیاندا، بەڵکو دەبێ لەگەڵ گاورە ڕاستەقینەکانیشدا یەك بگرن و، بە شێوەیەکی کاتی واز لەو

شتانە بهێنن کە دووبەرەکی و موناقەشەیان لە نێواندا بـزوێنێت، بۆ ئەوەی پاڵ بە دوژمنی هاوبەشیانەوە بنێـن کـە دەستدرێژیی کردووەتـە سـەریان. چونکـە کـوفری ڕەها هێرشێکی سەخت دەکاتە سەر ئیمان.

جا لـە غیرەتی ئاینیتـان و ئەزموونەکانت لـە بـواری زانستدا و لـە پەیوەندیـیە بەهێزەکانتانەوە بە پەیامەکانی نوور، ئومێدەوارم کە ئەوەی لە نێوان تۆ و صـەبریدا ڕووی دا لە بیری خۆتی ببەیتەوە و چاوی لـێ بپۆشـیت. چونکـە صـەبری بـە ژیریـی خۆی بیری نەکردووەتەوە، بەڵکو بەو موناقەشە بـێ جـێ و ڕێیانـەی کـە لـە نێـوان هەندێ زانای پێشیندا ڕووی داوە.

تۆ بـۆ خـۆت بـاش دەزانیـت کـە "چاکـەی گـەورە" زۆر کـردەوەی "خـراپ" دەسڕێتەوە.

بەڵێ، صەبریی برامان خزمەتێکی گەورە و ڕاستەقینەی پێشکەش بـە پەیامـەکانی نوور کردووە و، لەم ڕێیەشەوە خزمەتێکی هێندە مەزنی بـۆ ئیمـان ئەنجام داوە کـە هەزار هەڵەی ئەو دەسڕێتەوە.

ئومێدەوارم لـە ڕوانگەی نەجابەتی خۆتـان و لـە گۆشـەی خزمەتـە مەزنـەکانی ئەویشـەوە بـۆ "نـوور" بڕواننـە مەسـەلەکە و، بـە برایـەکی هـاوڕێی خزمـەتی نـووری دابنێن.

لــە ئــەنجامی شــوێنکەوتنی "دادگــەریی نیســبی" و پیــادە کردنــی "ڕوخســـەتی شەرعی"یەوە هەندێ کەسی هاوەڵە بەڕێزەکان لەو فیتنـە و ئاشـووبانەدا ڕۆشـتبوونە ناو ڕیزی پێچەوانەی ئیمامی عەلییەوە، کە ئەو لە ڕێبازەکـەی خۆیـدا شـوێنکەوتنی "دادگەریی ڕاستەقینە" و جێبەجێ کردنی "عەزیمەتی شەرعی"ی خستبووە ئەستۆی خۆی، هاودەم لەگەڵ پیـادە کردنـی ڕێبـازی زوهـد و ئیستیغنایەکی لەڕادەبەدەر و ژیـانێکی سـەختی زیـاد لـە پێویستدا. جـا ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانـە لـە ئـەنجامی ئـەم ئیجتیـهادەوە بـوو کـە ڕێبازەکەی ئیمـامی عـەلییان واز لـێ هێنـا و ڕۆشـتنە نـاو ڕیزەکەی بەرامبەریەوە. تەنانەت "عەقیل"ی برای ئیمامی عـەلی و "ئیـبن عـەبباس"ی ئامۆزاشی کە پێی دەوترێـت زانـای نەتـەوەی ئیسـلام، تـا ماوەیـەك لـەناو ڕیزەکـەی بەرامبەریدا بوون.

لەبەر هەموو ئەمانە، ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەم بوارەدا شوێن دەستوورێکی بنچینەیی شەرعی کەوتوون کە بریتی‌یە لەوەی ڕێیان بە باسی ئەو فیتنە و ئاشووبانە نەداوە و، وتوویانە: "من محاسن الشريعة سدّ أبواب الفتن" هەروەها: "طهّر الله ايدينا فلنطهر ألسنتنا"[1] چونکە هەرچەندە کەسانێکیش هەبن شایانی ڕەخنە لێگرتن بن، بەڵام حەز و هەستی لایەنگریی لایەك ئەنجامەکەی ڕەخنە گرتن دەبێت لە چەند هاوەڵێکی بەڕێزی لاکەی تر لەوانەی کە مژدەی بەهەشتیان دراوەتێ، وەك حەزرەتی تەلحە و زوبەیر - خوایان لێ ڕازی بێت - و لە چەند کەسێکی ئالی بەیتیش کە لە ڕیزی نەیارەکاندا بوون. لە ئەنجامی ئەمەشدا دەماری دوژمنایەتی و زەم کردنیان لای کەسی ڕەخنەگر دەجووڵێت. بۆیە ئەهلی سوننەت داخستنی دەرگای باسی فیتنە و ئاشووبەکانیان لە کردنەوەی پێ باشترە.

تەنانەت سەعدی تەفتازانی کە یەکێکە لە پێشەوایانی زانستی کەلامی ئەهلی سوننەت و، بەلایەوە دروستە یەزید و وەلید لەعنەت بکرێن و بە گومڕا دابنرێن، سەیید شەریفی جورجانی - کە یەکێکە لە زانا مەزنەکانی ئەهلی سوننەت - ڕووبەڕووی بووەتەوە و، وتوویەتی:

(هەرچەندە یەزید و وەلید لە ڕێ لادەر ر و ستەمکار و بێ وەفان، بەڵام زانینی ئەوەی کە بە بێ ئیمانی کۆچیان بۆ ئەودنیا کردبێت، شتێکی پەنهانە. جا لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك بە دڵنیایی نازانێت کە بە بێ‌ئیمانی دنیایان بەجێ هێشتبێت و بەڵگەی بێ گومان و دەقی ڕوون و ڕاستەوخۆمان بۆ ئەمە بەدەستەوە نی‌یە و، گریمانی تۆبە و پەشیمانی و کۆچ کردنیان لە دنیا بە ئیمانەوە لە ئارادایە.. ئەوا لەبەر هەموو ئەمانە، دروست نی‌یە بەم چەشنە تایبەت و لەعنەتە شەخسی‌یە نەفرەتیان لێ بکرێت، بەڵکو کاتێ "لەعنەت" دروستە کە بە شێوەیەکی گشتی بێت، وەك ئەوەی بڵێت: "لەعنەتی خوا لە ستەمکاران و مونافیقان". دەنا هیچ پێویستی‌یەك بەم جۆرە لەعنەتە نی‌یە و زیانیشی تێدایە).

---

(١) "طهّر الله ايدينا فلنطهّرْ ألسنتنا" وتەی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە. بڕوانە "اليواقيت والجواهر"ی شەعرانی ٢/٦٩ هەروەها "شرح جوهرة التوحيد" للباجوري ص٣٣٤". (وەرگێڕ)

بەم جۆرە، بەرپەرچی سەعدەدینی تەفتازانیی داوەتەوە.

بەهۆی نەخۆشیی زۆر و، کـار و ئەرکـە گرنگەکانمـەوە نەمتوانی وەڵامێکی دوور و درێژی نامە زانسـتی‌یە وردەکـانت بدەمـەوە و، هـەر تەنـها ئـەم ئـەندازە سەرپێییەم بۆ نووسرا.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

(خوا دەستی ئێمەی لەو خوێنە پاراست دەبا ئێمەش زمانمان پاك ڕابگرین)

برای ئازیز و بەڕێزم!

لێدوان و تەنانەت بیرکردنەوەش لەو زامە قووڵەی کە هەزار و سێ سەد ساڵ پێش ئێستا جیـهانی ئیسـلامیی خسـتە گریـان و، ئـەهلی حەقیقـەتی دووچـاری حەسرەت و فرمێسك ڕشتن کـرد، گەلـێ ئازارم دەدات و، مەشرەبی تایبـەتیم ئەم کارەی لا پەسەند نی‌یە، بە تایبەت وا بیست ساڵە خزمەتی ڕاستەقینە و بە ئیخلاسـی ئیمان بە تەواوەتی منی لە مەیدانی هەموو جۆرەکانی سیاسەت کێشـاوەتە دواوە و، بە درێژایی ئەم ماوەیە بۆ خوێندنەوەی یەك دانە ڕۆژنامەش هانی نەداوم. لەبەر ئەوە، من حاڵـەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆم تێدایە کە ناچارم دەکـات ئـاوڕ لـە ژیـانی سیاسـی نەدەمـەوە و، ژیـانی دیلیـی سـەرتاپا ئەشـکەنجە و ئـازار لـە مـاوەی بیسـت سـاڵی ڕابوردوودا هەڵبژێرم و، جگە لە بەرگری‌یەکانم لە بەردەم دادگادا، بە هیچ جۆرێك سەردانی حکوومەت نەکەم. بۆ ئەوەی هیچ ناتەواوی‌یەك لە خزمەتی ئیمـاندا پەیدا نەبێت و، ئیخلاسیش بپارێزم تاکو درز و کەلێنی تێ نەکەوێت. تەنانەت بە درێژایی دە ساڵ بایەخم بە دەنگوباسی جەنگی جیـهانی نەدا و یـادی کەسیشـم نەخستەوە، تاکو چڵك و چەپەڵیی سیاسەتم بەر نەکەوێت. پێویستیی ئێستا تەنها ڕزگار کردنی ئیماندارانە لە پێوەدانی چەندین هەژدیها و ماری سەرسـەخت کـە هێرشـی دڕندانە بۆ سـەر ڕاستی‌یەکانی ئیمـان دەهێنـن و، لـە پێش‌چـاوی خۆمـاندا ژەهرەکانیـان دەڕژێننە ناو بیر و هۆشی زۆر کەسی ئەم خەڵکەوە!

جا مادەم بارودۆخی ئەمڕۆ بەم جۆرەیە، ئەوا بەجێهێشتنی ئەم کات و ڕۆژگارەی ئێستا و، گەڕانەوە بۆ چەند چەرخێکی دێرین و، سەیرکردنی ئەو ستەمە سامناکەی کە لەو سەردەمانەدا ئالی بەیتی پێوە گیرۆدە بوون، زیاتر ڕۆحم دەهاڕێت و ورەم دادەبەزێنێت و، ئازارێکیشم دەدات کە لە باس کردن نایەت.

دەستووری غەددارانەی سیاسی‌یە ستەمکارەکان بریتی‌یە لەوەی کە: "تاك و یەکە یەکەی خەڵکی لە پێناوی کۆمەڵدا بەخت دەکرێن"! ئەم دەستوورە لە ژێر ناوی هەڵبژاردنی "أهون الشرين"دا، کە هەندێ کاربەدەست وەك جۆرە دادگەری‌یەکی نیسبی و لە بەرژەوەندیی مانەوەی حوکمەکەیاندا بەکاریان هێناوە، گەلێ ڕووداوی بێ بەزەیی و ستەمکارانەی لە مێژوودا هێناوەتە کایەوە. تەنانەت لەم چەرخەی خۆشماندا و بە خواستی ئەم دەستوورە، هی وایان هەیە تەنها لەبەر هەڵەی کەسێك لە گوندێکدا سەرتاپای گوندەکە تیا دەبات و، هەزاران کەسیش قەڵاچۆ دەکات لەبەر گومانی پەیدا بوونی زیانێك لە ئەنجامی نەیاریی تەنها دە کەسەوە!

جا لەبەر ئەوەی ئەم دەستوورە غەددارەی سیاسەت تا ڕادەیەك لە چەرخە ئیسلامی‌یە دێرینەکاندا ڕۆشتووەتە ناو موسڵمانانەوە، ئەوا پێشینانی پیاوچاك لە بەردەم ئەم چەشنە دەستوورە سامناکانەدا ناچاری بێ دەنگی بوون و، ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش ئەو چەشنە دەرگایانەیان بەوە داخستووە کە وتوویانە: "طهّر الله أيدينا فلنطهّرْ ألسنتنا".

مادەم ئەوانەی کە ستەمیان لە ئالی بەیت کردووە، ئێستا لەو دنیادا ئازارێکی هێندە سەخت دەدرێن کە هیچ پێویستی‌یەك بە یارمەتیدانی ئێمە نامێنێتەوە تا هێرشیان بۆ بەین و.. ئالی بەیتی ستەم لێکراویش لە پاداشتی ئازارێکی کاتیی دنیادا، پلەیەکی هێندە بەرز و فراوانیان بەدەست هێناوە کە ژیریی ئێمەی پێ ناگات..

ئەوا باشتر وایە، لە بریی بەزەیی پێدا هاتنەوەیان، هەزاران پیرۆزباییان لەسەر بەدەستهێنانی ئەو میهرەبانی‌یە فراوانە ئاراستە بکەین! چونکە هەروەك ئەوان لە

بەرامبەر چەند ساڵێکی سەخت و ئازاربەخشدا ملیۆنەها پلە و بەختەوەریی نەبڕاوەی ئەودنیایان بەدەست هێنا، بە هەمان جۆر، هەموو یەکێکیشیان لە جیهانی حەقیقەتدا بوو بە گەورە و پێشەوا و پادشای مەعنەوی، لە بریی دەستەڵاتێکی فانیی دنیا و فەرمانڕەوایەتی‌یەکی کاتی و سیاسەتێکی شڵەژاوی بێ بایەخ، لە ماوەی ژیانی دنیادا! هەروەها لە بریی ئەوەی ببن بە والیی ویلایەتەکانی دنیا، بوون بە پێشەوای ئەولیا و ئەقتابەکان. خۆ ئەم دەسکەوتەیان بە ملیۆنەها جار لە پلە و پایەکانی دنیا گەورەتر و مەزنترە.

لەبەر ئەم نهێنی‌یە وردە، ئەو ڕاستی‌یەی پێشووم لە مامۆستایانی سەعیدی نوێ وەرگرت، کە بریتین لە: ئیمامی ڕەببانی و شێخی گەیلانی و ئیمامی غەزالی و ئیمام زەینولعابیدین - خوایان لێ ڕازی بێت - کە موناجاتی "الجوشن الكبير"م بە تایبەتی لەم دوو پێشەوایە وەرگرتووە! هەروەها حەزرەتی حسەین و ئیمامی عەلی، خوایان لێ ڕازی بێت. جا ئەو وانەیەی کە لە دەمی پەیوەندیی مەعنەویم لەگەڵیاندا و بەهۆی "الجوشن الكبير"وە لەوانم وەرگرتووە، بریتی‌یە لەم ڕاستی‌یە. کەواتە مەشرەبی ئێستام - کە لە پەیامەکانی نوورەوە هاتووە - بریتی‌یە لەو مەشرەبەی کە لە سەرچاوەکەی ئەو زاتانەوە نۆشیومە. بۆیە سەیرکردنی غەدری ستەمکاران و تەنانەت بیر لێکردنەوەشی لەگەڵ مەشرەبماندا ناگونجێت. چونکە ستەمکاران دووچاری سزای خۆیان بوون و، ستەم لێکراوانیش پاداشتێکیان بەدەست هێنا کە لە سەرووی توانای ژیرمانەوەیە. کەواتە سەرقاڵ بوون و کات بەزایەدان لەو جۆرە مەسەلانەدا زیان بەو کارمەندی و ئەرکە قورئانی‌یە دەگەیەنێت کە خراوەتە ئەستۆمان، بە تایبەت لەم ڕۆژگارەی ئێستادا کە گیروگرفتەکان یەك لە دوای یەك بەسەر ئاییندا دەبارێن.

زانایانی کەلام و، پێشەوایانی ئوسوولی دین و، لێکۆڵەرانی بەرزی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، دوای گەلێ وردەکاری و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە بیر و باوەڕی ئیسلام و، بەکارهێنانی داوەریی ژیری و دامەزراندنی تەرازووکاری لە ڕووناکیی ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکاندا، چەند دەستوورێکی پەسەندیان لە

زانستی ئوسوولی دیندا بڕیار داوە، ئەو دەستوورانەش داخوازی پاراستنی ئەم مەشرەبەی ئێستای پەیامەکانی نوورن و زیاتر هێز و پێزی پێ دەدەن! بۆیە هیچ کەسێك لە هیچ شوێنێکدا - با لە ئەهلی بیدعەتیش بێت - ناتوانێت ڕەخنە لە مەشرەبەکەمان بگرێت.

جا لەبەر ئەوەی "کاکڵەی ئیخلاس" بە تەواوەتی لەم مەشرەبەدا پارێزراوە، ئەوا هەموو جۆرەکانی ئەهلی ئیسلام دەتوانن بڕۆنە ناو بازنەی پەیامەکانی نوورەوە. ئەوەتا شیعەی دەمارگیر لە شیعەیەتیدا و، وەهابیی زیادەڕەو لە وەهابیەتدا و فەیلەسووفی ماددیی تەواو ڕۆچوو لە مادییەت و زانستدا و، زانای توندگیری زۆر خۆویست، هەر هەموویان، وا پێکەوە خەریکن دێنە ناو بازنەی پەیامی نوور و، ئێستا بەشێکیان لەناو ئەو بازنەیەدا بە برایەتی و خۆشەویستی دەژین. تەنانەت هەندێ نیشانە هەیە لەسەر ئەوەی کە چەند موبەششیرێکی نەصرانیش لە ڕۆحانی‌یە ڕاستەقینەکان دێنە ناو ئەو بازنەیەوە! چونکە هەست بە پێویستیی هاوپەیوەندی و گونجان دەکەن و، بابەبەتەکانی دەمقاڵێ و مشتومڕی نێوان هەردوولا دەخەنە لاوە.

واتە: پەیامەکانی نوور کە ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - بە نزیکەی چل ئاماژە - کە هەندێکیان لە پلەی صەراحەتدان - هەواڵی لە بارەوە داون، تیماری زامەکانی ئەم سەردەمە دەکەن!! بۆیە ئەو بازنەیە سەروزیادمانە و لێی ناڕۆینە دەرەوە.

باس کردنی کەسی حەزرەتی عەلی - کرّم الله وجهه - هەروەها ڕەخنە گرتن لە ژیان و سیاسەتەکەی کە لەسەر بناغەی دادگەریی ڕاستەقینە و بێگەرد بەڕێی دەکرد، شتێکە و.. باسی کەسایەتیی مەعنەویشی و ڕەخنەگرتن لە کەماڵی زانست و پلەی ویلایەت و میراتگریی پێغەمبەرایەتیش لەودا، کە هەزاران جار لە کەسایەتی‌یە ڕواڵەتی‌یەکەی و ژیانی دنیایی و سیاسەتی کۆمەڵایەتیی ئەو بەرزترە، شتێکی تری تەواو جیاوازە.. کێ دەتوانێت توخنی ئەمەیان بکەوێت؟ یان ڕەخنەی لێ بگرێت؟ تەنانەت شتی وا هەر نەوتراوە و ناشوترێت.

ئا لێرەوە مەترسیی گەورەی کاری ئەوانە دەردەکەوێت کە دەیانەوێت هەردوو ڕووەکە بە یەکەوە ببەستن و هێرش بکەنە سەر حەزرەتی عەلی! چونکە ئەم کارە هێندە سەرسامی و سەرسوورمان لە ڕیزەکانی ئەهلی ئیماندا دەورووژێنێت کە بڵێن: ئایا دەگونجێت فیتنەی لەم جۆرە لە نێوان ئیمانداراندا ڕوو بدات؟!

خۆ جگە لە چەند کەسێکی بێ نرخی چەپەڵی وەك یەزید و وەلید، دەنا بەشی زۆری ئەوانەی کە لە بارەی ئیمامی عەلییەوە دواون، تەنها ڕەخنەیان لە کارگێڕیی تایبەتی و ژیانە کۆمەڵایەتییە مرۆڤانەکەی گرتووە، کە لەم ڕەخنەیەشیاندا بە هەڵەدا چوون، نەك لە کەماڵات و کەرامات و میراتگریی ئەرکی پێغەمبەرایەتیدا.

لە کاتی هێرشی دوژمنە دەرەکییە گەورەکاندا پێویستە واز لە سووکەڵە دوژمنایەتییە بچووکەکانی ناوخۆ بهێنرێت، دەنا هەر کارێکی پێچەوانەی ئەمە وەکو یارمەتیدانێك دەبێت بۆ دوژمنە گەورە دەرەکییەکە.

بۆیە دەبێ ئەو موسڵمانانەی کە لە بازنەی ئیسلامدا یەکێك لە لایەنەکانیان گرتووە، بەپێی خواستی بەرژەوەندیی ئیسلام، جارێ دوژمنایەتییە ناوخۆییەکەیان لە بیر ببەنەوە.

* * *

(نامەیەك بۆ سکرتێری پارتی گەلی کۆماری)

بۆ بەڕێز حیلمی ئۆران!

وەزیری پێشووی ناوخۆ و سکرتێری ئێستای پارتی گەلی کۆماری[1].

---

(١) پارتی گەلی کۆماری: لە ساڵی ١٩٢٣دا مستەفا کەمال دایمەزراندووە و، پاش ئەو "عیصمەت ئینۆنۆ" سەرکردایەتیی لە ئەستۆ گرتووە و، وەك تاکە حیزب و بێ نەیار بە زەبر و زەنگەوە هەتا ساڵی ١٩٥٠ز حوکمی وڵاتی کردووە. بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی ئەم ساڵەدا تەنها شەست و نۆ کورسیی لە کۆی چوارسەد و هەشتا و حەوت کورسیی پەرلەماندا بەدەست هێنا. یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئەم پارتە بریتییە لە عەلمانییەت بە واتای دوژمنایەتی کردنی ئایین هەروەها بانگەشە بۆ نەتەوەگەریی تورك. لە ماوەی حوکمڕانیی ئەم حیزبەدا ستەمی نەتەوەیی لە کورد گەیشتە لوتکە و ڕاگوێزرانی لە خاکی خۆی دەستی پێکرد و، قوتابخانە و "پەیمانگای گوندەکان"یشی دامەزراند بۆ پێگەیاندنی مامۆستایانێك کە وانەی ئیلحاد بڵێنەوە! (وەرگێڕ)

یەکەم:

لە ماوەی بیست ساڵدا و لەو کاتەدا کە ئێوە وەزیری ناوخۆ بوون، تەنها یەك عەرزوحاڵم بۆ نووسین. بەڵام بۆ ئەوەی لەو دەستوورەی ژیانم لانەدەم کە ڕەفتاری پێ دەکەم، عەرز و حاڵەکەم بۆ نەناردن. ئەگەر پێتان باشە ئێستا بۆتان دەخوێنمەوە و، بە سیفەتی ئەوەی کە وەزیرێکی پێشووی ناوخۆ و سکرتێری گشتیی حیزبن لەگەڵتان دەدوێم. تکایە یەك دوو سەعات بواری قسەم پێ بدەن، چونکە کەسێك کە ماوەی بیست ساڵ لەگەڵ حکوومەتدا نەدوابێت، گەر دە سەعاتیش و تەنها یەك جار لەگەڵ یەکێك لە پایەکانی حکوومەتدا و بە سیفەتی نوێنەرایەتیی حکوومەت بدوێت، هێشتا هەر کەمە.

دووهەم:

لەبەر ئەوەی بەڕێزتان سکرتێری ئێستای حیزبن، خۆم بە ناچار دەزانم کە ئەم ڕاستییەی خوارەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

ئەم پارتەی کە سکرتارێتیی بە ئێوە سپێرراوە، لە بەردەم گەلدا ئەرکێکی گرنگی لە ئەستۆدایە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

ئەم نەتەوەی تورکە و برایانی ئاییینی هاورێشی، ماوەی هەزار ساڵە ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرتووە و، بە پاڵەوانێتیی خۆیان سەرجەمی نەتەوەی ئیسلامیان منەتبار و سوپاسگوزاری خۆیان کردووە و، یەکێتیی ئیسلامییان پاراستووە و، بە قورئانی پیرۆز و ڕاستییەکانی ئیمان گرۆی مرۆڤیان لە کوفری ڕەها و گومڕایی ترسێنەر و سامناك ڕزگار کردووە..

جا ئەگەر ئێستا ئەم نەتەوانە - بە وێنەی مێژووی پێشوویان - بە لێبڕانێکی قارەمانانە ئەرکی پاراستن و بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان نەخەنە ئەستۆی خۆیان و، ئێوەی غیرەتمەندیش ڕاستەوخۆ کەسانی ئەم نەتەوەیە بۆ ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان هان نەدەن، لە بریی هەڵەی سەردەمی پێشوو کە بانگەشەی بۆ شارستانێتیی خۆرئاوا تێدا دەکرا و گیانی ئاییینیش بەرەو لاوازی

دەبرا، ئەوا من مەترسی و هەڕەشەی بێ گومانی دواڕۆژێکی سامناکتان پێش چاو دەخەم و، ئەمەش بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ ڕوون دەکەمەوە. چونکە ئەو کاتە:

جیهانی ئیسلامی، لە بریی خۆشویستنی ئەم نەتەوەیە، نەفرەتی لێ دەکات، تەنانەت دەبێت بە دوژمنی برای پاڵەوانی نەتەوەی تورکی و، ئێوەش لە بەردەم ئەو ئاژاوە و تۆقاندنەی کە لە ژێر پەردەی ئەو کوفرە ڕەهایەدا خۆی مەڵاس داوە کە بۆ لەناوبردنی جیهانی ئیسلامی تێدەکۆشێت، شکست دەهێنن و دەبن بەهۆی لەت لەت بوون و شپرزیی نەتەوەی تورك کە قەڵای جیهانی ئیسلامی‌یە و سوپا پاڵەوانەکەشی، هەروەك ڕێگا بۆ خۆسەپاندنی دێوی دڕندەی شیوعیەتیش بەسەر ئەم وڵاتەدا خۆش دەکەن.

بەڵێ، مەگەر تەنها بە هێزی قورئانی پیرۆز، دەنا ئەم نەتەوە قارەمانە هەرگیز ناتوانێت لە بەردەم لافاوەکانی ئەو دوو تەوژمە سامناکەی دەرەوەدا خۆی ڕابگرێت. کەواتە ئەم لافاوە ڕامالەرەی کوفر و.. ئیستبدادی ڕەها و.. بەرەودان بە هەرزەیی و.. موباح کردنی ماڵی خەڵکی، تەنها ئەو نەتەوەیە دەتوانێت بەربەستی بکات کە گیانی لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا هێندە تەبا و تێکەڵ و هەڵشێلراو بێت کە بووبێت بە بەشێك لە قەوارەکەی و، نەتەوەیەك بێت لەبەر ڕێزنان لە مێژووی ڕابوردووی خۆی، شانازی بە ئیسلامەوە بکات.

بە پشتیوانیی خوا ئەهلی غیرەت و مەردایەتیی ئەم نەتەوەیە، لە ڕێی بڵاوکردنەوەی گیانی ڕاستی‌یەکانی قورئانەوە - کە بە ناو دەمارەکانی ئەم نەتەوەیەدا ڕۆچووە - ئەو تەوژمانە لە شوێنی خۆیان ڕادەگرن و، لە بریی بەرەودان بە پەروەردەی شارستانێتیی خۆرئاوا، قورئان دەکەن بە دەستووری ژیانی خۆیان.

تەوژمی دووهەم بریتی‌یە لەوەی کە "دوژمن" ئەو شوێنانەی لە جیهانی ئیسلامیدا داگیری کردوون، بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت و، بە پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵ دەیانبەستێت بە خۆیەوە. تاکو دوای ئەوەی کە ناو و ناتۆرەی بێ دینی و ئیلحادی خستە شوێن ئەم وڵاتە، بتوانێت باوەڕ و متمانەی جیهانی ئیسلامی بەم

وڵاتە و بە پلە و پایە مەرکەزی‌یەکەی لە جیهانی ئیسلامدا لەق بکات. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی پچڕانی پەیوەندیی مەعنەویی نێوان ئەم وڵاتە و جیهانی ئیسلامی. ئنجا ئەو گیانی برایەتی‌یەش کە جیهانی ئیسلامی بەرامبەر بەم نەتەوەیە هەڵی گرتووە دەگۆڕێت بۆ دوژمنایەتی.. ئەمە و پیلانە ترسناکەکانی تری هاوچەشنی، کە تا ئێستا هەندێ سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێناوە..

بەڵام گەر ئەم تەوژمە ژێر بێت و پیلانە ترسناکەکەی بگۆڕێت و، وەك نەرمونیانی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا دەنوێنێت، لێرەش لە ناوخۆدا ڕەفتار و مامەڵەی لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا جوان بێت، ئەوا دەسکەوتێکی زۆر بەدەست دەهێنێ و، پارێزگاری لە دەسکەوتەکانی پێشووی دەکات و، ئەم نەتەوە و وڵاتەش لە کارەساتێکی ڕووخێنەر ڕزگاریان دەبێت.

جا ئەگەر ئێوە، کە پلەی سکرتارێتیی ئەهلی غیرەت و نەتەوایەتی‌تان گرتووەتە ئەستۆ، هەوڵی پاراستنی ئەو بناغە و بنەمایانە بدەن کە موقەددەساتی ئایینی ئەم نەتەوەیە تێکدەشکێنن و، برەو بە شارستانێتیی خۆرئاوا دەدەن و، لایەنە چاکەکانی کاتی ئێستا و چاکەکاری‌یەکانی ئەم کودەتایە بە هی چەند کەسێکی کەم دابنێن کە بە ناوی کودەتاکەوە هەڵساون و، لە هەمان کاتدا ناتەواوی و کەموکوڕی‌یە ترسناك و تاوانە گەورەکانیش بخەنە ئەستۆی ئەم نەتەوەیەوە.. ئەوا کردارە خراپەکانی چەند کەسێکی کەم دەخەنە ئەستۆی هەموان و دەیانگەیەننە ملیۆنەها کردەوەی خراپ! دیارە ئەو کاتەش ڕەفتارێکی دژ و پێچەوانەی ئاواتەکانی ئەم نەتەوە ئاییندار و قارەمانە ئەنجام دەدەن و، بێ وەفایی بۆ سوپای ئیسلام دەنوێنن و، بە ڕووکارێکی تری غەیری ئاراستەگەی سەرجەمی نەتەوەدا دەڕۆن و، پشت لە ملیۆنان پاڵەوانی مەردی ئەم نەتەوەیە هەڵدەکەن کە شەرەفی شەهیدی‌یان بەدەست هێناوە و، ئازاری ڕۆحە خاوێنەکانیان دەدەن و لە شان و شەرەفیان دادەشکێنن.

هەروەها گەر ئەو چاکەکاری‌یانەی کە بە هیممەتی نەتەوە و هێزی سوپا بەدەست هێنراون، بدرێنە پاڵ ئەو چەند کەسە کەمە کودەتاچی‌یە، ئەوا ملیۆنان

کردەوەی چاك دەتربجێننە چەند چاکەیەکی کەمەوە، کە بەوەش دەپووکێنەوە و، لە ئەنجامدا نامێنن و، ناشبن بە کەفارەتی هەڵە گەورەکانی ڕابوردوو.

سێهەم:

بێ گومان ئێوە لە چەند لایەنێکی ناوخۆ و دەرەوە ناحەز و نەیاری زۆرتان هەیە. خۆ هەرچەند ئێستا بەهۆی بایەخ نەدانم بە دەنگوباسی دنیا و سیاسەت لەو کاروبارانە بێ ئاگام، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمساڵ زۆر تەنگیان پێ هەڵچنیم، ناچاربووم کە بۆ هۆکاری ئەم سەخڵەت کردنە بگەڕێم و، لەمەوە زانیم کە نەیاری و موعارەزەیەك پەیدا بووە.

جا ئەگەر ئەم موعارەزەیە پێشەوایەکی شایستە و لێهاتووی بۆ بڕەخسێت و، بە ناوی ڕاستییەکانی ئیمانەوە بڕواتە مەیدانەوە، ئەوا یەکسەری بەسەرتاندا سەردەکەوێت! چونکە وا ماوەی هەزار ساڵە لە سەدا نەوەدی ئەم نەتەوەیە بە گیان و دڵ پابەندی داب و نەریتەکانی ئیسلامن و، گەر بە ڕواڵەتیش ملکەچی بۆ شتێکی پێچەوانەی ئەم سروشتەی خۆیان پیشان بدەن، ئەوا هەرگیز بە دڵ پابەندی نابن!!

پاشان "موسڵمان" جیاوازە لە کەسانی نەتەوەکانی تر؛ چونکە ئەگەر موسڵمانێك واز لە ئایینەکەی بهێنێت ئەوا هیچ شتێك لە سنووری خۆی ڕایناگرێت و، تۆقێنەرێکی ئاژاوەچیی لێ دەردەچێت. تەنانەت بە هیچ هۆکارێکی پەروەردە و بەڕێوەبردن بەڕێوە نابرێت، مەگەر ئیستیبدادی ڕەها و بەرتیلی گشتیی بۆ بەکار بهێنرێت. گەلێ بەڵگە و نموونەی زۆر هەن کە ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن! لێرەدا بە کورتی لێیان دوام، ڕوونکردنەوەیان بە وریایی و زیرەکیی خۆتان دەسپێرم.

نابێت ئێوە لە دەوڵەتە ئەسکەندنافیەکان دوا بکەون کە لەم چەرخەدا هەستیان بە پێویستییەکی زۆر بۆ قورئانی پیرۆز کردووە، بەڵکو دەبێ ئێوە پێشەنگی ئەوانیش و دەوڵەتەکانی تری هاوچەشنیان بن.

خۆ ئەگەر گوناهـ و تاوانەکانی ئەم کودەتایە کە تا ئێستا ئەنجام دراون بخەنە ئەستۆی چەند کەسێکی کەمەوە و، ئنجا بۆ چاککردنەوەی ئەو کاولکارییانە هەوڵ بدەن کە بەهۆی بارودۆخی جەنگی جیهانی و چەند ئاڵوگۆڕێکی ترەوە پەیدا بوون، بە تایبەت ئەوانەی کە سەبارەت بە داب و نەریتە ئایینییەکان ئەنجام دراون، ئەوا لە ئاییندەدا ئەم هەوڵەتان بە شەرەفمەندییەکی گەورە بۆ دادەنرێت و، کارەکەشتان دەبێت بە کەفارەتی گوناهە گەورەکانتان. ئنجا لەبەر ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی نەتەوە و نیشتمانی دەکەن شایانی ئەوە دەبن کە سیفەتی "غیرەتمەندان" و "جوامێرانی نەتەوە"تان پێ بدرێت.

چوارەم:

مادەم "مردن" لەناو نابرێت و "دەرگای گۆڕ"یش داناخرێت و.. ئێوەش وەك هەر مرۆڤێکی تر دەبێ بە گورجی بەرەو گۆڕەکانتان بڕۆن.. ئنجا ئەو مردنەش کە دەبێت هەموو کەسێك بیچێژێت، بۆ گومڕایان "ئیعدامێکی هەتاهەتایی"یە و، سەد هەزار بانگەشەی نیشتمان پەروەری و خۆشویستنی دنیا و دەسکەوتە سیاسییەکان هەرگیز ناتوانن ئەو ئیعدامە هەمیشەییە بگۆڕن، مەگەر قورئانی پیرۆز کە بۆ "ئەهلی ئیمان" دەیکات بە پسوولەی پشوودان و حەوانەوە. وەك ئەو پەیامانەی نوور چەسپاندوویانە کە لەبەردەستتاندایە و، هیچ فەیلەسووف و موڵحیدێك نەیتوانیوە ڕەخنەیان لێ بگرێت، بەڵکو هەر کەسێك لەو فەیلەسووفانە بە وردی و سەرنجەوە ئەو پەیامانەی خوێندبێتەوە پەیامەکان هێناویانەتە ناو بازنەی ئیمانەوە..

تەنانەت لە ماوەی ئەم چوار ساڵەدا چ فەیلەسووفەکان و چ زانا خەبیرەکان و تەنانەت هەر چوار دادگاکانتان، جگە لە سەلماندن و سەرسووڕمان و ڕێزلێنان، شتێکی تریان بەرامبەر ئەو پەیامانە دەرنەبڕیوە و، هیچ ڕەخنەیەکیان لەو بەڵگە بەهێزانەی ڕاستییەکانی ئیمان نەگرتووە، چ جای ئەوەی زیانێکیان بۆ نەتەوە و نیشتمان تێدا بێت. بەڵکو ئەو پەیامانە وەکو بەربەستێکی قورئانیی چەشنی بەربەستەکەی "زولقەرنەین"وان لە بەردەم تەوژمە سامناکە هێرشبەرەکاندا. سەد

هەزار شایەتیشم لەم نەتەوەی تورکە، بە تایبەت لە گەنجە ڕۆشنبیرەکانی، لەسەر ئەم ڕاستی‌یە بەدەستەوەیە..

لەبەر هەموو ئەم هۆکارانەی کە خرانە ڕوو، ئەرکی بنەڕەتیی سەرشانتان بریتی‌یە لەوەی کە بەوپەڕی گرنگی و بایەخ پێدانەوە بڵاوکردنەوە و پشتگیریی ئەم بیر و بۆچوونانەم بگرنە ئەستۆی خۆتان.

خۆ ئێوە هەمیشە گوێ بیستی زۆر کەسی سیاسی و دنیایی دەبن. دەبا ئەم جارە - با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت - گوێ لە کەسێکی لاوازی دەستەوسانی وەك من ڕابگرن، کە لەسەر لێواری گۆڕەکەیدا بۆ حاڵی هاووڵاتیانی دەگری و، لە پێناوی دوارۆژیشدا لەگەڵتان دەدوێت.

* * *

(گومانی باش بە خۆم نابەم)

برا بەوەفا و ڕاستەکانم!

(ئەمە وەڵامێکە بە دڵدا هات بۆ پرسیارێکی ماددی و مەعنەوی)

دەوترێت:

بۆچی بە پلەوپایە و چەند تایبەتکاری‌یەك بۆ خۆت ڕازی نابیت، لە کاتێکدا قوتابیانی نوور لەڕادەبەدەر باوەڕی باش و قەناعەتی تەواویان بەرامبەرت هەیە. خۆ گەر بەو پلەوپایانە ڕازی ببیت، ئەوا ئاشکرایە کە شەوق و لێبڕانی ئەوان بۆ کارکردن لە خزمەتی ئیماندا زیاد دەبێت، کەچی ئەو پلەوپایە تایبەتانە لە خۆت دوور دەخەیتەوە و، بە "پەیامەکانی نوور"یان دەبەخشیت و، خۆت بە خزمەتگوزارێکی خاوەن قسوور و ناتەواوی پیشان دەدەیت؟

وەڵام:

هەزاران شوکر و ستایشی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە، "پەیامەکانی نوور" ئەوەندە پاڵپشتی بەهێزی نەبزواوی زۆر و بەڵگەی گومانبڕی ئاشکرا و ڕوونیان

هەیە کە هەرگیز ناکوژێنەوە، بە چەشنێك هیچ پێویستێکیان بەو قابیلییەت و تایبەتکاری‌یانە نی‌یە کە وا گومان دەبرێت لە مندا هەبن. "پەیامەکانی نوور" وەك کتێب و بەرهەمەکانی تر نین تا گرنگی‌یان بە لێهاتنی دانەرەکەیانەوە بەسترابێت و باشی و هێز و پێزیان هی ئەو بێت. نەخێر..

وا بیست ساڵە ئەم پەیامانە پشتیان بە بەڵگە بەهێزەکانی خۆیان بەستووە کە بە رادەیەکن دوژمنە ماددی و مەعنەوی‌یەکانیان ناچاری تەسلیم بوون کردووە. ئەمەش لە بەرچاوی هەمواندا ڕوون و ئاشکرایە. جا ئەگەر کەسێتیی من خولگە و پاڵپشتی گرنگی ئەو پەیامانە بوایە، ئەوا دوژمنە مولحید و ناحەزە ستەمکارەکانم، لە ڕێی دەست وەشاندنەوە لە منی خاوەن قسووری گوناهبار دەیانتوانی زەبرێکی توند ئاراستەی "پەیامەکانی نوور" بکەن. بەڵام بەهۆی هەڵەشەیی و گێلیی خۆیان، دەچن هەرچی فرت و فێڵ و هۆکار و پیلانیان هەیە بۆ نرخ نەهێشتن و شکاندنی کەسێتیی من دایدەڕێژن. جا لەو کاتەدا کە ئەوان تێدەکۆشن کەس ڕووم تێ نەکات و لێم نزیك نەبێتەوە، توانای ئەوەیان نی‌یە ڕێ لە "فتوحاتی ئیمانیی پەیامەکانی نوور" بگرن و لە ڕێز و نرخ و بایەخیان دابشکێنن. تەنانەت ناشتوانن خزمەتگوزارە نوێکانی لەم خزمەتە ئیمانی‌یە دوور بخەنەوە، هەرچەندە بێگەردیی دڵ و زەینی هەندێ لەوانیان لێڵ کردبوو.

جا لەبەر ئەم ڕاستی‌یە و، لەبەر پەرەسەندن و زاڵ بوونی "خۆویستی" بە چەشنێکی فراوان لەم سەردەمەدا، هەرگیزاو هەرگیز بەو گومان باشی‌یە لەڕادەبەدەرەی کە خەڵکی بەرامبەر من هەیانە و لە سەرووی توانا و وزەی خۆمەوەیە، ڕازی نابم و دەست بە ڕوویەوە دەنێم. چونکە من وەکو براکانم وام، گومانی باش بە خۆم نابەم. سەرەڕای ئەوەی کە ئەو پلەوپایانەی دوارۆژ کە براکانم بەم هەزارەیان ڕەوا بینیوە، ئەگەر پلەی ڕاستەقینەی ئایینی بێت و، منیش - خوا نەخواستە - ئەگەر پێی ڕازی بم، ئەوا بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئەو پلەوپایەیە! خۆ ئەگەر بیشزانم پلەوپایەی وام نی‌یە، ئەوا دەبێ - بەپێی ئەو دەستوورەی کە لە

"مەکتووبی دووهەم"دا خراوەتە ڕوو - بەخشش و دیاریی ئەوان وەرنەگرم. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هەرکەسێك خۆی بە خاوەن پلە بزانێت لەوانەیە خۆویستی تێکەڵی کارەکەی ببێت.

* * *

(ڕێبازی پەیامەکانی نوور دەسکەوتەکانی تەریقەتیش دەهێنێتە دی)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

برای ئازیز و پاڵەوانم کاك صەبری!

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە چەند سەربازێکی گیانفیدای وەك کاك "غالب" بۆ سوپای ئیسلام بنێرێت. ئەم بەڕێزە لە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتدا بە وێنەی خزمەتگوزارییەکەی خلووصی، خزمەتی ئیمانی پێشکەش دەکات و، تێدەکۆشێ لە ڕێی تەسەووفەوە ئیمانداران لە ئیمانەکەیان نزیك بخاتەوە و لە گومڕایی بیانپارێزێت..

ئەم بەڕێزە پێش ئەوەی پەیامەکانی نوور ببینێت هەوڵی دابوو لە ڕێبازی نووردا تێبکۆشێت. خۆ هەرکات پەیوەندیی بە پەیامەکانەوە بەهێز بکات، ئەوا دەتوانێت کاری زیاتر ئەنجام بدات. چونکە بناغەی ڕێبازی نوور بریتییە لە: حەقیقەت و.. سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ و.. بایەخدان بە فەرزەکان و خۆپاراستن لە گوناهەکان. ئنجا لە پلەی دووهەم و سێهەمدا دەڕوانێتە تەسەووف.

بەڵام برای بەڕێزمان کاك "غالب" لەناو عەلەوییەکاندا خزمەتەکانی بە ئەنجام دەگەیەنێت و، بیر لەوە دەکاتەوە کە چەند وانەیەکیان لە تەریقەتێکی سۆفی پێ بڵێت کە پوختەی تەریقەتەکانی قادری و شازلی و ڕەفاعییە و، لە ناوەندی سوننەتی نەبەویدایە، بە مەرجێ کە بە خراپە توخنی خەلیفە ڕاشیدەکان و عەشەرەی موبەششەرە نەکەوێت و، هەوڵەکانیشی هەر لە بازنەی خۆشویستنی ئالی بەیتدا بهێنێتەوە.

ئەم ڕێبازە بە ناوی حەقیقەت و لە پێناوی ڕزگار کردنی ئیمان و پاراستنی لە بیدعەت، زۆر سوودی گرنگی تێدایە:

یەکەمیان:

سوودێکی گرنگی لەو ڕووەوە تێدایە کە نایەڵێت تەوژمەکانی تر عەلەوییەکان بە لای خۆیاندا ڕابکێشن و، لە زیادەڕەویی ڕافزییەکان و تەوژمی سیاسیی بەکتاشییەکانیش دەیانپارێزێت.

دووهەمیان:

ئەو عەلەوییانەی کە خۆشویستنی ئالی بەیتیان داناوە بە ڕێبازی خۆیان، هەرچەندەش لەم خۆشویستنەدا ڕۆبچن و تەنانەت بیشبن بە ڕافزی هێشتا هەر ناڕۆنە ناو کوفری ڕەهاوە، چونکە تا خۆشویستنی ئالی بەیت زیاتر بە ناخی دڵیاندا ڕۆ بچێت ئەوا پتر لەو کوفرە دووریان دەخاتەوە کە دوژمنایەتیی پێغەمبەر ﷺ و ئالی بەیتی لەخۆ گرتووە. بەڵکو بەهۆی ئەو خۆشەویستییەوە پتر دەست لە ئیسلام گیر دەکەن. کەواتە هێنانی ئەو جۆرە کەسانە لە ڕێی تەریقەتی سۆفییەوە بۆ ناو بازنەی سوننەتی نەبەوی بە سوودێکی گەلێ گەورە دادەنرێت.

پاشان هێنانی عەلەوییەکان بۆ ناو بازنەی نوور بەرژەوەندییەکی گەورەی تێدایە. بۆ ئەوەی چەند تەوژمێکی سیاسی ئازایەتییە سروشتییەکەیان بە زیانی یەکێتیی ئەهلی ئیمان نەقۆزێتەوە. جا مادەم مامۆستای قوتابیانی پەیامەکانی نوور ئیمامی عەلییە - خوای لێ ڕازی بێت - و خۆشویستنی ئالی بەیتیش یەکێکە لە بناغەکانی ڕێبازی نوور، ئەوا پێویستە عەلەوییە ڕاستەقینەکان بە شەوق و شادمانییەکی تەواوەتی بێنە ناو بازنەی نوورەوە.

ئەم زەمان و ڕۆژگارە زەمانی "ڕزگار کردنی ئیمان"ە. جا لەبەر ئەوەی لەم سەردەمی بیدعەتەدا گەلێ گیروگرفت لە ڕێبازی سەیر و سلووکی تەریقەتی سۆفیدا هەیە، ئەوا بازنەی نوور ڕێبازی حەقیقەت دەگرێتە بەر و بەمەش سوودەکانی "تەریقەتی سۆفی"ش دەهێنێتە دی.

ئەمەی سەرەوە بۆ ئەو برایەمان بنووسن و، پیرۆزبایی و سڵاوی منیشی بە بۆنەی هاتنی مانگی ڕەمەزانەوە پێ بگەیەنن. با ئەویش دوعای خێر بۆ ئێمە بکات.

* * *

(هەموو كەلەبەرێكی نەفسم گرتووە)

برا بەوەفا و ڕاستەكانم!

لەو كاتەدا كە ئازاری نەخۆشی بە تەواوی لەسەرم قورس بووبوو، چەند پزیشكێك لە "ئەركانی قوتابیانی نوور" هاتن بۆ لام، بەڵام سەبارەت بە نەخۆشی‌یە سەختەكەمەوە هیچم لای ئەو قوتابی‌یە ڕاست و دڵسۆزانە نەدركاند و چارەسەرم لێ وەرنەگرتن، تەنانەت لە بارەی ئەو نەخۆشی‌یانەی گرفتاریان بووم هەر هیچ پرس و ڕایەكم پێ نەكردن، هەرچەندەش لەو كاتەدا ئازارەكانی ئەو نەخۆشی‌یانە دەیانگووشیم و تابلێی پێویستم بەوان هەبوو!

كە بینییان بە هیچ جۆرێك لە بارەی نەخۆشی‌یەكەمەوە نادوێم، دڵگرانی و ماتەمینی دایگرتن. لەبەر ئەوە ناچار بووم ڕاستی‌یەكیان بۆ ڕوون بكەمەوە كە حیكمەتێكی تێدایە، وا دەینێرم بۆتان بەڵكو سوودی بۆ ئێوەش تێدا بێت:

پێم وتن:

دوژمنە پەنهانەكانم و دەروونی بەدخوازم پێكەوە و بە فیتی شەیتان، بە دوای سروشت و دەمارێكی لاواز دەگەڕێن لە مندا، تاكو بیگرن و لەو ڕێیەوە زیان بە خزمەتگوزاریی بێگەردانەی ئیمانم بگەیەنن و، كۆسپ بخەنە ڕێی بڵاوبوونەوەی ڕووناكی‌یەكان.

بەڵێ ڕاستە، لاوازترین لایەن لە مرۆڤدا و، پڕ لە مەترسیترین ڕێگری كار "نەخۆشی"یە! چونكە ئەگەر "نەخۆش" بایەخی زۆر بە نەخۆشی‌یەكەی بدات، هەستەكانی لەشی زیاتر لەسەری توند دەبن و پتر بە سەریدا زاڵ دەبن، هەتا وای لێ دێت دەڵێت: "ئەمە پێویستی و ناچاری‌یە"! ئیتر بەم پێیە "ڕۆح" و "دڵ"ی لە قسە دەخات و، پزیشكەكەی بە وێنەی فەرمانڕەوایەكی خۆسەپێنەر هێندە زاڵ دەكات كە ناچاری گوێڕایەڵیی ئامۆژگاری‌یەكانی ببێت و، ئەو چارەسەرانەش بەجێ بهێنێت كە دایاندەنێت بۆی. ئەمەش شتێكە زیان بە خزمەتگوزاریی ئیمان دەگەیەنێت، كە داخوازی قوربانی و خۆبەختكاری و ئیخلاسی تەواوەتی‌یە.

دوژمنە پەنهانەکانم ویستیان سوود لەم لایەنە لاوازەم ببینن و، ئێستاش هەر هەوڵ دەدەن.. جگە لەوەش دەیانەوێت دەرفەت لە سروشتی ترس و تەماع و ناوبانگ وەربگرن. بەڵام لەم لایەنانەوە هیچ ئامانجێکیان بەدەست نەهێنا و، بۆیان سەلما کە ئێمە گوێ بە هیچ شتێك، تەنانەت بە ئیعدامیش، نادەین.

پاشان ڕەوشتێکی لاواز و دەمارێکی بێ هێزی مرۆڤ بایەخدانە بە تەماع و خەم و خەفەتی گوزەران. لەم ڕووەشەوە گەلێ هەوڵیان دا سوودێك وەربگرن. بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە لەو لایەنە لاوازەشەوە هیچ دەسکەوتێکیان نەبوو. تاکو گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە شمەك و کەرەسەکانی دنیا، لەوانەی کە خۆیان موقەددەساتیان لە پێناودا بەخت دەکەن، لای ئێمە ئەوەندە بێ نرخن کە بەهای هیچ شتێکیان نی‌یە. ئەمەشیان بە چەندین ڕووداوی زۆر و زەبەندە بۆ سەلما. بە ڕادەیەك کە لە ماوەی ئەم دە ساڵەی ڕابوردوودا، سەد جار زیاتر بە شێوەیەکی ڕەسمی لە بەڕێوەبەرایەتی‌یە ناوخۆییەکانیان پرسیبوو: "بە چی دەژی"؟

گەڕان بە دوای دەرکردنی ناوبانگدا و، چاوگێڕان بۆ پلەوپایە، دەمار و لایەنێکی لاوازە لە مرۆڤدا. کاربەدەستان فەرمانیان دابوو دەرفەت لەو دەمارە لاوازەم وەربگیرێت. لەبەر ئەوە، هەموو جۆرێکی زامدار کردنی هەست و سووکایەتی و ئەشکەنجە و ئازاریان هێنایە ڕێم!

بەڵام - بە فەزڵی خوای گەورە - هیچ شتێکیان بەدەست نەهێنا و، بە تەواوی تێگەیشتن کە ئەو ناوبانگە دنیاییەی ئەوان تا ڕادەی پەرستن شەیدا و عەوداڵی بوون، ئێمە بە ڕیا و لەخۆڕازی بوونێکی ئەوتۆی دەزانین کە زیانی بۆ مرۆڤ تێدایە و، حەز کردنیش لە پلە و پایە و ناوبانگی دنیا - کە ئەوان بایەخی پێ دەدەن - لای ئێمە فلسێکی قەڵب ناهێنێت، تەنانەت ئێمە لەم ڕووەوە ئەوان بە گێل و شێت دادەنێین!

پاشان ئەو لایەنەی کە لە ڕووی خزمەتگوزاری‌یەوە بە لایەن و دەمارێکی لاواز لە ئێمەدا دادەنرێت، هەرچەند لە ڕاستیدا بە لای هەموو خەڵکی‌یەوە باش و

ڕەوایە، بەڵکو لە هەناسەبڕکێ و هەڵپەدان بۆ دەستکەوتنی، کە بریتی‌یە لەوەی مرۆڤ پلەیەکی مەعنەویی بەرزی هەبێت و بە مەقامەکانی "ویلایەت"دا سەربکەوێت..

ئەم لایەنە، هەرچەندە هیچ زیانێکی تێدا نی‌یە و جگە لە قازانج هیچی تری لێ ناوەشێتەوە، بەڵام لەم زەمانەی ئێمەدا کە خۆویستی و خۆپەرستی دەسەڵاتی خۆی تێدا سەپاندووە و ڕووی لە بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکانە، بە ڕادەیەك کە هەموو هەست و نەستێکی مرۆڤ لەو بۆتەیەدا قاڵ بووە کە بیر تەنها لە ڕزگاربوونی خۆی بکاتەوە..

خزمەت کردنی ئیمان ئا لەم زەمانەدا، کە خزمەتێکە پاڵی بە نهێنیی ئیخلاسەوە داوە و نایەوێت لە لایەن هیچ کەسێکەوە بۆ هیچ ئامانج و مەبەستێك بەکار بهێنرێت.. ئەم خزمەتە، داخوازی ئەوەیە کە مرۆڤ بە دوای پلەوپایەی مەعنەویی کەسیدا نەگەڕێت، بەڵکو هەڵسوکەوتیشی هەرگیز ئەوە نەگەیەنێت کە بە دوایاندا عەوداڵە و حەزی لێیانە، تەنانەت دەبێت هەر بیریشیان لێ نەکرێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو نهێنی‌یەی لە ئیخلاسی ڕاستەقینەدا هەیە، تێك نەچێت و کەلێنی تێ نەکەوێت.

ئەوانەی تێدەکۆشان دەرفەت لەم لایەنە لاوازەم ببینن، ئا لێرەوە بۆیان دەرکەوت کە من لە دەرەوەی خزمەتگوزاریی نووردا بە دوای ئەو کەشف و کەرامەت و پلە و پایە و تایبەتکاری‌یە ڕۆحی‌یانەشدا ناگەڕێم کە هەموو مرۆڤێك بە دوایاندا دەگەڕێت.

سڵاومان بە هەموو یەکێکی برایانمان بگەیەنن و، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە بە میهرەبانیی فراوانی خۆی ئەم "شەوی قەدر"ەی کە لە ڕێماندایە بخاتە بریی هەشتا ساڵ تەمەنی خواپەرستی بۆ یەك بە یەکی قوتابیانی نوور و، حەقیقەتی ئەو شەوەش دەکەین بە تکاکارمان لەو نزا و پاڕانەوەیەماندا.

* * *

(لە بارەی ڕوانینی حەرامەوە)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

کاتی ئەوە هاتووە کە ڕووداوێکی ناسك و ئازاربەخش و سەرسووڕهێنی ژیانی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە و، لە هەمان کاتیشدا ئەو بوختانە دەمهەڵبەستە چەپەڵەش بخەمە ڕوو کە دوژمنان بڵاوی دەکەنەوە و لە ڕادەیەکدایە کە تەنانەت شەیتان خۆیشی ناتوانێت هیچ کەسێکی پێ تەفرە بدات.

ئەمەش دەری دەخات کە دوژمنان هیچ چەکێکیان لە بەرامبەر نوورەوە پێ نەماوە.

بەسەرهات و مێژووی ژیانم زۆر کەس دەیزانن:

◆ ئەوەبوو دوای ئەوەی کە "عومەر پاشا" هەوڵێکی یەکجار زۆری لەگەڵ دام بڕۆمە ماڵیان، چونکە ڕێزێکی زۆری لە زانست و زانایان دەگرت، دوو ساڵ لە ماڵی خوالێخۆشبوو عومەر پاشای ناوبراودا لە "بەدلیس" مامەوە..

ئەم پیاوە شەش کچی هەبوو: سیانی بچووك و سیانی گەورە. جا هەرچەندە من ماوەی دوو ساڵ لەو ماڵەدا ژیام، کەچی کچە گەورەکانیم نەدەناسین، چونکە بۆم نەدەڕوانین تا بیان ناسم و لێکیان جیا بکەمەوە.

جارێکیان زانایەك بوو بە میوانم و، لە ماوەی دوو ڕۆژدا ئەو کچانەی ناسی و لە یەکی جیا کردنەوە!

ئەوانەی لە دەوروبەرمدا بوون سەریان سووڕدەما لەوەی کە چۆن من نایان ناسم و.. پرسی‌یان:

بۆچی سەیریان ناکەیت؟

منیش پێم وتن:

"پارێزگاری کردنی عیززەت و سەربەرزیی زانست نایەڵێت سەیر بکەم"!

◆ لە یەکێ لەو فیستیڤاڵانەی کە چل ساڵ پێش ئێستا لە ئەستەمبوڵ ساز کرا، حەشاماتێکی زۆر ئامادە بوون و، لەمبەر و ئەوبەری ئەو کەنداوەی کە ئەستەمبووڵ

دەکات بە دوو بەشەوە ئافرەتانی ئەستەمبووڵ و ئافرەتە ڕۆم و ئەرمەنی‌یە پۆشتە و ڕووتەکان ڕیزیان بەستبوو.

منیش لەگەڵ کاك تاها و کاك ئیلیاسدا (کە هەردووکیان ئەندامی پەرلەمان بوون) سواری بەلەمێك بووین تاکو بانگەیەنێتە جێی ئاهەنگ گێڕان لە کۆتایی کەنداوەکەدا.

بەلەمەکە بە بەردەمی ئەو ئافرەتانەدا دەڕۆیشت.. منیش ئاگاداری ئەوە نەبووم کە مەلا تاها و حاجی ئیلیاس زووتر قسەیان کردووە بە یەك کە بە نۆرە سەیرم بکەن و تاقیم بکەنەوە و بزانن بۆ ئافرەتەکان دەڕوانم یان نا؟ دوای سەعاتێکی تەواوی گەشتی ناو ئاو بەو بەلەمە و بەناو ئەو ئافرەتانەدا، خۆیان دانیان پیادا نا و وتیان:

سەرمان لە تۆ سووڕماوە.. خۆ بە هیچ جۆرێ سەیرت نەکردن!

وتم:

"من ئەو تام و چێژە کاتی و بێ نرخ و ئاوێتەی ئازارانەم ناوێت.. چونکە ئەنجامەکانیان ئازار و حەسرەتە"!

پاشان هەموو هاوڕێیانم و ئەو کەسانەش لەگەڵما تێکەڵن، بە باشی دەزانن کە من بە تەواوی توخنی وەرگرتنی دیاری‌یەکان نەکەوتووم و، بە درێژایی هەموو ژیانم نەڕۆشتوومەتە ژێر منەتی هیچ کەسێکی خێرەومەندەوە.

جا لەبەر پاراستنی ڕێزی پەیامەکانی نوور و خزمەتی قورئان و پاراستنی سەلامەتیی ئەم خزمەتە، وازم لەوە هێناوە کە گرنگی بە هەر شتێك بدەم پەیوەندیی بە چێژە ماددی و کۆمەڵایەتی و سیاسی‌یەکانی دنیاوە بێت و، بایەخیشم بە هەڕەشە و تەنانەت ئیعدامەکانی کەسانی خاوەن ئامانج و مەبەستی کەسی نەداوە. ئەمەش بە ڕوونی لەو بیست ساڵەدا دەردەکەوێت کە بە ڕەهەندەیی و ئازاری ئاوارەیی و بەندیخانەی ترسناك و لە دادگاکاندا بەسەرم بردووە.

لەو کاتەدا کە من بە درێژایی حەفتا و پێنج ساڵ ئەم دەستوورە مەزنەم پیادە کردووە، کەچی کارمەندێکی خاوەن مەنسەبی ناو حکوومەت تۆمەتێکی هێندە

چەپەڵی بە مەبەستی شکاندنی شان و شکۆی بەرزی پەیامەکانی نوور ڕێك خستووە کە تەنانەت بە خەیاڵی شەیتانیشدا نایەت و، وتوویەتی: "بە شەودا ئافرەتانی فاحیشە و خۆشترین و بەلەزەتترین خۆراکی بۆ دەچێت"!

لە کاتێکدا کە من بە شەودا دەرگاکەم لە ناوەوە و دەرەوە دادەخرێت و، کەسێکیش هەیە کە بە فەرمانی ئەو کارمەندە بەدبەختە شەو تا بەیانی ناخەوێت و چاودێریی ئەو دەرگایەی لە ئەستۆدایە و، دراوسێ و هاوڕێکانیش بە باشی ئاگادارن کە هەر لە بانگی عیشاوە هەتا ڕۆژ دەبێتەوە بواری سەرلێدانی هیچ کەسێك نادەم!

بێ گومان ئەو کەسەی کە ئەم تۆمەتە هەڵدەبەستێت مرۆڤێکی هەرزە و نەفامە و، ئەگەر یەکێك نەك هەر بێت بە کەر بەڵکو بیشبێت بە شەیتان هێشتا گریمانی وای بە ئەندێشەدا نایەت.

جا ئەو کەسە بوختان هەڵبەستە، دوای ئەوەی هەستی بە هەڵەکەی خۆی کرد، وازی لەم چەشنە فرۆفێڵانە هێنا و، ئەم شوێنەی بەجێ هێشت و ملی شکاند، بێ ئەوەی بگەڕێتەوە.

* * *

(ئەرکەکانی حەزرەتی مەهدی)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

یەکێك لەو قوتابیانەی نوور کە شان و شکۆ و بەرەکەتی هەیە – بە ناوی زۆر کەسەوە – ئەم پرسیارەی ئاراستە کردم:

بەشێك لەو قوتابیانەی نوور کە شوێنیان دیارە و دارای ئیخلاسن، پێیان وایە و سووریشن لەسەر ئەم بۆچوونەیان کە تۆ ئەو ڕابەرە هەرە مەزنەی ئالی بەیتیت کە لە ئاخر زەماندا دێت و، هەرچەندە خۆت لەمە بپارێزیت ئەوان زیاتر لەسەر بۆچوونەکەیان سوور دەبن.. تۆش لە لایەنی خۆتەوە لەسەر نەویستنی بیر و

بۆچوونەکەی ئەوان سوور دەبیت و بە زۆری خۆتی لێ دەپارێزیت. بێ گومان ئەو برایانە حەقیقەتێکیان پێیە و بەڵگەیەکی بێ گومانیشیان بۆ ئەم بۆچوونەیان بەدەستەوەیە! ئێوەش بە هەمان جۆر لە وەرنەگرتنی بۆچوونەکەی ئەواندا پاڵتان بە ڕاستی و حیکمەتێکەوە داوە. دیارە ئەم دوو هەڵوێستەش پێچەوانەی یەکترن.. بۆیە داوای ڕوونکردنەوەی ئەم دوو دژە هەڵوێستە لە بەڕێزتان دەکەین.

لە وەڵامی پرسیارەکەی ئەم برا بەڕێزەدا، کە گەلێ مەسەلەی لەخۆ گرتووە، دەڵێم:

ئەو قوتابیە خەواصانەی نوور بەڵگەیەکیان بەدەستەوەیە، بەڵام لە دوو ڕووەوە پێویستی بە تەعبیر و لێکدانەوە هەیە:

ڕووی یەکەم:

چەندین جار لە پەیامەکانمدا ئاماژەم بەوە داوە کە حەزرەتی "مەهدی" نوێنەری کەسی مەعنەویی کۆمەڵی مەزنی ئالی محەممەدە ﷺ و، سێ کارمەندیی لە ئەستۆدایە. ئێمە لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدەوارین کە کۆمەڵەکەی حەزرەتی مەهدی و دەستەی سەییدە بەڕێزەکان، ئەو ئەرك و کارمەندییانە جێبەجێ بکەن، ئەگەر کتوپڕ قیامەت بەرپا نەبێت و گرۆی مرۆڤیش بە تەواوەتی ڕێی لێ ون نەبێت.

سێ کارمەندییەکەشی بریتین لەمانەی خوارەوە:

❖ کارمەندیی یەکەم:

"ڕزگارکردنی ئیمان"ە. ئەمەش بە پووچەڵ کردنەوەی فەلسەفە و بیری ماددی دەبێت لە پێش هەموو شتێکدا. چونکە بە وێنەی بڵاوبوونەوەی تاعوون بیری ماددی و سروشتییەکان لەناو گرۆی مرۆڤدا پەرەی سەندووە و زانست و فەلسەفەی ماددیش بەسەر بیر و زەینەکاندا زاڵ بووە.

جا پاراستنی ئیمانداران لە شەڕ و زیانەکانی "گومڕایی" پێویستی بە چەند لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی زانستی و باس و توێژینەوەی بەردەوام و یەك لە دوای یەك هەیە کە ئەمەش داخوازی لێبڕانێکی یەکجاری و دەستبەرداربوونی تەواوەتییە لە

ئەرك و خەم و خەفەتەکانی دنیا. خۆ کات و بارودۆخەکانیش بواری ئەوە نادەن کە خودی حەزرەتی مەهدی بۆ خۆی ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات! چونکە کاروباری حوکمڕانیی خەلافەتی ئیسلامی هێندە کاتی بۆ ناهێڵنەوە کە بەو ئەرکەوە خەریك ببێت. کەواتە دەبێ پێش خۆی دەستە و تاقمێك لە شوێنێکدا ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنن و، کاتێ کە حەزرەتی مەهدیش دێت نووسراوەکانی ئەوان دەکات بە بەرنامەیەکی ئامادەکراوی خۆی و، بەم جۆرە و بە شێوەیەکی تەواوەتی ئەم ئەرکە ڕادەپەڕێنێت!

هێزی پاڵپشت و سوپای مەعنەویی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە قوتابیانێکن کە بە تەواوەتی سیفەتەکانی ئیخلاس و وەفا و پشتگیری و پەیوەندییان لە نێواندایە. جا ئەو قوتابیانە هەرچەندە بە ژمارەش کەم بن، بەڵام لە ناوەرۆکدا هێز و گرنگیی سوپایەکیان هەیە.

❖ کارمەندیی دووهەم:

بریتییە لە زیندوو کردنەوەی شەعائیرەکانی ئیسلام لە کۆمەڵدا بە ناوی خەلافەتی محەممەدی و، ڕزگار کردنی گرۆی مرۆڤ لە کارەساتە لەناودەرە ماددی و مەعنەوییەکان و لە غەزەبی خوای گەورە. ئەم کارەش بەوە ئەنجام دەدرێت کە پشت بە "یەکبوونی جیهانی ئیسلامی" بەسترێت.

ئەم کارمەندییە بە چەند کارگوزارێك بەڕێوە دەچێت کە چەند سوپایەکی وەها پێك‌بهێنن ژمارەیان بە ملیۆنەها بێت.

❖ کارمەندیی سێهەم:

حەزرەتی مەهدی بۆ پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلام و جێبەجێ کردنی حوکمەکانی قورئان تێدەکۆشێت، دوای ئەوەی کە لە ئەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕانەی ڕۆژگار هێنایانە کایەوە، جێبەجێ کردنی زۆر فەرمانی قورئان و یاسای شەرعی تا ڕادەیەك لەکار خران.

جا بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرنگەی سەرشانی، پشتگیرییەکی مەعنەوی لە لایەن هەموو ئیمانداران و یەکێتیی ئیسلامییەوە بەدەست دەهێنێت و، زانایان و

ئەولیاکان بە تایبەت ملیۆنەها پاڵەوانی گیانفیدای ئالی بەیت کە بە زۆری و هێزەوە لە هەموو سەردەمێکدا هەن، شوێنی دەکەون و، هەر هەموویان لە پێناوی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە هەرە مەزنەدا پشتی دەگرن.

جا مادەم حەقیقەتی ئەم کارە بەم جۆرەیە! ئەوا ڕزگار کردنی ئیمان و ڕێنمایی ڕاستەقینەی خەڵکی - بەگشتی - بۆ لای ئیمان، تەنانەت گۆڕینی ئیمانی تەقلیدیی خەڵکانی عەوام بۆ ئیمانی تەحقیقی، یەکەمین ئەرك و بەرزترین ڕێبازی "حەزرەتی مەهدی"یە، هەر ئەم ئەرکەشە کە لە واتا و ڕاستیدا ناوی "المهدي" دەخوازێت.

جا لەبەر ئەوەی "قوتابیانی نوور" ئەنجامدانی ئەم ئەرکە بە تەواوەتی لە "پەیامەکانی نوور"دا دەبینن! ئەوا دوو کارمەندیەکەی تر لە چاو ئەم کارمەندیەدا بەلایانەوە دێنە پلەی دووهەم و سێهەم. هەر لەبەر ئەوەشە کە وەك جۆرە مەهدیەك دەڕواننە کەسی مەعنەویی پەیامەکانی نوور و، لەمەشدا حەقیان پێکاوە!

ئنجا لەبەر ئەوەی پێیان وایە کە ئەم لاوازەی دانەری پەیامەکانی نوور نوێنەری ئەو کەسایەتیە مەعنەویە بێت - کە لە پشتگیری و هاوپەیوەندیی قوتابیانی نوور پێکهاتووە - ئەوا هەندێ جار ئەو ناوە بۆ ئەویش بەکار دەهێنن.

خۆ هەرچەند ئەم کارە لێ تێکچوون و سەهوێکە ئەوان تێی کەوتوون، بەڵام بەرپرس نین لێی! چونکە هەر لە دێر زەمانەوە زیادەڕەوی لە گومان باشیدا بووە و ڕەخنەی لێ نەگیراوە. منیش لە لایەنی خۆمەوە، بە ڕوانینی دوعا و ئاواتەخوازی و نیشانەی کەمالی بیروباوەڕی قوتابیانی نوور، دەڕوانمە گومان باشیە لەڕادەبەدەرەکەیان و، زۆر ڕەخنەیان لێ ناگرم!

بەم لێکۆڵینەوانەی پێشوو، تەئویلی بینینی هەندێ لە ئەولیایانی پێشین دەردەکەوێت کە لە کەشفەکانیاندا پەیامەکانی نووریان بە مەهدیی ئاخر زەمان بینیوە!

واتە ئاڵۆزی لە دوو خاڵدا هەیە و پێویستیان بە لێکدانەوەیە:

یەکەمیان: دوو کارمەندییەکەی دوای ئەمە (واتە دووهەم و سێهەم) هەرچەند لە گۆشەی ڕوانینی حەقیقەتەوە هێندەی کارمەندیی یەکەم گرنگ نین! بەڵام دامەزراندنی حوکمی ئیسلامی لەسەر زەویدا بە سوپاکانی خەلافەتی محەممەدی و یەکێتیی ئیسلامی، لە بەرچاوی خەڵکیدا هەزار جار لە کارمەندیی یەکەم فراوانترە، بە تایبەت لای عەوامەکان و ئەهلی سیاسەت، بە تایبەتتر بەلای بیر و بۆچوونەکانی ئەم چەرخەوە. بە ڕادەیەك کە هەر ئەوەندەی ناوی "مەهدی" لە کەسێك نرا، یەکسەر ئەم دوو کارمەندییە بە زەیندا دێن، نەك یەکەم! کە ئەمەش وا لەم ناوە دەکات کە ئاماژە بێت بۆ واتایەکی سیاسی و، دوور نییە واتای "لەخۆ ڕازی بوون" بە زەیندا بهێنێت و، حەز و ئارەزووەکانی بەدەستهێنانی ناوبانگ و چاوگێڕان بۆ پلەوپایە بەرزەکان، سەر هەڵبدەن!

ئنجا هەر لە دێر زەمانەوە و تا ئێستاش زۆر کەسی ساویلکە و ئەوانەش کە بە دوای پلەوپایە بەرزەکاندا دەگەڕێن، لافی ئەوەیان لێ داوە کە دەبن بە "مەهدی"!

خۆ هەرچەند گەلێ نوێکار و ڕابەر لەوانەی کە خەڵکی بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی دەکەن، هاتوون و لەمەولاش دێن، بەڵام هیچ کامیان خۆی بەو حەزرەتی مەهدییە گەورەیە دانانێت کە لە ئاخر زەماندا دێت، چونکە ئەو کەسە هەر تەنها یەکێك لەو سێ ئەرکەی لە شوێنێکدا پێ ئەنجام دەدرێت!!

پاشان خەبیرەکان لە دادگای "دەنیزلی"دا، بەپێی باوەڕی هەندێکیان، سەبارەت بە قوتابیانی نوورەوە وتیان:

گەر سەعیدی نوورسی خۆی بە "مەهدی" لە قەڵەم بدات، ئەوا هەموو قوتابییەکانی بە سنگێکی فراوانەوە قسەکەی دەسەلمێنن!

منیش لە دادگادا پێم وتن:

من ناتوانم خۆم لە ئالی بەیت دابنێم، چونکە نەسەبەکان لەم سەردەمەدا بە جۆرێکی وا تێکەڵی یەکتر بوون کە ناتوانرێت لەیەك جیا بکرێنەوە، لە کاتێکدا کە مەهدیی ئاخر زەمان لە ئالی بەیت دەبێت.

خۆ هەرچەند لەو ڕووەوە كە من وەكو كوڕێكی مەعنەویی حەزرەتی عەلیم - خوا لێی ڕازی بێت - و، وانەی حەقیقەتم لەلا خوێندووە و، یەكێك لە واتاكانی "ئالی محەممەد ﷺ" قوتابی‌یە ڕاستەقینەكانی نوور دەگرێتەوە و، دەگونجێ لەم ڕووەوە لە ئالی بەیت دابنرێم.. بەڵام ئەم زەمان و ڕۆژگارە هی كەسی مەعنەوی‌یە و، ڕێبازی پەیامی نووریش بە هیچ جۆرێك بوار بە حەزی خۆویستی و خۆدەرخستن نادات و، بە دوای پلەوپایەدا ناگەڕێت و، جێی بەدەستهێنانی شەرەفمەندی و ناوبانگی تێدا نابێتەوە. چونكە هەموو ئەمانە بە تەواوی دژی نهێنیی ئیخلاسن.

كەواتە شوكر و سوپاسی بێ سنوور پێشكەش بە پەروەردگاری شكۆمەندم لەسەر ئەوەی كە وای لێ كردووم لە خۆم ڕازی نەبم. بۆیە هەرگیز ئاوڕ لەم چەشنە پلەوپایە كەسی‌یانە نادەمەوە، كە زۆر لە سەرووی توانا و پلەی خۆمەوەن. تەنانەت گەر چەندین پلەی بەرزی سەر بە قیامەتیشم بدرێتێ، هەر هێشتا خۆم بە ناچار دەزانم كە واز لە هەموویان بهێنم، تاكو ئەو ئیخلاسە زامدار نەكەم كە لە ڕێبازی پەیامەكانی نووردا هەیە.

ئاوام بە خەبیرەكانی دادگا وت و، ئەوانیش بێ دەنگ بوون.

* * *

(بۆچی وازم لە سیاسەت هێنا)؟

برای ئازیز و بەوەفام كاك ڕەئفەت!

یەكەم:

بە بۆنەی چەند ڕووداوێكی جوزئی‌یەوە، كە هەموومان پێكەوە دەگرنەوە، بە توندی ئەوەم بە دڵدا هێنرا كە ئەم ڕاستی‌یەی خوارەوەتان بۆ ڕوون بكەمەوە:

بێ گومان قوتابی‌یەكی نووری تایبەتیی وەك ئێوە دەزانن كە پەیامەكانی نوور هەرگیزاو هەرگیز نابن بە ئامرازی دەستی هیچ شتێك و، جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێكی تریان پێ ناهێنرێتە دی و، ڕاستەوخۆ و پێش هەموو

شتێك بۆ ڕوونكردنەوەی ڕاستی‌یەكانی ئیمان تێدەكۆشن، تاكو ئیمانی كەسانی لاواز و خاوەن شك و گومان ڕزگار بكەن.

دووهەم:

گەورەترین هێزی پەیامەكانی نوور لە بەرامبەر نەیارە زۆرەكانیانەوە: "ئیخلاس"ە. جا هەروەك پەیامەكان هەرگیز نابن بە داردەست و ئامرازی هیچ شتێكی دنیا، بە هەمان جۆر بایەخ بەو تەوژمانەی دنیاش نادەن كە لەسەر بناغەی هەستی لایەنگرتن و پشتگیریی لایەنەكان بە تایبەت تەوژمە سیاسی‌یەكان، بنیات نرابن. چونكە دەماری لایەنگرتن "ئیخلاس" دەشێوێنێت و، ڕەنگی حەقیقەتیش دەگۆڕێت..

تەنانەت هۆی وازهێنانم لە سیاسەت - سی ساڵ پێش ئێستا - ئەوەبوو كە زانایەكی پیاوچاك بە گەرمی ستایشی مونافیقێكی كرد كە خاوەنی بیرێكی گونجاو بوو لەگەڵ بیرە سیاسی‌یەكەی ئەمدا و، لە هەمان كاتیشدا ڕەخنەیەكی هێندە توندوتیژی لە زانایەكی پیاوچاك گرت كە بیرەكانی پێچەوانەی بیری ئەم بوون تا ئەو ڕادەیەی كە بە "فاسق" ناوی دەبردا!

بەو واتایەی كە دەماری "مونافەسە" ئەگەر لایەنگیریی سیاسیشی تێكەڵ ببێت، ئەوا گەلێ هەڵەی سەرسوورهێنی وەك ئەمەی لێ دەبێتەوە. بۆیە وتم: "أعوذ بالله من الشيطان والسياسة" و، لەو كاتەوە وازم لە سیاسەت هێنا!

لە ئەنجامی ئەو حاڵەتەوە كە ئێوە باش شارەزا و ئاگادارن لێی وا بیست ساڵە تەنها یەك ڕۆژنامەشم نەخوێندووەتەوە و، بە درێژایی دە ساڵیش بایەخم بە ڕووداوەكانی جەنگ نەدا و گوێم بۆ ڕانەگرت و، بە دوای هەواڵیشیدا نەگەڕام، تەنانەت هەر هەوڵی ئەوەشم نەدا كە شتێكی لە بارەوە بزانم. هەروەها بە درێژایی بیست و دوو ساڵی ڕەبەقی ئەشكەنجە و دیلی توخنی لایەنگرتنی هیچ لایەنێك نەكەوتووم و نەڕۆشتوومەتە ناو سیاسەتەوە، تاكو زیان بەو ئیخلاسە نەگات كە لە پەیامەكانی نووردایە. ئەوەبوو، مەگەر بۆ ڕوونكردنەوەی بەرگری‌یەكانم لە بەردەم

دادگادا، دەنا هەرگیز بۆ حەوانەوەی خۆم سەردانی فەرمانگەکانی دەوڵەتم نەکردووە.

سێهەم:

دەزانن من سەدەقە و یارمەتی وەرناگرم و، نام بەهۆی ئەو چەشنە یارمەتییانەش. لەبەر ئەوە، بەرگ و پۆشاکی تایبەتی و شمەکە پێویستەکانی خۆم دەفرۆشم، تاکو بە پارەکەیان ئەو کتێبانەم لە براکانم بکڕمەوە کە ئەوان نووسیویاننەتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی نەیەڵم سوود و بەرژەوەندییەکانی دنیا تێکەڵ بە "پەیامەکانی نوور" بن، تاکو زیان بەو پەیامانە نەگات و برایانی تریش پەند لەمە وەربگرن و، ئەوانیش پەیامەکان نەکەن بە "هۆکار" بۆ هیچ شتێك.

چوارەم:

"پەیامەکانی نوور" سەروزیادی قوتابیانی ڕاستەقینەی نوورن! دەبا پێی ڕازی بن و لێی دڵنیا بن.. با کەسیان ئاوڕ بە لای پلەوپایەی بەرزی تردا نەداتەوە و، بە دوای هیچ سوود و بەرژەوەندییەکی مەعنەوی و مادیدا نەگەڕێن.

* * *

(لە بارەی مستەفا کەمالەوە)

(پاشکۆی ئەو عەرزوحاڵەی کە درا بە
سەرۆك کۆمار، ناچار بووم بینووسم)

هۆکاری بنەڕەتیی هێرشی داخ لە دڵان لە دژی من ئەوەیە کە بە بیانووی خۆشەویستی و پشتگیرییان بۆ مستەفا کەمال دەمهاڕن و ئازارم دەدەن!

وا منیش بەو ڕقاوی و داخ لە دڵانە دەڵێم:

من لە بارەی کەسێکەوە کە مرد و کۆتایی پێ هات و پەیوەندیی بە حکوومەتەوە نەما، وتوومە: لە ئاخر زەماندا کەسێك پەیدا دەبێت زیان بە قورئانی

پیرۆز دەگەیەنێت! ئەمەشم سی ساڵ پێش پەیدا بوونی وت و، کاتی خۆی لە فەرموودەیەکی پیرۆزەوە وەرمگرتبوو. پاشان ڕۆژگار دەری خست کە ئەو کەسە: "مستەفا کەمال"ە!!

جا ئەو ڕق لە دڵانەی کە لایەن و پشتی مستەفا کەمال دەگرن، وا ماوەی بیست ساڵە، بە چەند بروبیانوویەکی پڕوپووچ، ئەشکەنجە و ئازارم دەدەن، چونکە من ناچم کارێکی پێچەوانەی ڕاستی بکەم و هەموو سەربەرزی و شانازی و سەرکەوتنەکانی ئەو سوپایەی پێنج سەد ساڵە بە قارەمانێتی و خۆبەختکاری‌یەوە لە پێناوی حەقدا تەحەددای جیهانی کردووە، بدەمە پاڵ مستەفا کەمال!

بەڵێ، وەك لە دادگادا چەسپاندم:

هەموو شانازی و دەسکەوت و کردارە چاکە ماددی و مەعنەوی‌یەکان دەبێ بدرێنە پاڵ کۆمەڵ و بەسەر ئەواندا دابەش بکرێن، بەڵام تاوان و گوناهەکان و هەڵسوکەوتە هەڵەکان دەبێ بدرێنە پاڵ سەرۆکەکەیان.

جا لەبەر ڕووناکیی ئەم دەستوورە ڕاستەقینەیەدا دەڵێم: ئەو شەرەف و شانازی‌یانەی کە سوپا لە ڕێی سەرکەوتنەکانی خۆیەوە بەدەستی هێنان، بە تایبەت هی ئەفسەرە قارەمانەکان کە سەرکردایەتیی سوپایان لە ئەستۆدا بوو، نابێ بە هی مستەفا کەمال دابنرێن، بەڵکو تەنها هەڵە و ناتەواوی و گوناهەکانی دەدرێنە پاڵ!

جا ئەو کەسانەی کە بە خۆش نەویستنی مستەفا کەمال تۆمەتبارم دەکەن، لە ڕاستیدا سووکایەتی بە شان و شەرەف و کەرامەتی سوپا دەکەن. بۆیە من بە خیانەتکارانی نەتەوەیان دادەنێم و بەو چاوە بۆ ئەو سەرسەختە لایەنگرانەی مستەفا کەمال دەڕوانم و، ئامادەشم ئەم ڕاستی‌یەیان پێ بسەلمێنم، وەك لە بەردەم دادگادا چەسپاندم:

(من ملیۆنەها سەرباز و ئەفسەری سوپای کۆڵنەدەری ئەم نەتەوە خاوێنەم خۆش دەوێت و، هەتا بتوانم بۆ پاراستنی عیززەت و کەرامەت و ڕێزیان تێدەکۆشم. کەچی ناحەزە ڕق لە دڵەکانم کە بەرامبەرم ڕاوەستاون، لە ناوەرۆکدا سووکایەتی

بە شان و شکۆی ملیۆنەها کەسی ئەم سوپایە دەردەبڕن و لە پێناوی خۆشویستنی تەنها یەك کەسدا دوژمنایەتی‌یان دەکەن).

بەڵێ، بە چەند نیشانەیەکی زۆر بۆمان دەرکەوتووە کە: تەنها لەبەر ئەوەی "مستەفا کەمال"م خۆش ناوێت و نەیاری بووم، ئەو ڕق لە دڵانە هێرشم دەکەنە سەر و، هۆکارەکانی تر هەموویان بڕوبیانووی پڕوپووچ و دەست هەڵبەستن. بۆیە ناچار بووم کە بەو نەیارانەم بڵێم:

مستەفا کەمال خۆی بانگی کردم بۆ ئەنقەرە تاکو ڕێزم لێ بگرێت و بمکات بە واعیزی گشتیی هەموو کوردستان (پارێزگاکانی خۆرهەڵات). منیش ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە، بەڵام ئەم سێ ماددانەی خوارەوە هانیان دام واز لە خۆشویستنی بهێنم و، لە ئەنجامی ئەم وازهێنانەشدا بیست ساڵی ڕەبەقم بە ئازاری ژیانی گۆشەگیری و پڕ لە ئەشکەنجە و ئازار بردە سەر و، توخنی کاروبارە دنیاییەکانی ئەوان نەکەوتم:

*ماددەی یەکەم:*

بە کردار و ڕەفتارەکانی خۆی دەری خست کە (مستەفا کەمال) ئەو کەسەیە فەرموودەی پیرۆز ڕایگەیاندووە: لە ئاخر زەماندا کەسێك پەیدا دەبێت هەوڵی زیان گەیاندن بە داب و نەریتە ئیسلامی‌یەکان دەدات! من سی و شەش ساڵ پێشتر ئەو فەرموودە پیرۆزەم لێکدابووەوە. پاشان بە تەواوی واتاکەی لەم کەسەدا هاتە دی! ئەمەشم لە ماددەی سێ‌هەمی بەرگرییەکانم لە بەردەم دادگادا، ڕوون کردووەتەوە.

*ماددەی دووهەم:*

"بوون" و "بینا" و "ژیان"ی هەرشتێك بەندە بە بوونی هەموو پایە و هەل و مەرجەکانی ئەو شتەوە. بەڵام "نەبوون" و "ڕووخان" و "مردن"ەکەی بە تێکچوون یان نەهاتنەدیی تەنها یەك مەرج ڕوو دەدات. ئەمەش دەستوورێکی هێندە ڕاستەقینەیە کە لەسەر زمانی خەڵکیدا ئەم قسەیە وەك پەندی لێ هاتووە و دەڵێن:

"وێرانکاری لە ئاوەدانکردنەوە ئاسانترە"!

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە بەهێز و توندوتۆڵە:

هەرچی ناتەواوی و عەیبە و کاولکاریی ڕواڵەتی و سامناك ڕوویان داوە، هەموویان هی هەڵەکانی ئەو سەرکردەیەن! بەڵام سەرکەوتنە درەخشانەکان هی قارەمانێتیی سوپان.

جا لە کاتێکدا کە دەبوو سەرجەمی خراپکاریيەکانی بدرێنە پاڵ و، کردارە چاکەکانیش بە هی سوپا دابنرێن، کەچی ئەم پێویستیيە بە تەواوی پێچەوانە کراوەتەوە، ئەوەتا کردارە چاکەکانی کۆمەڵ دەدرێنە پاڵ ئەو کەسەی کە خراوەتە پێشەوە و، خراپەکانی ئەویش دەدرێنە پاڵ کۆمەڵ! دیارە ئەمەش ستەمێکی چەپەڵ و ئابڕووبەرە.

*ماددەی سێهەم:*

گێڕانەوەی چاکەکاریيەکانی کۆمەڵ و سەرکەوتنەکانی سوپا بۆ سەرکردەی فەرماندە، هەروەها گێڕانەوەی گوناهەکانی ئەو فەرماندەیەش بۆ هەموو کۆمەڵ، ئەوە دەگەیەنێت کە سووکایەتی بە شان و شکۆی هەزاران کردەوەی چاك بکرێت و بهێنرێنە ئاستی یەك دانە کردەوەی چاك و، لە هەمان کاتدا یەك کرداری خراپیش بکرێت بە هەزاران هەڵە و کردەوەی خراپ..

چونکە هەروەك ئەگەر تیپێکی سوپا دوژمنێکی سەرسەخت بکوژن، ئەوا هەموو یەکێکی سەربازەکانی ئەو تیپە پلەی موجاهیدیان دەدرێتێ، بەڵام گەر ئەم پلەیە تەنها بە فەرماندەکەیان بدرێت، ئەوا هەزار پلەی موجاهید دادەبەزێنرێنە تەنها یەك دانە پلە..

هەروەها گەر لە ئەنجامی هەڵەیەکی فەرماندەی ئەو تیپەوە تاوانێکی قەتڵ ڕوو بدات و پاشان ئەم تاوانە بخرێتە ئەستۆی هەموو یەکێکی ئەو تیپەوە، ئەوا یەك دانە تاوانەکە زیاد دەکات و لە حوکمی هەزار تاواندا دەبێت. چونکە ئەو کاتە - بۆ نموونە - هەزار سەرباز لەو تاوانە بەرپرس دەبن و شایانی ئەوە دەبن کە سزا بدرێن لەسەری!

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، ئەم مەسەلەیەش بە هەمان جۆرە. چونكـە هەڵـە گەورەكان زۆر ئاشكرا و لـە بـەرچاون. جا ئەگـەر نەخرێنـە ئەسـتۆی ئـەو پیـاوە مردووەی كە هەر خۆی ئەنجامی داون و، بدرێنە پاڵ ئەو سوپا مەزنە بەڕێزەی كە لـە پێش چاوی هەموو جیهاندا جیهـادی لە پێناوی هێنانەدیی حـەقدا دەرخست و، بـە خوێن و شمشێرەكانیشی شایەتیی سـەربەرزی و بڵنـد ڕاگرتنـی ئـاڵای قورئـانی لـە ماوەی پێنج سەد بەڵكو هەزار ساڵدا سەلماند، ئەوا ئـەو گوناهانـە دەبن بـە هـەزاران گوناهـ و بـە ئـەندازەی ژمـارەی ئەركانـەكانی ئـەو سـوپایە زیـاد دەكـەن و، بەمـەش ڕابوردووی بـەرز و مایـەی شـانازیی ئـەو سـوپایە بـە شـێوەیەكی سـامناك چەپـەڵ دەبێـت و دەشـێوێت و، مێژووەكەشی بە ڕادەیـەك ڕەش دەبێـت كـە سـوپای ئـەم چەرخە بەرپرس و شـەرمەزار دەكـات لـە بـەردەم سوپا پاڵەوانـەكانی چەرخـەكانی پێشوودا..

هەروەها گـەر سـەركەوتنە درەخشـانەكانی سـوپا و شـانازی و دەسـكەوتەكانی ئێستای بدرێنـە پـاڵ تەنـها یـەك دانـە كـەس، ئـەوا دەبن بـە شتێكی جوزئـی و، ئـەو كـردەوە چـاك و جیهادانـەش كـە هێنـدەی ژمـارەی ئـەركان و سـەربازەكانی سـوپا دەبن، دێنە خوار و دەچنە حوكمی چاكەی یەك دانە كەسەوە. دیـارە لـەو كاتەشـدا ئەو ڕووناكی‌یە درەخشانە دەكوژێتەوە و نابێت بە كەفارەتی تاوان و گوناهەكان.

لەبەر ئەم هۆكارانەیە كە وازم لـە خۆشویستنی ئـەو پیـاوە هێنـا و، خۆشویستنی ئـەو سـوپایەم دەسـكەوت كـە بـە كـردەوە و بـە جۆرێكـی كاریگـەر و لــە كـاتێكی ناسكی سەختەتدا لە ڕیزەكانیدا خزمەتم كردووە. هەروەك بە پەیامـەكانی نووریـش هەوڵی پارێزگاریی شەرەفی ئەو سوپایەم داوە كە هەزار جار لە هـەر تاكـە كەسێك بەرز و بڵندترە!!

سەعیدی نوورسی

لە ئەمیرداغ

(بڕوانامەیەك)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

پیرۆزبایی جەژنتان لێ دەکەم.. ئەوەشتان دەخەمەوە یاد کە زووتر پێم ڕاگەیاندبوون، کە لە ڕێی پشت بەستنم بە خاتیرەیەکی مەعنەوی هەریەکەتانم - بەپێی پلەی خۆی - بە "سەعید"ێك و میراتگرێکی خۆم و پارێزگارێکی پەیامەکانی نوور لە بریی خۆم ، قبووڵ کردووە. وا ئێستا جگە لەوە، ئەمەشتان بۆ ڕوون دەکەمەوە کە:

مادەم ئێوە لە زانستەکانی ئیمان و خزمەتی قورئاندا و لەسەر بناغەی گومان باشی‌یە لەڕادەبەدەرەکەتان پلەیەکی ئەوتۆی مامۆستاییتان بە من بەخشیوە کە زۆر لە سەرووی توانا و سنووری خۆمەوەیە، ئەوا بە وێنەی مامۆستایانی پێشین کە بڕوانامەی زانستی‌یان بە قوتابی‌یە شایستەکانی خۆیان دەبەخشی، منیش بڕوانامە بە هەموو یەکێکی ئێوە دەبەخشم و، بە ویژدان و ڕۆحی خۆم و هەموو متمانەیەکم، پیرۆزباییتان لێ دەکەم.

بە ڕاستی ئێوە تا ئێستا لە پێناوی "بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور"دا هاودەم لەگەڵ پابەندبوونتان بە "وەفا و ئیخلاسی تەواوەتی" هەوڵێکی لە توانا بەدەرتان داوە و، لەمەولاش بە جوانترین و درەخشانترین شێوە هەر لەسەری بەردەوام دەبن و، پشت بە خوا دەبن بە هەزاران "سەعید"ی بەتوانای بەهێز و گەرموگوڕ لە ئەرکی سەرشانتاندا، لە بریی ئەم سەعیدە دەستەوسانە لاوازە خانەنشینە.

سەعیدی نوورسی

ئەو نامانەی کە دوای بەندیخانەی ئافیون لە "ئەمیرداغ" نووسران

باسمه سبحانه

(بۆ سەرۆکی کاروباری ئایینی)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

با یەکێکتان لە بریی من بڕوات بۆ سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی و، ڕێز و سڵاوم ئاراستەی بەڕێز "ئەحمەد حەمدی"ی سەرۆك بکات و، ئەمەی خوارەوەشی پێ ڕابگەیەنێت:

جەنابتان دوو ساڵ پێش ئێستا داوای کۆمەڵێکی تەواوەتیی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"تان کردبوو، منیش هەر ئەو کاتە بۆم ئامادە کردن. بەڵام کتوپڕ خستینیانە بەندیخانەوە و، ئیتر بوارم بۆ نەڕەخسا کە بەو کۆمەڵە پەیامەدا بڕۆمەوە و هەڵەگیرییان تێدا ئەنجام بدەم، بۆیە نەمتوانی بۆ بەڕێزتانی بنێرم. وا ئێستا سەرقاڵی ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوەی ئەو کۆمەڵە پەیامەم، بەڵام وا دیارە لەبەر تێکچوونی باری تەندروستیم لە ئەنجامی ژەهر پێدانمەوە نەتوانم بەم خێراییە تەواوی بکەم. پشت بە خوا هەر کە لە هەڵەگیری و پێداچوونەوەی بوومەوە، دەینێرم بۆ بەڕێزتان.

جا لەبەر ئەوەی هەرکەسێك دیاری وەرنەگرێت دیاریش نادات، ئەوا نرخی ئەم تەفسیرە مەعنەوییە بەهادارە نرخێکی بەرزی مەعنەوی دەبێت! ئەویش هەوڵدانی بەڕێزتانە بۆ بەدەستهێنانی سەربەستیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور، بە سیفەتی ئەوەی کە بەڕێزتان سەرۆکی زانایانی ئەم وڵاتە ئیسلامییەن. هەروەها سێ جزمی موصحەفی پیرۆزیشی لەگەڵدا دەنێرین کە زووتر پیشانمان داون، تکامان وایە هیممەت و تێکۆشانتان بۆ لەچاپدانی بخەنە کار.

بە ڕوونی بۆ خودی ئێوەی بەڕێزی ئاشکرا دەکەم کە:

تا ئێستا لە مێژوودا هیچ دەستدرێژییەکی غەددارانە و ئاشکرا بەرامبەر زانستی حەقیقەت و ڕاستییەکانی ئیمان ڕووی نەداوە، بە وێنەی ئەوەی کە لەم کێشەیەی

ئێمەدا ڕوو دەدات. لەبەر ئەوە، دیوانی زانستی و پلەوپایەی سەرۆکایەتیی بەڕێزتان - پێش هەموو شتێك - داخوازی جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە ئایینی و زانستی‌یەیە.

لە دەمی ژەهر پێدانی دواییمدا بیرم لە ئەجەلی خۆم کردەوە و، دڵی خۆم بەوە دایەوە کە: دوای من "ئەحمەد حەمدی" پەیامەکانی نوور لە بریی من دەگرێتە ئەستۆی خۆی.

هەروەها نوسخەیەکی تەواوی بەرگری‌یەکانی بەردەم دادگاشم دەنێرم بۆتان کە عەینی حەقیقەتە و پێشتر چەند بەشێکمان لێ ناردوون بۆ دیوانی بەڕێزتان، بەو هیوایەی کە وەك مەرجەعێك بە دەستی ئەو کەسەوە بێت کە لە ژێر سەرپەرشتیی ئێوەدا بۆ ئازادیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور تێدەکۆشێت.

* * *

(مژدەی بە چاپ گەیاندنی پەیامەکان)

"نامەکەی صونگورە لە ئەنقەرەوە بۆ مامۆستا"

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بۆ مامۆستای بەڕێز و ئازیز و بەشەفەقەت و پیرۆز و خۆشەویستم!

نامە ڕەنگینەکەتانم لەگەڵ کۆمەڵە پەیامێکدا بە دەستی مامۆستا "ئەحمەد حەمدی"ی سەرۆکی کاروباری ئایینی گەیاند و، ئەویش بە شادمانی‌یەکی لەڕادەبەدەرەوە خستنیە کتێبخانە تایبەتی‌یەکەی خۆیەوە و، وتی:

(پشت بە خوا ئەم کۆمەڵە پەیامە دەدەم بە برا تایبەتمەندەکانم تاکو بیانخوێننەوە و، هەوڵیش دەدەین، وردە وردە، لەسەر ئەم شێوەیە لە چاپیان بدەین).

هەروەها ئەی مامۆستای گەورە و خۆشەویستم! وتی: بەپێی ناوەڕۆکی نامەکەی بەڕێزتان بۆ ئەو مەبەستە تێدەکۆشم. چونکە چاپکردنی ئەم کۆمەڵە پەیامانە بە یەك جار و لە کاتی ئێستادا لە تواناداا نی‌یە. بەڵام دەیاندەم بە برا

تایبەتمەندەکانم تاکو بیانخوێننەوە و، بەپێی بایەخ پێدان و داواکاریی خەڵکیش پەخشیان دەکەین و، بە پشتیوانیی خوای گەورە بە جوانترین شێوە هەوڵی بڵاوکردنەوەیان دەدەین.

صونگور

* * *

(هەوڵی وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز)

ئەم سەرنجەی خوارەوە، لە پێشەکیی مەقامی دووهەمی مەکتووبی بیست و نۆهەم و، ڕاستەوخۆ لە دوای پرسیار و وەڵامەکەوە، بنووسرێت:

هۆی دانانی ئەم پەیامە، جۆرە بەرپەرچدانەوەیەکی ئەو پلانە سامناکەیە کە دەیەوێت تەرجەمەی قورئان لە بریی خودی قورئانی پیرۆز لە مزگەوتەکاندا بخوێنرێت. بەڵام چەند باس و درێژەپێدانێك هاتنە ناو پەیامەکەوە کە پەیوەندییان بە بابەتە سەرەکییەکەوە نییە.. لەگەڵ ئەوەشدا مەقامی یەکەمی مەکتووبی بیست و نۆهەمم هاتەوە یاد و، وتم: ئەو مەقامە گرنگ و پێویست و درەخشان و دەراسایە، ناتەواوی و ئیسرافەکانی ئەم مەقامی دووهەمە دەسڕێتەوە.

ئیتر بەوپەڕی دڵخۆشییەوە سوپاسی پەروەردگارم کرد و ئەو ناتەواوییانەم لە بیر چووەوە.

* * *

(نامەیەکی کەسی و تایبەت بۆ سەرۆکی کاروباری ئایینی)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ بەڕێز جەنابی ئەحمەد حەمدی!

وا لە خوارەوە ڕووداوێکی ڕۆحیتان بۆ باس دەکەم کە بەسەر خۆمدا هاتووە:

ماوەیەکی زۆری پێش ئێستا وازهێنان لە "عەزیمەت" و بیری شوێنکەوتنی "ڕوخسەتی شەرعی" لەسەر بناغەی زەروورەت، وەك ئەوەی جەنابتان و چەند زانایەکی تر لەگەڵتاندا گرتتانە بەر، لەگەڵ بیری مندا نەدەگونجا. بۆیە ڕقم لە ئێوە و لەوانیش هەڵدەسا و، تووڕە دەبووم لێتان و، دەموت: بۆچی واز لە "عەزیمەت" دەهێنن و شوێن "ڕوخسەت" دەکەون؟ هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ڕاستەوخۆ پەیامەکانی نوورم بۆ نەدەناردن.

بەڵام پێش نزیکەی چوار ساڵ، داخێکی زۆری پڕ لە ڕەخنەم هاتە دڵەوە و، یەکسەر ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە:

ئەو بەڕێزانە لە پێش هەموو شیانەوە جەنابی "ئەحمەد حەمدی" دۆست و هاوڕێی خوێندنی تۆن لە قوتابخانەی شەرعیدا و، توانییان ئەو مەترسییەی کە لەسەر ئیسلام بوو تا ڕادەی چواریەك کەم بکەنەوە. ئەوەبوو بەپێی توانا بەشێکی ئەرکە زانستییەکەیان لە بەردەم وێرانکارییە سامناك و توند و تیژەکان و لە پێناوی پاراستنی موقەددەساتدا بەخت کرد و، لەمەشدا شوێن دەستووری شەرعیی "اختيار أهون الشرين" کەوتن و، پشت بە خوا ئەم کارەیان دەبێت بە کەفارەتی هەندێ لەو قسوور و ناتەواوییانەیان کە بە ناچاری تووشی بوون.

ئیتر لەو کاتەوە بە چاوی برایەتیی ڕاستەقینەی جارانەوە دەڕوانمەوە ئێوە و زانایانی هاووێنەتان. چونکە ئێوە برایانی قوتابخانەی شەرعی و هاوڕێی خوێندنی منن.

جا لەبەر ئەوەی دوای ئەم ژەهرپێدانەی دواییم چاوەڕوانی مردنی خۆم بووم، ئەوا سێ ساڵ پێش ئێستا بڕیارم دا کۆمەڵە پەیامێکی تەواوەتیتان پێشکەش بکەم، بەو هیوایەی کە لە بریی من، ئێوە ببن بە خاوەنی ڕاستەقینە و پارێزگاری پەیامەکانی نوور. کەچی ئەو کۆمەڵە ئێستا ئامادە نییە و هەڵەگیریی تەواویشی تێدا ئەنجام نەدراوە. بەڵام نەختێ ڕاستکردنەوەم لە کۆمەڵە پەیامێکی تەواودا بە ئەنجام گەیاند، کە زۆربەی بەشەکانی پازدە ساڵ پێش ئێستا سێ قوتابیی پایەداری پەیامەکانی نوور نووسیویانەتەوە و، گەر بۆ جەنابتان نەبوایە ئەم کۆمەڵە پەیامە

بەنرخەم بە کەسی تر نەدەدا، چونکە نووسینەوەیان لە لایەن ئەو سێ کەسە ئازیزەوە نرخەکەی گەیاندووەتە ئاستی دە کۆمەڵە پەیامی تەواوەتی..

بەرامبەر بەمەش نرخی مەعنەویی ئەم کۆمەڵە پەیامە بریتی‌یە لە سێ شت:

یەکەم:

لەبەرگرتنەوەی سی دانە لە هەریەك لەو پەیامانە لەسەر ئامێری ڕۆنیۆ بە پیتە کۆنەکان - گەر بگونجێت - دەنا بە پیتە تازەکان و، پاشان دابەش کردنیان بەسەر لقەکانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی لە سەرتاسەری وڵاتدا، بە مەرجێك یەکێك لە برا تایبەتمەندەکانمان یارمەتیدەری هەڵەگیری و سەرپەرشتیکاری ئەم کارە بێت. چونکە بڵاوکردنەوەی ئەم چەشنە دانراوانە بەشێکە لە ئەرکی سەرشانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی.

دووهەم:

لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور موڵك و کەرەسەی قوتابخانەی شەرعین و، بەڕێزیشتان بناغە و سەرۆکی قوتابیانی ئەو قوتابخانە شەرعی‌یەن، ئەوا پەیامەکانی نوور موڵکی ڕاستەقینەی ئێوەیە. کەواتە ڕاتان لەسەر بڵاوکردنەوەی هەر پەیامێك بوو پەخشی بکەن و، دواخستنی هەر پەیامێکیشتان بە باش زانی بڵاوکردنەوەی دوا بخەن.

سێهەم:

با بە وێنەی فۆتۆگرافی ئەو موصحەفە پیرۆزە چاپ بکرێت کە تەوافوقەکانی لەمەڕ "لەفزی جەلالە" دەردەخات، تاکو بریسکەی ئیعجاز لەو تەوافوقانەدا ببینرێت. تکایە پێناسە تورکی‌یەکان، کە لەسەرەتای موصحەفە پیرۆزەکەدا لە بارەی تەوافوقەکانەوە نووسراون، لەگەڵ موصحەفەکەدا چاپ نەکرێن، بەڵکو باشتر وایە یان لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بە زمانی تورکی لە چاپ بدرێن، یان بە وەرگێڕانێکی ئەمین بکرێن بە عەرەبی.

* * *

(نهێنیی ئیخلاس و حەزەرکردن لەم تەمەنەدا)

برایانی ئازیز و بەوەفام! ئەوەم بە دڵدا هات کە هەندێ مەسەلەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە تایبەتن بە خودی خۆمەوە:

یەکەم:

نهێنیی ئیخلاس بە تەواوی ڕێی ئەوەم لێ دەگرێت کە پەیامەکانی نوور و خزمەتی ئیمان وەك ئامرازێك بەکاربهێنم بۆ دەسکەوتنی پلەوپایەی دنیا و تەنانەت مەقامەکانی ئەودنیاش بۆ خودی خۆم. هەروەك بە هیچ جۆرێك نامەوێت ئەو خزمەتە خاوێنە بکەم بە هۆکارێك بۆ حەوانەوەی تایبەتیی خۆم و بەسەربردنی ژیانی دنیام بە شادی و خۆشحاڵی. چونکە بەکارهێنانی کردەوە چاکەکانی سەربەدوارۆژ و بەروبوومە نەبڕاوەکانیان لە پێناوی بەدەستهێنانی چەند تام و لەزەتێکی جوزئیی ژیانێکی فانیدا، پێچەوانە و دژی نهێنیی ئیخلاسە. بۆیە بە دڵنیایی و بێ داگرتنەوە ئەمەی خوارەوەتان پێ ڕادەگەیەنم:

ئەگەر چەند خزمەتگوزارێك لەو جینننییە ڕۆحانییانەی کە گۆشەگیران و کەسانی دەست لەدنیا هەڵگرتوو خۆشحاڵ دەبن بە بینینیان، لە کاتی زامداریمدا ئامادە بن و باشترین دەرمانم بۆ بهێنن، هەر لەبەر هێنانەدیی "ئیخلاسی ڕاستەقینە" خۆم بە ناچار دەزانم کە لێیان وەرنەگرم! تەنانەت گەر بەشێك لەو ئەولیایانەی کە لە بەرزەخدان، بەرجەستە بن و باشترین جۆری شیرینیم پێ ببەخشن، ئەوا هاودەم لەگەڵ ماچ کردنی دەستەکانیاندا ئەو دیارییەیان لێ وەرناگرم! بۆ ئەوەی بەروبوومە باقییەکانی ئەودنیای هەمیشەیی لە دنیایەکی فانیدا نەخۆم و لەناویان نەدەم! لە ڕاستیدا "دەروون"یشم بە وێنەی "دڵ"م ڕەزامەندیی خۆی لەم وەرنەگرتنە دەربڕی!

بەڵام بە "ڕۆح"ی خۆم ئەو ڕێزلێنانە ڕەحمانییانە وەردەگرم کە وەك بەرەکەت وان و لە ڕووی چاودێریی خواوەندەوە بۆمان دێن، بێ ئەوەی مەبەستمان بوو بێتن و لە نیازماندا بووبن. بە مەرجێ دەروونی بەدخواز خۆی تیایاندا هەڵنەقورتێنێت. چونکە ئەو جۆرە ڕێزلێنانە ڕەحمانییانە نیشانەی پەسەندی و لێ ڕازی بوونی خزمەتەکەمانە.

بەهەرحاڵ ئەم ئەندازەیە بۆ ئەم مەسەلەیە سەروزیادە.

دووهەم:

لە یەکەم جەنگی جیهانیدا لەگەڵ شەهیدی خوالێخۆشبوو "مەلا حەبیب" لە بەرەی "پاسینلەر" پەلامار و هێرشمان بۆ سەر ڕووسەکان دەبرد و، تۆپخانەکەی ئەوانیش بەردەوام لە ماوەی هەموو یەك دوو خولەکێکدا سێ گوللە تۆپی تێ دەگرتین!

جارێکیان سێ دانە لەو گوللە تۆپانە بە بەرزایی دوو مەتر لە ئاستی سەرماندا تێپەڕین و یەکێکیان لە شێوەکەی پشتمانەوە تەقیەوە و سەربازەکانی ناو سەنگەرەکانیش کشانە دواوە. منیش - بۆ تاقیکردنەوە - بە مەلا حەبیبم وت:

- تۆ چی دەڵێیت مەلا حەبیب؟ من خۆم لە گوللە تۆپی ئەو کافرانە ناشارمەوە!

وتی:

- منیش وەك تۆ دەکەم و لێت دوا ناکەوم و جیا نابمەوە لێت.

لەم قسانەدا بووین کە گوللە تۆپی دووهەم لە نزیکمانەوە داکەوت. هاودەم لەگەڵ متمانەیەکی زۆردا بە پارێزگاریی خوای گەورە سەبارەت بە ئێمەوە، بە مەلا حەبیبم وت:

با بەرەو پێشەوە بڕۆین.. گوللە تۆپی کافران نامانکوژێت و.. هەرگیز ئێمەش دانابەزینە ئاستی هەڵهاتن و دواکەوتن!

هەمان شت لە جەنگەکەی "بەدلیس" و بەرەی پێشووی ئەو جەنگەشدا ڕووی دایەوە. چونکە سێ گوللەی ڕووسەکان بەر سێ شوێنی کوشندەی من کەوتن و یەکێکیشیان شەرواڵەکەی کون کردم و لە نێوان هەردوو پێمەوە دەرچوو. من لەو کات و بارودۆخە پڕ لە مەترسییەدا حاڵەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆم لە خۆمدا هەڵگرتبوو کە پێم عار بوو دابەزمە ناو سەنگەرەوە. تەنانەت "گوڵ عەلی"ی سەرکردە و "مەمدووح"ی پارێزگار لە پشتەوە هاواریان لێ بەرز بووەوە:

با بکشێتە دواوە.. یان خێرا بڕواتە ناو سەنگەرەکەوە!

جا هەرچەند ئەوان ئاوایان پێ دەوتم، من هەر دەموت:

گوللە تۆپی دوژمنان نامانکوژێت و، بایەخـم نەدەدا بە حەزەر و خۆپاراسـتن و، هەوڵی پاراستنی ژیانە ڕەنگینەکەی ڕۆژگاری لاویم نەدا..

کەچی ئێستا لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا ئەوپەڕی حەزەر و خۆپاراستن بۆ مەبەستی پارێزگاری لێکردنی ژیانم بەکار دەهێنم، تەنانەت بە هەسـتیارییەکی زۆرەوە خۆم لە مەترسییەکان دەپارێزم!

جا هەرکەسێك سەرنج لەم دوو حاڵەتـەم دەدات، دوو دژە هەڵوێستی سـەیریان تێدا دەبینێت. چونکە کەسێك بێ هیچ دوودڵییەك ڕۆژگارانی ژیانی لاویی خـۆی بەخت بکات، کەچی بە حەساسیەتێکی زۆرەوە هەوڵی پاراستنی چەند سـاڵێکی بێ تام و چێژی ژیـانی پیری بـدات، بێ گومـان ئـەم کـارەی لـە حیکمەتێکـەوە سەرچاوەی گرتووە و، دوو سێ مەبەستی بەرزی تێدایە:

▢ مەبەستی یەکەم:

ژیانی پیری و لاوازیم - تـا ڕادەیـەك - دەبێـت بـەهۆی ڕزگـار بوونـی قوتابیـانی پەیامەکانی نوور لەو پیـلان و فڕوفێڵانـەی کـە ستەمکارە ڕەسمی و نارەسمییـەکانی پشتی پەردە دەیـانگێڕن و، لـەو هێرشانەشـدا کـە بـە تایبـەتی ئاراستەی کەسـی منـی دەکەن. چـونکـە - لە نـەزانیی خـۆیاندا - پێیـان وایـە مـن شـان و شـکۆیەکم لـەم کارەدا هەبێـت.. ئیتر لە بریی قوتابیانی پەیامەکانی نوور، خۆیـان بـە منـەوە سـەرقاڵ دەکەن!

▢ مەبەستی دووهەم:

هەرچـەندە هـەموو یـەکێکی بـرا تایبەتمـەندەکانم خـاوەنی پەیامـەکانی نـوورن و، هەریەکەیان "سەعید"ێکـە بۆ خـۆی، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پارێزگـاری لێکردنـی ژیانە نەخۆشە لاوازە پیرەکەی خۆم بـە پێویسـت دەزانم، بـە مەبەستی دامـەزراندن و قـووڵ کردنـەوەی پشـتگیری و هاوپـەیوەندیی نێوانیـان کـە لـە دوای "ئیخـلاس" بـە مەزنترین هێزی ئێمە دادەنرێت. تاکو لە ئەنجامی جیاوازیی مەشرەبەکان و بە وێنەی ڕووداوەکەی بەندیخانە ئەو پشتگیری و هاوپەیوەندییە لێك نەترازێت، کە لەوانەیە

لێکترازانێکی لەو جۆرە زیانی گەورە بە خزمەتی نوور بگەیەنێت.. هەروەها تاکو کۆمەڵە پەیامەکانی "وتەکان" و "بریسکەکان" پێش چاو بخرێن و.. گرفتی ترساندنی زانایان لە پەیامەکانی نوور - کە هی ترس و کێبەرکێی نێوانیانە - لە گۆڕێدا نەمێنێت..

چونکە بە درێژایی ئەم تاقیکردنەوە دوور و درێژانەی دادگاکان، دوژمنانم لە دۆزینەوە و بینینی ناتەواوی و کەموکوڕی‌یە پەنهانەکانمدا دەستەوسان مان و، بەهۆی پارێزگاری و چاودێریی خوای گەورەوە نەیانتوانی سووکایەتی بەرامبەرم بنوێنن. جا هەروەك ئەمەیان نەتوانی، بە هەمان جۆر ناشتوانن بەسەر پەیامەکانی نووردا زاڵ بن. ئێستاش بۆیە هەوڵی پاراستنی ژیانە بێ بایەخەکەی خۆم دەدەم چونکە نیگەرانی ئەوەم کە دوژمنانمان لەوانەیە بتوانن لە ڕێی سووکایەتی بە شان و شکۆی هەندێ لە سەعیدە لاوە میراتگرەکانم و هەڵبەستنی بوختان بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی‌یان - لەبەر چەند هۆکارێکی نەزانراو - زیان بە پەیامەکانی نوور بگەیەنن. بە ڕادەیەك کە بە پێویستم زانی زیاد لە دەمانچەکەی خۆم، یەکێکی تریش هەڵبگرم!

بە پشتیوانیی خوای گەورە و بەرەکەتی دوعای برایانم و، بە وێنەی پووچەڵ بوونەوەی کاریگەریی ژەهرەکە، هەموو ئەو پیلانانەش پووچەڵ دەبنەوە کە دوژمنان سازیان دەکەن.

* * *

(نیشانەکانی سەرهەڵدانی تەوژمێکی نوێ)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

سێهەم:

هەرچەند من ماوەی سی ساڵە بایەخم بە ڕووداوە سیاسی‌یەکان نەداوە و بە دوایاندا نەگەڕاوم، بەڵام دەست بەسەرداگرتنی ئەو موصحەفە پیرۆزەمان کە تەوافوقەکانی لەمەڕ "لەفزی جەلالە" دەردەخات و نەدانەوەی پێمان.. هەروەها ئەو ئەشکەنجە و ئازارە نزمەی کە بە دەست دادگای ئافیوونەوە چەشتمان و قەدەغە

کردنی کتێبەکانمان لە لایەن ئەو دادگایەوە.. هەموو ئەمانە، کاریگەریەکی زۆریان لەسەر بەجێ هێشتووم و، لە ماوەی پازدە ڕۆژدا دوو سێ جار ڕوانیمە دنیای سیاسەت و، شتی سەیرم تێدا بینی..

بینیم ئەو تەوژمی ئیلحادەی کە بە ئیستبدادی ڕەها و بەرتیلی گشتی حوکمی گرتووەتە دەست، لە پێناوی ڕازی کردنی ماسۆنییەت و شیوعییەت بۆ ئازاردان و لەناوبردنمان تێدەکۆشێت، وەك ئەوەی کە لە بەرگرییەکانمدا خستوومەتە ڕوو. بەڵام نیشانە و مژدەی سەرهەڵدانی تەوژمێکی ترم دی کە - پشت بە خوا - هێزی تەوژمی یەکەم دەشکێنێت. ئیتر لەمە زیاتر نەمڕوانییە ئەو دنیایە، چونکە لە ڕووی ڕێبازەکەمەوە ڕێی ئەوەم پێ نەدراوە.

الباقي هو الباقي

برای نەخۆشتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(بروسکەیەك بۆ سەرۆك کۆمار)

بۆ سەرۆك کۆمار.. جەلال بایار!

پیرۆزباییتان لێ دەکەین و، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە بۆ خزمەتی ئیسلام و نیشتمان و نەتەوە یارمەتیتان بدات[1].

بە ناوی قوتابیانی نوورەوە

سەعیدی نوورسی

* * *

(١) شایانی باسە "جەلال بایار"یش ئەم بروسکە وەڵامەی خوارەوەی بۆ مامۆستا نوورسی نارد:
بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی ـ ئەمیرداغ
پیرۆزباییەکەتان کە لە دڵەوە ناردبووتان گەلێ خۆشحاڵی کردین. زۆر سوپاست دەکەم.
جەلال بایار
(پەراوێزی وەرگێڕ)

(نامەیەك بۆ سەرۆك کۆمار)

بۆ بەڕێز سەرۆك کۆمار و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران لە ئەنقەرە!

ئێمەی قوتابیانی نوور چەندین جۆری بێ وێنەی ئەشکەنجە و سووکایەتیمان بە درێژایی بیست ساڵی ڕەبەق هێنرایە ڕێ و، هەر ئێمەش بووین کە توانیمان لە بەرامبەریەوە ئارام و خۆڕاگری بنوێنین، هەتا خوای گەورە ئێوەی بۆ یارمەتیدانی ئێمە نارد.

دادگای تەمیز و دادگای دەنیزلی هەردووکیان شایەتن لەسەر ئەوەی کە سووکایەتی کردن بە ئێمە لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕەبەقدا، لەسەر هیچ بناغەیەکی یاسایی نەبووە. چونکە دوای وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی سێ دادگا لە سەد و سی کتێب و هەزاران نامەدا، نەیانتوانی نە لە ڕاستیدا و نە بە شێوەیەکی ئاسایی هیچ هۆیەك بۆ ئەم سووکایەتی و ئەشکەنجە و ئازارەی ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابوردوومان بدۆزنەوە.

هەرچەندە من ماوەی سی ساڵە وازم لە سیاسەت هێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیرۆزبایی خۆم پێشکەش بە سەرۆك کۆمار و ئەنجومەنی وەزیران دەکەم کە سەرۆکایەتیی ئازادیخوازان و سەربەستانیان گرتە ئەستۆ. هاودەم لەگەڵ پیرۆزباییەکەشمدا ئەم ڕاستییەی خوارەوەیان بۆ دەدرکێنم:

ئەوانەی هێرشمان دەکەنە سەر و لە دادگاکاندا ئازارمان دەدەن، بیانوویان ئەوەبوو کە دەیانوت: "لەوانەیە قوتابیانی نوور ئایین لە پێناوی چەند ئامانجێکی سیاسیدا بەکار بهێنن". ئێمەش لە بەرگرییەکانماندا بەو ستەمکارانەمان وت و دەشڵێین و، پشتی ئەم وتەشمان بە هەزاران بەڵگە دەگرین کە:

ئێمە "ئایین" ناکەین بە ئامرازی دەستی "سیاسەت" و، جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێکی ترمان نییە و، ڕێبازەکەمان وایە کە ئایین نەکەین بە داردەستی نە سیاسەت و نە دەسەڵات و نە هەموو دنیا بە گشتی.

دوژمنانیشمان دوای لێکۆڵینەوەی ڕق لە دڵانەی سێ ساڵیان لە سێ فەردەی پڕ لە کتێب و نامەدا، بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن ئەو تۆمەتەمان لەسەر بچەسپێنن.

تەنانەت هیچ بروبیانوویەك بۆ ئەو فەرمانە هەرەمەكی‌یانە شك نابەن كە ئێمەیان پێ حوكم داوە. جا لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەكیان لە دژمان نەدۆزی‌یەوە، ئەوا "دادگای تەمیز" ئەو حوكمەی هەڵوەشاندەوە.

ئێمە هەرگیز ئایین ناكەین بە ئامرازێك بۆ سیاسەت، بەڵكو سیاسەت دەكەین بە ئامرازێك لە خزمەت و بەرژەوەندیی ئاییندا و، ئاشتی و تەبایی دەخەینە نێوانیانەوە. ئەمەش تەنها لە كاتێكدا كە ناچار دەبین بڕوانینە سیاسەت لە بەرامبەر ئەوانەوە كە لە پێناوی زیان گەیاندنی زۆر و لەڕادەبەدەر بەم وڵاتە و بە خەڵكی ئەم نیشتمانە سیاسەتی خۆسەپێن وەك داردەستی ئیلحاد بەكاردەهێنن. كەواتە كارەكەمان پەیوەندی و پەیوەستێكی برایانە دەهێنێتە دی بۆ سێ سەد و پەنجا ملیۆن كەس لەگەڵ برایانیان لەم وڵاتەدا.

پوختەی ئەم قسانە:

لە بەرامبەر ئەوانەوە كە سیاسەتی خۆسەپێنیان كردووە بە ئامرازی دەستی ئیلحاد و ئازاریان داوین، ئێمە سیاسەتمان كردووە بە ئامرازێك بۆ خزمەت و تەبایی لەگەڵ ئاییندا و، بەم كارەشمان بۆ بەختەوەریی ئەم وڵات و نەتەوەیە تێكۆشاوین.

* * *

(مژدەی گێڕانەوەی بانگی شەرعی)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برایانی ئازیز و بەوەفام!

یەكەم:

پڕ بە گیان و قەوارەی خۆمان پیرۆزبایی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزتان لێ دەكەین كە هەشتا و ئەوەندە ساڵی تەمەنێكی نەبڕاوەی پڕ لە عیبادەت بۆ مرۆڤ دەهێنێتە دی. هەروەها لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە كە هەموو شەوێكی ئەم مانگە پیرۆزەمان وەك شەوی قەدر بۆ بكات بە شەوێكی بەرهەم بەخش.. هەروەك بە میهرەبانی‌یە فراوانەكەشی لێی دەپاڕێینەوە كە برایەتیی ڕاستەقینە و ئیخلاسی

کامڵتان پێ ببەخشێت، تاکو هەموو قوتابیيەکی تایبەتمەندی نوور - بەهۆی بەشدارکردنی هەوڵ و تێکۆشانەکانەوە - لە دەسکەوتە مەعنەوىيەکانی هەموو قوتابیانی نووردا بەشدار بکات، وەك ئەوەی کە بە هەزاران زمان پەرستش و لە خوا پاڕانەوە و ئیستیغفار و تەسبیحاتی ئەنجام دابێت.

دووهەم:

لەگەڵ ئەوەدا کە پەیامەکانی نوور بە جۆرێکی مەعنەوی و تەواوەتی سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، کەچی ماسۆنیيە مولحیدەکان و شیوعیيە زەندیقەکان هەوڵی ئەوە دەدەن کە شتی بچووك لە پێش چاودا گەورە بکەن و، ڕێ لە سەربەستیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور بگرن. تەنانەت ئەم جارەش بوون بەهۆی ئەوەی کە دادگایی کردنمان ماوەی سێ و پێنج ڕۆژ دوا بخەن و، قرەقرِ و غەڵبەغەڵبیان لەگەڵ پارێزەرەکەماندا نایەوە، تاکو نەهێڵن موصحەفە پیرۆزەکەمان بدرێتەوە. بەڵام چاودێریی خوای گەورە هەموو نەخشە و پلانەکانی ئەوانی پووچەڵ کردەوە. چونکە پەیامەکانی نوور لە ئەستەمبووڵ و ئەنقەرەدا خۆیان خستووەتە سەردەستی لاوەکان کە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنماییان دەکەن و، ئەوانیش بە تاسە و شەوقێکی تەواوەتیيەوە دەیانخوێننەوە. بە ڕادەیەك کە ئەم سەرکەوتنە مەعنەوىيە بوو بەهۆی ئەوەی لە لایەن سەدان لاوی ڕۆشنبیرەوە بروسکەی پیرۆزبایی و سوپاسگوزاری بۆ سەرۆك وەزیران ڕەوانە بکرێت کە هەوڵەکانی خۆی بۆ گێڕانەوەی بانگی محەممەدی ﷺ لەسەر شێوەی شەرعی، خستبووە گەڕ.

* * *

(ئیسپارتە سەبارەت بە من شوێنێکی پیرۆزە)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

یەکەم:

بە بۆنەی گێڕانەوە و بەرزبوونەوەی دەنگی "بانگی محەممەدی ﷺ" لەسەر دەیان هەزار منارەی ئەم وڵاتە، بەوپەڕی خۆشحاڵی و شادمانیيەوە پیرۆزباییتان لێ

دەکەم. هەروەك ئەمە مژدەیەکە بۆ پەیدابوونەوەی سەرلەنوێی شەعائیرەکانی ئیسلام لەم وڵاتەدا، لە هەمان کاتدا پێشەکییەکیشە بۆ چەندین جەژنی گەورەی ئێوە و ئەم وڵاتە و سەرانسەری جیهانی ئیسلامی.

ئێمە لە لایەن خۆمانەوە سەبارەت بە پەرستش و دوعاکانتان دەڵێین: "آمین. آمین. آمین. اللهم آمین" کە لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا پێشکەشی خوای گەورەتان کردوون، کە مانگێکە دەسمایەی تەمەنێکی هەشتا و ئەوەندە ساڵیی پڕ لە عیبادەت دەستی مرۆڤ دەخات. هەروەك لە میهرەبانیی خواوەند دەپاڕێینەوە کە پاداشتی "شەوی قەدر" بە هەموو یەکێك لە شەوەکانی ئەم مانگە پیرۆزەتان ببەخشێت. تکام وایە لە ئێوەش کە دەستی یارمەتیی مەعنەویم بۆ درێژ بکەن، چونکە لەبەر پەرەسەندنی نەخۆشی و زیادبوونی لاوازیم ناتوانم لەم مانگەدا لەسەر پەرستش و دوعاکردن بەردەوام بم.

دووهەم:

ئاواتی گەورەم ئەوەیە کە کۆتایی ژیانم لە "ئیسپارتە" و دەوروبەریدا بەسەر ببەم. چونکە بە وێنەی پاڵەوانەکەی نوور وتی، منیش دەڵێم:

(شاری ئیسپارتە، بە خاك و بەرد و ئاو و هەوا و هەموو شتێکیەوە، سەبارەت بە من پیرۆزە)! تەنانەت هەرکات لە ماوەی ئەم بیست و پێنج ساڵەدا لە ئەنجامی ئەو ئازار و سووکایەتی پێکردنەی کە لە لایەن حکومەتەکانی پێشووەوە دەهێنرایە ڕێم، تووڕە دەبووم و ئارامم لا دەبڕا، هەرگیز لە حکومەت و بەرپرسەکانی ئیسپارتە تووڕە نەدەبووم، تەنانەت لەبەر خاتری ئەم شوێنە خاوێنە بەرپرسەکانی تریشم لە بیر دەچووەوە و دوعام لێ نەدەکردن. بە تایبەت نیشتمان پەروەرە ڕاستەقینەکان کە دەستیان داوەتە بنیاتنانەوەی ئەو لایەنانەی پێشتر دەڕووخێنران، لەو ئازادیخوازانەی کە پێیان دەوترێت دیموکراسییەکان. من لە لایەنی خۆمەوە زۆر سوپاسی ئەو ئازادیخوازانە دەکەم کە ڕێزی شایان لە نوور و قوتابیانی نوور دەگرن و، بە زۆری لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە پشتیان بگرێت و سەریان بخات. پشت بە خوا ئەو ئازادیخوازانە ئیستبدادی ڕەها لە گۆڕ دەنێن و، دەبن بە هۆکارێکی سەرهەڵدانی سەربەستیی شەرعی.

سێهەم:

مانەوەم لێرە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە دوای جەژن - لەبەر هۆیەك - كارێكی پێویستە. بەڵام مانەوەم لە دوای یەك دوو مانگ، بە دەست بڕیاری ئەركانی قوتابخانەی زەهرا و ڕەزامەندیی سەعیدە لاوەكانی زانكۆی ئەستەمبووڵ و ئەنقەرەیە. ئەوان هەر شوێنێك بۆ مانەوەی من بە گونجاو دەزانن، من پێی ڕازیم. چونكە لەبەر ئەوەی ئێوە میراتگری ڕاستەقینەن بۆ من و هەزار جار لە خۆم باشتر ئەركی ئەم دنیایەم ڕادەپەڕێنن، ئەوا دوا مەنزڵم لەم ژیانە فانییەدا بە ڕای ئێوە دەسپێرم.

چوارەم:

وەڵامدانەوەی پیرۆزبایی و نامەكان بە ئێوە دەسپێرم، كە لە لایەن ئەو كەسانەوە هاتوون پەیوەندیی گەرموگوڕی خۆیان بە پەیامەكانی نوورەوە دەردەبڕن.

* * *

(قوتابیانی نوور ژیاننامەی مامۆستاكەیان دەنووسن)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

یەكەم:

لە خوای گەورەی بەتوانا و میهرەبانییە فراوانەكەی دەپاڕێینەوە كە شەونخوونیی یەك بە یەكی ئێوە و گشت قوتابیانی نوور لە شەوی "قەدر"دا قبووڵ بكات، كە شەوێكە هەشتا و ئەوەندەساڵی پەرستش دەستی مرۆڤ دەخات و، دەكەوێتە نیوەی دووهەمی ڕەمەزانەوە، بە تایبەت دە شەوی دواهەمینی و، بەتایبەتتر شەوە تاكەكانی و، لەناو ئەوانیشدا شەوی بیست و حەوتەم. ئومێدەوارم ئەم برا لاواز و تەقسیربار و نەخۆشەتان بخەنە ناوەندی دوعاكانتانەوە كە هەزاران "ئامین"یان لەگەڵدایە.

دووهەم:

قوتابیانی نووری زانكۆ نوێنەرایەتیی چەند سەعیدێكی لاو دەكەن و، بە ڕاستی ئەركی سەرشانی "قوتابخانەی زەهراء" چ لە ئەستەمبووڵ و چ لە ئەنقەرەدا ڕادەپەڕێنن و، هیچ ئەركێك بۆ ئەم سەعیدە لاوازە ناهێڵنەوە.

لە هاوپێچی ئەم نامەیەدا بەیاننامەکەی قوتابیانی زانکۆتان بۆ دەنێرین کە ئاراستەی ئەندامانی پەرلەمانیان کردووە و، نموونەیەك پیشان دەدات بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پەیامەکانی نوور سەروزیادن، لەگەڵ "مێژووی ژیان"دا کە هەر ئەوان دایان‌ناوە و بەدەست نووسراوەتەوە، تاکو بدرێت بە حەفتا ئەندامی پەرلەمان.

جا ئەگەر ڕاتان لەسەری بوو: ئەو بەیاننامەیە و، بەرگرییەکەی مستەفا صونگور کە پێشکەشی وەزارەتی پەروەردەی کردووە و، عەرزوحاڵەکەی مستەفا عوسمانیش کە پێشکەشی وەزارەتی دادی کردووە، بیانکەن بە پاشکۆیەك بۆ کتێبی "مێژووی ژیان" کە بە دەست نووسراوەتەوە، یان لە "ئەینەبولو" بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە.

سێهەم:

ئەرکانی "قوتابخانەی زەهراء" وەکیلی ڕاستەقینەی خودی خۆمن، کەواتە با وەڵامی ئەو نامانە بدەنەوە کە ئاراستەی خودی کەسی من کراون.

* * *

(برایانی موسڵمان و قوتابیانی نوور)

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

یەکەم:

هەزار هەزار جار پیرۆزبایتان لێ بێت لەسەر ئەنجامدانی کۆمەڵە پەیامی "وتەکان" لە جوانترین و ڕێکترین شێوەدا. هەروەك سوپاسی زۆر پێشکەشی خوای گەورە لەسەر ئەوەی کە بەشێکی کۆمەڵە پەیامەکانتان لە زایەبوون و دەست بەسەرا گرتن ڕزگار کرد.

دووهەم:

سەبارەت بەو پیرۆزباییەی کە ئەندامێکی "برایانی موسڵمان" لە "حەڵەب"ەوە بۆی نووسیبووم، ئێمەش لە بەرامبەرەوە پیرۆزبایی لێ دەکەین و، لە ناخی دڵ و گیانیشمانەوە پیرۆزبایی لە "برایانی موسڵمان" دەکەین و، پێیان دەڵێین:

هەزار جار "بارك الله"..

"قوتابیانی نوور" کە وەك جێگەدارێکی "ئیتیحادی محەممەدی"ی جاران، نوێنەری ئیتیحادی ئیسلامیی ناو ئەنادۆڵن. بەڵام لە وڵاتە عەرەبی‌یەکاندا "برایانی موسڵمان" نوێنەری ئەو ئیتیحادە ئیسلامی‌یەن.

"قوتابیانی نوور" و "برایانی موسڵمان" لە نێوان چەندین دەستە و تاقمی تردا، دوو ڕیزی هاوشان و هاوتێڕوانینی یەکتر لە ناوەندی حیزبی قورئان و بازنەی خاوێنی ئیتیحادی ئیسلامیدا، پێکدەهێنن. گەلێ دڵخۆش بووین بە بایەخدانی گەرموگوڕیان بە "پەیامەکانی نوور" و نیازیان بۆ وەرگێڕانی هەندێك لەو پەیامانە بۆ زمانی عەرەبی. ئێمە لە بەرامبەر ئەمەوە هەستی پێزانین و ئەمەکداری‌یان لە دڵی خۆماندا بۆ هەڵدەگرین. لەبەر ئەمە، وەڵامێك بۆ ئەو کەسە بنێرنەوە کە بە ناوی کۆمەڵەی "برایانی موسڵمان"ەوە کارتی پیرۆزبایی بۆ ناردبووم. تکام وایە ئەوانیش لەوێ چاودێریی قوتابیان و پەیامەکانی نوور بکەن.

* * *

(سەعیدە لاوەکان)

برای ئازیز و بەوەفام عوسمان نووری!

بەهۆی نیازی بەرز و ئیخلاسی تەواوەتیی خۆتان، خوای گەورە چەند سەعیدێکی لاوی خاوەن شان و شکۆی لە دەورت کۆکردووەتەوە. جا لەبەر ئەوەی ئێوە مانەوەی من لە ئەنقەرە بە پێویست دەزانن، ئەوا منیش لە لایەنی خۆمەوە نوسخە تایبەتی‌یەکانی خۆم لە پەیامەکانی نوور، کە لەسەر مەسرەفی خۆم ئامادەم کردوون – لە بریی خۆم – دەنێرم بۆ ئەو قوتابخانە نووری‌یە بچکۆلەیە، تاکو بە ژمارەی ئەو نوسخانە هاوڕێ و دراوسێت لە دەور کۆببنەوە..

لە هەمان کاتدا چەند سەعیدێکی لاوت لەلا دادەنێم کە بریتین لە: صونگور، جەیلان، صالح، عەبدوڵلا، ئەحمەد، ضیاء. ئەمانە بە خزمەتگوزاری‌یەکانی خۆیان تا ئێستا چەسپاندوویانە کە گیانفیدای ئەم ڕێگایەن و، زیاد لە وەفای کوڕانیش بۆ

باوکیان بۆ ئەم خزمەتە وەفایان تێدایە و، هەریەکەیان لە جێی دە "عەبدورڕەحمان"دایە. بۆیە دەشیانێرمە لات تاکو قوتابی و وەکیلی من بن و لە بریی منیش ئەرکی سەرپەرشتی کردنی ئەو قوتابخانە بچکۆلەیە بگرنە ئەستۆ و، بیکەن بە قوتابخانەیەکی بچووکی نوور. ئەمەش بۆ ڕای ئێوە بەجێ دەهێڵم.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(ڕەخنەگرتنەکانی ئەهلی ئیمان)

برایانی ئازیز و بەوەفا و پیرۆزم!

.....

دووهەم: ئەو ڕەخنەگرتنە سووکەڵانەی کە هەندێ لە سۆفی‌یەکان ئاراستەمان دەکەن - وەك لە نامەی براکەی قۆنیەدا هاتووە - هیچ گرنگی‌یەکی نی‌یە و، دەبێ برایانیش پێیان ناخۆش نەبێت و، بە هیچ جۆرێك، حەق بە حەق، وەڵامیان نەدەنەوە. چونکە من ئەو ڕەخنەگرتنانەی ئەوان بە جۆرێکی ئامۆژگاری و چەشنە ئاوڕدانەوە و ڕێزلێنانێك دادەنێم کە لە لایەنی ئەوانەوە ئاراستەمان کرابن. جا لەبەر ئەوەی ئەو ڕەخنانە لە لایەن ئەهلی ئیمانەوە، بە تایبەت لە لایەن شوێنکەوتووانی تەریقەتە سۆفی‌یەکانەوەن، بە تایبەت‌تر ئەوانەیان کە ڕاستەوخۆ کەسی من دەگرنەوە، ئەوا من لێیان خۆش دەبم و چاویان لێ دەپۆشم. چونکە لە بەرامبەر ئەو زیانە سامناکانەی کە ئێستا ئەهلی ئیلحاد دەیانهێننە ڕێمان، ئەو سووکەڵە ڕەخنانەی برایانی ئەهلی ئیمان بە تایبەت ئەوانەیان کە خۆم دەگرنەوە، بە وەسیەتی هاوڕێیەکیان دادەنێم کە وەك ئاگاداریی حەزەر کردن وان.

الباقي هو الباقي

براتان

سەعیدی نوورسی

(هەندێ لە خزمەتگوزارییەکانی قوتابیانی نوور)

ئەو خزمەتگوزارییە ئیمانییانەی کە "قوتابیانی نوور" بە تایبەت "ئەرکانی قوتابخانەی زەهراء" بە تایبەت "خەسرەو" پێشکەشی ئەم نەتەوە و نیشتمانە و جیهانی ئیسلامیی دەکەن و، سنوورێك لە بەردەم فرتوفێڵی مولحیدە ڕووخێنەرەکاندا دادەنێن، بە چەند کردەوەیەکی چاکی هێندە مەزن دادەنرێن کە هەزاران کردەوەی خراپیان دەسڕێتەوە، گەر بە فەرزی مەحاڵ وا دابنرێت کردەوەی خراپیان بێت..

لەبەر ئەوە، دەبێ ڕەخنە لە هەڵسوکەوتی ئەو قوتابییە ئەرکانانە، بە تایبەت خەسرەو، نەگیرێت. بەڵکو دەبێت بە ئیخلاسی تەواوەتی پشتیان بگیرێت و بە وەفای خاوێن و بێگەردیش پەیوەندیی برایەتییان لەگەڵدا بەهێز بکرێت.

* * *

(لە بارەی پەیامی: چەند بریسکانەوەیەك"لوامع"ەوە)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەی "ئەرکانی قوتابخانەی زەهراء" و بڵاوکەرەوانی پەیامەکانی نوور!

یەکەم:

مەسەلەیەکی گونجاومان بینی و، وامان بە دڵدا هات کە ئاراستەی ئەرکانی قوتابخانەی زەهرای بکەین، تاکو ڕای خۆیانی لەبارەوە دەربڕن. چونکە ئەوان خاوەنی ڕا و صەلاحییەتن. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

لەبەر ئەوەی سێ کەس لەو برایانەی کە لە ئیشوکارمدا یارمەتیم دەدەن، حەزیان دەکرد بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دەرسێکی کاتیم لەلا بخوێنن.. هەروەها بە تاسەمەندیی زیندووکردنەوەی خاتیرەیەکی بەنرخ کە کاتی خۆی بە قوتابیانم وتبووەوە، ئەوا هەرچی ڕۆژە یەك لاپەڕەم لە پەیامی "لوامع"ی چاپکراو پێ دەوتن و، بە ڕێز و سەرسووڕمانەوە پێشوازیمان لەم پەیامە دەکرد. چونکە ئەوەمان بە بیردا هات کە هۆی تەواوبوونی ئەم پەیامە چاپکراوە و پەیامەکانی تری

هاوچەشنی: نرخە بەرزەکەیانە کە دوژمنان پێیان زانیوە و نەیانهێشتووە بڵاو بیێتەوە و، دۆستانیش کە نایانەوێت دەرفەتی دەستخستن و کڕینی لە دەستی خۆیان بدەن.

بینیمان ئەم پەیامە وەك ناوك و تۆوی بەشێکی گرنگی پەیامەکانی نوور وایە، چونکە گەلێ دانستی پوخت و ڕەوانی لەخۆ گرتووە کە هەریەکەیان گەلێ ڕاستیی گەورەی کۆمەڵایەتییان تێدایە و، بە شێوازی "سەهلی مومتەنیع" داڕێژراوە کە لاسایی ناکرێتەوە و، شێوەی هۆنراوێکی لە پەخشان چووی لەخۆ گرتووە کە هیچ ئەدیب و بیریارێك لە نووسینی هاوچەشنیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە و، خوێنەر بەوپەڕی ئاسانی دەتوانێت بە "پەخشان" بیخوێنێتەوە، بێ ئەوەی "هۆنین"ی بە خەیاڵدا بێت.

ئەم پەیامە سی و حەوت ساڵ پێش ئێستا لە ماوەی بیست ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز و بە یەك دوو سەعات کارتێداکردنی ڕۆژانە دانراوە و، لە ڕووی ئەدەبیشەوە لە مەسنەویی ڕۆمی دەچێت. ئەم پەیامە ئەوەی ڕاگەیاندووە کە دوای سی ساڵ ناوەرۆکەکەی دێتە دی. لە سی شوێندا ئاماژەمان لەسەر ئەم چەشنە هەواڵانە داوە. کە ئەممش ئەوە دەگەیەنێت: پەیامی "لوامع" مژدەی سەرهەڵدان و هاتنی پەیامەکانی نووری داوە و، پێڕست و کێڵگە و نموونەی ئەو پەیامانەیە.

* * *

(مژدە و بێدارکردنەوەیەك)

(نامەیەکە تایبەتە بە "ئەرکان"ی ئێستای قوتابخانەی زەهراء)

"مژدەیەکی گرنگە بۆ پیرەژنان و.. بێدارییەکیشە بۆ ئەو کیژانەی کە دەیانەوێت شوو نەکەن"

ناوەرۆکی فەرموودەی: "علیکم بدین العجائز" مرۆڤ هان دەدات چاو لە پیرەژنان بکات. بەو واتایەی کە لە ئاخر زەماندا ئیمانی دامەزراو لای پیرەژنان دەبێت.

لەبەر ئەوەی یەکێك لە چوار بناغەکانی پەیامەکانی نوور "شەفەقەت"ە و.. ئافرەتانیش ڕابەر و پێشەوای شەفەقەت و میهرەبانین، بە چەشنێ کە ترسنۆکترین کەسیان لە پێناوی ڕزگار کردنی منالەکەیدا گیانی خۆی بەخت دەکات و.. دایکان و خوشکانی بەڕێزیش لەم چەشنە کات و سەردەمەدا ڕووبەڕووی چەندین ڕووداوی گەورە گەورە دەبنەوە..

لەبەر ئەوە، ئەم بێدارییەی خوارەوە بۆ دڵم ئیلهام کرا کە:

پێویستە ڕاستییەکی سروشتیی تایبەت بە کچان ڕوون بکرێتەوە، هەرچەندەش نەدەبوو باس بکرایە و بڵاوبکرایەتەوە، چونکە تایبەتە بەو ئافرەتانەی دەیانەوێت، یاخود ناچار بوون، شوونەکەن. لەبەر ئەوە، دەڵێم:

کچەکانم! خوشکەکانم!

ئەم زەمان و سەردەمەی ئێمە لە زەمان و سەردەمەکانی پێشوو ناچێت، چونکە وا ماوەی نیو سەدەیە پەروەردەی نوێی (ئەوروپایی) لە بریی پەروەردەی ئیسلامی جێی خۆی لە کۆمەڵدا کردووەتەوە. دەبینیت ئەو کەسەی کە دەبوو - بەپێی پەروەردەی ئیسلام - ژنی بۆ ئەوە بهێنایە خۆی لە گوناهباری پێ بپارێزێت و، بیکات بە هاوەڵ و هاوسەری هەمیشەیی خۆی و، خولگەی بەختەوەریی ئەم دنیای، کەچی دەبینیت - بە کاریگەریی پەروەردەی ئەوروپایی - ئەو هاوسەرە لاواز و بەدبەختەی ژیانی دەکات بە ژێر دەستەی خۆسەپاندن و زاڵبوونی بەردەوامی خۆی و، تەنها لە تافی لاوییەکەیدا خۆشی دەوێت، تەنانەت لەوانەشە گەلێ زیاتر لەو حەوانەوەیەی بۆی ئامادە کردووە دووچاری ماندوویی و دەردیسەریی ژیانی بکات. ئیتر ژیان لەو ئافرەتە بێچارەیە بە ئەشکەنجە و ئازار دەچێتە سەر، بە تایبەت ئەگەر بەپێی پێوەری شەرع هاوکووفی یەك نەبن، چونکە لەو چەشنە کاتەدا هیچ چاودێرییەکی مافە شەرعییەکان ناکرێت. خۆ ئەگەر مونافەسە و غیرەت و چاولێکەرییش تێکەڵ بەو ژیانە ببێت، ئەوا گیروگرفتەکە چەندین جار زیاد دەبێت.

تەنها سێ هۆکار هەن ئافرەت بۆ ئەم شووکردنە هان دەدەن:

❑ هۆکاری یەکەم:

دانایی خوای گەورە شەوق و ئارەزووی لە مرۆڤدا بۆ وەچەخستنەوە داناوە و، پاداشتێکیشی بۆ ئەنجامدانی ئەو فەرمانبەرییە سروشتییە پێ داوە کە "لەزەت"ە. پیاو لەوانەیە لە پێناوی ئەو لەزەتەی کە (دە) دەقیقە دەخایەنێت تەنها ئازار و ماندوویی یەك سەعاتی بێتەڕێ - ئەگەر حەلاڵ بێت - بەلام ئافرەت بەرامبەر بەو تام و لەزەتەی کە (دە) دەقیقە دەخایەنێت. نزیکەی دە مانگ منال لە سکیدا هەڵدەگرێت، سەرەڕای ئەوەی کە بە درێژایی دە سالیش ئەرکی دەردیسەری و ئازاری ژیانی منالەکەی دەکەوێتە ئەستۆ. واتە: ئەو لەزەتە (دە) دەقیقە خایەنە گرنگیی ئەو مەیل و شەوق و ئارەزووە سروشتییە دەسڕێتەوە، چونکە ئەم ماندوویی و گیروگرفتە یەکجار زۆر و بەردەوامانەی لێ دەبێتەوە.

کەواتە نابێت هەست و ئارەزووەکانی ئافرەت، ئەو مەیلە سروشتییە بۆ شووکردن بیزوێنن.

❑ هۆکاری دووهەم:

ئافرەت، هەر بە سروشت و لەبەر ئەو لاوازییەی لە بەدیهاتنیدا هەیە، پێویستی بە یەکێکە لە کاروباری ژیاندا یارمەتیی بدات. جا باشتر وایە - وەك ئافرەتانی لادێنشین - هەوڵ بدات بە دەستی خۆی خەرجی و نەفەقەی خۆی پەیدا بکات. ئەمەی دەیان جار باشترە لەوەی کە ئەم پێویستییە ناچاری ملکەچ بوونی بکات بۆ دەستەلات و زەبر و زالبوونی مێردێك کە - وەك باری ئێستامان - بە پەروەردەیەکی جگە لە پەروەردەی ئیسلام پێگەیشتبێت و، لەسەر زۆرلێکردن و فەساد ڕاهاتبێت. چونکە لەوانەیە ئەو ئافرەتە بە: "ڕیاکاری و تێکدانی پەرستن و ڕەوشتەکانی خۆی" کە خولگەی ژیانی دنیا و قیامەتی ئەون، هەوڵ بدات ڕەزامەندیی ئەو مێردەی بەدەست بهێنێت. هەموو ئەمانەش لە پێناوی ئەو گوزەرانە ساکار و کەمەدا.

جا لەبەر ئەوەی بەدیهێنەری بەخشندە، بە چەشنی ئەو ڕۆزییەی لە مەمکاندا بۆ بێچووانی دەنێرێت، ئاوا ڕۆزیی ئەو ئافرەتانەش دەدات، ئەوا چاوگێڕان بۆ مێردی

نوێژنەکەری بەدڕەوشت و ملکەچ بوون بۆی لە پێناوی ڕۆزیـدا، کارێکە هەرگیز لە شان و شکۆی "ئافرەتە قوتابی‌یەکانی نوور"دا نی‌یە.

❒ هۆکاری سێ‌هەم:

"خۆشویستن و گەمە و گاڵتەکردن لەگەڵ منالدا" لـە سروشـتی ئافرەتدا هەیـە. ئەو شتەش کە ئەم مەیلە سروشتی‌یەی ئافرەت بەهێز دەکات و بـۆ شـووکردن هـانی دەدات ئەوەیە کە: لە پاشاندا ئەو منالە لە دنیادا خزمەتی بکاتەوە و، لـە قیامەتیشـدا ببێت بە شەفاعەتکاری و، دوای مردنیشی چاکەی بۆ بنێرێت. بـەڵام ئەو پـەروەردە ئەورووپاییـەی کـە ئێسـتا جێی پەروەردەی ئیسـلامیی گرتووەتـەوە، کـارێکی وای کـردووە مـەگەر یەکێك یان دوو لـەناو (دە) کـوڕدا لەگـەڵ دایکی خـۆیدا بـاش بێت و، بە دوعـا و کردەوەی باش "چاکـە" لەسـەر لاپـەڕەی کردەوەکـانی دایکیـدا تۆمار بکات و، گەر پیاوچاك دەرچێت، لە قیامەتیشدا شـەفاعەتکاری بێـت و، بـەو پێ‌یە پاداشتی شەفەقەتی دایکی بداتـەوە.. بەڵام هەشـت دانەکـەی تر، هەموو ئـەم شتانە پشتگوێ دەخەن.

کەواتـە نـابێت ئـەم مەیلـە سروشـتی و تاسـە دەروونی‌یـەی خۆشویسـتنی منـاڵ و گەمـە و گاڵتـە لەگـەڵیان، لـەم کـات و سـەردەمەدا، ئـافرەت گـیرۆدەی گیرو گرفتەکانی ئەم ژیانە سەختە بکات، ئەگەر بە تەواوی و بە چەشنێکی تەواو بێ گومان ناچار نەبێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یەی پێشوو، ڕوو دەکەمە کچانم لە قوتابیانی نوور، لەوانەی شوونەکردنیان پێ باشترە، پێیان دەڵێم:

دەبێ خۆیان ڕووت نەکەن و، جەستەیان دەرنەخەن و، بەو پێ‌یە خۆیان هـەرزان فـرۆش نەکـەن، تـاکو مێردێکی ئیمـانداری پیاوچـاکی ڕەوشت جوانیـان دەسـت دەکەوێت کە بە تەواوی بۆ ئەوان بگونجێت. بەڵکو دەبێ بە کچـی بمێننـەوە، ئەگـەر مێردێکی هاوکووفیان دەست نەکەوت، وەك پیاوە پاڵەوانەکانی قوتابیانی نوور کە ژنیـان نـەهێناوە، هـەتا کەسێك داوایـان دەکـات لەگەڵیدا بگونجێـت لەوانـەی بـە پەروەردەی ئیسـلام پـەروەردە بـوون و خـاوەنی ویژدانـی زینـدوون. بۆ ئـەوەی ئـەو

جۆرە مێردە بێت بە هاوڕێی ژیانێکی هەمیشەیی کە شیاوی بێت و، تاکو لە پێناوی لەزەتێکی سەرپێیی دنیایدا بەختەوەریی دواڕۆژی نەدۆڕێنێت و لە خراپکارییەکانی شارستانێتیدا نوقم نەبێت.

سەعیدی نوورسی

* * *

(بڵاوکردنەوەی نوورەکان)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

یەکەم:

پڕ بە دڵ و ڕۆحی خۆمان پیرۆزبایی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەری خۆشەویستان ﷺ لێ دەکەین.

دووهەم:

پشت بە خوا جیهانی ئیسلامی لەمەولا پیرۆزبایی سەرکەوتنی ڕەنگینتان لە بڵاوکردنەوەی ڕووناکییەکانی پەیامەکانی نووردا ئاراستە دەکات و، سەرەتای ئەمەش ئێستا دەرکەوتووە. وا لە خوارەوەدا نموونەیەکیتان بۆ باس دەکەم:

وەزیری پەروەردەی پاکستان هات بۆ لام بۆ وەرگرتنی بەشێك لە پەیامەکانی نوور و، وتی: هەوڵ دەدەم ئەم پەیامە نوورانییانە لە نێوان نەوەد ملیۆن موسڵماندا بڵاو بکەمەوە..

ئنجا هەرچەندەش مونافیقەکان پڕوپاگەندەی چەپەڵ لە دەوروبەرماندا بڵاو دەکەنەوە، کەچی لە چەند شوێنێکی دووری وەك ئەوروپا و ئاسیا ئەم ڕووناکییانە بڵاو دەبنەوە! تەنانەت دوای سەرهەڵدانی کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار" لێرە، یەکسەر لە ئەڵمانیاشدا سەری هەڵدا..

ئنجا لە ناوخۆی وڵاتیشدا خەڵکی بەوپەڕی حەز و شەوقەوە و بێ ئەوەی بایەخ بەو قەدەغەکردنە بدەن کە سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ بەسەر پەیامەکانی نووردا سەپاندوویانە، کۆمەڵە پەیامی "عەصای مووسا" و "زولفەقار" دەخوێننەوە و، زۆربەی خوێنەرانیشیان خەڵکی ئەنقەرەن..

بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی گەلێ پارێزگا وتبوویان: لە پێناوی چاکسازی و ڕاستکردنەوەی ڕەفتاری بەندکراوەکاندا، بەندیخانەکان دەکەین بە قوتابخانەی نوور، وەك ئەوەی لە بەندیخانەی "دەنیزلی" و "ئافیوون"دا ڕەفتاری بەندکراوان لەو ڕێیەوە گۆڕا و بەرەو باشی ڕۆشت!

سێهەم:

برای بەڕێزمان کاك بورهان - خوا لێی خۆش بێت - یەکێك بوو لە پاڵەوانە نەخوێندەوارەکانی پەیامەکانی نوور، بەبۆنەی لە دنیا دەرچوونیەوە سەرەخۆشی لە خزمانی و لە ئیسپارتە و لە قوتابیانی "قوتابخانەی زەهراء" دەکەم. نزیکەی شەش ڕۆژ پێش ئێستا ئەم هەواڵەم بیست و لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا هەزار جار دوعام بۆ کردووە، چونکە پێشتریش لە دوعاکانمدا و لە ویردی "أجرنا من النار"دا نزیکەی چوارسەد جار ناوم دەهێنا و پاداشتی هەموویانم دەکرد بە دیاری و بە "بورهان"م دەبەخشی!

چوارەم:

بە فەزڵی خوای گەورە پەیامەکانی نوور دەستیان داوەتە ڕووناککردنەوەی قوتابخانە نوێیەکان، چونکە ئەو قوتابیانەیان هێناوەتە ڕیزی قوتابیانی پەیامەکانی نوور و بڵاوکەرەوەی ئەو پەیامانە زیاتر لە قوتابیانی قوتابخانە شەرعی‌یەکان، کە ئەوانیش - پشت بە خوا و وردە وردە - دەبن بە قوتابیی پەیامەکانی نوور، چونکە "پەیامەکانی نوور" کەرەسەی ڕاستەقینە و داهاتی قوتابخانەکانی ئەوانە. وا وردە وردە خەریکە حەز و ئارەزووی گەلێ موفتی و زانا بۆ پەیامەکانی نوور دەردەکەوێت. پێویستە ئەهلی تەکیە و خانەقاکانیش، کە خاوەنی تەریقەتە سۆفی‌یەکانن، ئەو پەیامانە ڕووناك بکەنەوە.

پێشتر دەم وت: ئەم زەمان و ڕۆژگارە هی تەریقەت نی‌یە، چونکە بیدعەتەکان ڕێ لەوە دەگرن کە مرۆڤ خەریکی تەریقەت بێت. کە ئەمەشم دەوت تەنها بیرم لە "ڕاستی‌یەکانی ئیمان" دەکردەوە. کەچی ڕۆژگار دەری‌خست کە دەبێ و تەنانەت لە هەموو شتێك پێویستترە بۆ هەموو خاوەن تەریقەتێك کە بڕواتە ناو

بازنەی پەیامەکانی نوورەوە، کە فراوانترینی تەریقەتەکانە و هەر دوازدە تەریقەتە گرنگەکانی ناو بازنەی سوننەتی خاوێنی لەخۆ گرتووە. چونکە هەرکەسێکی ئەهلی تەریقەت گەر نوقمی گوناهیش بووبێت هەرگیز بە ئاسانی ناڕواتە ناو ئیلحادەوە و دڵی لە ئاستیدا شکست ناهێنێت، بۆیە هەرگیز لەرزەیان پێ ناکەوێت. کەواتە دەتوانن ببن بە قوتابیی ڕاستەقینەی پەیامەکانی نوور، بە مەرجێك - تا دەتوانن - نەڕۆنە ناو بیدعەتەکانەوە و، ئەو گوناهانەش ئەنجام نەدەن کە ڕێ لە تەقوا دەگرن و زامداری دەکەن.

پێنجەم:

ترسناکترین شت لەم زەمان و ڕۆژگارەدا: ئیلحاد و زەندەقە و ئاژاوە و کاری تۆقاندنە..

خۆ جگە لە "دەستگرتن بە ڕاستییەکانی قورئانەوە" هیچ چارەسەرێکی تر نییە بۆ مرۆڤ لە بەرامبەر ئەم مەترسییانەوە کە هەڕەشەی لێ دەکەن. دەنا هەرگیز هیچ شتێك ناتوانێت ڕووبەڕووی ئەم موسیبەتە مرۆییە ببێتەوە کە وڵاتی چینی لە ماوەیەکی کەمدا خستە باوەشی شیوعییەتەوە. هەروەك ناتوانرێت بە هێزە سیاسی و ماددییەکانیش بێ دەنگ بکرێت. کەواتە هەر تەنها "ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز"ن کە دەتوانن ئەو گێرو گرفتە ببەنە دواوە و دووری بخەنەوە.

* * *

(ئەرکی سەرشانمان کارکردنە.. سەرکەوتنیش تەنها لە لایەن خواوەیە)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەی لاوە پاڵەوانەکانی نوور!

یەکەم:

پڕ بە گیان و هەناومان پیرۆزبایی ئەو خزمەتە دەراسا و مەزنانەتان لێ دەکەین کە لە ئەنقەرە و شوێنەکانی تردا ئەنجامیان دەدەن. بە ڕاستی ئێوە بوون بەهۆی

بێداری و ڕابوونێکی گرنگ و زیاد لە ئاواتی چاوەڕوانکراوی ئێمەش سەبارەت بە زۆر کەس، بە تایبەت بۆ فێرخوازانی قوتابخانە نوێکان.

ئەو خزمەتگوزارییانەی کە تا ئێستا لە ئەنقەرەدا ئەنجامتان داون، مەگەر بە دە ساڵ دەنا هەرگیز ناگونجێ ئەنجام بدرێت. کەواتە قەناعەت بەم خزمەتە گرنگانە بکەن کە جێبەجێتان کردوون، تاکو لە ئەنجامی چەند ڕووداوێکی بێ نرخەوە ورە و هێزی مەعنەویتان دووچاری لاوازی نەبێت. تەنانەت دەبێ ئەو خزمەتانە هۆیەك بن بۆ گەیشتن بە چەند هۆکارێکی تر کە هەوڵ و چالاکیتان زیاد بکات.

لەو چەشنە شوێنانەدا کە زیاتر لە بیست تەوژمی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە پێناوی بەرژەوەندییە کەسییەکاندا، یاخود لەبەر چەندین ئامانجی جۆراوجۆر ململانێ دەکەن، کاری ئێوە - لەم ناوەندەدا - لە پێناوی قورئان و ئیماندا و، پێشوازی کردنی قوتابیانی زانکۆ لە پەیامەکانی نوور بەوپەڕی ڕێز و سەرسووڕمانەوە..

ئەم کارە، دڵخۆشیی بە هەموو قوتابیانی نوور بەخشی، تەنانەت دڵی هەموو جیهانی ئیسلامییش خۆش دەکات.

پاداشتی ئێوە لەم خزمەتە گشتییەتاندا هێندە مەزنە کە بە وێنەی پاداشتی ئێشکگر(المرابط) وایە لە بارودۆخی سەختی سەر سنووردا لە بەرامبەر دوژمنانەوە. چونکە یەك سەعاتی ئەو ئێشکگرتنە هاوتای ساڵێکی تەواوی پەرستشە..

جا ئێوە - هەروەها قوتابیانی نووری زانکۆی ئەستەمبووڵ - وەك ئەو پاسەوان و ئێشکگرانە لە ماوەیەکی کەمدا گەلێ کاری گەورەتان ڕاپەڕاندووە. خۆ ئەگەر بەری هەموو ڕەنجەکەتان نەچنیوەتەوە، ئەوا قەناعەت بەو ئەندازەیە بکەن کە هاتووەتە بەر.

بەڵێ، هەروەك کشانەوەی هەندێ کەسی لاواز لە کاتی جیهاددا، حەماسەت و غیرەتی قارەمانانەی مرۆڤە ئازا و بەغیرەتەکان دەبزوێنێت، دەبێ قوتابییە گیانفیداکانی پەیامەکانی نووریش، لە دەمی پاشەکشێی کەسانی دوودڵدا، زیاتر بەرەو غیرەت و دامەزراوی و کۆششی بەردەوام بڕۆن.

بەڵێ، ئێوە لە سروشتی خۆتاندا بە ڕێنمایی ڕاستییەکی مەزنی نێوان ڕاستییەکانی "پەیامەکانی نوور" هەنگاوتان ناوە. دەبا ئەو ڕاستییە هەمیشە لە پێشچاوتاندا بێت کە بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئەرکی سەرشانی ئێمە تەنها کارکردنە بە ئیخلاسەوە بۆ ئیمان و قورئان. بەڵام بەدەستهێنانی سەرکەوتن لەم کارەدا و.. قبووڵ کردنی ئەم ڕاستییانە لە لایەن خەڵکییەوە و.. دوورخستنەوەی نەیارەکانی ئەم خزمەتە.. ئەم کارانە، خوای گەورە خۆی ئەنجامیان دەدات و لە ئەستۆی ئێمەی نەناون. ئێمە خۆمان لەو شتانەدا هەڵناقورتێنین کە ئیشی خوای گەورەن. تەنانەت گەر شکستیش بهێنین هەر کار ناکاتە سەر وورە و هێزی مەعنەوی و خزمەتگوزارییەکانمان.

کاتێ کە بە جەلالەددین خوارەزم شای سەرکردەی مەزنیان وت: "بەسەر جەنگیزخاندا سەر دەکەویت". وتی: "ئەرکی سەرشانی ئێمە تەنها جیهاد کردنە، بەڵام سەرکەوتنمان یان شکست هێنانمان کاری خوای گەورەیە و، من خۆمی تێهەڵناقورتێنم"!

جا ئێوەش – برایانی بەڕێزم! – چاوتان لەم پاڵەوانە کردووە. پشت بە خوا لەمەولاش هەر بە ئیخلاسەوە لە کاری خۆتاندا بەردەوام دەبن، بێ ئەوەی "لاوازی" کارتان تێ بکات.

* * *

(هیچ ناوەندێك لە نێوان ئیمان و کوفردا نییە)

"ئیمان" و "کوفر" هیچ ناوەندێکیان لە نێوانـدا نییە. ئەوەتا لە بەرامبەر شیوعییەتەوە و بۆ قەڵاچۆکردنی لەم وڵاتانەدا جگە لە ئیسلام هیچ شتێکی تر و هیچ ڕێگایەکی ناوەند نییە. چونکە دابەشکردنی ڕێگاکان بە "ڕاست" و "چەپ" و "ناوەڕاست" داخوازی ئەوەیە کە سێ ڕێباز لە ئارادا بن. دیارە ئەمەش لای ئینگلیز و فەرەنسییەکان کارێکی ڕاست و دروست دەردەچێت، چونکە ئەوان دەتوانن بڵێن: ڕاست ئیسلامە و چەپ شیوعییەتە و ناوەڕاستیش نەصرانییەتە..

بەڵام لەم وڵاتانەی خۆماندا جگە لە ئیمان و ئیسلام هیچ ئایین و مەزهەبێك نی‌یە کە ڕووبەڕووی شیوعییەت ببێتەوە، مەگەر هەڵگەڕانەوە لە ئایین و ڕۆشتنە ناو شیوعییەتەوە! چونکە موسڵمانی ڕاستەقینە نە دەبێت بە "گاور" نە دەشبێت بە "جوولەکە"، بەڵکو - گەر واز لە ئایینەکەی بهێنێت - مولحیدێکی ئاژاوەچیی تۆقێنەری لێ دەردەچێت.

جا هەروەك وەزیری پەروەردە و وەزیری داد لەم ڕاستی‌یە تێگەیشتن، پشت بە خوا هەموو پایەکانی تری حکوومەت لێی تێ دەگەن و، لە بریی "ڕاست" و "چەپ" پاڵ بە هێزی: حەق و حەقیقەت و قورئان و ئیمانەوە دەدەن و، پشت بە خوا ئەم نیشتمانە لە کوفری موتڵەق و زەندەقە و کاولکاریی ترسناکیان ڕزگار دەکەن. ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە پڕ بە هەموو گیان و هەناوی خۆمان لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە لەم هەوڵەدا سەریان بخات.

* * *

(بروسکەیەك لە ڤاتیکانەوە)

ڤاتیکان: ٢٢/شوبات/١٩٥١

مەقامی بەرزی پاپا
سکرتێری تایبەت
سەرۆکایەتیی قەڵەمی تایبەت ژمارە ٢٣٢٢٤٧

گەورەم! لە ڕێی وەکالەتی مەقامی پاپاوە لە ئەستەمبووڵ، کتێبە دەسنووسە جوانەکەتان (زولفەقار) گەیشتە دەستمان و پێشکەشی جەنابی پاپا کرا. ئەویش ئومێدی ئەوەی خواست کە پێخۆشحاڵیی خۆیتان پێ ڕابگەیەنین بەرامبەر بەم ئاوڕلێدانەوە میهرەبانانەی بەڕێزتان، هاودەم لەگەڵ پاڕانەوەیدا لە خوای گەورە کە بەر لوتف و فەزڵی خۆیتان بخات. ئێمەش ئەم هەلە دەقۆزینەوە کە ڕێزی خۆمانتان پێشکەش بکەین.

ئیمزا
سەرۆکایەتیی سکرتارێتیی ڤاتیکان

* * *

(لە بارەی: ﴿وِلْدَانٌ مُخَلَّدُون﴾ەوە)

باسمه سبحانه

ئەو ڕوونکردنەوەیەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وِلْــــدَانٌ مُخَلَّــدُون﴾ کە لـە پەیامی: "پرسەی منالێك"دا باس کراوە جیایە لەوەی کە بەشێك لـە تەفسیرە کۆنـەکان دەڵێن: لە بەهەشتدا هەموو مرۆڤێك هەر لە بچووکترین منالەوە تـا گـەورەترین پیر، لە تەمەنی سی و سێ سالیدا دەبن.

حەقیقەتی ئەمە - والله أعلم - ئەمەی خوارەوەیە:

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕاشکاوی دەستەواژەی: ﴿ولـــــدان﴾ی بەکارهێناوە، کە ئەمەش وا دەگەیەنێت: ئـەو منالـە بچووکانەی پێش بالغ بوونیان مردوون و، بۆ بەجێهێنـانی فـەرزەکانی شـەرع زۆریـان لـێ نەکـراوە و، خۆیشـیان لـە ڕووی سوننەت و تەطەووعەوە ئەو فەرزانەیان ئەنجام نەداوە.. ئەو منالانە، لە بەهەشتدا هەر بە منالی و خۆشویستراوی و بە هەمیشەیی دەمێننەوە، بە چەشنێك شیاوی بەهەشت بێت.

بەلام ئەوانەی گەیشتوونەتە تەمەنی حـەوت سـالی و، دایـك و باوکیـان - لەبەر فێرکردن و ڕاهێنان - بۆ جێبەجێ کردنی فـەرزەکان هانیـان داون و لـە دە سـالیدا زۆریان لـێ کردوون، وەك شەرع داوای کردووە، ئەوانیش لە حەوت سالییەوە تا بـالغ بـوون فـەرزەکانیان - لـەو ڕووەوە کـە بـۆ ئـەوان سـوننەتە، نـەك فـەرز - بەجێهێناوە و، وەکو گەورەکان بەڕۆژوو بوون.. ئەوانە، بە چەشنی مرۆڤە گـەورە ئاییندارەکان پاداشت دەدرێنەوە و، لە بەهەشتدا - وەك ئـەوان - لـە تەمـەنی سـی و سێ سالیدا دەبن.

هـەندێ تەفسـیر ئەمـەیان کـردووە بـە گشـتی بـۆ هـەموو منـالێك و، بـێ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییە، لەو گومانەدان کە حوکمی ئـەم ئایەتـە گشـتی بێـت، کەچی تایبەتییە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(یادخستنەوەی پەرلەمانتارە ئاییندار و بەغیرەتەکان)

بەرژەوەندیی ئیسلام و وڵات - پێش هەموو شتێك - داخوازی ئەوەیە کە: یاسای ئازادیی ئاییندار ان دابمەزرێت و یەکسەری لە قوتابخانەکاندا جێبەجێ بکرێت. چونکە ئەم پشتگیری‌یە هێزی مەعنەویی چل ملیۆن موسڵمانی ڕووسیا و چوار سەد ملیۆن موسڵمانی جیهان بە گشتی دەکات بە هێزێکی مەزن و پشتگیر بۆ ئێمە. چونکە هیچ گومانێك لەوەدا نی‌یە کە هەر تەنها ڕاستی‌یەکانی قورئان و ئیمان بوون دەستدرێژیی ڕووسیایان لە دژی ئێمە گێڕایە دواوە کە هەزار ساڵە دوژمنایەتیمان دەکات، پێش ئەوەی دەستدرێژی بکاتە سەر ئەمریکا و ئینگلیز..

لەبەر ئەوە، دەست گرتن بەو ڕاستی‌یانەی قورئان و ئیمانەوە و، بەکارهێنانیان وەك بەربەستێکی قورئانیی بەهێزی چەشنی بەربەستە بەهێزەکەی "زولقەرنەین" بۆ بەرەنگاریی تەوژمی دەستدرێژیکەری ئیلحاد، لە هەموو شتێك پێویستترە بۆ بەرژەوەندیی ئەم وڵاتە. چونکە ئەو ئیلحادەی کە دەستی بەسەر هەموو ڕووسیا و نیوەی چین - تا ئێستا - و نیوەی ئەورووپادا گرت، لە بەرامبەر ئێمەوە لە سنووری خۆیدا ڕاوەستا و، هەر تەنها ڕاستی‌یەکانی ئیمان و قورئانیش بوون کە لەو سنوورەدا ڕایانگرت..

دەنا ئەو دادگایانەی کە لە کۆی هەزار ڕووخێنەردا مەگەر یەکێکیان پێ سزا بدرێت، هەرگیز ناتوانن و ئەو هێزە پێویستەشیان نی‌یە کە هێز و توانای مەعنەویی کاولکاری ڕووسیا لە سنووری خۆیدا ڕابگرن..

چونکە ئەو کاولکاری‌یە مەعنەوی‌یەی کە دەرگای ماڵ و سامانی دەوڵەمەندان بۆ نەدارا و بەرەڵایان دەخاتە سەرپشت و، شەرەف و نامووسی غیرەتمەندان بۆ لاوانی بەرباد موباح دەکات و، بە ماوەیەکی کەم بەسەر نیوەی ئەورووپادا زاڵ بوو، مەگەر چەند بۆمبایەکی مەعنەوی ڕابیوەستێنێت کە بە تەواوی هەڵی بتەکێنن و لە بنج و بێخدا دەری بهێنن، کە چەند بۆمبایەکی ئەتۆمیی مەعنەوی و گەورەی ڕاستی‌یەکانی قورئان و ئیمانن، ئەو لافاوە ڕامالەرە لە شوێنی خۆیدا ڕادەگرن.

دەنا کاری پێچەوانەی ئەمــە و، بە سزادانی یەك لـە هەزارانی ئەوانە لـە لایەن دادگاکانــەوە، نــاتوانرێت ئــەو هــێزە کاولکــارە مەزنــە لــە شــوێنی خۆیــدا رابووەستێنرێت.

ئەو بێدارییەی لە ئەنجامی هەردوو جەنگە جیهانییەکەدا چاوی گرۆی مرۆڤـی کردەوە، دەری خست کە هیچ نەتەوەیەك بە بێ ئایین ژیانی بۆ ناڕواتە سەر. کەواتە رووسیا ناتوانێت بـە "بێ ئـایین" بمێنێتـەوە. دیـارە ناشـگەڕێتەوە بـۆ "نەصرانییـەت". لەوانەیە یان لەگەڵ قورئاندا ئاشتەوایی بکـات، یـان بـە تـەواوی شـوێن ئـەو کتێبـە روونە بکەوێت کە پشتی کوفری ڕەها دەشـکێنێت و پاڵی بـە حـەق و حەقیقـەت و بەڵگەوە داوە و قەناعەت بە ژیری و دڵـی مـرۆڤ دەبەخشێت. ئیـتر ئـەو کاتـەش لەگەڵ چوارسەد ملیۆن کەسی ئەهلی قورئاندا ناکەوێتە جەنگەوە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(هەموو شتێك نیشانەی لەسەر بەدیهێنەر تێدایە)

برایانی صیددیق و بڕیار و ئازیزم!

یەکەم:

لەسەر بناغەی چەند نیشانەیەکی زۆر قەناعـەتی تـەواوم پـەیدا کـرد بـەوەی کـە: مولحیدانی پشتی پەردە هەندێ لە کارمـەندە ڕەسمییـەکان دەخەڵـەتێنن و، لـە نێـوان چەندین پەیامی گەورەی نووردا سوورن لەسەر پێشچاو خستنی پـەیامی: "ڕابـەری لاوان" و دەیکەن بە مایەی تۆمەتبار کردنم! ئیتر ئـەوانیش وا مـاوەی سـاڵ و نیوێکـە ئەشکەنجە و ئازارم دەرخوارد دەدەن و تەنگم پێ هەڵدەچنن..

ئێستا بە دڵنیـایی بۆم دەرکـەوتووە کـە هـۆی سووربوونیان لەسـەر ئـەو پەیامـە، باسێکە تیایدا بە ناونیشانی: (سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی "هُوَ"دا). چونکە ئەو باسە نهێنیی تەوحیدی دەرخستووە و، هێندە بە جوانی ڕوونـی کردووەتـەوە کـە بـە تەواوی کوفری ڕەها قەلاچۆ دەکات و بوار بۆ هیچ چەشنە گومانێك لای بەشێکی ئەوان ناهێڵێتەوە.

جا دوای ئەوەی کە ئەو مولحیدانەی پشتی پەردە لە بەرامبەر ئەم باسە بەنرخەوە هیچ کارێکیان پێ نەکرا، دەستیان دایە سازدانی فرِوفێڵ، تاکو نەهێڵن بڵاو ببێتەوە و، بە ڕەسمی لە پێش‌چاودا لا ببرێت.

دوێنێ لە بارەی هەندێ خاڵی ئەو باسە ناوبراوە دەرسێکم بە ئەرکانی "قوتابخانەی زەهراء" وت، وا تەنها سێ دانەیان بۆ ئێوەش باس دەکەم:

● خاڵی یەکەم:

یەکێك لە کارمەندییە بەرز و مەزنەکانی "هەوا" لەوەدایە کە دەبێت بەهۆی بڵاوبوونەوەی وشە خاوێنەکان و گوفتارە پڕ لە حەقیقەت و دانست بەخشەکانی ئیمان، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی کردووەتەوە کە دەفەرموێت:

﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ...﴾ (فاطر: ١٠)..

بە ڕادەیەك کە "هەوا" دەبێت بە لاپەڕەیەکی ئەوتۆی توانستی خوای گەورە کە بە تێدانووسینی قەڵەمی قەدەر و بڵاوبوونەوەی ئەو وشانە تیایدا - بە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە - ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت، تاکو بدرێن بە گوێی مەلائیکەت و ڕۆحانییەکاندا، هەر لەناو گۆی هەواوە تا بەرز دەبنەوە بۆ عەرشی ئەعزەم.

جا مادەم ئەرکی گرنگ و بەرز و حیکمەتی بەدیهێنانی "هەوا" لەمەدایە.. لە هەمان کاتیشدا بەهۆی ڕادیۆوە، کە نیعمەتێکی مەزنی خواوەندە و پێشکەش بە مرۆڤ کراوە، گۆی زەوی وەکو یەك خانە و مەنزڵی لێهاتووە، ئەوا بێ گومان ڕۆژێك دێت کە گرۆی مرۆڤ لە بەرامبەر ئەو نیعمەتە مەزنەوە شوکرانەیەکی گشتی و هەمەلایەنە پێشکەش بە پەروەردگاری خۆی بکات و، نیعمەتی ڕادیۆ پێش هەموو شتێك بەهۆکارێکی گواستنەوەی وشە جوانەکانی وەك قورئانی پیرۆز و ڕاستییەکانی ئەو قورئانە بەکاربهێنێ و، بەردەوام وانەکانی ئیمان و ڕەوشتی جوان و گوفتاری پێویست و سوودبەخشی بۆ ژیانی مرۆڤ پێ بڵاو بکاتەوە.

چونکە ئەگەر شوکرانەیەکی وەك ئەمە لەسەر ئەو نیعمەتە پێشکەش نەکرێت، ئەوا دەبێت بە مایەی سزا و نەهاتی بۆ گرۆی مرۆڤ. ئەوەتا هەروەك مرۆڤ

پێویستی بە بیستنی ڕاستی‌یەکانە، پێویستیشی بە هەندێ گاڵتەوگەپ و لەهووە، بەڵام دەبێ بەشی ئەم گاڵتەوگەپ و لەهووە پێویستە تەنها پێنج یەکی ئەو شتانە بێت کە "هەوا" دەیانگوێزێتەوە. دەنا کاری پێچەوانەی ئەمە دژی نهێنیی حیکمەتی "هەوا" دەبێت و، مرۆڤ دەخاتە باوەشی تەمبەڵی و حەز لە حەوانەوە و خاوبوونەوە و هەرزەیی، هەروەك دەشبێت بەهۆی تەواو نەکردنی کار و ئەرکە پێویستەکانی سەرشانی و، وازلێهێنانیان بە کرچ و کاڵی و ناتەواوی. دیارە ئەو کاتەش نیعمەتە مەزنەکە، لەبەر ئەوەی شەوقی مرۆڤی بۆ کاری پێویست کز کردووە، دەبێت بە مایەی سزا و بەڵایەکی گەورە.

بە وردی سەرنجم لەم ڕادیۆ بچووکەی بەردەمم دا کە هێناویانە بۆ ژوورەکەم، تاکو لەو ڕێیەوە گوێ لە قورئانی پیرۆز ڕابگرم..

بینیم ئەم ڕادیۆیە مەکینەیەکی بچووکی ناو سندووقێکی بچکۆلەیە و، لە نێوان دە بەشی گاڵتەوگەپ و لەهودا تەنها یەك بەش دانراوە بۆ گوفتاری جوان و وشەی خاوێن! ئیتر زانیم کە ئەمە هەڵەیەکی مرۆڤە و، پشت بە خوا لە ئایندەدا ئەم هەڵەیەی خۆی ڕاست دەکاتەوە و، ڕادیۆ دەگۆڕێت بە قوتابخانەیەکی ئیمانی و، چوار لەسەر پێنجی ئەو بەشانە بۆ گوفتاری جوان و باش دادەنێت و، بەم کارەشی شوکرانەیەکی گشتی بەرامبەر بەم نیعمەتەی ڕادیۆ دەردەبڕێت و، لە بەرژەوەندیی ژیانی هەمیشەیی مرۆڤدا ئاراستەی دەکات.

● خاڵی دووهەم:

لە پەیامەکانی نووردا وتراوە کە:

هەرکەسێك نەتوانێت سەرجەمی گەردوون بەدی بهێنێت، هەرگیز ناتوانێت تەنها یەك دانە گەردیلەش بەدی بهێنێت و، جگە لە بەدیهێنەری ئەم گەردوونە کەس ناتوانێت گەردیلەیەك لە شوێنی گونجاوی خۆیدا دابنێت و، بە ڕێکوپێکی بەرەو ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی بیداتە بەر.

وا لە نێوان بەڵگە هەمەکی‌یەکانی ئەم ڕستەیەدا، یەك بەڵگەی جوزئی باس دەکەین.

ئەم ڕادیۆیەی نزیکم هەگبەیەکە بۆ چەندەها جۆری وشە.. ئامێرەکەی ناویشی بەشێکی یەکجار کەمی هەوای تێدایە. دەبا سەرنج لەم هەوا یەکجار کەمە بدەین.. ئەوەتا لە دوای سەرنجدان ئەمەی خوارەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

بەپێی لیستی ئێستگاکان کە لە بەردەمماندایە: نزیکەی دووسەد مەڵبەندی پەخشی ئێستگا هەیە و، ئەم مەڵبەندانەش لە دووری و نزیکیدا جیاوازن و، لەوانەیە سەعاتێك یان ساڵێك لێمانەوە دوور بن..

جا ئەگەر هەموو گەردیلەیەکی هەوا هێزێکی بێ سنوور و ویستێکی نەبڕاوە و زانستێکی تەواوی هەمەلایەنگری لە پشتەوە نەبێت کە ئاگای لە زمان و لەهجەی هەموو قسەکەرانی ئەو مەڵبەندانەی سەر ڕووی هەموو زەوی بێت و.. گەر بینینێکی تیژی گشتگیر نەبێت کە هەموو ئەوانە ببینێت و.. گەر بیستنێکیش نەبوایە کە لە یەك کاتدا و بێ ئەوەی شتێك ڕێی شتێکی تری لێ بگرێت، هەموو شتێك ببیستێت، ئەوا نەدەتوانرا یەك دانە وشەی قورئانیی - بۆ نموونە وەك "الحمد لله" - بە پیت و لەهجە و زمانی تەواوەتیی خۆی و تەنانەت بە نەبرەی دەنگی قسەکەر، هەر لەو خولەکەدا بگاتە گوێمان کە لە مەڵبەندەکەوە پەخش کراوە، بێ ئەوەی هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا بێت. کە هەموو ئەمانش بەهۆی ئەو گەردیلانەوەیە کە لە کەمێك "هەوا"ی ناو ئامێری بچووکی ڕادیۆوە ئەنجام دەدرێن.

واتە تەنها بەو "توانستە ڕەها" و "سیفەتە ڕەها"یانەی خوای گەورەیە کە دەتوانرێت: وشە جیاجیاکانی قورئان بە زایەڵە و دەنگە جیاجیاکان و بێ هیچ ئاڵوگۆڕێك، بگاتە بەر گوێمان. خۆ ئەگەر ئەو توانست و سیفەتە ڕەهایانە نەبوونایە ئەم موعجیزەی توانستەش پەیدا نەدەبوو.

واتە گەردیلەکانی هەوای ناو ئەم ئامێرە بچووکە، تەنها بە توانست و ویستی خاوەن توانستێکی ڕەها و زانا و بیسەر و بینەرێکی هەمەلایەنگر، کە هیچ شتێکی بەلاوە گران نییە و، گەورەترین شت لە بەردەم توانستیدا وەك بچووکترین شت وایە، دەتوانێت ئەو کارە پڕ لە موعجیزاتە ئەنجام بدات و "موعجیزەی توانست" پێش چاو بخات.

دەنا گێڕانەوەی ئەم کارە دەراسایە بۆ "ڕێکەوت"ی هەڕەمەکی و، "هێز"ی کتوکوێر و، "سروشت"ی کەڕولاڵ - کە وا گومان دەبرێت لە شەپۆلەکانی هەوادا بن - ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو یەکێك لە گەردیلەکانی هەوا و ئەو هەوایەش کە دەوراندەوری گۆی زەویی داوە، خاوەنی دانستێکی ڕەهای ئەوتۆ بن کە هەموو شتێك ببینێت و، هێندە زاناش بێت کە هیچ شتێکی لێ ون نەبێت و، تواناشی بەسەر هەموو شتێکدا بشکێت! دیارە ئەمەش خورافەتێکی بێزلێکراوە و، هێندە مەحاڵی تێدایە کە تابڵێی لە بیرکردنەوەی ژیرییەوە دوورە!

دەسا با گومڕایان بێن و ببینن کە ڕێڕەوەکەیان چەندە لە ژیرییەوە دوورە!

● خاڵی سێهەم:

ئەم "هەوا" یەکجار کەمەی ناو ئامێری بچووکی ڕادیۆ، ڕۆڵی گوڵدانی گوڵی وشە مەعنەوییە خاوێنەکان دەبینێت و، هێندە موعجیزاتی توانستی خواوەند دەردەخات کە دەردەکەوێت هەموو گەردیلەیەکی ئەو هەوایە "بوون"ی خوای گەورە دەچەسپێنێت و، زاتی پاك و سیفەتە خاوێنەکانی خواوەند بە خاوەن هەستان دەناسێنێت.

فەیلەسووفە داناکان و زانا مەزنەکان بە ئەندێشەی خۆیان بەناو هەموو سووچ و قوژبنێکی گەردووندا گەڕان و، هەرچییەکی تێدایە خستیانە ژێر تیشکی ژیرییەوە، تاکو بە هێنانەوەی چەندین بەڵگەی فراوان و مەزن "بوون" و "یەکتایی" خواوەند بچەسپێنن و، دوای ئەوە بە ناسینی ڕاستەقینەی خوای گەورە بەهرەمەند بن!

کەچی حەقیقەتێك هەیە بریتییە لەمەی خوارەوە:

هەر هێندەی "خۆر" هەڵدێت، تەنانەت وردە شووشەیەکی بچووکیش بە وێنەی تەختایی ڕووی دەریا، ئەو خۆرە دەردەخات و دەیناسێنێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە، هەموو گەردیلەیەکی هەوای ناو ئەم ڕادیۆیە - خۆی لە خۆیدا - درەوشانەوەی تەوحید و کەماڵی سیفەتەکانی خوای گەورە

دەردەخات. پەیامەکانی نوور - کە یەکێکن لە بریسکانەوەکانی ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆز - بەوپەڕی ڕوونی ئەم ڕاستی‌یەیان چەسپاندووە.

لەبەر ئەوە، هەرگیز قوتابیی وردەکاری نوور خۆی بە ناچار نازانێت کە بڵێت: "لا موجود إلاّ هو" هەتا حوزووری قەلبیی بەردەوامی دەست بکەوێت و هەمیشە ناسینی خوای لە یاددا بێت.. هەروەها وەك بەشێکی ئەهلی حەقیقەتیش پێویستی بە وتنی: "لا مشهود الاّ هو" نی‌یە تاکو بە حوزووری قەلبیی بەردەوام شاد ببێت. بەڵکو تەنها هێندەی بەسە کە یەکجار لە پەنجەرەی ئەم حەقیقەتە بەرزەوە بڕوانێت کە دەڵێت:

وفي كلّ شيء له آية تدلّ على أنّه واحد!

ڕوونکردنەوەی ئەم دەستەواژەیەش بە پوختی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

هەموو کەسێکی ناو ئەم جیهانە، جیهانێکی تایبەتی و گەردوونێکی تایبەت بە خۆی هەیە. واتە بە ئەندازەی ژمارەی خاوەن هەستان، جیهان و گەردوونی تێهەڵکێش هەیە و، ژیانی هەموو کەسێکیش ستوونی ڕاگیرکەری دنیا تایبەتی‌یەکەی ئەو کەسەیە. بە وێنەی ئەوەی کە ئەگەر هەرکەسە و ئاوێنەیەکی بە دەستەوە بێت و ڕووی ئاوێنەکەی کردبێتە کۆشکێکی مەزن و، هەریەکەیان - لەو ڕێیەوە - بوو بێت بە خاوەنی ئەو کۆشکە لە ئاوێنەکەیدا. بۆیە بەشێکی ئەهلی حەقیقەت بە: "ئینکاری کردنی دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆیان" و "وازهێنان لە غەیری خوا" و وتنی: "لا موجود إلاّ هو": حوزووری قەلبیی بەردەوامیان دەست دەکەوێت و بە ناسینی خوا بەهرەمەند دەبن..

بەشێکی تری ئەهلی حەقیقەت، بۆ ئەوەی بگەن بە ناسینی خوا و حوزووری قەلبیی بەردەوام، دەڵێن: "لا مشهود الاّ هو" ئیتر لەم ڕێیەوە دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆیان دەخەنە ناو بەندیخانەی لەبیرچوونەوە و، پەردەی "فەنا"ی بەسەردا دادەدەنەوە و، لەم ڕێیەوە دڵئامادەییان دەست دەکەوێت و، تەمەنی خۆیان دەخەنە حوکمی جۆرێکی تایبەتیی عیبادەتەوە.

بەڵام لەم سەردەمەدا "پەیامەکانی نوور" بەهۆی ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆزەوە، نهێنیی ئەم دەستەواژەیان ڕوون کردووەتەوە کە دەڵێت:

وفي كلّ شيءٍ له آية تدلّ على انّه واحد!

واتە "پەیامەکانی نوور" دەری دەخەن کە هەر لە گەردیلەکانەوە تا گەلەستێرەکان هێندە پەنجەرەی کراوە هەن کە هەموو یەکێکیان بەسەر تەوحیددا دەڕوانێت و، هەریەکەشیان چەندین نیشانە و بەڵگەی ڕاستەوخۆی لەسەر زاتی تاك و تەنیا و سیفەتە جوانەکانی خواوەند تێدایە.

جا (سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی "هُوَ"دا) چەند پوختە ئاماژەیەکی بۆ ئەم ڕاستییە مەزنەی ئیمان و دڵئامادەیی تێدایە، کە "پەیامەکانی نوور" بە چەشنێکی ڕوون و بێ گومان چەسپاندوویانە، لە کاتێکدا کەسانی ئەهلی حەقیقەتی پێشین بە کورتی و پوختی، چەسپاندوویانە و لێی دواون.

واتە ئەم زەمان و ڕۆژگارە ترسناکە، لە هەموو کاتێکی تر زیاتر پێویستی بەم ڕاستییە هەیە، بە ڕادەیەك کە خوای گەورە، بەهۆی ئیعجازی قورئانی پیرۆزەوە، ئەم نیعمەتەی بە خەڵکی بەخشیوە و، "پەیامەکانی نوور"یش ڕوونیان کردووەتەوە و، بوون بە یەکێك لە بڵاوکەرەوەکانی.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(ئیعجاز لە شتانی ئاسایی و لەگەڵ ڕاهاتوودا)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برایانی صیددیق و ئازیزم!

یەکەم:

پڕ بە گیان و هەناوی خۆمان پیرۆزبایی هاتنی سێ مانگە پیرۆزەکانتان لێ دەکەین، کە هەشتا ساڵ تەمەنی مەعنەوی و هەمیشەیی دەستی مرۆڤ دەخەن.

هەروەها شەوە پیرۆزەکانی ڕەغائیب و میعراج و بەرات و قەدرتان لێ پیرۆز بێت و، لە میهرەبانیی خواوەند دەپاڕێینەوە کە دەسکەوتە مەعنەوییەکانتان و دوعاکانتان بۆ برایانتان وەربگرێت. هەروەها پیرۆزبایی خزمەتگوزارییە خاوێنەکانتان و سەرکەوتنتان لە بڵاوکردنەوەی نووردا ئاراستە دەکەین.

دووهەم:

موسیبەتی "لەبیرچوونەوەی تەواوەتی" کە لە ئەنجامی ژەهر پێدانم تووشی بووم، بە فەزڵی خوای گەورە سەبارەت بە من بوو بە نیعمەت و میهرەبانی و کلیلێك بۆ کردنەوە و دەرکەوتنی گەلێ حەقیقەت. بۆیە لەمەش ئاگادارتان دەکەمەوە تاکو خەفەتی زۆرم بۆ نەخۆن، هەرچەندەش بە هەموو توانایەکمەوە ئومێدەواری دوعاکانتانم.

بەڵێ، هەر ئێستا پەیامی "موناجات"م خوێندەوە کە لە سەرەتای کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دایە. لەم خوێندنەوەیەوە سەرنجم دا کە گەلێ حەقیقەت هەن لە ژێر پەردەی خووپێوەگرتن و عادەت و ڕاهاتن و ڕایی بوونی کاری ئاساییدا خۆیان حەشار داوە!

جا لەبەر ئەوەی مولحیدانی بێ ئاگا و ئەهلی سروشت و فەلسەفە بە تایبەتی، زۆر لەو موعجیزاتانەی توانستی خواوەند نابینن کە لە ژێر پەردەی یاسا بەڕێوەچووەکانی خوای گەورە لە گەردووندا داپۆشراون، ئەوا دەچن "ڕاستییەکی مەزن" دەدەنە پاڵ هۆکارێکی بێ نرخی ئاسایی! بەم کارەشیان ئەو ڕێیە لە خەڵکی دەگرن کە لە هەموو شتێکدا هەیە و مرۆڤ دەگەیەنێتە ناسینی خواوەندی بەتوانا. تەنانەت چاوی خۆیشیان لە ئاستی بینینی ئەو نیعمەتانەدا دەنووقێنن و نایان بینن کە نیعمەت بەخش لە هەموو شتێکدا دایناون. لەم ڕێیەشەوە دەرگاکانی سوپاس و شوکرانەبژێری لە خۆیان و خەڵکی دادەخەن!

بۆ نموونە:

"توانست"ی مەزنی خوای گەورە هەروەك تەنها یەك دانە وشە لە یەك کاتدا و بەهۆی دەرکەوتنی ئەو وشەیە لەسەر لاپەڕەی هەوادا یەك ملیۆن جار بەڵکو یەك

ملیار جار کۆپی دەکاتەوە، بە هەمان جۆر و بە هێمای ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ﴾ (فاطر: ١٠) هەموو وشەیەکی خاوێن و پیرۆزیش لەناو گۆی هەوای دەوراندەوری زەویدا و بە قەڵەمی توانستی خوای گەورە لە یەك کاتدا - کە هێندە خێرایە لە حوکمی بێ زەمانیدایە - کۆپی دەکاتەوە. واتە هەر لە زەمانی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەربێت - تا ئێستا و لە ژێر پەردەی ئولفەت و ڕاهاتندا، موعجیزەیەکی سەرسووڕهێنی توانستی خوای گەورە لەناو گۆی هەوادا - کە وەك تابلۆیەکی کوژانەوە و تیانووسینی ڕاستی‌یە مەعنەوی‌یە قبووڵ کراوەکان وایە - لە پێش‌چاوی بێ ئاگایاندا شارراوەتەوە!

ئەو موعجیزەیەش لەم سەردەمەی ئێستادا بەهۆی ئامێرێکەوە چەسپاوە کە ناوی "ڕادیۆ"یان لێ ناوە، بە ڕادەیەك کە دەری دەخات تەنها یەك درەوشانەوەی "توانستی ڕەهای ئەزەلی" کە "زانست" و "دانست" و "ویستی ڕەها"شی لەخۆ گرتووە، ئامادە و تەماشاکارە لە هەموو گەردیلەیەکی هەوادا. چونکە وشە جۆراوجۆرە بێ سنوورەکان، بەبێ هیچ تێکەڵ بوون و لێ تێکچوون و ناتەواوی و سەر لێ شێوانێك، دەڕۆنە ناو گوێی بچووکی گەردیلەوە و ئنجا لە زمانە وردیلەکەیەوە دێنە دەرەوە.

بەو واتایەی کە ئەگەر هەموو "هۆکارەکان" کۆ بینەوە، هێشتا هەر ناتوانن دەرکەوتنی توانستی ئەزەلیی لەمەڕ ئەم کارمەندی‌یە سروشتی‌یەی یەك دانە گەردیلە، پێش چاو بخەن.

جا لەبەر ئەوەی هۆکارەکان هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن ئەو سنعەتە ناوازە ئیعجازبەخشە دەربخەن کە لە گوێ و زمانە ورد و لەژمارەبەدەرەکانی گەردیلەدا هەن، ئەوا گومڕایان و بێ ئاگایان دەچن لە ژێر پەردەی: ئولفەت و ڕاهاتن و ئاسایی و یاسادا دایدەپۆشن و، ئنجا ناوێکی ئاسایی لێ دەنێن، تاکو بە جۆرێکی کاتی خۆیانی بێ بخەڵەتێنن!

بۆ نموونە، وەك لە پەراوێزی پاشکۆی وتەی چواردەهەمدا وتراوە:

گەر وەستایەکی کارامە سەد هۆقە خواردەمەنیی جۆراوجۆر و سەد گەز کوتاڵی جیاجیای لە پارچە تەختەیەکی بە قەدەر سەری نینۆکێك دروست کرد و،

پاشان یەکێك وتی: ئەم کارانە تەنها ئەو پارچە تەختە بێ نرخە بە "رێکەوت" و بە چەند کاروبارێکی "سروشتی" ئەنجامی داون، ئەمەش بۆ ئەوەی لە نرخی کارە دەراساکانی سنعەتی ئەو وەستا کارامەیە دابشکێنێت.. ئایا ئەم قسەیەی بە وڕێنە و خورافەت و گومڕایی دوور لە ژێری دانانرێت؟

درەختی سنەوبەر یان هەنجیر و درەختەکانی هاوچەشنیان لەو هەزاران سنعەتە ناوازانەی خوای گەورە کە پڕن لە موعجیزاتی توانستی ئەو، بە هەمان جۆرن.. ئەوەتا دەبینیت ئەو گومڕایانە دەچن دەنکە تۆوی ئەو درەختانە پێش چاو دەخەن و دەڵێن: ئەم درەختە گەورە و بەرزانە لەم تۆوانەوە پەیدا بوون!

هەر بە وێنەی ئەمانە، ئەم ئامێرەش بە هەمان جۆرە، کە هەوای دەوراندەوری گۆی زەویی گۆڕیوە بە مەیدانی دەرس و وتاردان و، سەر ڕووی زەویشی کردووە بە قوتابخانە و فێرگەی وانەکانی خواناسین و.. گەلێ نیعمەتی بێ سنووری لەخۆ گرتووە کە دەبێ شوکرانەی بێ سنووریان لەسەر پێشکەش بکرێت و.. نموونەیەکی خێرای چاکەکاری‌یەکانی خوایە کە لەودنیای هەمیشەییدا بە مرۆڤیان دەبەخشێت و.. بەڵگەیەکی بێ گومان و دیاری‌یەکی میهرەبانیی خواوەندیشە کە ڕاستەوخۆ لە گەنجینەی میهرەبانی‌یەکەیەوە بە مرۆڤ دەبەخشرێت..

جا ناونانی "ڕادیۆ" لەم دیاری‌یە بەخشراوەی خواوەند، هەروەها ناولێنانی "کارەبا" و "شەپۆلەکانی هەوا" - لە ڕاستیدا و بە وێنەی نموونەکەی پێشوو - بریتی‌یە لە دادانەوەی پەردەی کوفرانە و ناشکوری بەسەر ئەم نیعمەتە خواییانەدا کە لە سەدان هەزار تێپەڕ دەبن. تەنانەت گەوجایەتی‌یەکی بێ سنوورە ماددی و گومڕایان تێی کەوتوون، بە ڕادەیەك کە لە ئەنجامدا دەیانگەیەنێتە تاوانێکی نەبڕاوەی ئەوتۆ کە دووچار و شایستەی سزایەکی نەبڕاوەیان دەکات.

بەڵێ برایانم!

ئەمڕۆ بە نیازی هەڵەگیری و پێداچوونەوە، پەیامی "موناجات"ی سەرەتای کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"م خوێندەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی هێزی زەین و بیرم بە تەواوی لاواز بووە، ئەوا لە بەرامبەر ئەو ڕاستی‌یانەی پەیامی موناجاتەوە خۆم وەکو

کەسێك دەبینی کە تازە هاتبێتە دنیاوە، هەرچەندەش تەمەنم خۆی لە هەشتا ساڵ داوە. ئیتر ئەو ڕاهاتن و عادەتە زانراوانە سەبارەت بە من نەبوون بە پەردە لە بەردەم بیر و تێڕامانمدا. بۆیە بە شەوقێکی تەواوەتی‌یەوە ئەو موناجاتەم خوێندەوە و، بە فەزڵی خوای گەورە سوودێکی گەلێ زۆرم لێ وەرگرت و هەستم کرد کە - بە ڕاستی - پەیامێکی دەراسایە و، زانیم کە دوژمنە شارراوەکانمان دەچن لە پشتی پەردەوە هەندێ کارمەندی ڕەسمی دەخەڵەتێنن لە پێناوی دەست بەسەرداگرتنی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دا. بۆ ئەم کارەشیان ئەو باسەی لەمەڕ دەجاڵ دەکەن بە بیانوو کە لە کۆتاییەکەیدایە! بەڵام من لەو قەناعەتەدام کە هۆکەی "پەیامی موناجات" بێت کە لە سەرەتاکەیدایە! بە وێنەی هێرشی مولحیدان بۆ سەر پەیامی "ڕابەری لاوان" لەبەر باسی "سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی (هُوَ)دا"!

سێهەم:

برایانم! بە هەموو گیان و قەوارەی خۆمان مژدەتان دەدەینێ کە: ئیخلاسی تەواوەتی و، وەفای ڕاستەقینە و گەرموگوڕ و، پشتگیریی نەجووڵی نێوان قوتابیانی نوور - پشت بە خوا - هەموو ئەو موسیبەتانەی کە لە ڕووی خزمەتی ئیمانەوە دێنە ڕێمان، دەگۆڕن بە چەندین نیعمەتی گەورە..

بەڵێ، فتوحاتی نوور بە پەنهانی و نادیار بە شێوەیەك گەشە دەکات و فراوان دەبێت کە لە ئەندێشە و حسابی کەسدا نەبووە.

بۆ نموونە:

ئەوان ناچار بوون کە سەد لیرەی وەرەقی بدەن بە کرێی ئەو ئۆتۆمبیلەی لە ئیسپارتەوە منی هێنا بۆ ئەم دادگایەی کە لێرە (ئەستەمبوڵ) ساز کراوە! باوەڕ بکەن - برایانم! - گەر دووسەد لیرەشم لە گیرفانی خۆم تەنها بۆ ئەو ئەنجامانەی خزمەتی ئیمان خەرج بکردایە کە لەم مەسەلەیەوە سەرهەڵدەدەن و تایبەتن بە "ڕابەری لاوان"ەوە، یان تایبەتن بە خودی خۆمەوە، ئەوا هێشتا ئەو بڕە پارە خەرج کراوەم لە بەرامبەر ئەو ئەنجامە مەزنانەوە بە کەم دەزانی، چ جای ئەو ئەنجامانەی کە

پەیوەندییان بە سەرجەمی قوتابیان و، هەموو خەڵکی و، گشت مەسەلە هەمەکییەکانەوە هەیە!

الباقي هو الباقي

برای نەخۆش و ئومێدەواری دوعاکانتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(ڕوانین بۆ بەدیهێنراوانی خوا)

"پەراوێزێکە بۆ پەیامی کلیلی جیهانی نوور".

ڕۆژێکیان لەگەڵ دوو قوتابیی نووری زانکۆدا بە ئۆتۆمبێل لە سەفەرێکدا بووین و لە ڕێی ڕادیۆی ئۆتۆمبیلەکەوە، کە بە هیچ پەیوەندییەکی تەلییەوە پەیوەست نییە، گوێمان لە ئاهەنگی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ دەگرت کە لە شوێنێکی دوور ساز کرابوو. بەو دوو قوتابییەی زانکۆم وت:

بەڵگە لەسەر دەرکەوتنی بەدیهی و بێ پەردەی "توانست"ی خوا لە "ڕووناکی"دا، بە وێنەی دەرکەوتنی "ژیان" و "وجوود"، ئەمەی خوارەوەیە:

ئەو هەوا و ڕووناکییە مەعنەوییە یەکجار کەمەی کە هێندەی سەری نینۆکێك دەبێت و لەم ئامێرە بچووکەدایە، تەنها وشەکانی ئەم مەولوودە نەبەوییە وەرناگرێت و پاشان بیانلێتەوە، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا گوێ لە هەزاران وشە دەگرێت و بە وێنەی بیستنی ئەم مەولوودە نەبەوییە هەموو ئەو وشانەی تریشمان بە ڕوونی بە گوێدا دەدات کە هەزاران ئێستگای جیهان پەخشی دەکەن.

بەو واتایەی کە بچووکترین بوونەوەری "جوزئی" دەبێت بە گەورەترین شتی "کوللی".

واتە ئەم هەوا یەکجار کەمە بە ئەندازەی کارمەندی و ئەرکەکانی هەوای دەوراندەوری گۆی زەوی ئەرك و کار ڕادەپەڕێنێت. واتە بچووکترین شتی "جوزئی" هێندەی گۆی هەوای دەوراندەوری زەوی "گەورە" دەبێت.

جا ئەگەر ئەم کارە بە درەوشانەوەی "توانستی خواوەند" دانەنرێت، ئەوا خورافەتێکی هێندە سەیر سەرهەڵدەدات کە هێندە شتانی دژ بە یەکی تێدا کۆبوونەتەوە جێیان لە هیچ ئەندێشەیەکدا نەبێتەوە! چونکە گۆڕان و هەڵگەڕانەوەی شتێك بۆ دژەکەی خۆی کارێکی مەحاڵە، ئەی ئایا چۆن ئەم شتە جوزئییەی کە بە هەزاران پلە بچووکە، بە هەزاران جار دەبێت بە شتێکی گەورە و کوللی؟

هەروەها چۆن ئەم بێ گیانە دەستەوسانەی کە هەست بە هیچ شتێك ناکات، دەبێت بە خاوەن توانا و هەست و ویست و پەی بردن؟

دیارە ئەمە خورافەتێکە کە سەدان خورافەت و شتانی دژ بە یەکی بێ وێنەی لە خۆدا هەڵگرتووە!

بەو واتایەی کە ئەم کارە - بە ئاشکرا و بەڵگەنەویستی - لە ڕێی تیادەرکەوتنی "توانستی خواوەند"وە ئەنجام دەدرێت. ئەو شتەش کە ئەم درەوشانەوە فراوانە لە هەوادا بە گشتی دەنوێنێت، واتای ئەم فەرموودە پیرۆزە ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێت:

"إنّ لله مَلَكا له أربعون ألف رأس، في كل رأس أربعون ألف لسان، يسبح أربعين ألف تسبيحة بكل لسان"..

بەو واتایەی کە لە یەك چرکەدا شەست و چوار ترلیۆن تەسبیحات دەکات.

واتە ئەو هەوایەی کە دەوراندەوری زەویی داوە، بە وێنەی ئەم مەلائیکەتەیە. بە واتایەکی تر: بە ئەندازەی ژمارەی تەسبیحاتەکانی ئەم مەلائیکەتە وشەی خاوێن و جوان لەسەر لاپەڕەی هەوادا دەنووسێت.

هەوای دەوراندەوری زەوی دەڵێت: ئەم فەرموودە پیرۆزە هەواڵی من و ئەو مەلائیکەتە ڕادەگەیەنێت کە سەرپەرشتیی کارەکانی لە ئەستۆدایە. چونکە لە نێوان هەموو وشەکانی مرۆڤ و دەنگە بێ سنوورەکانی تردا، ئەم وشە خاوێنانە بە هەموو پیتەکانیانەوە و بێ هیچ لێ تێکچوونێك و بە نەبرە و دەنگی جیاوازی قسەکەر، دەڕۆنە ناو گوێکانەوە، هەرچەندەش ئەو وشانە لەگەڵ هەموو دەنگ و وشەکانی

تردا تێکەڵی یەکتری بوون. کەواتە هەرگیز لە توانادا نییە ئەم کارەی کە بە هەست و نەستێکی کامڵ و هەمەکی ئەنجام دەدرێت و ئەرکی سەرشانی تەنها یەك دانە گەردیلەی منە، بدرێتە پاڵ من یان هەر هۆکارێکی ترا

واتە تەنها درەوشانەوەی "توانستی ئەزەلیی خواوەند"ە ئەم کارە ئەنجام دەدات، کە "ویست" و "زانست"ێکی هەمەلایەنگری لەخۆ گرتووە و، درەوشانەوەیەکی گشتییە هەموو شتێك دەگرێتەوە و، بەهۆی درەوشانەوەی "ئەحەدییەت"ی خواوەندیشەوە ئامادە و بینەرە لە هەموو شوێنێکدا.

زیاتر لە ملیۆنەها شایەتیدەرمان لەسەر ئەم ڕاستییە بە دەستەوەیە، کە یەکێك لەوانە "ڕادیۆ"یە.

ناوەرۆکی ئەو بەراوردەی "وتەی دوازدەهەم" کە لە نێوان حیکمەتی قورئان و فەلسەفەی مرۆڤدا ساز کراوە، ئەمەی خوارەوەیە:

ئەو فەلسەفەیەی کە مرۆڤ بەدەستی هێناوە، پەردەی عادەت و ڕاهاتن بەسەر موعجیزاتی توانست و کارە دەراساکانی میهرەبانیی خوای گەورەدا دەداتەوە و، بەڵگەکانی "یەکتایی" و ئەو نیعمەتە مەزنانەش نابینێت کە لە ژێر پەردەی ئەو شتە عادەتییانەدا شارراونەتەوە و، دەریان ناخات و ڕێنمایی خەڵکییان بۆ لا ناکات. لە کاتێکدا کە ئەگەر هەر شتێکی جوزئی و تایبەتی لە دەرەوەی کارە عادەتییەکاندا ببینێت، ڕوویان تێدەکات و بایەخیان پێ دەدات..

بۆ نموونە:

"فەلسەفە" موعجیزاتی توانستی خوای گەورە لە بەدیهێنانی مرۆڤی ڕێکوپێکدا نابینێت و بایەخی پێ نادات، کەچی بە سەرسامی و سەرسوورمانەوە سەرنجی خەڵکی بۆ لای مرۆڤێك کە دوو سەر یان سێ قاچی هەبێ ڕادەکێشێت، کە لە دەرەوەی یاسا گشتییەکەدان! واتە لە ژێر پەردەی عادەتدا موعجیزاتی گشتی و هەمەکیی خوای گەورە دەشارێتەوە و، لە هەمان کاتدا ئەو ماددانەی کە جوزئین و لە ئەرکی سەرشانیان لایان داوە، دەکات بە مایەی پەند لێ وەرگرتن و تێڕامان!

هەروەها - بۆ نموونە - ئەو موعجیزاتانە نابینێت کە لە "ژیاندن"ی منداڵی مرۆڤ و بێچووی زیندەوەراندا هەن، بەڵکو بە کارێکی ئاساییان دادەنێت و بایەخیان پێ نادات. بەڵام بایەخ بە باسی مێروویەك دەدات کە لە بنی دەریادا لە دەستە و تاقمەکەی خۆی بەجێ ماوە و "دەستی یارمەتی"ی ڕۆزیدەر گەڵایەکی سەوزی بە هاناوە ناردووە تا پێی بژی و، ئەم ڕووداوەش فرمێسکی بە چاوی ڕاوچییانی ماسیدا هێناوە و بەسەرسووڕمانەوە لێی دواون! تەنانەت لە کاتی خۆیدا یەکێك لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکاش باسی کردووە.

کەچی هەزاران هەزار موعجیزەی ڕۆزیدانی وەك ئەمە لە بچووکترین زیندەوەردا هەیە، چونکە شلەمەنیی ژیان لە مەمکی دایکانەوە بۆ ئەو وردیلانە هەڵدەقوڵێت. لەگەڵ ئەوەشدا فەلسەفەی مرۆڤ ئەم موعجیزەی چاکەکاری و میهرەبانی‌یەی خواوەند نابینێت هەتا شوکری لەسەر پێشکەش بکات و باوەڕ بە پەروەردگاری میهرەبان بهێنێت تا شوکرانەبژێریی بۆ دەرببڕێت.

بەم جۆرە، حیکمەتی قورئانی پیرۆز ئەو پەردەی عادەت و ڕاهاتنە دەدڕێنێت کە بەسەر ڕووی بوونەوەراندا دراوە و، گرۆی مرۆڤ بەرەو ئەو موعجیزاتە هەمەکی و نیعمەتە گشتی‌یانە ڕێنمایی دەکات کە خوای گەورە بە سەرجەمی بوونەوەرانی بەخشیون. ئیتر لەم ڕێیەوە ئەو بوونەوەرانە پەروەردگاری خۆیان دەناسن و، "حیکمەتی قورئان"یش بەم کارەی خۆی هەموان بەرەو بەندایەتی کردنی هاودەم لەگەڵ شوکرانەدا بۆ خوای گەورە، دەداتە بەر.

کەواتە سەیرترین و نامۆترین هەڵەی فەلسەفەی مرۆڤ لەمەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

ئەم مرۆڤەی کە "ویست" و "جوزئی ئیختیاری"یەکەی خۆی بەشی کارێکی یەکجار ڕواڵەتی و جوزئیی وەك "ئاخاوتن" ناکات و ناتوانێت ئەم کارە بۆ خۆی بەدی بهێنێت، بەڵکو هەر هێندەی لە توانادایە کە هەوا دەکاتە ژوورەوە بۆ ناو شوێنی دەرچوونی پیتەکان و، ئیتر خوای گەورەش لەسەر بناغەی ئەم کەسبە

جوزئی‌یەی بەندەکەی وشەکان بەدی دەهێنێت و هەزاران نوسخەیان لە هەوادا لەبەر دەگرێتەوە..

جا ئەم مرۆڤەی کە تا ئەم ڕادەیە دەستی لە "بەدیهێنان"دا کورت و کۆتایە، بە ناولێنانی "بەدیهێنانی مرۆڤ" لە موعجیزەیەکی هەمەکیی توانستی خواوەند، کە هەموو هۆکارەکانی گەردوون لە ئاستیدا دەستەوسان دەمێنن، کارێکی هێندە هەڵە ئەنجام دەدات کە هەر کەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك هەست و شعووری ببێت پەی بەو هەڵەیە دەبات.

بۆ نموونە:

مرۆڤێکی دەستەوسان، بەهۆی ئیلهامێکی خواییەوە، واتە بە جۆرە گیرابوونێکی دوعای فیعلی و کردار، لە ڕێی دۆزینەوەی ئامێری "ڕادیۆ"وە پاسایەکی خوایی - کە هەزاران کاری دەراسای تێدایە - کردووە بەهۆی سوودگەیاندن بە گرۆی مرۆڤ. جا بزانە کارێکی چەندە هەڵەیە کە مرۆڤ بڵێت: (بەڵێ، ڕادیۆ فلان داهێنەر بەدیی هێناوە.. فلان کەس هێزی کارەبای دروست کردووە.. کەسانی تریش هەن بۆ دروست کردنی ماددەیەك هەوڵ دەدەن کە شتانی ناو مێشکی مرۆڤ بخوێنێتەوە)!

بەڵێ، خوای گەورە جیهانی وەك میوانخانەیەك بەدی هێناوە کە شایانی مرۆڤ بێت و، هەموو پێداویستی‌یەکانیشی تێدا بۆ ئامادە کردووە. ئنجا وەك جۆرە خواستێکی ئەم میوانداری‌یە، لە هەندێ سەردەم و ڕۆژگاردا و لە ئەنجامی دوعای فیعلی و کردەوەی مرۆڤەوە کە بریتی‌یە لە: توێژینەوە و گەڕانی یەك لە دوای یەکی بیرەکانی مرۆڤ بە دوای ڕاستی‌یەکاندا، هەندێ نیعمەتی پێ دەبەخشێت کە پێشتر سەبارەت بەو پەنهان بوون.

جا لە کاتێکدا کە پێویست بوو مرۆڤ بەرامبەر بەم نیعمەتانە سوپاسی پێشکەش بە پەروەردگاری خۆی بکردایە، کەچی خۆی دووچاری کوفران و ناشکوری‌یەکی گەورە دەکات و لە بیری دەچێت کە ئەم نیعمەتەی لە لایەن

خواوەندەوە پێ بەخشراوە و، بە جۆرێك بۆی دەڕوانێت كە بەدیهاتووی مرۆڤێكی ئاسایی و دەستەوسانی وەك خۆی بێت و، دەیداتە پاڵ كارامەیی ئەو كەسە! تەنانەت لە بیری كەسانی تریشیان دەباتەوە كە ئەو نیعمەتانە چەند كارێكی دەراسای چاكەكاریەكی گشتین و، بە "زانست" و "ویست" و "میهرەبانی" و "هەست و شعوور"ەوە بە مرۆڤ بەخشراون، چونكە تەنها هۆكار و دیمەنێكی ئەو چاكەكاریە دەبینێت و، ئەو كارەش بە "ڕێكەوت"ی هەڕەمەكی و "سروشت" و "مادده بێ گیانەكان" دەسپێرێت!

دیارە ئەم كارەش دەرگای نەزانی و نەفامیی ڕەهای لێ دەخاتە سەرپشت كە هەرگیز بۆ ئەم مرۆڤە ڕێزلێ گیراوە ناشێت كە لە جوانترین نرخ و ڕێزدا بەدی هێنراوە.

لەبەر ئەوە، دەبێ بە ڕوانینی "حەرفی" نەك "ئیسمی" و بەپێی دەستووری:

وفي كلّ شيءٍ له آية     تدلّ على أنّه واحد

سەیری بوونەوەران بكرێت، تاكو مرۆڤ بە جۆرێكی ڕاستەقینە بەرەو پلە و ئاستی شایستەی ئادەمیزاد بەرز ببێتەوە!

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

* * *

(شیكردنەوەی مێژووی ژیانی دانەر)

باسمه سبحانه

برایانی صیددیق و ئازیزم!

یەكەم:

پیرۆزبایی یادی مەولوودی نەبەویی پیرۆز و سەركەوتنتان لە كارەكانتاندا لێ دەكەین و، مژدەی بڵاوبوونەوەی پەیامەكانی نوورتان لە ناوەندەكاندا بە شێوەیەكی كاریگەر و چاوەڕوان نەكراو دەدەینێ و، بەم بۆنەیەوە پیرۆزبایی ئاراستەی هەموو قوتابیانی نوور دەكەین.

دووهەم:

لەم شەوە پیرۆزەدا خاتیرەیەکی بەهێز هاتە دڵمەوە، کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

بە بۆنەی نووسینی ئەو کارە دەراسا(خوارق)یانەی ژیانی سەعیدی کۆن و نوێ کە قوتابیانی زانکۆی ئەستەمبووڵ لە "مێژووی ژیان"مدا نووسیویانە، دوو دانە ڕا و بیر و بۆچوون لە لای خوێنەران سەریان هەڵداوە:

*یەکەمیان:*

باوەڕباشی‌یەکی وەك هی ویلایەت و زۆر لە سەرووی توانا و سنووری خۆمەوە بۆ "هاوڕێیانمان" دروست بوو.

*دووهەمیان:*

گومان و دوودڵی‌یەکیش، کە هەزار جار لە توانای من بەدەرە، لەلای "نەیاران" و "ئەهلی فەلسەفە" پەیدا بوو. چونکە پێیان وابوو کە زیرەکی و دەهائێکی یەکجار دەراسا لە مندا بێت. تەنانەت هەندێکیان کەوتنە وەهمی ئەوەی کە سیحرێکی یەکجار بەهێز لە ئارادا بێت!

لە گەلێ شوێندا چەند پرسیارێکم بەم واتایانەی پێشوو ئاراستە کرا و، داوایان لێ کردم کە بە شێوەیەکی ماددی و مەعنەوی مەسەلەکە ڕوون بکەمەوە.

وا منیش لە لایەنی خۆمەوە ناچار بووم، لەبەر ئەو خاتیرەیەی کە ئەمشەو هاتە دڵمەوە، حەقیقەتێك ڕوون بکەمەوە کە گەلێ پێشەکیی هەیە.

پێشەکیی یەکەم:

تۆوی درەختی سنەوبەر، کە قەبارەکەی بە ئەندازەی دەنکە گەنمێکە، دەبێت بەهۆی پەیدا بوونی درەختێکی گەورەی سنەوبەر. واتە توانستی خوای گەورە ئەو درەختە سەرسووڕهێنەرە لەو تۆوە بەدی دەهێنێت..

لەوانەشە ئەو تۆوە جگە لە ڕێژەی یەك لە ملیۆن هیچ بەشێکی تری لەو بەدیهێنانەدا نەبێت، چونکە قەڵەمی توانستی خوایی پێرستێکی مەعنەویی ئەو درەختەی لەو تۆوەدا تۆمار کردووە.

جا ئەگەر ئەم کارە هی توانستی خوای گەورە نەبێت، دەبێ پڕ بە شارێکی گەورە کارگەی زۆر و زەبەندە بۆ بەدیهێنانی ئەو درەختە هەبێت، تاکو ئەو درەختە سنەوبەرە بە لق و پەلەکانیەوە دروست بێت!

بەم جۆرە، یەکێك لە بەڵگەکانی مەزنی و توانستی خوای گەورە لەوەدایە کە لە شتێکی یەکجار بچووکی وەك "تۆو" گەلێ شتی مەزنی بە ئەندازەی چیاکان بەدی دەهێنێت.

جا بە وێنەی ئەم نموونەیە، وا من بە نیازێکی خاوێن و قەناعەتێکی تەواوی ئەوتۆ کە هیچ خۆنەویستی و تەوازوعێکی دەستکردی تێدا نی‌یە، ڕایدەگەیەنم کە:
خزمەتگوزاری‌یەکانم و ڕووداوەکانی ژیانم لە حوکمی "تۆو"ێکدان تاکو ببن بە سەرەتا و بنەمای خزمەتێکی ئیمانیی مەزن. ئەوەتا چاودێریی خوای گەورە لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا درەختێکی بەرداری بە "پەیامەکانی نوور" - کە لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە - لەو تۆوە پێگەیاندووە و بەخشیوە.
جا بۆ ئەوەی دڵنیا بن، سوێندتان بۆ دەخۆم و دەڵێم:
هەرگیز من هیچ توانا و تایبەتکاری‌یەکم لە خۆمدا شك نەدەبرد بۆ ئەو کارە دەراسایانەی کە بەسەر ژیانمدا هاتن. بۆیە هەرکاتێ بیرم لێ دەکردنەوە و، بۆ توانا و لێهاتنەکانی خۆمم دەڕوانی تووشی سەرسووڕمان دەبووم، تەنانەت هیچ لێهاتنێکیشم لە خۆمدا نەدەبینی بۆ بەڕێکردنی کاروبارەکانی ژیانی خۆم و پەیوەندی‌یەکانم بە کۆمەڵەوە، چ جای ئەوەی خاوەنی دەهاء و زیرەکی و ویلایەتی نائاسایی بم!

بەڵێ، چەند حاڵەتێك لە منەوە دەرکەوتن کە سەرنجی خەڵکی‌یان بۆ لا ڕاکێشام، بەڵام هەر هەموویان لە دەرەوەی ویست و ئیختیاری مندا بوون، کەچی بە چەشنێك پێش چاو دەکەوتن کە وەك بڵێی جۆرێك بن لە ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك بۆ لای من. لە ڕاستیشدا لەو ڕووەوە بوون کە ئەو گومانە باشەی خەڵکی بەرامبەر بە من هەیان بوو، بە درۆ نەخرێتەوە.

جا لەبەر ئەوەی حیکمەتی ئەوەم نەدەزانی کە بۆچی من لە ڕاستیدا بەو جۆرە نیم کە خەڵکی بە گومانی باشی خۆیان بۆم دەڕوانن و، بۆچی من هیچ سوودێکم بۆ دنیا نی‌یە و، کەچی خەڵکیش ڕوویان تێکردووم و هەزار و یەك ئەوەندەی پلەی خۆم بەرزتر بۆم دەڕوانن.. لەبەر ئەوە، هەمیشە ئەم کارەم بە پێچەوانەی تەواوەتیی حەقیقەتەوە دادەنا!

بەڵام هەزار شوکر و سوپاس بۆ ئەو خواوەندە گەورەیەی کە بە چاکە و بەخششی خۆی لە ڕۆژگارانی کۆتایی ژیانم و دوای بەسەرچوونی نزیکەی هەشتاساڵی تەمەنم، شتێکی لە حیکمەتی ئەم کارە تێگەیاندم!

وا ئاماژە بۆ کەمێك لەو حیکمەتە دەکەم و، بەشێك لە نموونە زۆرەکانی ڕوون دەکەمەوە:

*نموونەی یەکەم:*

بەپێی ڕێ و ڕەسمی قوتابخانە ئایینی‌یەکان، دەبێ مرۆڤ لانی کەم ماوەی پازدە ساڵ زانستە شەرعی‌یەکان بخوێنێت، تاکو ڕاستی‌یەکانی ئایین و زانستە ئیسلامی‌یەکان بەدەست بهێنێت و فێریان ببێت.

جا لەو کاتانەدا، نەك هەر تەنها زیرەکی‌یەکی نائاسایی و هێزێکی مەعنەوی، بەڵکو جگە لەوە حاڵەتێکی سەرسووڕهێنەریش لە سەعیدەوە دەرکەوت و سەری هەڵدا، کە لە دەرەوەی بازنەی گشت توانا و لێهاتنەکانیەوە بوو. چونکە تەنها دوای چاوگێڕانی بە ناو بابەتە سەرەتاییەکانی صەرف و نەحوو لە ماوەی یەك دوو ساڵێکدا، ئەو حاڵەتە سەرسووڕهێنەرە سەری هەڵدا، وەك بڵێی لە ماوەی سێ مانگدا نزیکەی پەنجا کتێبی خوێندبێت! ئەوەبوو لەو ماوەیەدا لە هەموویان تێگەیشت و ئیجازە و بەڵگەنامەی تەواوکردنیانی بەدەست هێنا!

جا ئەم حاڵەتە، دوای شەست ساڵ لە ڕوودانی، دەری خست کە: تەفسیرێك بۆ قورئانی پیرۆز پەیدا دەبێت و لە ماوەیەکی کەمی ئەوتۆدا کە لە چوار مانگ تێپەڕ ناکات هەموو زانستە ئیمانی‌یەکان دەستی خوێنەری دەخات و، ئەو "سەعید"ە لاوازەش کارمەند و خزمەتگوزاری ئەو تەفسیرە دەبێت.

هەر لە دەماودەمی ئەو بارودۆخـەدا چـەند واتایـەك بـە دلـدا دەهـاتن، وەك بلێـی ئاماژەی غەیبی بن بۆ ئەوەی کـە: ڕۆژگـارێك دێتـە پێشـەوە قوتابخانـە ئایینی‌یـەکانی تێدا دەپووکێنەوە و، ئیتر ناتوانرێت نە لە پازدە سـاڵ و نـە لـە یـەك سالیشـدا زانسـتە ئیسلامی‌یەکان دەست بخرێن.

*نموونەی دووهەم:*

گفتوگۆ و مونازەرەی ڕۆژگارانی دێرینی "سەعید" کە هێشتا منـاڵ بـوو لـەگـەڵ زانـا بـەڕێز و پایەبـەرزەکاندا.. هـەروەها وەڵامدانـەوەی ڕاسـت و دروسـتی بـۆ پرسـیارەکانیان، بـێ ئـەوەی خـۆی هیـچ پرسـیارێك ئاراسـتەی ئـەوان بکـات، هەرچەندەش پرسیارەکانیان لە قورسترین بابەت و مەسەلەدا هەڵبژێررابوون..

ئەم حاڵەتەی کە ئەوسا بە منەوە بینرا، پڕ بە دەم دەڵێم و دان بەوەدا دەنێم کە هی ئەوە نەبوو خاوەنی زیرەکی‌یەکی لەڕادەبـەدەر یـان توانـا و لێـهاتنێکی نائاسـایی بم. نەخێر هی ئەوە نەبوو، چونکە من ئەو کاتە هێشتا منالێکی بچووك و گیرۆدەی زۆر دەردیسەری بووم و، تازە دەستم دابووە خوێندن و، بیرم پەرتەوازە و خۆیشم مایەی وروژاندنی موناقەشەی خەلکی بووم.

کەواتـە مـن هـەرگیز ئـەوەم لـە توانـادا نـەبوو کـە وەڵامـی پرسـیاری زانـا پایـە بەرزەکان بدەمەوە، چونکە من هەر لەو کاتانـەدا هـەندێ جـار لـە موناقەشـەی زانـا بچووکـەکان و قوتابیـانی بچووکـی زانسـتدا شکسـتم دەهێنـا و بەسـەرمدا سەردەکەوتن!

لەبەر ئەوە، قەناعەتی تەواوم هەیە بەوەی کە وەڵامە ڕاسـت و دروسـتەکانی ئەو کاتەم هی توانا و لێهاتنم و، لە زیرەکیی خۆمەوە نەبوون..

خۆیشم ماوەی حەفتا ساڵی ڕەبەق سەرم لـەم دیاردەیـە سـووڕ مـابوو. بـەڵام وا ئێسـتا - بـە فـەزڵ و بەخشـندەیی خـوای گـەورە - یـەکێك لـە حیکمەتـەکانی ئـەو دیاردەیە تێگەیشتم.

ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

ئەو زانستانەی کە لەناو قوتابخانە ئایینی‌یـەکاندا دەخوێندرێـن - کـە وەك تـۆوی ئـەو زانسـتانەن - درەختێکی بـەرداریان لـێ پێ دەگـات و، خزمـەتگوزاری ئـەو درەختەش گەلێ حەسوود و نەیاری دەبێت..

جا هەروەك لە سەردەمەکانی پێشوودا "ئەهلی سوننەت" و "موعتەزیلە" لە دژی یەکتر دەدوان و بـۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕا و بۆچوونـەکانی یـەکتری و سـەرکەوتنیان بەسەر ئەوی تردا کتێبیان دادەنا.. دەبوو - بـەو پێیـە - خـاوەن مەشـرەب و ڕێبـازە جیاجیاکانی موسـڵمانانی ئەم سـەردەمەش ڕەخنەیان لە خزمەتگوزاری ئەو درەختە - درەختی نوور - بگرتایە، بە تایبـەت زانایـانی ئـایین، کـە چ لەبـەر مونافەسـە و چ بەهۆی جیاوازیی مەشرەب و چ لەبەر ئـەوەی کـە "پەیامـەکانی نـوور" گەلـێ جـار دەماریان دەورووژێنێت، چاوەڕوان دەکرا ڕەخنەیان ئاراستە بکردایە..

جا لـە کـاتێکدا کـە دەبوو ئەمـە ڕووی بدایە.. کـەچی خـوای گـەورە ویسـتی لەسەر ئەوە بوو کە بە پێچەوانەی ئەم عادەتە دێرینەیە ئەم کارە بەڕێ بکات!

کەواتە هەزار و یەك جار شوکر و سوپاس بۆ خوای گـەورە لەسـەر ئـەم نیعمەتـە مەزنەی کە بە فەزڵی خۆی بەخشیی.

ئێستا من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە هۆی نەنووسینی هیچ کتێبێـك لـە لایـەنی زانایانەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە "پەیامەکانی نوور"، وەڵامدانەوە ڕاست و دروستەکانی ئەوسای "سەعیدە بچکۆلە"یـە بـۆ زانـا مەزنـەکانی سـەردەمی زوو! چونکـە وەڵامـە ڕاست و تەواوەکانی ئـەو کاتـەی سـەعید غـیرەت و ئازایـەتیی زانایـانی ئێسـتای بـە ئەندازەیەك خاو کردەوە کە خۆیان لە قەرەی پەیامەکانی نـوور نـەدا و ڕووبـەڕووی نەبوونەوە! هەرچەندەش مەشرەبیان لەگەڵ هی پەیامەکانی نووردا جیایـە و، گیـانی مونافەسە و غیرەتی زانستیشیان لە خۆدا هەڵگرتووە!

لەبەر ئەوە، من لەو قەناعەتە تەواوەدام کە ئەمە یەکێکە لە حیکمەتەکانی ئـەوەی زانایـان ڕەخنـەیان لـە پەیامـەکانی نـوور نـەگرت. چونکـە ئەگـەر ڕەخنـەیان لـێ بگرتایـە، ئـەوا دوژمنـە پەنهانـەکانمان و موڵحیـدان و شـوێنکەوتووانیان ڕەخنەکـەی ئەوانیان دەقۆزتەوە و، بـە وێنـەی بەڵگـە و بەهانەیـەکی یـەکجار گرنـگ دەیـانگرت

بەدەستەوە و، ئنجا بۆ شکاندنی شان و شکۆی "پەیامەکان" و "زانایان"یش پێکەوە بەکاریان دەهێنا!

کەواتە سوپاسی نەبڕاوە و بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە، کە تەنانەت لە لایەن ئەو زانا ڕەسمی‌یانەشەوە کە پەیامەکان گەلێ جار قسەی بەجێی تێ سرەواندوون، هیچ بەرەنگاری و ڕەخنەیەك ئاراستەی "پەیامەکانی نوور" نەکران!

نموونەی سێ‌هەم:

هەرچەندە "سەعیدی کۆن" هەر لە ڕۆژگارانی منالی‌یەوە فەقیر حاڵ و باوکیشی دەستکورت و هەژار بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سەدەقە و دیاریی لە خەڵکی وەرنەدەگرت. تەنانەت هەر نەیدەتوانی وەری بگرێت، مەگەر لە بەرامبەر شتێکەوە، هەرچەندەش لەو کاتانەدا تابڵێی موحتاج بوو.. هەروەها هیچ کاتێك "سەعید" نەدەڕۆشت بۆ وەرگرتنی "ئازووقە" یان - پێی بزانێت - "زەکات"ی لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە، بە وێنەی داب و عادەتی ئەوسای کوردستان کە ئازووقەی قوتابیان لە لایەن خەڵکەکەوە دەدرا و خەرجیشیان لە زەکاتی ئەوان دابین دەکرا..

جا ئێستا قەناعەتێکی تەواوم هەیە بەوەی کە حیکمەتی ئەم دیاردەیەی ژیانی "سەعیدی کۆن" بریتی‌یە لەوەی کە:

لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنمدا "پەیامەکانی نوور" - کە خزمەتێکی بەرز و بڵند و بێگەردن بۆ ئیمان و ئاخیرەت - نەکەم بە هۆکار و پلیکانەیەك بۆ دەستکەوتەکانی دنیا و بیانوویەك بۆ دەستخستنی بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکان!

لەبەر ئەم حیکمەتیە کە ئەم حاڵەتەم پێ بەخشرا، کە حاڵەتی نەفرەت و دوورەپەرێزیمە لەو ڕەفتارە بێ زیانە و دەست نەگرتنەوەیە لە خەڵکی. ئەوەبوو من بە ڕۆزیی مایەی بژێو و فەقیری و هەژاریی سەخت و گوزەرانی کولەمەرگی ڕازی بووم، تاکو ئەو ئیخلاسە ڕاستەقینەیە نەشێوێت کە هێزی ڕاستەقینەی پەیامەکانی نوورە!

هەروەها هەست دەکەم کە ئەم کارە ئاماژەیەکی پڕ واتای وەك ئەمەی خوارەوەشی تێدایە:

هەر ئەم موحتاجی‌یەیە کە زانایان ناچار دەکات نوقمی خەمی ژیـان و گـوزەران بن، تا لە ئەنجامدا وایان لـێ دێت دەستەڵاتیان بەسەر خۆیاندا نامێنێت و ژێردەستی ئەم و ئەو دەبن!

نموونەی چوارەم:

لەو کاتەدا کە "سەعیدی نوێ" لە ڕۆژگارانی پیریی خۆیدا هەوڵی ئەوە دەدات بە تەواوی خۆی لـە سیاسـەت و کاروبـاری دنیـا دوورە پەرێز بگرێـت، کـەچی بـە پێچەوانەی هـەموو یاسـا و نـەریت و ویژدانێـك و تەنانـەت بە پێچەوانـەی ڕەفتـاری مرۆیی‌شەوە، ئەهلی دنیا بە درێژایی بیست و هەشت ساڵی ڕەبـەق، تونـد و تیژتریـن جۆرە چەپەڵەکانی ستەمیان لەگەڵدا نواند..

لـە ئەنجامی ئەمەشـدا ئـەو سـەعیدە لاوازەی کــە پێشــتر ئـازاری مێشـێکی پـێ هەڵنەدەگیرا، تاڵترین ئازار و سەخت‌ترین دەردیسـەریی ئەوانی بـەو ئارامە مـەزن و خۆڕاگریی‌یـە بـێ وێنەیـە قبـووڵ کـرد کـە خـوای گـەورە لــە بەرامبـەر ئـازاری سووکایەتی‌یە نابەجێکانی ئەوان پێی بەخشیبوو..

خۆ هەرچـەندە خـاوەنی مـیزاجێکی تـووڕە و هەسـتێکی ناسـکە و، هـەر بـە سروشـت ترسـی تێدا نی‌یـە و، ئیمانیشـی بە حەقیقـەتی ئـەوەی کـە (ئەجـەل هـەر یەکێکـە و نـاگۆڕێـت) جورئـەتێکی لەڕادەبەدەری داوەتێ.. کـەچی ئـارامی و بـێ دەنگی‌یەکی لە بەرامبـەر ئـەو هـەموو ئازارانـەوە نوانـد کـە ئەوپەڕی مایـەی تـرس و بیمن! تەنانەت دوای چەشتنی ئـەو هـەموو جۆرە ئـازار و سـووکایەتی پـێ کردنانـە خۆشحاڵی و شادمانی بە ڕۆحی بەخشران!

جا حیکمـەتێکی ئەم دیاردەیە وەك خـۆم قەناعـەتی تـەواوم پـێ کـردووە، بریتی‌یـە لەوەی:

پەیامەکانی نوور - کە تەفسیری ڕاسـتی‌یە ئیمانی‌یـەکانی قورئـانی پیرۆزن - بـۆ هیـچ شتێکی تـری جگـە لـە ڕەزامـەندیی خـوای گـەورە بـەکار نـەهێنرێن! چونکـە "ئـەهلی سیاسـەت" شـوبهەی ئـەوەیان بـڵاو کـردەوە کـە گوایـا "سـەعید" ئـایین لـە پێنـاوی سیاسـەتدا بـەکار دەهێنێـت و، ئیـتر بـۆ ئـەوەی ئـایین نـەکرێت بـە ئـامڕازی

سیاسەت سەعید بەند کرا و ئازار درا! بەڵام "قەدەری خوای گەورە" لە ژێر پەردەی ئەو فەرمانە ستەمکارانەیەی ئەهلی سیاسەتدا چەند زلله‌یەکی سۆز و میهرەبانیی لە "سەعید" وەشاند، تاکو ئەو "ئیخلاس"ە تێك نەدات کە لە پەیامەکانی نوورەوە بەدەستی هێناوە و، پێی وت:

"نەکەی پەیامەکانی نوور - کە تەفسیری ڕاستی‌یەکانی ئیمانن - بکەیت بە هۆکارێك بۆ دەستخستنی سوودە کەسی‌یەکانی خۆت، تەنانەت بۆ کەماڵاتە مەعنەوی‌یەکانیشت.. هەروەها وریابە! ئەو پەیامانە نەکەیت بە بیانوویەك بۆ خۆدەربازکردن لە بەڵا و ئازار و زیانەکان، تاکو ئەو ئیخلاسە ڕاستەقینەیەی کە هێزی گەورەی پەیامەکانی نوورە لە هەموو کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەك پارێزراو بێت".

جا ئێستا من قەناعەتی تەواوم بەوە هەیە کە ئەو زلله‌نە چەند زلله‌یەکی میهرەبانی بوون لە لایەن قەدەری خواوەندەوە ئاراستەم کران. بەڵکو بە تەواوی دڵنیا بووم لەوەی کە هەرکات بە تەنها بۆ کاروباری دواڕۆژی خۆم لێ ببڕێم و، تەنها سەرقاڵی پەرستشە تایبەتی‌یەکانی خۆم بیم و، واز لە خزمەتگوزاری‌یەکانم بۆ پەیامەکانی نوور بهێنم، یەکسەر - لەم کاتەدا - ئەهلی دنیا خۆیانم بەسەردا زاڵ دەکەن و ئازار و ئەشکەنجەم دەدەن!

ڕوونکردنەوەی ئەم نموونەی چوارەمە بە دوا نامەم دەسپێرم کە بە ناونیشانی: (هەر تەنها حەقیقەتە کە دەدوێت) و تایبەتە بە ڕوونکردنەوەی هۆی ئەوەی کە ئەهلی سیاسەت لەبەر ئەوە "سەعید" دەخەنە بەندیخانەکانەوە تاکو نەهێڵن ئایین بۆ کاروباری سیاسەت بقۆزێتەوە و، سەعیدیش حیکمەتی ئەم کارە تێگەیشتووە کە بریتی‌یە لە چەند زلله‌یەکی میهرەبانانەی "قەدەری خوای گەورە" و، ئیتر دوای ئەوە چاوپۆشیی لەوان کردووە و، لە حیکمەتی ئەو ئارامگرتن و خۆڕاگری‌یە لەڕادەبەدەرەش تێگەیشتووە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە.

نموونەی پێنجەم:

ئەم سەعیدە هەژارە هەرچەند پێویستی‌یەکی لەڕادەبەدەری بە نووسین و خەت خۆشی هەبوو، چونکە وا ماوەی حەفتا ساڵە بەو کارەوە سەرقاڵە و هەندێ جار

ناچارە ڕۆژانە دووسەد لاپەڕە بخوێنێتەوە و هەڵەکانیان ڕاست بکاتەوە.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێندە شارەزای نووسین و خەت نییە کە مناڵێکی زیرەکی دە ساڵی لە ماوەی دە ڕۆژدا فێری دەبێت!

ئەم کارە - لە ڕاستیدا - جێی سەرسووڕمانە! چونکە سەعید بە تەواوی لە توانا و لێهاتنەکان بێ بەهرە نەبوو. جگە لەوەش، براکانی هەموویان خەتیان خۆشە و بە باشی و جوانی دەنووسن.

وا ئێستا قەناعەتێکی تەواوم پەیدا کردووە بەوەی کە حیکمەتی مانەوەم بە "نیمچە خوێندەوار" - لەبەر خەت ناخۆشیم - لەم ماوە دوور و درێژەی تەمەنمدا، سەرباری ئەو هەموو پێویستییەشم بە نووسین و خەت خۆشی، ئەوەیە کە:

ڕۆژگار و زەمانێك دێتە پێش کە هێز و توانا و بەهرە کەسی و جوزئییەکان ناتوانن بەرەنگاری هێرشی دوژمنە سامناکەکان ببنەوە، لەو ڕۆژگارەدا "سەعید" بەوپەڕی گەرموگوڕی بە دوای کەسانێکدا دەگەڕێت کە بەهرەی خەت خۆشییان هەبێت، تاکو لەگەڵ خۆی لە خزمەتێکی گشتی و هەمەکی و بەهێزدا بەشداریان بکات و، پێکەوە هەزاران پێنووس پێك بهێنن کە ئەو خزمەتە کەسی و جوزئییە بگۆڕن بە خزمەتێکی هەمەکی و گشتی و بەهێز. چونکە هەموویان - بە وێنەی کۆبوونەوەی هەوا و ڕووناکی و ئاو - لە دەوری ئەو "تۆو"ە کۆدەبنەوە و یارمەتیی ئەو درەختە مەعنەوییە دەدەن.

ئنجا جگە لەم حیکمەتە، حیکمەتێکی تر لەم کارەدا هەیە و مرۆڤ بەرەو خزمەتی ئیمان دەداتەبەر، ئەویش بریتییە لە: تواندنەوەی خۆویستییەکەی لەناو حەوزی بەپیت و پیرۆزی کۆمەڵدا، بە وێنەی تواندنەوەی قاڵبی سەهۆڵ لەناو ئاودا. تاکو ئیخلاسی ڕاستەقینە و بێگەرد بەدەست بهێنێت.

ئەمەش حیکمەتێکی ترە و بۆ خزمەتی ئیمان دەمانداتە بەر.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(پەیامەکانی نوور هیچ تاوان و گوناهێکیان تێدا نی‌یە)

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

یەکەم:

لە ناخی گیان و قووڵایی دڵمانەوە پیرۆزبایی هاتنی جەژنتان لێ دەکەین و، بە پشتیوانیی خوای گەورە ڕۆژێك دێت کە جەژنێك دەبینن سەرجەمی جیهانی ئیسلامی دەگرێتەوە. چونکە گەلێ نیشانە هەن دەری دەخەن کە ئەو قورئانە پیرۆزەی سەرچاوەی هەموو یاسا بەرزەکانی جەماوەری یەکگرتووی ئیسلامە، لە ئایندەدا زاڵ و دەستەڵاتدار دەبێت و، پشت بە خوا ئەو ڕۆژە دێتە پێشەوە کە جەژنی ڕاستەقینەی هەموو موسڵمانان و سەرجەمی مرۆڤایەتی‌یە.

دووهەم:

گومان لەوەدا نی‌یە کە پەیام و قوتابیانی نوور لە ژێر چاودێری و پارێزگاریی خوای گەورەدان. چونکە دوژمنان سەرباری بارودۆخی وردی ئەم قۆناغە و سەرەڕای یاسا هەرەمەکی‌یەکانیان و سەرسەختیی لەڕادەبەدەریان و لە درێژایی ئەم ماوە دوور و درێژەدا، مەگەر بە ڕێژەی لە سەدا یەك، دەنا نەیانتوانیوە زیان بە قوتابیانی نوور بگەیەنن.

ئەوەتا سەرەڕای پلانە ترسناکەکانیان بۆ سەرقاڵ کردنی شەش سەد قوتابیی چالاکی نوور بە دادگا یەك لە دوای یەکەکانەوە، توانایان تەنها بەسەر شەش قوتابیدا شکا! تەنانەت - وەك پاڵەوانەکەی نوور باسی کرد - بە درێژایی ماوەی لێکۆڵینەوە یەك لە دوای یەکەکانی بیست و پێنج دادگا هیچ شتێکی نایاساییان لە هەزاران پەیامی نوور و هەزاران قوتابیی نووردا نەدۆزی‌یەوە! بەڵگەی بێ گومانیش لەسەر ئەم دەرەنجامە ئاشکرایە وتەی زۆر لە "فەرمانگەکانی داد"ە کە وتوویانە: پەیامەکانی نوور هیچ تاوانێکیان لە ئەستۆدا نی‌یە و شتێکی بێ یاساییان تێدا شك نابەین.

ئەمە جگە لەوەی کە من لە دادگای ئەستەمبووڵ و ئافیوون و دادگاکانی تری هاوچەشنیاندا بە پێچەوانەی یاساکانیان - کە دەگونجێت بۆ ئامانجی خراپ بەکار بهێنرێن - قسەم کرد و، نەشیان توانی تاوانبارم بکەن.

سەرەڕای ئەمانەش، دادگاکان نەیانتوانی هیچ تاوان و گوناهێك لە پەیامەکانی نووردا بدۆزنەوە کە هەموو یاسا ستەمکارەکانی شارستانێتیی ئەورووپایان هەڵوەشاندووەتەوە.

هەموو ئەمانە بە ئاشکرا دەری دەخەن کە: ڕاستییەکانی پەیامەکانی نوور بەهۆی سەرکەوتنیان بەسەر نەیارەکانیاندا فەرمانگەکانی دادیان هێناوەتە سەر بەکارهێنانی ویژدان. کەواتە چاودێریی خوای گەورە پەیامەکانی نووری لە ژێر باڵەکانی خۆیدا هەڵگرتووە و پەنای داوە. ئەمەشت بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە ئەم پەیامانە یەکێکن لە موعجیزاتی قورئانی پیرۆز. سەبارەت بە هێرشی نەیار و کەسانی دژ بەو پەیامانەش لەسەر پەیامەکان، ئەوا پشت بە خوا دەبێت بەهۆیەك بۆ پتر تیشکدانەوەی پەیامەکان و بڵاوبوونەوەیان!

* * *

(لەگەڵ ئەفسەرانی ئاسایشدا)

مامۆستامان دەڵێت:

(لە ماوەی بیست و هەشت ساڵدا چاوم بە هەر بەرپرسێکی حکوومەت کەوتبێت ئازاری داوم، جگە لە "ئەفسەرانی ئاسایش" کە هەرگیز تەنگیان پێ هەڵنەچنیوم و دڵگرانیان نەکردووم، سەرەڕای ئەوەی کە هەندێکیشیان بە وێنەی "پارێزەر" ڕەفتاریان نواندووە و بەرگرییان لێ کردووم. وا ئێستا حیکمەتی ئەو ڕەفتارەی ئەوان ڕوون دەکەمەوە:

بە دڵنیاییەوە دەرکەوتووە و سەلماوە کە پەیام و قوتابیانی نوور چەند ئەفرادێکی مەعنەویی ئاسایشن و بە بیروباوەڕەوە پارێزگاری لە ئاسایش و ڕێسای وڵات دەکەن و، لە ڕێی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانیانەوە پاسەوانێکیان لە دڵی هەموو ئیمانداریکدا داناوە. ئەفسەرانی ئاسایش بە چەشنێکی مەعنەوی هەستیان بەمە کردووە، بۆیە لە هەموو کاتێکدا ڕووی هاوڕێیەتییان بۆ ئێمە دەرخستووە.

نهێنیی ئەم ڕاستییەش بریتییە لەمەی خوارەوە:

یەکێ لە یاسا بنەڕەتی‌یەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرى﴾ (فاطر:١٨). قورئان بەپێی ئەم یاسایە ڕێ لە هەوڵی تێکدانی ڕێسا و ئاسایش دەگرێت، تاکو لە دەمی لەناوبردنی "دە" تاوانباردا زیان بە لە سەدا "نەوەد"ەکەی تری خەڵکی نەگات..

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە وردە: هەرچەند گەلێ هێزی مەعنەویی ترسناك هەن هەوڵی تێکدانی ڕێسا و ئاسایش دەدەن و لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا چالاکی دەنوێنن، تەنانەت چالاکی‌یەکانیان لێرە زۆر زیاترە لە هی فەرەنسا و میسر و مەغریب و ئێران، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی ئاسایش لێرە تێك بدەن! هۆکاری ئەمەش تەنها شەش سەد هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور و پێنج سەد هەزار قوتابیی نوورە کە هێزێکی مەعنەویی پشتگیر بۆ هێزی ئاسایش پێکدەهێنن، تاکو بەرەنگاری ئەو هێزە ڕووخێنەر و ترسناکانە ببنەوە.

جا ئەفسەرانی ئاسایش هەستیان بەمە کردووە، بۆیە چەند حاڵەتێك دەنوێنن کە سۆز و ویژدان و میهرەبانی‌یان سەبارەت بە "پەیامەکانی نوور" تێدایە. بە پێچەوانەی کارمەندە ڕەسمی‌یەکانی تر لە ماوەی ئەم بیست و هەشت ساڵەدا).

هەروەها مامۆستامان دەڵێت:

(دەبێ یەك بە یەکی کەسانی ئاسایش لە زانایانی ئەهلی تەسەووف زۆر زیاتر خاوەنی تەقوا و ئایین بن و، فەرزەکانیان جێبەجێ بکەن و، خۆیان لە گوناه و تاوان بپارێزن. چونکە، لەبەر پێویستیی لەڕادەبەدەر، ئەرکەکەی سەرشانیان ئەمەیان لێ دەخوازێت، تاکو بتوانن لە بەرامبەر ئەو کاولکاری‌یە سامناکەی کە ڕووخێنەرە مەعنەوی‌یەکان ئەنجامی دەدەن و لە پێناوی ڕاگیر کردنی ڕێسا و ئاسایشدا، ئەرکەکانی سەرشانیان بە تەواوەتی و ڕێکوپێکی ڕاپەڕێنن).

ئەو قوتابیانەی نوور

کە لەگەڵ مامۆستادان

( هەر تەنها حەقیقەتە کە دەدوێت)

پەیامەکانی نوور چەسپاندوویانە کە لە دووتوێی "ستەم"دا "دادگەری" سەرهەڵدەدات!

واتە هەندێ جار مرۆڤێك دووچاری ستەم و ناحەقی و گیرو گرفتێك دەبێت، یان بێ هیچ تاوانێك بریاری بەندکردنی لەسەر دەردەکرێت و دەخرێتە بەندیخانەوە. بێ گومان ئەم چەشنە بریارە ستەمێکی ڕوون و ئاشکرایە. بەڵام کاتی وا هەیە کە هەر ئەم ستەمە دەبێت بەهۆی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی دادگەری! چونکە قەدەری خوای گەورە هەندێ جار ستەمکار بەکار دەهێنێت بۆ ئاراستە کردنی سزایەك بەرامبەر بە کەسێك کە لەبەر هۆیەکی تر شایستەیی ئەو سزایەی بەدەست هێناوە! ئەمەش یەکێکە لە جۆرەکانی دەرکەوتنی "دادگەری"ی خواوەند.

جا ئێستا من لەم ڕوانگەیەوە بیر دەکەمەوە لەوەی کە:

ئایا بۆچی بە درێژایی بیست و هەشت ساڵ لە دادگایەکەوە بۆ دادگایەکی تر و لە پارێزگایەکەوە بۆ پارێزگایەکی دیکە و لەم شارەوە بۆ شارێکی تر دەدرێمە بەر؟ چ تۆمەتێکم ئاراستە کراوە لە لایەن ئەو کەسانەوە کە ڕازین بەم جۆرە سزا و ئەشکەنجە ستەمکارانەیە مامەڵەم لەگەڵدا بکەن؟ ئایا تۆمەتی بەکارهێنانی ئایینە لە پێناوی سیاسەتدا؟ ئەی ئایا بۆچی ناتوانن بیچەسپێنن؟ دیارە لەبەر ئەوە ناتوانن تۆمەتەکەیان بچەسپێنن کە لە ڕاستی و واقیعدا شتێکی لەم جۆرە لە ئارادا نییە..

ئەوەتا دەبینیت دادگایەك چەندین ساڵ و مانگ لە هەوڵی دۆزینەوەی بەڵگەیەکدا کات بەسەر دەبات کە منی پێ تاوانبار بکات، کەچی ناتوانێت بەڵگەیەکی لەو جۆرە بدۆزێتەوە.. دوای ئەوە یەکسەر دادگایەکی تر بە هەمان تۆمەت بۆ لێکۆڵینەوە و دادگایی کردن دەمداتە بەر و ئەویش ماوەیەکی تر لەم هەوڵەدا و بۆ گوشارخستنە سەرم کات بەسەر دەبات و چەندین جۆری ئازار و ئەشکەنجەم دەهێنێتە ڕێ. ئیتر کاتێ کە ناگاتە هیچ ئەنجامێك بۆ تۆمەتبارکردنم، وازم لێ دەهێنێت.. بەڵام دوای ئەو دادگایەکی تری سێهەم بە هەمان تۆمەت یەخەم پێ دەگرێتەوە!

بیست و هەشت سالی تەمەنم - بەم جۆرە - لە گرفتێکەوە بۆ یەکێکی تر و، لە کێشەیەکەوە بۆ کێشەیەکی دی بەسەر بردووە. تا لە کۆتاییدا دڵنیا بوون لەوەی کە هیچ ڕاستییەك لەو چەشنە تۆمەتانەدا نییە و هەموویان بە ناحەق دراونەتە پاڵم.

من سەبارەت بە خۆمەوە بە دڵنیاییەوە دەزانم کە هیچ پەیوەندییەکم بەم تۆمەتەوە نییە، کە چ بە ئەنقەست و چ بەهۆی وەهم و دوودڵییەوە دراوەتە پاڵم.

هەروەك هەموو کەسانی خاوەن ویژدانیش دەزانن کە من لەو جۆرە پیاوانە نیم ئایین بۆ هیچ ئامانجێکی سیاسی بقۆزمەوە. تەنانەت ئەو کەسانەش کە تۆمەتەکەیان ئاراستە کردووم، لە ناخی دەروونی خۆیاندا، ئەم ڕاستییە دەزانن!

جا من دەپرسم:

کەواتە ئایا هۆی سووربوونیان چییە لەسەر ئەم ستەمەی کە دەرحەق بە من دەیکەن؟ بۆچی لەگەڵ ئەوەشدا کە من لەم مەسەلەیەدا بێ تاوانم کەچی هەر دووچاری ئەم ستەم و ئازارە بەردەوامە دەکرێم؟ بۆچی نەمتوانی لەم موسیبەتانە ڕزگارم ببێت؟ ئایا ئەم حاڵەتانە پێچەوانەی دادگەریی خواوەند نین؟

بە درێژایی چارەکە سەدەیەك بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارانەدا دەگەڕام و، ئەم گەڕانەشم بێ ئاکام مایەوە.. بەڵام وا ئێستا هۆکاری ڕاستەقینەی ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە بۆچی ستەمم لێ دەکەن و ئازارم دەدەن! بۆیە - بە داخەوە - دەڵێم:

گوناهەکەم لەوەدایە کە خزمەتە قورئانییەکانم دەکەم بە هۆکارێك بۆ بەرزبوونەوەی مەعنەوی و "کەماڵاتی ڕۆحی"م. وا ئێستا بە تەواوی هەست بەمە دەکەم و لێی تێدەگەم. بۆیە هەزاران جار شوکر و سوپاسم پێشکەش بە خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەوەی کە لە ماوەی ئەم ساڵە دوور و درێژانەدا چەندین ڕێگری بەهێزی مەعنەویی لە دەرەوەی ویستی خۆمدا هێنایە ڕێم، تاکو خزمەتگوزارییە ئیمانییەکانم نەکەم بە هۆیەك بۆ تەرەققی و بەرزبوونەوەی ماددی و مەعنەوی، یان بۆ ڕزگاربوون لە ئازار و ئاگری دۆزەخ، تەنانەت بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەییشم یان لە پێناوی هیچ ئامانجێکی تردا.

ئەم هەستە قووڵانەی ناخی خۆم و ئەم ختووره و ئەندێشە ئیلهامی‌یانە، منیان دووچاری حەپەسان کرد. چونکە لە کاتێکدا هەموو کەسێك مافی بەدەستهێنانی ئەو پلە و پایانەی هەیە کـە حەز دەکـات پێیان بگـات و، بواری دراوەتێ لـە ڕێی کردەوە چاکەکانەوە بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، جگـە لەوەش کە ئەم کارانە هیچ زیانێکیان بۆ کەس تێدا نی‌یە.. کـەچی لەگەڵ ئەوەشدا بینیم "گیـان" و "دڵ"م لـەم چەشنە حاڵەتانـە و لـە گرتنەبەری ئەم ڕێگایە قەدەغـە دەکرێن و، ئەوەم لەبەر چاودا دانراوە کە هاودەم لەگەڵ بەدەستهێنانی "ڕەزامەندیی خواوەند"دا، جگە لە "خزمەتی ئیمان" بایەخ بە هیچ شتێکی تر نەدەم!

چونکە لەم زەمان و ڕۆژگـارەی ئێستادا سـەبارەت بەو کەسانەی کە لـە ڕێی سروشتی بەندایەتیی ناو ناخی خۆیانەوە نەگەیشتوون بەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە لـە سـەرووی هـەموو شتێکەوەن و، ئـەو کەسـانەش کـە پێویستیان بـە تێگەیشتنی ئـەم ڕاستی‌یانە هەیە بە شێوەیەکی کاریگەر، وتنەوەی جۆرە دەرسێکی قورئانیی ئەوتۆ کە لە خزمەتی هیچ ئامانجێکی تردا نەبێت، کارێکی گەلێ پێویستە. بە جۆرێك کە لـەم چەشنە دنیایەدا، کـە هـەموو شتێکی تێدا تێکـەڵ و ئاڵۆز بـووە، ئـەو دەرسـە قورئانی‌یە بتوانێت ئیمـانی خەڵکی ڕزگـار بکـات و، قەناعەت بـە سەرسەختانیش ببەخشێت و، دڵنیایی لـە دەروونیـاندا بیووژێنێتـەوە. بەمەش ئەو دەرسە دەتوانێت پشتی کوفری موتڵـەق و گومڕایی سەرسەخت و ملنەدەر بشکێنێت و، قەناعەتی تەواوەتی بە هەموان ببەخشێت.

خۆ لەم بارودۆخانەی ئێستادا هەرگیز ئەم چەشنە قەناعەتە پەیدا نـابێت، مەگـەر لە کاتێکدا کە هەوڵ بدرێت "ئایین" نەکرێت بە هۆیەك بۆ هیـچ ئامـانجێکی ماددی یان مەعنەوی، ئیتر ئەو ئامانجە: کەسی، یان دنیایی، یان قیامەتی بێت!

خۆ ئەگەر ئەمە نەیەتەدی، ئەوا لە بەرامبەر ئەو تەوژمـە ترسناکەی کە لـە لایەن کۆمەڵـە و ڕێکخراوە نهێنی‌یەکانەوە سەرهەڵدەدەن، هەموو کەسێك - لـە هـەر پلەوپایەیەکی مەعنەویشدا بێت - هـەر دەستەوسان دەمێنێت و نـاتوانێت هـەموو شوبهە و گومانەکان قـەڵاچۆ بکـات. چونکـە لـەو چەشـنە کاتـەدا دەروونـی

بەدخوازی ئەو کەسەی کە حەز دەکات بێتە ناو بازنەی ئیمانەوە بە خۆی دەڵێت: "ئەو کەسەی کە باسی ئایینمان بۆ دەکات بەهۆی زیرەکی و ئاستی بەرزی خۆیەوە لە بەرچاودا دەیرازێنێتەوە و دەتوانێت قەناعەتمان پێ بکات". ئەمە دەڵێت و، ئیتر شوبهە و گومانەکانی هەر لە دڵدا دەمێننەوە!

دەسا هەزاران هەزار جار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە کە ماوەی بیست و هەشت ساڵ و لە دووتوێی تۆمەتی "بەکارهێنانی ئایین لە پێناوی سیاسەت"دا قەدەری سەرتاپا دادگەری خواوەند - بە بێ ویست و پێزانینی خۆم - نەیهێشت ئایین بکەم بە ئامرازێك بۆ هیچ ئامانجێکی کەسی و تایبەتیی خۆم و، دەستە ستەمکارەکانی مرۆڤی بۆ زللە لێدانم و وریایی و بێدارکردنەوەم بەکار هێنا، کە چەند زللەیەکی سەرتاپا دادگەری بوون و هەڕەشەیان لێ کردم کە: هەرگیز "ڕاستییەکانی ئیمان" نەکەیت بە ئامرازێك بۆ کەس و خودی خۆت. تاکو ئەو کەسانەی پێویستیان بە ڕاستییەکانە تێبگەن و بزانن کە هەر تەنها حەقیقەت و ڕاستییەکانن لە پەیامەکاندا دەدوێن و قسە دەکەن، نەك شتی تر. هەروەها بۆ ئەوەی هیچ وەهم و گومانێکی نەفس و فڕوفێڵێکی شەیتان لە گۆڕێدا نەمێنێت و هەموویان بێ دەنگ بن.

ئەمەیە نهێنیی کاریگەریی پەیامەکانی نوور لە وروژاندنی حەماسەتی ناو "دڵ" و "گیانەکان"دا بە وێنەی شەپۆلی دەریا فراوانەکان.

بەڵێ، نهێنیی ئەو کاریگەرییە هەر تەنها ئەمەیە و هیچی تر نییە! ئەوەتا هەرچەند هەزاران زانا هەن کە ئەو ڕاستییانەی پەیامەکانی نووریان لە سەدان هەزار کتێبدا تۆمار کردووە کە زۆر زیاتر لە پەیامەکانی نوور ڕەوانبێژییان تێدایە، کەچی نەیانتوانی بەربەستی ئەو کوفرە ئاشکرایە بکەن و لە شوێنی خۆیدا ڕاییگرن! جا کە لە کاتێکدا پەیامەکانی نوور لە ژێر سایەی ئەم بارودۆخە سەختانەدا و تا ڕادەیەك توانیبێتیان ڕووبەڕووی ئەم کوفرە ئاشکرایە ببنەوە، ئەوا نهێنیی سەرکەوتنیان لەوەدایە کە باسمان کرد. واتە نە "سەعید" و نە توانا و لێهاتن و

قابیلییەتی سەعید بۆ ئەم کارە لە گۆڕێدا نی‌یە، بەڵکو هەر تەنها "حەقیقەت"ە لە بارەی خۆیەوە دەدوێت.. بەڵێ، تەنها حەقیقەتی ئیمانە کەوتووەتە گوفتارەوە.

جا مادەم "پەیامەکانی نوور" کاریگەری‌یان لەو جۆرە دڵانەدا هەیە کە تینووی "ئیمان" و "نووری حەقیقەتەکان"ن، ئەوا نەك هەر تەنها یەك "سەعید" بەڵکو هەزار و یەك سەعیدیش لەو پێناوەدا بەخت دەکرێت و، هەرچی ئەشکەنجە و ئازاریشم لە ماوەی ئەم بیست و هەشت ساڵەدا تووش بووە گەردنیان ئازاد بێت و، ئەو کەسانەش ستەمیان لێ کردم و لەم شارەوە بۆ ئەو شار دەیانگواستمەوە و، ئەوانەش کە دەیانویست جۆرەها تۆمەتم بدەنە پاڵ و چەندین جۆری سووکایەتی‌یان هێنایە ڕێم و زیندانی تاکەکەسی‌یان بۆ ئامادە دەکردم.. وا لە هەموویان خۆش بووم و، وازم لە هەموو مافێکی خۆم هێنا لە ئەستۆیاندا!

بە "قەدەری دادگەر"یش دەڵێم:

من شایانی زللە دادگەرەکانت بووم.. چونکە منیش وەکو خەڵکی ڕێگایەکم گرتەبەر کە خۆی لە خۆیدا ڕەوایە و هیچ زیانێکی تێدا نی‌یە و، لەم ڕێ‌یەدا بیرم لە خودی خۆم کردەوە. خۆ ئەگەر لە دەمی ئەنجامدانی خزمەتگوزاری‌یەکانم لە پێناوی پاراستنی ئیماندا هەست و نەستەکانی خۆمم سەبارەت بە ڕێزنە و بەرەکەتە ماددی و مەعنەوی‌یەکانەوە بەخت نەکردایە، ئەوا ئەم هێزە مەعنەوی‌یە گەورەیەم لە دەست دەدا. بۆیە هەموو شتێکم بەخت کرد و هەموو ئازارێکیشم هەڵگرت. هەر ئەمەش بوو بە هۆکاری ئەوەی کە ڕاستی‌یەکانی ئیمان لە هەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەوە و، سەدان هەزار تەنانەت لەوانەیە ملیۆنەها قوتابی لە قوتابخانەی نووردا پێگەیشتن و لە سەرچاوەی زانستەکانی نووریان هەڵگوزی و، هەر ئەوانیشن کە لەم ڕێگەی خزمەتی ئیمانەدا هەر بەردەوام دەبن و، لە بەختکردنی هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا لەم ڕێگەیەی من لانادەن، چونکە هەوڵ و کۆششیان تەنها بۆ "خوای گەورە" دەبێت، نەك بۆ هیچ شتێکی تر.

گەلێ کەس لە قوتابیانم دووچاری چەندین جۆری بەڵا و موسیبەت بوون و، گرفتاری چەندەها سەختی و ئازار و ئەشکەنجە کران و بە فەزڵی خوای گەورەش

چەندین تاقیکردنەوەی سەختیان بڕی.. جا من داوایان لێ دەکەم کە ئەوانیش بە وێنەی من چاوپۆشی لەو کەسانە بکەن کە ئەو ستەمانەیان لێ کردوون و مافیان خواردوون، چونکە ئەو ستەمکارانە لە نەزانیی خۆیاندا ئەو ڕەفتارانەیان نواندووە و، ئەوانەش کە ئازار و ئەشکەنجەیان داین، بێ ئەوەی پەی بە درەوشانەوەی نهێنییەکانی "قەدەری خواوەند" بەن، یارمەتیی بڵاوبوونەوەی ڕاستییەکانی ئیمانیان داوە.. ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە ئەوەیە کە ئومێدەواری هیدایەتدانیان بین.

وەسیەتم بۆ قوتابیانم ئەوەیە کە هیچ کامیان بە ئەندازەی تەنانەت گەردیلەیەکیش گیانی تۆڵەسەندنەوە لە دڵی خۆیدا هەڵنەگرێت و، بە گەرموگوڕی و لێبڕانەوە بۆ بڵاوبوونەوەی "پەیامەکانی نوور" تێبکۆشن و پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پتەو بەو پەیامانەوە ببەستن.. من زۆر نەخۆشم، توانای نووسین و قسەکردنم نەماوە. لەوانەیە ئەمە دواهەمین قسەم بێت. دەسا با قوتابیانی نووری "قوتابخانەی زەهراء" ئەم وەسیەتەی منیان لە بیر نەچێتەوە.

* * *

(نامەیەك بۆ سەرۆك وەزیران)

برایانم!

ڕاستییەکی یەکجار گرنگم بە دڵدا هێنراوە، وا بۆ ئێوەشی ڕوون دەکەمەوە و دەیخەمە بەردەستتان. جا ئەگەر ڕاتان لەسەری بوو، ئەوا بە سەرۆك وەزیران (عەدنان مەندەرس) و ئەندامە ئاییندارەکانی پەرلەمانی بگەیەنن.

پێشەکی:

لەبەر ئەوەی من چل ساڵە وازم لە گۆڕەپانی سیاسەت هێناوە و، زۆربەی ڕۆژگارانی ژیانیشم بە گۆشەگیری بردووەتە سەر و، تێکەڵی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەبووم، ئەوا نەمتوانیوە مەترسییە هێرش هێنەرەکەی ئێستا ببینم. بەڵام لەم ڕۆژانەدا هەستم کرد کە بارودۆخ ئامادەی داباریینی ئەو مەترسی و موسیبەتە یەکجار گەورەیەن بەسەر نەتەوەی ئیسلام و ئەم وڵات و حکوومەتە ئیسلامییەدا.

وا سێ خاڵ - کە بە جۆرێکی مەعنەوی هاتنە دڵمەوە - بۆ ئەو سیاسەتمەدارانە ڕوون دەکەمەوە کە لە پێناوی بەرژەوەندیی نەتەوەی ئیسلام و فەرمانبەرداریی ئایین و دەستەبەر کردنی ئاسایش و سەلامەتیی وڵاتدا تێدەکۆشن و، هەوڵی پارێزگاری کردنی کۆمەڵگای مرۆڤ دەدەن:

■ خاڵی یەکەم:

هەرچەند گوێ لە ڕۆژنامەکان ناگرم، لەگەڵ ئەوەشدا دوو ساڵ پێش ئێستا تۆمەتی "کۆنەپەرستی"م بەرگوێ کەوت. یەکسەر بە بیرکردنەوە و بۆچوونی "سەعیدی کۆن" بیرم لەم دیاردەیە کردەوە و، بینیم:

ئەو دوژمنانەی ئیسلام کە سیاسەت دەکەن بە ئامرازی دەستی ئیلحاد و، بە گەرموگوڕی و لێبڕانەوە و لە ژێر پەردەی بەرگری لە نیشتمان و نەتەوە، بۆ گێڕانەوەی گرۆی مرۆڤ بەرەو یاسای ترسناکی جاهیلی هەوڵ دەدەن، دەچن موسڵمانان و غیرەتمەندان لەسەر ئایین بە تۆمەتی نارەوای "کۆنەپەرستی" تاوانبار دەکەن. لە کاتێکدا کە موسڵمانان تەنها هاندەری ئیسلام و غیرەت لەسەر ئایینەکەیان هانیان دەدات کە سیاسەت بکەن بە ئامرازێکی لەبار و گونجاو لە خزمەتی ئاییندا، بێ ئەوەی ئیسلام بکەن بە ئامرازی دەستی سیاسەت. بۆیە ئەم هەوڵەش دەدەن تاکو بە هێزی مەعنەویی ئیسلام پشتی ئەم حکوومەتە بگرن و هێندە هێزی پێ بدەن کە لە ڕادەی هێزی چوارسەد ملیۆن برای ڕاستەقینە و پشتگیردا بێت، بۆ ئەوەی سیاسەتمەدارانی ئێستا ڕزگار بکەن لە سواڵی بەردەم دەرگای ستەمکارانی ئەورووپا.

ئەم تۆمەتە نارەوایە، ناو و ناتۆرەی "کۆنەپەرستی" دەداتە پاڵ ئەو غیرەتمەندانە و، وەك زیانەدەر بە وڵات و خەڵکی پێش چاویان دەخات. بەڵام ئەمە بوختانێکی گەورە و تۆمەتێکی یەکجار غەددارانە و نارەوایە.

ئەوەش هەیە کە "کۆنەپەرستی" (ڕیجعییەت) دوو جۆرە و، هەریەکەشیان پاڵی بە یاسایەکی بنەڕەتییەوە داوە:

یەکەم: کۆنەپەرستی ڕاستەقینەیە. کە کۆنەپەرستی‌یەکی سیاسی و کۆمەلآیەتی‌یە و، یاسا بنەڕەتی‌یەکەشی تەوەرەی گەلێ ستەم و تاوانکاری‌یە.

دووهەم: بناغەی پێشکەوتن و دادگەریی ڕاستەقینەیە، بەڵام بە ناحەق ناوی "کۆنەپەرستی"ی لێ نراوە.

■ خاڵی دووهەم:

ئەو کەسانەی کە هێرش دەکەنە سەر ئایین، بە ناوی شارستانێتی و بەپێی یاسا و دەستوورێکی نێوان خۆیان، دەیانەوێت گرۆی مرۆڤ بەرەو سەردەمەکانی نەزانی و ژیانی دەشتەکێتی بگێڕنەوە. ئەو یاسایەشیان بەختەوەری و حەوانەوە و دادگەری و ئاسایشی گرۆی مرۆڤ لەناو دەبات، ئەوانە دەیانەوێت ئەم یاسایە لە وڵاتە گیرۆدە و کلۆڵەکەی ئێمەشدا پیادە بکەن و، لە ڕێی حیزبایەتی‌یەوە تۆوی دووبەرەکی و ئیختیلاف و بیر شپرزەیی بچێنن، تاکو بگەن بە مەرام و ئامانجە کەسی‌یەکانیان و، هەڵپە و سەرسەختی و عینادیی خۆیانی پێ تێر بکەن.

ئەو یاسایەشیان بریتی‌یە لەوەی کە:

بە تاوانی یەك تاقە کەس، هەموو یەکێك لە کەسانی دەستە و کۆمەڵ و هۆزەکەی ئەو کەسە تۆمەتبار دەکرێن و، هەموویان بە تاوانبار و بەرپرس لە قەڵەم دەدرێن! جا بەپێی ئەم یاسایە تەنها یەك دانە گوناهـ دەبێت بە هەزاران هەزار گوناهـ و تاوان. دیارە ئەمەش هەموو پایە و ستوونەکانی یەکێتی و یەکگرتنی کۆمەڵ (چەشنی برایەتی و خۆشەویستی و هاونیشتمانێتی) لەناو دەبات و دەیانکات بە تۆزی بابردەڵە.

بەڵێ، هێزە سەرسەخت و بە یەك ناحەزەکان کاتێ کە ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، هەموو هێزەکانیان لەو ڕێیەدا لەدەست دەدەن و لاواز دەبن و بە بێ هێز دەمێننەوە. خۆ کاتێ کە لە ئەنجامی ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیەشدا دووچاری لاوازی و داڕمان دەبن، ناتوانن هیچ کارێك لە پێناوی وڵات و نەتەوەدا بەپێی خواستی "دادگەری" ئەنجام بدەن. بۆیە ناچار دەبن کە بەرتیل بدەن تاکو مولحیدان

بۆ ناو ڕیزەکانی خۆیان ڕابکێشن و، دەچن دەست لەو یاسا ستەمکارە دڕندانەیە گیر دەکەن کە باس کرا، لە بریی ئەو یاسا حەق و دادگەر و دەستوورە ئاسمانی‌یە خاوێنەی خواوەند کە بریتی‌یە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـــرى﴾ (الأنعام:١٦٤) کە دەستوورێکە خۆشەویستی و برایەتیی ڕاستەقینە دەهێنێتە دی و، نەتەوەی ئیسلام و ئەم وڵاتەش لە مەترسی‌یەکان ڕزگار دەکات و، لە ژێر سایەی ئەم یاسایەدا هیچ کەسێك بە هاوبەشی تاوانی کەسی تر دانانرێت، با برای خۆی یان لە تیرە و تاقم و حیزبەکەی خۆیشیدا بێت، مەگەر لە کاتێکدا کە مەیلی بەلای ئەو تاوانەدا چووبێت و لایەنی گرتبێت، دیارە لەم چەشنە کاتانەدا تەنها لە دواڕۆژدا – نەك لە دنیادا – بەرپرس دەبێت.

جا ئەگەر ئەم دەستوورەی قورئان نەکرێت بە یاسایەکی بنەڕەتی، ئەوا کۆمەڵگای مرۆڤ لە ڕێی "کۆنەپەرستی"یەکی دڕندانەوە بەرەو نزمترینی پلە نزمەکان بەر دەبێتەوە، بە وێنەی ئەو کاولکاری‌یە چەپەڵ و سامناکەی کە هەردوو جەنگە جیهانی‌یەکە بەرهەمیان هێنا.

دەسا بزانن ئەو کەسانە چەندە بەدبەختن کە ناوی "کۆنەپەرستی" لەم یاسایەی قورئانی پیرۆز دەنێن و، کەچی بە یاسایەکی دڕندانەی جاهیلی ڕازی دەبن و لە سیاسەتەکانیاندا پیادە و جێبەجێی دەکەن و، وەك پایە و ستوونی بەڕێوەبردنی کارەکانیان دایدەنێن و، بەو پێیە قوربانی بە "تاکە کەس" دەدەن لە پێناوی "کۆمەڵ"دا و، لە ڕێی سەلامەتیی نیشتماندا مافی کەسان و تاك تاکانی خەڵکی پشتگوێ دەخرێت و، لەبەر سەلامەتیی سیاسەتی دەوڵەتیش گوێ بە ستەمە جوزئی‌یەکان نادرێت! ئەوەتا لەسەر بناغەی ئەم یاسایە شارێکی تەواوەتی بە سەدان هەزار بێ تاوانی ناویەوە کاول دەکرێت، تەنها لەبەر تاوانی یەك دانە کەس! هەر ئەم یاسایە بەلایەوە دروستە کە لەبەر تاوانی یەك دانە تاوانبار، هەزار کەس لەناو ببرێت و، هەزاران بێ تاوانیش دووچاری تەنگانە و سەختی و گیروگرفت دەکات تەنها لەبەر زامێك کە لە یەك کەسی بەرامبەردا کرابێت!

جا بەپێی ئەم بەهانە و بڕوبیانووە، هیچ گوێیەك بە كوشتن و گوللەبارانی دووسەد كەس نادرێت، وەك ئەوەی لە جەنگی جیهانیی یەكەمدا لەبەر سیاسەتی هەڵەی سێ هەزار كەس، سێ ملیۆن خەڵك لەناو برا! بۆ خۆت چاو بگێڕە، هەزاران نموونەی تری وەك ئەمە دەبینیت.

قوتابیان و خزمەتگوزارانی قورئانیش لە بەرامبەر ستەمكاریی‌یە چەپەڵەكانی ئەم كۆنەپەرستی‌یە دڕندانەیەوە، سەدان یاسای بنەڕەتیی قورئانی پیرۆزیان لایە لە چەشنی: ﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخرى﴾ كە دادگەریی ڕاستەقینە و یەكێتی و برایەتی دەهێنێتە دی.

كەواتە تۆمەتباركردن و ناولێنانی ئەو ئیماندارانەی كە دادگەری و برایەتی دەهێننە دی بە "كۆنەپەرست" وەكو ئەوە وایە كە فەزڵی ستەمی یەزیدی لەعنەتی بدرێت بەسەر دادگەریی حەزرەتی عومەری كوڕی خەتتابدا، خوای لێ ڕازی بێت، هەروەها وەك فەزڵدانی "دادگاكانی پشكنین" وایە بەسەر "دادگەریی مەزنی قورئان"دا!

كەواتە ئەو سیاسەتمەدارانەی كە بۆ پاراستنی ئاسایشی ئەم وڵاتە و حكوومەتە ئیسلامی‌یەكەی هەوڵ دەدەن، پێویستە ئەم ڕاستی‌یە بخەنە پێش چاوی خۆیان و بایەخی پێ بدەن. دەنا تەوژمە نەیارەكانی حكوومەت و سووربوونیان لەسەر موعارەزە كردنی ئەم حكوومەتە هەموو هێزەكان لاواز و ماندوو دەكەن. دیارە ئەو هێزە لاوازەش بەشی دەستەبەركردنی بەرژەوەندی‌یەكانی وڵات و سەقامگیر كردنی ڕێسا ناكات و، تەنانەت بە ئیستبدادیش ناتوانێت قەوارەكەی ڕابگرێت. ئەمەش - وەك ئاشكرایە - بوار بە چاندنی تۆوی شۆڕشی فەرەنسا لەم وڵاتەدا دەدات، كە كارێكە شایانی ئەوەیە مرۆڤی پێ نیگەران بێت.

مادەم لە پێناوی جێگیركردنی سیاسەتی بیانی‌یەكاندا لە بەرامبەر ئەو یارمەتی‌یە كاتی و بێ نرخانەی كە پێشكەشی دەكەن، بەرتیلی تەنازولی یەك لە دوای یەكی مەعنەوی پێشكەش دەكرێت، بەهۆی ئەو لاوازی‌یەی كە لە ئەنجامی جیاوازیی نێوانمانەوە پەیدا بووە، بە ڕادەیەك كە گوێ بە برایەتیی چوارسەد ملیۆن

موسڵمان و بایەخ بە ڕێبازی یەك ملیار پێشینانی مەزن نادرێت، تەنانەت خۆیان بە ناچار زانیوە کە، بە وێنەی مووچەی کارمەندان، چەندین بڕە پارەی زۆر بدەن لە پێناوی زیان نەدان لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت و ڕێسای وڵاتدا، بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەك لەو دەستکورتی و هەژارییەی کە خەڵکی گیرۆدەی بوون..

مادەم سیاسەتمەدارانی ئێستای ئەم وڵاتە بەرتیلی وا بە خۆرئاوا و بیانییەکان دەدەن و، تەنازولی سیاسی و مەعنەوییان بۆ دەکەن، ئەوا دەبێ و پێویستیشە لەسەریان کە دە هێندەی ئەوە بدەن لە پێناوی برایەتیی چوارسەد ملیۆن موسڵماندا کە دوایی لە شێوەی چەند کۆمارێکی ئیسلامیی یەکگرتوودا یەکدەگرن. ئەمەش لەبەر سەلامەتیی ئەم وڵاتە و پارێزگاری کردنی قەوارەی ئەم نەتەوەیە گەلێ پێویستە و، ئەم کارە بە دیاری و باجێکی بێ زیان و پێویست دادەنرێت.

جا ئەو بەرتیلە واجب و دروست و یەکجار سوودبەخشە، تەنانەت ڕەوا و پێویستەش، بریتییە لەوەی کە دەستووره خاوێن و پیرۆزەکان بکرێن بە ڕێبازی کار. کە چەند دەستوورێکن بریتین لە بناغەی هاوکاریی ئیسلامی و، دیاریی ئاسمانیی قورئانی پیرۆزن و، پەیوەندیی نێوان موسڵمانان بەهێز دەکەن و، تەنانەت یاسای موقەددەسی بنەڕەتیی موسڵمانانیشن، کە بریتین لە:

﴿إِنَّما الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: ١٠)..

﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً﴾ (آل‌عمران:١٠٣)..

﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ (الأنفال:٤٦).

* * *

تێبینی:

لەم شوێنەی دەقە تورکییەکەدا "إفادة المرام" و پێشەکیی تەفسیری سوورەتی "فاتیحە"ی کتێبی "ئاماژەکانی ئیعجاز" دانراوە. تکایە با لە شوێنی خۆی لە کتێبی ناوبراودا سەیر بکرێت. (وەرگێڕ)

(دوای ئەوەی کە ڕۆشتیتە ناو سیاسەتەوە بۆچی وازت لێ هێنا؟)

باسمه سبحانه

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته أبداً دائماً

برایانی بەوەفا و ئازیز و ڕاستم!

یەکەم:

پڕ بە گیان و ویژدانی خۆمان پیرۆزبایی سەرجەم جەژنە ماددی و مەعنەوی و، ڕابوردوو و داهاتووەکان و، شەوە پیرۆزە خاوێنەکانتان لێ دەکەین و، لە میهرەبانیی خواوەندی بەتوانا دەلالێینەوە کە بەندایەتی و گوێڕایەڵی و دوعا بێگەردەکانتان لێ وەربگرێت.

دووهەم:

ناچار بووم بە جۆرێکی تایبەتی وەڵامی دوو پرسیارە گرنگەکەیان بدەمەوە، چونکە ئەو دوو پرسیارە لە زۆر لایەنەوە دەکرێن.

پرسیاری یەکەمیان:

پێشتر تۆ لە سەرەتای "سەردەمی سەربەستی"دا گەلێ تێکەڵی سیاسەت دەبوویت و بە گەرمی خۆت پێوە سەرقاڵ کردبوو، کەچی وا چل ساڵە بە تەواوی وازت لە سیاسەت هێناوە. ئایا ئەمە بۆچی؟

وەڵام:

یاسای بنەڕەتیی سیاسەتی مرۆڤ بریتییە لەوەی کە: "تاکە کەس" لە پێناوی سەلامەتیی "نەتەوە" و پارێزگاری کردنی "کۆمەڵ"دا بەخت دەکرێت و، هەموو شتێك لە پێناوی پاراستنی "نیشتمان"دا بە کەم دادەنرێت.

هەرچی تاوانی چەپەڵ و نارەوا تا ئێستا لە مێژووی مرۆڤدا ڕووی داوە، هەمووی بەهۆی بەکارهێنانی خراپی ئەم یاسا و دەستوورە بنەڕەتییەوە بووە و، بە تەواوی لەمەش دڵنیام. جا ئەم دەستوورە بنەڕەتییەی مرۆڤ، سنوورێکی تایبەتی و یاسایەکی تایبەتیی نییە کە بیبەستێتەوە و لەو سنوورەدا ڕایبگرێت، بۆیە ڕێی خۆش کردووە بۆ ئەوەی کە لە بەکارهێنانیدا بە زۆری یاریی پێ بکرێت.

هەردوو جەنگە جیهانی‌یەکە، کە داهاتی پێشکەوتنی هەزار سالی گرۆی مرۆڤیان بە تەواوی لەناوبرد، لە ئەنجامی بەکارهێنانی خراپی ئەم یاسا بنەڕەتی‌یەی مرۆڤەوە هەلگیرسان. هەروەك ئەم یاسایە بوار و فەتوا دەدات بە لەناوبردنی نەوەد کەسی بێ تاوان لەبەر تاوانی دە کەسی تاوانبار. هەروەك لەبەر تاوانی یەك کەس ڕێ بە کاول کردنی شارۆچکەیەك دەدات..

هەموو ئەمانەش لەبەر "چەند ئامانجێکی کەسی" کە لە ژێر ناوی "بەرژەوەندیی گشتی"دا شارراونەتەوە!

جا لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور" لە زۆربەی بەشەکانیاندا و لە "بەرگری‌یەکان"یشدا ئەم ڕاستی‌یەیان ڕوون کردووەتەوە، ئەوا پێمان خۆشە خوێنەری بەڕێز ئەو پەیامانە بخوێنێتەوە.

بەم جۆرە و لە بریی ئەم یاسا بنەڕەتی‌یە غەددار و ناڕەوایەی مرۆڤ، ئەو یاسا بنەڕەتی‌یەی قورئانی پیرۆزم دۆزی‌یەوە کە لە عەرشی هەرەمەزنەوە هاتووە و، لەم دوو ئایەتە پیرۆزەیدا ڕایگەیاندووە:

﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرى﴾ (الأنعام:١٦٤)..

﴿مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً﴾ (المائدة:٣٢)..

ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەی قورئان مرۆڤ فێری ئەم دەستوورە مەزنەی خوارەوە دەکەن:

هیچ کەسێك بە تاوانی کەسی تر سزا نادرێت. هەروەك هیچ کەسێکی بێ تاوان، بە بێ ڕەزامەندیی خۆی، لە پێناوی تەنانەت هەموو خەلکیشدا ناکرێت بە قوربانی.

بەلام گەر بە ویست و ڕەزامەندیی خۆی بچێت خۆی بەخت بکات، ئەوا کارەکەی بە پلەی "شەهیدی" دادەنرێت.

درێژەی باسی ئەم دەستوورە مەزنەی کە دادگەریی ڕاستەقینە لەناو گرۆی مرۆڤدا دادەمەزرێنێت، بە "پەیامەکانی نوور" دەسپێرم..

پرسیاری دووهەمیان:

پێش ئێستا کە تۆ بەناو تیرە و هۆزە لادێ نشین و خێڵەکییەکانی خۆرهەڵات(کوردستان)دا دەگەڕایت و گەشتت دەکرد و سەرت لێدەدان، داوای ژیانی شارستانیت لێ دەکردن و بە شەوق و تاسەمەندی و حەزێکی زۆرەوە بەرەو ژیار و پێشکەوتن لە بوارەکانی گوزەران و ژیاندا هانت دەدان.. ئەدی بۆچی وا نزیکی چل ساڵە خۆت لە ژیانی شارستانێتیی سەردەم دوور گرتووە و، ئەم شارستانێتییەی ڕۆژگارت پە (دەنییەت) نەك (مەدەنییەت) - واتە بێ میم - لە قەڵەم داوە و، لە ژیانی کۆمەڵایەتی دوور کەوتوویتەوە و، خۆت ترنجاندووەتە گوزەرانی دوورەپەرێزی و گۆشەگیری؟!

وەڵام:

ئەم شارستانێتییە خۆرئاواییەی ئێستا، لەبەر ئەوەی ڕێیەکی پێچەوانەی یاسا و دەستوورە ئاسمانییەکانی گرتووەتەبەر و، بە ڕەفتارەکانی لە دژی ئەو یاسایانە ڕادەوەستێ، ئەوا تای تەرازووی خراپەکانی بەسەر چاکەکانی و زیانەکانی بەرامبەر سوودەکانیدا قورس و زاڵ بووە! ئەوەتا بەهۆی ئەو شارستانێتییەوە، ئاسایش و ئارامیی خەڵکی شڵەژاوە و حەوانەوەیان شێواوە و بەختەوەریی ڕاستەقینەشیان هێندە گەنیوە کە بۆگەنی بڵاوبووەتەوە و، بەم پێیە ئامانجی ڕاستەقینەی "ژیانی شارستانێتی" تێکچووە و لە شوێنی خۆیدا ترازاوە. چونکە هاندەرەکانی هەڵە خەرجی و هەرزەیی، جێی دەست پێوەگرتن و قەناعەتیان گرتووەتەوە و، مەیل و ئارەزووی تەمبەڵی و پاڵدانەوەش لە مرۆڤدا کار و کۆششی لە بەرچاو خستووە.. ئەم شارستانێتییە، پۆشاکی هەژارییەکی سەخت و بەرگێکی ترسناکی تەمبەڵی و پاڵ لێدانەوەی بە بەری مرۆڤ پۆشیوە.

جا لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور" ئەو دەستوورەی قورئانی پیرۆزیان ڕوون کردووەتەوە کە ڕووی دەمی لە گرۆی مرۆڤایەتی دەکات و لە بانگەوازێکی بەرز و بڵندا پێیان دەڵێت:

﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا﴾ (الأعراف:٣١).

هەروەها:

﴿وأَنْ لَيْسَ لِلإنْسانِ إلاّ ما سَعَى﴾ (النجم:٣٩)..

ئەوا ئەو پەیامانە، لەبەر تیشکی ڕووناکی و ڕێنمایی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزەدا، ئاماژەیان داوە بەوەی کە "بەختەوەریی ژیانی مرۆڤایەتی" بەندە بە:

- دەست پێوەگرتن و ئیسراف نەکردن..
- هاندان و وروژاندنی هیممەتەکان بۆ هەوڵ و کار و تێکۆشان.

هەروەها ڕوونیان کردووەتەوە کە تەنها بەم دوو مەرجە دەتوانرێت "هاوکاری" و "لەگەڵ یەك گونجان" بخرێتە نێوان هەردوو چینی "خەواص و عەوام"ی مرۆڤایەتییەوە.

لەبەر ئەوەی پەیامەکان ئەمەیان ڕوون کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا تەنها دوو مەسەلە و سەرنجی ورد و ناسك دەخەمە ڕوو:

یەکەمیان:

مرۆڤ لە قۆناغی دەشتەکێتی و خێڵایەتیدا "سێ" یان "چوار" دانە شتی پێویست دەبوو بۆ گوزەران و ژیانی. ئنجا لە دە کەسدا تەنها دوو کەس هەبوون نەیاندەتوانی هەر سێ یان هەر چوار شتەکان بەدەست بهێنن..

بەڵام لەم سەردەمەدا و لە ژێر پاڵەپەستۆی خۆسەپێنەری شارستانێتیی خۆرئاوادا، کە شەقڵ و نیشانە جوداکەرەوەکانی بریتین لە چەند سیفەتێکی وەك: وروژاندنی لایەنی بەکارهێنانی هەڵە و خراپی دەسکەوتەکانی ژیان و.. هاندانی خەڵکی بۆ هەڵەخەرجی و.. هەژاندنی هەوا و ئارەزووەکانی دەروون و.. لە قەڵەمدانی شتانی ناپێویست بە چەند شتێکی یەکجار پێویست و ناچارەکی..

ئا لەم سەردەمەدا و بە پاڵەپەستۆی ئەو شارستانێتییەی کە ئەم خاڵانە هەندێکن لە تایبەتکارییەکانی، مرۆڤ لە ڕووی: "چاولێکەری" و "خوو پێوەگرتن"ەوە، لە بریی چوار دانە پێویستی، بۆ بیست دانە ناچار کراوە! خۆ

مەگەر لەناو بیست کەسدا تەنها دوانیان بتوانن لە سەرچاوەیەکی حەڵاڵ و بە شێوەیەکی موباح ئەو بیست دانە پێداویستی‌یانە بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، هەژدە کەسەکەی تریان هەر بە هەژاری و دەستکورتی دەمێننەوە!

کەواتە ئەم شارستانێتی‌یەی ئێستا، بە تەواوی مرۆڤ گیرۆدەی هەژاری و دەستکورتیی بەردەوام دەکات. ئەوەتا لە ڕێی هاندانی خەڵکی‌یەوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پێداویستی‌یە داسەپاوانە، ئەم شارستانێتی‌یە، گرۆی مرۆڤی بەرەو حەرام خۆریی زیاتر و جۆرەها پێشێل کردنی حەق و ستەم و ناڕەوایی دایەبەر و، چینی هەژاری عەوامی بۆ ململانێ و دەستەویەخە بوونی بەردەوام هان دا لەگەڵ چینی خەواصدا، بەهۆی پشتگوێ خستنی ئەو یاسا بنەڕەتی‌یەی کە قورئانی پیرۆز دایڕشتووە و بریتی‌یە لە: واجب کردنی زەکات و حەرام کردنی سوود(ڕیبا). کە ئەگەر ئەم یاسایە لە ژیاندا جێبەجێ بکرایە، ئەوا ڕێزی عامەی خەڵکی بۆ خەواص و سۆز و میهرەبانی خەواصیش بۆ عامەی خەڵکی دابین دەبوو..

بەڵام بە پشتگوێ خستنی ئەو یاسا بنەڕەتی‌یە، شارستانێتیی نوێ بورژوازی‌یەکانی هان دا ستەم لە هەژاران بکەن و بە ناڕەوا مافیان بخۆن و زەوتی بکەن، هەروەها هەژارانیشی ناچار کرد لە بورژوازی‌یەکان هەڵبگەڕێنەوە و لە دژیان ڕابووەستن. ئیتر لەم ڕێیەوە - ئەم شارستانێتی‌یە - حەوانەوە و بەختەوەریی لە بەری مرۆڤ داماڵی و ئارامی و ئاسایشی لێ تێکدا و گرفتاری ئەو بارەی ئێستای کرد کە پێوەی دەتلێتەوە.

سەرنجی دووهەمیان:

ئەو کارە دەراسایانە(خوارق)ی کە شارستانێتی نوێ لە بواری زانستدا بەدەستی هێناون، لە ڕاستیدا چەند نیعمەتێکی گەورەی پەروەردگاری بەخشندەن و، داخوازی ئەوەن کە مرۆڤ لە بەرامبەریانەوە شوکرانە بژێریی خاوێن و بێگەرد پێشکەش بکات و، بە چەشنێکی شایستە و گونجاو لە پێناوی سوود و بەرژەوەندیی مرۆڤدا بەکاریان بهێنێت..

بەڵام ئەوەی کە ئێمە لەم ڕۆژگارەدا دەیبینین پێچەوانەی ئەم داخوازییە ناوبراوەیە، دەبینین ئەو کارە دەراسایانە کەسانێکی بایەخدار و گرنگیان لە ژیاندا بەرەو تەمبەڵی و هەرزەیی داوەتەبەر، چونکە هەردەم ئاگری هەوای دەروون دادەگیرسێنن و ئارەزووەکانی دەورووژێنن، بەمەش پتر مرۆڤ لە هەوڵ و کۆشش دوور دەخەنەوە و لە شەوقی کار و تێکۆشانیش سارد و سستی دەکەنەوە، لە ڕێی بێ قەناعەتی و دەست پێوەنەگرتنیشەوە بەرەو: هەرزەیی و، هەڵەخەرجی و، ستەم و، حەرام خۆریی دەبەن.

وا لێرەدا نموونەیەك بۆ ئەمە دەهێنمەوە (وەك لە پەیامی: "کلیلی جیهانی نوور"دا باسکراوە):

"ڕادیۆ" نیعمەتێکی مەزنی خوای گەورەیە کە بە گرۆی مرۆڤی بەخشیوە. جا لە کاتێکدا کە دەبوو شوکرانەی مەعنەویمان لەسەر ئەو نیعمەتە پێشکەش بە خوا بکردایە، بەوەی کە لە بەرژەوەندیی سەرجەمی مرۆڤایەتیدا بەکارمان بهێنایە، کەچی دەبینین چوار لەسەر پێنجی بەکارهێنانی ئەو نیعمەتە لە ورووژاندنی هەوا و ئارەزووە دەروونییەکان و چەندین شتی بێ نرخدا - کە هیچ سوودێکیان بۆ مرۆڤ تێدا نییە - بەکاردەهێنرێن! ئنجا دەبینین ئەم بەکارهێنانە هەڵە و خراپەی ڕادیۆ، شەوق و حەزی مرۆڤ بۆ کار و کۆشش لە بنج و ڕەگدا دەردەهێنێت و گرفتاری تەمبەڵی و پاڵدانەوەی دەکات بە مەبەستی حەوانەوە و لەزەت بردن لەوەی گوێی لێ ڕابگرێت، بە ڕادەیەك مرۆڤ بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکات کە بچێت لەو پێناوەدا واز لە کارمەندی و ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانی ژیانیشی بهێنێت، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو لەزەتەی لەکیس نەچێت!

واتە لە کاتێکدا کە پێویست بوو بەشێکی زۆری ئەو هۆکار و بەدەستهاتە دەراسایانە لە پێناوی بەرژەوەندیی ڕاستەقینەی مرۆڤ و لە ڕێی هەوڵ و کار و کۆششدا بۆ خێر و قازانجی مرۆڤایەتی بەکار بهێنرایە و، پێداویستییەکانی پێ نەهێڵرانایە و گیروگرفتەکانیشی لەو ڕێیەوە چارەسەر بکرانایە.. کەچی هەر بە

چاوی خۆم بینیم کە: لە نێوان دە دانەدا تەنها یەك دوانێکیان بۆ هێنانەدی و دابین کردنی خواست و پێداویستی‌یەکانی مرۆڤ بەکار دەهێنرێن و، هەشت بەشەکەی تریان لە: کاری گاڵتەوگەپ و پێ ڕاکێشان لە ورووژاندنی هەوا و ئارەزووی دەروون و، تەمبەڵی و پاڵ لێدانەوە و، کات کوشتندا بەسەر دەبرێن!

هەزاران نموونەی تری وەك ئەم دوو نموونە بچووکە هەن.

پوختەی ئەم قسانە:

شارستانێتیی ئێستای خۆرئاوا، بە تەواوی گوێ لە ئایینە ئاسمانی‌یەکان ڕاناگرێت. لەبەر ئەوە، مرۆڤایەتیی بە هەژاری‌یەکی گەلێ سەختەوە تلاندووەتەوە و، داخوازی و پێداویستی‌یەکانیشی بە چەندین قات لەسەر زیاد کردووە.. ئنجا پتر لە ورووژاندنی ئاگری هەڵەخەرجی و، هەڵپەکاری و، تەماعیشدا پێ ڕادەکێشێت، پاش ئەوەی کە بناغەی دەست پێوەگرتن و قەناعەتی هەڵتەکاند و، ڕێگاکانی ستەم و حەرامکاری و حەرام خۆریی لە بەردەمدا والا کرد..

زیاد لەمانەش - بەو هۆکارانەی کە ڕابورد - ئەم مرۆڤە هەژار و دەستکورتەی هاویشتە ناو باوەشی تەمبەڵی و دەست بەتاڵی‌یەکی ڕووخێنەر و بێ بەرهەمەوە، دوای ئەوەی کە بەرەو هۆکارەکانی "هەرزەیی" هانی دا و پاڵی پێوە نا.

بەم چەشنە، شەوق و حەزی کارکردنی لە مرۆڤدا ڕەواندەوە.

مرۆڤیش لەم ڕێیەوە تەمەنە بەنرخەکەی خۆی لەدەست دا و، بە مفتە لە شوێنکەوتنی هەرزەیی و، گاڵتەوگەپ و، هەوا و ئارەزووی شارستانێتیی سەردەمدا، لە ناوی برد.

جگە لەمانەش، شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە، مرۆڤی هەژار و دەست بەتاڵی دووچاری چەندین نەخۆشی و بیماری کرد و، لە ڕێی ئیسراف و بەکارهێنانی هەڵە و خراپی دەسکەوتەکانیەوە، چەندەها دەرد و پەتای لەناو گرۆی مرۆڤی سەرانسەری گۆی زەویدا بڵاو کردەوە!

جگە لەم سێ دەردەی کە "شارستانێتی" بەرهەمی هێناون و بریتین لە: پێویستیی لەڕادەبەدەر و، حەز کردن لە هەرزەیی و، زۆربوونی ئەو نەخۆشییانەی کە مردن یاد دەخەنەوە.. جگە لەمانە، بە بڵاوبوونەوەی ئیلحاد و پەرەسەندنیشی لەم شارستانێتییەدا گرۆی مرۆڤ لە خەوی بێ ئاگایی بێدار بووەوە و هەستی کرد کە ئەم شارستانێتییە بەردەوام هەڕەشەی لێ دەکات و مردنی لە بەرچاودا وەك لەناودان و ئیعدامێکی هەمیشەیی پیشان دەدات..

لە ئەنجامی ئەمەشەوە شارستانێتی نوێ جۆرە سزایەکی دۆزەخی هەر لەم دنیایەدا دەرخواردی گرۆی مرۆڤ دا.

جا بەرامبەر بەم موسیبەتە سامناکەی کە مرۆڤ دووچاری بووە، "قورئانی پیرۆز" دێت و بەهۆی ڕابوون و بێداربوونەوەی قوتابییەکانی، کە لە چوار سەد ملیۆن قوتابی تێپەڕ دەبن و، لە ڕێی یاسا ئاسمانییە موقەددەسەکانیەوە، هەرسێ دەرد و زامە قووڵەکان تیمار و چارەسەر دەکات. چونکە هەروەك هەزار و سێ سەد ساڵ لەمەوپێش شیفا و چارەسەری بە نەخۆشییەکانی ئادەمیزاد بەخشی، ئێستاش بە هەمان جۆر ئامادەیە کە لە ڕێی یاسا بنەڕەتییە بەرزەکانیەوە ئەو زامە قووڵانەی ئەم ڕۆژگارەش ساڕێژ بکات. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم قورئانە پیرۆزە بەختەوەریی هەردوو دنیا بۆ مرۆڤ دەهێنێتە دی، بە مەرجێك قیامەتێکی کتوپڕی بەرپا نەبێت.

زیاد لەمانەش، قورئانی پیرۆز مرۆڤ تێدەگەیەنێت لەوەی کە "مردن" ئیعدامی هەمیشەیی نییە، بەڵکو تەواو کردنی ئەرکی سەرشان و پسووڵەی ڕوخسەت پێدانە، بۆ ئەوەی ئەو کەسە بڕواتە ناو جیهانی ڕووناکییەوە. هەروەك تای کردارە چاکەکانی ئەو شارستانێتییەی کە لە قورئانەوە سەرچاوە دەگرێت، بێ هیچ گومانێك و بەوپەڕی دڵنیایی، بەسەر تای کردەوە خراپەکانی شارستانێتی ئێستادا زاڵ دەبێت، تەنانەت شارستانێتیی نوێ دەکاتە شوێنکەوتە و خزمەتگوزار و یارمەتیدەری ئەو یاسا ئاسمانییانە، لە بریی ئەوەی کە بەشێکی ئایین بۆ بەشێکی

شارستانێتی واز لێ بهێنرێت و فەرمانەکانی ئایین بدرێت بە بەرتیل لە پێناوی شارستانێتیدا، بە وێنەی ئەوەی کە ئێستا ڕوو دەدات!

هەموو ئەمانەی کە باس کران، لە هێما و ئاماژەکانی قورئانی ئیعجاز بەخشەوە وەردەگیرێت و، گرۆی مرۆڤی بەخەبەر هاتووی ئێستا بە تکا و لالانەوەی بەکوڵ ئەو چارەسەرە قودسی‌یە لە میهرەبانیی خوای گەورە داوا دەکات.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

* * *

**(با ماڵەکان بکرێن بە قوتابخانەی نوور)**

**١٩٥١/١١/١٨**

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

**برا ئازیز و بەوەفاکانم!**

**ئەی قوتابیانی نوور لە "قوتابخانەی مەعنەویی زەهراء"دا!**

کاتێ هاتم بۆ "ئیسپارتە" بیستم کە قوتابخانەیەکی ئامۆژگاری و وتار و پێشنوێژیی تێدا دەکرێتەوە. یەکسەر ئەوەم بە دڵدا هات کە قوتابخانەیەکی نووریش لە شوێنەکانی نزیك و دەوروبەری ئەو قوتابخانەیەدا بکرێتەوە، تاکو ئەوێش بکرێت بە جۆرە قوتابخانەیەکی نوور، چونکە زۆربەی ئەو کەسانەی کە خۆیانی تێدا ناونووس دەکەن لە قوتابیانی نوورن.

دوو ڕۆژ دوای هاتنم بۆ ئیسپارتە و، سەردانی دەستە دەستە و دانە دانەی ئافرەتان و پیاوان بۆ ئەم شارە و، دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، وا دەزانرا کە من وانەیەکی گشتی بە خەڵکی دەڵێمەوە. ئنجا هەستم کرد کە ئەگەر قوتابخانەیەکی نووریی شێوە ڕەسمی و گشتیی لەو جۆرە دابمەزرێ، ئەوا قوتابخانەیەکی گەلێ پڕ و

جەنجاڵ دەردەچێت، وەك ئەوەی کە لە دەمی ڕۆشتنمان بۆ "دادگای ئافیوون" ڕووی دا و دەستە دەستەی خەڵکی دەهاتن بۆ بینینمان.. جا لەبەر گرنگی ڕوودانی ئەم چەشنە کۆبوونەوە و قەرەباڵغی‌یە بێ جێ و بێ ڕێیە، وازم لەو بۆچوونەم هێنا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕاستی‌یەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

با هەموو کەسێك ماڵەکەی خۆی بکات بە قوتابخانەیەکی نوور و، لەگەڵ خێزان و منداڵ و کەسوکاری خۆیدا دەرسی پەیامەکانی نوور لە نێوان خۆیاندا بخوێننەوە.

خۆ ئەگەر ئەو کەسە بە سەڵتی دەژیا و منداڵ و خێزانی نەبوو، با لەگەڵ چەند کەسێکی دراوسێدا ماڵێك بکەن بە قوتابخانەیەکی نوور و، لەو کاتانەدا کە لە کار و ئەرکەکانی سەرشانیان لێ دەبنەوە پەیامەکانی نووری تێدا بخوێننەوە و گوێیان لێ ڕابگرن و بیاننووسنەوە. چونکە خۆخەریك کردن بەم پەیامانەوە، تەنانەت گەر بۆ ماوەی دە خوولەکیش بێت، پاداشتی "قوتابیی ڕاستەقینەی زانست" دەستی ئەو کەسە دەخات، جگە لەوەی کە پاداشتی پێنج ڕووناکیی ئەو چەشنە پەرستشانەی دەست دەخەن کە لە "پەیامی ئیخلاس"دا باس کراون و، بە وێنەی پاداشتی قوتابیی زانست هەموو عادەت و مامەڵە ئاساییەکانی خواستی ژیان و گوزەرانیشی بۆ دەبن بە "پەرستش" و پاداشت دەدرێتەوە لە سەریان.

ئەم خاتیرەیەم بەم جۆرە هاتە دڵەوە و، منیش لە لایەنی خۆمەوە دەیخەمە پێش چاوی برایانم.

الباقي هو الباقي

برای نەخۆشتان

سەعیدی نوورسی

(دەرسەکان جێگای من دەگرنەوە)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

یەکەم:

سەد هەزار شوکر و سوپاس بۆ پەروەردگاری مەزنم لەسەر ئەوەی کە بە ئێوەی "ئەرکانی قوتابخانەی زەهراء" ئەو حەقیقەتە مەعنەوییەی قوتابخانەی زەهرای هێنایەدی کە ماوەی پەنجا و پێنج ساڵ ئامانجی ئەندێشە و ژیانم بووە.

دووهەم:

لە ئەنجامی نەخۆشی و چەند هۆکارێکی ترەوە، لە کۆڕ و گفتوگۆی برایانی قوتابیانی نوورم بێ بەش بووم. بۆیە لە بریی خۆم ئەو دەرسانە دەکەم بە بریکارم کە "پەیامەکانی نوور" لە قوتابخانەی قورئاندا بە سەعیدی نوێیان وتەوە و، ئەوانەش کە سەعیدی کۆن لە ژیانی کۆمەڵایەتی وەری گرتن، وەك وتاری شام و پاشکۆکانی. جا ئەو دەرسانە دەکەم بە جێگەداری ئەم برا لاواز و موشتاقەتان لە بریی قسە و گوفتارەکانی.

سێهەم:

پرسە و سەرەخۆشی پێشکەشی قوتابی تایبەتمەند و بێگەرد و بڵاوکەرەوەی پەیامەکانی نوور "تاهیری"ی[1] قارەمان دەکەم، کە ماڵەکەی خۆی کردووە بە قوتابخانەیەکی بچووکی نوور، بە بۆنەی کۆچی دوایی ئەو باوکە بەڕێزەیەوە کە ئەمی بە بازنەی نوور بەخشی. هەروەك سەرەخۆشی ئاراستەی خزم و کەسانی و ئیسپارتە و بازنەی پەیامەکانی نوور دەکەم و، لە خوای گەورەی بەتوانا داواکارم

---

(١) تاهیری مۆتلو: یەکێکە لە قوتابییە هەرە تێکەڵ و نزیکەکانی مامۆستا نوورسی و، لەگەڵیدا بەندکراوە و، دوای وەفاتی مامۆستاش یەکێکە لەوانەی کاروباری پەیامەکانی نووریان لە ئەستۆدا بووە، هەتا لە ساڵی ١٩٧٧ز و لە تەمەنی حەفتا و حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

کە بە ئەندازەی ژمارەی پیتەکانی پەیامەکانی نوور سۆز و میهرەبانیی خۆی بەسەر گیانی ئەو خوا لێخۆشبووەدا ببارێنێت.

الباقي هو الباقي

برای نەخۆشتان

سەعیدی نوورسی

* * *

(ڕەخنەی وەلی‌یەکی مەزن)

باسمه سبحانه

برا ئازیزەکانم!

کتێبێکی چاپکراوی سەعیدی کۆنم دەست کەوت کە ناوی "مونازەرات"ە و، بە وردبینی و تاسەمەندی‌یەوە تێم ڕوانی. یەکسەر ئەم بڕگەیەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

یەکەم:

ئەم کتێبەی کە ساڵی ١٣٢٩ك لە چاپخانەی "أبو الضياء" چاپ کراوە، بریتی‌یە لەو دەرسەی کە لە ساڵی سێ‌هەمی سەردەمی سەربەستیدا و بۆ ئەوەی هۆز و خێڵەکان بە ڕاستی و دروستی لە شوورای شەرعی تێبگەن و وەری بگرن، سەعیدی کۆن بە عەشرەتەکانی "ئەرتووش" بە تایبەت "گەڤەدان" و "مامەخووران"ی وتووەتەوە. بەڵام هەرچەند سێ ساڵ بە دوای ئەم نووسراوەمدا دەگەڕام بە داخەوە دەستم نەکەوت، تا لەم نزیکانەدا یەکێك نوسخەیەکی دەست کەوت و بۆی ناردم.

کتێبەکەم بە وردی و بە عەقڵی سەعیدی کۆن و بە سنووحاتی سەعیدی نوێ خوێندەوە. تێگەیشتم کە سەعیدی کۆن بە هەستێکی سەیر و سەرسووڕهێنەری پێش وەخت نزیکەی چل ساڵ پێش ئێستا هەستی بەم ڕووداوە ماددی و مەعنەوی‌یانە کردووە کە ئێستا ڕوو دەدەن. چونکە لە پشت پەردەی هۆز و

عەشیرەتە کوردەکانەوە ئەو خیانەتکارانەی بینی کە ئەم ڕۆژگار و زەمانەیان کردبوو بە ڕووپۆشی خۆیان و، بریتین لەو مولحید و جاهیلە ڕاستەقینە و کۆنەپەرستانەی کە دەیانەوێت لە ژێر پەردەی نیشتمان پەروەریدا ئەم نەتەوەیە بەرەو داب و نەریتە پێشینەکانی پێش سەردەمی ئیسلام بوونیان بگێڕنەوە و، سەعیدی کۆنیش بە توند و تیژی لەگەڵیان دواوە.

دووهەم:

ئەو لاپەڕانەم لەم کتێبەدا خوێندەوە کە تیایاندا دەردەکەوێت وەلی‌یەکی گەورە لەناو گوێ بیستانی ئەو دەرسەمدا بێت، بێ ئەوەی من پێی بزانم. چونکە لەو مەقامەدا ڕەخنەیەکی توندی گرت و وتی:

- تۆ زیاد لە پێویست ڕۆ دەچیت و پێی لێ ڕادەکێشیت، چونکە "ئەندێشە" بە "حەقیقەت" پیشان دەدەیت و، لەو ڕووەوە کە پێت وایە ئێمە "نەزان" بین. سووکایەتیمان پێ دەکەیت. خۆ ئێمە لە چەرخی ئاخر زەماندایین و فەساد و خراپکاری پەرە دەسێنێت و لەمەولاش لە خراپەوە بەرەو خراپتر سەردەکێشێت.

وەڵامی ناو کتێبەکەش بەم جۆرە بوو کە:

بۆچی دەبێ دنیا بۆ هەموو کەسێك گۆڕەپانی پێشکەوتن بێت و، تەنها بۆ ئێمە مەیدانی دواکەوتن بێت؟! جا ئەگەر وایە، ئەوا سوێند بێت لەگەڵ ئێوە نەدوێم و پشتتان لێ هەڵبکەم و، ڕووی گوفتارم بکەمە ئەوانەی کە لە ئایندەدا دێن:

(ئەی ئەو کەسەی وا لە پشت چەرخێکی بڵندی دوای سێ سەد ساڵەوە و بە ئەسپایی و بێ دەنگی گوێ لە وتەکانی "نوور" ڕادەگرێت و، بە تەماشا کردنێکی غەیبی و پەنهان بۆمان دەڕوانێت!

ئەی ئەوانەی ناوتان: "سەعید و حەمزە و عومەر و عوسمان و تاهیر و یووسف و ئەحمەد" و ئەم چەشنە ناوانەیە!

من لەگەڵ ئێوە دەدوێم.. سەرتان بەرز بکەنەوە و تەسدیقم بکەن و بڵێن: "ڕاستت وت" با ئەم تەسدیق کردنەش قەرز بێت لە ئەستۆتاندا!

با واز لەم هاوچەرخانەم بێنین کە گوێ بۆ وتەکانم ڕاناگرن، من لەگەڵ ئێوەمە و، هەر لە شیوە قوولەکانی ڕابوردووەوە - کە ناوی مێژووی لێ نراوە - تا دەگاتە لوتکە بڵندەکانی ئایندەی ئێوە و، لە ڕێی شەپۆلەکانی "ئەثیرەوە" لەگەڵتان دەدوێم..

چی بکەم؟ ناچار بووم زوو بێم و بە دەستی خۆم نەبوو، ویستی قەدەر وا بوو کە لە زستانی ژیاندا بێمە ناو ئەم ژیانە. بەڵام خۆزگەم بە ئێوە، لە بەهارێکی خۆشی بەهەشت ئاسادا دێنە مەیدان و، ئەو تۆوانەی "نوور" کە ئێستا دەچێنرێن، لە زەویی ئێوەدا بە چەندین گوڵی گەش دەمیان دەپشکوێت.

ئێمە بەرامبەر بە خزمەتگوزاری‌یەکانمان تەنها داوای ئەوەتان لێ دەکەین کە هەر کات هاتن و بە قەدپاڵی ڕابوردوودا گوزەرتان کرد، سەرێك لە گۆڕەکانمان بدەن و دیاری‌یەکانی ئەو بەهارەتان لەسەر لووتکەی قەڵاکەدا بڕوێنن).

(واتە وەك ئەوەی لە ئومێدی سیازدەهەمی "پەیامی پیران"دا باس کراوە کە: بە مردنی قوتابخانەی خورخوری ژێر قەڵا سەختەکەی وان، کە قوتابخانەیەکی سەرەتایی قوتابخانەی زەهرایە و، بە مردنی سەرجەمی قوتابخانە شەرعی‌یەکانی ئەنادۆڵ، هەموو قوتابخانەکان مردن و گیانیان لەدەست دا. وەك بڵێی قەڵاکەی وان بووە بە کێلێك بۆ گۆڕە مەزنەکەیان. دەسا ئەی ئەوانەی کە دوای سێ سەد ساڵ دێن! گوڵی قوتابخانەیەکی نوور لەگەڵ خۆتاندا بهێنن و لەسەر لوتکەی ئەم قەڵایە بیڕوێنن).

واتە جەستەی ئەو قوتابخانەی زەهرایە بنیات بنێن کە گیانەکەی لە ناوەندی دەستەیەکی فراواندا دەژی و هێشتا جەستەکەی نەبووژاوەتەوە. هەرچەند "سەعیدی کۆن" زۆربەی ژیانی لە پێناوی هێنانەدیی ئەو قوتابخانەیەدا بەسەر برد و، گەلێ ڕاستیی گرنگیشی - چ لە بارەی دامەزراندن و چ لە بارەی سوودەکانی ئەو قوتابخانەیە - لەو دانراوەیدا تۆمار کردووە.

جێی خۆشحاڵی و مایەی گەشبینی‌یە کە دوای شکست هێنانی زەبر و زەنگی ئەو ئیستبدادە ترسناکەی کە بیست و پێنج ساڵی خایاند و کۆتایی بە ژیانی

قوتابخانە شەرعی‌یەکان هێنا، "تۆفیق ئیلەری"ی وەزیری پەروەردە بڕیاری دامەزراندنی قوتابخانەی زەهرای داوە لە "وان"دا بە ناوی "زانکۆی خۆرهەڵات" و، "جەلال بایار"ی سەرۆك کۆماریش - بێ ئەوەی پێی بزانێت - بڕیارەکەی وەزیری پەسەند کردووە و خستوویەتیە لیستی مەسەلە گرنگەکانەوە. خۆ ئەمەش ئەو شتەیە کە چل ساڵ پێش ئێستا "سەعید" ئاواتەخوازی بوو. پشت بە خوا ئاواتەکەی دێتە دی.

لێرەدا سێ "ڕاستی" بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو وەڵامەی سەعیدی کۆن پێش چاو دەخەین کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا داویەتەوە:

ڕاستیی یەکەم:

"سەعیدی کۆن" بە هەستی پێش وەخت هەستی بە دوو ڕووداوی سەرسووڕهێنەر کردبوو، بەڵام بە وێنەی خەونە ڕاستەکان ئەو هەستەش پێویستی بە تەعبیر بوو. چونکە هەروەك ئەگەر کەسێك لە پشت پەردەیەکی سوورەوە سەیری شتێکی سپی بکات بە سوور دەیبینێت، سەعیدی کۆنیش لە پشت پەردەی سیاسەتی ئیسلامی‌یەوە سەیری ئەو ڕاستی‌یەی کرد، ئیتر تا ڕادەیەك شێوەی ڕاستی‌یەکە لە بەرچاویدا گۆڕا. ئەو وەلی‌یە پیاوچاکەش کە ئامادەی کۆڕەکە بوو، بەو هەڵەیەی سەعیدی کۆنی زانی و، لەو ڕووەوە ڕەخنەی لێ گرت.

ئەو ڕاستی‌یەش دوو بەشە:

بەشی یەکەم:

"نوورێکی درەخشانی گەورە لە وڵاتی دەولەتی عوسمانیدا سەرهەڵدەدات".
تەنانەت لە پێش سەردەمی سەربەستیدا سەعید چەندین جار ئەم مژدەیەی - وەك دڵدانەوەیەك - بە قوتابی‌یەکانی داوە..

هەروەها: "سەرەڕای ئەو کاولکاری و فەسادەی لە پێش چاودایە، ئەو نوورە بەختەوەریی ئەم نیشتمانە دەهێنێتە دی". ئەوەبوو لە دوای چل ساڵ "پەیامەکانی نوور" ئەم ڕاستی‌یەی تەنانەت بۆ چاوە نابیناکانیش دەرخست.

سەعیدی کۆن هەستی بە سوودە مەزن و فراوانەکان و جۆرە بەرز و بڵندەکەی ئەو نوورە کردبوو، بەڵام لە ناوەندی "سیاسەت"ەوە بۆی ڕوانی و، بە چەشنێك لێکی دایەوە کە وەك بڵێی لە هەموو وڵاتی عوسمانیدا سەرهەڵبدات، بێ ئەوەی "چەندایەتی"یە کەمەکەی ئەو نوورە و ئەندازە تەسکەکەی ڕەچاو بکات.

کەواتە سەعیدی کۆن تا ڕادەیەك حەقی پێکاوە و، ئەو وەلی‌یەش هەر لەسەر حەق بووە کە ڕەخنەی لێ گرتووە لەوەدا کە بازنە تەسکەکەی بە فراوانی بینیوە..

چونکە بازنە تەسکەکەی "پەیامەکانی نوور"، لە ڕووی پاراستنی ئیمانەوە، گەلێ فراوانە، چونکە ژیانی هەمیشەیی ڕزگار دەکات. ئەوەتا یەك ملیۆن کەس لە قوتابیانی لە حوکمی ملیارێکدان. واتە هەوڵی بەختەوەر کردنی ئەودنیای هەزار کەس زۆر چاکترە و، لە ناوەرۆکدا گەلێ فراوانترە لەوەی کە لە ژیانی دنیا و شارستانیدا بەختەوەر بکرێن.

جا ئەمە ئەو ڕاستی‌یە بوو کە "سەعیدی کۆن" بە هەستی پێش وەختی چەشنی خەونە ڕاستەکان بینیی. واتە ئەو نوور و ڕووناکی‌یە کەم و تەسکە، دەوراندەوری سەرانسەری وڵاتی عوسمانی دەدات.

جێی ئومێدە کە خوای گەورە لە ڕێی نەشونما کردنی ئەو تۆوە نوورانی‌یانەی کە "پەیامەکانی نوور" دەیانچێنن، ئەو بازنە فراوانە ڕووناك بکاتەوە. ئەو کاتەش ڕاستیی تەعبیر و لێکدانەوە هەڵەکەی سەعیدی کۆن دەردەکەوێت.

ڕاستیی دووهەم:

سەعیدی کۆن لە نووسراوە کۆنەکانی و لە "إفادة المرام"ی "إشارات الإعجاز"دا هەواڵی بە قوتابی‌یەکانی دەدا و بە دووپات کردنەوەی یەك لە دوای یەك پێی دەوتن کە:

بوومەلەرزەیەکی ماددی و مەعنەویی کۆمەڵایەتیی یەکجار گەورە لەناو گرۆی مرۆڤدا ڕوو دەدات و، ئەو کاتەش خەڵکی خۆزگە بە گۆشەگیری و ژن نەهێنانم دەخوازن.

تەنانەت لە یەکەم سالّی سەردەمی سەربەستیدا "شێخ بەخیت"ی موفتیی میسر لە "سەعیدی کۆن"ی پرسی:

– سەبارەت بەم سەربەستی‌یەی دەولّەتی عوسمانی و، شارستانێتی ئەوروپا، ڕات چۆنە؟

سەعیدی کۆن وەلاّمی دایەوە:

– دەولّەتی عوسمانی سکی بە دەولّەتێکی ئەوروپایی پڕ بووە و ڕۆژێك دێت دەزێت.. ئەوروپاش سکی بە ئیسلامەتی پڕ بووە و ڕۆژێك دێت دەبێت!

شێخی بەڕێزیش وتی:

– منیش تەسدیقی قسەکەی دەکەم.

پاشان بە زانایانی دەوروبەری خۆی وت:

– من مونازەرەی ئەم لاوە ناکەم و ناتوانم بەسەریدا زالّ بم.

ئەوەبوو دوایی بە چاوی خۆمان لەدایکبوونی یەکەمان بینی، کە بریتی بوو لەوەی دەولّەتی عوسمانی لە دوورکەوتنەوەیدا لە ئایین چارەکە سەدەیەك پێش ئەوروپا کەوتەوە!

بەلاّم لەدایکبوونی دووەهەم – پشت بە خوا – دوای نزیکەی سی سالێك دێتە دی و، چ لە خۆرهەلاّت و چ لە خۆرئاوادا دەولّەتێکی ئیسلامی پەیدا دەبێت.

ڕاستیی سێهەم:

سەعیدی کۆن و نوێ، بە هەستێکی پێش وەخت و جەختێکی لەڕادەبەدەر و دووپات کردنەوە، هەوالّی ڕووداوێکی گەورەی ماددی و مەعنەوی و سەرهەلّدانی بوومەلەرزەیەکی مرۆیی کۆمەلاّیەتیی ترسناك و ڕووخێنەری لە دەولّەتی عوسمانیدا، ڕادەگەیاند.. هەر بەو هەستە پێش وەختەش ئەو ڕووداوانەی بازنە یەکجار فراوانەکەی لە بازنەیەکی بچووکدا بینی.

خۆ هەرچەندە ڕۆژگار بە "جەنگی جیهانیی دووهەم" تەسدیقێکی تەواوەتیی ئەو هەوالّەی کرد، لەگەلّ ئەوەشدا هەر "سەعید" بۆ خۆی بینینی ئەو بازنە فراوانە لە ولاّتی عوسمانیدا بەمەی خوارەوە لێك دەداتەوە:

سەرەڕای فراوانیی لەڕادەبەدەری ئەو کاولکاری‌یەی کە جەنگی جیهانیی دووهەم بەرهەمی هێنا، کەچی هێشتا بە کەم.و بەرتەسك دادەنرێت لەچاو ئەو کاولکاری‌یەی کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕووی دا. چونکە کاولکاری‌یەکەی لەمەڕ جەنگی جیهانی ڕووی لە ژیانی دنیا و شارستانێتیی قەڵب و ساختەیە، بەڵام ئەوەی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕووی دا کاولکاریی ژیانی نەبڕاوە و بەختەوەریی هەمیشەییە و، لە ناوەڕۆکدا بوومەلەرزەیەکی ئیسلامیی گەلێ سەخت و ترسناکترە لە هی ئەو جەنگە!

بەم جۆرە "سەعیدی نوێ" سەهووەکەی "سەعیدی کۆن" ڕاست دەکاتەوە و، خەونە ڕاستەکەی لێك دەداتەوە و، هەستە پێش وەختەکەی پێش چاو دەخات و، لە هەمان کاتیشدا بەرپەرچی ڕەخنەکەی ئەو وەلی‌یە بەڕێزەش دەداتەوە کە وا دەردەکەوێت لەسەر حەق بێت. بەوەی کە دەیچەسپێنێت: هەستە پێش وەختەکەی سەعیدی کۆن لە چاو ڕەخنەکەی ئەو زیاتر لەسەر حەقە.

* * *

(قوربانیدانی صیددیقانە)

هەردوو ڕۆژنامەی: "بیوك جیهاد"(جیهادی گەورە) و "سبیل الرشاد" ئەو ڕاگەیاندنەی منیان بڵاو کردەوە کە:

من "ئیمان" و "ئایین" و "پەیامەکانی نوور" ناکەم بە ئامڕازێك بۆ سیاسەتی دنیایی، بە تایبەت بۆ کەماڵاتی مەعنەوی و پلەوپایە بەرزەکان، تەنانەت بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەیی و ڕزگاربوونیش لە دۆزەخ، کە هەموو کەسێك حەزی پێ دەکات. بەڵکو تەنها خزمەتێکی خاوێن و بێگەردە بۆ خوای گەورە و تەنها لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودایە و بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیەتی. ئەو شتەش کە ناچاری ئەمەی کردم تەنها "ئیخلاسی ڕاستەقینە"یە کە هێزی ڕاستەقینەی پەیامەکانی نوورە، بە ئومێدی ئەوەی کە بەهرەمەندی

هێندەی گەردیلەیەك لەو خۆبەختکاری‌یە بەرزەی حەزرەتی صیددیقی ئەکبەر - خوای لێ ڕازی بێت - بیم کە فەرموویەتی:

(لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە جەستەم هێندە گەورە بکات کە هەموو دۆزەخ پڕ بکاتەوە، تاکو جێی هیچ ئیمانداریکی تێدا نەمێنێتەوە و، من لە بریی ئەوان سزا بدرێم)!

منیش بە هەمان جۆر، ڕازیم بڕۆمە ناو دۆزەخەوە، تاکو چەند کەسێکی خاوەن "ئیمان"ی لێ دەرباز بکەم!

ئاشکراشە کە نابێت بە تەماعی بەهەشت و لە ترسی دۆزەخ "پەرستش" ئەنجام بدرێت، بەڵکو لەبەر فەرمانی پەروەردگار و بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواوەند، جێبەجێ دەکرێت.

* * *

(لە بارەی "تحضير الأرواح"ەوە)

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برایانی ئازیز و بەوەفام!

بە گەلێ نیشانە و ڕووداوی زۆر و جۆراوجۆر سەلماوە کە دوژمنانی قوتابیانی نوور چەندین پیلان ڕێکدەخەن تاکو هەندێ لە قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانی نوور ناچار بن واز لە خزمەتی نوور بهێنن، یاخود لە کارەکەیاندا سستیان دەکەنەوە. بۆ ئەم مەبەستەش دەچن دەمارە لاوازەکانیان دەدۆزنەوە و لەوێوە دەیانگرن!

وا لە خوارەوەدا دوو نموونە پێش چاو دەخەین، تاکو ببن بە مایەی پەند لێ وەرگرتن:

نموونەی یەکەم:

ئەم نموونەیە بریتی‌یە لەوەی کە: دەچن سەرنجی هەندێك لە قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانی نوور، کە پەیوەندی‌یەکی بەهێز و پتەویان بە خزمەتی نوورەوە هەیە،

بۆ لای شتێکی تری غەیری خزمەت ڕادەکێشن و، بە چەند مەشرەبێکی ڕۆحانیی پڕ لە چێژەوە سەرقاڵیان دەکەن. کە ئەمەش توندوتۆڵی و پەیوەندیی پتەوی نێوانیان لاواز دەکات..

یان بە هەواڵ وەرگرتن لە مردوانەوە کە پێی دەوترێت: "تحضـير الأرواح" و لە ڕاستیدا گفتوگۆکردنە لەگەڵ جنۆکەدا، سەرقاڵیان دەکەن..

یان بە هەواڵدان لە ڕووداوەکانی ئایندە، بە وێنەی هی کاهینە پێشووەکان، دەیانخڵافێنن، گوایا پەیوەندی‌یەکی چەشنی گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ چەند وەلی‌یەکی مەزن، تەنانەت لەگەڵ پێغەمبەرانیشدا - درووددیان لەسەر بێت - ئەنجام دەدەن!..

هەروەها فێڵە لەخشتەبەرەکانی تری هاوچەشنی ئەمانە.

لەبەر ئەوەی مەسەلەی "تحضـير الأرواح" و "هەواڵدان لە غەیب" لە لایەن بیانی‌یەکانەوە هاتووە و لە فەلسەفەوە سەری هەڵداوە، ئەوا لەوانەیە زیانی زۆر بە ئیمانداران بگەیەنێت لەو ڕووەوە کە دەتوانرێت بە شێوەیەکی خراپ بەکار بهێنرێت، چونکە ئەگەر یەك دانە "ڕاست"ی تێدا بێت ئەوا دە دانە "درۆ"شی لەگەڵدایە و، هیچ مەحەك و تەرازوویەکیش بۆ لێك جیاکردنەوەی ڕاست و درۆی ئەو بوارە بەدەستەوە نی‌یە.

هەر بەم هۆکارە، ئەو جیننی‌یانەی کە یارمەتیی ڕۆحیانەتە چەپەڵەکان دەدەن، زیان بە دڵی ئەو کەسەی کە بەم مەسەلانەوە سەرقاڵە و، بە ئایینی ئیسلامیش پێکەوە دەگەیەنن، چونکە هەرچەند ئەم چەشنە هەواڵ ڕاگەیاندنانە بە ناوی کاروباری ڕۆحی و مەعنەوی‌یەوە ئەنجام دەدەن و خۆیان - کە لە ڕاستیدا ڕۆحانی چەپەڵن - بە ڕۆحە خاوێنەکان لە قەڵەم دەدەن، کەچی هەواڵەکانیان پێچەوانەی ڕاستی‌یەکانی ئیسلامە و دژی بیروباوەڕە گشتی‌یەکانیەتی، تەنانەت هەوڵ دەدەن کە بناغەکانی ئیسلام تێك بدەن، یان دەچن لاسایی ناوی چەند ئەولیایەکی مەزن دەکەنەوە و هەندێ وشەیان بە ناوی ئەوانەوە لە زار دەردەچێت.

بەم جۆرە و لەم ڕێیەوە، دەتوانن "ڕاستی" لە پێش‌چاوی مرۆڤە ساویلکەکاندا بشێوێنن لەوانەی کە دەبن بە قوربانیی فڕوفێڵەکانی ئەوان.

خۆ ئەگەر درەوشانەوەی "خۆر" کە بەسەر پارچە شووشەیەکی بچووکەوە دەبینرێت، بە ناوی خۆرەوە بدوێت و بڵێت: ڕووناکی‌یەکەم سەرانسەری دنیا دەگرێتەوە و گەرمی‌یەکەشم هەموو شتێك گەرم دەکاتەوە و خۆیشم یەك ملیۆن جار لە گۆی زەوی گەورەترم.. دیارە ئەم گوفتارەی گەلێ پێچەوانەی حەقیقەت دەبێت!

پێغەمبەریش ﷺ کە لە پلەی ڕاستەقینە و بەرزی خۆیدا وەکو خۆری درەخشان وایە، هەرگیز ناکرێت لە دەمی هەواڵدان لە ئایندە و "تحضیر الأرواح"دا "درەوشانەوە"کەی لە بریی "خۆی" بدوێت. خۆ ئەگەر بە ناوی پێغەمبەرەوە دوا، ئەوا گوفتارەکەی بە سەدان قات و بە جۆرێکی کوللی پێچەوانەی واقیع دەردەچێت. کەواتە هەرگیز ناکرێت دەرکەوتنی درەوشانەوەیەکی جوزئیی ئەو لە دەمی "تحضیر الأرواح" و هەواڵدان لە ئایندە، بە ماهییەتی بەرز و بڵندی خاوەنی وەحی قیاس بکرێت کە بە وێنەی "خۆری مەعنەوی" وایە. کەواتە هەرگیز ناتوانرێت ئەو حەقیقەتە مەزنە بهێنرێت و ئامادە بکرێت، تەنانەت هەوڵی هێنان و ئامادە کردنی، جگە لە بێ ئەدەبی و سووکایەتی و بێ ڕێزی، هیچی تر نی‌یە!

لە ڕاستیدا نزیك بوونەوە لەو پلەوپایە بەرزە تەنها بە سەیر و سلووك دەبێت و، هەر تەنها لەو ڕێیەوە مرۆڤ دەتوانێت بەهرەمەندی کۆڕ و گفتوگۆی ئەو خۆرە ڕاستەقینەیە ببێت، وەك ئەوەی کە بۆ "جەلالەددینی سیووتی" و چەند ئەولیایەکی تر ڕووی داوە.

ئنجا دەبێ بزانرێت کە تەنانەت ئەم بەرزبوونەوەیەش - وەك پەیامەکانی نوور چەسپاندوویانە - تەنها دانیشتن و گفتگۆیەکە لەگەڵ "ویلایەت"ی پێغەمبەردا ﷺ کە بەپێی توانا و لێهاتنە زاتی‌یەکانی ئەو کەسانە دێتەدی کە بەم سەیر و سلووکەدا بەرز دەبنەوە.

بەلاّم "حەقیقەتی پێغەمبەرایەتی" لەبەر ئەوەی گەلێ بەرز و بلّندترە لە "ویلایەت"، ئەوا هەر گفتوگۆیەك لەگەڵیدا کە بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕۆحی یان "تحضير الأرواح"ەوە بەدەست بهێنرێت و گوفتاری لێ وەربگیرێت، هەرگیز ناگاتە ئاستی گفتوگۆلەگەڵ کردن و وەرگرتنی ڕاستەقینە و ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەرەوە ﷺ و، هەرگیز نابێت بە مایە و تەوەرەی حوکمە شەرعی‌یەکان.

ئەو "تحضير الأرواح"ە کە لە ئاینەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو لە ڕۆچوونی مرۆڤەوە لە وردەکاریی فەلسەفەکاندا سەری هەڵداوە، بزووتنەوەیەکی پێچەوانەی "حەقیقەت"ە و، دژی ئەدەب و ڕێزی پێویست و شایانە! چونکە هێنانی ڕۆحیانەتی ئەو کەسانەی کە لە "أعلى عليين" و پلە هەرە بەرزە خاوێنەکاندان بۆ سەر مێزی "تحضير الأرواح" کە جێی گاڵتەوگەپ و درۆ و دەلەسەیە و، لە پلەی هەرە نزمی "أسفل سافلين"دایە، لە ڕاستیدا سووکایەتی‌یەکی لەڕادەبەدەر و بێ ئەدەبی و ڕێز نەزانی‌یەکی ڕوون و ئاشکرایە.

حەقیقەتی ڕاستەقینە و ئەدەبی بێگەرد و ڕێزی شایان لەو ڕووداوانەدایە کە بۆ مەردە بەرزەکانی چەشنی: جەلالەددینی سیووتی و جەلالەددینی ڕۆمی و ئیمامی ڕەببانی، لە ڕێی سەیر و سلووکی ڕۆحی‌یەوە، بەدەستیان هێنا و، گەیشتنە پلەی "نزیکی" لەو کەسە بەرزانە و، لەوانەوە بەهرەمەندی ڕێزنە و بەرەکەتەکان بوون.

شەیتان و گیانە چەپەڵەکان هەرگیز لە خەونە ڕاستەکاندا بەرجەستە نابن، کەچی لە "تحضير الأرواح"دا و بە پێچەوانەی فەرمانەکانی شەرع و سوننەتی نەبەویی پیرۆزەوە، دەگونجێت ئەو ڕۆحیانەتە چەپەڵانە بە ناوی یەکێك لە پێغەمبەرانەوە - درووودیان لەسەر بێت - بدوێن و لاسایی بکەنەوە!

جا ئەگەر ئەو قسەکردنانە پێچەوانەی فەرمانەکانی شەرع و سوننەتی نەبەوی بوون، ئەوا بەڵگەیەکی بێ گومانە لەسەر ئەوەی کە قسەکەر نە لە گیانە خاوێنەکانە و نە موسڵمان و ئیمانداریشە، بەڵکو لە گیانە چەپەڵەکانە و، بەو شێوەیە لاسایی گیانە خاوێنەکان دەکاتەوە!

دووهەم:

ئێستا قوتابیانی نوور لەم جۆرە شتانەدا پێویستیان بە ڕێنمایی زیاتر نی‌یە، چونکە "پەیامەکانی نوور" ڕاستیی هەموو شتێکیان لەم بارەوە یەکالا کردووەتەوە و، پێویست بە ڕوونکردنەوەی تر نەماوە. کەواتە پەیامەکانی نوور سەروزیادیانە.

ئەوانەش کە لە دەرەوەی قوتابیانی پەیامەکانی نووردان، پێویستە گوێ لەم چەشنە پڕوپاگەندە و تەلقینانە ڕانەگرن کە دژ و پێچەوانەی فەرمانەکانی شەرع و سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ، ئیتر چ لە ڕێی "تحضیر الأرواح"ەوە بێت، یان لە هەر ڕێیەکی ترەوە. ئەمە لە هەموو شتێك پێویستترە بۆیان، دەنا هەڵەیەکی گەلێ گەورە ڕوو دەدات.

بێدارکردنەوەیەك:

ئەم ڕەخنە توند و تیژەی کە لەم نامەیەدا ئاراستەی گفتوگۆکردن لەگەڵ گیانەکاندا کراوە، تەنها مەبەست لەو بزووتنەوەیەیە کە لە فەلسەفە و زانستەوە سەرچاوەی گرتووە و ناوی: "تحضیر الأرواح" و "خەواندنی موگناتیسی" و "هەواڵدان لە ئاینده"ی لێ نراوە.

واتە ئەم ڕەخنە توندوتیژە ئاراستەی تەسەووف و ئەهلی تەریقەت نەکراوە کە لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە و، کارەکەیان وەك بروسکە و تەلەفۆن وایە لەگەڵ گیانەکاندا و، بەهۆی خۆ تێهەڵقورتاندنی کەسانی نائەهلەوە تا ڕادەیەك بە خراپی بەکار هێنراوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە ئەو بروسکە و تەلەفۆنە - لە ڕوویەکەوە - بۆ هەندێ کەس زیانی تێدا بێت، بەڵام مرۆڤ بەهەڵەدا نابات و مەبەست تیایدا زیان گەیاندن نی‌یە بە ئیسلام.

جگە لەمانەش، ئەو مەشرەبەی کە لە لایەنی بیانی‌یەکانەوە هاتووە پێچەوانەی تەریقەتی سۆفی و خودی ئایینی ئیسلامیشە، هەروەك هەوڵی ئەوە دەدات کە ڕێبازی تەسەووف بڕووخێنێت و، لە شان و شکۆی دابگرێت و، وەك شتێکی ئاسایی پیشانی بدات.

دەبا ئەو سۆفی‌یانەی کە لەبەر لاوازیی خۆیان هێشتا بەهرەمەندی شوێنکەوتنی تەواوەتیی سوننەتی نەبەوی نەبوون، ئاگایان لە خۆیان بێت و هەوڵی لاسایی کردنەوەی ئەوانە نەدەن!

سەعیدی نوورسی

* * *

(ڕاستی‌یەکی تایبەت بە ژیانی کۆمەڵایەتیمان بە دڵدا هێنرا)

چوار حیزب لەسەر خاکی ئەم نیشتمانەدا هەن: حیزبی گەلی کۆماری[1]، حیزبی دیموکراتی[2]، حیزبی نەتەوە[3]، حیزبی یەکێتیی ئیسلامی.

حیزبی یەکێتیی ئیسلامی کاتێك دەتوانێت حوکم بگرێتە دەست کە لە سەدا شەست تا لە سەدا حەفتای ئەندامەکانی ئایینداری تەواوەتی بن، تاکو ئایین نەکات بە ئامرازی دەستی سیاسەت، بەڵکو سیاسەت لە پێناوی ئاییندا بەکار بهێنێت. بەڵام پێویستە کە ئەم حیزبە ئێستا حوکم نەگرێتە دەست، چونکە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی تاوان و خراپەکاری‌یەکانی ئێستای سیاسەتدا ناچار دەبێت ئایین لە ژێر

---

(١) حیزبەکەی مستەفا کەمالە، کە ڕچە شکێن و پێشڕەوی هەموو ئەو تاوانانەیە بەرامبەر ئایینی ئیسلام و نەتەوەی کورد کراوە و دەکرێ لە تورکیادا. (وەرگێڕ)

(٢) لە ساڵی ١٩٤٦ز دا لە حیزبی گەلی کۆماری جیا بووەتەوە و ساڵی ١٩٥٠ز یش دەسەڵاتی گرتووەتە دەست، دوای ئەوەی کە لە کۆی ٤٥٠ ئەندامی پەرلەماندا ٤٠٨ ئەندام لەم حیزبە هەڵبژێررا و، "جەلال بایار" بوو بە سەرۆکی حیزب و سەرۆك کۆمار و "عەدنان مەندەرس"یش بوو بە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران. هەندێ لە دەسکەوتەکانی سەردەمی حوکمڕانیی ئەم حیزبە بریتی‌یە لە: گێڕانەوەی بانگی شەرعی و، زیادکردنی وانەی ئایین لە قوتابخانەکاندا و، پەخش‌کردنی بەرنامەی ئایینی و، بەخشینی هەندێ سەربەستی و ئازادی لە بڵاوکراوەکاندا. ئەم حیزبە دە ساڵ لە حوکمدا مایەوە، تا ساڵی ١٩٦٠ز بە کودەتایەکی سەربازی لابرا و، عەدنان مەندەرس و هاوڕێکانی لە سێدارە دران. (وەرگێڕ)

(٣) ئەم حیزبە ساڵی ١٩٤٨ دامەزراوە و لە حیزبی دیموکراتی جیابووەتەوە و، لە هەڵبژاردنەکاندا تەنها یەك ئەندامی پەرلەمانی بەدەست هێناوە! ساڵی ١٩٥٤ بە بیانووی بەکارهێنانی ئایین بۆ ئامانجە سیاسی‌یەکان داخراوە. پاشان لە ژێر چەند ناوێکی جیاجیادا دروست کراوەتەوە. تا دوایی لە ساڵی ١٩٧٧دا بە تەواوی خۆی هەڵوەشاندەوە. (وەرگێڕ)

فەرمانی سیاسەتدا بەکار بهێنێت، لەو ڕووەوە کە زۆر لە مێژە "پەروەردەی ئیسلامی" ڕووبەڕووی لاوازی و ناتەواوی بووەتەوە[١].

بەڵام "حیزبی گەلی کۆماری" ئەوا هەرچی تاوانی لە ماوەی بیست و هەشت ساڵدا ئەنجام داوە و، تاوانەکانی غەیری خۆی و، تەنانەت خراپکاری‌یەکانی "ئیتتحاد و تەرەقی"ش، بە تایبەت هی ماسۆنی‌یەکانیان، هەموو ئەمانە خراونەتە ئەستۆیەوە. سەرباری ئەم هەموو خراپکاری‌یانەش لەم حیزبەدا، کەچی - لە ڕوویەکەوە - لە حوکمی زاڵ و دەست ڕۆیشتوودایە بەسەر دیموکراتی‌یەکاندا! ئەوەتا لە ژێر پەردەی یاسادا بەرتیلێکی سەیر و بەلەزەت دەرخواردی هەندێ لە کارمەندان دەدات، چونکە بە کەم بوونەوەی "خواپەرستی" هەردەم "خۆپەرستی"ی مرۆڤ بەهێز دەبێت و بانگەوازکارانی فیرعەونایەتیی نەفس پتر زیاد دەبن.

جا لەم چەشنە ڕۆژگار و زەمانەی کە "فیرعەونێتیی نەفس"ی تێدا زیاد بووە و پەرەی سەندووە، "کارمەندیی حکوومەت" گیانی خۆسەپاندن و سەرکردایەتی و فیرعەونایەتی دەخاتە دەروونەوە، لەکاتێکدا کە ئەو کارمەندی‌یە لە ناوەرۆکدا تەنها بریتی‌یە لە خزمەتکردنی کەسانی تر.

لە شێوازی ئەو مامەڵە و ڕەفتارەی کە لەگەڵ مندا دەیکەن، هەستم کرد ئەم حیزبە پلەی "فەرمانڕەوایەتی"ی پڕ لە هەست و نەستی سەرسووڕهێنەر و بەتام و لەزەت - وەك بەرتیلێك - بە دەروونی بەشێك لە کارمەندەکان دەبەخشێت و، بەم جۆرە و لە ڕوویەکەوە ئەم حیزبە سەرکەوتن بەسەر دیموکراتی‌یەکاندا بەدەست

(١) ئەم حیزبەی کە مامۆستا لێی دەدوێت، دانەمەزراوە. مەبەستیشی پێی ئەو هەستە گشتی‌یە بووە کە لای ئەو گەلە موسڵمانە و چەند کەسایەتی‌یەکی حیزبە پارێزگارەکاندا سەری هەڵداوە، دوای ئەوەی کە هەندێ ئازادی‌یان لە چالاکیدا بۆ ڕەخسا. هەرچەندە کەسانێکی غیرەتمەند لەسەر ئیسلام هەوڵی دامەزراندنی ئەم حیزبەیان دا، بەڵام سەرکەوتنیان تێدا بەدەست نەهێنا. ئەو ڕێژە سەدی‌یەش کە مامۆستا باسی کرد تایبەتە بەوانەوە کە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت دەگرنە ئەستۆ. لەوانەیە مەبەستیشی لە ئایینداری تەواوەتی لەت لەت نەکردنی شموولییەتی ئیسلام بێت، تاکو نەکرێت بە ئامرازی دەستی سیاسەت. (وەرگێڕ)

دەهێنێت، سەرەڕای ئەو تاوانە ترسناکانەش کە ئەنجامی داون و، سەرباری دژە بڵاوکراوەکانی ناو ئەو ڕۆژنامانەش کە سەر بەو نین.

لە ڕاستیدا "کارمەندی"ی دەوڵەت بریتی‌یە لە خزمەتکردنی خەڵك، بەپێی ئەو دەستوورەی کە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە: "سيّد القوم خادمهم"[(١)]. چونکە ئەگەر "یاسا" هێزی تێدا نەبێت ئەوا ئەو هێزە دەکەوێتە دەستی کەسەکانەوە، ئەو کاتەش دەبێت بە ئیستبدادێکی هەڕەمەکی، بە هەموو واتایەکی ئەم وشەیە! کەواتە چار نی‌یە دەبێ هەریەك لە "دیموکراتییەت" و "ئازادیی ویژدان" پاڵ بەم دەستوورە ئیسلامی‌یەوە بدەن.

هەرچی "حیزبی نەتەوە"شە، ئەوا گەر مەبەست بە نەتەوە، بیری "نەتەوەی ئیسلام" بێت، کە بناغەی یەکێتیی ئیسلامی‌یە و نەتەوەی تورکیشی تێدا ئاوێتەیە، ئەوا ئەم واتایە لە واتا و ناوەڕۆکی حیزبی دیموکراتیدا هەیە و، کەسانی سەر بەم حیزبە لە ئەنجامدا ناچار دەبن کە بڕۆنە ڕیزی دیموکراتی‌یە ئایینداره‌کانەوە.

بەڵام ئەو "ڕەگەزپەرستی"یەی کە ئێمە بە دەردی سیلی خۆرئاوای دادەنێین، ئەوا بە وێنەی تاعوون لە خۆرئاواوە هاتووەتە ناومان و ئەورووپای لە ئێمەدا موتربە کردووە، تاکو بتوانێت جیهانی ئیسلامی لەتوپەت بکات. ئەم دەردە ترسناکە حاڵەتێکی ڕۆحیی خاوەن جازیبییەت پەرە پێ دەسێنێت، بە ڕادەیەك کە سەرەڕای زیان و مەترسی‌یە ڕووخێنەر و ترسناکەکانی، کەچی هەموو نەتەوەیەك حەز و ئارەزوویەکی کوللی یان جوزئی‌یان لە ئاستیدا هەیە!

جا ئەگەر بەهۆی زاڵبوونی شارستانێتیی خۆرئاوا و لاوازبوونی "پەروەردەی ئیسلامی"یەوە ئەم حیزبە لەم ڕووەوە سەرکەوتنێك بەدەست بهێنێت، ئەوا ڕەگەزەکانی تری غەیری تورك، کە لە سەدا حەفتای نەتەوەی ئیسلام دەنوێنن، ناچار دەبن بەرەیەکی دژ بە تورکە ڕاستەقینەکان بگرن کە لە سەدا سی تێپەڕ

(١) رواه عبدالرحمن السلمي في آداب الصحبة، ورواه الخطيب، واخرجه الديلمي، ورواه الطبراني ما بمعناه.. فالحديث ضعيف كما علمت. على انه قد يقال انه حسن لغيره لتعدد طرقه كما مرّ فتدبر (باختصار عن كشف الخفاء ٢ / ٤٦٣). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

ناکەن. دیارە ئەمەش پێچەوانەی سەروەریی ئیسلامە. چونکە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (فاطر:١٨) بە یەکێك لە بناغەکانی یاساکانی ئیسلام دادەنرێت. واتە هیچ کەسێك تاوانی کەسی تری لە ئەستۆدا نییە. کەچی لە "ڕەگەزپەرستی"دا هەموو کەسێك بە مافی خۆی دەزانێت کە برای کەسی تاوانبار، یان خزمەکانی، تەنانەت کەسانی هۆز و عەشرەتەکەشی بکوژێت! جا هەروەك ئەمە هیچ دادگەرییەك ناهێنێتە دی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگا بۆ گەلێ ستەمی چەپەڵ و ناشیرین خۆش دەکات. بەڵام بڕیاری دەستووری ئیسلام وایە کە هیچ کەسێکی بێ تاوان، تەنانەت لەبەر سەد تاوانباریش، سزا نادرێت و بەخت ناکرێت.

ئەمە مەسەلەیەکی گرنگی ئەم وڵاتەیە و، سەبارەت بە سەروەریی ئیسلامیشەوە گەلێ جێی مەترسییە.

جا مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا ئەی دیموکراتییە ئایینداره‌کان و ئەی ئەو کەسانەش کە ڕێز لە هەست و نەست و بەها ئایینییەکان دەگرن!

ئێوە - چ پێتان خۆش بێت و چ پێتان خۆش نەبێت - ناچارن کە ڕاستییەکانی "ئیسلام" بکەن بە پایە و پاڵپشتێکی خۆتان، چونکە لە ڕووی جازیبیەتی ماددی و مەعنەوییەوە زۆر بەهێزترە لە چاو جازیبیەت و هاندانی پایە و پاڵپشتەکانی ئەم دوو حیزبە. دەنا - بە پێچەوانەی ئەمە - هەرچی تاوان لە کۆنەوە تا ئێستا بەرامبەر بەم نەتەوەیە کراون، با ئێوەش نەتان کردبن، وەك دەخرێنە ئەستۆی حیزبەکەی پێشوو، دەخرێنە ئەستۆی ئێوەش. دیارە ئەو کاتەش حیزبی گەلی کۆماری "ڕەگەزپەرستی" دەقۆزێتەوە و لەو ڕێیەوە بەسەرتاندا سەردەکەون. ئەمەش - وەك من هەستم پێ کردووە - گریمانێکی بەهێزە. بۆیە من بە ناوی ئیسلامەوە زۆر لەم بارودۆخە نیگەرانم[1].

---

(١) لە ئەنجامی دەرکردنی یاسا هەڕەمەکییەکان و جێبەجێ کردن و پیادە کردنی خراپی ئەو یاسایانە لە سەردەمی حیزبی پێشوودا، مەسەلەی "تیجانی"(*) سەری هەڵدا، جگە لەوەی کە خەڵکیشیان

(چاوپێکەوتنی مامۆستا)

باسمە سبحانە

مامۆستامان دەڵێت:

(ئەمەی خوارەوە بۆ هەموو ئەو برا بەڕێزانە ڕوون دەکەمەوە کە حەزیان لە چاوپێکەوتن و سەرلێدانمە:

ئەگەر زۆر پێویست نەکات، توانای چاوپێکەوتنی خەڵکیم نەماوە. چونکە ئەم ژەهر پێدانەی ئێستام و، لاوازیی جەستەشم، هاودەم لەگەڵ پیری و نەخۆشیدا،

---

وروژاند و هانیان دان. جا لەبەر ئەوەی بەرپرسیاریی ئەم مەسەلەیە نەکەوێتە ئەستۆی دیموکراتیيە ئایینداره‌کان و، هەوڵ بدرێت لە پێش‌چاوی جیهانی ئیسلامیدا ڕێزیان نەشکێت، پێم وایە تاکە ڕێگا لەوەدایە کە:
هەروەك بە گێڕانەوەی بانگی شەرعی دە هێندەی هێزەکەی خۆیان هێزی تریان بەدەست هێنا، ئەوا گێڕانەوەی "ئەیاصۆفیا"ش بۆ دۆخی عیبادەت تێدا کردنی پێشووی، کاریگەرییەکی گەلێ باشی لە جیهانی ئیسلامیدا دەبێت و، بایەخدان و خۆشەویستیی جیهانی ئیسلامی بۆ خەڵکی ئەم وڵاتە دەستەبەر دەکات. هەروەها پێویستە دیموکراتیيە ئاییندارەکان ئازادیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور بە ڕەسمی ڕابگەیەنن. ئەو پەیامانەی کە دادگاکان بە درێژایی بیست و هەشت ساڵ شتێکیان تێدا نەدۆزییەوە زیانی بۆ وڵات تێدا بێت و، پێنج دانە دادگاش بڕیاری بێ تاوانییان بۆ دەرکردوون. ئێوە بەم کارەتان ئەم زامە ساڕێژ دەکەن و، بایەخ پێدانی جیهانی ئیسلامی دەستی خۆتان دەخەن. سەرەڕای ئەمانەش ستەم و تاوانەکانی غەیری خۆشتان ناخرێتە ئەستۆ.
لەبەر خاتری دیموکراتیيە ئاییندارەکان، بە تایبەت بەڕێزانی وەك "عەدنان مەندەرس" ماوەی یەك دوو ڕۆژێك ڕوانیمە کاروباره سیاسییەکان، هەرچەندەش سی و پێنج ساڵە وازم لێ هێناوە.
سەعیدی نوورسی

ئێمەی قوتابیانی نوور شایەتین و تەسدیقی ئەم حەقیقەتە دەکەین:

جەیلان، خەلیل، عوسمان، حەمزە و کەسانی تریش.

(*) ئەو مەسەلەیە بریتییە لەوەی کە شوێنکەوتووانی "تەریقەتی تیجانی" لە نێوان ساڵەکانی (١٩٥٠-١٩٥٢)دا هەڵمەتێکیان لە سەرانسەری تورکیادا کرد بۆ شکاندنی پەیکەرەکانی مستەفا کەمال و، لە ئەنجامی ئەمەشدا حوکم دران. یەکسەر دوای ئەمە یاسای "پاراستنی مستەفا کەمال و ئالوگۆڕەکانی" دەرکرا و "محەممەد کەمال پلاوئوغلو"ی سەرۆکیان - دوای تەواوبوونی ماوەی مەحکومییەکەی - ڕەهەندەی دورگەی "بوزجا" کرا و هەتا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٩٧٧دا لەوێ هەر دەست بەسەر بوو! (وەرگێڕ)

بڕستی ئەوەیان لێ بڕیوم کە قسەی زۆر بکەم. بۆیە بە دڵنیاییەوە پێتان ڕادەگەیەنم کە هەموو یەکێك لە کتێبەکانی پەیامەکانی نوور سەعیدێکە بۆ خۆی.

کەواتە هەر پەیامێك بخوێننەوە دە هێندەی چاوپێکەوتنی من سوودی لێ وەردەگرن..

تەنانەت بە جۆرێکی ڕاستەقینە من لەو پەیامەدا دەبینن و دیدارم لەگەڵدا دەکەن..

هەر لەبەر ئەوە، بڕیارم داوە کە هەموو بەیانی‌یەك لە دەمی خوێندنی دوعا و ویردەکانمدا دوعای خێر بۆ ئەوانەش بکەم کە لەبەر خوای گەورە پێیان خۆشە بێنە سەرلێدان و دیدەنم. لە بریی ئەوەی کە ناتوانن بمبینن. پشت بە خوا لەسەر ئەم بڕیارەشم هەر بەردەوام دەبم).

وا ماوەی دوو مانگە مامۆستامان ناتوانێت تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسەشدا بدوێت کە لە ئیش و کارەکانیدا یارمەتیی دەدات، چونکە هەر هێندەی دەکەوێتە قسە یەکسەر پلەی گەرمی‌یەکەی بەرز دەبێتەوە. خۆیشی لەسەر بناغەی "بێدارکردنەوەیەکی قەلبی" دەڵێت:

(حیکمەتی ئەمە بریتی‌یە لەوەی کە پەیامەکانی نوور هیچ پێویستی‌یەك بە من ناهێڵنەوە، کەواتە پێویست بە قسە و گوفتار نەماوە. سەرەڕای ئەوەی کە مەگەر لەگەڵ بیست سی دانە کەس لە خۆشەویستانم دەنا لەگەڵ کەسدا نادوێم. لەوانەیە ڕێی قسەکردنم لەگەڵ ئەوانیشدا لێ بگیرێت، تاکو هەست و سۆزی هەزاران خۆشەویستی ترمان زامدار نەبێت.

دەسا با برایانم بمبوورن لە بوارنەدانم بە چاوپێکەوتنە تایبەتی‌یەکان).

* * *

(گرنگیی قوتابخانەی زەهراء)

(چوار ساڵ پێش ئێستا کە مامۆستامان بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە منی دانا بە بریکاری خۆی بۆ بەدواداچوونەوەی کاروباری "پەیامەکانی نوور" لە دادگاکانی ئەنقەرەدا، ئەم نامە هاوپێچەی خوارەوەمان خستە بەردەست پەرلەمانتارە بەڕێزەکان.

وا ئێستاش بەهۆی بەردەوامبوونی هەمان مەسەلە، سەرلەنوێ پێشکەشی ئێوە و ئەندامانی بەڕێزی پەرلەمانی دەکەینەوە، بە تایبەت دوای ئەو هەوڵانەی کە لەم مانگانەی دواییدا بۆ دامەزراندنی زانکۆ تازەکەی پارێزگاکانی خۆرهەڵات دراوە):

بڵاوبوونەوەی فراوان و بەربڵاوی "پەیامەکانی نوور" لە ماوەی سی ساڵی ڕابوردوو چ لە ناوخۆ و چ لە دەرەوەی وڵاتدا و کاریگەریی باشیان لەسەر خەڵکی.. هەروەها هەوڵدانی بەردەوامی پەنجا و پێنج ساڵ پێش ئێستا بۆ دامەزراندنی زانکۆیەك لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا..

ئەمانە دوو مەسەلەی گرنگی یەك لە دوای یەك و تەواوکەری یەکترین و، جێی بایەخی جیهانی ئیسلامین.

چونکە ئەم نەتەوەیە (بە تایبەت خەڵکی پارێزگاکانی خۆرهەڵات) و، چوار سەد ملیۆن کەسی نەتەوەی ئیسلام و، جیهانی نەصرانییەتی موحتاج بە ئاشتی لە سەرتاسەری جیهاندا، بایەخ بەم دوو ئەنجامە مەزن و ڕووداوە گرنگە دەدەن. لەبەر ئەوەی کە دوو سەرچاوەی بەرفراوانن بۆ ڕاگەیاندنی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی ڕاستییەکانی قورئان.

مامۆستای بەڕێزمان پەنجا و پێنج ساڵ پێش ئێستا بە هیممەتێکی یەکجار بەرز و لە ڕێی بەکارهێنانی گەلێ هۆکارەوە هەوڵی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی وەك زانکۆی ئەزهەر و بە ناوی قوتابخانەی زەهرائەوە لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا

داوە و، دەری خستووە کە دامەزراندنی ئەم زانکۆیە گەلێ پێویستە، وەك لە پیرۆزباییەکەیدا بۆ سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران لەم ڕووەوە وتوویەتی:

(ئەو زانکۆیەی خۆرهەڵات بەهۆی ئەوەی لە شوێنێکی ناوەندیی جیهانی ئیسلامیدایە، ئەوا پلەوپایەیەکی بەرزی لەناو موسڵماناندا دەبێت. چونکە هەموو ئەو خزمەتە ئایینیە مەزن و بەرزانەی پێشین و گشت ڕەوشتە مەعنەویە نەمرەکانی هەزاران باپیری زانا و خواناس و شەهید و لێکۆڵەران کە لەو پارێزگایانەدا ئەسپەردە کراون، هەموویان لەو زانکۆیەدا دەبووژێنەوە و بەرجەستە دەبنەوە و، لە فراوانترین بوار و مەیداندا ئەرکە ئیمانییەکانیان سەرلەنوێ ڕادەپەڕێنن).

ئەو وانە بناغەییەش کە شایانی ئەوەیە بەرنامە و پرۆگرامی ئەو زانکۆیەی خۆرهەڵات بێت، بریتییە لە "پەیامەکانی نوور" کە تەفسیری ڕاستییە ئیمانییەکانی قورئانی پیرۆزن و، بەڵگەی ژیری و مەنتیقی و ئیمانی بۆ چەسپاندنی مەسەلە و بابەتە گەورە و گرنگەکانی قورئان دەهێننەوە.

کەواتە ئەم پەیامانە شایانی ئەوەن کە لە زانکۆ و قوتابخانە نوێیەکاندا بابەتی خوێندن و لێکۆڵینەوە بن.

"پەیامەکانی نوور" بەهۆی یەکێك لە قوتابیانی مامۆستایان و قوتابخانە ئایینییە زۆر و بڵاوەکانی سەرانسەری خۆرهەڵاتەوە سەریان هەڵداوە و، ئەو سەرچاوە مەعنەوییانەشیان تەقاندووەتەوە کە مایەی ژیانن.

ئێمە بە هەموو گیان و قەوارەیەکی خۆمان لە میهرەبانیی خواوەند ئومێدەوارین کە ئەو مامۆستا بەڕێزانە سەرلەنوێ ئەرکەکانی سەرشانیان بگرنەوە ئەستۆ و، لە ڕێی بەروبوومە ڕووناکەکانی ئێستای هەوڵ و کۆششەکانیانەوە بازنەی کارە فیکری و خزمەتگوزارییە قورئانییەکانیان فراوان بکەن و، لەم ڕێیەوە بارودۆخەکانی لەمەڕ ژیان و کات و شوێن و ئاشتی و ئاسایشی گشتی، بۆ هاتنەدیی ئەم ئاواتانەمان، ئامادە بن.

بەڵێ، "پەیامەکانی نوور" کە تەنها یەك بەروبووم و ئەنجامی گەورە و هەمەکیی چالاکی‌یە زانستی‌یەکانی خۆرهەڵاتن، شایانی ئەوەن کە لە لایەن کارگوزارانی ئیسلام و ئەم نەتەوەیە و جیهانی ئیسلامی‌یەوە بایەخیان ئاراستە بکرێت.

بایەخدان بە پەیامەکان و قوتابیانی نوور لە ئەمریکا و ئەوروپادا و بڵاوبوونەوەیان لەو شوێنانەدا، گرنگیی ئەم داوایەمان دەردەخات.

مستەفا صونگور

* * *

(وەسیەتێك)

هەر لە مێژە مامۆستامان لەسەر ئەو ڕەفتارەی دەڕوات کە بریتی‌یە لەوەی بە مەبەستی پاراستنی پلەی بەرزی زانست هیچ کاتێ زەلیلیی لە بەردەم گەورەترین سەرۆکدا نەنواندووە و، تەنانەت بە بێ بەرامبەر دیاریی لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە. ئێستاش لەبەر ئەو نەخۆشی‌یەی کە لە ڕادەبەدەر لاوازی کردووە دیاری لە کەس وەرناگرێت - کە زانایان پێیان وایە زیان لە وەرگرتنیدا نی‌یە - بگرە لە ئێمەشی وەرناگرێت کە خزمەتی دەکەین، با زۆر بچووکیش بێت. چونکە بە چاوی خۆمان دەبینین کە هەرکات ئەو دیاری‌یە بخوات پێشکەشی دەکەین پێی نەخۆش دەکەوێت!

ئیتر دڵنیا بووین لەوەی کە ئیلهامی دڵی کراوە نابێ ئەو دەستوورەی درێژایی ژیانی بشکێنێت، واتە نابێ "پەیامەکانی نوور" بکرێن بە ئامراز بۆ هیچ شتێك. ئەوەش لە پێناوی پارێزگاری کردن لە ئیخلاسی تەواوەتیدا.

ئێمە ئێستا لە وەرزە جەژنی پەیامەکانی نووردایـن، کە بڵاوبوونەوەی ئەو پەیامانەیە لە هەموو لایەکدا. کەچی هێشتا دەبینین مامۆستا لە گفتوگۆ وەڕس دەبێت و، بە سەیر کردن و تەوقە لەگەڵ کردنیش تەنانەت لەلایەن تایبەتمەندترین قوتابی و برای خۆیەوە قەڵس و بێزارە!

لەم ڕۆژە پیرۆزانەی جەژندا دەیوت:

(با گۆڕەکەم لە شوێنێکی تەواو پەنهاندا بێت و، جگە لە یەکدوو کەسی قوتابیانم کەسی‌تر شوێنەکەی نەزانێ. ئەمە وەسیەتمە بۆتان. چونکە ئەو ڕاستی‌یەی کە لە دنیادا ڕێی گفتوگۆی لێ گرتم، بێ گومان دوای مردنیشم ڕێم لێ دەگرێت).

ئێمەش لەلایەنی خۆمانەوە لە مامۆستامان پرسی:

ئەو کەسەی دێتە سەر گۆڕەکەت، فاتیحە دەخوێنێت و پاداشتی ئەو قورئان خوێندنەی دەست دەکەوێ.. ئیتر چ حیکمەتێك لەوەدا هەیە ڕێ نەدەن بەوەی سەردانی گۆڕەکەت بکرێت؟

وەڵامی دایەوە:

(ئەو "بێ ئاگایی"یەی کە لەم سەردەمەدا لە "خۆویستی" و "خۆشویستنی زات"ەوە سەری هەڵداوە، وا لە خەڵکی دەکات کە لە دەمی سەردانی گۆڕەکاندا بایەخ بە پلەوپایە و ناوبانگی دنیایی مردووەکە بدەن، وەك ئەوەی لە دێر زەماندا فیرعەونەکان دەچوون تەرمی مردووەکانیان بە مۆمیاکراوی هەڵدەگرت و، پەیکەریان بۆ دادەنان و، وێنەکانیان بڵاودەکردنەوە، تاکو سەرنجەکانیان بۆ ڕابکێشن. لە ئەنجامی ئەمەشدا ئەو سەرنجانە ئاراستەی واتای ئیسمی‌یەکە - واتە خودی کەسەکان - کران، نەك واتا حەرفی‌یەکەی، کە لە غەیری خودی کەسەکەدایە.. بە هەمان جۆر ئەهلی دنیای ئەم کاتەشمان ڕووی بایەخیان ئاراستەی خودی کەسە مردووەکە و پلەوپایەی دنیای دەکەن لە دەمی سەردانی گۆڕەکەی، لەبریی ئەوەی - وەکو جاران - سەردانێکی شەرعیی ڕەوا و بە نیازی ڕەزامەندیی خوا و پاداشتی دوارۆژ بێت.

لەبەر ئەوە.. وەسیەتتان بۆ دەکەم کە شوێنی گۆڕەکەم ئاشکرا نەکرێت، لەبەر پارێزگاریی نهێنیی ئیخلاسی تەواوەتی و، تاکو ئەو ئیخلاسەش زامدار نەکەم کە لە پەیامەکانی نووردا هەیە. ئیتر کەسێ کە فاتیحە بخوێنێت لە هەر شوێنێکی خۆرهەڵات یان خۆرئاوا بێت و، هەرکەسێ بێت، پاداشتەکەی بەو ڕۆحە دەگات).

(بوار نەدان بە "پارتی گەل" کە حوکم بگرێتەوە دەست)

لە مامۆستامان پرسی: بۆچی کار بۆ مانەوەی "پارتی دیموکراتی" دەکەیت؟

ئەویش بەمەی خوارەوە وەڵامی داینەوە:

(ئەگەر حکوومەتی پارتی دیموکراتی بڕووخێت ئەوا پارتی گەلی کۆماری، یان پارتی نەتەوە جڵەوی فەرمانڕەوایی دەگرنە دەست. لە کاتێکدا کە هەرچی تاوانی خراپکارانی ئیتتحاد و تەرەقی هەیە و بەشی هەرە گەورەی ئەو ئاڵوگۆڕانەش کە سەرۆك کۆماری یەکەم بەپێی "پەیمانی سیڤەر" و ماوەی پازدە ساڵ لە ژێر گوشار و پاڵەپەستۆدا و بە چەندین فڕوفێڵی سیاسی زۆر پیادە و جێبەجێی کردن، هەموو ئەم شتانە لە ئەستۆی "پارتی گەل"دا دانراون. لەبەر ئەوە، نەتەوەی ڕەسەنی تورك هەرگیز - بە ویستی خۆی - بوار بەوە نادات کە پارتی گەل فەرمانڕەوایەتی بگرێتەوە دەست. چونکە ئەگەر ئەم پارتە دەستەڵات بگرێتە دەست ئەوا بە ناوی هەمان پارتەوە هێزی شیوعییەت لە وڵاتدا حوکم دەکات. ئاشکرایشە کە هەرگیز موسڵمان نابێت بە شیووعی، بەڵکو - گەر لە ڕێ بترازێت - دەبێت بە تۆقێنەرێکی ئاژاوەچی و، لەمەشدا موسڵمان لەگەڵ بیانییەکاندا بەراورد ناکرێت.

جا بۆ ئەوەی بوار بە چوونە سەر حوکمی پارتی گەل نەدرێت، کە مەترسییەکی گەورە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیمان و ئەم نیشتمانە پێکدەهێنێت، ئەوا بە ناوی قورئان و نیشتمان و ئاشتییەوە هەوڵ دەدەم پارێزگاری لە پارتی دیموکراتی بکرێت).

* * *

(لەزەتی بەهەشت لە دنیادا)

باسمه سبحانه

"ئەم نامەیە تایبەتە بەو لەزەتانەی بەهەشت کە تەنانەت لە دنیاشدا "ئیمان" بۆم دەهێنێتەدی"

لە تەمەنی نۆ ساڵییەوە دایکی میهرەبانم نەدیوە و بەهرەمەندی لەگەڵ دانیشتن و گفتوگۆی نەبووم، بۆیە لەو خۆشەویستییە بەرز و بڵندە بێ بەش بووم.

هەروەها لە تەمەنی پازدە سالیشمەوە نەمتوانیوە هەر سێ خوشکەکەم ببینم، چونکە - بە وێنەی دایکم - کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کرد. بۆیە من لە زۆر لوتف و سۆزی ڕێز و میهری ئەو چەشنە دانیشتن و بە یەك شاد بوونانەی "خوشك و برا" لە دنیادا بێ بەش بووم.

هەروەها وا پەنجا ساڵە دوانم لە سێ براکانم نەدیوە، خوا لێیان خۆش بێت. بەم جۆرە، من لەو شادمانی و دڵخۆشی‌یە بێ بەش بووم کە ئەنجامی برایەتیی پڕ سۆز و میهرەبانی‌یە و، لە تێکەڵی و پێکەوە ژیانی ئەو ئازیزە زانا و خاوەن تەقوایانەوە مرۆڤ هەستی پێ دەکات.

ئەمڕۆ کە لەگەڵ ئەو چوار کەسەدا دەگەڕام کە لە کاروبارەکانمدا هاوکاریم دەکەن، بە یەقین و دڵنیاییەوە بەشێکم لەو تۆوەی بەهەشت بە دڵدا هێنرا کە لە ئیماندا هەیە، وەك ئەوەی "پەیامەکانی نوور" بە ڕوونی لێی دواون و پێش چاویان خستووە.

جا لەبەر ئەوەی من ژنم نەهێناوە و بە بێ هاوسەر ژیانم بەسەر بردووە، ئەوا منالیشم نەبووە و، لە چێژی خاوێن و بەرائەتی منال و خۆشحالی و شادمانییان بێ بەش بووم.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز هەستم بەم نەبوونی و کەمی‌یە نەکردووە. هەر ئەمڕۆ خوای گەورە واتایەکی تابلێی بەتام و لەزەتی پێ بەخشیم و لە سێ ڕووەوە هەر چوار زامە ناوبراوەکانی بۆ تیمار کردم:

ڕووی یەکەم:

لە بریی ئەو سۆز و میهرەبانی‌یە تایبەتی‌یەی کە لە لایەن دایکمەوە ئاراستەم دەکرا، خوای گەورەی میهرەبان، بە چاکە و بەخشندەیی خۆی، هەزاران دایکی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە سوودی لەڕادەبەدەر لە پەیامەکانی نوور وەردەگرن و چەندین تام و لەزەتی ڕۆحیی خاوێن و بێگەردی لێ دەچێژن. وەك فەرموودەی: "علیکم بدین العجائز" دەری خستووە کە لە پەیامەکانی نووردا باس کراوە.

هەروەها لە بریی ئەو شادمانی و خۆشحاڵی و سۆزی خوشك و برایەتی‌یەی کە دەبوو لە تێکەڵی و پێکەوە ژیان و لەگەڵ دانیشتنی هەر سێ خوشکەکانمەوە - خوا لێیان خۆش بێت - بەدەستم بهێنایە، خوای گەورەی بەخشندە هەزاران خوشکی بەڕێز و لاوی پێ بەخشیم. منیش هەزاران سوود و بەروبوومی مەعنەوی و شادمانیی ڕۆحیم لە دوعا و نزاکانی ئەوان و پەیوەندی‌یان بە پەیامەکانی نوورەوە، دەست دەکەوێت. گەلێ نیشانەی زۆر هەن لەسەر ڕاستیی ئەم بەشەی دووهەم کە براکانم دەیانزانن و ئاگایان لێ‌یەتی.

هەروەها لە بریی ئەو یارمەتی‌یە ماددی و مەعنەوی‌یەی کە چاوەڕوان دەکرا ئەو دوو برا خوا لێخۆشبووەم لە ڕووی سۆز و بەزەیی و میهرەبانی‌یەوە فریایان بکەوتمایە و بە دەممەوە بهاتنایە، خوای گەورە - بە میهرەبانیی خۆی - سەدان هەزار برای ڕاستەقینە و فیداکاری لە خزمەتی پەیامەکانی نووردا پێ بەخشیم کە خاوەنی سۆزی خاوێن و بێگەردن و یارمەتیم دەدەن و، نەك هەر تەنها ژیانی دنیایان بەڵکو سەرمایەی ژیانی ئەو دنیاشیان لەو پێناوەدا بەخت دەکەن.

هەروەها لە بەرامبەر بێ بەش بوونم لە چێژی ئەو سۆز و بەزەییەی کە مرۆڤ بەرامبەر منداڵەکانی هەستی پێ دەکات، چونکە لە دنیادا ژنم نەهێناوە و منداڵم نی‌یە، خوای گەورە - لە بریی ئەوە - سەدان هەزار منداڵی بێ گوناهـ و خاوێن و بەریی پێ بەخشیم لەو ڕووەوە کە لە ئایندەدا سوود لە "پەیامەکانی نوور" وەردەگرن.

بەم جۆرە خوای گەورە ئەم سێ جۆرە سۆز و شەفەقەت و میهر و بەزەییە جوزئی‌یەی بۆ گۆڕیم بە سەدان هەزار سۆز و شەفەقەت و میهرەبانی.

گەلێ نیشانەی سەبارەت بەم بەشە هەن. تەنانەت ئەو برایانەی کە لە ئیش و کارەکانمدا یارمەتیم دەدەن، ئاگاداری ئەوەن کە منداڵانی "ئەمیرداغ" و "بولفادین"[1] زۆر هۆگرم دەبن و پەیوەندیم پێوە دەکەن و زیاد لە ڕێزگرتنی باوکیان ڕێز و پەیوەندیم بۆ دەنوێنن.

---

(١) شارۆچکەیەکی سەر بە پارێزگای "ئافیون"ە. (وەرگێڕ)

نموونەی ئەمە گەلێ زۆرە، کە خوای گەورە ئەم چێژ و لەزەت و ڕێزە میهرەبانانەی لەم سۆزە جوزئی‌یە کەسی‌یەوە گۆڕیوە بە هەزاران سۆزی هەمەکی و میهرەبانیی گشتی.

گیانی ئەو منالە بێ گوناهانە بە هەستێکی پێش وەختی وەك هی هەندێ لە گیانلەبەرە پیرۆزەکان، هەستیان بەوە کردووە کە دوایی پەیامەکانی نوور بە وێنەی دایك و باوك لە دنیادا پەروەردەیان دەکات و لە بەلا و گیروگرفتەکان دەیانپارێزێت، بۆیە زیاد لەو ڕێزەی کە بۆ باوکانی خۆیانی دەنوێنن ڕێز لە خزمەتگوزارەکەی نوور دەگرن. تەنانەت کیژۆڵەیەك کە تەمەنی لە سێ ساڵ تێ نەپەڕیبوو بە ڕاکردنەوە بەناو دڕك و داڵدا هات بۆ لام، هەرچەندەش نەمدەناسی! ئنجا لەبەر زۆریی منالە خۆشەویست و بێ گوناهەکانی "بولفادین" تەنانەت هی شوێنەکانی تریش، بە ئاسانی نەماندەتوانی بە ئۆتۆمبیل بەناو شاردا بڕۆین، هەرچەندەش نەیانبینیوم و هیچیان لە بارەوە نەبیستووم.

جا ئەم سۆز و خۆشەویستی‌یەی کە بۆ منی دەنوێنن و گەلێ زیاترە لەوەی کە بۆ باوکانی خۆیانی دەردەبڕن، وای لێ کردم کە سەبارەت بە خۆم، تەنانەت لە ڕووی جەستە و هەوا و ئارەزووشەوە، تۆوی بەهەشت بە ڕاستی لە "ئیمان"دا ببینم!

* * *

(ئاماژەیەکی کورت بۆ ڕاستی‌یەکی گرنگ)

چەند فەرموودەیەکی پیرۆز ئاماژە دەکەن بۆ ئەوەی کە: لە ئاخر زەماندا ڕاستی‌یەکانی ئیمان لە لای ئافرەتان ڕوونتر دەردەکەون، بە چەشنێ کە - تا ڕادەیەك - دەتوانن خۆیان لەو شتانە بپارێزن کە گومڕایی ئەو سەردەمە مرۆڤیان پێ لەناودەبات. هەروەها وەك لە فەرموودەی: "علیکم بدین العجائز" دەبینین، هاندان هەیە بۆ چاولێکەریی پیرەژنان لە ئاخر زەماندا.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە "ئیخلاس"ی هەڵقوڵاوی سۆز و شەفەقەتی ئافرەتـان - کە پاڵەوان و پێشەوای سۆز و شەفەقەت و میهرەبانین - نایەڵێت دووچاری ئـەو لـەناوچوون و لـەڕێ ترازانە ببن کـە لـەم سـەردەمەدا "گومڕایـی" گـەوزاوی نـاو ڕیاکاری تووشی مرۆڤی دەکات. بەم چەشنە ئەوان دەست بە ئیسلامەتیی خۆیانەوە دەگرن و وازی لـێ ناهێنن.

فەرموودەیەکی تر ئەمەی تێدایە کە دەفەرموێت: "إن أبا البنـات مـرزوق". واتـە: لـە ئـاخر زەمـاندا منـاڵی کـچ زۆر دەبن و ئـەوانیش بێگـەرد و خـاوێن دەردەچـن و خوای گەورەش بەرەکەت دەخاتە ڕۆزییانەوە.

زووتر نهێنیی ئەم فەرموودەیە و هاوچەشنیم نەدەزانی. بەڵام - سوپاس بۆ خوا - لەم دواییەدا شتێك لـە نهێنییـەکانیان تێگەیشتم. وا بەوپەڕی کورتـی ئامـاژەی بـۆ دەکەم:

مناڵی مرۆڤ وەك بێچووی زیندەوەران نین، چونکە لـە کـاتێکدا ئـەو بێچووانـە لـە ماوەی دوو یـان سێ مـانگدا دەتوانـن پشـت بـە خۆیـان ببەسـتن، منـاڵی مـرۆڤ پێویستی بە پارێزگاری و چاودێرییەکی بەسۆز و میهرەبانە کە (دە) ساڵ یان زیـاتر دەخایەنێت.

لەبەر ئەمـە، دەبێ دایکـان بەوپـەڕی لێبڕانـەوە پارێزگـاری و شـەفەقەتیان بـۆ مناڵەکانیان بەردەوام بێت، کە ئەمەش خوو و ڕەوشتێکە لە مرۆڤدا - بە پێچەوانەی زیندەوەرانی تر - پتر ڕەگی داکوتاوە. بەڵام دانایی خوای گـەورە خـوو و ڕەوشـتی "غیرەت و شـەرەفمەندی"ی لـە سروشـتی پیـاواندا دانـاوە، تـاکو بتوانـن یارمـەتیی دایکانی لاواز و منداڵانی دەستەپاچە و کۆڵەوار بدەن.

لە ناوەندی ئەم خوو و ڕەوشـتی غیرەت و شـەرەفمەندییەدا پاڵەوانییـەکی بێ وێنـە و بێگـەرد هەیـە کـە بێ هیـچ بەرامبـەر و پاداشتێکە، بـەڵام ئێسـتا تـا ڕادەیـەك تێکچووە و گۆڕانـی بەسـەردا هـاتووە. لـە ئـەنجامی ئەمەشـدا ئـەو پاڵەوانییـە لـە زۆربەی خەڵکیدا لاواز بـووە، کـەچی ئـەو خـوو و ڕەوشتە سروشتییەی ئافرەتـان (کە شەفەقەت و میهرەبانییە) هەر وەك خۆی ماوەتەوە و تێك نەچووە.

ئافرەتان - بەم خوو و ڕەوشتە سروشتی‌یەیان - چەندین خزمەتگوزاریی مەزن لە نێوان موسڵمانانی ئاخر زەماندا ئەنجام دەدەن. ئەو فەرموودە پیرۆزانەش بە هێما ئاماژە دەکەن بۆ گرنگیی ئەم خوو و ڕەوشتە سروشتی‌یە و کاریگەریی لە کۆمەڵدا و، بۆ ئەوەی کە چۆن دەبن بە بناغە و پشتیوان بۆ موسڵمانان لە چوارچێوەی ئیسلامدا.

* * *

(شوێنکەوتنی سوننەت لە ژن هێناندا)

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

ئەمە وەڵامی پرسیارێکە لە ڕۆژنامەی وڵاتە بیانی‌یەکاندا بڵاوکراوەتەوە[1]. ناوەرۆکی پرسیارەکە بەم جۆرەیە:

"بۆچی بە پێچەوانەی سوننەتی پیرۆزت کردووە و، تا ئێستا ژنت نەهێناوە"؟

---

(١) وا لە خوارەوە دەقی ئەو نامەیە دەهێنین کە کاتی خۆی یەکێك بۆ مامۆستا نوورسیی ناردووە:

(چەند پەیامێکی نوور و مێژووی ژیانتم خوێندەوە. لە بەسەرهاتی ژیانتان بینیم یەکێك لە کارە تایبەتی‌یەکانتان "ژن نەهێنان" و پەیدا نەکردنی هیچ پەیوەندی‌یەکە بە دنیاوە. ئەمەش کاری لە قوتابیانی نووردا کردووە و لەوانیشدا دەرکەوتووە.. جا مادەم ئەمە لەگەڵ ئەو ئایەتەی سوورەتی "النساء" کە دەفەرموێ: ﴿فَانْكِحُوا ما طابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَـــــاءِ﴾ و، فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: "لا ترهب في الإسلام" و "تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامـــة"دا ناگونجێت، ئەوا وام بە باش زانی داوای ڕوونکردنەوەی ئەمەت لێ بکەم. لەو باوەڕەشدام وەڵامی ئەم پرسیارەم بەوە دەدرێتەوە گەر ڕوونی بکەنەوە کە قوتابیانی نوور - ژن و پیاویان - تا تەمەنێکی دیاریکراو دەبێ هاوسەر نەگرن، لەبەر لێبڕان بۆ خزمەتگوزاریی قورئان و ئیمان لە تەمەنی هەرزەکاریی و هەرەتی لاویدا. بە پێویستی دەزانم ئەمە باس بکەن لەگەڵ دەستنیشان کردنی ئەو تەمەنەی کە قوتابیانی نوور تیایدا دەتوانن ژن بهێنن.

بە هەرحاڵ، چاوەڕوانی وەڵامتان دەکەم، کە ئومێدەوارم - پشت بە خوا - وەڵامێك بێت لەگەڵ حەق و ڕاستیدا یەکاویەك بێت).

ئەمەی سەرەوە لە نامیلکەیەکی بچووکەوە هێنرا کە ساڵی ١٩٥٣ز لە بەغدا دەرچووە. (وەرگێڕ)

نامەکەتان بۆ مامۆستامان خوێندەوە، کە لە سەختترین حاڵـەتی نەخۆشیدایە.
ئەویش پێی وتین:

ئەگەر لە نەخۆشییەکی ئاوا سەختدا نەبومایە، وەڵامێکی دوور و درێژم بۆ ئەو برا بەڕێز و خۆشەویستانەم دەنووسی. بـەڵام بـاری ناهـەمواری تەندروستیم بـواری ئەوەم نادات. کەواتـە بەوپـەڕی کورتـی و، لـە چـەند خـاڵێکدا، بۆ ئـەو بـرا بـاش و دڵسۆزانە و، هاوڕێیانم لە خزمەتگوزاریی قورئاندا، بنووسن:

یەکەم:

لەو کاتـەدا کـە دەبێ بۆ بـەرەنگاری کردنی هێرشی ئـەو ئیلحـادە سـامناکەی مـاوەی چـل سـاڵە پـەلاماری ئیمـان دەدات، چـەندین فیداکـاری وا هـەبن هەرچییەکیان هەیە بەختی بکەن، بڕیارم دا کە نەك تەنها بەختەوەریی دنیـام بـەڵکو گەر پێویست بێت بەختەوەریی دواڕۆژیشم لـە پێنـاوی حەقیقـەتی قورئـانی پیرۆزدا بەخت بکەم.

جا لەبەر ئەوەی بتوانم بە تەواوی و بە ئیخلاسی ڕاستەقینەوە بۆ خزمەتی قورئـان لـێ ببڕێم، ناچار بووم واز لە ژن هێنانی کاتیی دنیـا بـهێنم - کـە دەزانم سـوننەتێکی پیرۆزی پێغـەمبـەرە ﷺ - تەنانـەت گـەر لـەم دنیایـەدا (دە) دانـە "حـور العـین"ی بەهەشتیشم بدەنێ، هەر خۆم بە ناچار دەزانم واز لە هەموویان بهێنم، لە پێناوی ئـەو ڕاستییە(ڕاستیی قـورئـان)دا. چونکە ئـەو ڕێکخـراوە سـامنـاکانەی مولحیـدان چەندین هێرشی سەرومڕ و توندوتیژ بۆ سەر ئەو ڕاستییە دەبەن و چـەندەها پیلانـی چەپەڵیشی لە دژ ساز دەکەن. کەواتـە ئەوپـەڕی خۆبـەخت کـردن و فیداکـاری بۆ بەربەستی ئەو هەوڵەی ئەوان پێویستە و، دەبێ هەموو کارێ کـە بۆ بڵاوکردنـەوەی ئـایین دەدرێـت خـاوێن و بێگـەرد و تەنـها بۆ ڕەزامەندیی خـوای گـەورە بێـت، بـێ ئەوەی هۆیەك بێت بۆ هیچ شتێکی تر.

چەندەها زانای نەگبەت و کەسانی خواناس لە ئەنجامی خەمی ژیان و گوزەرانی خێزان و منـاڵیـان، فـەتوایان بـۆ بیدعـەت دەرکـرد، تەنانـەت لـە شێوەی پشـتگیریی بیدعەت خوازانیشدا دەرکەوتن!

لەبەر ئەمە و لـە بەرامبەر ئەو هێرشە سامناك و سەختەی دەکرێتە سەر ئایین، دەبێ پێویست نەبوون بە خەڵکی و بەڵکو بە هەموو شتێك، ئەنجام بدرێت. بە تایبەت دوای ماوە نەدان و نەهێشتنی وتنەوەی وانەی "ئایین" لە قوتابخانەکاندا و، گۆڕینی بانگی شەرعی.

لەبەر ئەوە، دەستم لە ژن هێنان هەڵگرت، کە دەزانم "سوننەت"ێکی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ ئەوەی تووشی "حەرام" نەبم و، بتوانم زۆر "واجب" و "فەرز"ی ئەستۆم جێبەجێ بکەم. چونکە ناکرێت لەبەر بەجێهێنانی "سوننەت"ێك مرۆڤ دووچاری چەندین کرداری "حەرام" ببێت.

زانای زۆر هەبوون کە لە ماوەی ئەم چل ساڵەدا ئەم سوننەتەیان بەجێ هێنا، بەڵام ناچاریش بوون تووشی (دە) گوناهی کەبیرە و حەرام ببن و، واز لە بەشێکی فەرز و سوننەتەکان بهێنن!

دووهەم:

ئایەتی پیرۆزی: ﴿فانْكِحُوا ما طابَ لكم...﴾ (النساء:٣) و، فەرموودەی پیرۆزی: "تناكحوا تكاثروا"[١]، هەروەها فەرمانەکانی تری هاوچەشنیان، فەرمانی "واجب بوون" و هەمیشەیی نین، بەڵکو فەرمانی "سوننەت"ن. جگە لەوەش کە بەندن بە چەند مەرجێکەوە دەبێ بێنەدی. لەوانەیە هەموو ئەو مەرجانە بۆ هەموو کەسێك و لە هەموو کاتێکدا کۆنەبنەوە و نەیەنە دی.

(١) تناكحوا تناسلوا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة. رواه عبدالرزاق والبيهقي عن سعيد بن أبي هلال مرسلاً بلفظ: (تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة). قال في المقاصد: جاء معناه عن جماعة من الصحابة، فأخرج أبو داود والنسائي والبيهقي وغيرهم عن معقل بن يسار مرفوعاً: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، ولأحمد وسعيد بن منصور والطبراني في الأوسط والبيهقي وآخرين عن أنس قال كان رسول الله ﷺ يأمر بالباءة وينهى عن التبتل نهياً شديداً، ويقول: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، وصححه ابن حبان والحاكم.. الخ ( باختصار عن كشف الخفاء للعجلوني ١٠٢١) والسيوطي في الجامع الصغير (٣٣٦٦). (وەرگێڕ – لە چاپی عەرەبیی "اللمعات"ەوە).

پاشان فەرموودەی پیرۆزی: "لا رهبانية في الاسـلام"[(١)] ئەوە ناگەیەنێت کە ژن نەهێنان و گۆشەگیری – وەك ئەوەی ڕاهیبەکان – حەرامن و نابێت ببن. بەڵکو ئەم فەرموودەیە هاندانە بۆ خەڵکی تاکو لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشدار بن، وەك لە ناوەرۆکی ئەم فەرموودەیەدا هەیە کە دەفەرموێ: "خير الناس أنفعهم للناس"[(٢)]، دەنا هەزاران کەس لە پیاوچاکانی پێشین، بە جۆرێکی کاتی، لە خەڵکی دوور کەوتوونەتەوە و، تا ماوەیەك حەزیان لە گۆشەگیری بووە و، دەستیان لە جوانیی دنیای فانی داشۆردووە و خۆیان لێ داماڵیوە، تاکو بتوانن بە تەواوی و ڕاستی ژیانی دوارۆژی خۆیان بنیات بنێن.

جا مادەم کەسانێکی زۆری پیاوچاکانی پێشین، لەبەر گەیشتن بە کەماڵێکی نەبڕاوە و "تایبەت بە خۆیان" وازیان لە دنیا و هەموو ڕازاوەیی و جوانییەکی هێناوە، دەبێ ئەو کەسەی کە بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی و نەبڕاوەی چەندەها لێقەوماو" لێ دەبڕێت و نایەڵێت بکەونە هەڵدێری گومڕاییەوە و، بۆ بەهێزکردنی ئیمانی ئەوان تێدەکۆشێت لە پێناوی خزمەت کردنی ڕاستەقینەی ئیمان و قورئاندا و، لە بەرامبەر هێرشە ناکامەکانی دەرەوە و شاڵاوە ئاشکراکانی ناوخۆدا خۆی ڕادەگرێت.. ئەو کەسەی ئەم کارە گشتییە ئەنجام دەدات – نەك کاری تایبەتی بۆ خۆی – ڕەفتاری پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ناکات، بەڵکو بەپێی حەقیقەتی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەنگاو دەنێت.

پاشان ئەوپەڕی ئاواتەخوازم کە بە ئەندازەی یەك گەردیلەم لەو فەرمایشتە ڕاستەی صیددیقی مەزن – خوا لێی ڕازی بێت – دەست بکەوێت کە دەفەرموێ:

"یا جەستەم لە دۆزەخدا ئەوەندە گەورە ببێت کە ئیتر جێی هیچ ئیماندارێکی تری تێدا نەبێتەوە"!

---

(١) قال ابن حجر: لم أره بـهذا اللفظ، لكن حديث سعد بن أبي وقاص عند البيهقي: "إن الله أبدَلَنا بالرهبانيةِ الحنيفيةَ السمحةَ". كشف الخفاء: ٣١٥٤

(٢) حديث حسن أخرجه القضاعي في مسند الشهاب وابن عساكر في تـاريخ دمشـق ٢/٤٢٠/٢ وانظر الصحيحة ٤٢٦ وصحيح الجامع الصغير وزيادته برقم ٦٥٣٨.

لەبەر ئەوەیە کە ئەم سەعیدە لاوازە "ژن نەهێنان" و پێویست نەبوونی بە خەڵکی، لە درێژایی ژیانیدا، بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

سێهەم:

ئێمە بە قوتابیانی نوورمان نەوتووە: "ژن مەهێنن و وازی لێ بهێنن بۆ خەڵکی" و، نابێ پێشیان بوترێ..

بەڵام قوتابیان لەناو خۆیاندا چەند پلە و چینێکن، هی وایان هەیە دەبێ تا دەتوانێت، لە ماوەیەکی تەمەنیدا، خۆی بە پێداویستی‌یەکانی دنیاوە نەبەستێت، تاکو بگات بە خۆبەخت کردن و دامەزراویی تەواوەتی و هەرە مەزن. خۆ ئەگەر ئافرەتێکی وەهای لێ هەڵکەوت لە خزمەتگوزاریی ئیمان و قورئاندا یارمەتیی بدات، ئەوە خێرێکە خوا داویەتی. چونکە ئەم چەشنە ژن هێنانە رێی کار و خزمەتگوزاریی قورئانی لێ ناگرێت.

سوپاس بۆ خوا، زۆر کەسی وا لەناو قوتابیانی نووردا هەن و، هاوسەرەکانیشیان لە خزمەتگوزاریی قورئان و ئیماندا هیچیان لەوان کەمتر نی‌یە. تەنانەت کاتی وا هەیە بە بۆنەی ئەو شەفقەتە بێ بەرامبەر و بێ پاداشتەی لە سروشتیاندا هەیە، پێش مێردەکانیشیان دەکەون و، بەم پاڵەوانێتی‌یەی پێیان بەخشراوە و بە ئیخلاسێکی تەواو کارەکانیان ئەنجام دەدەن.

ئنجا زۆربەی قوتابی‌یە پێشینەکانی نوور ژنیان هێناوە و، بە تەواوی و رێکوپێکی ئەم سوننەتەیان جێبەجێ کردووە. پەیامەکانی نووریش روو دەکاتە ئەوانە و پێیان دەڵێت:

"ماڵەکانتان بکەن بە قوتابخانەیەکی بچووکی نوور و جێی وەرگرتنی زانست و فێربوونی خواناسی. تاکو ئەو منداڵانەی کە بەرهەمی ئەنجامدانی ئەم سوننەتەن، لەسەر ئیمان پەروەردە ببن و، لە قیامەتیشدا شەفاعەتتان بۆ بکەن و، لە دنیاشدا کوڕ و منداڵ و جگەرگۆشەی باشتان بن. ئەو کاتە بە تەواوی ئەم سوننەتە پیرۆزەتان تێدا جێبەجێ دەبێت.

دەنا ئەگەر منالەکان لەسەر پەروەردەی ئەورووپایی گەشە بکەن و پێ بگەن - وەك لە ماوەی سی سالّی ڕابوردوودا ڕووی دا - ئەوا زۆربەی ئەو منالانە لە لایەکەوە سوودیان بۆ دنیاتان نابێت و، لەو لاشەوە لە قیامەتدا سکالاتان لە دەست دەکەن، چونکە لەوێ پێتان دەلێن: "بۆچی ئیمانتان نەپاراستین"؟ ئێوەش بەم وتەیەی ئەوان پەژارە و پەشیمانی داتان دەگرێت، کاتێ کە پەشیمانی دادی مرۆڤ نادات و سوودی نابێت. ئەمەش پشتگوێ خستنی ئەو حیکمەتەیە کە لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردایە ﷺ.

* * *

(سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی "هُوَ"دا)

باسمه سبحانه

﴿وإن من شئ إلاّ يسبح بحمده﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بە جۆرێکی کتوپڕی و لە گەشتێکی بیرەکی و ئەندێشەیی و، لە کاتی موتالاکردنی لاپەڕەی "هەوا" تەنها لە لایەنە ماددییەکەیدا، سەرنجێکی جوانی "یەکتایی"م لە وشەی "هُوَ"ی: ﴿لا إله إلاّ هو﴾ و ﴿قل هو الله أحد﴾دا بینی. لەم سەرنجەوە بۆم دەرکەوت کە: ڕێی "ئیمان" ڕێیەکی ئەوەندە ئاسانە کە پێویستە بگیرێتە بەر، بەلام ڕێی "گومڕایی" و "هاوەڵ بڕیاردان" هێندە مەحاڵ و گیروگرفتی تێدایە کە هیچ کەسێك ناتوانێت بیگرێتە بەر.

وا بە ئاماژەیەکی یەکجار کورت، ئەو سەرنجە جوان و درێژ و فراوانە ڕوون دەکەمەوە:

بەڵێ، دەکرێ مشتێك "گڵ" ببێت بە جێی سەوز بوونی سەدان گوڵ و ڕووەك، گەر یەك لە دوای یەك تیایدا بروێنرێن. جا ئەگەر ئەم کارە بە "سروشت" و "هۆکارەکان" بسپێررێت، ئەوا دەبێت سەدان، تەنانەت بە ئەندازەی ژمارەی گوڵەکان، کارگەی بچووك لەو مشتە گڵەدا بن.. یان هەریەك لە گەردیلەکانی ئەو مشتە گڵە بینا و پێکهاتن و تایبەتکاریی ئەو گوڵە جۆراوجۆرانە و ئەندام و کۆئەندامە زیندەکانیان بزانێت. واتە خاوەنی زانستێکی گشتگیر و توانستێکی ڕەهای چەشنی زانست و توانستی خوای گەورە بێت!

"هەوا"ش، کە یەکێکە لە عەرشەکانی فەرمان و ویستی خوای گەورە، بە هەمان جۆرە. چونکە هەموو بەشێك لە بەشەکانی "هەوا" و "سروە" و "با" تەنانەت ئەو هەوایەی کە لە بەشێکی کەمی هەناسەی مرۆڤدایە کاتێ وشەی: "هُـــوَ"ی لە زار دەردەچێت، چەندەها کار و فرمانی لەژمارەبەدەری لە ئەستۆدایە و هەموویشیان ئەنجام دەدات.

جا ئەگەر ئەم کار و فرمانانە بە "سروشت" و "ڕێکەوت" و "هۆکارەکان"ی بسپێررێت، ئەوا دەبێ ئەو هەوایە یان چەندەها مەڵبەندی پەخش و وەرگرتنی بچووکی تێدا بێت بۆ هەرچی دەنگ و گفتوگۆی بروسکە و تەلەفۆن و ڕادیۆ و هەرچی جۆری دەنگی قسە و ئاخاوتنە لە ژمارە بەدەرەکانی دنیا هەن و، بیشتوانێت لە یەك کاتدا هەموو ئەو کار و فرمانانە جێبەجێ بکات..

یان ئەو هەوا کەمەی کە لە وشەی "هُـــوَ" و گشت تەنۆلکە و بەشێك لە بەشەکانی و هەموو یەکێ لە گەردیلەکانیدا هەیە، بە ئەندازەی ژمارەی هەموو ئەوانەی کە لە تەلەفۆندا قسە دەکەن و بروسکە جۆراوجۆرەکان لێ دەدەن و بە ڕادیۆکان وتە و گوفتاریان بڵاو دەکەنەوە، بەو ئەندازەیە خاوەنی کەسێتیی مەعنەوی و توانا و قابیلییەت بن و، ئنجا زمان و لەهجەی یەك بە یەکیان بزانن و لە هەمان کاتیشدا ئەو زمان و لەهجانە فێری گەردیلەکانی تریش بکەن تاکو ئەو وتانە بڵاو بکەنەوە و بیانگەیەنن!! چونکە بەشێکی ئەم حاڵەمان لە بەردەمدایە و بە

چاو دەبینین و، هەموو تەنۆلکە و بەشەکانی هەوا ئەو توانا و لێهاتن و قابیلییەتە پێش چاو دەخەن.

کەواتە نەك تەنها یەك دانە مەحاڵ، بەڵکو بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی "هەوا" مەحاڵ و گیروگرفتی لەژمارەبەدەر لە ڕێی کوفری ماددیی‌یە سروشتی‌یەکاندا هەیە!

بەڵام ئەگەر ئەم کارە بە دەستی بەدیهێنەری مەزن بسپێررێت، ئەوا ئەو هەوایە و هەموو گەردیلەکانی دەبن بە سەربازی گوێڕایەڵ و چاوەڕێی وەرگرتنی فەرمان. ئیتر ئەو کاتە هەموو گەردیلەکانی هەوا: بە ئیزن و هێزی بەدیهێنەریان و، بە بۆنەی نیسبەتیان بۆ لای و پشت بەستنیان پێی و، بەهۆی درەوشانەوەی کتوپڕی بروسکە ئاسا و یەك لە دوای یەکی توانستی ئەو بەدیهێنەرەیان و، بەوپەڕی ئاسانیی چەشنی ئەوەی کە یەك گەردیلەیان تەنها یەك دانە لە کارەکانی ئەنجام بدات و، وەك ئاسانیی وتنی وشەی: "هُوَ" و هاتوچۆی هەوا لەو وشەیەدا.. ئەو هەوایە و هەموو گەردیلەکانی، بەو ڕادە و ئەندازەیە، سەرجەم کار و فرمانە هەمەکی و جۆراوجۆرە لەژمارەبەدەرەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن.

واتە ئەو کاتە "هەوا" دەبێت بە لاپەڕەیەکی فراوان بۆ نووسینە ڕێك و ناوازە و لە ژمارە بەدەرەکانی قەڵەمی توانستی خوای گەورە و، گەردیلەکانیش دەبن بە نووکی ئەو قەڵەمە و، کار و فرمانی گەردیلەکانیش دەبن بە نوختەی نووسینەکانی قەڵەمی توانستی خواوەند. لەبەر ئەوە، ئەنجامدانی هەموو کارەکانیان بە ئەندازەی ئەنجامدانی هەڵسوکەوتی تەنها یەك دانە گەردیلەیان ئاسان دەبێت.

ئەم ڕاستی‌یەم بە تەواوی و ڕوونی و بە "عین الیقین" چاو پێکەوت، کاتێ لە گەشتە فیکری‌یەکەمدا سەیر و موتاڵای جیهان و لاپەڕەی هەوام دەکرد و، بیرم لە: ﴿لا إله إلاّ هو﴾ و ﴿قل هو الله أحد﴾ دەکردەوە. هەروەها بە "علم الیقین" زانیم کە بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە هەیە لەو نەختە هەوایەی کە تێکەڵی وشەی "هُـوَ" دەبێت، هەروەك لە واتا و ئاماژەی وشەی "هُـوَ"دا

درەوشانەوەیەکی "تەنیایی" خواوەند لەوپەڕی ڕووناکیدا و، بەڵگەیەکی "یەکتایی" لەوپەڕی بەهێزیدا هەیە. چونکە نیشانەی: ئاماژەی ڕەها و نەزانراو لە جێناو(ضمیر)ی "هُوَ"دا هەیە. واتە: ئایا ئەو "هُـوَ"یە بۆ کێ دەگەڕێتەوە؟ ئیتر ئەو کاتە تێگەیشتم کە بۆچی قورئانی پیرۆز و زیکرخوێنان لە مەقامی "یەکتاناسی"دا ئەم وشەیە دووپات دەکەنەوە.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك بیەوێت یەك "خاڵ" لە شوێنێکی تایبەتیی پەڕە کاغەزێکی سپیدا دابنێت، دەتوانێت بەوپەڕی ئاسانی ئەم کارەی ئەنجام بدات. بەڵام ئەگەر داوای لێ بکرێت: لە یەك کاتدا چەندین "خاڵ" لە چەند جێیەکی جیا جیادا دابنێت، ئەوا کارەکە ئاڵۆزی و گیروگرفتی تێ دەکەوێت و بۆی ئەنجام نادرێت..

کەچی دەبینین زیندەوەرێکی بچووك لە تەنها یەك کاتدا کۆڵی قورسی چەندین کاروباری جیاجیا هەڵدەگرێت، کە دەبوو بەمە ڕێساکەی تێکەڵ و پێکەڵ ببوایە و، لەگەڵ هاتنە دەرەوەی چەندین وشەی زۆر لە یەك کاتدا و ڕۆیشتنیان بە یەکەوە بۆ ناو گوێکان، ئەو ڕێسایە پەرتەوازە و پەرش و بڵاو ببوایە..

بەڵام من بە "عین الیقین" و بە بەڵگەی وشەی "هُـوَ" کە بوو بە کلیل و قیبلەنمایەك بۆم، بینیم کە هەزاران خاڵ و پیت و وشەی جۆراوجۆر لەسەر هەموو بەشێك لە بەشەکانی هەوا - کە بە بیر گەشتی تێدا دەکەم - دادەنرێن، یاخود دەکرێت تیایاندا دابنرێن. تەنانەت دەگونجێ هەموو ئەمانە لە ئەستۆی تەنها یەك گەردیلە دابنرێن، بێ ئەوەی هیچ تێکەڵی و تێهەڵکێش بوون و ڕێسا تێکچوونێك ڕووبدات.

دەبێ ئەوەش بزانین کە جگە لەم کارانە، ئەم گەردیلەیەی هەوا چەندین کار و ئەرکی زۆری تریش لە هەمان کاتدا ئەنجام دەدات و هیچ کارێکیانی لێ تێك ناچێت و، چەندەها کۆڵی قورسی لەسەر شان دادەنرێت بێ ئەوەی هیچ جۆرە لاوازی و تەمبەڵی یەك دەربڕێت. ئەوەتا هەمیشە ڕێسای خۆی دەپارێزێت و هەرگیز نابینین لە ئەنجامدانی کار و ئەرکە جۆراوجۆرەکانی سەرشانیدا

کەمتەرخەمی بنوێنێت، چونکە هەزاران هەزار وشە و دەنگی جیاجیا و جۆراوجۆر دەڕۆنە ناو ئەو گەردیلانەوە و بە هەمان جۆریش لێیان دەچنە دەرەوە، بێ ئەوەی تێکەڵی یەکتر ببن و سەر لە یەکتر بشێوێنن. وەك بڵێی ئەو گەردیلانە خاوەنی چەندین گوێی بیسەری بچووکی بە ئەندازەی خۆیان بن و گەلێ زمانی وردی بچووکیان بێت کە لەگەڵ خۆیاندا لەبار و شیاو بن و، لەو ڕێیەوە ئەو وشانە بچنە ناو ئەو گوێیانەوە و لەو زمانە وردانەشەوە دەربچن.

سەرەڕای ئەم هەموو کاروبارە سەیرانەش، هەموو گەردیلەیەك و هەموو بەشێك لە بەشەکانی "هەوا" بەوپەڕی سەربەستی دەجوولێن و بە زمانی حاڵ و لە کاتی کەیف و شادیی (جەزبە و حاڵ)دا زیکری بەدیهێنەری خۆیان دەکەن و بە زمان و شایەتیدانی ئەو ڕاستییەی ئێستا باسمان کرد و پڕ بە دەم: ﴿لا إله إلاّ هو﴾ و ﴿قل هو الله أحد﴾ دەڵێنەوە..

خۆ کاتێ کە زریان و ڕەشەبای سەخت هەڵدەکات و، هەور نەعرەتەی لێ دەبێتەوە و، ئاسمانیش بە ڕووناکیی هەورە بروسکە دەدرەوشێتەوە.. ئا لەو کاتەدا ڕەوتی هەوا دەگۆڕێت و دەبێ بە چەندەها شەپۆلی تێکەڵ و پێکەڵ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا و بە هیچ جۆرێك ڕێسای گەردیلەکان لە کاتی ئەنجامدانی کاروبارەکانیاندا تێکناچێت و هیچ کارێك ڕێی جێبەجێ کردنی کارێکی تری لێ ناگرێت!! ئەم ڕاستییەم بە "عين اليقين" چاو پێکەوت.

کەواتە دەبێ (گەر کاری هەوا بە سروشت و هۆکارەکان بسپێررێت) هەموو گەردیلەیەك و هەموو بەشێك لە بەشەکانی "هەوا" خاوەنی زانست و دانست و ویست و هێزی ڕەها بێت و، توانا و دەسەڵاتی تەواوی بەسەر گشت گەردیلەکاندا بێت، تاکو بتوانێت ئەو هەموو کار و فرمانە جۆراوجۆرانە بە تەواوی جێبەجێ بکات!! خۆ دیارە ئەمەش بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکان بەتاڵ و مەحاڵ و نەگونجاوە، تەنانەت هیچ شەیتانێکیش شتی وای لە دەم دەرناچێت.

کەواتە شتێکی ئەوپەڕی ڕوون و ئاشکرا و بەڵگەنەویستە و، تەنانەت بە "حق الیقین" و "عین الیقین" و "علم الیقین" دەزانرێت کە:

ئەم لاپەڕەیەی "هەوا" لاپەڕەیەکی بگۆڕە و، بەدیهێنەر بەپێی زانستی ڕەها و بە قەڵەمی توانست و قەدەری خۆی، چیی بوێت تیایدا دەنووسێت و بەوپەڕی داناییەوە قەڵەمی خۆی تێدا تاو دەدات.. هەوا لاپەڕەیەکە وەك تەختەیەکی کوژانەوە و تیانووسین وایە بۆ کاروبارە نووسراوەکانی لەمەڕ "لوح المحفوظ" لەناو جیهانی پڕ لە ئاڵوگۆڕی دنیادا.

هەروەك "هەوا" بەم کاروبارە سەرسووڕهێنەرانەی باس کران بەڵگەیە لەسەر درەوشانەوەی "یەکتایی" خوای گەورە لە کاتی ئەنجامدانی تەنها یەك دانە ئەرکی سەرشانیدا کە گواستنەوەی دەنگەکانە و، هەر لەو کاتەدا مەحاڵە لەژمارەبەدەرەکانی "ڕێی گومڕایی" ڕوون دەکاتەوە.. لە هەمان کاتدا چەندین کاروباری لەوپەڕی گرنگی و ڕێکوپێکی و بێ هیچ تێکەڵ بوون و لێ تێکچوونێکیش ئەنجام دەدات، وەك:

گواستنەوەی مادده ناسکەکانی چەشنی کارەبا و بکێش و پاڵنەر(الجاذبة والدافعة) و ڕووناکی..

لە هەمان کاتیشدا دەڕواتە ناو ڕووەك و گیاندارەکانەوە لە ڕێی هەناسە دانیانەوە و، لەوێش بەوپەڕی وردی و ڕێکوپێکی چەندین کاری سەبارەت بە ژیانی ئەو ڕووەك و زیندەوەرانە جێبەجێ دەکات..

هەروەها لە هەمان کاتدا ئەرکی پیتاندنی ڕووەك دەخاتە ئەستۆیەوە و.. چەندەها کار و فرمانی تری بنەڕەتیی وەك ئەمانە ئەنجام دەدات.

ئەمانە بە دڵنیاییەکی تەواوەتی ئەوە دەچەسپێنن کە:

"هەوا" عەرشێکی مەزنی وەهایە کە بە فەرمان و ویستی مەزنی خوای گەورە دەجوولێتەوە و، بە "عین الیقین" دەیچەسپێنێت کە هەرگیزاو هەرگیز هیچ گریمانێك لە کایەدا نییە بۆ ئەوەی "ڕێکەوتی کتوکوێر" و "هۆکارە بەرباد" و

"مادده کۆڵەوار و بێ گیان و ژیانەکان" دەستیان لەو نووسینە بێ وێنەیەی ئەو لاپەڕەیەی "هەوا" و لە ئەنجامدانی کارەکانیدا ببێت..

بەمەی پێشوو، تا ڕادەی "عین الیقین" قەناعەتی تەواوم پەیدا کرد و زانیم کە: هەموو یەکێك لە گەردیلەکانی هەوا، بە زمانی حاڵی خۆیان، هەردەم ﴿قل هو الله أحد﴾ و ﴿لا إله إلاّ هو﴾ دەڵێنەوە.

هەروەك بەم کلیلە - واتە کلیلی: "هُوَ" - ئەم هەموو کاروبارە سەیرانەم تەنها لە ڕووە ماددییەکەی هەوادا بینی، تێکڕای توخمی هەوایش بە گشتی لە بەرچاومدا وەك وشەی "هُوَ"ی لێ هات و، بوو بە کلیلێك بۆ جیهانی مەعنا و میسال. چونکە بۆم دەرکەوت کە جیهانی میسال[1] وەك کامێرایەکی یەکجار مەزن وایە، لە یەك کاتدا چەندەها وێنەی لەژمارەبەدەری هەرچی ڕووداوی دنیا هەیە دەگرێت، بێ ئەوەی ئەو وێنانە تێکەڵی یەکتر بین یان تێك بچن و بئاڵۆزێن. بە ڕادەیەك کە ئەم جیهانی میسالە چەندین دیمەنی مەزن و فراوانی دواڕۆژی بە ئەندازەی هەزاران هەزار دنیای تێدا کۆبووەتەوە، کە چەندین بارودۆخی فانیی چەند بوونەوەرێکی "فانی" و بەرهەمی ژیانی سەرپێیی ئەوان لە چەندین دیمەن و تابلۆی نەمر و بەردەوام و لە بەردەم ئەهلی بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی و لە چەندەها پیشانگای هەتاهەتاییدا، پیشان دەدات. بەم کارەش ڕووداوەکانی دنیا و یادداشتە جوانەکانی ڕابوردوویان یاد دەخاتەوە.

بەڵگەی بێ گومانیش لەسەر بوونی "لوح المحفوظ" و جیهانی میسال و نموونەی بچووکی ئەم دوانە: هێزی پارێزگاری ناو کەللەسەری مرۆڤ و توانای ئەندێشەیەتی. چونکە هەرچەند ئەم دوانە ئەوەندە بچووکن جێی تۆوە خەرتەلەیەکیش ناگرن، کەچی کاروبارەکانیان بە تەواوی و بێ تێکەڵ بوون و لێ تێکچوون و بەوپەڕی وردەکاری و ڕێکی جێبەجێ دەکەن، بە ڕادەیەك کە دەڵێی

---

(١) لێرەدا بە کورتی باسکرا، چونکە بارودۆخی دەوروبەرمان دەرفەتم نادات لەگەڵ بەڵگە گومانبڕەکانیدا ڕوونی بکەمەوە. (دانەر)

هەریەکەیان کتێبخانەیەکی پڕ لە زانیاری و بەڵگەنامەیان تێدایە. ئەمەش بۆمان دەچەسپێنێت کە ئەم دوو هێزەی مرۆڤ، دوو نموونەی بچووکی "لوح المحفوظ" و "جیهانی میسال"ن.

بەم جۆرە و بە "علم الیقین" زانرا کە: "هەوا" و "ئاو" بە تایبەت شلەی "مەنی"، کە دوو توخمی ئەوتۆن گەلێ زیاتر لە خۆیان دەبن بە بەڵگە لەسەر بوونی خوای گەورە (وەك لە سەرەتای ئەم بابەتەوە باس کرا).. زانرا کە ئەم دووانە دوو لاپەڕەی فراوانن قەڵەمی توانست و دانست نووسینێکی دانایانە و ڕەوانیان تێدا دەنووسن و، ویست و، قەڵەمی قەدەر و، توانستی خواوەندیش تیایاندا دەگەڕێن و دێن و دەڕۆن و.. ئیتر دەست تێوەردانی "ڕێکەوت" و "هێزی کتوکوێر" و "سروشت"ی کەڕ و "هۆکار"ە بەربادە بێ گیانەکان لەو نووسینە پڕ لە داناییەدا، کارێکی سەد لە سەد مەحاڵ و نەشیاو و نەگونجاوە.

(پاشماوەی ئەم باسە لە کاتی ئێستادا نەنووسرا)!

هەزار هەزار سڵاو بۆ هەموان

سەعیدی نوورسی

(هەندێ لە واتاکانی "تەحیات")

باسمه سبحانه

﴿وإنْ من شيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و ڕاست و باشەکانم!

پێمان باش بوو پوختەی ئەو دەرسەتان بۆ باس بکەین کە بە "ئەرکان"ی قوتابخانەی زەهرائمان وتەوە لەسەر داخوازیی خۆیان. کە بریتییە لەم باسەی خوارەوە:

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کە مایـەی شـانازیی بوونەوەرانـە و بـەروبوومی بەدیهاتنی جیهانە، لە شەوی میعراجدا بە ناوی سەرجەمی گرۆی مرۆڤ و تەنانەت بە نـاوی هـەموو زینـدەوەران، بـەڵکو بـە نـاوی سەرانسـەری بوونەوەرانـەوە لـە حوزووری خوای گەورەدا، لە بریی وشەی "السلام"، فەرمووی:

"التحياتُ المباركاتُ الصَّلَواتُ الطيباتُ لله"!

نەتەوەی ئیسلامیش، لەبەر ئەو واتـا هەمەکی‌یـەی کـە لـەم گوفتـارە پیرۆزەدایـە، هـەرچی ڕۆژە چـەندین جـار لـە نوێژەکانیـاندا دووپـاتی دەکەنـەوە و، هـەموو ئیمانداریێك - لە هەر پلەیەکی ئیماندا بێت - بەشێکی لەو گوفتارەدا هەیە.

زووتر لـە پـەراوێزی باسـی: (سـەرنجێکی یەکتاناسـی لـە وشـەی "هُــوَ"دا) لـەو شوێنەدا کـە ڕوونمـان کردووەتـەوە: "ڕادیـۆ" نیعمـەتێکی خواییـە، باسـی ئـەو کـارە دەراسایانەی توانستی خواوەندمان کردووە کە لەناو توخـمی "هەوا"دا هەن. لەبەر ئەوانە، وا هات بە دڵمدا کە:

ئەو خواپەرستی‌یەی ئیماندار لەم دنیا کەم و تەمەنە کورتـەدا ئەنجامی دەدات و، لـەودنیای بەختـەوەریی هەمیشـەییدا بـە موڵکێکـی بـاقی و بـەرینی لـە دنیـا فراوانـتر پاداشـتی دەدرێتـەوە، پەرستشـێکی هێنـدە هەمەکی‌یـە، دەڵێـی سەرانسـەری دنیـا تایبەتی‌یەکەشـی ئـەو پەرستنەی لەگـەڵدا ئـەنجام دەدات! چونکـە بـە ئـەندازەی دنیـا تایبەتی‌یەکەی پاداشت دەدرێتەوە.

مرۆڤ لە ئاماژەکانی قورئانەوە لەمـە دەگـات. هـەروەك لـە کـاتی بـاس کردنـی زانستی خوایی، لە مەقامی دووهەمی پەیامی "الحجة الزهراء"دا، باس کراوە.

کاتێ کە لە نوێژدا تەحیاتم دەخوێند، واتا هەمەکی‌یەکانی ئەو وشـەیە بـۆ ڕۆحـم هـاتن و لـە ڕووی گیـانمدا کرانـەوە، یەکسـەر هـەر چـوار توخمـەکانی دنیـا تایبەتی‌یەکەم: "گڵ و ئـاو و هـەوا و ڕووناکی" لـە بـەرچاوی ئەندێشـەمدا بـوون بـە چوار زمـانی هەمـەکیی زیکـر خوێـن کـە هـەر یەکـەیان ملیۆنـەها، بەڵکو بلیۆنـەها

ملیۆن، تەنانەت بە ژمارەیەکی لە ئەندازەبەدەر زمانی حالّیان تێدا بوو کە هەموویان دەیانوت: "التحياتُ المباركاتُ الصلواتُ الطيباتُ لله"!

لەو ئەندێشەیەمدا بەم جۆرەی خوارەوە ئەو چوار توخمەم بینی:

یەکێك لەم چوار توخمانە بریتی‌یە لە: "گڵ" کە لە بەرچاوی ئەندێشەمدا بوو بە زمانێکی زیکرگۆ و، هەموو زیندەوەرێکیش بوو بە وشەیەکی خاوەن ژیانی ئەوتۆ کە زیکری: "التحيات.. لله"یان دەوتەوە..

چونکە: دەکرێت هەموو مشتە گڵێك ببێت بە شوێنێك بۆ ڕواندنی زۆربەی ڕووەکەکان..

جا (بە پێوانە و بەراوردێکی بچووك):

یان ئەوەیە هێندە کارگەی مەعنەویی یەکجار بچووك لەو گڵەدا هەیە کە ژمارەیان لەو کارگانە زیاترە مرۆڤ لەم جیهانەدا دایمەزراندوون، تاکو بتوانێت ئەو ڕووەکانە بەرهەم بهێنێت، کە ئەمەش مەحالێکی ئاشکرایە.. یان ڕوان و سەوز بوونی ئەو ڕووەکانە بە توانستی خاوەن توانایەکی ڕەها و لە ڕێی زانستە گشتگیر و ویستە گشتی و هەمە لایەنەکەیەوە ئەنجام دەدرێت و دێتەدی.

کەواتە "گڵ" لەم ڕێیەوە بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلە و بەشەکانی، بەڵگە لەسەر خوای گەورە دەخاتە ڕوو. لەبەر ئەوە، بە بەردەوامی "التحيات لله" دووپات دەکاتەوە.

واتە دەڵێت:

(ئەو ژیانەی کە بە سەرجەمی زیندەوەران بەخشراوە، هەر لە ئەزەلەوە تا ئەبەد، تایبەتە بە زاتی خاوێنی خوای گەورەوە).

هەروەها توخمێکی تری دنیا تایبەتی‌یەکەم - کە هی دنیای خەڵکی تریشە - بریتی‌یە لە: "ئاو"..

ئەم ئاوەم لە بەرچاودا بوو بە زمانێکی هەمەکیی زیکر خوێن کە بە زمانی حاڵی بارودۆخەکانی و بە سەرجەمی گەردیلەکانی، وشەی پیرۆزی: "المباركات"ی دەوتەوە و، بە ملیۆنەها، بەڵکو بە بلیۆنەها، تەنانەت بە ژمارەیەکی لە ئەندازەبەدەر

بەناو هەموو لایەکی بوونەوەراندا بلاّوی دەکردەوە، بە تایبەت لە بواری خزمەت کردنیدا بۆ ژیاندن و گەشە پێ کردنی زیندەوەران..

چونکە ئەو کار و ئەرکانەی دلۆپە ئاوەکان ئەنجامیان دەدەن، بە تایبەت لە گەشە پێ کردنی ئاوی مەنی و ناوك و تۆوەکان و بێدار کردنەوەی هەریەك لەمانە بۆ ئەنجامدانی کارە سروشتی‌یەکانی سەرشانیان..

هەروەها ڕاپەڕاندنی گەلێ ئەرکی مەزن لە لایەن ئەو بوونەوەرە بچووك و جوانکیلە و ناوازە و پیرۆزانەوە بە بارودۆخە ناسك و نیانەکانیان و بەوپەڕی وردی و ڕێکوپێکیی ئەوتۆ کە خاوەن هەست و شعوورەکان لە سەرسووڕماندا دەخاتە گوفتار و هانیان دەدات کە چەندین جاری لە ژمارە بەدەر بڵێن: "بارك الله.. ماشاء الله"..

ئەنجامدانی ئەو هەموو کار و ئەرکانە بەو شێوە ورد و ڕێکوپێکە، داخوازی ئەوە دەبێت کە هەموو گەردیلەیەکی "ئاو" بە ئەندازەی هەزار هەزار ئەفلاتوون زانیاریی ببێت و، هەزار هەزار ئەوەندەی دانایی لوقمانی حەکیمیش خاوەنی دانایی بێت! خۆ ئەمەش بە ژمارەی گەردیلەکانی "ئاو" کارێکی مەحاڵە!

کەواتە ئەو کاروبارە پڕ لە وردەکاری‌یانە بە: (توانست و ویستی خاوەن توانایەکی شکۆمەند و، سۆز و دانایی میهرەبانێکی بە بەزەیی نەبێت ئەنجام نادرێن).

جا ئەو زیندەوەرە خنجیلە و پیرۆزانەی کە ئەو موعجیزە لەژمارەبەدەرانەیان دەرخست، بە ژمارەی خۆیان و بە زمانی حاڵی هەموویان، ئەم وشە هەمەکی‌یەی: "المبارکات.. لله" دووپات دەکەنەوە.

ئا لێرەوەیە کە بەرهەمی بەدیهاتنی جیهان، واتە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ، لە شەوی میعراجدا بە ناوی هەموو ئەو بەدیهاتووانەوە فەرمووی: "المبارکات.. لله" و، لە حوزووری خوای گەورەدا هەموو ئەو شتە پیرۆزانەی پێشکەش کرد کە لە ژمارە نایەن.

بەو واتایەی کە:

(سەرجەمی ئەم بارودۆخە نیان و ناوازانە و، سەرانسەری ئەم وردەکاری و داهێنانە بێ وێنانەی کە هەموو بینەرێك دەخەنە سەرسوورمانەوە و وای لێ دەکەن لە تاوا بڵێت: "بارك الله.. ما شاء الله".. هەموویان تەنها تایبەتن بە توانستی خواوەندی شکۆمەندەوە).

هەروەها "هەوا"ش، کە سێهەم توخمی دنیای هەموو کەسێکە، بە هەمان جۆرە.. چونکە هەموو گەردیلەیەکی هەر بڕێکی کەم و بچووکی هەوا، با بە ئەندازەی دەربڕینی وشەی "هُوَ"ش بێت، لە ناوەندی سەرقاڵی و ئەنجامدانی ئەرکە زۆرەکانیدا، بە وێنەی مەڵبەندێکی وەرگرتن و گواستنەوە هەموو ئەو دوعا و سڵاوات و لاڵانەوە و پەرستشانەش لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت کە هەر هەموویان بە: "الصلوات" دەردەبڕرێن. لەم ڕێیەوە "هەوا" دەبێت بە زمانێکی حاڵی هەمەکی و، بە ئەندازەی گەردیلە لە ژمارە بەدەرەکانی خۆی زیکری ئەو وشانە دەڵێت و پێشکەشیان دەکات بە بەدیهێنەری مەزنیان.

لەبەر ئەوە، پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە ناوی هەموو ئەو گەردیلانەوە و بۆ دەربڕینی ئەو واتا هەمەکی‌یە، وشەی "الصلوات لله"ی وت و پێشکەشی خواوەندی مەزنی کرد. بەو واتایەی کە:

(سەرجەمی ئەو دوعا و نزایانەی کە گیرۆدەبووانی بێچارە پێیان دەلاڵێنەوە و، ئەو شوکر و سوپاسگوزاری‌یانەش کە لەسەر نیعمەتەکان پێشکەش دەکرێن و، گشت پەرستش و سڵاواتەکانیش کە ئەنجام دەدرێن، هەرهەموویان تایبەتن بە خوای تاك و تەنیا کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە).

چونکە هەروەك لەو باسە ناوبراوەدا وتراوە:

گەردیلەکانی هەموو بڕێکی هەوا کە بە ئەندازەی دەربڕینی وشەی "هُوَ" بێت، یان ئەوەیە هەموو زمانەکان بە باشی دەزانێت و.. شوێنی ئەو کەسانەش دەبینێت کە بەو زمانانە دەدوێن و.. هەموو شتێکی نزیك و دوور دەبیستێت و.. دەتوانێت بە باشی بە هەموو ڕێچکە زمانێك قسە بکات و پیتەکان وەك خۆیان دەربهێنێت،

لەگەڵ ئەنجامدانی گەلێ کار و ئەرکی تردا، بێ تێکەڵ بوون و لێ تێکچوون. بەو واتایەی کە هەموو یەکێك لە گەردیلەکانی ئەو هەوایە خاوەنی توانست و ویستێکی ڕەها بێت! کە ئەمەش بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی هەوا مەحاڵی ئەندەر مەحاڵە!

یان هەموو یەکێك لەو گەردیلانە، بە دڵنیایی، دەبن بە بەڵگە لەسەر بەدیهێنەری دانا و، بە بێ گومانییش شایەتی لەسەر هەموو سیفەتە مەزنەکانی دەدەن. تەنانەت دەڵێی بە پێوەرێکی بچووك جێگای سەرجەم شایەتیدانەکانی جیهانی لەسەر بەدیهێنەری مەزن تێدا دەبێتەوە.

واتە ئەو سڵاواتانەی کە بە ژمارەی گەردیلەکان پێشکەش دەکرێن و بە "الصلوات لله" دەردەبڕێن، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بەم واتا هەمەکی‌یە لە شەوی میعراجدا پێشکەشی خوای گەورەی کردوون!

هەروەها کاتێ وشەی شیرین و پیرۆزی "الطیبـــــاتُ" دەوترێت، "ئاگر" و "ڕووناکی" واتە: توخمی ماددی و مەعنەویی "ڕووناکی" - گەرمیی لەگەڵدا بێت یان نەبێت - دەبێت بە زمانێکی هەمەکیی زیکرخوێنی ئەوتۆ کە بە چەندین زمانی حاڵی لەژمارەبەدەر وشەی: "الطیباتُ لله" دووپات دەکاتەوە. بەو واتایەی کە:

(هەموو وشە پیرۆزەکان و واتا خاوێنەکان و جوانی‌یە ناوازەکان و درەوشانەوەکانی ناوە جوانە ئەزەلی‌یەکان، کە بەسەر گۆنای بوونەوەران و ئیمانی ئیماندارانەوە دەبریسکێنەوە، لە پێشەکیی هەموویانەوە پێغەمبەران - درووردیان لەسەر بێت - و ئەولیا و پیاوچاك و ئەصفیاکان.. هەروەها گشت بریسکەیەکی جوانی کە بەهۆی ئیمانەوە بەسەر ڕوخساری بەدیهاتووان و بوونەوەرانەوە دەبینرێن.. هەروەها سەرجەمی ئەو وشە خاوێن و جوانانەی کە هەڵقوڵاوی ئیمان و حەمد و سەنا و شوکرانە و تەهلیل و تەسبیح و تەکبیری ئیماندارانن و بە بەڵگەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿إلیه یَصعَدُ الکلمُ الطَّیبُ﴾ (فاطر: ١٠) بۆ عەرشی ئەعزەم بەرز دەبنەوە.. سەرجەمی ئەم وشە خاوێنانەی کە ڕوویان لە عەرشی ئەعزەمە و هاودەم لەگەڵ هەموو شێوە لە سنوور بەدەرەکانی "جوانی" و "خاوێنی" و

"شیرینی" کە لە جوانترینی سێ ڕووەکەی دنیاوە سەریان هەڵداوە کە ئەو ڕووەیەتی ئاوێنەی ناوە جوانەکانی خوایە، لەگەڵ چەندین "خێر" و "چاکە" و "بەروبوومی مەعنەوی"ی ئەوتۆدا کە لە ڕووی دووهەمی دنیادا - کە کێڵگەی دوارۆژە - چێنراون و سەوز کراون.. ئەم هەموو "طیّبات"ە، بە تەواوی، تەنها تایبەتە بە خوای تاك و تەنیای خاوەن توانستی ڕەها و پادشای ئەزەل و ئەبەدەوە)!

جا ئەم واتا هەمەکی‌یە، کە بە زمانی بەندایەتیی هەمەکیی "ئاگر" و "ڕووناکی" دەردەبڕرێن، سەرداری گەردوون کە پێغەمبەری ئازیزمانە ﷺ بە ناوی هەموو ئەو بەدیهاتووانەوە لە حوزووری پەرستراوی شکۆمەندا بە وشەی پیرۆزی: "الطیباتُ لله" پێشکەشی کرد.

چونکە "ڕووناکی"ی ماددی و مەعنەوی هێندە بەڵگە و شایەتیی هەندەکی و هەمەکی‌یان لەسەر خوای گەورە لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە کە لە ژمارە نایەن.

بەڵێ، ڕووناکی و ئاگر - وەك گڵ و هەوا و ئاو - بە چەشنێکی بێ‌گومان و بەڵگەنەویست و لە ڕێی ئەو نموونانەوە کە باس کران، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە: سەرجەمی هۆکارەکان تەنها چەند پەردەیەکن و، هەموو کاریگەری و بەدیهێنانێك تەنها لە لایەن خوای گەورەی بەتوانای شکۆمەندەوەیە.

چونکە "ڕووناکی" - کتومت وەك "ژیان" و "بوون" - بە دەرچوونی ڕاستەوخۆی لە دەستی توانستی خوای گەورەوە "بوون"ی دەست دەکەوێت و، لە هیچ لایەکەوە هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان نابن بە پەردە لە نێوان "ڕووناکی" و "توانستی خوای گەورە"دا. کەواتە لەو ڕووەوە "ڕووناکی" لە نێوانی "واحیدییەت"دا دەبێت بە بەڵگە لەسەر "ئەحەدییەت"! واتە بە کارمەندی‌یەکی هەندەکیی یەکجار بچووك ئاماژە بۆ بەڵگەیەکی فراوان و هەمەکیی ئەحەدییەت دەکات، وەك ئەوەی بە کورتی لە باسی (سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی "هُـوَ"دا) چەسپێنراوە.

لێرەدا و لە نێوان ملیۆنەها ملیۆن نموونەدا، تەنها دوو دانە باس دەکەین:

○ نموونەی یەکەم:

ئەم نموونەیە بریتی‌یە لەو شتەی کە لـە بەشێکی کـەمی بریسـکانەوەی نوورێکـی مەعنەوی و لە شێوەی زانستێك لە مێشکی مرۆڤێکدا دەردەکەوێت کە بەهۆی ئـەو هێزی پارێزکار(حافظة)ەی بە ئـەندازەی نینۆکێـك دەبێـت، دەتوانێـت شـت لەبـەر بکات.

ئەم مرۆڤە وشـەکانی نـەوەد کتێبی لـە مێشـکی خۆیـدا جـەم کـردووە و، هـەموو ڕۆژێك سێ سەعات لە خوێندنەوەی تەنها ئەم بەشەی حافیزەیدا بـەردەوام دەبێ تـا ماوەی سێ مانگ ئنجا تەواوی دەکات!

هەر ئەم مرۆڤە کاتێ هەر شتێکی بوێت، لەوانـەی کـە بینیوونـی یـان بیستوونی، یان هەر شێوە و واتایەك هاتووەتە پێش چاوی، یان هەر وشـە و گوفتـارێك کـە پێـی جوان بووە یاخود سەری لێی سوورماوە، یان هەر شتێك حەزی لێی بـووە، لەگـەڵ سەرجەمی ئەو دەنگ و ڕەنگانەی کە هاتوونەتە ڕێی ژیانی لە ماوەی تەمەنی خۆیـدا کە خۆی لە هەشتا ساڵ داوە، دەتوانێت لەو حافیزەیە دەری بهێنێت!

هەموو ئەو شتانەی ناویان برا لە لاپەڕەی ئەو حافیزەیـەدا کۆکراونەتـەوە. لەبـەر ئەوە، پێی وایە ئەو حافیزەیـە بـە وێنـەی کتێبخانەیـەکی گـەورەی ئـەوتۆ وایـە کـە بـە شێوەیەکی ڕێکوپێك زانیاری‌یەکانی تێدا ڕێکخرابن.

کەواتە ئەم حافیزەیەی کە جێگای قەبارەی تۆوە خەرتەلەیەك ناگرێت و هـەموو بارودۆخێکی تێدا دەپـارێزرێت و دەنووسرێت، دەبێ: بـە ئـەندازەی دەریـا فـراوان بێت و، نوورێکی هەمـەکی و ڕووناکی‌یـەکی مەعنـەویی ئـەوتۆ بێـت کـە بـە وێنـەی ڕووناکیی گشتگیری خۆر هەموو لایەنێکی ئەو شـتانە بگرێتـەوە و، دارای چـەندین لاپەڕەی گەورەی فراوانی بە ئەندازەی زەوی بێـت. دیـارە ئەمـەش مـەحاڵی ئـەندەر مەحاڵە، تەنانەت سەدان هەزار مەحاڵی تێدایە.

کەواتە بێ هیچ گومانێك دەبێ ئـەم حـافیزە یـەکجار بچووکـە خـوای گـەورەی خاوەن زانسـتی ڕەهـا بـە زانسـت و دانسـت و توانسـتی خـۆی لـە مێشـکی مرۆڤدا

داینابێت و، بە وێنەی نموونەیەکی بچووك بەدیی هێنابێت تاکو بیکات بە ئاماژە و شایەت لەسەر "لەوحی مەحفووظ" کە لاپەڕەی قەدەر و قودرەتی خۆیەتی.

○ نموونەی دووهەم:

کە نموونەیەکی جوزئی و یەکجار بچووکە، بریتی‌یە لە "کارەبا"!

چونکە دوای ئەوەی یەکێك لە گڵۆپی کارەبای کۆڵی‌یەوە و بە وردی سەرنجی دا، بینیی ئەو گەردیلە و ماددانەی کە لەناو سەدان سویچ و وایەر و مەڵبەندی کارەبادان، هەموویان بێ گیانن و هیچ کامێکیان خاوەنی هەست و شعوور و جووڵەی خۆیی نین، لەگەڵ ئەوەشدا لە ماوەیەکی کەمتر لە نیو چرکەدا و دوای کەمتر لە دەست لێدانێکی ئاسایی، دەیان کیلۆمەتر تاریکایی دەڕەوێنێتەوە و ڕووناکی‌یان لە جێگەدا دادەنێت! جا ڕۆشتن و نەمانی کتوپڕیی ئەم تاریکاییە لەبەرچاوە و هاتنی ڕووناکی‌یەکی بینراو لە بری و بە ئەندازەی ئەو تاریکی‌یە - بێ هیچ گومانێك - ئەندێشە نی‌یە و کارێکە لە بەرچاودایە..

کەواتە "بەریەککەوتن"ی ئەو گەردیلە بێ گیان و هەستانە، یان ئەوەیە: هێز و ڕووناکی‌یەکی هێندە زۆر و نەبڕاوەی پێ‌یە کە ئەو گەردیلانە بتوانن دەست بۆ دووریی سەدان کیلۆمەتر درێژ بکەن و تاریکایی تێدا لا ببەن و پڕی بکەن لە ڕووناکی. خۆ ئەمەش هێندە مەحاڵە کە تەنانەت "سۆفستائی"ش[1] قەناعەتی پێ

---

(١) سۆفستائی‌یەکان: دەستەیەك بوون لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، کە دوای قوتابخانەی "فیساگۆرس" و لە ئەنجامی ئاڵۆزیی باری ڕامیاری و قەیرانی ئابووری پەیدا بوون. ئەم دەستەیە ئینکاریی حەقیقەتی شتانیان کردووە و لایان وا بووە کە هیچ شتێك دارای حەقیقەت نی‌یە. "گۆرگیاس" و "برۆتاگۆراس" بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائی‌یەکانن. ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێکن. کاتی خۆی "سوقرات" زۆر بە توندی بەرپەرچی داونەتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە کەس و بیر و ڕایانە لە هەموو سەردەمێکدا بە کاڵای نوێ و ناوی جۆراوجۆرەوە پەیدا دەبنەوە. بۆ زیادە شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: "شرح العقائد النسفية" لسعدالدين التفتازاني ص ٢٣-٢٥ طبعة تركيا سنة ١٣٢٦ هـ، "كشاف إصطلاحات الفنون" للتهانوي ج١/ص٦٦٥ طبعة كلكته في الهند عام ١٨٦٢م، "الموسوعة الفلسفية الميسرة" ج١/ص١٠٣٤ طبعة دار نهضة لبنان — بيروت سنة ١٩٦٥م. هەروەها پێشەکیی (مهدی توحیدی پور) بۆ (نفحات الأنس)ی مەولانای جامی ص ٦٩-٧٠ ناشر: کتابفروشی سعدی. (وەرگێڕ)

